



# میدیا

ئی. م. دیاکۆنۆف
نوسیویەتی

برهان قانع
(فارسیەوە كردوویەتی بە كوردی)

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و هونەر
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

٥٦

# میدیا

ئی . م . دیاکۆنۆف

بورهان قانع

لە فارسییەوە کردویەتی بە کوردی

چاپی یەکەم

١٩٧٨

# پیشەکی :

تا ئیستا ئەوانەی لە بارەی میژوی مادەوە نوسیویانە وەکو بەشیکی سەربەخۆو خاوەن قەوارەی سیاسی باسەکەیان دانەرشتوە ·· زوربەی میژوو نوسەکان باسو بەسەرهاتو شەڕو شۆرو حوکمڕەوایی مادەکانیان وەکو سەرەتایەك بۆ چونە ناو میژوی حوکم ڕەوایی هەخامەنشیەکان داناوە ·· لە هەمان کاتیشدا ماد هۆزیکی ئاری زمانی فراوان بوە کە بەر لە دایك بونی رووژگاری سەڵتەنەتی هەخامەنشیەکان ئەمان لە بەشیکی زۆری ·· ئەناوچەیەدا دەولەتو شانشینی سەربەخۆو ئیمپەراتوری‌یان هەبوە· مادەکان دوو ئەوەندەی سەردەمی هەخامەنشیەکان حوکمڕەوا بون ، وەختیك مادەکان ئیمەراتۆریتی ئاشوریەکانیان لەناو بردوەو دەسەڵاتی عەسکەری‌و سیاسی‌و ئیداری‌یان تیك شکاند ،نەك تەنیا خۆیان بەلکو گەلیك هۆزو تیرەو شانشینی بچوكو خەلکی زەحمەتکیشی ئازادیان لە دەستی ئاشورو کۆتی باجو سەرانەو بیگار رزگار کردو خەلکیان لە پەلامارو هەڕەشەو گوڕەشەی ئاشوریەکان دڵنیا کرد ·

**جگە لەوەی کە خولیای میژوم لە سەردایە ، دەمیك بوو بە شوین کتیبیکدا ئەگەڕام کە میژوی [ماد] [میدیا] لە بنەڕەتەوە لەسەر بنچینەیەکی زانستیانەو خاوەن بەڵگە باس بکات ·· ئەو کتیبو نوسراوانەو ئەو باسانەی کە لە بارەی مادەوە خویندومەتەوە دڵمیان پاراو نەکردۆ تەوە ·· ئەمویست لەگەل باسیکدا خۆم ماندوو بکەمو خۆم بە کتیبیکەوە خەریك بکەم کە لە سەرەتای پیك هاتنی کۆمەڵگای ـ چینایەتیەوە لە سەرزەمینی مادو یەکگرتنی هۆزەکانیانو دامەزراندنی ئیمپەراتۆری‌یانو شەڕو بگرەو بەردەکانیان لەگەل دراوسیی نزیكو ولاتە دور دەستەکاناو خوو رەووشتو هەستانو دانیشتنیانو نەریتی**

**ئاینیو پەلاماردانە کانیانو ۰۰۰بۆ ئەو دیو سنوری سیاسی ولاتەکەیانو روی سیاسیو ئابوریو پلەی کۆمەلایەتیو رەوتی پێشکەوتنی پیشەسازیو رادەی ژیانو کرداریان بەرامبەر بە دوژمنو هەروەها بەرامبەر بە شانشینە لاوازەکانی ژێر دەستیانو چارەسەر کردنی گیروگرفتە کۆمەلایەتیەکانیان بە دەستی خۆیانو یادگارە میژوویيە کانیانو ۰۰۰تاکو روخاندنی دەسەلاتو سرینەوەی شوێنە ـ واری سیاسیو ئیداریيان لە ولاتا ۰۰ هەموی باس بکات ۰**

نەبو!۰۰تاکو کتێبێکی میژوی ماد ـ تأریخ مادـم دەسکەوت کە بریتی بوو لە ٨٢٢ لاپەرەی قەوارە گەورە بە شیوەیەکی نویو چاپێکی رەوان نوسرا بۆوەو پەراوێزەکانیشی بە رێکو پێکی لەگەلدا بو ۰ کە خوێندمەوە وتم [ئەمەیە من بۆی ئەگەرام !] ۰۰پاش ئەوەی جارێك بە تەواوی خویندمەوەو هەمو بەسەرهاتو روداوەکانی هاتنە ناو دەرونمەوەو لە مێشکما شەقل بون، بریارم دا ئەم هەلە لەدەس نەدەمو ئەم یادگارە میژوویيە بەنرخە بکەم بە کوردی بۆ ئەوەی خوێنەواری کورد لەم گەنجینە ئەدەبیو میژوویيە بێ بەش نەبن ۰ سالێکی رەبەق پێوەی خەریك بووم تاکو کردم بە کوردیو سەر لەنوێ جارێکی تریش پیا چومەوەو والا بێژم کرد ۰۰ ئەم کتێبەی لێهاتە بەرهەم کەوا ئیستا لەبەر دەستدایە ۰

ئیگور میخائیلویچ دیاکونوف شارەزای (فقه اللغه)و میژوی رۆژهەلاتی کۆنو کارگێری لێ هاتوی مۆزە خانەی ئەرمیتاجو مامۆستای زانستی میژوو ئەندامی فەخری ئەنجومەنی ئاسیایی سەلتەنەتی بەریتانیاو خاوەنی چەندەها نوسراوەی بەکەلك لە بارەی میژوی رۆژهەلاتی کۆنو (فقه اللغه)و زمانەکانی ئاکادیو سومەریو ئۆرارتوییو چەندەهای تر کە لە بەشی ئانستیتوی هۆزە ئاسیایەکانو زەمینەی فەرهەنگی زانستی سوڤییەت لە لنینگرادا جێگایەکی تایبەتی هەیەو لێی وەشاوەتەوە ئەم ئەرکە بەجێ بهێنێ ۰

**دانەر جگە لە نوسینی نوسەرە کۆنەکانی یۆنانو رۆژهەلاتی کۆن گەلێك بایەخی بەو شوێنەوارە میژوییو قاپو قاجاخە دۆزراوانەی ناو دەرونی گۆرەکانو تەپە هەلکەندراوەکانو نوسینی روی شاخە بەردە بەرزەکان داوەو تارادەیەك ئەوەی لە بارەی مادەوە نوسراوە یان نەخش کراوە رونی کردۆتەوەو لەم کتێبەدا لە جێگای خویدا گونجاندویتی ۰۰بەو جۆرەی مەگەر هەر خۆی بتوانێ بەو جۆرە دلسۆزیيەو بەو بێ لایەنیەوە سەیری مەسەلەکە بکات ۰**

**دانەر بە ئەمانەتو دەس پاکیەکی بێ وێنەوە ئەم خزمەتی میژوویيەی بەجێ هێناوەو ئەلێ ئەم میژوە وە نەبێ هەمو کونو قوژبنو کەلێنەکانی میژوی**

**بەسەرهاتی مادی پشکنی بێ ، وە لەو باوەڕەدایە کە لە رۆژگاری ئایندەدا گەلێك شوێنەوارو کەلوپەلی نووسراوو یادگارو بەڵگەی تر بدۆزرێتەوەو ببێتە هۆی گۆڕینی رویەکی ئەم مێژووە ٠**

نوسەر جگە لە ماندوێتیو گەڕان بە شوێن سەرچاوەی رەسەنو باوەڕ پێکراودا دوچاری گەلێك گیروگرفت بووە ، وەکو نەبونی سەرچاوەی تەواو لە بارەی باسەکانەوەو پچڕ پچڕ بونی باسەکان ٠٠ هەروەها تەقەللای داوە کە ئەم کتێبە وەکو مێژووی هۆزی ماد بێتە بەرهەم نەك وەکو مێژوی کیشوەری ماد ٠٠وە ئەوەندەی لە دەسەڵاتیا بوە کورتی نەکردوە ، ئەوەشمان لەیاد نەچێ مەگەر شارەزایەکی وەکو دیاکونوف ئەگەر ناکام زانا یان کام شارەزای (فقە اللغة) ئەتوانێ زاراوەی ئەم هەموو زمانە جۆربەجۆرە مردوانە زیندوو بکاتەوەو بەراوردی بکاتو بیانباتەوە سەر بنجو رەگەزی رەسەنی خۆیو لەوێوە بیروڕای خۆی لەسەر هەڵگۆزێ ؟ ٠٠هەندێك زاراوە کە بە پیتی لاتینی نوسراوە ئەگەر جێگای خۆی پڕ نەکردبێتەوە ئەوە هۆی ئەوەیە دانەر بە پیتی روسی نوسیویەو لە گۆڕینا بۆ لاتینی ئەو شێوەی بەسەردا هاتووە ٠

دانەر لە بارەی خوێندنەوەو لێکدانەوەی سەرچاوە بزماریە [میخی]کانەوە پرسو رای بە گەلێك زاناو شارەزای باوەڕ پێکراو کردوەو سوودی لێ وەر گرتوون ٠

نوسەری بەناوبانگی فارسی [کەریم کشاوەرز] ئەم کتێبەی لە روسیەوە کردوە بە فارسیو بەم هۆیەوە رێگای دوری ئاواتی من نزیك بۆوە ، منیش لە فارسیەکەوە بە بێ دەسکاری و گۆڕین کردم بە کوردی ، بەو هیوایەی کە لە نامەخانەی کوردیدا کەلێنی خۆی پڕ بکاتەوە ٠ وەدوای گۆڕین بەراوردیش کراوەتەوەو هەندێکی لێ بژار کراوە ٠

هەزار رەحمەت بۆ ئەوانەی مرۆڤایەتی ئەکەن بەپیشە لەژیاناو خزمەتی گەلو نەتەوەو تەواوی رێبازگەی مرۆڤایەتی ئەکەنو رێزی رابوردوی بەکەڵك ئەگرن ٠

**برهان قانع**
**١٩٧٤**

# تێ بینی

مەبەست لە تەرجومە کردنی ئەم کتێبەو چاپو بلاو کردنەوەی بەلای ئێمەوە ئەوەیە ..ئەمە کۆمەلە بیروڕایەکی رۆژهەلاتناسانو میژوونوسەکانو شوێنەواری کۆنو بەلگەو سەنەدی بڕوا پێکراوە لە بارەی بەسەرهاتە میژوییەکانی رۆژهەلاتی کۆنەوە وە بە تایبەتی - میدیا - مادەکان - حەزمان ئەکرد ئەم زانیاریە میژووییانە بەخوێنەرانی کورد بگەیەنین ..

هیوادارین هەرکەس لە بواری -میژودا کە پەیوەندی بە رابوردوی خەلکی ناوچەی ناوبراوەوە هەبێ -کە خۆشمان یەکێکین لە دانیشتوانی ناوچەکە -بە پێی توانا پێشکەش خوێنەرانی بەرێزی بکات .

- وەرگێر -

# پێشەکی چاپی فارسی

مادەکان تەنیا چەند هۆزێکی ئاری زمان بون کە بەر لە سەردەم و ڕۆژگاری هەخامەنشیەکان لە بەشێکی زۆری سەرزەمینی ئەمڕۆی ئێراندا دەوڵەتی جۆربەجۆرو پادشایەتیان بووە ، سەردەمی دەسەڵاتداریتیان دو ئەوەندەی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی هەخامەنشیەکانی خایاندوە •

مادەکان ئەمپەراتورێتە گەورەکەی ئاشوریان لەناو برد ، خۆیان و چەندان نەتەوەو خێڵ و هۆزیان لەژێر ستەم و دەسەڵاتی داگیرکەرانەی ئاشوریەکانا ڕزگار کرد • بەڵام مێژوی مادو دەوڵەت و پادشایەکانیان تا ئیستا بەشێکی دیاریکراوو سەربەخۆی لە مێژودا نەبوە ، مێژو نوسەکان زوربەیان بەسەرەتایەکی مێژوی هەخامەنشیەکانیان دائەناو داناوە •

لە ماوەی نیوە سەدەی ئەم دواییەدا هەندێک شتی تازە لە بارەی کۆنەشوناسیەوە دۆزراوەتەوەو چەند پەیکەرو نوسراوو تابلۆیەکی دوزراوەی قەدشاخەکان خوێندراوەتەوە کە هەندێکیان [تاڕادەیەك] چەند گۆشەیەکی تاریکی مێژوی ماد ڕون ئەکەنەوە •

کۆ کردنەوەی ئەم سەرچاوانەو بەڵگەی تازەو ڕێکخستنی و نوسینەوەو ڕەخنە لێگرتنیان یەکێك گرتیە ئەستۆی خۆی ـ جگە لەو سۆزو شۆرەی کە

لەگەل میژودا هەیەتی توانیویتی راستەو خۆ سود لەو سەرچاوانە وەر بگریّ•

ئیگور میخائیلویچ دیاکونوف شارەزای فقه اللغەو میژوی رۆژهەلاتی کۆنو کارگوزاری لیهاتوی ئەنتیکەخانەی ئەرمیتاجو مامۆستای زانستی میژو ئەندامی (فەخری) ریزلینان ئەنجومەنی ئاسیایی سەلتەنەتی بەریتانیاو خاوەن چەندان نوسینی میژوییی لە بارەی رۆژهەلاتی کۆنەوە و فقەاللغەو شارەزای زمانەکانی ئاکادیو سومەریو ئورارتوییو چەندان زمانی تر کە لە بەشی ئانستینوی هۆزە ئاسیایەکانو فەرهەنگستانی زانستی شورەوی لە لینینگرادا جێگایەکی گەورەو بەرزی هەیە ئەم کارە بەنرخەی بە ئەنجام گەیاندوەو لیّی وەشاوەتەوە ئەم ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆی •

مامۆستای ناوبراو ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆو ئەم ریگا تازەیە کردەوە چاوی ،لە هەنگاو نانی سەر ئەو شەقامانەی خەلکی تر کوتابویانەوەو پۆشیبو ،بە پیّی بەلگەو سەنەدی تازە دۆزراوەی میژوییو زانستیانەو بەراورد کردنیان لەگەل بەلگەو سەرچاوە کۆنە شوناسیەکاناو دەرهینانی بیرورایەکی مەنتیقیانە لە هەمو ئەو سەنەدو تابلوو سەرچاوە دۆزراوانەو بە پیّی هەولو کۆششیکی زۆر توانی ئەم کتیبە بەناوی [میژوی ماد]ەوە بنوسیتەوە کەوا بە تەرجەمە کراوی کەوتۆتە دەست خوینەرە بەریزەکان •

ئاشکرایە، هەروەکو دانەری ئەم کتیبە لە پیشەکیەکەیا بەیادی کردوە ئەم کتیبە لە هەمو رویەکەوە تەواو لە تەواو نیە ،وە لەوە ئەچیّ ئەو تابلۆو بارچە نوسراوەو پەیکەرو سەنەدو بەلگە تازانەی تر کە لەمەو پاش ئەدۆزریتەوە لە بارەی کۆنە شوناسیەوە لەوانەیە روخساری هەندیک باس وەیان بەگشتی لە بنەرەتەوە بگۆریتە سەر جۆریکی تر ••

نوسەری ئەم چەند دیرە ـ موتەرجمی «میژوی ماد» ـ لەگەل کەمتوانایی خۆی بەهۆی هاریکای کۆمەلیك لە دۆستە دانشمەندەکان لە بارەی ئەم تەرجەمە کردنەوە یارمەتیان داو لەگەل ئەو پەیوەندیەی کە بە باسەکانی کتیبەکەوە هەیەتی ئەمکارەی کە لە توانای ئەو گەورە تر بوو ، بە هاریکاری هەمو گۆرینەکەی هاتە کایەوە •

**موتەرجیمی کتیبەکە(*) رونوسی ئەم کتیبەی دوای گۆڕینی بۆ زمـانی فارسی نیشانی زۆر کەس لە میژو ناسانو ئەدەب دۆستانی هاوچەرخی خۆی داوە وەکو [.....] ئـەوانیش هـەریەکـە بـە پێی توانای خۆی دەسـکاری راستکردنەوەی هەندێك لە زاراوەکانی کردوەو راستو چەوتیان تیا بەراورد کردوەو ئەمەش جێگای سوپاسە ٠**

**دیارە هەر هەڵەیەکی تیا بێ گوناحی لـە ئەستۆی (وەرگێڕە (مترجم) لێرەدا هەندێک شـت دێتـە پێشـەوە کـە پێویستە خوێنـەران سـەرنجی بدەن وەکو :**

لە میژوی ماددا گەلێک ناومان دێتە پێش کە بۆ یەکەمین جارە لە وڵاتی ئیمەدا ئەبیسترێ وە یان لە کتیبێکدا ئەنوسرێتەوە وە چەندان ناوی تر کە لە سەرچاوەکانو تەرجـەمەی تری فارسیدا بـە شێوەیەك یان چـەند شێوەیەکی تر هاتوە ٠

هەندێک لەو ناوانە بە هۆی نەبونی دەنگو پیتی (ھ،ق،غ،آ) لە زمانو خەتی روسیدا رەنگە لـە گۆڕینـە کـەدا نەختێك گۆڕدرابێ وەکو روباری [هالیس] [قزل ئیرماق] کە لە چەند لاوە [گالیس] نوسراوەو لـە ناوەڕۆکی راستکردنەوەی هەڵەکان راست کراوەتەوە ٠

نوسینی وشە لاتینیەکانیش دەقاندەق شیوەی رۆنوسەکە نیە ٠٠ بەپێی شێوەی دەنگ نوسراونەتەوە ٠

کتیبی [میژوی ماد] لە ساڵی **١٩٥٦** دا چاپ کراوەو ،لـە کاتی بـەرگ تێگرتنی کتێبەکەدا دانەر چـەند ئاگاداریو زانیاریـەکی نوێی بـە هۆی بەڵگەو سەرچاوەی تازە دۆزراوەوە دەست کەوتوە کـە کەوتۆتە دوای دانانی کتیبەکە ئەوا لە لاپەڕەیەکی ترا پێشکەش ئەکرێ ٠

داوای سەرکەوتنی خوێنەرە بەرێزەکان ئەکەم

**کەریم کشاورز**

**وەرگیری کتیبەکە ـلە روسیەوە بۆ زمانی فارسی**

---

**(*) ناوی ئەو کـەسانە نەنوسراوە کـە لـە رونوسـە فارسیەکـەدا هـەیە (وەرگێڕی دوەم) ٠**

# ئەو زانیاریە تازانەی
# لەکاتی چاپی کتیبەکەدا
# دەست دانەر کـەوتوە

لە ساڵی ١٩٥٦ چـەند پارچـەیەکی تازە لـە بارەی مێژوی روداوەکانی بابلەوە لە دەوروبەری ساڵەکانی ٦٣٣ ـ٦٢٦ ٥٩٥ ـ٦٠٨ و ٥٥٦ ی بەر لـە زاینی بلاو بۆتەوە ..کە بە هاریکاری •

D. J, Miseman. Chronicles of chaldaean kings. London, 1956.

ئەتوانرێ سەرەتای روداوەکانی ئەو رۆژگارە بـە وردیو راستی رون بکرێتەوە ،ئەوا لـە خوارەوە گرنگترین باسو هـەواڵ لـەم روەوە ئـەخەینە بەرچاو :

سین شاریشکون لـە ساڵی ٦٢٩ سـەرەتای حکومـەتی دامـەزراندوە ، کاندالانو کە لە ساڵی ٦٢٧ دەرچووە لە دژی ئەو رۆیشتووە ، لەوە بە دواوە نابو پالاسار بو بـە سەرکردەی شورشەکە ،بـەلام لـە پایزی سـاڵی ٦٢٦ دا نازناوی پادشایەتی وەرگرتوە ،نابوپالاسار توانی هـەمو ولاتی بابل لـە سـاڵی

**٦٢٢** وەیان نەختێك دواتر بگرێتە ژێر دەستی خۆی ••عیلامەکان لەگەل ئەود یەکبون،[سین شوملی شیر] رەنگ بێ لە دەورو بەری ساڵەکانی **٦٢٢ــ٦٢٦** ی پێش زاینیدا لە دژی [سین شاریشکون] دەرچو بێ •

لە ساڵی **٦٠٨** بابلیەکان پە لاماری ناوچەی [بیت هانونیە]یان لە ئورارتو دا ،لە ساڵی **٦٠٧** نابوخودو نوسور سەرپەرشتکاری کاروباری جەنگی ئەکرد میسریەکانی لەژێر شورای کارکمیش‌و خاماتدا تێك شکاند • لەو رۆژگارەد لە مێژوی روداوەکانی نرا ناوی ماد نەهاتوە • نابوپالاسار لە مانگی [ئاوت]ی ساڵی **٦٠٥** دا کوچی دوایی کردوە •

لە ساڵەکانی **٥٩٥ــ٥٩٦** لـە نێوان نابو خودونوسوری دوەم‌و سـوڵتانی سەربەخۆی عیلام دا (؟) شەڕێك رویدا ، رەنگ بێ کــە بابـل دەسـەلاتی بەسەر شوش‌دا نەبوبێ ،ئەم باسەی کە گوایە شەڕ لە نێوان نریگلی سارو ماد بوە لایەنگیری ناکرێ ،بەلام لە بارەی لەشکرکەشی‌یەوە بو کیلیکیە تا سنوری لیدیەکان لە ساڵەکانی (**٥٥٦ــ٥٥٧**)دا بـە دەستەوەیە ••تـەماشای پـەراوێزی بەشی حەوتەم بکەن •

## پیشەکی‌یەك لە بارەی دانەرەوە ..

لە رۆژگاری کۆندا دەوڵـەتی [ماد]و دەوڵەتی [مانا] ـبەر لـەوان ـ چەند ئەمپەراتۆرێتیکی گەورەیان پێك هێنا بو .. ئەمپەراتۆریتی ماد ، لەگەل ئەوەدا زۆری پێ نەچو ئەرکێکی میژویی گەورەی گرتە ئـەستۆ .. « ماد » دەسەلاتی ئاشوری لە ناوبرد کـە نزیکـەی سـەرانسەری ئاسیای رۆژئاوای گرتبوە ژێر دەستی خۆی .هەروەها پـەلاماری ئەسکیتەکانی بەرپەرچدایەوە ، وە ئەو هۆزانەی کـە لـە پلەی سەرەتاییدا ئـەژیان فێری شارستانێتی بون‌و هێنایە ژێر رکێفی دەوڵەتەوە .. ئەو ئامۆژگاری‌و رێ‌و شوێنانەی کـە بونە بنچینەی ئاینی زەردەشت‌و بوبو بە جێ نەزەرگەی بیرو باوەڕو فکری خەڵکی ئەو سەردەمە لەناو نەخشەی ئەمپەراتۆرێتی مادا پەرەی سەند .

بەشی زۆری سەرزەمینی ماد لە ناوچەیەکدا بو کە لە دواییدا پێیان ئەوت ئازربایجان لە لاخواروی روباری ئاراسەوە . دێتـە بەرچاو کـە دەسـەلاتی دەوڵەتی ماد هەندێك جار لـە زەوی‌وزارو خـاکی ژوروی ئـەو ناوچـەیە [ ـ کۆماری ئازربایجانی نیستای یەکیتی سوفیەت ] دەستی رۆیشتووە . ناوی [ئازربایجان] خۆی لە وشەی مادی [ئاتروپاتین] وەرگیراوە ، وە هیچ گومانی تیا نیە لـەناو میژوی پێچاو پیچی درێژو زۆر لایـەنی پـەیدا بونی خـەڵکی ئازربایجاندا نژادی ماد شوێنێکی گرنگی گرتوە . تەنانەت لە هەندێك دەورو

رۆژگاری مێژوییدا ئەرکی خاوەندارێتی و رابەری خەڵکی گرتۆتە ئەستۆی خۆی •• بەم هۆیەوە باری کۆمەڵایەتی ئازربایجان لە بواری مێژوی مادا زۆر جێگای سەرنج لێدانە •

ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستایە بۆ ئانستیتۆی مێژوو فەلسەفەی فەرهەنگستانی زانیاری [ج• ش• س]ی ئازربایجان نوسراوەتەوە ، ئەبێ ئاڕادەیەك باسی ئەو مەسەلە باسکراوانە بکات ••

مەبەست لە دانانی ئەم کتێبە تەنیا رونکردنەوەی باس و بەسەرهاتە گرنگەکانی سەر بە رەگەزو پەیدابونو پێك هێنانی کۆمەڵانی خەڵکی ئازربایجان نیە وە دانەرەکەی کە کارشوناسێکی مێژوییو زمانی رۆژهەڵانی کۆنە بە هیچ جۆرێك خۆی بۆ ئەو باسە بەتایبەتی ئامادەو تەرخان نەکردوە • ئەم کتێبە تەنیا لەبارەی دەوڵەتی مادەوە نوسراوە •• پێویستە ئەوەش بزانن کە باسی هەمو مێژوی ئەو دەوڵەتە ناکات • بەڵام باس و بەسەرهاتی مێژوویی ئەو کیشوەرە لە سەردەمی کۆنەوە تاکو دامەزراندنی دەوڵەتی مادی [ئاتروپاتێن]و جیا بونەوەی وەکو لە زاراوەی مادی خوارو یان مادی گەورەدا هەیە ، ئەکات کە لە رۆژگاری دواییدا بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە مێژوی ئازربایجانەوە نەبوە ،نوسینی مێژوی [ئاتروپاتێن] سودی لەو سەرچاوانە وەرگرتوە کە کەوتوتە دەرەوەی دەسەڵاتو ئارەزوی دانەرەوە •• وە لەبەر ئەوە ئەو باس و بەسەرهاتانەی لێرەدا باسی لێوە ئەکری تیانیە •

ئەم کتێبەی وا ئەکەوێتە دەست خوێنەرانی وەکو کتێبێکی خوێندنی مێژوی ماد نەبوە بەڵکو زۆر تر زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکە لە بارەی کیشوەرەوە• وە لە بەر ئەمە ناتوانین هەمو جموجوڵە مێژوییەکان بە شێوەیەکی راستو رەوان لەم کتێبەدا باس بکەین • وە لەبەر ئەمە دیسان لەهەندێك لەو باسانە ئەکوڵینەوە کە ئەمانەوی بی هێنینە کایەوەو بەتایبەتی باسیان لێوە بکەین کە جێگایەکی تایبەتیان لە باسەکەدا هەیە • وە لە ئەنجامدا گەلێك شت لە رێبازی راستیو سەرچاوەو خەتی بنچینەیی لایداوە ، بەشەکانی تری کە بە تایبەتی نەهاتۆتە دی ، وەیان جۆرە لێکۆڵینەوەیەك لەبارەیانەوە بەپێی توانا

ە کراوە لەوانەیە بە جۆرێکی تر باسی لێوە کرابێ ، وەیان لەوانەیە لە بارەی بەجێ هێنانی رواڵەتی تەواوی باسەکەوەو شوێن کەوتنی خەت‌و رێبازی بنچینەیی بە شێوەیەکی تر قسەی لێوە بکرێ • ئەگەرچی دانانی ئەم جۆرە کتێبە خۆلیایەکی زۆری خستە ناو دەرونی خوێنەرانیەوە •• بەهەر جۆر بێ دانەری ئەم کتێبە ئەوە ئاگادارە کە ئەم کتیبە تەنیا بۆ ئەوانە نیە کە شارەزاییان بە باسەکانەوە هەیە • بەم جۆرە تێکۆشاوەو هەوڵی داوە تا بتوانێ شێوازی نوسینەوەی کتێبەکە بە جۆرێك سازو رۆشن بێ کە زوربەی خەڵك‌و خوێنەران لێی تێبگەن ، وە جۆری دارشتنەکەی بەشێوەیەك بێ نەك هەر لە بارەی ئەو شتانەوە لێی تێ بگەن کە تایبەتی پەیوەندی بە خۆیانەوەیە بەڵکو لە پلەی یەکەمدا ، لەگەل خوێندنەوەی باسەکانا لە مێژوی ماد تێ بگەن •

جگە لەوە ئەرکێکی تایبەتی لە ئەستۆی دانەردا بووە ،وە ئەم کتێبە لەگەل ئەوەدا خۆی لە هەمو رویەکەوە بە تەواو نازانێ ، ئەبوایە یەکەمین کۆمەڵە سەرچاوەیەك بێ‌و لە لێکۆڵینەوەی دواییدا لەو باس‌و بابەتانەی کە تایبەتی لە بارەی رەگەزو پەیدابون‌و پێکهاتنی نژادەوە کە لە رەگەزی خەڵکی ئازربایجاندا هەیە سودی وەر گرتبایە •

لەبەر ئەمە دانەر بە تایبەتی لەبارەی مەسەلەکانی زمان‌و قەوارەی هۆزو خێڵەکانەوە گەلێك بەوردی بۆی چووە لەگەل ئەوەشدا کە ئەو مەبەستی دیاریکردنی مێژوی زمان‌و سەرچاوەو رەگەز نەبوە •

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم هەمو نوسین‌و سەرچاوانە رێگا لە رونکردنەوەی مێژووەکە ناگرن زورتری ئەمانە کە لایەن‌و روخسارێکی تایبەتیان هەیە لە ناو پەراوێزو لێکۆڵینەوەی باسەکانا نوسراوون نەك لە ناو باسەکانی ناو کتێبەکەدا • ئەگەر چی پەراویزو لێکۆڵینەوەکان لەم کتیبەدا لەژێر باسەکانەوە و هەر لە هەمان لاپەرەی باسەکەدا نوسراونەتەوە[1] • بەڵام لەبارەی سەرنجدانی ئەم

**(١) لەم بەرگە تەرجومە کراوەدا پەراویزو لێکۆلینەوەکان کەوتونەتە دوای کتێبەکەوە •**

قەوارەیە ،هەروەکو لەگەل نوسینەکەدا ئـەخوێندرێتەوە ، باسەکـە دوچاری گرانی تێگەیشتنی ئەکات ، لـەبەر ئەوە وا بەباش ئـەزانرێ کـە خوێنـەران سەرنجی پەراوێزو لێکۆڵینەوەکانی بدەن چونکە ئەو پەراوێزانە بۆ خوێنـەران نوسراونەتەوە نەك بۆ هونەرنواندن •

لەبەر ئەوە باسەکان لە بواری تایبەتی شارەزایان جیا کراوەتەوەو لەناو پەراوێزەکانا نوسراوە •• وە ئەمە ئەو کۆششەی کە بۆ سود وەرگرتن لـە سەرچاوەکانو گونجاندنیان ئەدرێ تا رادەیەك بە نرختری کردوە •• رەنگە بێ ، بە تایبەتی لەبەشی دووەمدا ـ کە لە بارەی مێژوی لەشکر کەشیو دەست درێژی ئاشورەوەیە بـۆ سـەر خـاکی مـاد [ وە بـەهۆی سـەرگـەردانی ولاتەکەوە لە بارەی سەرنجی سیاسیەوە]زۆر بە نارەحەتی وەر ئەگیرێ ـ ئەوەی زۆر تر ئەکەوێتە بەر سەرنج ئەوەیە ئەم کەموکورتیە لـە کتێبێکی خوێندنی مێژودا ئەتوانرێ لابرێ بەلام لە دانانی کتێبێکدا کە لێکۆڵینەوە بێت وە لـە هەمان کاتدا کۆمەلێك سەرچاوەو بەلگە هەبێ شیکردنەوەی شتی زۆر ورد ئەوەندە بایەخی نیە •• لەگەل ئەوەشدا لـەو باوەڕەدام کـە ئەو بەشە وردە ناسکراوانە رێبازی ئەسلی مێژوی نەخستۆتە رو ••

دانەری ئەم کتێبە زۆر باش ئەزانی کە زۆر شتی تر لە بارەی مێژوی ماددوە ـ جگـە لەوەی ئەو ئەیزانێ ـ بخرێتـە بـەرچاو • کـەمی لـە رادە بەدەری سەرچاوەو یەکجۆر بونی سەرچاوەکانو جیاوازی ئاشکرا لە بارەی مێژوی رۆژگارەوە لەنێوان سەرچاوەکانا زۆر هـەیە •• ئەمانـە سـەر لـە لێکۆڵەرەوەکان تێك ئەدەن وای لێ ئەکەن گومان لە باسەکاندا پەیدا بکات ، لە هیچ یەکێك لـە مێژوەکانی سـەردەمی کۆن بـە ئـەندازەی مێژوی مـاد بیروراو سەرنجی جۆر و دژو کەموکورتی زۆر بێبنچینەو سـەر سوڕهێنەر [لە بارەی لێدوان لـە روداوی کاروباری سیاسیو لایـەنی مێژونوسی] دا تیا نیە ••ئاشکرایە ئەم کتێبە بێ کـەمو کورتی نیە ، هەرچـەند دانـەرەکەی تێکۆشاوەو هەولی داوە تاکو شتی سـادەو بێ بنچینەی تیا لابات‌و بیروراکانی خۆی بە پێی بەلگەو سەرچاوە تیا بچەسپێنێ ، لـەگـەل ئـەوەشدا گومـانی

لەهەر باس‌و روداوێک کردبێ دەست‌نیشانی کردوە ، بۆ ئەوەی ئەو باسە بە شێوەی تەواو خۆی نەگرێ ، خوێنەر بەراستی تێ نەگات ••وە بەشێوەی رون نەیتوانیوە هەمو باسەکان لـە هەڵە بەدور شی بکاتەوە ،دانـەر بـەهیچ جۆرێک نالێت کە گوایە مێژوی مادی لـە هەڵە گوڵبژێر کردوە ، وە حەز ئەکات ئەم کتێبە وەکو سەرەتای پەیدابون‌و دروستبونی مێژوی ماد لـە ناو زانستی مێژوی سوڤیەتدا لە قەڵەم بدرێ •

دانەر لە بارەی ژیان‌و رێبازی کامڵ بونی مێژوی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری مادەوە دوچاری گەلێك ماندوێتی بوە ، وە زور کـەم سەرچاوەو بـەڵگەی راستی دەست کەوتوە •• بـەم جۆرە ، ناوبراو پشتی بە تیوریە زانستیەکان بەستوە •• ئەو بارو چۆنیەتیـەی کـە هاریکـای پـەیدابونی کۆمـەڵگای کویلەێتی کردوە وەیـەکەمین هـەنگاوێک کـە ئـەو کۆمـەڵگایە لـەپێناوی پێگەیاندنی خۆیاناوێتی لـەم بارەیەوە تارادەیـەك کەوتۆتە بـەر سـەرنجی دانشمەندەکانی سوڤیەت بە هۆی هەندێک بەڵگـەو سەرچاوەی بچڕ بچڕەوە توانیوێتی شوێنەوارو پیشکەوتنی ناراستەوخۆ ئەوەندەی کـە لەگەل واقیع‌دا رێ بکەوێ بە شێوەی گشتی جیا بکاتەوەو پیشکەوتنی باری هـەر قۆناغێك بەجیا دیاری بکات •

دانەر لەگـەل گیروگرفتێکی ترا ــ کە لابردنی زۆر ستەم بو ــ دوچار بوە ، بەو مانایە کە سەرچاوەکان زۆر کەمن تا رادەیەك خوێنـەر ئەبێ دڵۆپ دڵۆپ وەریان بگرێ‌و لێیان تێبگات •• جگە لـەمـەش سـەرچاوەکان هەمـە جۆرەن [کۆنە شوناسی ، نوسراوە ، شوێنەواری پاشماوەی زمانـەکان]وە لـە هەمو ئـەمانە گرنگتر ــواتا سەرچـاوەو بـەڵگە نوسراوەکان ــ بـە زمـانە جۆربەجۆرەکان نوسراونەتەوە ••سەرچاوە نوسراوەکان کەبۆ زیندوکردنەوەی مێژوی ماد پێویستە بـەزمانـەکانی سومـەری‌و ئاکادی [بـە شێوەکـانی بابلی‌و ئاشوری] و عیـلامی‌و ئورارتویی‌و پـارسی کـۆن‌و ئاویستایی‌و عیبـری کـۆن‌و

یۆنانیو لاتینیو ئەرمەنی کۆن نوسراونەتەوە ، ئەو نوسراوەی کە سودی لێوەر گیراوە ئەویش بەمجۆرە تێکەڵاوە ، بۆ رون کردنەوەی نامەکان [کە لە شوێنی خۆیا بە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژویی دانراوە] وە بە شێوەی گشتی بۆ خوێندنەوەی بەڵگە زمانشوناسیەکان Linguistique ئەبێ پەنابرێتەبەر بەزمانی هۆرێتیو زمانە جۆربە جۆرە ئێرانیو ئارامیەکان•

شتێکی ئاشکرایە کە هیچ مێژونوسێك ناتوانێ بە زانیاری فقه اللغة هەمو ئەم زمانە جۆربەجۆرانە لێك بداتەوە ، دانەر بە تەنیا مێژونوس نەبوە بەڵکو لە هەمان کاتیشدا زمان شوناسێکی بە توانا ولێهاتوو بوە ، لەبارەی نوسینو دانانی ئەم کتێبەوە بێ ئەندازە هەوڵی داوەو زانیاری گشتی خۆی لەبارەی ریشەی زمانشوناسیەوە یارمەتی داوە تاکو لەو بەڵکەو سەرچاوەی زمانە جۆربەجۆرانە کە تا رادەیەك شارەزایان نیە سود وەربگرێ •• لەگەل ئەوەشدا لەهەر لایەك بۆی کرابێ لەگەل بەڵگەکاندا بەراوردی کردوەو دیسان سەرنجی سەرچاوەکانی داوەتەوە ، بەلام لە بارەی ئاویستاو چەند سەرچاوەیەکی تری ئێرانیو ئەرمەنیەوە ناچاربوە پەنای بردۆتە بەر ئەو سەرچاوانەی کە دەسکەوتون •

وە لە بارەی بەڵگەو سەرچاوەی زمانەکانی ترەوە ، دانەر تا رادەیەك شارەزایی لە رەگەزی زمانەکانەوە زیادوکەم بوە،تەنیا لە بارەی ئەو زمانانەوە نەبێ کە بە خەتی بزماری نوسرابنەوە توانیبێتی بە شێوەی تەواو لێکی دابنەوە• بەو هۆیەوە پێویستە لەبارەی گەلێك لە باسو بابەتەکانەوە پرسو را بە شارەزایانی زمانو زانایانی فقه اللغة بکات ، بەم بۆنەیەوە پرسی بە بیروراکانی و• آ• لیوشیتس Livchitz لە بەشی فقە اللغەی ئێرانیو روس• و• پولیا کووا Poliakova لە فقە اللغەی کۆنو ك• ب ئاستارکوا Starkava لە فقه اللغەی عیبری کۆن کردوە • ئەمە ئاشکرایە ئەو زانا ناوبراوانەی کە دانەر پرسو رای پێکردوون بە هیچ جۆرێک ئەرکی لێ

پرسینەوەی راستو هەڵەی ئەو باسو لێکدانەوانە ناگرنە ئەستۆی خۆیان کە کە لەژێر دەستی ئەوا نوسراوەتەوە •

ئەتوانین ئـەوە بڵێین کـــە دانـەر ئـەوەندەی توانێیتیو بۆی کـرابێ سەرچاوە نوسراوەکانو زمانەکانی بـەشێوەیەکی تـەواوو ورد لێکداوتـەوەو سودی لێوەر گرتون ، وە باسەکانی بە وردی رون کردۆتەوە •• بـەڵام لـە بارەی بەڵگەو سەرچاوەی کۆنە شوناسیو خەڵك ناسینو چـەند سەرچاوەو بەڵگەیەکی تری لەم جۆرە وەها نەبوە چونکە دانەر کۆنە شوناس نیـە بەڵام ئەوەندەی بۆی کرابێ لە زانیاری کۆنەشوناسی سـودی وەرگرتوە •• وە بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوە و بۆی نـەکراوە هەمو ئـەو بەڵگـەو سـەرچاوانە راستەو راست بە وردی لێك بداتەوە •

لەم کتێبەدا ئەوەندەی پێویستە بەڵگەو سەرچاوە لـە بارەی کۆنەشوناسی مادەوە تیایا نیە ، ئەگەر چی لـە بارەی زیندو کردنەوەو دۆزینەوەی باسـە مێژوییەکانەوە سودی لە سەرچاوەی تر وەرگرتوە ، بـەڵام بەشێوەی گشتی ئەم کتیبە تا رادەیەك خۆی بـەو بەڵـگەو سەرچاوانەوە بەستۆتەوە کـە لـە زمانەکانا ماونەتەوە ••وە ئەم شێوەی کتیبە هـەموی ئاراستە کراوە ،وە بـەر لە مێژوی کیشوەرو دەوڵەتی ماد تارادەیەك بـە هـاریکای کۆنەشوناسیە رون کراوەتەوە ،وە لە گرنگترین چاخی ژیانی ئەمپەراتورێتی گەورەی ماد ــ کە لەم بوارەی ئێمەدا زۆر جێگای بایەخدانە ــ شوێنەوارێك لـەو شـوێنەوارە باسکراوانەی [کۆنە شوناسی]نیە •

دانەر بە هیوایە کە لە دوا رۆژدا باسو بابەتی کۆنەشوناسیو نوسراوەی تر لەبارەی مێژوی مادەوە ــ جگە لەوانەی لەم کتێبەدا هەیە یان نیە ــ بکەوێتە بەر سەرنجو مەودای لێکۆڵینەوەی لێکۆڵەرەوەکان ،وە رەنگ بێ ئەم کتێبەش تارادەیەك لەم روەوە یارمەتیان بدات •

× ×

ئیستا جێگای خۆیەتی ئەگەر بمانەوێ لە بارەی شێوەی نوسینی ئەو ناوو زاراوانەوە ـ ئەو شێوەی کە لەم کتێبەدا بـەکار هاتوە ـ بدوێین ،بە شێوەی گشتی بەپێی ئەو رێبازە نوسینانەی کـە لـە هەرزمانێکی کۆندا جێگای خۆی هەیە ، بەلاّم شێوەی نوسینی وشە یۆنانیەکانی لێ بەدەر ئەکەین •

لە هەمو ئەو بەڵگەو سەرچاوانەدا کـە لـە زمانە جۆربەجۆرەکانەوەو وەرگیراوون ـ هەروەها ئـەو ناما‌نـەی کـە بـەو زمانانـە نوسراونەتەوە ـ مـەبـەسـت ئـەوە بوە کـــە خوێنـەران بتـوانن لـــە بـارەی رەسـەنو رەگـەزی ئـــەو زمـانـەو پـەیوەندی زمانـەکـانی تـرەوە تێ بگـەن •• دانەر لـەو باوەڕەدایـە کـە شـێوەی نوسـینی زمـانـە یۆنـانی یـەکـان بۆ ئەوانەی کە زمانی کۆن شارەزا نین بـە باشی ایێی تێ ناگەن •• هەروەکو ئەزانن کە زمانە یۆنانیەکان یان بەپیتی یۆنانی یان وەکو باو بوە بە پیتی لاتینی ئەنوسرایەوە کە رێبازی رێنوسی ئەو زمانـە لـە سەردەمی رۆژگاری رۆمی کۆنەوە وەرگیراوەو هاتوە • بەلاّم بەم شێوەیە بەکار هێنانی وشەی یۆنانی بۆ ئەو خوێنەرانـەی کـە شـارەزای میژوی زمانـە کۆنـەکان نەبن ،لـە کاتی سەرنجدانو بەراورد کردن دا لەگەل وشـەی ،زمانی مادو زمانو نامـەکانی تر ،وەکو یۆنانی کۆن ،لەوانەیە بە هەڵـە وەری بگرنو لێی تێنەگـەن ،بۆ نمونە ئەگەر خوێنەرێك شارەزای زمانـە لاتینیەکانو یۆنانی نەبێ لـە کوێ ئەزانێ [ئیپسیلون] « ئیگرگ » کە ئێمـە ئـەوە لـە شێوەی نوسینی لاتینیدا بە شێوەی [ i ـ ئای ]بە کار دێنین ،کە لە زمانی یۆنانی سەردەمی هردوتدا لـە جیـاتی [ ئو ] بـەکار هێنراوە وەیان [ زتا ] لـــە شـــێوەی نوسـینی لاتینیـــدا [ Z ]وەکـــو [ زد Zd ]بـەکار هاتوە ،وەیـان [خی]ی لاتینی [ ch ]نەك [ خ ] بەڵکو [ك] ی سـەرزاری aspire بـــەکـار هێنراوە ••بەمجۆرە ••••؟ ئەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کـە ئەم سەرچاوانە لەبارەی دیاریکردنی بەهای زمانەوانیەوە زۆر بە کەڵکن ،بەم هۆیەوە ئێمـە گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کـە بەپێی ئـەم خشتەی خوارەوە پیتە یۆنانیەکان بخەینەروو ••

## خشتەی ژمارە یەك

| پیتی یۆنانی | شێوەی کۆن | پیتی ناو کتێبەکە | پیتی یۆنانی | شێوەی کۆن | پیتی ناو کتێبەکە | پیتی یۆنانی | شێوەی کۆن | پیتی ناو کتێبەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Α α | a | a | Κ κ | k | k | Τ τ | t | t |
| Β β | b | b | Λ λ | l | l | Υ υ | y | u |
| Γ γ | g | g | Μ μ | m | m | Φ φ | ph | ph |
| Δ δ | d | d | Ν ν | n | n | Χ χ | ch | kh |
| Ε ε | e | e | Ξ ξ | x | ks | Ψ ψ | ps | ps |
| Ζ ζ | z | zd, z | Ο ο | o | o | Ω ω | o | ö |
| Η η | e | ē | Π π | p | p | Oυ | u | ou |
| Θ ϑ | th | th | Ρ ρ | rh, r | rh, r | | | |
| Ι ι | i | i | Σ σ ς | s | s | | | |

بەو مەبەستەی کە شێوەی نوسینەکان بەراورد کردنی وشـەی زمـانی ئاویستا لەگەڵ زمانەکانی ترا ئاسان بێ ،هەندێك لە وردەکاری ڕێنوسی ئاویستاو بەتایبەتی پیتە دەنگدارەکان کـە لەناو وشەکانا هـاتوە لابراوە هـەروەکو بۆ وشەی هئورواتات Haurvatàt ـ هروتات Harvatàt و لـە جێگای پایتی پاتیو •••• نوسراوە • [دیفتونگ]ەکان بـە پێی گرتنـە بـەرچاوی ریشەکانیان نوسراوە ـ ai ، لە جیاتی ae au ao •پیتی S [لە روی رەگەزەوە rT ] بە شێوەی rt بەکار هاتوە •لە زۆر شوێندا لە وشەی ئاویستاییو فارسی کۆندا شێوەی ئەسڵی یەکە [بە خەتێکی پێکەوە لکاو لە دوای وشەکەوە]لـە جیـاتی ( فاعل ) nominatif هـــاتوە • ل نوسینی زمانەکانی ترا بۆ لەهەندێك حاڵاتدا پیتە بێدەنگەکان aspire مان بەکار هێناوە ، پیتە یۆنانیەکان لـەناو نوسراوە لاتینیەکانا تـەنیا بۆ بەکار

هێنانی پیته بێ دەنگەکانی گەرو بەکار هێنراوە ٠٠وەکو لە جیاتی **Th** ی ئینگلیزی دەنگدار Th ی شاردراوە لەژێر زمانەوە هاتوە ،یان لـە جیاتی [گ]ی روسی لە وشەی Bogotily کە لە نیوان [غ و گ]دا بەکار دێ لەگەل (غ)ی ئازربایجانیدا کە مەبەست (غ)ی سووکە ـوەکو لە ئازربایجانی سوڤیەت پێی ئەنوسن وە X « خ »کە لە زمانە سامیەکانا بە شێوەی h پیتی « خ » قایمتر لە زمانی روسی بەکار ئەهێنرێ ٠ بەلام B دەنگێکە لـە نێوان [ب] و [ W ] ی ئینگلیزیدا(*) ٠

---

(*) رەنگە بێ گۆرینی ئەم [پێشەکیە لە بارەی دانەرەوە] تارادەیەك دەقاندەقی رونوسە فارسیەکە نەبێ لەبواری زمانو نوسینەوەی لێکۆلینەوەی پیتە دەنگدارو بێدەنگەکانەوە ، ئەویش هۆی ئەوەیە شێوەی چەند پیتێکی یۆنانیو روسی تیا بوو کە لە بواری چاپەمـەنی ئێمـەدا ئـەو پیتـانە دەست ناکەوێ ، لەبـەر ئـەوە ئەوەندەی کـە بۆمـان کرا چوینـە ناو باسەکەوە ٠٠

ـ وەرگیر ـ

# مێژووی ماد

## ئی .م . دیاکۆنۆف

کۆمەڵە باسو بەسەرهاتێکی مێژویی
بنچینە کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیو
ئیداریەکانی مادە ... ئەو سەرچاوانەی
تا ئیستا دەست دیاکونوف کەوتون
ئێمەش کردمان بە کوردی چونکە
کردنەوەی چەند گرێیەکی ئاڵۆزی
جوگرافیای مێژویی رۆژهەڵاتی کۆنە .
- وەرگیر -

٥

# پێشەکی یەك
# بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی ماد

## ١ ــ سەرچاوە لێ وەرگیراوەکان :

نوسین لــە بارەی مێژوی مادەوە شتێکی ئاڵۆزو گرانە ، چونکــە تاکو ناوەراستی سەدەی رابوردو مەسەلــەی مــاد وەکو مەســەلەو بــەسەرهــاتی کیشوەرەکانی تری رۆژهــەڵاتی کۆن وا بوەو باسی روداوەکانی وڵاتی مــادو دراوسێکانی تەنیا بریتی بون لە زنجیرەیەك باسی ئەفسانەو سەرزارەکی کە لە زمانی مێژوونوس‌و نوسەرە یۆنانیە کانەوە ئەیان گێڕانەوە لەگەل ئەوەی لــە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا بە هۆی ئەوەوە کــە زانیاری مێژوو بوو بــە خاوەنی چەندەها بەڵگەو نوسراوەی کۆن‌و دۆزینەوەی شوێنەواری کۆن لــە ژێر زەویدا ••بەڵام هێشتا بەسەرهاتی ماد نەیتوانیوە وەکو دەوڵەت‌و وڵاتەکانی تر لە مەیانی زانیاری‌و پێشکەوتنی زانیاری مێژودا کــەڵك وەربگرێ •تــەنیا ئەمەندە بەسە کە بڵێین تا ئیستا شوێنەواری شارو شارستانیەتێکی کۆنی مادەکان لە ژێر زەویدا بــە رونی نــەدۆزراوەتەوەو تــەنانەت شــوێنەواری نوسینێکی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی مادەکان بــە دەستەوە نیە ••بۆ ئــەوەی شــارەزای

بەسەرهاتەکانی مادو دەوڵـەتی مادەکان بین ـ هەروەکو سەد ساڵ لەمەوبەر ـ سود لە سەرچاوە بێگانەکان وەرئەگرین لەگەل ئەوەشدا کـە لە ناوەڕاستی سەدەی رابوردودا سەرچاوە بزماریە [میخی] یەکان گەیشتۆنەتە شان بەشانی سەرچاوە یۆنانیەکان •

بەلاّم لە بارەی سەرچاوەکانی کۆنە شوناسییەوە با ئەوە بزانین کە لـە ناوچەکانی ئازربایجانی شورەوی چەند شوێنەوارێکی هەڵکەندراوی زانستیانە دەست کـەوتوەو ئیستاش بەردەوامـە • ئـەمانە تارادەیەك ئەبنە هۆی سـود وەرگرتن بۆ ناسینو زانیاری لەبارەی مادەکانەوە • هەرچەند ئەم سەرچاوانەش بەڵگەی راستەوخۆ نادەن بەدەستەوە بەلاّم هەر سودیان لێ وەر ئـەگیرێ •• لەگەل ئـەوەدا کـە شارستانیـەتو رۆشنبیری مـادی کۆنو ئالبـانی کۆن[1] تارادەیەك لە یەکترەوە نزیك بون ،وە لەوانەیە کـە خەڵکەکانیشیان هـەریەك نژاد بووبن ،بەلاّم نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە لە گەلێك بابەتدا بنچینەیەکی ئابوری هاوبەشیان نەبوە ،ئینجا لـەبەر ئەوە ناتوانین بـە تەواوی شارستانیەتو روشنبیری مـادەکـان بـەشـان بـەشـانی رەوتـی شـارستانیو رۆشـنبیری ئالبانیەکان دابنێین •

لەو بەری ئاراسەوە[2] گەلێك شوێنەورای هـەڵکەندراو لـەناو دەرونی هەندێك لە گردۆڵکەکانا دۆزراوەتەوە ،وەکو [گردی حەسار لە نزیك دامغانو گردیسیلك لـە نزیك کاشانو گردی گیان لـە نزیك نهاوەندو گردیتەپە لـە نزیك ورمێو .چەندشوێنێکیتر] •• ئـەمانـەش بـە هۆی تەقـەللادانی کۆنەشوناسە فەرەنسایيو ئەمەریکاییەکانەوە دۆزراونەتەوە ، شوێنـەوارەکانی ئەو دیو سنور رواڵەتێکی مێژویی سـەردەمی مادەکان نیشان ئـەدا ،وە ئـەو

(١) ناوێکی کۆنی ناوچەی کوێستانی قەفقازی رۆژهەلاّتە لە قەراخ دەریای خەزەر کە ئیستا بەشیکە لە ئازربایجانی شورەویو داغستان •

(٢) بە زمانی نوسەرەوە وتراوە •

شوێنەوارانەی کە دۆزراونەتەوە لە چاخی رۆژگاری کۆمەلآیەتی کۆچەرەکان ئەچن •

ئێمە لە بارەی چۆنێتی ئەو شوێنەوارانەوە کە دۆزراونەتەوە دوایی باسی ئەکەین[1] جارێ خۆمان بەو نووسینو شوێنەوارە کەمانەوە خەریك ناکەین •

گەورەترین قۆناغی مێژوی مادی کۆن ــ لە سەرەتای دروست بوونی چینە کۆمەلآیەتیەکانی کۆمەڵگای ناوبراو تاکو دامەزراندنی ئەمپەراتۆرێتی گەورەی مادو دوای ئەوەش دروست بونی سەڵتەنەتی [ماد ــ ئاتروپاتین] ــکە بە هۆی سەنەدو شوێنەواری نوسینەوە [بەزۆری] رونو ئاشکرایە ••ئەوە باس ئەکەینو لە ناو چوارچێوەی ئەو بەلگانە بەدەر ناتوانین شتی تر بلێین •

لەبارەی هەندێك لە قۆناغەکانی رۆژگاری مێژوی لەشکرکەشی بە دریژی لەدەستدایە ، بەلآم بەشەکانی تر کە لە چەند سەرچاوەیەکی جۆر بەجۆرەوە بە چەند زمانێکی جیاواز نوسراوون کەموزۆر بە سودن پێویستە [بۆ ئەوەی سودیان لێ وەر بگیرێ] بەرابەری بکرێن •

ئەو شوێنەوارانەی کە بە خەتی بزماری هەیە زۆرتر لە سەرچاوەکانی پر بەلگەی بەسەرهاتەکانی قەڵەمڕەوی مادەکانمان ئەدەنە دەست •• ئەوپەڕی سنوری رۆژئاوای ماد ئەگاتە پاینی کێوەکانی زاگروس لە دیدەگای سۆمەریەکان •• هەروەها [هوریت]ەکان عیلامیەکانو دوای ئەوانیش بابلیەکانو ئاشوریەکان ــ هەمو مێژوی ئەمانە ــ لە هەزارەی سێیەمەوە تا سەدەکانی دوایی پێش زاینی بوە • هەروەها سەرچاوە نوسراوە بزماریەکان گەلێك رووی ناوچەکانی ناو خۆی مادمان بۆ رون ئەکەنەوە ، [بە تایبەتی] وەکو سەرچاوەی ئاشوریەکان کە لە بارەی رۆژگاری کۆتایی سەدەی نۆهەمی پێش زاینییەوە دەست پێ ئەکاتو لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا کۆتایی پێ دێ • دیسانەوە رۆژگاری شەڕو شۆڕو مێژوی لەشکرکەشیو لێکدانی ئاشوریەکانو مادەکان بەر لە دامەزراندنو بنج بەست بونی ئەمپەراتۆرێتی مادەکان تارادەیەك رون ئەکاتەوە •

**ئێستا نەختێك بەدرێژی لەبارەی چەند شوێنەوارێكی بزماریەوە ئەدوێین :**

سەرچاوەكانی سۆمەریو ئاكادی كۆن تارادەیەك بە هۆی داگیر كردنی [بین النهرین]ی خوارو ولاتی (میسۆپۆتامیا) بە دەست هۆرەكانی گۆتی‌یەوە كە لە سەر زەوی ماد پەرپا بوون ،وە هەروەها بەهۆی لەشكركەشی پادشایانی سومەریو ئاكادەوە بۆ ناوچەكانی زاگروس كۆنترین زانیاریمان لە بارەی كیشوەری مادەكانەوە ئەدەنە دەست • ئەمانەی لە خوارەوە باسی ئەكەین بەشێكن لەو سەرچاوانە : زنجیرەی ناوی فەرمانڕەوایانی گۆتی كە پێیان وتوە [ناوەڕۆكی سەڵتەنەتی سۆمەریەكان] لە زانیاری رەسمیەوە وەرگیراوە (٢)•• بەیت هەڵدان بە شەڕو شۆرەكانی ئوتوهگال پادشای سۆمەریەكان لە شاری ئوروك لەگەل تیریكان پادشای گوتی (٣) ، یادداشتی ئەو روداوانەن كە بە ناو [غەیب زانەكان] لەو بارەیەوە قسەیان لێ كردوەو (٤) هەروەها روداوی گۆتی‌یەكانو دراوسێو لۆلۆبیەكان كە لە چیاكانی ماددا نیشتەجێ بون ئەوەمان بۆ رون ئەكەنەوە كە لە ولاتی [بین‌النهرین] ناوی ساڵەكان نەبوە ،وە ساڵەكانیان بە ناوی روداوی گرنگی ئەو ساڵەوە ناو ئەنا •• ئینجا لەبەر ئەوەیە روداوە لەشكر كەشیەكانی پادشایانی سۆمەرو ئاكاد بۆ چیاكانی زاگروس‌وو (٥) •••هتد • وەكو زانراوە لە هەزارەی سێیەم وە یاخود لە كۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا بوە ،بەلاّم سەرچاوەی ئێمە لە بارەی هەزارەی دوەمی پێش زاینی‌یەوە شوێنەوارە بزماریەكانی عیلامو ئاشورە •

شوێنەواری عیلامیەكان بریتین لە نوسینەكانی پادشایانی عیلام [سوزانی یا خوزستانی ئیستا لە خواروی رۆژئاوای ئێرانەوە] كە بە زمانی ناوچەیی عیلامیو هەروەها زمانەكانی ئاكادیو سۆمەری رێك خراوە • بە داخەوە كە لە نووسینەكانی پادشای شیلهاك ــ ئینشو شیناك ــ [سەدەی دوازدە هەمی پێش زاینی] تێپەڕین ، نوسینەكانی تر زوربەیان لە بارەی ساختومانو پەرستگاو كۆشكو هەوارگەو ناوی پادشاهانو پیاو ما قوڵانی دەورو بەریانەوەیە ،

سەرچاوەی میژوویی‌یان زۆر کەمە ،هەندێك بەڵگەی دەوڵەتی‌و راپورت‌و رونوسی حیسابی‌و دارایی‌و ئابوری بە زمانی عیلامی لە سەردەمی یەکەمین پادشای هەخامەنشی‌یەوە [لە سەدەی شەشەم‌و پینجەمی پێش زاینی دا]هەیە • ئەو ناوە تایبەتیانەی کە لەم راپورت‌و رونوسە حیسابیانەدا هەن ، تا رادەیەك یارمەتی ئەوە ئەدەن کە نژادی ئەو خەڵکانە بناسین کە لە دەورو بەری ماد ژیاون‌و شارەزای هەندێك لە نەریت‌و رەفتاری رۆژانەیان ببین (٦) •

سەرچاوەی بزماری ئاشوریەکان لە بارەی هەزارەی دوەمی پێش زاینی‌یەوە زۆر کەمە(٧) ئەوەش کە هەیە تەنیا لە نوسراوەی باسی پادشاکانایەوە دەربارەی نەریت‌و ئاینەوەیە ، بەلاّم بە شێوەی گشتی باسی سەرکەوتنی پادشایان ئەگێرنەوە •• لەو نوسراوانەی کە باس کراوون لەبارەی ئەو کێشوەرو هۆزانەوە کە لە رۆژهەلاّتی ئاشوریەکانا ژیاون شارەزاییەکی کەممان دەست کەوتوە ،بەلاّم بەهیچ جۆرێك لە بارەی روداوو پێش هاتە میژوییەکانەوەو جۆری ژیان‌و رۆشنبیریتی‌و پەروەردەو شارستانێتی ئەو هۆزانەوە هیچ زانیاریەکیان تیا نیە • بەلاّم نوسراوە ئاشوریەکان لەبارەی سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی بە جۆرێکی ترە(٨) • هەندێك لەوانە بە درێژی‌و بە زمانی شیواو لەبارەی ئەو کیشوەرانەوە کە هوردوگاو جێگای شەڕو شۆری ئاشوریەکان بون زانیاریەکی فراوانمان ئەدەنە دەست •• [بەداخەوە کە ئەو نوسراوانە لە بارەی ئەو ولاّتانەی ئەو دیو سنورەوە کە لە ژیر قەڵەمڕەوی لەشکرکەشی پادشایاندا بووە هیچ باس ناکەن] •

**نوسراوە ئاشوریەکانی ئەم سەردەمە ئەکرێن بە چەند بەشێکەوە :**

**١ ـ ئەونامانەی بۆخوا** : چەند راپۆرتێکی دورو درێژە لە بارەی یەکێ لەو لەشکرکەشیانەوە کە بە ناوو نیشانی پەرستگای خوای گەورەی ئاشوریەوەیە • ئەم راپۆرتانە نوسەرە لێهاتووەکان رێکیان خستوون ، لەبەر رۆشنایی ئەو یادداشتانەی یاوەرو میرزایانی پادشادا نوسراون •• یەکێ لەو

نامانە لەبارەی لەشکرکەشی سارگونی دووەمەوەیە بۆ سەر [ئورارتو] کە لە ساڵی ٧١٤ی پێش زاینیدا بووە • وە پەیوەندیەکی راستەو خۆی بە مێژوی مادەوە هەیە •

٢ ـ **ساڵنامەکان** : یا بەسەرهاتی لەشکرکەشی ساڵانەی پادشاکانە کە لەبەر راپۆرتە سەرەتایی یەکانا بە کورتی رێکخراوە ، هەندێك باسیان کورت کراوەتەوەو بەلاّم بەلایەکدا هەر دا ئەتاشن •

٣ ـ **نوسراوە گشتی‌یەکان** : کۆمەڵە باسێکی لەشکرکەشی پادشایەکە لەچەند شوێنێکی جوگرافیاییدا ، بە بێ پێش کەوتن‌و پاشکەوتنی مێژوویی ••

٤ ـ **سەرکەوتن نامەکان** : تەنیا بە کورتی باسی سەرکەوتنەکان ئەکەن‌و گرنگی بە لایەنی شێوەی ریزی نوسینەکان نەدراوە •

جگە لە نوسراوەکانی بەشی یەکەم کە وەکو نوسینی بزماری سادە لەسەر روی سواڵەت نەخش کراون ، نوسینەکانی تر لەسەر ئەستون‌و سواڵەت‌و روی بەرد نەخش ئەکران‌و لە شوێنێکی دیاری کۆشك‌و ساختومانەکانا دائەنران •• [بانیان] ئەوەیان ئەزانی کە وەختێك ئەم ساختومانانە کۆن ئەبن [ لەو وەختەدا هەمو کۆشك‌و ساختومانەکانی (بین‌النهرین) لە خشتی کاڵ دروست ئەکران] •• وێران ئەبن ، یەکێك لە پادشایانی ئاینده کە بیەوێ ئەم شوێنەوارە کۆنانە بکاتەوە لەو شوێنەوارانەدا ئەم نەخش‌و نوسراوانە ئەدۆزنەوەو بەم جۆرە باسی رەووشت‌و نەریتی کۆمەلاّیەتی‌و ژیانی پادشایان بە پارێزراوی ئەمێنێتەوە ••سەرکەوتن نامەکان‌و باسی شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەو ئازایەتیەکانیان لەسەر بەرد نەخش ئەکردو لە شوێنێکی دیاری ساختومانەکەدا دایان ئەناو ئەیان چەسپاند(٩) •

پیویست ناکات کە باسی ئەوە بکەین ئەم نوسراوانە لە بارەی شەڕو شۆڕو لەشکر کەشیەوە لایەنی لایەکیان گرتوە ، یا چون باسی شان‌و

شەوکـەت‌و قودرەتی پادشـایانی ئاشـوریان کـردوە ••وە تێکشـکان‌و ژێر کەوتنەکانیانی تارادەیەك کردوە بە ژێر چمکەوە ،لە بارەی سەرکەوتنەکانیانەوە زیادە رۆییان کردوە ، لەگـەل ئـەوەشدا ئەتوانرێت بـە سـەرنجێکی وردی مێژووناسانە راسـت‌و درۆکان لێك جیـا بکرێنـەوە • لـە کاتێکدا کـە باسی لەشکرکەشی‌و سەرکەوتنی ئاشوریەکان ئەکات لە هەمان کاتا ئەتوانرێ هەندێ زانیاریش لە بارەی ژیانی ناو خۆی ئەو تیرەو هۆزانەوە وەر بگیرێ کە لەگەل لەشکری ئاشوریەکانا کەوتونە شەڕو شۆرەوە •یان ئـەگەر ئاشوریەکان لـە شوێنێکدا بە تەواوی شـکا بن [سا بەهەر هۆیەکەوە] ئەگەر ئـەم نوشوستی‌و تێك شکانە نەنوسرابێ ئەوا مەسەلەکە لەویادا زۆرتر ئەئاڵۆزێ‌و لـەم بارەیەوە هیچ زانیاریەکی مێژویی دەست ناکەوێ ،بـەلام لـە هـەندێك شـــوێنی ترا سەرچاوەو زانیاری تر یارمەتی ئێمـە ئـەدات ••وەکو نوسراوە دەولەتیەکانی پادشایانی ئاشـــور ، راپۆرت‌و کورتـەی راپورتی جـاسوسـەکان‌و زانیـــاری پەرێوەبەری‌و سوپایی هەمەجۆرە ،رونوسی یادداشتەکانی پادشاهان ، نوسراوەی سیاسی‌و هەمە چەشنەی تر •بەشی زۆری ئەم بەلگە بـەنرخ‌و راستانەمـان لـە بارەی نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەم‌و سەدەی حـەوتەمی پێش زایینەوە بـە دەستەوەیە •بەلام داخەکەم کە بەشێکی کەم لەم بەلگەو نوسراوانە لە بارەی مادەکانەوەیە ،ئـەم بەلگانە بـە شێوەی گفتوگۆیی ئاشوری ـ زمانی ئاکادی ـ یەوەیە •• کـــە تا ئیستا کـەمتریان لێ خوێندراوەتەوەو لێ تێ گـەیشتنیان زۆر گرانە[١٠] • لەوە ئەچێ گفتوگۆی پادشایانی ئاشـــورو پاڕانەوەیان لـە خواو چاوەڕوانی وەلامیان‌و چەند مەسەلەیەکی هـەمەجۆرەی سیاسی بن کـە مەترسی بۆ ئاشوریەکانی تیا بێ‌و باسی ئـەو روداوانەبێ کـەهـەڕەشەیان لـە ئاشور کردوە[١١] •کـە لـــەم کاتـەدا نوشوستی سیاسی پادشایانی ئاشــــور دەرئەکەوێ ••ئەو شتانەی کـە پەیوەندی بـە ڕوداوی ولاتی مادەوە بووەو پەیوەندی بەسەردەمی سەلتـەنەتی دو پادشاوە واتا [ئاسار خاردون] و [ئاشــور

بانیپال] له ساڵه‌كانی [٧٠ـ٥٠ سه‌ده‌ی حه‌وته‌می پێش زاینی] ده‌ست ئێمه كه‌وتوه ،به‌ڵام داخه‌كه‌م هه‌موبان ون بوون . زیندو كردنه‌وه‌و رون كردنه‌وه‌ی روداوه‌كانی ئه‌م قۆناغه له‌روی مێژووه‌وه كارێكی زۆر گرانه(١٢) .

سه‌رچاوه ئاشوریه‌كان له سیه‌كانی سه‌ده‌ی حه‌وته‌می پێش زاینیدا له‌م روه‌وه ده‌ست ناكه‌ون .ناوه‌رۆكی سه‌رچاوه ئورارتوییه‌كان زۆر له ناوه‌رۆك‌و ناواخنی سه‌رچاوه ئاشوریه‌كان ئه‌چن .ئه‌وانیش بریتین له‌و نوسراوانه‌ی كه پادشایانی ئورارتو له‌سه‌ر روی به‌ردو كێلی قه‌بره‌كان‌و كۆشكه‌كانیان هه‌ڵیان كه‌ندوون .هه‌ر كۆشكێكیان كردبێته‌وه سه‌ركه‌وتنێكیان له‌سه‌ر هه‌ڵكه‌ندوه . هه‌روه‌ها نوسراوه ساڵنامه‌ییه‌كانیان له‌باره‌ی وشكی‌و قات‌و قڕی‌یه‌وه زۆر له نوسراوه ئاشوریه‌كان ئه‌چن .ئه‌م به‌ڵگانه روداوه‌كانی سه‌ده‌ی هه‌شته‌می پێش زاینی له‌ناو سنوره‌كانی وڵاتی ماد نیشان ئه‌ده‌ن‌و تاراده‌یه‌ك رونیان ئه‌كه‌نه‌وه . به‌ڵام تێگه‌یشتن له‌و نوسراوانه كه به زمانی ئورارتویی نوسراون زۆر زه‌حمه‌ته‌و بۆ ئه‌مڕۆ گیروگرفتی زۆری هه‌یه(١٣) .

روداوه‌كانی ناو ساڵنامه‌ی بابلیه‌كان ئه‌وانیش زانیاریان لێ وه‌ر ئه‌گیرێ‌و سودیان هه‌یه ..یه‌كه‌مین روداوی نیگاری ناوبراو له باره‌ی هه‌زاره‌ی دووه‌می پێش زاینیه‌وه‌یه ، به‌ڵام ئه‌م به‌روارانه له‌وه ئه‌چن له سه‌رده‌می سه‌ڵته‌نه‌تی [نابونصر] له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی هه‌شته‌می پێش زاینیدا وه‌كو ساڵنامه رێك خرابن . زنجیره‌ی روداوی مێژویی تا كۆتایی سه‌ده‌ی سێیه‌می پێش زاینی نه‌پچڕاوه ..به‌ڵام به‌شێك له‌و نوسراوانه به ده‌ستی ئێمه گه‌یشتوه ، له‌كاتی مێژوی [ماد]دا ـ له كه‌له‌به‌ری نێوان ساڵه‌كانی ٦١٦ و٦١٠ ی پێش زاینی ـ «مێژوی گد» وه ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی شه‌شه‌می پێش زاینی [مێژوی وابونید] به‌گرنگی باسی ئه‌كه‌ن .

روداوه مێژوییه‌كان له‌و ماوه‌یه‌دا وه له لایه‌ن ئه‌و مێژوانه‌وه به شێوه‌یه‌كی زۆر وشك‌و كورت‌و بچڕ بچڕ باسیان لێوه كراوه ، به‌م هۆیه‌وه

رووداوە بچوکەکان لەناو چون[١٤] •

جگە لەمانە ناوەڕۆکی رووداوە نیگاریەکان ، نوسراوەکانی پادشایانی بابل کە بە شێوەیەکی رەوان نوسراون ئەمانە بەڵگەیەکی زۆر بەکەڵکن[١٥] •
ئەمانە بە پێچەوانەی نوسراوە ئاشوریەکانەوە شتێك لە بارەی سیاسەتی دەرەوەیان تیا نیە وە ئەگەر بێت زۆر کەمە •بەلاَم لە هەندێك بواردا کە پەیوەندی بە ئاین‌و ساختومان سازیەوە هەیە جاربەجار پەنجەی بۆ مەسەلەی [بابەت] سیاسی راکێشاوەو بۆ بەڵگە ئەیان هێنێتەوە •

هەندێك لە نوسینەکانی [تەورات] کە هاوچەرخی رووداوەکانی مادبووە ئەوانیش بە بەشێك لەو بەڵگەو سەرچاوانە ئەژمێردرێن ، لە هەمویان گرنگتر ئەو پەندو ئامۆژگاری‌و وتانەی واعیزەکانن وەکو نەبی ناحوم لە کۆتایی سەدەی حەوتەم ەوە نەبی ئەرمیاء لە سەرەتای سەدەی شەشەم و••] کەئەتوانرێ جیا بکرێنەوە •

ئەو لێکۆڵینەوانەی رووداوە ئاینی‌و میژوویەکانی تەورات کە پێی ئەڵێن : [نوسراوی پادشایان] کە ئاشکرایە لە سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا نووسراوون‌و لە دواییدا بەناوی [میژوی رۆژەکان]ەوە دەستکاری کراون ، ئەوانەمان دەست کەوتوە •

بەسەرهاتی رۆژگاری ماد لەژێر دەسەلاَتداریتی ئەمپەراتۆریتی هەخامەنشیەکانا لە نوسراوە سێ زمانیەکانی[١٦] هەندێ پادشایان‌و هەروەها نوسراوەی گەورەی داریوشی یەکەم لە روکاری بێستون ئاوێنەی یەکترن ••لە نوسراوەی دوەمدا لە بارەی لەناوچونی دەسەلاَتی [گئوماتای مغ]ەوە بە دەستی داریوش وە ئەو رووداوانەی کە دوا بە دوای ئەوا هاتوون لە ساڵەکانی ٥٢١ و٥٢٢ی پێش زاینی[١٧] رویداوە قسەی تیا رۆیشتووە ،لەناو چوە •
ئەم بەڵگەو سەرچاوانە لەبەر ئەوە کە لە سەردەمی رووداوەکانی مادا نوسراون نرخدارن ، بەلاَم سەرچاوەکانی دەستەی دووەم کە زوربەیان بەزمان گێردراونەتەوەو بە دەمی بلاَو بونەتەوە لە بەر ئەمە ئەوانە جێگای باوەڕ نین‌و

رخیان کەمترە ..بایەخی ئەمانە لە لایەك بەستراوە بە واقیعی باسەکەوەو لـە لایەکی تریشەوە بە ویژدانو ئـەمانەت پەروەری ئـەو کەسەوە کـە باسـەکە ئەگێڕێتەوە ،ئەمانە ئەکرێن بـە چەند بەشێکەوە ،نوسـەرە کۆنـەکانی یۆنان ئەکەونە ریزی یەکەم لە چوار چێوەی کۆمەڵی دواییدا •

یۆنانیەکان لە سەردەمی شـەڕی یۆنانو ئێرانیەکاندا ـ لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا ـ ئاشنایەتیەکی باشیان لە بارەی مێژوی رۆژ هەڵاتەوە پەیدا کرد [لەو شەڕانەدا لەشکری مادەکانیش بەشداری کردوە] ••یۆنانیەکان کە بیریان لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی گەورەی هـاوڕێی خۆیان ئەکردەوە ، بێ پـەروا پەنایان ئەبردە بەر رۆژگاری کۆنو سـەردەمی هـەخامەنشیەکان • بـەسـەر چۆنێتی مێژویی مادو ئاشوریەکانا تێئەپەڕین •

یۆنانیەکان لەبارەی ئاشوریەکانەوە زانیاریو بیروڕایەکی پڕ لـە ئەفسانەو هیچو پوچیان بو ، بەسەرهاتی مێژویی ئاشوریەکان لەناوا نەمابوو ،خوێندەوارانی وڵاتی ئاشورو پیاو ماقوڵانی ئەو چەرخە لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا لـە ناو چوبون •بەڵام چۆنێتی رۆژگاری ماد بەو جۆرە نـەبوو ،هێشتا نەوەی زۆر لە نێوان بنەماڵە بەرزەکانی ماددا هەبو کـە بەشداری ژیانی سیاسی وڵات بونو زوربەیان لە ئەمپەراتورێتی هەخامەنشیەکانا جێگاو مقـامی بەرزیان بـە دەستەوە بووە •هەروەها گەلێك لەمانەش لەگەل یۆنانیەکانا پەیوەندییان هەبو ••لەبەر ئەوە ئەبێ بڵێین کە لەو کاتەدا هێشتا بەڵگەو سەرچاوەی رەسمی دەوڵەتی مـاد لەلایەن دەرباری هەندێ پادشاها نەوە ئاگاداری ئـەکرا لـەم رێگەوە لەگـەل یونانیەکانیش پەیوەندییان هەبوو •

داخەکەم یۆنانیـەکان دەستیان بـە سـەرچاوەکانی دەرباری سـەڵتەنەتی هەخامەنشیەکان نەئەگەیشت ،وە دیسانەوە لە کاتێکدا کە ئەسکەندەر لە سێیەکی دوایی سەدەی چوارەمی پێش زاینیدا ئەمپەراتۆرێتی هـەخامەنشیەکانی تێك داو داگیری کرد هەمو ئەو نوسراوانەی دەرباری شاهی لەناو چوون •

له بارەی سەڵتەنەتو کیشوەری مادەکانەوە چەند زانیاریەکی تاکە تاکە لە نوسینەکانی نوسەرە یۆنانیەکانی سەدەی پێنجەمی پێش زایینی هەیە ••وەکو هکاتی میلتیو هارون لامپساکی دیونیس میلتی کە لەبارەی داریوشی یەکەمەوە•• نووسیویانە ••هەروەها کسانت لیدیائی نوسەری [میژوی لیدیا]یەکان [دەوڵەتێك بوە لە ئاسیای بچوك]،کە لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەم ژیاون ، ئەمانە لە بارەی مادەکانەوە شتیان وتوە[١٨]،هەلانیك نوسەرو میژونوس دروست بونی ماد ئەبەستێ بە نووسراوی قارەمانانی ئەفسانەکانی یۆنانەوە بەلام لە نوسینەکانی ئەمانە تەنیا چەند پارچەیەك ماوە کە لە شوێنو نوسینی نوسەرەکانی دوای خۆیانەوە بەجێ ماوون •• جگە لەمانەش چەند نوسراوێك لە پیشانگا نامەیەکی تراژیدی (ئاخیل) ــ دا ماوەتەوە[١٩] ، بەلام لە بارەی ڕێکخستنی تەواوی میژوی مادەوە یەکەمجار میژونوسی گەورەی یۆنانو دامەزرێنەری زانیاری میژوو [هردوت هالیکار ناسی] لە نیوەی دوەمی سەدەمی پێش زایینیدا هەوڵو کۆششێکی زۆری داوە[١٩] (دوبارە) •

هردوت کە گۆیا بە هۆی چەرمە سەرێی سیاسەتەوە ناچار بووە وڵات بەجێ بهێڵێو لە تافی لاویا گەلێك وڵاتان گەڕاوە ، سەری لە بەشی زوروی کەناری دەریای ڕەشو ئاسیای بچوكو فنیقیەو میسرو بابل داوەو لەوانەیە سەرزەمینی مادو پارسو دوایی ئەمانەش چووە بۆ مەقدونیە • ناوبراو لەم گەشتو سەردانەیا چەند نوسینێکی لە بارەی میژوی نەریتو ڕەووشتو هەستانو دانیشتنی ئەم کیشوەرانەوە نوسیوە•وەکو لای هەمو کەس باوە ئەڵێن لە دەوروبەری ساڵی ٤٤٧ی پێش زایینی چووە بۆ ئاتن وە لەوێ لە شوێنە گشتیەکانا نوتقی ئەداو قسەی بۆ خەڵك ئەکرد ،وە لەو ئاهەنگانەدا کە ڕۆشنبیرانو ئەدیبان لە شاری ئاتن سازیان ئەکرد [کە لەو ڕۆژگارەدا ئاتن بو بو بە مۆڵگەی ڕۆشنبیرانو ئەدیبانو دیموکرات خوازەکان] بەشداری ئەکردن •• [ئەگەرچی هردوت خۆی مرۆڤێکی دیموکراتی مام ناوەندی بوو] • ناوبراو لەم

ئاهەنگانەداو لەبەر تیشکی روناکی لێکدانەوەی خۆیا یادداشتی رۆژانـەی خۆی ئەنووسی‌و بە وێنەی مێژوی گەورەی ئاسیاو ئەوروپا کۆی ئـەکردنەوەو لێکی ئەدان • بە تایبەتی ئـەتوانین مێژوی شـەڕەکانی یۆنان‌و ••• دراوسێکانی بـە رونی لـەوەوە وەربگرین ، لـە خواروی ئیتالیاو قوریا [کـە خۆی بـۆ دامەزراندنی ئەو زۆر هـەوڵی دا] ،بۆ ئـەوەی مێژوەکەی تەواو بکـات زۆر تێکۆشاوە •• لە دەوروبەری سـاڵی ٤٢٥ی پێش زاینی هـەر لـەوێ لـە دنیا دەرچووە ، بـەڵام وەکو خۆی ئـەیویست نـەیتوانی بـە ئـاواتی نوسینەکـانی خۆی بگات •

لە ئەنجامی ئەو هەوڵ‌و تەقەللایەی کـە بە شوێن دۆزینەوەی بەڵگەو شوێنەواری ئەو سەردەمەدا دراوە ئەوە ڕون بۆتەوە کە ئەگـەر چی هردوت سودی لە نوسینەکانی پێشونان وەرگرتوەو بەتایبەتی تێکەڵی لەگەل نوسینەکانی هکاتەو هلانیك‌و دیونیس‌دا بوە ، بـەڵام بـەشیوەی گشتی لـەبارەی نـوسینی کتێبەکەی خۆیەوە پشتی بەو لێکۆڵینەوەو پرسیار کردن‌و وتەی سـەرزارەکیانە بەستوە کە لـەگەل خـەڵکا کردوێتی •• بۆ نمونـە لـەبارەی مێژوی [ماد]ەوە بەبیروڕای ئەوانەی کە خەریکی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەبون گوایە ئەو سودی لە قسەی خانەدانەکان وەرگرتوە ،بە تایبەتی [زوپیر] •••

لەو کاتەدا زوپیر لە ئاتن ژیاوە ،وە رەنگە بێ لە وتەی یەکێ لە نەوەی هارپاك [کە یەکێ لە گەورە پیاوانی ماد بووەو (٢٠) سـەد سـاڵ پێش لـەوە نەخشێکی شومی لە تێکدان‌و لەناوچونی سەڵتەنەتی مادەکانا دیاری کردوە]سودی وەرگرتبێ[٢١] •• قسەی لێوە ئەکەن کە بنەماڵەی خانەدانی هارپاك لە دوایدا لە ناوچەی لیکیە ـ ئاسیای بچـوك ـ لەنزیك زادەگـای هردوت نیشـتەجێ بووبن ، وە لـەوێ ملك‌و ماڵیان بووبێ[٢٢] ، بـەم جۆرە شارەزاکان توانیویانە زانیاری شێوەراست بـە تایبەتی لـە بارەی داستان‌و بـەسەرهاتەکانی بنـەماڵەی خۆیانەوە بە هردوت بدەن •

بەڵام لە بارەی نوسینەوەی ئەم روداوانەوە پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێ کە هردوت [باوکی میژو] زۆر بە ئەمانەتەوە باسەکانی نوسیوە • لە هەندێك جێگادا کە لە بارەی بەسەرهاتێکەوە چەند جۆرێك بەڵگەی دەست کەوتوە بەراوردی کردونو ئەوەی کە لە هەمویان زیاتر لە راست چووە [بە پێی بیری خۆیو رۆشنایی سەرچاوەکان] ئەوەی دیاری کردوەو هەڵی بژاردوەو نووسیوێتی • هردوت خۆی لەو باوەڕەدا نەبوە کە هەر باسێکی لە هەرکەسێکەوە وەر گرتبێ ئیتر ئەوە بە تەواوی راستە ! [ئیتر ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە کاروباری ئەو سەردەمەی پارسەوە بووە بەو جۆرە بووە] • نوسینەکانی ئەو نازە ترین بەڵگەی کۆنە شوناسیو رۆژهەڵات شوناسییە کە لە بابەتی وردو بچوکیش کۆڵابێتەوە • یەکێك لەو بەڵگانە کە راستیو دروستی وتەکانی هردوت ئەسەلمێنێ نوسراوەکانی داریوشی یەکەم پادشای هەخامەنشیە لە بێستون • دەرکەوتوە ئەوەی کە هردوت نزیکەی سەد ساڵ لەدوای روداوی میژوی کوشتنی گئوماتای مغ نوسیویەتیو ناوی ئەو شەش کەسەی کە دەستیان لە کوشتنەکەیدا بووەو باسی کردوون بەراست دەرچوە ، تەنیا ئەوە نەبێ کە لە ناوی یەکێکیانا توشی گومان بووەو ناوی یەکێك لە نزیکەکانی داریوشی هێناوە کە ئەو یەکەش دەستی لەو کارو کوشتنەدا نەبوە[٢٣] •

ئەگەر سەرنج بدەین ،نوسینەکانی هردوت پشت بە قسەی سەرزارەکی ئەبەستێو لە سەرچاوەیەکی نوسراوەوە وەری نەگرتوون ، ئەو کاتە شارەزاییو ورد بینی دەر ئەکەوێو لەمەودوا لەم رووەوە نمونەی فراوان ئەخەینە روو ،وە ئەو زانیاریانەی کە هردوت داوێتی بە نمونە ئەیان هێنینەوە •

جێگای داخە کە لەگەل ئەوەدا هردوت ئەم بەسەرهاتانەی بەچەند جۆر بیستوە ، بەڵام تەنیا جۆرێکیانی باس کردوەو ئەوانی تری فەرامۆش کردوە ، ئەگەرچی ئەو بەپێی بەراوردو باری سەرنجی خۆی یەکێکیانی بەراست تر

زانیوەو هەڵی بژاردوە ،بەڵام بەم جۆرە ناتوانین پشت بە مێژووەکەی ببەستین •

کورتە نوسراوی هردوت تەنیا مێژوی واقیعی مادە کـە لـە سەردەمی کۆنەوە پێمان گەیشتوە • ئەو نوسراوانە مێژوی روداوی کیشوەری ماد ـ بە تایبەتی لـە رۆژ گارێکدا کـە سەرچاوە ئاشوریەکان باسی لێوە ناکەن ـ بە دەستی ئێمە گەیشتوە •

داخمان ناچێ بەروارەکانی چونکە لـە قســەی زارەکیەوە وەرگیراون ناتوانین داکوکی لەسەر ئەوە بکەین کە بە تەواوی راستن •

بەوتەی هردوت وڵاتی ماد لـە سەرەتاوە لـە ژێر دەسەڵاتی ئاشوریەکانا بووەو دوایی ئازاد بوەو ، خـەڵکی مـاد ماوەیـەك دەوڵەتو فـەرمانڕەوایان نەبوە ،یەکەمین پادشای ماد کە شاری ئەکباتانی دروست کردو سەڵتەنەتی مادی دامەزران دیوك Deiokes بوە کـە ٥٣ ســاڵ حوکمی کردوەو فرائورت Phraortes ی کوڕیشی کـە پارسەکانو هۆزەکانی تری ئاسیای خســتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیــەوە ٢٢ســاڵ سەڵتەنــەتی کردوە • ئـەو لـە دژی ئاشوریەکان زۆر تێکۆشاوە ،وە زۆر هەوڵی داوە شەڕیان لـە گەلا بکاتو لـە ناویان بەرێتو پەلاماری ئەوانەی ئەدان کە لە دەستیان دەرباز بوبون ،ئەگەرچی هێشتا ئاشوریەکان لەو کاتەدا [شیرازەیان بە خۆوە مابوو] • فرائورت لە شەڕی ئاشوریەکانا لەناوچو ، کیاکساری Kueksares کوڕی لـەشکری مادەکانی کۆ کردەوەو رێکی خستن ، ئەویش ٤٠ ساڵ پادشایی کرد • وە زۆر هەوڵی دا کە نەینەوای پایتەختی ئاشوریەکان داگیر بکات ، بەڵام سەرنەکەوت چونکە لەشکری یەکانی « ئەسکیت » ـ سکاییەکان ـ بە سەرکردایەتی مادیا کوڕی پروتوتی چون بەهاواری ئاشوریەکانەوەو رزگاریان کردن •

[ئەسکیتەکان] ماوەی ٢٨ ســاڵ دەسەڵاتی خـۆیان لـە ئاسیادا هێشتەوەو خۆیان پاراست بەڵام لە دواییدا کیاکسار هێنانیە ژێر رکێفی خۆیــەوەو دوایی بە هاوکاری بابلیەکان وڵاتی ئاشوریــەکانی داگیر کرد • ئـەو جـار کیاکسار هەوڵی داو ویستی ئەسکیتەکان بە تەواوی لەناو بەرێ •• پاشماوەی ئەسکیتەکان

رایان کرد بۆ ئاسیای بچوك [لیدی] • وه ئه‌مه بوو به هۆی ئه‌وه که ماوه‌ی شه‌ش ساڵ شه‌ڕو لێدان له نێوان کیاکسارو «ئالیات»ی پادشای [لیدی‌دا] رو بدات • له کاتی دوا شه‌ڕو شۆڕدا رۆژ گیراو هه‌ردولا ئه‌م رۆژ گیرانه‌یان به نیشانه‌یه‌ك زانی‌و به هۆی ناوبژی کردنی [سیدنسی] پادشای کیلیکیه‌و [لابنیت] پادشای بابله‌وه په‌یمانی ئاشت بونه‌وه‌یان به‌ست • سنوری هه‌ردو کیشوه‌ره‌کان به درێژایی روباری گالیس که ئیستا پێی ئه‌ڵێن [قزل ئیرماك] دانرا ، وه ئاستیاگ کوڕی کیاکسار کچی [ئالیات]ی خواست • له دوای مردنی کیاکسار ئاستیاگی کوڕی چوه سه‌ر ته‌خت‌و ٣٥ ساڵ حوکمی وڵاتی کرد ، به‌هوی جموجوڵی هارپاك [که یه‌کێ له گه‌وره پیاوانی ماد بوو ، وه له کیاکسار زویر بوبو] وه به هۆی کۆرش کوری ماندانا کچی ئاستیاك‌و کامبیس [کمبوجیه]ی پارس سه‌ڵته‌نه‌ته‌که‌ی دۆڕاند •

ئه‌و مێژوه‌ی که هردوت باسی ئه‌کات به‌شێوه‌ی گشتی وه‌کو ئه‌مه‌ی سه‌ره‌وه وایه که باسمان کرد • تاکو ئیستا قسه‌کانی ئه‌و به بڕبڕه‌ی قه‌واره‌ی مێژووی ماد ناو براوه • ئه‌م باسانه له‌گه‌ل مێژوی راستا به‌رامبه‌رن ، بۆ نمونه [مێژوی کسوفی ـ رۆژگیران] که هردوت باسی ئه‌کات له ئه‌نجامی ژماره‌ی ئه‌ستێره ژماره‌ی تایبه‌تی یه‌وه بووه که له ٢٨ی مانگی [مه] ساڵی ٥٨٥ی پێش زاینیه‌وه رویداوه[٢٤] • جگه له‌وه به پێی سه‌نه‌دو به‌ڵگه‌ی بابلیه‌کان که په‌یوه‌ندی به مێژوی هردوته‌وه نیه رون بۆته‌وه که ئاستیاك [ئیشتودیگا] ساڵی ٥٤٩ـ٥٥٠ی پێش زاینی فه‌رمانڕه‌وایی له ده‌ست چووه •وه کیاکسار [ئوکیش ته‌ر] له ساڵی ٦١٢ ی پێش زاینیدا شاری نه‌ینه‌وای خاپور کردوه •

هردوت له جێگایه‌کدا ئه‌ڵێ : ماده‌کان ١٢٨ ساڵ فه‌رمانڕه‌وایی ئاسیایان کردوه ، بێجگه له سه‌ڵته‌نه‌تی ئه‌سکیته‌کان [وه‌کو له سه‌ره‌وه باسکراوه] •• به قسه‌ی هردوت ئه‌سکیته‌کان ٢٨ ساڵ حوکمڕانیان کردوه[٢٥] ، ئه‌مه ئه‌وه ئه‌گه‌یه‌نێ که ئه‌م ژماره‌یه دو دڵی تیا بێ ، چونکه هردوت ماوه‌ی حوکمی

[فرائورت] و [کیاکسار] و [ئاستیاك]ی بـــه حیسابی خۆی ۹۷ ســـاڵی بـۆ داناوون[٢٦] ، بێ ئەوەی کەرتەکان لێك بداتەوە •

لەم رووەوە دەر ئەکەوێ کە هردوت بـەرواری روداوەکانی بـە وردی نەهێناوە ، دیسانەوە لەم رووەوە بەڵـگەی تر بەدەستەوەیە •• بۆ نمونـە ناوی [لابینت] گۆیا لە کاتی پەیمـانە ئاشتیانەکـەی ساڵی ٥٨٥ ناوبژی کردوە ئـەمە [نابو ناعید]ی سوڵتانی بابلە [لە یاسای ئەستێرە ژماری بطلیمۆس «نابونید»ە]،کە لە ساڵی ٥٥٦ چۆتە ســەر تەخت[٢٧] • نوسراوە ئاشوریەکان باسی [دای ئوك] ناوێك ئەکەن کە لە ساڵی ٧١٥ی پێش زاینیدا لە ولاتی مادەوە دور خراوەتەوە بۆ سوریا ، لەوە ئـەچێ ئـەم پیـاوە [دی ئوك] بێ کــە مێژوی هردوت باسی ئەکات • ئەگەرچی ئەم نوسراوانەی ئاشوریەکان تارادەیەك ئەو باسانە ئەسەلمێنن کە هردوت نوسیونی بەلاّم لە هەمان کاتا بەرواری ساڵی روداوەکان لــە یــەك ناچن و لە یەکتر جیان • دیسان ئـەو شـوێنانەی کە روداوەکانی تیا رویداوە لە یەکتر ناچن •

ئینجا ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە کە ئەو بەروارانە لــە مێژوی هردوت‌دا دروستکراوە ، وە ئەمەش هۆی ئەوە بود کە باسەکان لــە ســەر زارەکی‌یەوە وەر گیراوون ، ئەمەش بۆ ئەوە بووە کــە باشتر رەوان بکرێ و بێتــە یادەوە • دیسانەوە وەکو : ٢٢ + ٥٣ = ٧٥ و ٣٥ + ٤٠ = ٧٥ وە هەمویان ئەکـەنە ١٥٠ ساڵ[٢٨] • کە ئەمەش ٢٢ ساڵ سەڵتەنەتی [فرائورت] + ٢٨ ســاڵ ســەڵتەنەتی ئەسکیتەکان ئەکاتە ٥٠ ساڵ ، هــەروەها مــاوەی ســەڵتەنەتی [دی ئوك] ئەکاتە ١٠٣ ساڵ ، بەلاّم لەوانەیە کە روونوسی دەستخەتە کۆنەکانی هردوت لە جیاتی ٥٣ ساڵ ٥٠ ساڵ نوسرابێ •• بەم جۆرە ژمارەی ساڵەکان ئەکەنە ١٠٠ ساڵ• ماوەی حکومەتی [کیاکسار] و [ئاستیاگ] و حکومەتی [کورش] ١٠٤ ســاڵە ، [٢٩ + ٣٥ + ٤٠] بەلاّم لەبەر ئەوەی هردوت ئەمەی لــە نوسینەکەی خۆیا یاد نەکردوە رەنگە بێ وای زانیبێ کە شەڕی کۆرش لەگەل [ئاستیاگ] سی چوار

سالٌ درێژەی کێشابێ ، ئینجا لەبەر ئەوە ساڵەکانی سەرەتای حکومەتی کورش لەگەل دوا ساڵی سەڵتەنەتی [ئاستیاك] یەکانگیر بووە • بەم جۆرە ژمارەیەکی ١٠٠ ساڵی تەواو ئەکات [٢٥ + ٣٥ + ٤٠] کە هەموی پێکەوە ئەکاتە ٢٠٠ ساڵ(٢٩) •

دیسانەوە رەنگە بێ هردوت ئەوانەی روداوەکانیان بۆ باس کردوە زۆر بایەخیان بە ساڵو مانگی بەرواری روداوەکە نەدابێ • بە هەر جۆر بێ بەرواری ساڵەکان دروستکراونو بەپێی تەمەن درێژی دەسەڵاتدارەکان زۆرو کەمی دەسەڵاتداریتیان بۆ دانراوە • وەکو : لە سەرەتای سەڵتەنەتی [دی ئوك] تاکو [فرائورت] نیو سەدە یان تۆزی زۆرتر تۆمار کراوە ، [فرائورت]و ئەسکیتەکان هەموو نیو سەدە حوکمیان کردوە ، [کیاکسار] بەختێك زۆرترو [ئاستیاك] نەختێ کەمتر • کۆرش نزیکەی سی‌ی ساڵ فەرمانڕەوایی کردوەو چوار ساڵ لەگەل [ئاستیاگ]دا شەڕی کردوە • ئەگەر مەسەلەکە وابێ چۆن بە سەرزارەکی ساڵو مانگ روون ئەبێتەوە ؟ دیارە ئەمە لەگەل راستیدا ناگونجێ ،وە لە هەمان کاتا وەنەبێ لەگەل سەنەدو بەڵگەی ترا ساڵێك جیاوازی یان نەبێ ، لێرەدا ئەتوانین بەشێوەی گشتی لە بارەی ئەم ساڵانەوە کە هردوت نوسیونی باوەڕ بکەین ، لە دێرەکانی خوارەوەدا ئەوە ئەبینین کە هردوت زۆر لە راستیەوە دور نەبوە ،وە ئەو بەروارانەی کە لە خوارەوە نوسراونو لە وتەکانی هردوت دەر هێنراون ئەتوانین بە شێوە راستیان دابنێین • [دی ئوك] ٦٧٥ – ٧٢٧ پێش زایینی [یاخود ناوێك کەوتبێتە نووسینەکەوە نەختێ زووتر ـ وەکو ٧١٥ – ٧٦٧](٣٠) •

| | |
|---|---|
| فرائورت | ٦٥٣ – ٦٧٤ |
| مادو ئەسکیتەکان | ٦٢٥ – ٦٥٢ |
| کیاکسار | ٥٨٥ – ٦٢٤ |
| ئاستیاگ | ٥٤٩ – ٥٨٤ |

هردوت لەسەردەمی کۆنا توشی لۆمــەو سەرزەنشتی زۆر بووە ، ناویان نابو [ئەفسانە خوازو داستان ساز] • [پلوتارك] میژو نوسی ســەدەی یەکــەمی زاینی کتێبێکی لەبارەی [رقە بەرایــەتی خوازی هردوت]ەوە داناو •• بــەلاّم وەکو دەرکەوتوە زانستی ئەمرۆ لەو باوەڕەدایە کە هردوت [باوکی میژو] بــە تەواوی دەست پاكو راستگۆ بووە • هۆی سەرزەنشتی کردنیشی ئەوە بوە کە ئەو زیاد لە پێویست خــەریکی رونکردنەوەو لێکۆڵینەوەی چۆنێتی ئاسیاییەکانو بەتایبەتی ئــەوانەی یۆنانی نینو [بەربەرەکان]و بێ رقەبەریانە باسەکانیانی بــە پوختی نوسیوون [سەرنجی یۆنانیەکان دوای ئەو ، لە بارەیەوە ئەوە بووە کــە بەربەرەکان دوشمنو تالانکەری یۆنانیەکان بون] • بۆ نمونە [پلوتارك] هردوتی ناو نابوو [بەربەر پەرست] ••هردوت تارادەیەك لــە ئــەنجامی کردەوەی بێ رقەبەرانەی خۆی دەرونی نیشتمان پەروەری ناوچەییو کورت بینە یۆنانیەکانی بریندار کردبووە ، وە دەری خست کــە هەندێك لە پیاوانی [شارو ــ دەوڵەت]ە جۆربەجۆرەکانی یۆنان لە بەر بەرەکانێی دژی دەست درێژ کەران ــ هەروەکو نەوەکانیان ئارەزویان ئەکرد ــ لە زەمینــەی نیشتمان پەروەریدا یەك بیرورایان نەبوو • [لە یادمان نەچێ کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا لە یۆنانا هۆزێکی سەرەکی نەبوەو رەخنە گرانی رۆژگاری دوایی هــەسیتیان بەمە نەئەکرد] لــە ئەنجاما هردوت تارادەیەك لەم روەوە سەرزەنشت کراوە کە جاربەجار گوایــە لە رێگای بێ لایــەنیو راستی لای داوەو روداوەکان وەکو ئارەزو خــوازانی پریکلس ــ پێشەوای دەوڵەتی ئاتن ــ ئەیانویست بەو جۆرەی نوسیوە •لەگەل ئەوەدا ئەمانە لە نرخی ئەوە کەم ناکاتەوە کە لە بارەی میژوی مادەوە وتویە ••

لە سەردەمی تازەشدا دیسان چەند جار بۆ سوك کردنی هردوت تێکۆشاوون وەکو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا [سیس] رۆشنبیری ئینگلیسی ئەم تەقەللایەی داوە • وە [ف• گ میشچنکو زانــای روس[٣١] بــە ئــاشــکرا بــەرپــەرچی بیروراکانی دایەوە •

[دلاتر]ی بەلایجیکایی بـە رەوانیو ئاشـکرایی پشتگیری لـەو نووسینانە کرد[٣٢] کە هردوت لە بارەی میژوی مـادەوە نوسیویە •وە [هیوزنیگ][٣٣] دیسانەوە لە سەدەی بیستەما زۆر تەقەللای دا بۆ ئەوەی میژوی [ماد]ی هردوت بە درۆ بخاتەوە •

[کتسیاس کیندی] کە نوسەرێکی تری یۆنانیەو لەپاش هردوت هـاتوەو ئەبێ ناوی بهێنین کتێبێکی [مێژویی بە ناوی [پرسیکا ــ Persika ] داناوەو دەست ئێمە نەکەوتوە بەلام چەند بەشێکی گەورەی لە بارەی شوێنەواری ترەوە دەست کەوتوە[٣٤] •

کتسیاس پزیشکێکی دەرکەوتو لە خزمانی [ بقراط ] ، بونیـاد هێنەری زانستی پزیشکی بوەو لە دەوروبەری سالی ٤١٤ی پێش زاینی ئیرانیەکان بەدیل گرتویانەو[٣٥] بردویانە بۆ دەرباری داریوشی دووەمی پادشـای ئیران • لـە ـەرەتاوە ماوەیەك لە دەرگای ئەو پادشایەو دواجاریش لە دەرباری ئاردەشێری دووەم ماوەی ١٧ سالی بەسەر بردوە • پادشای ئیران جار بـەجار بۆ گفتوگۆ کردن لەگەل یۆنانیەکان سودی لێ وەرگرتوە[٣٦] ، وە لە سالی ٣٩٨ی پێش زاینی بە فەرمانی پادشا بە ئیشو کاری تایبەتی چوە بۆ (ئەسپارت) دوای ئەوە گەڕاوەتـەوە بـۆ ولاتی خـۆیو دەستی کردوە بـە نوسین • بـەناوبانگترین نوسینەکانی [پرسیکا]یە •وە لێکۆڵینەوەیەکی کورت لەبارەی هیندستانەوە کـە ناوی [ئیندیکا]یە ، بە قسەی کتسیاس خۆی لە نوسینی کتێبی (پرسیکا) سـودی لە سالنامە رەسمیەکان وەرگرتوە • وە لە بارەی [ئیندیکا]وە سودی لـەو شتانە وەرگرتوە کە خۆی بەچاو بینوینی وەیا خۆ لەو کەسانەی بیستوە کە خۆیان روداوەکانیان بـە چـاو دیوە • ئـەم وتانـەی ئـەوو لایـەنی داستانسەراییو خۆشخوانی نوسینەکانی سەرنجی نوسەرانی کۆنی دوای خۆی راکێشاوەو لـە هردوت زیاتر باوەڕیان بە نوسینەکانی ئـەو کردوە •لەو بابەتو باسانەدا کـە هردوتو کتسیاس هەردوکیان باسیان لێوە کردونو هەریەکەیان بە پێچەوانەی

ئەوی ترییانەوە شتی نوسیوە ، ئەمە بۆتە هۆی ئەوە کە کۆمەڵێك سەرزەنشتی هردوت بکەن‌و پشت بـە نوسینەکانی نەبەستن ••بـەلاّم لـە راستیدا قسـەو نووسینەکانی [کتسیاس] لە راستیەوە دورن‌و فڕیان بەسەر واقیعەوە نیـەو لـە سەردەمی ئەمڕۆی ئێمەدا بە ئاسانی ئەمە ئەسەلمێندرێت •

بەر لە هەموو شتێك [کتسیاس] ئەوەندە شارەزای زمانەکانی رۆژهەلاّت نەبووە، شێوەی نوسینەکانی رۆژهەلاّتی نەزانیوە ، بەهیچ جۆرێک نەیتوانیوە بە تەواوی ساڵنامەکانی سەڵتەنەتی بخوێنێتەوە ،چەند سەرچاوەیەك وا ئەگەیەنن گە لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا ژمارەیەکی زۆر لە یۆنانیەکان لـە [شوش ـ و ـ ئەستێل] ژیاوون ، بەم جۆرە پزیشکێکی یۆنانی چەند ساڵێك لەو شوێنەدا بژی تەنیا ئەوەندە شارەزای زمان ئەبێ کـە بتوانێ تێکەڵی‌یەکی رۆژانە لەگەل خزمەتکاران‌و نەخۆشەکانا پەیدا بکات‌و بەس •بەلاّم ئەو کە لە نووسینەکانی رۆژهـەلاّت شارەزا نەبووە وەکو لـە خوارەوە دەر ئـەکـەوێ کتسیاس بـەم جۆرە ئـەڵێ : [کێوی باغستان جێگـای پیرۆزی «زوس»ە لای باخەکە بەردێکی گەورە دیارە کە بەرزیەکەی حەڤدە «استاد[1]»ە ، ئەو زنـە ـ مەبەستی لە سمیرامیس شاژنی ئاشورە ـ هەندێکی لە دامێنی چیاکەوە ساف کردووە ، نیگاری خۆی لـەسەر نـەخش کردوە ، سەد نێزە بـەدەستی لـە خواروی خۆیەوە راوەستاندووە ، بە پێتی سرەیانی «مەبەستی خەتی بزماری‌یە» نوسیوێتی : سمیرامیس باری ئـەو چارەوێیانەی کـە بۆی ئـەهات لە پاینەوە داینـاوەو بە سەریانا سەرکەوتووەو گەیشتوتە بورجەکە «قوللە»] •

پێویست بە باسکردن ناکات کە بەردە نوسراوەکانی پادشایانی رۆژهەلاّتی کۆن هەمویان لە یەکتری ئەچون ، بەلاّم مەسەلەکە ئەمە نیە ، ئەو بەردەی کە کتسیاس باسی کردوە بەراستی هەیە ، وە ئەو بەردەی بێستون یان باغستانی کۆن ـ جێگای خواکان ـ بوەو کراوە بە وەقفی ئاهورامزدای خوای خواکان

---

(١) زیاتر لە ٣ هەزار مەترە

که یۆنانیــه‌کان [زوس] یان پێ ئه‌ووت ــ وه‌کو زانراوه ــ به هیچ جـۆرێك په‌یوه‌ندی به ئه‌فسانه‌ی سمیرامیسه‌وه [که به قسه‌ی کتسیاس هه‌زارو پێنج سه‌د ساڵ بـه‌ر لـه سه‌رده‌می ئـه‌و ژیاوه]نیـه بـه‌ڵکو داریوشی یـه‌کـه‌م پادشـای هه‌خامه‌نشیه‌کان ئه‌م په‌یکه‌ره‌ی بۆ خۆی کردوه‌و ، دو باڵه‌وانی شه‌ڕ که‌ریشی له ته‌نیشته‌وه‌یه وه له ژورووی سه‌ریانه‌وه خواوه‌ند باڵی به‌سه‌ردا کێشاوون‌و نۆ دیلی ده‌ست به ستراویش به‌رامبه‌ر به پادشا راوه‌ستاوون(٣٨) •

به‌رده‌که به سێ زمان نوسراوه • ئه‌مه ئه‌وه ئاشکرا ئه‌کات کـه کتسیاس نووسینه‌کانی سه‌ر ئه‌و به‌رده‌ی نه‌خوێندۆته‌وه به‌ڵکو له‌وانه‌یه به رێبواری به‌لای ئه‌م به‌ردو په‌یکه‌رو نوسراوه‌دا تێپه‌ڕ بووبێ‌و هه‌ندێك ســه‌رنجی دابێ‌و پاش ئه‌وه‌ی بۆی لێك نه‌دراوه‌ته‌وه خۆی به بیری خۆی ئه‌مــه‌ی نوسیوه ، ئـه‌گه‌ر کتسیاس شاره‌زایی‌و تێکه‌ڵی له‌گه‌ل سه‌نه‌دو به‌ڵگه‌کانی پادشاهانا بوایه له‌وانه‌یه شتێکی له‌و به‌رده نوسراوه بزانیبایه • چونکه ئاشکرایه(٣٩) که نوسینه‌کانی سه‌ر ئه‌و به‌رده به زمانی ئارامی‌و زمانه ره‌سمیه‌کانی تری کیشوه‌ر لـه هـه‌مو باره‌گاکانی ده‌وڵه‌تیدا بوه •

ئه‌گه‌ر کتسیاس سودی له بکه‌ڵگه‌و نوسراوه‌کانی پادشایان وه‌ربگرتایه له چۆنێتی‌و هه‌واڵی ئه‌و روداوانه‌ی که له دژی داریوش یاخی بووه‌و له‌سه‌ر ئه‌و به‌رده نوسراوه‌و هه‌روه‌ها له باره‌ی ده‌رچونی [گئوماتای مغ]ه‌وه زانیـاری وه‌ر ئه‌گرت • به‌ڵام ئه‌و له‌و چۆنیه‌تیه زۆر بێ ئاگا بوه • ئه‌ڵبه‌ته ئه‌و له مه‌سه‌له‌ی یاخی بونه‌که شاره‌زا بووه به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه به‌جێ هێنه‌رانی حه‌وت که‌س بون‌و ره‌گه‌زی گه‌وره ترین خانه‌دان له‌وان بون ••• ــ ئه‌مانه‌ی زانیوه ــ به‌ڵام مغی ناوبراو لـه جیـاتی [گئوماتا] نـاوی [ئه‌سفه‌نددات] بووه(٤٠) • وه بـه‌جـێ هێنه‌ره‌کانیش به‌م جۆره باس ئه‌کات : ئونوف ،ئیدرن ،نورون دابات ،ماردونی ، باریس ، ئاتافرن ، ته‌نیا ناوی [ئیدرن] راسته •

جگە لەوە [ماردونی] ناویك ،کە یەکێك لەو حەوت کەسانەیە کـەچی ئەم ناوەی هەر باس نەکردوە ، ئەمـە ئەوە نیشان ئـەدا کـە نوسینەکانی لـە سەرچاوەی زارەکیو شت رەوانکردنەوە وەرگرتووە • کتسیاس هەندێك لە روداوەکانی بە پوختی زانیوەو دوای ئەوەی رۆژگار بەسەر چوەو گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی نووسیوێتی ••بەڵام لە نوسینەکانی کتسیاس دا ئەم جۆرە شتانە سەیر نیەو ، زۆر دیارە • راستیەکی رون تر کـە لـەم رێگایـەدا زۆرجار تووشمان دێت باسی ئەکەین :

کتسیاس زانیویە کە دەوڵەتی ئاشور بـەهۆی یـەکێتی پادشاهانی مـادو بابلەوە لەناو چوە ، بۆ ئەمە پێویستە ناوی ئەو کەسانە بێنێ کە لە مەسەلەکەدا بوون ، بـەڵام ئـەو ناوە پێویستەکانی فـەرامۆش کردوە ، لـە جیـاتی ناوی سەرکردەکانی هـەندێ لە مادو ـ بین‌النهرین ـ کە هاوچەرخی ئـەو بونو [ئارباك] و [بلسیس] یان ناو بووە ناوی نەبردون ، ئەو ئەم دوناوەی کردوە بە ژێر چمکەوەو بە شوێن ئەم تەڕدەستیەی کتسیاس‌دا لە کتێبەکانی مێژونوسانی کۆندا دیسان [بلسیس] پادشای بابلو [ئارباك] پادشـای مـاد(٤١) لـە شـان تێکدەرانی ئاشوریەوە دانراون • تەنانەت [کنیگ] زانای ئەتریشی هاوچەرخی ئێمە تێکۆشاوە کە یەکێ لەم دو ناوانە کە لە یـەکێ لـە نوسینە بزماریەکانی بابلیەکانا هاتوە باسی بکات ! ] •

کتسیاس ئەگەر سودی لە ساڵنامەی پادشایان وەر بگرتایـە مومکن نیـە ئەوەی کە نەی ئەزانی هەر نەیزانیایە ، بەڵام لـە جیاتی ئـەو شتانەی کـە نەیزانیون شتی وای باس کردوە کە ناویان لە ساڵنامەکانا هەر نیە ، بۆ نمونە ئەڵێ : لە ساڵنامەی [بەربەریەکانا] نامەی پادشایەکی ئاشوری کە ناوی [توتام] بووەو بۆ [پریام] پادشای ئەفسانەیی [تروا]ی ناردوە ، ئەگێڕنەوە گوایە ئـەو کەسەی ئەمەی گێڕاوەتەوە بە بۆنەی شەڕ لەگەل یۆنانیەکانا کە بە سەرکردەیی (ئاگا ممنون) بووە داوای یارمەتی لە [توتا] کردوە ، ئەویش [ممنون]ی بە

ده هەزار شەڕکەری حەبەشەیەوە لەگەل ده هەزار شـەڕکـەری [شوشی] دا ناردوه بۆ شەڕی [تروا] •• کتسیاس ویستویّتی میژوی ئاشورەکەی بەستێت بە داستانی ئەفسانەی کیشوەرەکەیەوە •

هەمو ئەو نوسراوانەی کـه گوایا لـه سالّنامەکانا خوێندویەتیەوە رێکو پێك بووه ، ئەگەرنا ئەو شتانەی کە لافی پێوه لێداوەو باسی کردوون تەنانەت ئەوانەشی کە بە چاو بینوینی وباسی لێوه کردون رواڵەتێکی رێكو پێکیان نەبوە• بۆ نمونە [ثالیان]نوسەری بە ناوبانگی رۆم لە کتێبی [ئیندیکا]ی کتسیاسەوە بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە : گیان لەبەرێکی دڕندە لـه هیندستان هـەیـه ، بەقـەدەر شێرێك گەورەیە ، رەنگی سورو بەرگی پەشمینە ،وەکو سەگ وایـه ، بە زمانی هیندی پێی ئەڵێن [مرتی خوراس] ، دیمەنی لـه گیان لـەبەرانی تر ناچێت ، لە ئادەمیزاد ئەچێ ، سێ ریز دیانی لەسەرەوە هەیەو سێ ریز لـه خوارەوە ، دیانەکانی لە هێن سەگ تیژ ترو گەورە ترە ، گوێچکەکانی وەکو گوێی ئادەمیزاد وایە ، بـەلاّم گـەورەترو توك دارن ، چـاوەکانی رەنگی خۆلەمێشی یە ، پەنجـەو نینۆکەکانی بـەرای من وەکو هی شێر وایـه ، لە پۆپەی کلکیەوە چزە دوپشکێك بە درێژی گەزێك [نیو مەتر] هەیە ،کتسیاس ئەڵێ : ئەم گیان لەبەرەم لەلای پارسەکان دیوە ،کە هیندیەکان بە دیاری بۆ پادشای پارسەکانیان هێنابو(٤٢) ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە کتسیاس نـەك هـەر ئەوانەی کە خۆی دیویّتی دایناوە بەڵکو زمـانی پارسیشی وەکو پێویست بوه نەیزانیوە ، ئەو [مرتی خوارس]ی بە پیاو خۆر گۆڕیوە ، ئەمە راستە بـەلاّم [ثالیان] لە دوو جێگادا ئەم وشەیە بە هیندی ناو ئەبا [وە لە ناو قسەکانیا دەر ئەکەوێ کە وتەی کتسیاس دوبارە ئەکاتەوە] • لەگـەل ئەوەشدا ئەم وشەیە فارسی یە [مرتیا خوار – مردم خوار – مرد – خوار – وەرگێر] •

هەڵەی کتسیاس لە ژمارە نایەت ، بەرای ئەو شاری نەینەوا – نەك لـه کەناری دجله – بەڵکو کەوتۆتە قەراخ فوراتەوە ، [بە پێی میژوی زاینی] لـه

سەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا ، واتا تەنانەت بەر لەوەی سەردەمی سەرکەوتنی ئاشور لە رۆژگاری سەدەکانی نۆیەم‌و حەوتەمی پێش زاینیدا دەس پێ بکا ، مادەکان خاکی ئاشوریان داگیر کردوە ، بابل ــ گۆیا بە وتەی ئەو ــ لە سەردەمی سێ سوڵتاندا بەر لە ئاستیاگ یەکێك بوە لە ساتراپ نشینەکانی ماد، [لەگەل ئەوەشدا کۆرش لە ساڵی ٥٣٨ی پێش زاینی بابلی هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆی] • کتسیاس گەلێك نوسراوی لە بارەی پادشایانی بابل‌و میسرەوە نوسیوە ئەم نوسراوانە نە لە سەرچاوەیەکی ناوچەییەوە هاتوون ، وە تەنانەت کەسانێکی وەکو [بروس] و [بطلیموس] و [مانفون] و•• هتد کە لە سەردەمی کۆنا زۆر شارەزای مێژوی بابل‌و میسر بون ئاگایان لەو زانیاریانە نیە •

لە کاتێکدا کە نوسراوەکانی هردوت کتسیاس لە بارەی شوێنەواری ئەو سەردەمانەو روداوەکانی ئەو رۆژگارەوە لە یەك جیاوازن ، بەڵگەو شوێنەوارەکان قسە کانی هردوت ئەسەلمێنن‌و وتەکانی کتسیاس بە درۆ ئەخەنەوە ، ئەگەرچی وتەو نوسینی تری وەکو هینەکانی کتسیاس لە دوای نوسەرانی تری ــ گۆیا کۆنە شوناسان ــ بە جێماوە ، بەلام ئەتوانرێ ئەوە بسەلمێندرێ کە ئەو نوسەرانە هەموو نوسینەکانیان لە کتسیاس وەرگرتوە ، [لوکیان] لە بارەی کتسیاسەوە ئەڵێ : کتسیاس کوڕی [کتسیوخ]ە ، خەڵکی [کنید]ە ، لە بارەی وڵاتی هیندستان‌و ئەو شتانەی کە لەوێدا هەیە هەندێك شتی نوسوە کە نە خۆی چاوی پێیان کەوتووەو نە لە کەسیشی بیستوون(٤٣) •

لەگەل ئەمەشدا ناتوانین چاوپۆشی لە هەموو نوسینەکانی کتسیاس بکەین، چونکە ماوەیەکی درێژ لەو ناوچەیەدا ژیاوەو لەگەل ژمارەیەکی زۆر لە مادەکان‌و ••• ئاشنایەتی بووە ، گەلێك حکایەت‌و ئەفسانەو وتی بیستوە، گەلێك نووسینی بێ کەڵك‌و بەها لە بارەی روداوێك وەیان بەسەرهاتێکەوە ئەگێڕدرێتەوە کە لەوە ناچێ خۆی بەو جۆرەی نوسیبێ(٤٤) • ئەوە دەر

ئەکەویٚ کە ــ نەیتوانیوە ــ یان بۆی نەلواوە لــە دەرباری هــەندیٚ شــویٚن یادداشتەکانی بنوسیٚ ، وە دوای ئەوەی کــە گەڕاوەتــەوە بۆ وڵاتی خۆیو ناوبانگی ــ هردوت ــ ی بیستووە کە بە هۆی میژوەکەیەوە ریٚزی لیٚ گیراوە ئەویش میٚژوی خۆی لــە دژی میژووەکــەی هردوت نوسیوە •• بــەکورتی مەبەستی ئەوە بووە کتیٚبەکــەی هردوت بشکیٚنیٚ وە کتسیاس بــە یــەکیٚ لــە ئارەزو خوازانی ئاسپارت ئــەژمیٚردریٚ •• هردوت بــە ئاسانی گومانی لــەو روداوە جۆربەجۆرانە پەیدا ئەکرد کە لە هەندیٚك شویٚندا بە چەند جۆریٚك باسی لیٚوە ئەکرا •• کتسیاس کــە لــەم شــویٚنەدا شارەزاو بەناوبانگ بوبو ، ئەیویست نوسینەکانی هردوت بەدرۆ بخاتەوە ، بۆ ئەوەی بگاتە مەبەستەکەی تەکانی بە خۆی ئەداو پەلەی ئەکرد • وە چونکە ئەو هەر ئەیویست هردوت بەدرۆ بخاتەوە هەوڵی ئەوەی داوە کە لــە هــەر شویٚنیٚکداو لــە بارەی هەر شتیٚکەوە لەگەل میژوو نوسی [هالیکارناس] دا نوسینەکانیان پیٚچەوانەی یەکتر بن • ئەگەر هردوت شتیٚکی بە سپی باس کردبیٚ ئەو کردویٚتی بە رەش‌و بەم جۆرە بە پیٚچەوانەشەوە ، وە لە هەر جیٚگایەکدا کە لە بیری چوبیٚتەوە وەیا بە تەواوی لە ردواوەکە نەگەیشتبیٚ [لەگەل ئەوەدا کــە یادداشتی نەکردوە] بیٚ ئەوەی لە روو دابمیٚنیٚ لە خۆیەوە شتی نوسیوە ، کتسیاس بــە تایبەتی لــەو شویٚنانەی کە [ناو]ە کانیان ئاشکرا نەبون یان لە بیری چۆتەوە ناوی چەند کەسانیٚکی لە دەورو بەری خۆی تیا داناوە ، لە ئەنجامدا دو میژووی ئاسیا لە رۆژگاری کۆن دا! کە لــەیەکتر نەئەچون پەیدا بوو • ئەبوا یەکیٚك لەو دو میژوو نوسانە نوسینەکانی راست نەبوایە •• زانستی ئەمرۆ بە تەواوی ئەوەی سەلماندوە کە هردوت درۆی نەکردوە(٤٥) •

ئیٚستا بە کورتی باسی نوسینەکانی کتسیاس ئەکەین لــە بارەی نوسینی میژوی مادەوە ، بە وتەی ئەو ئاشور لە سەردەمی کۆندا ــ کە بە بیری کەسا تایەت ــ لە سەردەمی نەینەواو سمیرامیسی ئەفسانەیی ــ مادیان داگیر کردوە ، ـ دٚ

ـوە لــە

ئاشوریەکان گوایە نەک تەنیا لە خاکی مادا بەڵکو لـە [باکتریا]ش خەریکی شەڕو شۆڕ بون[٤٦] • دوای ئەوە ئاشوریەکان چەند سـەدەیەك لـە خاکی مادا سەڵتەنەتیان کردوە هیچ روداوێك روی نەداوە ، ئارباك ــ کە لە لایەن ئاشوریەکانەوە کرابو بە ساتراپی ماد ــ لەگەل [بلەسیس] دەرکران •

[سارداناپال] پادشای ئاشور داکۆکیەکی سەرکەوتوانەی ئەکرد ،لەناکاو باکتریاییەکان [کە هەرگیز لـە دەسەو دایـەرەی ئاشـور نـەبون] لێی جیا بونەوەو چونە پاڵ ئارباكو ئەمە بوو بـە سەرەتای بـەربەرەکانێو لێکدان ، دەوڵەتی ئاشور لەو کاتەوە کەوتە نوشوستیو نابود بوو •

کتسیاس بـەو جۆرەی لای خـوارەوە ناوی پادشایانی مـادو مـاوەی حوکمڕانیان باس ئەکات :

| | | |
|---|---|---|
| ئارباك [ئارباکس] | Arbakes | ٢٨ساڵ |
| ماندائوك [یا مائوداتوك ــ مائو دائوکس | maudaukes | ٥٠ ساڵ |
| سوسارم | Sosarmos | ٣٠ ساڵ |
| ئارتیك | Artukas | ٥٠ ساڵ |
| ئاربیان | Arbianes | ٢٢ ساڵ |
| ئارتی | Artaios | ٤٠ ساڵ |
| ئارتین | Artunes | ٢٢ ساڵ |
| ئاستیبر | Astibaras | ٤٠ ساڵ |
| ئاسپند | Aspandas | کە یۆنانیەکان |
| پێی ئەڵێن [ئاستیك] | Astuigas | ٣٥ ساڵ(؟) |

ئەم نوسینانەی سەرەوە ئەوەمان نیشان ئـەدات کە شاری نەینەوا ــ بە پێچەوانەی واقیعەوە ــ لە ساڵی ٦١٢ی پێش زایینی وێران نەبووە ، بەڵکو لـە ساڵی ٨١٢ی پێش زاینیدا وێران کراوە ، [ئەگەر تەماشا کەین کە «ئاسپند» یان «ئاستیگ» وەکو «ئاستیاگ» بە پێی مێژوی هردوت ٣٥ سـاڵ سـەڵتەنەتی

کردوه] • بێ سەرو بنی ئەم بەروارانە ئاشکرایە ، تەنانەت [ولنی] لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەرچاوەکەی پشکنیو لە ئەنجامدا نوسینی بەروارەکانی هردوت دەرچوە •

لە میژوەکەی هردوتدا پادشایانی ماد بەم جۆرە سەڵتەنەتیان کردوە [٥٢ ، ٢٢ ، ٤٠ ، ٣٥] ساڵ •• ماوەی حوکمڕانی ئاسکیتەکان ٢٨ ساڵ بووە • بە پێی کتێبەکەی کتسیاس پادشایانی یەکەمو سێیەم هەریەکەیان ٢٨ ساڵ حوکمیان کردوە [یان ٣٠ ساڵ وە لەوە ئەچێ لە کاتی نوسینەوەی رونوسەکانا گومانو هەڵە پەیدا بووبێ[٤٨] • پادشایانی دوەم وچوارەم هەر یەکەیان ٥٠ ساڵ حوکمڕانیان کردوە[٤٩] • پێنجەم حەوتەم هەریەکەیان ٢٢ ساڵ ، شەشەمو هەشتەم هەریەکە ٤٠ ساڵ • کتسیاس ناوی [ئاسپند] بە [ئاستیاگ]ی هردوت تێ گەیشتوە ، وە لەوانەیە بەو هۆیەوە ژمارەی ناوبراو لە کتێبەکەی هردوت ـ واتا ٣٥ ساڵ ـ ی لە بارەی حوکمڕانیەوە بۆ داناوە[٥٠] •

وا بزانم بۆ سەلماندنی بێ سەرو بنی قسەکانی کتسیاس لە بارەی میژوی مادەوە ئەوەندە بەسە ، بەڵام هەندێك لە لێکۆڵەرەوان وەکو [ئوپر ، روست ، ماسپرو ، •••هتد] هەوڵیان داوە رزگاری کەن و رای خۆیان دەربڕیوە کە گوایە ناوی پادشایانی ماد لە میژوی هردوتدا بەزمانی هیندیو ئەوروپایی نەنوسراوە[٥١] ،کتسیاس ئەو ناوانەی کردوە بە هیندی وئەوروپایی وە دیسان ئەڵێن کە کتسیاس ناوی پادشایانو پێشەوایانی بچوكو هەمە جۆرەی [ماد] کە لە پێش [دیوك] ژیاوون هەموی بە زنجیرە هێناوون[٥٢] • بەراستی هەندێك لەو ناوانەی کە کتسیاس باسی کردون تاڕادەیەك لەگەل ناوی سوڵتانەکانی ماد بە پێی ساڵنامەی ئاشوریەکان هاتوە وەکو [مارتوکا ، ماشدایوکا ، (؟) ئارباکاو •••هتد] ئەمانە لەیەك ئەچن • بەڵام چونکە ئێمە نووسەری ناوبراو ئەناسین گومان ناکەین کە لە بارەی راستی ناوی پێشەوایانی مادەوە لە

سەدەکانی هەشتەمو نۆیەمی پێش زاینیدا خۆی ماندو کردبێ ، وە لەوە ئەچێ کە سودی لە ناوی ئەو مادانەوە وەرگرتبێ کـە لە سەردەمی ئـەوا ژیاوون ، چونکە ئەو ناوانەی ئەو سەردەمە لەگەل ناوەکانی سەردەمی حوکمڕانیەکانیانا ناڕادەیەك لەیەك ئەچون(٥٣) • وە دەربارەی سەدەی هـەشتەمی پێش زاینی بێ ئەوەی سـەرنجی کتسیاس بدەین ئـەتوانین لـە سەرچاوەی ترەوە – کە ئەوانیش هەر ساڵنامەی ئاشوریەکانن – سود وەر بگرین ، بەڵام لـە بارەی رووداوەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینیەوە کـە لە سەرچاوە بزماریەکانو میژوی هردوتدا تەواو ئاشکرانیە ،لەمانەو لـە بارەی دوا شـەڕی نێـوان [ئاستیاگ]و کۆرش قسەکانی کتسیاس تا رادەیەك لە راستیەوە نزیکن(٥٤) • وە هەندێ لە نوسینەکانی ئەو لەگەل سەرچاوە بابلیەکانا یەکن •لەوە ئەچێ کە رووداوەکانی سـەرەتای رۆژگاری زنجیرەی هـەخامەنشیەکان – پێچەوانـەی پێشهاتەکانی رۆژگاری پێشتر بووبێ – لە کیشوەری ئێرانا تەنانەت لە سەدەی پێنجەم بەگەرمی باسی لێوە کراوە وە لـەوە ئـەچی کتسیاس لـە بارەی ئەو رووداوانەوە شتی بیستبێو بەرێکەوت یەکێك لەو باسانەش لـە بارەی میژوی مادەوە بووبێو بۆ ئێمەی تۆمار کردبێ •

نوسەرێکی تری یۆنانی کـە لـە بارەی دەوڵەتی مـادەوە شتی نوسیوە [کزنفون]ە ،کـە بەتەواوی لـە نوسەرەکانی تر راستگۆ ترە ، زانایـەکی ئیدیالیو پیاوێکی سیاسی خاوەن رێزو قوتابی سوقراتو هـاوڕێی ئەفلاتون بووە ، لە هـەمان کاتا یەکێك بووە لە مامۆستایانی وێژەو گفتوگۆی یۆنان ، گرنگتر لـە هەموو نوسینـە میژوویی‌و نیوە میژووییەکانی میژووی یۆنانە [ هلنیکـا Hellenika کـە دوابەدوای کتێبەکەی [ فوکیدید ] میژوونوسی گەورە باس ئەکرێ •• یەکێ تریان [لـە شـکرکەشی دە هـەزار یۆنانی] «ئاناباسیس»ە کە باسی لەشکر کەشی سەربازە کرێ گرتە یۆنانیەکان ئـەکات کـە بـە هاوکاری کورشی بچوك دژی ئاردەشێری دووەم تاکو بابـل ، وە

باشەکشەیان لە بابلەوە تا دەریای رەش لە دوای مردنی کورش باس ئەکات •

[کزنفون] خەڵکی ئاتن بوو ، لە دەوروبەی ساڵی ٤٣٠ی پێش زاینی لە بنەماڵەیەکی شێوە خانەدان هاتۆتە دنیاوە ، لە لاویا بە هاوکاری ئەفلاتون بوو بە قوتابی سوقرات فەیلەسوفی ئایدیالیست ، لە کێشەی سیاسیدا لایەنگری کۆمەڵی پیاو گەورانی ئاسپارت بووە ، لەو ساڵانەدا کە دیموکرات خوازەکان لەگەل ئاسپارتدا شەڕیان ئەکرد ئەو هەستی بە ناخۆشی ئەکرد لە دەرونیا ، هەروەها بە بیانوی سیاسەتەوە لە ساڵی ٤٠١ی پێش زاینی لە دوای تێکشکانی یەکجارەکی کە ـ لە ساڵی ٤٠٤ی پێش زاینی ـ ئاسپارت ئاتنیەکانی شکاند ئەو ناچار بوو ئاتن بەجێ بهێڵێ ، وە بە هۆی یەکێ لە هاوڕێ کانی خۆیەوە چوو بۆ دەرباری کۆرشی بچوك •

[کزنفون] بەشداری ئەو لەشکر کەشی‌یەی کرد کە کۆرشی بچوك لە ساڵی ٤٠١ی پێش زاینی کردیە سەر ئاردەشێری دووەم • کە کۆرش لەشەڕی [کوناکس] لە بابل کوژراو لەشکرەکەی پەردەوازە بوو ،قەرماندە یۆنانیەکان ئیرانیەکانیان ئەیان‌گرتن‌و ئەیانکوشتن ، سەربازە بەکرێ گیراوە یونانیەکان بەهەزاران کیلومەتر لە دوری وڵاتەوە لە کیشوەرێکی نەناس‌و دوژمن‌دا تەنیا کەوتن [کزنفون] بوو بە ڕابەری کشانەوەیان ، یۆنانیەکان سەرکەوتن ،وەکو کوێر وردە وردە لە ئاسیای نزیك‌و ئاشورو ئەرمەنستانەوە توانیان خۆیان بگەیەننە کەناری دەریای رەش •وە نزیکەی نیوەیان دوایی چونە ناو لەشکری [ئاگسیلا]ی پادشای ئاسپارت ، کە لەو کاتەدا لە رۆژئاوای ئاسیای بچوك لەگەل ئیرانیەکانا لەشەڕدا بون • [کزنفون]یش چوە ژێر فەرمانی ئاگسیلاوە، لە ئاتن ئەمەیان بە خیانەت ناو ئەبرد ،وە کزنفون لە مافی هاو نیشتمانی ئاتن بێ بەش بوو ، لەو شارە دەرکرا ، دوای ئەوە کزنفون لەلای ئاسپارت مایەوە تەنانەت دژی وڵاتی پێشینی خۆی شەڕی ئەکرد ، لەدەورو بەری ساڵی

**٣٨٠**ی پێش زاینی دەوڵەتی ئاسپارت هەندێ موڵکیان پێداو ئیتر بە ئاسودەگی ئەژیاو دەستی کرد بە نووسین(٥٥) •

نوسینەکانی ئەو ئەگەر لە [ئاناباسیس] ـ هوردوکەشی دەهەزار کەسی ـ [ومیژوی یونان] گوزەر بکەین رواڵەتێکی فەلسەفیو رەووشتی هەبوو(٥٦) ، وە لە بارەی پەندی سوقراتو رەووشتی پیاوە ناودارەکانی ئاسپارتەوە بوو ، کتیبی [کورش‌نامە] دیسان زۆرتر بە باسە فەلسەفیەکانی نزیك بوو •

[ای• م• ترونسکی] لە بارەی کورش نامەوە بەم جۆرەی نوسیوە : [ئەم کتێبە لە میژوو ئەچێ ، نووسەرەکەی لە زەمینەیەکی سیاسیو رەووشتایەتی بە فەلسەفەی بافی نوسیوێتی ، وەکو داستان رێکی خستووە ، داستانێك لە بارەی ژیانو کردەوەکانی کورش ، مەفهومی [میژوو] لە سەردەمی کۆندا ئەوەندە فراوان بووە کە ئەیتوانی ئەم نووسینەش بە خۆیەوە بگرێ ، لەگەل ئەوەدا ئێمە ئیستاش ئەم بەرهەمە بە بەشێك لە رۆمانە میژوویی‌و رەووشتیەکان دائەنێین نەك [میژوو] ! [کزنفون] لێرەدا بە ئەو بەرپی ئازادی‌یەوە سود لە نوسراوە میژوویەکان وەر ئەگرێ •بۆ نمونە وەکو راستیەکی میژویی کورش بە داگیر کەری میسر ئەداتە قەڵەمو بە شێوەیەکی سروشتی(٥٧) لە نێوان کورەکانیو دۆستانی خۆیا ئەمرێتو وەکو سوقرات لە کاتی سەرەمەرگا رەوشتو ئەخلاقیان فێر ئەکات ، لە وێنەکەی کورش‌دا بیروڕای سوقراتو [ئاگسیلا] یەك ئەگرنەوە(٥٨) •

کزنفون خورەووشتی قارەمانانی داستانەکەی بە بەرهەمی پەروەردە کردنێکی راست ـ کە لە ناخی هەمو یاسای ئاسپارتیو ئامۆژگاری رەووشتی سوقراتەوە هەڵقوڵابێ ـ دائەنێ • ژمارەیەکی زۆری پیاوانو قارەمانانی پلەی دووەمی کورش‌نامە وەکو ئاوێنە رواڵەتی چاکەو خراپەی هەمەجۆرە دەر ئەخەن(٥٩) •

ئەم نوسینەی سەرەوە کورش نامە بە شێوەیەکی ئەدەبی نیشان ئەدات ،

کورش نامە چەند روداوێکە کە سەردەمیان زۆر تێپەڕیوە ، نوسەر لەروی چەند سەرچاوەیەکی نوسراوەوە روداوەکانی کۆ کردۆتەوەو گونجاندوێتی ، ناوبراو بەڵگەی بەسەرهاتو روداوەکانی رۆژهەلاتی بە تەواوی بەدەستەوە نەبوە • کزنفون لەناو سوپای یۆنانیەکانا بووە ، خەریکی ئیش‌و کاری سوپایی بوەو گەڕاوەو [جگە لە زمانی یۆنانی زمانێکی تری نەزانیوە]و نەیتوانیوە تێکەڵی لەگەل پارس‌و مادەکانا پەیدا بکات‌و شارەزاییەکی تەواو لە بارەی مێژوی کۆنی ئەوانەوە بە دەست بێنێ[٦٠] • ئێمە لە بارەی ماوەی مانەوەی کزنفونەوە لە ئاسیای بچوکدا زانیاریەکی تەواومان نیە ، وە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە بڵێین لەو کاتەدا کە شەڕی ئێرانیەکان بەردەوام بو ، ئەو لەوەبەر ئەیتوانی سەرنج لە مێژوو نەرێتی پارس‌و مادەکان بگرێ •

[کزنفون] نەیئەتوانی لەبارەی نوسینی داستان‌و بابەتەکانیەوە پشت بە مێژوونوسە یۆنانیەکانی وەکو [هلانیك]و [دیونی‌سی]و [هکاتی] بەستێ ، چونکە ئەمانە گەلێك باسی هەڵەو بابەتی وشك‌و بێ سەرچاوەیان نووسیوە • کزنفون بە گشتی سوودی لە نوسینەکانی هردوت‌و کتسیاس وەرگرتوە ، کورش نامە بەڵگەی ئەم باسەیە ، لە کۆرش نامەدا گەلێك قارەمانی هێناوەتە ئایەوە کە بەو هۆیەوە ئەویش وەکو کتسیاس روبەڕوی گیرو گرفتێکی گرنگ بووە کە ناوی چی‌یان لێ بنێ ؟ زوربەی ناوەکانی کورش نامە ناوی پارسی‌یە کە بە بێ سێ‌و دوو کردن دیارە لە هردوتی وەرگرتون[٦١] • وە جاربەجاریش لە کتسیاس وەری گرتون[٦٢] ، بە هەر جۆرێك بێت ئەو ناوانەی کە لە کورش نامەدا هاتون تەنانەت ناوێکیان بێگانە نیە کە یان لە نوسینەکانی هردوت یان کتسیاس یاخۆ ناوی پیاوێکی پارسی هاوچەرخی کزنفون نەبێت وە یا خود لە یەکێ لەوان نەچێت[٦٣] • کزنفون کە گیری بەدەست ناوێکەوە ئەخواردو دوچار ئەبوو نەیئەویست دۆش دا بمێنێ ناوی قارەمانێکی ماد یا پارس یا ناوێکی ئاسیای بچوك یان یۆنانی وەیا خود ناوێکی

ناوازەی بێ سەرو شوێنی ئەدۆزیەوەو دای ئەنا(٦٤) •
ئەگەر کزنفون جگە لە هردوتو کتسیاس سەرچاوەیەکی تری باوەڕ پێکراوی بە دەستەوە بوایە بەم جۆرە نەئەبوو(٦٥) •

زانیاری کزنفون لە بارەی ئاسیای رۆژئاواوە وەکو یۆنانیەکانی هاوچەرخی زۆر شلەژاو بووە ، ئەمە لە [ئاناباسیس] دا بە ئاشکرا دەر ئەکەوێ ، یۆنانیەکان لە کاتی لەشکر کەشی ناوبراودا ئاگایان لە شوێن و ناوچەی کیشوەرەکانی خواروەوە نەبو ، بە گومانەوە ئەرۆیشتن(٦٦) • ئەگەر کزنفون جگە لە هردوتو کتسیاس سودی لە سەرچاوەیەکی تر وەر بگرتایەو زانیاری لە بارەی مادەوە دەست بکەوتایە ئەو هەڵە گەورە جوگرافیایانە بەو جۆرە روی نەئەدا ، هەڵەی گەورەی جوگرافیایی لە سەر زوربەی لاپەڕەکانی کورش نامە هەیە ، بۆ نمونە ئەگەر باوەڕ بە نوسینەکانی کورش نامە بکەین ئەڵێ : ئاشور لە سەردەمی [ئاستیاگ] و کورش ـ لەگەڵ ئەوەدا کە ئاشور چەندە بەر لەوان لە ناو چووە ـ(٦٧) ،لە خاکی مادا دەستەڵاتێکیان نەبوە • لەگەل ئەوەدا [هیرکانیە]یان بە دەستەوە بووە ، وە لە گەل [باکتریا] پەیمان و رێکەوتنیان بووە(٦٨) • هیرکانیە [ناوچەی ئوسترابادی ئیستاو کراسنوودسك]ە ، بە قسەی کزنفون بە ئاشور نزیکتر بو تاکو خاکی ماد(٦٩) • لەبەر ئەوە ئاشور لەسەر رێگای مادو زەوی و زاری کادوسیەکان [لە کێوەکانی خواروی دەریای خزر]و سکاییەکان [لە ئاسیای ناوەراست] بوون و(٧٠) کلدانیەکان [کوێستانیەکانی ئەرمەنستان ـ لەگەل کلدانیەکانی بابل نەگۆڕێن]بە بێ هۆ لەگەل ••• پادشای هیندستان پەیوەنددار بون و(٧١) ••هتد ئاوا بەم جۆرە •

کزنفون ئەیزانی [لە وتەی هردوت]کە یەکەم لە سەردەمی سەڵتەنەتی مادداً گەلێك وڵات و هۆز کە لە دوایدا کەوتنە ژێر دەسەڵاتی [پارس]ە ئیرانیەکانەوە ئەوانە سەربەخۆ بون ، دووەم لە وڵاتی مادا چەند شانشینێك

بووه که سەر به دەوڵەتی ماد بون(٧٢) • بەڵام ئاشکرایه کـه نـەیئەزانی ئەم کیشوەرو هۆزو شانشینانه کامانه بون ، لەبەر ئەوه کـه لـه هردوتو کتسیاس لەم بارەیەوه هیچیان نەنوسیوەو باسی نەکردوه • بەم جۆره ئـەو شانشینه سەربەخۆیانه که له کورش نامەدا باس کراون زوربەیان ئەو ساتراپ نشینه ئیرانیانه بون که کزنفون [خۆی هەندێکیانی ناسیوەو هەندێکیشیانی لـه چـەند سەرچاوەیـەکی سـادەو سەرپێیەوه وەرگرتوه] وەکو شانشینه‌کانی کاپادوکیەو ئەرمەنستانو هیرکانیـەو شوشو •••هتد • بـەرێکەوت هۆزی کادۆسیه‌کان(٧٣) لـــه کتێبـەکـەی کتسیاس [میژوی کورش] جێگایـەکی ئاشکرای بۆ دانراوه ، وه لەواقیعدا کزنفونیش هەروەکو هـەمان سەرچاوه باسی کردوون •

کزنفون له بارەی گۆڕینی سەڵتەنەتی ماد به پارسی هـەندێ شتی تازه باس ئەکات که لەگەل باسەکانی هردوتو کتسیاس دا جۆراو جۆرن،ئەگەر وا بزانین که ئەو له سەرچاوەی نادیار ـ لەو دوو نوسەرەوه ـ سودی وەرگرتوه ئەوا به هەڵه نەچین(٧٤) • بەرای کزنفون که له یەکەم لاپەڕەی کورش‌نامەدا نووسیویتی قەوارەی فێرکردنو پەروەردەی بالا که به وتەی ئەو ئێرانیەکان خەریکی بون هەمان چالاکی بووه کـه لـه ئیش‌دادانو ئیش کردنا بویانه • هەروەها ئـەو [کورش]ه کـه لـه میژوودا باس کراوه [ئاستیاگ]ی باپیری خۆی ـ یان به هەر جۆر ئەو کەسەی که چاکەی لەگەل کردوه ـ دەستی له سەڵتەنەت کێشاوەتەوه ـ هردوتو کتسیاس باسیان کردوه هەرچەند ئەویش ویستویتی بـه شانو باڵیا هـەڵ بدات وه وەکو قارەمانێك لـه داستانەکـەیا بی‌رازێنێتەوه سودی نەبوه •

بەم جۆره به قسەی (کزنفون) ئاستیاگ له کاتی ئاشتیو ئاسایش‌دا کـه پادشای ماد بووه کۆچی دوایی کردوه • کورش سەرکەوتنەکانی خۆی ـ نه بـه شێوەی پادشاهی ـ بـەڵکو بـه شێوەی سـەرداری [کیاکسار] کوڕی

[ئاستیاگ] «ناوی کیاکسار لە هردوت وەرگیراوە» هێناوەتە دی • ئەو کاتـە کورش سـەرداری سـوپا بوەو شانازی زۆری پێوە کراوە ، لـە ئـەنجامی لێهاتوییو کارگوزاری کورش بە پاداشتی خۆی گەیشتو [کیاکسار] کـە کوڕی نەبو کچەکەی خۆی پێداو ئەویش بوو بە میراتگری سەڵتەنەت •

لەراستیدا ئەمە قسەی مێژوو نیە بەڵکو رایەکی تایبەتی‌یە ، نوسینەکانی تری کورش نامە هەر ئەو زانیاریانەیە کە هردوتو کتسیاس لە نوسینەکانی خۆیانا باسیان کردوەو لەگـەل روداوەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی [ئاستیاگ]و [کورش] خۆیو [هێنانی کادوسیەکانو بابلیو لیدی] کـەمبوجیـە بـۆ ژێر رکێفی خۆیانو [گرتنی میسر] تێکەڵیان کردوە •

گرنگترین باسی کورش نامـە ئـەو بەڵگانەیە کـە کزنفون لـە بارەی روداوەکانی ئەرمەنستانەوە هێناویەتیەوە ، بێگومان نوسەر لـەم رووەوە ئـەو شتانەی نوسیوە کە خۆی چاوی پێیان کـەوتووە [وەکو داستانی دوژمنایەتی ئەرمەنیەکان لەگەل هۆزە کوێستانیە کلدانیەکان کە کزنفون لە «ئاناباسیس»دا بە درێژی قسەی لێوە ئەکات] •

ناوی شازادە [تیگران] جێگای سەرنجدانە ، وای زانیوە ئەم ناوە لە ناو پادشایانی دوایی ئەرمەنستانا هەر بووە ، لەوە ئەچێ کە لە سەردەمی پارس‌دا ئەم ناوە بە ساتراپە میراتگرەکانی ئەرمەنستان وترابێ ، کزنفون ئـەم ناوەی بیستبێو وەری گرتبێو نوسیبێتی • قسەی ئەو تەنیا ئەمەیە بە پێی سەرچاوە کۆنەکان وە لەبارەی یـەك شانشینی تایبـەتی ئەرمەنیەکانەوە [جگـە لـە «ئورارتو»] لە سەردەمی مادەکانا بە دەستەوەیە • ئیتر نازانرێ ئەم قسەیە تا چ رادەیەك راستەو بایەخی هەیە •بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا لە کورش نامەدا راسـتی مێژویی دەر بکـەوێ هـەرئەووەتە [لـەم رووەوە بگـەڕێتـەوە بـۆ بەشی پینجەم] •

لەگەل ئەوەدا بە داخەوە کـە بە گشتی کورش نامـە بـۆ ئێمـە هیچ

رخێکی ئەوتۆی نیە ، روداوی مێژوییی لەو کتێبەدا یان زۆر لایداوە ، یان بە ئارەزوو بەپێی ئامۆژگاری ورەووشت نوسراوەتەوە • بـەڵام لێدوان وباس کردنی نەریتو هـەستانو دانیشتنی مادەکان ــ بەشێکی بـەپێی سـەرچاوە ڕۆمان دەرئەکـەوێ و بەشێکی تری ئـەو چاو پێکەوتنانەی نوسەرە کـە لـە دەرباری [کورشی بچوك] بینیویەو بە شێکی تری ئەو بیرورایانەی کزنفونە •

ئاکاد میسین « و•و• ئاستروۆە » لەو باوەڕەدایە کورش نامە لەبارەی مێژوو فەرهـەنگو چۆنێی ژیانی ئێرانیـەکانەوە بـە یـەکـەم سـەرچـاوە ئەژمێردرێت(٧٥) • لەبەر ئەمە نوسینەکانی کورش نامـە لـە بارەی چۆنێتی سەدەکانی پێنجەمو چوارەمی پێش زاینیەوە ئەگەر باوەڕی پێ بکرێ ، بەڵام لەبارەی مێژوی مادەوە ــ بە تایبەتی ــ کورش نامە بایەخی ئێجگار کەمە •

نوسەرە یۆنانیەکانی سەدەی چوارەمو سێیەمی پێش زاینی بە تایبەتی ئەو مێژوو نوسانەی کە لـە بارەی لـەشکر کەشیەکانی ئەسکەندەری مەقدونیەوە شتیان نوسیوە ئەوانە لە بارەی مێژوی مادو سەرەتای کاری پارسەوە ئاگاداری بان بوەو شتیان زانیوە ، بـەڵام [دینون] و [هارس میتلینی]و نوسەرەکانی تر ئەوانیش وەك کتسیاس بـە زۆری داستان سـەرای مێژوییی بون تاکو مێژو نوس • لەگەل ئەوە کە هەندێکیان لەسـەر زەوی مـاد ژیاوونو بـە باشی شارەزای شێوەی ژیانو نەریتی خەڵکی ئەو سەردەمە بون ، نوسینەکانیشیان لەبارەی مێژوییەوە بایـەخێکی ئەوتۆیان نـەبوە ، نوسینی مێژو نوسـەکانی سەردەمی ئەسکەندەرو جێگەدارەکانی لە کاتێکدا نرخی هەیە کە باسی ئـەو روداوانە ئەکات کە لە سەردەمی خۆیا رویداوەو بە چاو بینوینی • هەندێك لەو نوسینانە دەست ئێمە کەوتوە ، هەندێ سەرچاوەی تریش بە دەستەوەیە ، ۆ نمونە [پولی بی] ــ لە سەدەی دووەمی پێش زاینی ــ یە کێك لــە باوەڕ پێکراوترین مێژونوسانی یۆنان بوە ، [ئەگـەرچی ئارەزو خوازی رۆم بوە] لەیەکی لە نوسەرە ناوبراوەکانەوە ئەگێڕێتەوە ، وەیان ئەفسانەی ماد لە بارەی

هیشتاسب] [ویشتاسب] پادشاوەو براکەی [زریادر] «زریوری» کە [ئاتنە] ـ لە سەدەی سێیەمی پێش زاینیدا ـ هەندێك کورتە داستانی گاڵتەو مێژویی لە زمانی [هارس میتلینی] یەوە گێڕاوەتەوە ... هتد . لە کتێبی [ژیانی پیاوان]و نوسینەکانی تری پلوتارك [سەدەکانی دوەمو یەکەمی زاینی] هەندێك زانیاری بەنرخ دەست کەوتوون ، پلوتارك لە چەند سەرچاوەیەکی جۆربەجۆر کە زوربەیان دەست ئێمە نەکەوتوە ، سودی وەرگرتوە . بە تایبەتی مێژوی ژیانی ئاردەشێری دووەمو ئەسکەندەری مەقدونیو نوسراوەی [ دەربارەی ئیسیدو ئاسیریس ]ی ئەو سودی لێ وەر ئەگیرێ .

بەڵام لە بارەی روداوەکانی سەردەمی ئەسکەندەرەوە سەرچاوەی رەسەنی هەمان لەشکرکەشی ئەسکەندەر [ئاناباسیس ئالکساندرو ـ Anabasis aleksandrou ] کە ئاریان نیکومدی نوسیوێتیو مێژوی ئەسکەندەر [کوئینت ـ کورتس ـ روف]ە ، نوسینەکانی ئاریان کە بە زمانی یۆنانیو لەسەدەی دوەمی زاینیدا نوسیوێتی جێگای زۆر باوەڕ پێکردن نیە ، بەڵام گرنگی ئەو نوسینە تەنیا لەوە دایە کە باسەکانی لە یادداشتی ئەو کەسانەوە وەر گرتوە کە خۆیان لەناو لەشکر کەشیەکەی ئەسکەندەردا بون واتا [ئاریستوبول] و [بطلیموس]ی کوڕی لاگ [کە لە دواییدا بوو بە سوڵتانی میسر]کە تەنانەت لەسەردەمی کۆنا یادداشتەکانی ئەمانە لە هەمو شتێکی تر زۆرتر جێگای باوەڕ پێکردن بون . [کوئینت ـ کورتس ـ روف]کە لەوە ئەچێ لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیابێ لەبارەی راستیو دروستی نوسینە کانیەوە لە دوای ئاریانەوەیە ، ئەو لە ئاریان زۆرتر بیری کردۆتەوە کە قسەکانی خەڵك بە خۆیەوە خەریک بکاتو ئامۆژگاریو رەووشت بۆ خەڵك دابنێ . بەڵام چەند روداوێك ئەگێڕێتەوە کە لە نوسینەکانی ئاریستوبول]و [بطلیموس]دا ودیان لە کتێبەکەی «ئاریان»دا نیە .

لەشکر کەشیەکانی ئەسکەندەرو جێ نشینەکانی لە سەرەتاوە زۆر سەرنجیان راکێشاوە وە لە سەردەمی کۆندا گەلێك نوسراوو کتێب لە بارەیانەوە نوسراوون ، بەلام راستی بە پێی بەرژەوەندی خاوەن سودە سیاسیەکان بەم لاو بەو لادا لای داوە ، لە ئەنجامدا شێوەی داستان سەرایی لێ نیشتووەو درۆو دەلەسەو ئەفسانەی سەیر سەیر روی راستی ناسەکانی داپۆشیوە • ئەنجامی بەسەرهاتی جۆربەجۆری داستانی کردەوەکانی ئەسکەندەر کە بە هەلە دراوەتە پاڵ [کالیسفن]ی فەیلەسوف ــکە لەناو لەشکرکەشیەکانی ئەسکەندەردا بووە ــ هەمو داستانەکانی تر کە لە بارەی ئەسکەندەرەوە نوسراوە بە درۆ ئەخاتەوە • داستانی ناوبراو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر بەنرخو بلاو بووە ، تەنانەت بو بو بە سەرچاوەی ئیلهامی گەلێك لە نوسەرانو شاعیران ،وە هەر بەو جۆرە بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ کاری کردۆتە سەر [نیزامی گەنجەوی] •

[بروس] میژونوسی بابلی ــ یۆنانی لەناو ئەو نوسەرانەدا جێگاو پلەیەکی تایبەتی هەیە • [بروس(٧٦) ئەستێرە شوناسێك بوو کە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زاینیدا لە بابل لەناو کاهنەکانا بە خزمەتچی [مردوك] خواوەند ئەژمێردرا •وە زانیاریو زمانی یۆنانی فێر بوبوو •

ئەو ئەیویست کە فەرمانڕەوایانی بابل ــ یۆنانیە مەقدونیەکان ــ فێری زانستی بابلیان بکات ،وە بەم بۆنەیەوە [میژوی بابل ـ Babuloniaka ]ی نوسی ، وە لە بارەی نوسینی بەشی میژویی کتێبەکەیەوە سودی لە نوسراوەی روداوەکانی بابلو بەلگەو سەنەدە نوسراوەکانی سەلتەنەتی سۆمەریەکان وەرگرتووە • ئاشکرایە کە یۆنانیەکان کتێبی [بروس]یان کە ئەخوێندەوە زاراوەی کۆنی سۆمەریو ئاکادیەکانیان نەئەزانی • بروس لەبەر ئەوان ئەو زاراوانەی بە شێوەیەك گۆڕی کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا لەسەر زار باوبوە • هەروەکو زنجیرەی [گوتی یەکان] کە بە پێی باسو حیکایەتی

ناواخنی روداوی سەڵتەنەتی سۆمەریەکان ۲۱ پادشا بون ، هەروەکو زنجیرەی مادی لێ هات [ وە تاکو رادەیەکیش راست بووە ] ، چونکە گۆتیـەکان لە ولاتێکدا ژیاون کـە لە دواییدا سەڵتەنەتی مادەکان لەوێدا چەسپاوە • لـەناو زاناکانا باسێك هـەبو کـە [ بروس ] زەردەشت [ دانەری ئاویستا ]ی بە یەکێك لە پادشاکانی زنجیرەی ناوبراو ناو بردوە •

لە کاتێکدا کە ساڵو مانگی مێژوی زنجیرەی ناوبراو لـە نووسینەکانی [بروس]دا هێشتا روون نەکرابۆوەو لـەگـەل ساڵنامەی بابلیەکانا بـەراورد نەکرابون لەبەر ئەمە ئەهمیەتی تایبەتیان پێ ئەدا ، هەرچەند لەو رۆژگارەدا کەسێك شارەزای شیرازەو ناواخنی روداوی سەڵتەنەتی سومەریەکان نەبو • [بروس] چونکە سەرچاوە کۆنەکانی رۆژهەلاتی گرتبو بە دەستەوە بەراست ترین بەڵگە ئەژمێردرا ، وە بـە پتەو ترین بـەڵگەی سـەر هـەڵدانی مـادی زەردەشتو زەردەشتچیەتی ئەژمێردرا ، ئەمـە گەیشتە رادەیەك کـە لـە سەدەی رابوردودا باوەڕیان وابو کە رێبازی زەردەشت سـەرچاوەکەی بـە مادەوەیە • هەروەکو [ف• ئاشپیگل][77] کە یەکێکە لـە ئاشنایانو دۆستو شارەزایانی ئاویستاو روداوە مێژوییەکانی ئەو ناوچەیەو ریبـازی زەردەشتی نوسیوێتی کە لەگەل ئەو هەمو بەڵگانەدا کە رێبازی زەردەشت بـە باکتریائی دائەنێن هێشتا لە بارەی بونی پـەیوەندی زەردەشت بـە مادەوە باوەڕی بـە نوسینەکانی [بروس] زیاترە •

ئیستا زانراوە گۆتیەکان لەم کاتەدا کـە [بروس] باسیان ئـەکات لەوە ناچێ پەیوەندی یەکیان لەگەل زەردەشت بوبێت • چونکـە بە زمانێك کـە بە هیچ شێوەیەك لە زمانی ئاویستا نەئەچو قسەیان ئەکرد ، جگـە لـەوەش زەردەشت لـە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا واتا لـە سەردەمی سەڵتەنەتی زنجیرەی گۆتیەکانا نەژیاوە[78] • دیسان جگـە لەمانەی سـەرەوە ئـەتوانین بە ئاشکراتر رونی بکەینەوە کـە لە نوسینەکانی [بروس]دا ناوی زەردەشت نەبراوە •

کەوابو ئەم هەڵەیە لەکوێ پەیدا بوە ؟ باشتر وایە لەم بارەیەوە نەختێك زیاتر گفتوگو بکرێ بۆ ئەوەی تارادەیەك مەسەلەی سەرچاوە شوناسیەکان رون بنەوە ، بۆ ئەوەی میژوی ماد سود لەو سەرچاوانە وەربکرێ ، وە پێویستە ئەم جۆرە گیروگرفتانە چارەسەر بکرێن ، بە تایبەتی کە بە داخەوە سەرچاوەی باسەکانمان زۆر کەمن •

ئێمە نوسینە راستیەکەی [بروس]مان بە دەست نەگەیشتوە ، بەڵام لە چەند سەرچاوەیەکەوە کە پەنجەیان بۆ درێژ کردوە سودمان وەرگرتوە[79] •

باسەکە وەکو لای خوارەوەیە : ئەو باسانەی کە پەیوەندییان بە نوسینەکەی [بروس]ەوەیە لە سێ سەرچاوەوە بە ئێمە گەیشتوە :

**١ ـ لە حکایەتی ئەرمەنیەکانەوە :**

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا میژوی [یوسوی] قەیسەریەکان کە لە سەدەی چوارەمی زاینی دا نوسراوە •

**٢ ـ نوسینە سریانیەکان :**

میژوی ناوبراوی [یوسوی] کە [مارمیخائیل] نوسەری سەدەی دوازدەهەمی زاینی رێکی خستوە •

**٣ ـ میژوی بیزانس :**

[گئورکی سینکل] کە بە هۆی پیاوێکەوە کە ناوی [پانودور] بوە سودی لە نوسینەکانی [یوسوی] وەرگرتوە ، نوسەری باسکراو دوایی باسی لە چەند نوسەرێکی ترەوە وەرگرتوەو تێکەڵ بە باسەکانی [یوسوی] کردوە[80] • لەبەر ئەمە میژوەکەی [یوسوی] بنچینەی هەرسێ سەرچاوەکەیە • یوسوی ئەوە ئەزانێ کە لەو سەرچاوە جۆربەجۆرانەوە کە لایەنگیری راستی یەکتر ئەکەن سود وەر ئەگرێ •وە لە کاتێکدا کە نوسینەکەی [ئەلکساندر پولی هیستور] لە چەندەها بەڵگەو سەرچاوەی جۆربەجۆر پێك هاتبو ، [ئەو تەنیا

کەسێك بووە کە کتێبەکەی [بروس]ی خوێندبوەوەو سودی لێ وەر گرتبێت •

یەکەم سەرچاوە لەو سیانەی سەرەوە کە باسمان کرد [واتا] تەرجومەی ئەرمەنی [یوسوی] باسەکانی [پولی هیستور]ی بە کورتی هێناوتەوە ، وە ئەوەمان دێنێتە یاد کە لە سەرەتای کتێبەکەدا ـ بە پێی نوسینەکەی بروس ـ ناوی ٨٦ پادشای بردوە کە ٣٣٠٩١ ساڵ لە دوای تۆفان سەڵتەنەتیان کردوە، بەڵام [یوسوی] خۆی تەنیا دو ناو [ئوسخوی] و [خرماسبل]ی بۆ نمونە هێناوەتەوە •ئێمە کە شارەزای ناوەڕۆکی حوکمڕانی سەڵتەنەتی سۆمەریەکانین ئەتوانین بڵێین کە [بروس] لەم ژمارەیەدا [لەوە ئەچێ بە هەڵە لای دابێ]نەك تەنیا یەك ،بەڵکو چەند زنجیرەیەکی ناوچەیی رازاندۆتەوە •وەکو لە داستانی ئەرمەنیەکانا دەر ئەکەوێ کە [پولی هیستور] ••• هەریەکەی بە ناوێکەوە کە لە کتێبەکەی [بروس]دا باس کراوە ناوی ناوون • بەم جۆرە چەند نوسەرێکی تری پاش ئەوان ئەو ٨٦ پادشایەیان بە شێوەی زنجیرەیەکی کلدانی باس کردوە •دیسانەوە لە داستانی کتێبی ئەرمەنیەکانا [یوسوی] بەم جۆرەی نووسیوە : [دوای ئەو پولی هیستور ناوی سوڵتانەکانی ماد کە ٨ کەس بونو ٢٢٤ ساڵ سەڵتەنەتیان کردوە باسی ئەکات] ••• هتد •

مێژوی [مارمیخائیل] ئەویش ئەم باسانەی [نەختێ بە کورت کراوەیی هێناوەتەوە] بەڵام لە جیاتی [پولی هیستور]ئەو [ئابیدن]ی کردوە بە سەرچاوەی راستی باسەکانی • هەروەکو یادداشتی ژمارە [٧٩]ی ئەم بەشەدا دەر ئەکەوێ ، دیسانەوە [ئابیدن]یش سودی لە کتێبەکەی [پولی هیستور] وەرگرتوە • جگە لەمانە لە بریتی ژمارەی هەڵەی [٨ پادشای] زنجیرەی ماد قسەیەکی راست تر پەیدا بوە [بەپێی ئەو بەڵگانەی لەناو روداوەکانی کۆتایی ناوەڕۆکی حوکمڕانی سەڵتەنەتی سومەریەکان لە سەردەمی گوتیەکاندا کە بروس سودی لێ وەرگرتون] بەم جۆرەیە : [لە دوای ئەوە کە فەرمانڕەوایی

کلدانیەکان کۆتایی هات مادەکان دەستیان کرد بە حوکمڕانی کردنو ۲۱ پادشایان هەبو] ئەم سەرچاوەیە باسی ساڵەکانی سەڵتەنەتەکەیان ناکات •

سەرچاوەی سێیەم ـ واتا نوسینەکانی [گێورکی سینکل] ـ ئەو ئەم باسانەی لە نوسینەکانی [بروس] وە یان [پولی هیستور] یان وەکو [یوسوی] کەمتر وەرگرتوە ، زۆرتر لەگەل پولی هیستور کە گوایە بە بیروڕای ئەو نوسەرێکی کافرە بەربەرەکانێی ئەکات ، لەبەر ئەوە بۆچی پولی هیستور ژمارەی شێواوو باوەڕ پێنەکراوی لەبارەی ماوەی سەڵتەنەتی زنجیرەی بابلیەکانەوە داناوە ،لە هەمان کاتا [بە یارمەتی نوسەرێکی تر کە ناوی «ئانیان»ە «لەگەل هەندێك لە مێژوو نوسانی کلیسەی مەسیحی خۆمان» ـ کە مەبەستی بە «پانودور»ە ـ هەولیان داوە کە ژمارەکانی سەڵتەنەتی بابلیەکان لەگەل بیروڕای تەوراتدا بگونجێنن] ، وە ئەو ژمارانەیان لە هەندێك شوێنا بە سەرگەردان دائەنا [گێورکی سینکل] بەم جۆرەی نوسیوە : [پولی هیستور] لە دوای ئەم رۆژگارە ـ بە ئاشکرا رۆژگاری نوسیوە ـ ۸٦ پادشا ،دوو پادشای کلدانی [ئوخوی] و [خوماسبل] ، ۸٤ پادشای مادیو زەڕدەشتو ئەوانەی کە دوای ئەو بون ، ۷ پادشای کلدانی هێناوەتەوە][۸۱] •

ئەمە هەر ئەوەیە کە هەندێك وایان زانیوە [بروس] لە زەڕدەشتی وەرگرتوە ، بەڵام ئێمە ئەوە ئەزانین کە [یوسوی] لە نووسینی روداوی ئەرمەنیەکانا باسی ئەوەی کردوە کە [پولی هیستور] ـ تەنیا ناوی دو سوڵتانی کلدانی فەرامۆش کردوە بەڵکو ناوی ئەو ۸٦ کەسەکەی تری هێناوە • ئینجا لەبەر ئەمە ئاشکرایە کە [سینکل] نە نووسینەکانی [یوسوی] وە نە هینەکانی [پولی هیستور]ی نەخوێندۆتەوە بەڵکو ئەو زانیاریانەی خۆی لە سەرچاوەی [پانودور] وەرگرتوە ، کە ئەم سەرچاوەیەش ناوی ئەو دو سوڵتانەی هێناوە • بەڵام بە پێویستی نەزانیوە ناوی هەمو ئەو ناوانە بهێنێ کە ناو بردنیان لەسەر زمان گرانە • [سینکل] نەختێك لە خوار ترەوە لە بارەی [پولی هیستور]و هی

ترەوە بەم جۆرەی نووسیوە : « کۆنترین پادشایان کـە بـە خواو نیو خوا ناویان ئەبردن ، ئەوانەیان کە لە دوای ئەوان بون ، نوسیویانە کـە ماوەیەکی زۆر سەڵتەنەتیان کردوە ، وە وایان زانیوە کە دنیا ئـەبەدی یـە وە ئەمـە پێچەوانەی نوسینە خواوەندیە پیرۆزەکانە ، وە ئەوانەی لە دواییدا لەدایك بون هـەمویان سـاڵە شـەمسیەکان [هەتاویـەکان] ئەزانن و ئاگادارن ، وەك ئەندامێکی وێران خوا ، نەوەکو ئەوەی [پانودور] و هـەندێکی تر لێی تێ گەیشتوون ، بەوەوە بەستراونەتەوە کە زەردەشت ساڵەکانی پادشایانی کردوە بە ساڵی شەمسی ۰۰۰۰] .

ئەم باسە کە بە شێوەی مەتەڵ ئەکەوێتە بەرچاو هەرخۆی بابەتەکە بـە تەواوی رون ئەکاتەوە ، دەرئەکەوێ کە [پانودور] لە بارەی ئەوەوە کە بۆچی ساڵەکانی سەڵتەنەتی یەکەمین زنجیرەی پادشایان لە ٨٦ پشت پێك هاتووە و بـە ژمارەی ئەستێرە شوناسی باس کراوەو زنجیرەی دوایی کـە مادەکان بوون بەژمارەی ئاسایی باس کراوون .. ئەمە ئەی هێنێتە وەڵام ، لەوە ئەچێ ئەمە گیروگرفتێکی دەرونی بێ و هۆی ئەوە بێ کـە بەتەواوی تێ نەگەیشتبن .. چونکـە کۆکرنەوەی ناوی ٨٦ پادشا لـە یـەك زنجیرەدا ـ هـەروەکو لـە ناوەڕۆکی سەڵتەنەتی سۆمەریەکانا بۆمان دەرکەوتوە ، دوایی لـە ئـەنجامی کەم کردنەوەی نوسینەکانی [بروس]دا رویداوە .بەراستی چەند زنجیرەیەکی ئەفسانەیی لە بارەی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەوانەوە باس کراوە ، کـە هـەر وەکو چەند زنجیرەیەکی راستی مێژوویی لەناو یەك زنجیرەدا کۆ بونەتەوە . چونکە سنورێك لەنێوان ژمارە خەیاڵیەکان و ژمارە راستەکانا کـە [پانودور] نوسیونی دانەنراوە ، لەبەر ئەمە بیروڕای ئەو هەموی هەڵە بووە ، بە بیروڕای ئەو زەردەشتی [ماد] گوایە فەلەك شوناسێکی تازە بووە ـ لە زوربەی نوسینە کۆنەکانا زەردەشت بەم جۆرە باس کراوە ـ یەکەمین کەسێکە کە لە جیاتی حیسابی [ئیما ئەستێرە ژمێری] «فەلەکی» وەخت ژماری و ساڵە خۆرشیدیەکانی

هەکار هێناوە،ئەوە ئەزانین کە [یوسوی] دیسان لەبارەی پادشاکانی ناواخنەکەی [بروس]ەوە ناوی نەهێناون ، هەروەها [پانودور] بۆ ئەوەی بیروڕاکەی خۆی بسەلمێنێ بە پێی ئەوە کە لە وەخت نامــە سادەکانیەوە وەرگرتوە زەرِدەشتی بە یەکێك لە پادشایانی زنجیرەی ماد ناو بردوە • [سینکل] کــە نوسینەکانی [یوسوی] نــەخوێندۆتەوەو بە هیچ جۆرێك لــە نوسینەکانی [پولی هیستور] شارەزا نەبووە ، کــە لــە کتێبەکــەی [پانودور] ناوی زەرِدەشتی دیوە وای زانیوە کە [بروس] یش ئەو ناوەی لە نوسینەکانیا باس کردوە •

بەڵام ئەگەر ناوی زەرِدەشت نەك تەنیا لە کتێبەکەی [پانودور] بەڵکو لە نوسینەکانی بــەر لەویشدا تا [بروس] باس بکرابایە ، بێگومان ئەبوایــە لــە داستانە ئەرمەنیەکانی [یوسوی] شدا ببوایە ، چونکــە ناوی [زەرِدەشت] لــە ئەرمەنستان تەواو بەناوبانگ بووە • لە داستانە ئەرمەنیەکانا وشەی گرانو پێچاو پێچ وەکو [ئوخوی]و چەندەهای تر نوسراوە وماوەتەوە ، وە ئــەبوا هەرناوی زەرِدەشت ببرایەو بنووسرابایە •

ئەم نوسینانەی ســەرەوە ئەوەمان بۆ رون ئەکــەنەوە کــە نوسینەکانی [بروس] لەگەل داستانە مێژوییەکانی بابلیەکانا بەرامبەرن وە ئــەو لــەبارەی ناوەرِۆکی پادشایانی مادەوە ــ واتا گوتیەکان ــ تەنیا ئەوەندەی بۆ کراوە ئەو ناوانە بنوسێ کە لە داستانە جۆربەجۆرەکانی زنجیرەی سەڵتەنەتی سومەریەکانا هەبووە • بەڵام ناوی زەرِدەشت [پانودور] وەیان یەکێ لە نوسەرەکانی دوای [یوسوی] بۆ ئــەوەی خۆی بــە شارەزایی زانیــاری مێژویی رۆژهــەلاتەوە بنوێنێت هەر بۆ ئەو مەبەستە نوسیوێتی •

بەشێك لە نوسینی کتێبەکەی [بروس] بــەو شێوەی ســەرەوەو بە بێ راستەوخۆ ئەتوانرێ رون بکرێتەوە ، هەندێك لــەو زانیاریانەی لە کتێبەکەدا هەیە ــ وەکو ئەو باسانەی کە پەیوەندی‌یان بەروخانی ئاشورەوە هەیە ــ لــە بارەی زیندوکردنەوەی مێژوی مادەوە زۆر گرنگە •

بەم جۆرە لەبارەی زانینی میژوی مادەوە ناتوانین بەهۆی سەرچاوە یۆنانیەکانەوە بگەینە ئاوات و شارەزایی تەواویان لێ وەربگرین،بەلام لەم روەوە نوسینەکانی هردوت لەوانی تر تارادەیەك راستترەو پشتی پێ ئەبەسترێ • بەلام لە نوسینەکانی [کتسیاس]و [کزنفون] مەگەر بە وردبونەوەیەکی زۆرو بەراورد کردنێکی خۆماڵیانەو سەرنجدانێکی ورد بتوانین چەند راستیەکی بچوکیان تیا بدۆزینەوە نەنانەت ناتوانین بە تەواوی پشت بەو باس و روداوانەش ببەستین کە بەو جۆرە ئەیدۆزینەوە ، نوسەرەکانی تر تا سەدەی سێیەمی پێش زاینی تارادەیەك زانیاری نیمچە راست ئەدەن بە دەستەوە •

نوسەرە یۆنانیەکانی ئەم دوایە تەنیا نووسینەکانی هردوت و کتسیاس و هەندێك لە هینەکانی کزنفون و بەشێکی زۆر کەمی [بروس]یان باس کردۆتەوە • بەلام ئەو نووسینانەی کە ئەوان لەبارەی میژوی سەلتەنەتەکانی رۆژ هەلاتی کۆنەوە نوسیویانە بەشێکی کەمی لە داستانێکی میژویی ترا هەیە کە ناتوانین بیکەین بەهینی هیچ نوسەرێك لەوانەی کە لەمەوبەر باسمان کردون • بەرای هەندێك لەو کەسانەی کەلەم بابەتە میژوییانە کۆلاونەتەوە ـ محققان ـ داستانی ناوبراو هینی میژوونوسە پێشکەوتوە کۆنەکانی یۆنان وەکو ـ هارون لامپساکی ـ یە •

بەلام زۆرتر لەوەئەچێ کە زانیاری ناوبراو هینی یەکێ لە نوسەرەکانی سەدەی چوارەمی پێش زاینی وەکو [دنیون][٨٢] بووبێت • لە پێشا باسی ئەو شتانە ئەکەین کە [ترویا پومپە] لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوەو لە بارەی میژوی رۆژ هەلاتی کۆنەوە باسی کردوەو نوسینەکانی هردوت و کتسیاسی وردتر داوەتە بەر سەرنج و شی کردونەتەوە • بەلام داخەکەم کە نوسینەکانی [ترویاپومپە] زۆر بە کورتی کە [ژوستین] ناوێك [لە سەردەی دووەمی زاینیدا] کۆی کردۆتەوەو رێکی خستوون بە دەستی ئێمە گەیشتووە • دوای ئەوەش [پولین] کە لە سەدەی دووەمی زایندا چەند کورتە داستانێکی لەبارەی میژوی

لەشکرکەشیەوە کۆ کردۆتەوە ، چەند بەسەرهاتێکی لە بارەی مێژوی مادەوە نوسیوتەوە کە بە شێکیانی لە هردوت‌و کسیاس‌و بەشێ تری لە داستانەکانی تر وەرگرتوە ، ـ کە لە نوسینەکانیا چاوی لـە هردوت‌و کتسیاس کردوە ـ ئەمەش لەوە ئەچێ ئەو باسانە بن کە [دینون] نوسیونی • بە داخەوە ئـەڵێم کە ئەو نوسراوانەش تا چ رادەیەك لە راست ئەچن ! بـەڵام هەندێک لـەو زانیاریانە لە سەرچاوە رۆژ هەڵاتیە کانیشدا هەیەو سەرچاوە رۆژهەڵاتیەکان تارادەیەك راستی ئەم نوسراوانە ئەسەلمێنن •

ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە شوێنەوارێکی زۆری نوسەرە یۆنانیەکان‌و لاتینیەکان ـ تەنانەت [ئامین مارتسلین] مێژو نووسی سەدەی چوارەمی زاینی ـ بەشێوەیـەکی ئاڵۆزو شێواو لـەبارەی رۆژگاری دوایی مێژوی مـادەوە دەر ئەکەوێ کە لە بارەی مەسەلەی مێژوی مادەوە سودیان لێ وەرئەگرین • بـە تایبەتی نوسـەرە جوگرافیاییـەکان وە لـە وانیش [ئاسترابون] ـ لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ـ زۆر گرنگە • ئاسترابون زانیاریەکی زۆری لە بارەی کتێبە مێژوییی‌و جوگرافیا ییەکانی سـەردەمی کۆنەوە هەبووە • وە شارەزاییەکی زۆری لە بەرهەمی نوسینی ئەو نوسەرە کۆنانەوە بووە کە شوێنەواریان نەمابو، وە بـە هۆی ئـەوەوە گـەلێك لـە نوسینەکانیان بـە پارێزراوی ماونەتەوە • نوسینەکـانی [کـلاودی پتولە] ـ بطلیمـوس ـ ئـەستێرە شـوناس‌و زانای [ماتماتیك] ، جوگرافیازانی بە ناوبانگی [سەدەی دوەمی زاینی]وە بە تایبەتی [کتێبی جوگرافیا]و مێژوی [نەریتی شاهانە]ی ئـەو کـە لـەروی سەرچاوە رۆژهەڵاتیەکانەوە وەرگیراوەو نوسینەکانی [ئیلینی] سروشت شوناس بلیمەتی سەدەی یەکەمی زاینی ـ مێژوی سروشت ـ زۆر بە کەڵکن •

بەم جۆرە وەکو باس کرا ئەتوانین بەشێوەیەکی تایبـەتی مێژوی مـاد وەکو کۆمەڵە بەسەرهاتێکی مێژویی سەردەمی کۆن لەناو نوسینی سێ تا پێنج نوسەر هەڵبژێرین • هەرچۆن بەراوردی بکـەین بۆ سـود وەرگرتن لـەو

بەسەرهاتە میژوییانە ناتوانین بەناو بردنو باسکردنی بەرهەمو بیروورای چەند نوسەرێك دەست هەڵبگرین بەڵکو ناچارین بنچینەی هەمو ئەو سەرچاوانە رون بکەینەوەو بگەینە ئەو ئەنجامەی کە نووسەر ئەم باسەی بۆچی وا نوسیوەو لەکام سەرچاوەی وەرگرتوە ، وە ئەوەش بەراورد بکەین کە تا چ رادەیەك باسەکەی بە راست نوسیوە ، دیسانەوە ئەبێ ئەو سەرچاوانەی تر ـ کە ژمارەیان هەر کەمە ـ پێویستە بەراوردیان بکەینو لێکیان بدەینەوە •

هەندێك لەو نووسینانە کە پەیوەندییان بە میژوی مادەوە هەیە لە سەردەمی هەڵگرانو فراوان بونی فەرهەنگی یۆناندا [هلینسم] لە ئاسیای نزیك نوسراوون ، وە ئەمانە لە داستانە میژوییەکانی یۆنان جیا ئەکرێنەوە ، لایەنێکی تایبەتیان هەیە ، [لە سەدەی سێیەمەوە تا سەدەی یەکەمی پێش زاینی] • وەکو ئەوە وایە کە کتێبی دانیال بەشێکی بە زمانی عیبریو بەشێکی بە ئارامی نوسراوە[٨٣] • وە کتێبی [یودیف]و کتێبی [بوویت]کە بە شێوەی یۆنانی بە دەستی ئێمە گەیشتوەو کەلەوەئەچێ لەبناغەدا بە زمانی ئارامی بوبێت[٨٤] •

ئەم سێ کتێبە میژوو نین ، کتێبی دانیال کۆمەڵە باسێکی زانیاری رەووشتە کە بە شێوەی ئەفسانەو رویەکی سیاسی هەیەو لەگەل روداوەکانی سەدەی دوەمی پێش زاینی تێکەڵە ، ئەفسانەیەك ئەدەنە پاڵ دانیال پێغەمبەر گوایە لەسەدەی شەشەمی پێش زاینیدا ژیاوە ، لەم کتێبەدا گەلێك باسو پارچە ئەفسانەی کۆنتر دەر ئەکەوێ ، بەڵام باسەکانی لەسەردەمی ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش زاینی کۆنتر نیە ، کتێبەکەی دانیال لە بارەی ئەم باسەی ئێمەوە بەگشتی ئەگەرچی باسی سەڵتەنەتی [مادەکانی] کردوە نرخێکی میژوویی نیە •

دوکتێبەکەی تریش شێوە داستانیو بێ کەڵکن •

ناوی [ئارفاکساد] لە رەگەز شوناسی هۆزەکان [شجرة النسب الاقوام]کە

نە تەوراتدا هەیە وەرگیراوە[٨٥] • ناوەڕۆکی ئەم باسە لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایینیدا نوسراوە (؟) لە رەگەز شوناسی هۆزەکاندا [ئارپاکساد] ناوێکی جوگرافیاییە ، شەڕی بەختە نەسر ـ بخت النصر ـ لەگەل ئارفاکسادا بەپێی داستانەکانی [ کتێبەکەی یودیف ] هیچ بایـەخێکی نیـە ، بـەڵکو هەر لەبەر ئەوە ئەم باسـە نوسراوەتەوە کە خوێنەران ئـەم باسەیان بێتـە یادو لەگەل روداوەکانی سـەردەمی پێش خـۆیاندا واتا شـەڕی [ئانطیوکوس]ی چوارەم پادشای سلوکی کە لە خاکی ماددا بوە بەراوردی بکەن • وە لەشکر کەشی [ئولوفرن] بۆ سەر یەهودیەکان ئەبوا لەگەل لەشکرکەشی ئانطیوکوسی چوارەم ، لیسی ، لـەساڵی ١٦٧ ی پێش زایینی دا باس بکرابایـە ، وە هۆی نوسینی ئەم داستانە نیشتمان پەرستیـیە ، هەر ئەمە بوە •

[کتێبی توویت] داستانێکی ئاینی ئەفسانەییە ، بەسەرهاتەکانی لـەگـەل داستانی ئارامی [ئاخی کار] کـە لـە رۆژهەڵاتی نزیك دا بەناوبانگە پێکەوە پەیوەندن ، بەم جۆرە وەکو داستانی ناوبراو ئەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سەدەی هەشتەمو حەوتەمی پێش زایینی • قارەمانانی داستانەکە ئەوانەن هەروەکو لـە [کتێبی پادشایان] دا باس کراوە کـە بە هۆی ئاشوریەکانەوە کۆچیان کردوە بۆ وڵاتی ماد • لـەگـەل ئەوەدا پەیدابونی ئـەم ناوانـە لـەسەر لاپەڕەکانی داستانەکەدا دیارە ، بەم جۆرە ناتوانرێ بەوردیو بە راستی ئەو سەرچاوانەی کـە نوسـەر سـودی لـێ وەر گـرتوون رون بکـرێنـەوە • بـەهـەر جـۆر بـێ جگـە لـەکتێبی [ پادشایان ] یـەکێك نە بەسەرهاتە کۆنەکانی [داستانی ئاخیکار] کـە دەست ئێمـە نەکەوتوەو بێ گومان بەر لە کۆتایی سـەدەی حـەوتـەم نوسراوەو تارادەیـەك بـەراستی چۆنیەتی ئەو سەردەمە ئەخاتە روو سودی لێ وەرگیراوە[٨٦] • لەوە ئەچێ نوسەری [کتێبی توویت] سودی لە هەندێ نوسراوەی ئـەدەبی رۆژهـەڵات وەرگرتبێ • ناوبراو نـەختێك شارەزای جوگرافیاو مێژوی ماد بووە[٨٧] • داخمان ناچێ چونکە زۆرتر گرنگیو بایەخی بە نوسینی ئاینی داوە بایەخێکی

ئەوتۆی بە میژوی ماد نەداوە • ئەوەش فەرامۆش ناکەین کە نوسەر شارەزای ئامۆژگاریەکانی ئاینی زەردەشت بووە[88] •

دیاریکـردنی میژوی نوسینی [کتیبـی تویت] زۆر گرانـە ، بـەلام بێگومان نوسەرەکەی [پێچەوانەی ئەو هەمو هەوڵو تەقەلالایەی کە دوایە بۆ ئـەوەی بـــەرێكو پێکی بێتەدی] ئەمـانە بـۆ ئاشـور[89] یـان مـاد دور نەخراونەتەوە ، بەڵکو ئەوانە بون کـە لە [دیاسپور] ـ دا ژیاون ، بـەرای زوربەی خەڵك لەسەر زەمینی پارتو لەدوای سەدەی سێیەمی پێش زاینی[90] واتا لە سەردەمی کۆنتر لـە رۆژگاری سـەڵتەنـەتپەوایی میتریداتی دووەم [١٢٣ ـ ٩٠ی پێش زاینی] نەبوە کە ژیاوە[91] •

[یوسف فلاوی] میژو نوسی عیبری زمان کە لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوەو بە زمانی یۆنانی نوسیویێتی ئەویش دیسان لە کتێبی [رۆژگاری کۆنی هۆزەکاندا] باسی مادی کردوە ، نوسینەکانی ئەو بەهیچ جۆرێك راست نیە ، [هەریەکەی لـە لایەکەوەو] لـە [بروس]و •• نوســەرەکانی تری یۆنانەوە وەری گرتوە •

دواسەرچاوەیەك کە باسی مـادی کردوەو شـایانی ئـەوە بێ باسی لێوە بکرێ [میژوی موسی خورنی] ـ موسس خورناتسی ـ نوسـەری بەناوبانگی ئەرمەنی یە کـە لـە سـەرەتای سـەدەکانی ناوەڕاستدا داینـاوە بـەزمـانی ئەرمەنی بوە •

موسی خورنی بۆ نووسینی میژوەکەی خۆی لە چەند سەرچاوەی هەمە جۆرو فراوان وەکو تـەوراتو نوسینی نوسـەرە یۆنانیەکانو سریانیـەکانو ئەرمەنیەکان سودی وەرگرتوە ، داخەکەم لە سەردەمی موسی خورنیدا [بـە پێی میژوە بەناوبانگەکەی لـە سەدەی پێنجەمو سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینیدا ژیاوە] لەو کاتەدا لێکۆڵینەوەو رەخنە گرتن لەناو نوسەرە یۆنانیەکاندا نەبوە •

موسی خورنی نەیئەتوانی سود لە سەرچاوە پێشوەکان وەکو نوسینەکانی هردوت وکتسیاس‌و کزنفون وەربگرێ بەڵام سودی لەو نوسینانەی دوایی وەرگرتووە کە ئەو سەرچاوانەیان باس کردوەو باسەکانیان لەوانەوە وەرگرتوە • هەندێك لە نوسینەکانیشی کە لە بارەی سەردەمی کۆنەوە ئەدوێن زۆر تێکەڵو پێکەڵن • ئەم ئاڵۆزیە هۆیەکی تایبەتی تری هەیە ، چونکە موسی خورنی بە تایبەتی پشتی بەکتێبی کابرایەکی سوریەیی بەستوەو باسی لێوە کردوە کە ناوی [مارئاباس کاتینا] بوە ، کە لەوە ئەچێ تەنیا ئەو لە بارەی رۆژگارێکی نزیکەوە زانیاری لێ وەر گرتبێ ••[مارئاباس کاتینا] یا ئەو کەسە ، کە ئەم ناوەی بۆ خۆی داناوە] خۆی بە هاو چەرخی یەکەمین پادشای ئەشکانی لەسەدەی دوەمی پێش زایندا لە قەڵەم ئەدا ، لەگەڵ ئەوەدا کە نوسینەکانی کۆمەڵە نوسینێکی نوسەرە کۆنەکانە کە بە شێوەیەکی نارێكو پێك بەسەر یەکا نوسراوون وە مێژووی ئەو نووسینانە ئەگەر لە سەدەی سێیەمی زایینی‌دا بەدواوە نەبێ پێشتر نیە •

موسی خورنی زۆرتر ئەو باسانەی نوسیوە کە مێژونوسە پێشوەکانی تر لە بارەی مێژووی ئەرمەنستانەوە نوسیویانە • لەبەر ئەمە باسی [تیگرانی یەکەم] کۆنترین شای ئەرمەنستان‌و ••• کردوە زۆر بە وردی داویەتیە بەر سەرنج‌و لە باسەکانا بایەخی پێداوە • هەروەها ناوی [ئاستیاگ]ی بە [ئادەهاك] بردوە، لیرەدا لە نوسینەکانی موسی خورنی دا دەر ئەکەوێ کە مێژو نوسی ئەرمەنی ناوبراو ویستوێتی ئەو باسانەی کە لە سەرچاوە یۆنانیەکانەوە وەری گرتون لەگەڵ باس‌و بەسەرهاتە مێژوییەکانی رۆژهەلاتدا پەیوەستە بکات• ئاژدەهاك ـ azi[s]DAHAKA ـ « ماردهاك » ی ئاویستا زۆردارێکی ئەفسانەیی‌و مارێکی شێوە ئادەمیزاد لە خەڵکی باوری Bawri [بابل][٩٢] کە بە دەستی [ئراتیلون] TraiTeuna [فەریدون] کوژراوە[٩٣] ، لەگەڵ ئەوەدا ناوەکان بەهیچ جۆرێك لە [ئاستیاگ] ناچن • ئەم ئاڵۆزیە دیسان لە

کۆنەوە توشی ناوی [ئاستیاگ] بووە(٩٤) • هەرچۆن بێ ئەم قسە بێ بناغەیە لە سەدەی نۆزدەهەمدا(٩٥) سەری لـە گـەلێك لـە نوسـەرەکانی ئەوروپای رۆژئاوا شێواندوەو توشی هەڵەی کردون • ئاشکرایە کە موسی خورنی کەمتر لە شارەزایانو نوسەرانی ئەوروپای سەردەمی تازە سەرچاوەی یۆنانی دەست کەوتوەو خۆی بە لێکۆڵینەوەیانەوە خەریك کردوە ،وەکو ئەو نامانـەی کـە یۆنانیەکان لە بارەی ناوی مادەکانو [ئاویستایی] ــ کە لە سەردەمی ئـەودا کۆن بون ــ یەوە دەستیان کەوتوە دەستگیری نەبوە،توانای نەبوە ئەو نوسراوو سەرچاوانەی دەست بکەوێ • بەڵکو شێوەی نامەکانی چۆن بیستوە بەو جۆرە داویەتیە بەر سەرنجو باسی کردون •

موسی خورنی نەك هـەر سودی لـە بەسەرهاتە مێژوییەکان وەر گرتوە بەڵکو سودیشی لـە داستانە ئەرمەنیەکانیش وەر گرتوە • وە لە داستانەکەی [تیگران]قارەمان ــکە مێژو نوسان بەو تیگرانەی ئەزانن کە گزنفون باسی کردوە بە هاوکاری لەگەل فەریدون لە دژی ئەژدەهایەك کـە [ئاژدەهاك] ی ناو بوە راپەڕیون ، باسی کراوە • دیسانەوە [ئاژدەهاك] و [ئاستیاگ] لـە نوسینەکانی گزنفوندا کـە هاو چەرخی تیگران بون موسی خورنی زورتر بـە هـەڵەدا بردوە(٩٦) •

نوسینە ئەرمەنیەکانو بـە تایبەتی کتێبـەکـەی موسی خورنی لەچـەند بوارێکی جۆربەجۆردا باسیان کردون • بـەڵام جیا کردنەوەو لێکۆڵینەوەی سەرچاوە ئەرمەنیەکان زۆر گرانە • ئـەم قسەیەش با بدرکێنین : رەنگە بێ موسی خورنی لە هەندێ سەرچاوەی تایبەتی رۆژهەڵاتەوە ــ کە ئیستا لە لای ئێمە نین ــ سودی وەرگرتبێ ، لەگەل ئەوەدا جێگای باوەڕ نیە کە لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا بەسەرهاتێکی مێژویی سەربەخۆ کـە بۆ ئەوە بشێ پشتی پێ بەسترێ لە بارەی سەڵتەنەتی مادەوە بوبێت ، ئەتوانین بڵێین کە لە رۆژگاری ساسانیەکانا [ لـە سـەدەی سێیەم تا حـەوتەمی زاینی ] تەنانـەت بیرەوەری

هەخامەنشیەکانیش بەر گوێ نەئەکەوت(•••)لە جیاتی قارەمانانی ئاویستا وەکو کوی کوات ] [ کەیقوباد ] وە [ کوی خسرەو ] [ کەیخوسرەو ] وە [کوی ویشتاسب] [گشتا سب]و پادشایانی تری کۆنی ناوچەکە بەم جۆرە باس ئەکران • سەردەمی سەڵتەنەتی هەخامەنشیەکان لە داستانە مێژویەکانی رۆژهەڵاتدا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە تەواوی فەرامۆش کرابو ، تەنانەت لەبارەی دەوڵەتی پارتەوە هیچ جۆرە زانیاریو شارەزاییەکی رونو راست نەبو •

نوسینی نوسەرە ئەرمەنیەکانی تر وەکو [موسی کالانکاتوئی نوسەری ئەرمەنی ـ ئالبانی] لە بارەی رۆژگاری دوای مێژوی [ئاتروپاتن]و [ئالبانەوە] جێگای سەرنج لێدانن •

لە بارەی ئەو سەرچاوانەوە کە باسی مێژوی ماد ئەکەن بە دورو درێژی دواین ، وە لە بارەی هەندێکیانەوە گەیشتینە ئەنجامێکی بەکەڵك ، لەگەل ئەوەدا کە باسکردنی ئەم سەرچاوانە شتێکی پێویست بوو ، لە نوسینەکانی داهاتومانا هەروەها نرخی ئەو نوسینانەی کە تا ئیستا لە بارەی مێژوی مادەوە نوسراونو ئەو بیروڕا جیاجیانەوە باسی ئەوە ئەکەین کە ئایا ئەم سەرچاوە زیان فلاّن نوسین راستو بایەخدارە یام نەء ـ یاخود هەروەکو بە داخەوە نەگەلێك لەو سەرچاوانە دا گومان لە نوسینو باسەکاندا پەیدا ئەبێت ـ کە باسی سەرچاوەیەك یان نوسەرەکەی ئەکەین پێویستە بە وردی سەرنجی نوسینەکەو باری رۆژگاری نوسینەکەو سیمای نوسەرەکە بدەین وە لە رواڵەتی مێژوییو ئەدەبیو سیاسی نوسینەکەو نوسەرەکە بە وردی بکوڵینەوە• ئەبێ ئەوە بزانین کە هەر باسێك لە هەر سەرچاوەیەکەوە وەرگیراوە چیەو چ نرخێکی هەیە ئەگەر بەم جۆرە نەبێ ئەوا ناتوانین بەرێكو پێکیو رەوانی بگەینە ئەنجامو بیروڕای خۆمان بچەسپێنین •

**دوائەنجامی سەرچاوەکان بەم جۆرەیە :**

سەرچاوە بزماریەکان ـکە زوربەیان هاوچەرخی روداوە باسکراوەکانن- ئەمانە لە سەرچاوەکانی تر کە باسیان لێوەرگیراوە راست ترن • بـەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کـە زوربـەی ئەوانـەش بەلایـەنی بیروباوەڕی رەسـمی ئـەو رۆژگارەدا لای داوە •

سەرچاوە ئاشوریەکانو تارادەیەکیش ئورارتوییو بابلیـەکان کـە لـە سەدەی نۆیەم تاشەشەمی پێش زایندا بون لە هەمو سەرچاوەکانی تر تەواو ترو راست ترن ، چونکە کەمتر بەم لاو بـەو لادا لایان داوەو کـەمتر تێکەڵاوی رقەبەرایەتیو لایەنگیری لایەنێك بون •

لـەناو ئـەو سـەرچاوانـەدا کـە باسەکانیان لێ وەرگیراون زۆرتر پشت بە نووسینەکانی هردوت ئەبەستین • بـەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین ئەوانەی کە ئەو نوسیوێتی کاتی خۆی زوربەی بە دەمی بۆیان گێڕاوەتەوە ، وە لەوە ئەچێ بە شێوەیەکی بێ لایەنی بێ •

قسەی پێغەمبەرە ••• کانیش ئـەوانیش لـەوە ئەچێ شتی راستیان لێ بەدەست بێت ، بەڵام سەرچاوەکانی تر وەکو نوسینەکانی کتسیاس ئـەوەندە پشتیان پێ نابەسترێ ، ئەگەرچی لەوەش ئەچێ راستەوخۆ باسێکی راستیان نوسیبێ بـەڵام بەراورد کردنیان لـە گـەل سەرچاوەی ترو رون کردنەوەو پشکنینی باسەکانو لێکدانەوەیان زۆر گرانە • هەروەها زوربەی سەرچاوەکانی تر مەگەر بە رێکـەوت لەبارەی رۆژگاری مێژوی مادەوە [بە پێی بیرو رای ئێمە] روداوو بەسەرهاتێکی راست بدەنە دەست • هەرچۆن وە لە هەر کاتێکدا بێت زۆر بە وردی سەرچاوەکانمان پشکنیوەو رونمان کردونەتەوە •

## ٢ ـ ئاویسـتا

ئاویستا لەناو ئـەو سەرچاوانەدا کـە لـە بارەی مێژوی مادەوە دواوون

نوێنێکی تایبەتی هەیە ، ئاویستا کتێبێکی پیرۆزی ئاینیی زەردەشتە کـە بـە زمانێک لە زمانە کۆنە رەسەنەکانی ئێرانیو ریشەی هیندو ئەوروپایی نوسراوە، بەڵام تا ئیستا ئایا لە سـەر خاکی ماد پەیدا بوە یان لـە ناوچەیەك لـە ئاسیای ناوەڕاست هەر لە لێکۆڵینەوەو باسکردندایە • زانایانو روشنبیران هەریەکەیان بڕوایان بە لایەنێکیان هەیە •

رۆژگاری رێکخستنی کۆنترین بـەشی ئاویستا هێشتا رون نەبۆتەوە ، هەندێك لە شارەزاو زانایان لەو باوەڕەدان کە زەردەشت هاوچەرخی داریوشی یەکەم [٤٨٥ ـ ٥٢٢]ی پێش زاینی بووە • [هرتل] و [هرتسفلد] ئـەوانیش لـەو باوەڕەدان ، لـەناو زاناو رۆشنبیرەکانی شورەویشدا ئاکاد میسین و•و• ئاسترو ئەویش باوەڕی هـەر وایە • بـەڵام زاناو شارەزایانی تر سەرەتای کۆنترین بەشی ئاویستا بە زمانە کۆنەکانی تر ئەزانن •

بەشێك لە یاسا نوسراوەکان کە لە سەردەمی ساسانیەکانا ـ لە سەدەی سێیەم تا پێنجەمی زاینی ـ لە ئاویستا پێك هاتوە تا ئەمڕۆ بـەدەستەوە مـاوە ئەکرێت بـە چوار بەشـەوە وەکو : [یسنا] وە [وندیداد] ـ ویدودات ـ و [یشت]ەکانەوە [ویسپرد] •• ئامۆژگاریە رێکخراوەکان کە لە بارەی زمانەوە کۆنترین بەشی ئاویستایە ئەمانە بەشێکن لە [یسنا] • ئەم ئامۆژگاریانە ئەوانەن نە پێیان ئەڵێن [گاتا] ـ گاتاکان ـ وە بریتین لـە کۆمـەڵـە ئامۆژگاریەکی کێش داری ئاینیو کۆمەڵایـەتی کە قسەی ـ لەو وێنـەیەی ـ پێغەمبـەرانی تەوراتمان دێنێتەوە یاد ، هەندێك لە زانا ئەوروپاییەکان کە شارەزای مێژوی زەردەشتن [گاتەکان] بە هی زەردەشت ئەزانن • ئەم ئامۆژگاریانە بە شێوەی ئەدەبی زمانی سەرەتاییو کۆنتر لە پارسی کۆنو نزیکتر بە زمانی [ودا]یـە هیندیەکان نوسراون •

ئەم جۆرە شوێنەوارانە بـە دەمی لـە کیشوەرەکانی تری رۆژهـەڵاتی نزیك دابووە ، کەباری کۆمەڵایەتی نیوەی یەکـەمی هـەزارەی

یەکەمی پێش زاینی تیادەرئەکەوێت• گومان نابرێ کە [گاتاکان]دوای هاتنەڕوو دەمودەس نوسرابنەوە ، چونکە لەوە ئەچێ [گاتاکان] ماوەیەکی زۆر بە زارەکی باس کرابن‌و گێڕدرابنەوە ، کاهن‌و پیرەوەکان لە یەکتریەوە بیستویانەو وەریان گرتبن‌و ئەوانیش بۆ خەڵکی تریان گێڕابنەوە • تا دوایی لەکاتی رێکخستنی کونترین وردە بەشەکانی ئاویستادا لە کاتێکدا کە لە دوای داریوشی یەکەم کەنوسین بە ئەلف وبای ئارامی ئەنوسرا ئەوانیش نوسراونەوە(٩٧) • [ یسنای حەوت بەش ] کە بە شێوەی [ گاتاکان ] نوسراوەتەوە ئەویش هەمان شێوەی زمانە •

بەشێکی تری [ یسنا ] بریتی‌یە لە پارانەوە لە یەزدانەکان‌و یاسای زەردەشتی‌و نەریتە ئاینیەکانو •••• [ ویسپرد ] « لە ئاویستا VISPE-RATAVO تەواو کەری شێوەی ناوەرۆکی [یسنا]یە کە لەوە ئەچێ لە دوایدا نووسرابێتەوە [یشت] یەشتەکانیش بریتی‌یە لە کۆمەڵە سرودو وتارێك ـ کە هەندێك لەوانە بۆ خواوەندەکان وتراوە ـ هەندێ لەو سرودانە بەشێوەی [گاتاکان] نوسراوون • لەوە ئەچێ نوسینەوەی ئەم کتێبە [وەکو هەندێ لە بەشەکانی تری وردە ئاویستا] یان [ئاویستای بچوك] لە زەمانێکدا بووبێ کە ئاینی زەردەشت ئەو ناوچەیە گرتبێتەوەو لایەنێکی رەسمی بۆ خۆی پەیدا کردبووبێ ، لەبەر ئەوە چونکە لە چۆنیتی یەکترو گەلێك بابەتی ئاینی ترا وەکو مەسیحیەکان لە یەکتر ئەچن • وە گەلێك بابەتی ئاینی کەپێش لە ئاینی زەردەشت لە ناو خەڵکا بەهادار بوە تیایەتی • لەبەر ئەمە بابەتەکانی [یەشتەکان] زۆر فراوان‌و کۆنن ـ تەنانەت لە «گاتاکان» کۆنترن ـ لەگەل ئەوەدا ـ بەڕای زوربە ـ لەکۆنترا بەشێك بوە لە کۆمەڵە یاسایەکی ئاینی(٩٨) •

دیارە کە [یسنا]و [یەشتەکان] و [ویسپرد] ئەمانە بەشێکن لە کتێبی ئاویستای گەورە [نسکەکان] کە بە دەستی ئێمە نەگەیشتوە • ئەو

زەردەشتیانەی کە لە دوای گرتنی ئەو ناوچەیە لە لایەن تازیەکانەوە ولاتیان بەجێ هێشت لـە کتێبە پیرۆزەکانی خۆیانا ئـەو بابەتانەی کـە ئـەهمیەتێکی ئاینیان هەیە لە لای خۆیان پاراستویانە • بەلام یـەکێ لـە [نسك]ەکان واتا [ ویدودات VI-DAIVO-DATO ] زۆر کەم بە شێوەیەکی تـەواو ئەمرۆ بەدەستەوەیە [ئەویش بەزیادو کەمیەکی زۆرەوە]یە •

ئەم کتێبـە وەکو گفتوگو لـە نێـوان خواوەند ئاهورا مزداو زەردەشت پێغەمبەرا نوسراوەتەوە •وە بریتی‌یە لە کۆمەڵە باس‌و خواسێکی جۆر بەجۆرو ئەفسانەیی‌و ئامۆژگاری‌و نەریتی لە بوارە پاك‌و پیسەکاناو ••• جگە لەوەش [ئاویستای بچوك] کە کورتەیەکی ئاویستایە ئەویش بە پارێزراوی ماوەتەوە •

زمانی ئاویستای بچوك ئـەتوانین بـە شێوەی فارسی کۆنی سـەدەکانی شەشەم‌و پێنجەمی پێش زاینی بەڵکو کۆنتر بدەینە قەڵەم •• بـەڕای زۆربە ئەم زمانە هی ئەو کات‌و ناوچەیە کە ئاویستا [ زمانی تایبـەتی نوسینی کتێبی زەردەشتی بووە تیایا•واتا زۆر ڕێی تێ ئەچێ لە سەدەکانی پێنجەم‌و چوارەمی پێش زاینی دا]لەوێ پەیدا بووبێت•چونکە لەو کاتەداو هەندێ دوای ئەوەش کتێبی ئاینی زۆر نوسراونەتەوە • ئەم کتێبانە باسی باوەڕو بابەتی ئـەفسانەیی وایان کردوە کـە لـە دوایدا ئاین‌و شـەریعەتی زەردەشت سـوودیان لـێ وەر گرتون • بـەشێکی گرنگـی ئـەو کتێبانـە لـەو سـەردەمەدا بـەهی زەردەشتیان ئەزانین • بۆ نمونە هرمیپ ئەزمیری [سەدەی سێیەمی پێش زاینی] نووسەری یۆنانی لـەبارەی ئەم بەسەرهاتە بەناوبانگەوە کـە زەردەشت لـە ئامۆژگاریەکانی خۆیا دو ملیۆن دێڕ شیعری وتوە ئاگادار بوە[٩٩] •

ئەو ئەفسانەو باوەڕانەی کە لە ئاویستادا هەیە بەر لە سەردەمی پـەیدا بونی هـەخامـەنشیەکانە ، ئاویستا بـە تـەواوی نا شارەزای ئەمپـەراتوریتی هـەخامەنشیەکـان‌و پادشایانیان بوە[١٠٠] ، وە لـەگـەڵ ڕۆژئاوا واتا ـ بین النهرین ـ[١٠١]و سوریەو ئاسیای بچوك‌و یۆنان‌و میسر ، یان بـە واتەیەکی



نمونەیەك نوسراوەی میژویی ئاشوریەكان بە خەتی بزماری لەسەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا



نمونەیەك نوسراوەی سۆمەریەكان بە خەتی بزماری لە كۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دا



نمونەی نوسینی كتێبێكی یۆنانی لە سەدەی پێنجەمی زاینی دا

تر لەو کیشوەرانەی کە چەند هۆزێکی جۆر بە جۆری سەر بە
هەخامەنشیەکان لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا هاتوچۆی
ئەوێیان ئەکرد زۆر بێ ئاگا بوە[١٠٢] • وە لەوە ئەچێ ئەوانەی ئاویستایان
نوسیوەتەوە بە تایبەتی چۆنێتی سەردەمی خۆیان باس نەکردوە ، بەڵکو ئەو
شتانەی کە لە سەردەمی کۆنا بە پیرۆزیان زانیوە ئەوانەیان بە پیرۆز داناوە ،
وە لە هەمان کاتا رواڵەتی ژیانی سەردەمی ئەوانەی کتێبەکەیان رێك خستووە
تا ڕادەیەك دیارە •

بە پێی بەسەرهاتو باسە زەردەشتیەکان ئاویستا یەکەمجار ٢١ نسك
بووە ، کە هەندێك لەوانە لە کاتێکدا کە ئەسکەندەری مەقدونی ئێرانی
داگیر کرد لەناو چوون ، بێگومان هەندێك راستی لەناو ئەم باس‌و
بەسەرهاتانەدا هەیە • ئاویستا بەر لە ئەسکەندەر نوسراوە ، چونکە لەوە
ئەچێ کە لە دوای سەدەی چوارەمی پێش زاینی زانایەکی شارەزای زمانی
کۆن‌و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەو شارەزای زمانی لەناو چوی
ئاویستا ئەمەی زیندو کردبێتەوەو وەکو خۆی دەری هێنا بێ ، بەڵام ئەگەر
یەك زمانی ئەدەبی ئاویستایی – یا زمانێکی گونجاو – هەبایە لەوە ئەچو لەو
سەردەمە دا لە شوێنەواری ئەو زمانە مردوە چەند پارچە نوسینێکی وەکو
[فرگرد] – بەش – ی یەکەمی ویدودات و[١٠٣] بەشەکانی تری ئاویستا
– کە پەیوەندی‌یان بە رۆژگاری دواوەیە – نوسرابێتەوە •

ئەو باسە ئەدەبیە کۆنانەی کە لە ئاویستادا هەیەو شێوەی رەوانی
زمانەکەیە ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن کە زمانی یەکەمین بەشەکانی ئاویستا
بە زمانی کۆنتر لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاینی بزانین [کە زۆر
کەس لە نوسەران‌و شارەزایان لەو باوەڕەدان کە زمانی سەردەمی
ناوبراوە][١٠٤] •

بە پێی باس‌و بەسەرهاتە زەردەشتیەکان کە لە کتێبی [دنکرت] – کە

بەشێکی لەو نوسینانەی ئاویستایەو بە دەستی ئێمە نەگەیشتووە ـ هەیە یەکەمین کۆششێك کە بۆ زیندو کردنەوەی ئاویستای [بەر لە ئەسکەندەر] دراوە لە سەردەمی [وەلکش] ـ لەوە ئەچێ ولوگزی یەکەم لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ـ دا بوبێت • دوای ئەو لە سەردەمی یەکەمین پادشای ساسانیەکانا [ئاردەشیری بابەکان] ، [٢٢٦ ـ ٢٤٠ ی زاینی] هەندێ نیگاری تازەی لێ پەیدا بوبێتو دەستوری ئاویستا بەیەکجاری لە سەردەمی شاپوری دووەمدا [٣١٠ ـ ٣٧٩ ی زاینی] جێگای خۆی گرتبێ• لەوە ئەچێ بەر لە ئەسکەندەر باسی زیندو کردنەوەی دەستوری ئاویستا لە ناوا نەبووبێ ، بەڵکو زۆرتر هەر خەریکی کۆ کردنەوەی کتێبی ئاینی بون کە بە ناوی زەردەشتەوە بووەو ماوەتەوە ، ئەوانەی کە لەگەل نەریتو یاسای رەسمیدا گونجاوە هەڵیان بژاردوەو بووەتە دەستورێکی ئاینی • وەکو زانراوە ئەو ئاینانەی کە شەریعەتیان هەیەو لەسەری ئەڕۆنو خەڵکی باوەڕیان پێ ئەهێننو پەیڕەوی ئامۆژگاریەکانیان ئەکەنو لەبەر فەرمانی ئەو دەست لە خۆشیو بەختیاری جیهان هەڵ ئەگرنو هەمو جۆرە سەرپێچییەك لە ئاینەکەیان بە گوناح ئەزانن،ئەو ئاینانە داهاتی کۆمەڵگای کۆیلەیی [کە لە دواهەناسەی ژیاندابو]وە کۆمەڵگای فیودالی [کە تازە پێ ئەگەیشتن] بون•بەم بۆنەیەوە ئامۆژگاری و دەستورە کۆنەکان کە بە ناوی زەردەشتەوە بوون یانهێنیتر نەیان ئەتوانی شەریعەتێکی رێكو پێکیان هەبێت تەنانەت لە یەکەمین سەدەکانی دوای زاینی ئەو یاساو ئامۆژگاریانەی کە ئێمە بەهینی زەردەشتی ئەزانین لەگەل ئەو یاساو بیرو رایانەی کە لە دوای زەردەشت پەیدا بوون جیاوازییان هەبوو • یاساو بیروڕاکانی دوایی بێگومان زوربەیان لە لایەن ئەو کەسانەوە کە پەیڕەویان ئەکردنو رقە بەرایەتی بیرو باوڕو یاسای رەسمی سەردەمی ساسانیەکانیان ئەکرد سودیان لێ وەر ئەگرتن[١٠٥] •

گومانی تیا نیە کە لە کاتی دانانی یاساو دەستوری رەسمی وبەراوردکردنی

بسازەردەشتیەکانا زوربەی ئەو کتێبانەی کە لە دوایدا نوسراونەتەوە گەلێك لە ئامۆژگاریو یاساکانی کتێبی ناوبراویان پیا نوسیوتەوەو زۆر پارچە نوسینیشیان گۆڕیوەو دەسکاری کردوە ، هەندێکیان لە نوکەوە نوسیوەتەوەو هەندێکیان لابردوە هەندێکیان ستی زیادەیان خستۆتە سەرو •••• هتد ، لەبەر ئەوەی ئەو ئاویستایەی کە نە دوای ساسانیەکان بە دەستی ئێمە گەیشتووە تەنیا بەشێکە لە ئاویستای گەورە، بەداخەوە هێشتا نوسینەکانی ئاویستا وەکو پێویستەو [لە تەوراتا باس کراوە] نەدراوەتە بەر سەرنجو لێکدانەوەو شی کردنەوەیەکی ورد ، وە زۆر ستەمە بوانری لە روی ئاویستای بچوك بەشەکانی کە لەچەند زەمینەیەکی جۆربەجۆر دا نوسراونەتەوە بدرێتە بەر سەرنجو جیا بکرێنەوە •

هەمو ئەو رونووسانەی ئاویستا کە بە دەستی ئێمە گەیشتوە هینی سەردەمی دوایەو کۆنترین نوسخەیان هینی سەدەکانی سیازدەو چواردەهەمی زاینییە • وە بە زمانی سانسکریتیو پارسی ناوەڕاست لێکدراوەتەوەو تەرجومە کراوە(١٠٦) •



**نمونەیەك نوسینی پارتی کە بەخەتی ئارامی نوسراوە ، هەمان خەتە کە یەکەم جار ئاویستای پێ نوسراوەتەوە ، لەسەدەی یەکەمی پێش زاینیدا**

---

ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ : ئەو ئاویستایەی کە لە کۆتایی سەڵتەنەتی پارتەکانو سەرەتای حکومەتی زنجیرەی ساسانی ــ لە ماوەی سەدەکانی یەکەمو چوارەمی

زاینی ـ بە هەوڵو تەقەللای موغەکان کۆ کراوەتەوە ، لە سەدەی چوارەمی زاینیدا بە شێوەی نوسینی ئارامی کە پیتی دەنگداری تیا نەبوە وە لە سەردەمی داریوشی یەکەم ـسەدەی چوارەمی پێش زاینی ـ پێک هێنراوە نوسراوەتەوە. ئەم شێوە نوسینە لە ولاتی پارتەکانا زۆر بایەخدار بوە ، وە موغەکان هـەر نەسەر ئەو شێوەیە کە نەختێك دەنگی تیا دەرکەوتوە رێکیان خستووە ،بەلام چونکە لە ماوەی سەدەکانی یەکـەمو چوارەمی زاینیو لـەوە بەریش زمانی ئاویستا مردبو[107] ، موغەکان هەندێ شتی تایبەتیان بۆ لێك نەئەدرایەوە ،وە بە تایبەتی بەکارهێنانی شێوە دەنگدارەکان ، وە لەبـەر ئـەوە کـە زوربەی باسەکان بـەدەمیو سەرزارەکی باسیان ئـەکردنو بۆ یەکتریان ئەگێڕانەوە زۆر وشەی هەڵە ئەوتراو ئەنوسراو زۆر وشەش کە لێی تێ نەئەگەیشتن دیسان بە خەتی تازە هەر بە هەڵە ئەیان نوسین ... هتد . چـەند بەشێکی ئاویستا لـە سـەردەمی پارتـەکانا ـ بۆ یەکـەمین جار ـ بە زمانـە مـردوە پیرۆزەکە نوسرابۆوە ، ئەوانەش بێگومان دەقاو دەق نەبون .



**پارچـە نووسینێکی ئاویسـتا**

---

هەندێ لە لێکۆڵەرەوان وا ئەزانن ئەم لادانە لەبەر ئەوە بوە کە زمانی ئاویستا [کە ئیستە بۆ ئێمە دەرکەوتوە] بە زمانی کۆمەلانی خـەڵکی زۆروی

ڕۆژئاوا نزیك بووبێت • جگە لەمانە زمانەکانی [ژوروی ڕۆژئاوا] و [ژوروی ڕۆژهەڵات] لە کۆنترین ڕۆژگارەوە ، تا ئیستە وەکو پێویستە نەزانراوە ،بەم هۆیەوە بەش بەش کردنو لێکۆڵینەوەی ئاویستا ورون کردنەوەی بابەتەکانیو شوێنی پەیدابونی رون نەکراوەتەوە(١٠٨) •

ئەوەمان لەبیر نەچێ کە تا ئیستا هیچ جۆرە تەرجومەیەکی ئاویستا کە بۆ ئەوە بشتی پشتی پێ ببەستین وە بە تایبەتی لە بارەی [گات]ە کانەوە نیە • تەرجومە کۆنەکان ـ لەگەل ئەوەدا پێشکە وتنیدوایی فقەاللغەی هەندێ لای تیا نیە ـ هەندێ جار لە بەرامبەر کردنی ئەو تەرجومە تازە کراوانە باشتر دەر ئەچن • وەرگێرە کۆنەکان بێ ئەوەی لایەنە فەلسەفیەکانی لێك بدەنەوە لەروی باسو بەسەرهاتە زەردەشتیەکانەوە وەریان گرتوە • بەلاَم وەرگێرە تازەکان لە تاریکی جۆری شێوەی داڕشتنی نوسینەکانی ئاویستا سودیان وەرگرتوەو بیروڕای فەلسەفی خۆیان تێکەڵ بە وەرگێرانەکە کردوەو بە شێوەیەکی دروستکراو لەبەر خۆیانەوە بیروڕای نوسەرانی کتێبی ئاویستایان تازە کردۆتەوەو بابەتەکانیان پێچاو پێچ کردوە(١٠٩) •

یاساو ئامۆژگاریەکانی ئاویستا بوو بە جێ نەزەرگەی موغەکانی [ئاتروپاتین] بە بیروڕای زوربە لە هەمو ماوەی چاخی فەرهەنگی یۆناندا [یاهلنیزم] ، ئاتروپاتین لە ژێر دەسەلاَتی حکومەتی پێشەوایانی ئاینی ئارەزو خوازانی موغەکاندا بووە • بە باشی زانراوە کە لەو سەرزەمینە فراوانەدا زەویو زارێکی زۆر پەیوەندی بە پەرستگاکانەوە بوە [هەروەکو لە مادی خوارودا بەم جۆرە بوە] • هەر بەم جۆرەو بەم هۆیەوە ئاتروپاتین یان بە زادەگای [زەردەشت] زانیوە •

بەلاَم لە واقیعدا هیچ گومانی بۆناچێ کە ئاویستا یەکەمین جار لە ئاتروپاتین پەیدا بوبێت •• ئەو مەرجە کۆمەلاَیەتیانەی کە لە ئاویستادا [وە بە تایبەتی ـ گات ـ ەکان کە کۆنترین بەشی ئاویستایە] باس کراوە ، لە بارەی

چۆنێتی یەکەوەیە کە تەنانەت لە کاتی سەڵتەنەتی ماد ـ سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی پێش زاینی ـ فەرمانڕەوا بووە زۆر کۆنترە • ئەمە ندە بەسە کە بڵێین هێشتا لە ئاویستادا زاراوەی ئاسن لە جەوجۆش جیا نەکراوەتەوە[110] • هەروەکو ئاویستا لە سەر زەمینی ماد نوسراوەتەوە • هەرچۆن بەراورد بکرێ لەوە ناچێ لە دوای سەدەی نۆیەم و هەشتەمی پێش زاینی نوسرابێتەوە ، وە ئەمە خۆی لەگەل بەسەرهات و باسەکانی هەندێ لادا هاوشان ئەبوو • ئەم باس و بەسەرهاتانە ـ لە سەدەی چوارەمی پێش زاینیدا [زەردەشت] بە سەردەمێکی کۆنەوە ئەبەستێ و باسی لێوە ئەکات[111] •

بەلام لە سەدەکانی نۆیەم و هەشتەمی پێش زاینی دا لە ئاتروپاتین بە زمانی ئیرانی قسەیان نەئەکرد ، لەوە ئەچێ ئاویستا لە پێشا بە زمانێکی تر نوسرابێت و دوایی وەرگێڕابێتە سەر ئەو زمانە ، دیسان ئەمەش گومان پەیدا ئەکات • هەمو زاراوە ئاینیەکانی ئاویستاو هەموو ناوەرۆکە ئاینی و فەلسەفیەکانی ئاویستا ـ وەکو [ ئارت Arta, rta ] ـ لەناو هەمو تیرەو هۆزە ئیرانیەکانا ڕواڵەتێکی دادپەروەری و بایەخێکی گشتی هەیە وە ئەسکیتی و خوارەزمی و سگدی و باکتریایی و پارسەکان زۆر بە باشی ئەیانزانی ، بەلام عێلامیەکان و [112] هوریان و تیرەو هۆزەکانی ژوروی قەفقاز ـ واتا ئەو نژادانەی کە غەیرە ئیرانیەکانی سەرزەمینی مادی ئاتروپاتین لەوان بون ـ شارەزای ئەم زاراوانە نە بون • ئەم زاراوەو ناوەڕۆکانە وەر نەگیراون بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە زمانی ئیرانین •

باس و بەسەرهاتە کانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست زۆریان لەوەدا یەك ئەگرنەوە کە زەردەشت خەڵکی ماد بووە • بەلام دەرباری ویشتاسب کە بەناگاو پارمەتیدەری ئەو بووە لە [بەلخ] تەخت نشینی باکتریاکان ـ باکتریای کۆن ـ وە یا طوس [لە خوارسان ـ پارت][113] بووە • لەبەرئەوە ئەم پێغەمبەرەیان بە زایندەی ئازربایجان و(ری) زانیوە،لە ئاویستادا [یسنا ۱۹و۱۸]

بەسەرهاتێك هەیە كە زەردەشت یان جێ گرێكی ئەو فەرمانڕەوای رەی بووە • لەوە ئەچێ تیرەی موغەكان كە ئەو پیاوە ئاینیانەی پەیڕەوی ئامۆژگاریەكانی زەردەشتیان ئەكرد لەوان بون ، لە [رەی] بووبن[١١٤] •

لەلایەكی ترەوە ئەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێ كە لە ئاویستادا راسنەو خۆ نەنوسراوە كە ویشتاسب یارمەتیدەری زەردەشت لە باكتریا بووە ، یان پەندو ئامۆژگاریەكانی ئەو پێغەمبەرە لە رۆژهەلاتی [باكتریا] برەوی بوە ، هەروەها لە باس‌و بەسەرهاتەكانی سەدەكانی ناوەڕاستدا بەم جۆرە هاتوە • وشەی [باكتریا] لە ئاویستادا نیە تەنیا یەك جار نەبێ ناوی براوە ئەویش لە [فرگرد]ی یەكەم [ویدودات] لەو كیشوەرانەی كە باوەڕیان بە ئاینی زەردەشت هێنابو باسی ئەكات[١١٥] • ئێستا ئەتوانین باوەڕ بەم قسەیە بكەین كە [فرگرد]ی ناوبراو [ویدودات] لە سەرەتای رۆژگاری سەلتەنەتی پارتەكانا نوسراوەتەوە • وە ئەو كیشوەرانەی كە ناویان تیایا براوە ـ هەمان ناوچەو كیشوەرەكانی پارت [لەو كاتەدا]و هەروەها ئەو بەشانەی كە پارتەكان لافی خاوەندارێتیان لێ ئەدا ، بووە •باكتریا لە ناوەڕۆكەكەیا ناو نراوە BaxTi [لەبەر ئەوە كە نوسەر ناوی راستی ئەم وشەیە بە زمانی مردوی كۆن كە نوسرابوو نەی ئەزانی] ، ئەم وشەیە لە زمانی زیندوی ئەو چەرخەوە وەرگیراوە Baxti [لە وشەی Baxtri كە كۆنترە] لەگەل وشەی Baxl و [بەلخ]ی ئێستا لەیەك ئەچن[١١٦] •

ئێمە ناتوانین ئەوە دەست نیشان بكەین كە زمانی ئاویستا لە كام شێوەی زمانە تەنیا یەك شت هەیە كە لە ئاسیای ناوەڕاست‌و ••• [ئەفغانستانی ئێستاو خوراسان] پەیدا بووە ،وەیان ئەگەر لە سەرزەمینی ماد پەیدا بووبێ لە ئەوپەڕی ناوچەی رۆژهەلاتی خاكی مادەوە بووە •

هەروەكو وتمان خاكی مادی ئاتروپاتین بە تایبەتی ـ بە پێچەوانەی ئەوەوە كە هەندێك وایان زانیوە ـ ئاران [ئالبانی] لەوە ناچێ زادەگای

ئاویستا بوبێت • هەرچۆن بێ ناتوانین ئاویستا بە سەرچاوەیەکی مێژوی ماد دانەنێین •

**یەکەم :**

تەنانەت کۆنترین بەشی ئاویستا لە خاکی رۆژهەلاتی ماد نەنوسراوە کە گوایە لە باکتریا رێك خرابێ • لەگەل ئەوەدا باری کۆمەلایەتی ئەو ناوچانە لەگەل چۆنێتی سەرزەمینی ماددا زیادو کەمی نەبووە • هەرچۆن بێ نوسراوەکانی ئاویستا لەگەل ئەوەدا کە سەرچاوە ئاشوریەکان لەبارەی خاکی مادەوە [وە زۆرتر لە بارەی مادی بچوکەوە] ئەلێن زۆر لە یەکتر ئەچن وە بێگومان خەلکی سەرزەمینی مادی رۆژهەلاتو باکتریا لە روی رۆشنبیریو پلەی شارستانێتیو پەیدا بوونی نژادەوە زۆر لە یەکترەوە نزیك بون •

**دووەم :**

ئاویستا بە شێوەی گشتی لە بارەی ئاینو بیرو باوەڕەکانی رابوردوو هوشیاری ••• بە یەکەم سەرچاوە ئەژمێردرێت • گومانی تیا نیە کە زوربەی ئەو ئاینو بیرو باوەڕانە لە زەردەشتیەوە وەر نەگیراوون ، بەلکو زۆرو کەم لە ئاینو بیروباوەڕەکانی پێشترەوە وەرگیراوون ••••••

ئاویستا وەکو کتێبە ئاینیەکانی تر کتێبێکی ئاینیە ، ئەگەرچی روالەتی بێزاری بەرامبەر بە هەمو لە [گاتا]کانا بەدی ئەکرێ ، لەوە ئەچێ کاهنەکان لەبەر دەسکەوتو هێنانەدی ویستو ئارەزووی خۆیان لەم دل نیگەرانیەی بەرامبەر بە خەلك سودیان وەرگرتبێ ، ئاینی زەردەشت لە بنەڕەتدا بەربەرەکانێ یەکی هەمیشەییە بۆ هێنانە پێشەوەی چاکە بەوێنەی خواوەندی ئاهورامزدا [گیانێکی زۆر خێرەتمەند ـ ئورمزد] دروست بووە ، وە لە دژی گیانی گلاوی [ئەهریمەن]و دارودەستەی شەیتانەکانی [دیوا] تێ ئەکۆشا • ئەو هێزانەی وەکو : ئاگرو ئاوو زەویو خەلکەکانی هۆزی [ئاریا] ـ کە خەریکی کشتوکال بونو رێزی ئاهورامزدایان ئەگرت ـ هەروەها مەڕو

ماڵاتو گیان لەبەرە سود بەخشەکان کــە کشتوکاڵیان پێ ئــەکرێ واتا گاو سەگو ••• هتد هەمو ئەمانەی بە ئامرازی چاکە داناوە ، وە بە پێچەوانەی چۆڵ گەردە ماڵ بەکۆڵە کانەوە بووەو بە تایبەتی بێگانەکان ، بە پێی باسو بەسەرهاتەکانی دوای زەردەشتیەکان دانیشتوانی ئاسیای ناوەراستو •••• ئەو گیاندارانەی [خرفستر] کە بە کاری کشتوکاڵ نەئەهاتن بــە بێ کەڵکی دائەنان • وە هەروەها بەڵێنی خەلاتی ئەو دنیای ئەدا بەو ئاین پەرستانە کــە لە تەمەنی ژیانیانا خــەریکی بــەجێ هێنانی فەرمانەکانی ئاینو بانگ کردنی خەڵك بون بۆ سەر رێگای چاکە • لە ئاویستای بچوکدا بابەتی گوێ رایەڵیو ئامۆژگاری وەرگرتنی خەڵکی بە زنجیرە یاسایەکی ئیداریو ئاینیەوە بەستوە وە بە پلەی ئاینی جیا جیا دیاری کردون •

بەم جۆرە ئاینی زەردەشتی ـ بە شێوەی گشتیو ســەلمێندراو یاسایەکی سنوردارو دیاریکراوە کە خۆی لــە بێگانەو ئەو هۆزانەی کە [ئاریائی] نین دور ئــەخاتەوەو ئــەم بیروڕایــەش لــەناو دەروونی ئاین پــەرستەکانی خــۆیا پەروەردە ئەکات ، وە لەواقیعدا ئاینی هەمو کۆمەڵە فیوداڵەکان بووە •

## ٣ ـ زمان لەبەر سەرنجی سەرچاوەی میژوویيدا

ناواخنی ئەو سەرچاوە میژوییانە کــە ئەتوانین سودیان لێ وەربگرین لەبارەی ئەو شوێنەوارانەوە کە لە بەشەکانی رابوردومانا باسمان کردون نیە ، زمان یان زمانەکانی ماد لەوە ئەچێ بە یەکەم سەرچاوەی میژویی دابنرێت • ئەم زمانانە وەکو ناوی تایبــەتی کــەسانو شوێنەکانو هــەروەها بــە شێوەی وشەیی لە زمانەکانی تر [ لە کاتێکدا کە شوێنی سەرهەڵدانی رەگەزی مادی نوانرێت تیا دیاری بکرێ ] بە پاریزراوی ماوەتەوە •

ئەو باسانە کە لە بارەی زمانــەوە وەرگیراوون لــەوە ئــەچن گــەلێك مەسەلەی گرنگ چارەسەر بکەن ، بۆ نمونە هــەروەکو بــە هاوکاری ئــەو

نوسراوانەی کە لە بارەی شوێنە جوگرافیاییەکانەوە [یاتوپونیمیك] یان ناوی تیرەو هۆزەکان [ئەتنونیمیك] نوسراوون ، بە پێی بارو چۆنێتی ئەو نوسراوانە ئەتوانین نژادی رەسەنی خەڵکی ماد لە رۆژگارە جۆربەجۆرەکاناو مێژوو ناوچەو نژادەکانی دەوروبەری ماد دیاری بکەین .. ناوی تایبەتی ئەندامانی [ئەنوماستیك] باشتر سودیان لێ وەر ئەگیرێ ، هەروەکو زانراوە لە رۆژهەلاتی کۆندا ناونان چاولێکەری بووە . هەروەها ناوەکان لە تێکەڵ کردنی چەند وشەیەك پێك هاتوون . [لە ساڵنامەی هۆزەکانی هیندو ئەوروپایی : یۆنانیەکان ، زۆر کۆمەڵەی تری خاوەن زمانی تایبەتی] یان چەند رستەیەکی بچوك [لەلای سومەری و بابلی‌و ئاشوری‌و هۆریانەکان‌و هینی تر] لە ئەنجامی لێکدان‌و لێکۆڵینەوەی نامەکان هەندێك کەرەسەی زمان شوناسی‌و رێزمان‌و دەستوری زمان دەست ئەکەوون کە بە هۆی سەرچاوەو نوسراوو شوێنەواری ترەوە دەست ناکەون . جگە لەوەش بە هاوکاری ئەم لێکدان‌و لێکۆڵینەوەی نامانە ئەتوانرێت هەندێك عونسوری فەرهەنگی تایبەتی ئاین دیاری بکرێ وە بە تایبەتی ئاینەکان دەست نیشان بکرێ ، وەکو ناوی خواکان کە پێیان ئەووتن [تیوفور] .

بەم جۆرە لێکدان‌و لێکۆڵینەوەو شی‌کردنەوەی ناوی شوێن‌و رەگەزو کەسان‌و بەڵگەی زمان شوناسی .و...بە وردی رون ئەبێتەوە .

لە زمان شوناسیدا ، ئەگەر وشەی جۆربەجۆر لەگەل یەکتردا بەراورد بکەین ــ ئەو جیاوازی بەکار هێنانی فۆنەتیکی زمانە کە لە نێوانیانا هەیە ئەوەندەی جیاوازی جۆری رێکخستن‌و داڕشتنی رێزمانەکە گرنگ نیە ــ . ئەگەر گوێ بە جۆری گۆڕانی وشەو جۆری داڕشتنی رستەکان‌و بەکار هێنانی لەروی زمانەوە نەدەین ئەوا بەراورد کردن‌و بەرامبەری کردنی وشەکان‌و ناوە تایبەتیەکان بە تەواوی لەناو ئەچن‌و ئەهمیەتی زانستیانەیان نامێنێت .

هەرکات ناوی شوێن‌و ناوی تایبەتی خەڵك لە شوێنەواری زمانێکی ترو بەتایبەتی شوێنەوارە نووسراوەکان نەمابێتەوە بەم هۆیەوە هەر جۆرە بەراوردو تێکدان‌و لێك کردنەوەیەك لە بارەی ئەو نوسراوە کۆنانەوە مانایەکی تایبەتی دێنێتە کایەوە • ئینجا ئەمە پێویستە لەگەل زمانەکانی ترا بەراورد بکرێ ، بەلأم ئەبێ ئەوە بزانین کە بەر لە هەموو شتێك ئەبێ ئەو زمانەی کە ئێمە مەبەستمانە لەگەل کام زمانی ترا نزیکەو لە یەکتر ئەچن • داخەکەم ئەمانە زوربەیان بە پێچەوانەوە دەر ئەکەوون وە ئەو وشانەی کە لە یەکتر ئەچن لەناو زمانەکانی ترا هەیە [کەوابو ، ئەگەر ئەو زمانانە لەیەك سەردەم‌و دراوسێی یەك سەرزەمین بووبن ئەوا قەیناکا] ، بەلأم زۆربەی لەبەر نیوەی لەناوی فلأن شوێن‌و نیوەکەی تری لە زمانێکی تر پێك دێت ، کە لە گەل زمانە پێشووەکەدا بە هیچ جۆر تێکەلأوی‌و ئاشنایەتی نیە • ئیتر چونێتی جۆری بەکارهێنانی وشەو دەنگ لەگەل مێژودا بەرچاو ناگیرێ • ئەو کاتە بۆ دۆزینەوەی مانای وشەکان ئەبێ شتی خۆکرد دابنرێ ، ئەمە شتێکی ئاشکراو رونە کە ئەم جۆرە کردەوانە هەڵەیەکی بێ جێیە • وە ئەوەی کە بونی خۆی ئەسەلمێنێ ئەوەیە ئەو زمانە خاوەنی ناوەڕۆکێکی رێزمانی بێت‌و لە زمانێکی وەکو خۆی بچێت • ئینجا ناتوانین پشت بەو جۆرە وشەو زاراوانە بەستین کە گۆیا ئەم وشەیە لە فلأن وشە ئەچێت‌و لە فلأن زمانا وشەیەکی بەم جۆرە هەیە وەکو پێی قایل بووین •

لە لێکۆڵینەوەی مێژوویدا ئەگەر توشی سەرچاوەیەك بوین کە لە بارەی ناوی شوێنە جوگرافیایەکانەوە سودی نەبوو هیچ بە شتێکی سەیری نازانین • وە لەبەر ئەوەیە کە ئێمە ئەم مەترسیەمان لەم رووەوە باس کردوە ، ناچارین لە بارەی جۆری سود وەرگرتن لەو جۆرە سەنەدو سەرچاوانەوە دیسانەوە قسە بکەین •

بەراورد کردنی زاراوەی زمانێك لەگەل زمانێکی ترا لە کاتێکدا ئەبێ

که گەلێك نمونـەی فراوانو رێكو پێك و لەیەك چوو لـە نێوان زاراوەی هەردو زمانەکەدا هەبێت • وەکو زمانی ئەسکیتەکان [سکایەکان] وە هایە •• وە لە دەیان ناوی تایبەتی کە زۆر تر لە سەرچاوە یۆنانیەکانا هەیەو وەرگیراوە وەکو ئارتا arta ، فرن Pharn ، کسـرت Ksarth ، یان کستر Ksatr ، ئەسپ Asp وەهینی تر ، دوبارە کراوەتەوە •وە ناتوانین ئەم ناوانە لەگـەل ئـەو ناوە تایبەتیانەی مـادو ئاویستا ••• وەکو ئارتو فرنو خشترو ئەسپ [ئەم وشانە هەریەکە مانایەکی تایبەتیان هەیە](١١٧) بەراورد نەکەین ، بەشوێن ئەم بەراورد کردنەدا دیسان ئەتوانین ناوی لەیـەك چوی زۆر بدۆزینەوەو ئەوە بسەلمێنین کە ئەمە شتێکی رێکەوت نیەو بەڵکو شتێکی راستو رێکخراوە •

ئەگەر مەبەست لەسەر کەمی زاراوەکان بێ کـە شێوەی لەیەك چونو ەراورد کردنیان کەم بووە ، ئەمە زۆر بەگران ئەسەلمێندرێ ، وەیان نزیك بونەوەی نێوان زمانەکان زۆر دروبێو نەتوانرێ بەبێ هۆیەکی رەوا ئـەوە دیاری بکرێ • بـەم جۆرە ناتوانین هیچ ئوسلوبێك بگـرین بـەدەستەوە •• تەنیا ئەو ئوسلوبە نەبێ کە بتوانین بە هۆیەوە مانای وشەکانی زمانە بووەکان بدۆزینەوە کە ئەوەش ئوسلوبی دارشتن [ترکیبی]ە • [بـەڵام دوای ئـەوە ئەتوانین ئەوانە لەگەل وشەی زمانەکانی ترا بەراوردو بەرامبەر بکەین،چونکە بەکار هێنانی ئەم ئوسلوبە زامنی ئەوەیە کە ئێمە تەنیا ئەو دارشتنانەمان بەراورد نەکردوە کە لە شێوەی فونەتیکدا لەیەك ئەچن بەڵکو ئەو وشانەشمان بەراورد کردوە کە لە فۆنەتیكو ماناو جۆری بەکارهێنانیانا لەیەکتر ئـەچن ،وە لـە یەك نەچونیشیان دیسان لەسـەر بنچینـەی رێکخستنی جۆری وشـەکانە] • ئوسلوبی ناوبراو بریتی‌یە لە بەکار هێنانی وشە لـە چـەند شوێنێکی جۆراو جۆردا وە ئەو مانایە کە لە هەمو کاتەکانا پڕ بـە پێستی وشەکـەیـە دیاری ئەکەین ، ئاشکرایە لە کاتی ون کردنی سەرچاوەکانو کەمی جۆری دارشتنی

وشەکان ناتوانین ئەم ئوسلوبە بەکار بێنین • بەڵام ئەم بەکار نەهێنانە وە نەبێ ئەوە بگەیەنێ کە ئەم ئوسلوبە بە درۆ دەر ئەچێ •

لە میژوی [فقه اللغه]ی رۆژ هەڵاتی کۆندا گەلێك سەرچاوە بوە ، کە نوسینەکانیان کۆنو نەزانراو بوەو بەپێی ئوسلوبێکی هەڵە وەریان گێڕاوە ، واتا بۆ گۆڕینی وشەی مانا ون بوو لە زمانە ئاشکراکانی تر وشەیەکیان هەڵبژاردوە کە لە بەکار هێنانا لەو وشەیە چوبێت • ئەم جۆرە وەرگێڕانانە هەمویان بێ سەرو پێو تاریکن(١١٨) •

ئاشکرایە لە لێکۆڵینەوە و لێکدانو بەراورد کردنی وشەتەنیاکان وەکو ناوی تایبەتیو نامەی شوێنەکان کە بەو ئوسلوبە هەڵەیە لێك دراوەتەوە لەگەل وشەکانی پێشو پاشی خۆیانا مانا کانیان پێکەوە ناگونجێن ، ئینجا لەبەر ئەوە ناتوانرێت مانایەکی رەسەنمان دەست بکەوێ ، لەگەل ئەمەشدا گومانی تیا نیە کە ون کردنی هۆی لێکۆڵینەوەی راستی وشەکان نابێتە هۆی باشی ئەم ئوسلوبە • بەم جۆرە ئەم جۆرە ئاسلوبەو ئەم جۆرە بەراورد کردنە هیچ نرخێکی زانستیانەی نیە •

هەروەها دوزمان ئەگەر زۆر لە یەکترەوە نزیك بن وە زۆر وشەیان لەیەك بچێتو بچێتەوە سەریەك ، وە ناکوکی جۆری دەربڕینی وشەکانیان لە هەر کاتێکدا بە شێوەیەکی تایبەتی دوبارە بێتەوەو ئەوە نیشان بدات کە بەك جۆر بەکار هێنانی دەنگیان تیایە ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوە کە لەیەکتری ئەچن • لەم کاتەدا ئەتوانین هێڵێك بەنێوان جیاوازیەکانیانا بهێنین ،وە یا خود ئەتوانین بڵێین کە ئەم وشانە لە فلان زمانە یان لە فلان بنەماڵەیە وەیان پەیوەندی بە فلان رێچکەی زمانەوەیە •

بەڵام ئەبێ لەم کاتەدا بەپێی بڕیاری ئوسلوبێکی دیاریکراو بجوڵێنەوە، بۆ نمونە نابێت بۆ هەموو ناوێك پەنا بەرینە بەر نوسراوەی هۆزەکان • ئەم هەڵەیە زوربەی میژوونوسەکان لە بارەی دۆزینەوەی دارشتنی نژادی

دانیشتوانی ناوچەکانەوە بەسەریا تێ ئەپەڕن • بەڵام شی کردنەوەو لێکدانو لێکۆڵینەوەی ناوی شوێنەکان لەو شوێنانەی کە مەرجی زمانو مێژووی بە تەواوی تیا روناکە [هەروەکو لە روی سەنەدو نژاد شوناسی هاوچەرخ]ەوە دەر ئەکەوێ کە نوسراوەی هۆزەکان لە بارەی ناوی شوێنەکانەوە زۆر بە رێکەوت دەر ئەکەوێ • [ئەڵبەتە لە کاتێکدا کە ناوی کیشوەرو ناوچە فراوانەکان بەکار نەهێنن]وە ئەوانە تەنیا لە پێکەیشتنی زەویو جۆربەجۆری نژادەکان بۆ نمونە ئەڵێن : لەوە ئەچێ فلان ناوچە ناوچەی [روس]یان [ئەرمەنی] بێت ، بەڵام ئەمە تارادەیەك شت دەرئەخات واتا شوێنەکانی تری دراوسێ شوێنی روس یان ئەرمەنی نین • لە ئەنجامدا خەڵکی رەسەنی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لە نژادی ئەو ناوچەیە نیە کە بە ناویەوە ناو نراوە •

ئەبێت لە بارەی ناوی شوێنەکانەوە ناوێك کە خۆی بە خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەزانێتو لە ناوی یەکێك لە دراوسێکانی جیا بکرێتەوە کە خۆیان بەو ناوەوە ناو ناوە • ناوێك کە دراوسێکان ئەیدەن رەنگ بێ بە بێ رقەبەرایەتیو رقو لۆمە گاڵتەی تێکەڵ بێ ، زوربەی ئەم نوسراوانە هۆزو تیرە جۆربەجۆرەکان ئەگرێتەوەو هەمویان لە روی ئاینو یاساوە وەکو یەك سەیر ئەکات [هەروەکو لە زمانی روسی کۆندا وشەی ـ تاتار ـ بە هەمو مسڵمانێك ئەوترا ، لە ئاویستادا زوربەی وشەی [ئاریا] لە بارەی « تەنیا زەردەشتی » بەکار هاتوە نەك پیاوێك کە ئێرانی زمان بێت] • وەیان لە کاتێکدا ئەبێ کە زمانەکەیان نەزانرابێت • وەکو [نمتس = بێگانە][1] ولوخ Wloch بە زمانی لهستانی واتا [ئیتالیایی] والاخ لە بالکان بە [رومانی] ئەڵین ، ولشمان Welshman بە ئینگلیزی بە [سلتی] ئەڵێن • جاری

---

**(١) نمتس بە زمانی روسی لە وشەی [نموی] یەوە هاتوە کە بە مانا [گنگ] ئەگرێتەوە کەسێ کە لە زمانی نەگەی ••• ئیستە بە تایبەتی ئەلمانیەکان ئەڵێن نمتس ••**

واش هەیە ناوێك کە خەڵکی ناوچەیەك بەکاری ئەهێنن لە بنەماڵەیەکەوە هانووە نەك لە هۆزێکەوە ، وەکو ئەسلوونو ئیلمنو ئسلواكو ئسلوینسەکان چەند هۆزو تیرەیەکی جۆر بەجۆری ئەسلاون نەك یەك تیرە • صربەکانی لۆژیتسك لە بارەی زمانو پەیدابونی نژادەوە بەرەگەزی چكو لهستانیەکان نزیکترن تاکو بە صربەکانی بالکان •

نوسراوە نژادیەکان لە وانەیە بەدرێژی رۆژگار بگۆڕێ(١١٩) • بە شێوەی گشتی لەبارەی دارشتنو پێك هاتنی نژادەوە وە بە تایبەتی دروست بونی ئەوخێلانەی خەڵکی یەك شوێنن ئەبێ هەمو ئەم پلانە بەرچاو بگیرێ • دیسان ئەبێ ئەوەش بزانین کە گۆڕینی زمان بە زۆری مانای گۆڕینو دروست بونی سروشتی خەڵکی یەك شوێنو نەرێتو فەرهەنگو ••• ئەوان نیە چونکە بە رێکەوت لە مێژودا بینراوە ئەوانەی کە زۆردارو زاڵبون توانیبێتیان هەمو ئەندامانی هۆزێکیان لەناو بردبێت •

بۆ دیاریکردنی دروست بونی نژاد لە سەرزەمیندا لە هەر بارەیەکەوە وە بە تایبەتی ناوی تایبەتی خەڵك ئەهمیەتی لە نوسراوەی شوێنەکان دا زۆر ترە • نوسراوەی شوێنەکان زور بەیان لە زمانی پێشوونانو خەڵکی ئەو شوێنەوە ماوەتەوە ــ بە تایبەتی ئەگەر گۆڕینی زمان ــ هەروەکو زۆر روو ئەدات ــ ئەگەر لە رێگای دەرکردنو راودوو نانی خەڵکەوە نەهاتبێ وە بەرە بەرە لەرێگای قۆناغی پەیدابونی دوشێوەی زمانەوە پەیدا بووبێ ، وە پێچەوانەی ناوی تایبەتی خەڵك ــ هەر وەکو لە سەردەمی کۆندا بووە رویداوەــوە مانای خۆی پاراستبێ ئەوانە زوربەیان ئەوە ئەسەلمێنن کە ئەوخەڵکە بەو زمانە قسەیان کردوە کە نوسراوەکانی پێ نوسراوەتەوە ــ بەڵام ئاینە خاوەن یاساکان زوربەیان نوسراوەکانی خۆیان لەناو چوار چێوەی شەریعەتی خۆیانا ئەنوسنەوە •• بۆ نمونە نوسراوەکانی وەکو [ئارتاشس] و [ئەهرام] و [نرسس]و ئەوانی تر شان بەشانی زەردەشتیەکان لە ئەرمەنستانا بایەخو

ڕەواجی بووە ، وە مەسیحیەکانیش نوسراوە عیبریو لاتینیو یۆنانیەکانی وەکو [سوگومون] ، « ێ » « ئەوانس » و « پطروس » و « گورك » و هینی تریان هێناوە بۆ ئەو ناوە • هەمو ئەزانین کە نرخی نوسراوە عەرەبیەکان لە کیشوەرە مسڵمانەکانا بە هۆی بڵاوبونەوەی زمانی عەرەبیەوە نەهاتوە بەڵکو بە هۆی ئاینی ئیسلامەوە بۆ ئەو سەرزەمینانە هاتوە •

لە لایەکی ترەوە ئەو نوسراوانەی کە لەگەل ئامۆژگاریو یاسای ئەو ئاینانەی کە خاوەنی یاساو شەریعەت بون نەهاتون بۆ ئەو سەرزەمینانە بەڵکو لەسەر بناغەی ئاینی کۆنو ڕۆژگاری کۆمەڵایەتی کۆچەرەکانەوە هاتوە،ئەوانە ئەوە ئەسەلمێنن کە خەڵکی ئەو سەرزەمینە ئەو زمانەیان زانیوە کە ئەو نوسراوانەی پێی نوسراوەتەوە وەکو ناوی [میتردات] ••• بەڵام ئەمە ئەوە نەگەیەنێ ئەو کەسانەی کە ئەم ناوەیان لێنراوە پەیوەندییان بە یاساو ئاینی میترا یان زەردەشتەوە هەیە•بەڵام ناوی «کۆتر– نان خونتە»••[عیلامی–خدا– نان خونتە – سوڵتان] کە ناوێکی عیلامییە ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ ئەو کەسەی ئەم ناوەی نراوە بە زمانی عیلامی دواوە وە ناوی «ئاری – ئرنا» – هوریتی – خدا – داد برادەر] ئەوە ئەگەیەنێ کە خاوەنی ئەم ناوە زمانی هوریی بووە •

بە بەکار هێنانی ئوسلوبێکی وردو زانستیانە لەبارەی لێکدانو لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنی بەڵگەی زمانەوە کە – بە تەواوی یان لەوە ئەچێ لە ماوەی ڕۆژگاری سەدەکانی نێوان سەدەی نۆیەم تا چوارەمی پێش زاینیدا لە خاکی ماد ریشەیان داکوتابێ ، ئەتوانین چەند زمان بدۆزینەوەو شییان بکەینەوە کە بەو هۆیەوە ناوی ماد ڕون ئەکرێتەوە •

لە پێشدا گەلێك ناوی تایبەتیو ناوی شوێن هەیە کە زوربەیان لەسەر چاوە ئاشوریەکانا هەیە ، وە پەیوەندییان لەگەل زمان یان زمانە ناوچەیەکانی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەو سەرزەمینەوە هەیە ، ئەم جۆرە ناوانە بە درێژی

ماوەی سەدەکانی نۆیەم‌و هەشتەمی پێش زایینی لـە سەرانسەری خاکی ماددا وە هەروەها ـ بەهەر جۆر ـ لە خاکی مادی سەرو وە ژوروی رۆژئاوا لـە سـەدەی حـەوتەمی پێش زاینیدا بـەهـادار بووە ، وە لـە دوای ئـەوەوە سەرچاوەکانی ئێمە بێ دەنگن‌و هیچ جۆرە زانیاریەك بـە دەستەوە نادەن • بەلأم بە تەواوی لەوە ئەچێ کەئەم جۆرە ناوانە یان زمان وەیان ئـەو زمانانە کە ئەو جۆرە ناوانەیان تیایە لـە دوای ئـەو مێژووەوە لـەو سـەرزەمینـەدا بلأو بۆتەوە وبایەخی بووە •

سەرچاوە ئاشوری‌و بابلیـەکان ئـەو زمانانەی کـە نرخدار بون لـەو سەرزەمینەدا ناویان ئەبەن وەکو : زمـانی گۆتی ، لولویی ، مانی [لـەگەل گۆتی یان لولویی] مهرانی ، کاسیتی ، بـەتایبەتی ئـەم زمانانە [پێیان ئەوتن «کاسیئی»] •وە پلـەی تێکەڵی ئـەم زمانانە لەگـەل یـەکتر وە ئـەوانـەی کە باشتر ناسراوون ،وەکو پێویستە روناك نیە • بەلأم تاڕادەیەك هەر یەکەیان لە جێگای خۆیا باسکراوە ، ئەتوانین بلێین ئەم زمانانەی باسکراوون هەمویان یان هەندێکیان لە لایەکەوە لەگەل زمانی یەکێ لە ناوچە شارستانیە کۆنەکان واتا عیلام ، وە لـە لایـەکی تریشەوە لەگەل زمانەکانی [کاسپی‌و ئالبانی]و هۆزەکانی تری ئازربایجانی ژورو‌و سەرزەمینەکانی تری دراوسێی خواروی رۆژئاوای دەریای خزر [دەریای کاسپی] تێکەڵیان بووە •

دۆزینەوەی شـێوەی ئـەم زمانانـەو مانـای ناو وشـەکانیان کارێـکی زانستیانەی زۆر گرانە • یەکەم : ناڕەحەتی لەوەدایە کـە کەرەستەی تەواو بۆ بەکار هێنانی ئوسلوبی دارشتنی زمانـەکـە بەدەستەوە نیـە •• دووەم : دیسان ئەگەر بـە پێی زانستی شت لێ دروست کردن بەراوردی بکـەین ئەمیش گیروگرفتێکی ترمان بۆ دێتە پێشەوە : یەکێ لـەو زمانانە کـە لەوە ئەچێ زمانی ماد پەیوەندی پێوە بووبێت ، ئەوە زمانی ئالبانی یە(١٢٠) کـە تا ئیستا لێی نەکۆڵراوەتەوە ، وە زمانێکی تر کە پەیوەندی بە زمانەکانی مادەوە

هەیە ـ واتا زمانی عیلامی ـ لە بارەی دارشتنی شێوەی زمانەکەو دەستوری زمانەکەوە وەکو پێویستە لێی نەکۆڵیونەتەوە • لە زمانی عیلامیدا شێوەی دروست کردنی وشەی هەمە جۆرە هەمان شێوەی [ئاگلوتیناتیو]یە واتا پێکەوە لکاندنی چەند بەشێکی بچوك کە هەریەك لە وانە ئەرکێکی تایبەتی بەجێ ئەگەیەنێت•ئەمە بناغەی تایبەتی زمانەکانی ئالتائی [تورکو مەغولی]و تونگوس‌و منچوری‌و فنلاندی‌و ئویگوری‌و ژاپونی‌و گەلێك زمانی ترە،وە لەگەل زمانەکانی قەفقازی‌و دراویدی هیندستان‌و زمانەکانی رۆژهەلاتی کۆن وەکو هوریانی‌و ئورارتویی‌و سۆمەری بلاوبونەتەوە • بەم جۆرە چەندجار تەقەللا دراوە کە زمانی عیلامی ببەستن بە بنەرەتی یەکێ لە زمانە رەسەنەکانی بنە مالەی زمانی ناوبراوەوە • رەنگ بێ پەیوەندی یەکی ئاواو بەم جۆرە ـ ئەگەرچی تا ئیستا پێك نە هاتوە ـ زۆر رێی تێ ئەچێ بوبێ •رەنگ بێ زمانی عیلامی لە وانەیێ بۆ نمونە لەگەل زمانە کانی تورکو مەغولدا تارادەیەك ئاشنایەتیان بوبێت •• بەلام ئاشنایەتی تەنیا ـ تەنانەت لە کاتێکدا کە سەریش بگرێت ـ ئەوە نابێتە بەلگەی ئەوە کە بەشێکەو لەو زمانە وەرگیراوە[١٢١] •بەهەر جۆر دەربارەی زمانی عیلامی ، تا ئەو رادەیە کە بۆ ئێمە ئاشکرایە ئەتوانین بلێین ناتوانین کە زەخیرەی رەسەنی شێوەی زمان‌و جۆری دەستوری زمانی تورکو مەغول بە بەشێك لەو زمانە بزانین[١٢٢] •

جگە لەمانە ئەو بوارانەی کە لە زمانی عیلامیدا هەیەو لە گەل زمانی تورکو مەغولدا هەرچۆن بێت‌و بگونجێ ، هەرچۆن بەراورد بکرێ زمانی عیلامی زمانی ماد نیە • تەنانەت ئاشنایەتی هەندێ لە زمانە کۆنەکانی ماد لەگەل زمانی عیلامی دا ـ لەگەل ئەوەدا کە کەم‌و زۆر دێتە بەرچاو ـ هێشتا رون نەبۆتەوە •

ئەمە خۆی مێژویەکی هەیە ، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا زاناو رۆشنبیرانی ئەوروپای رۆژئاوا شارەزاییان لەگەل نوسینەکانی پادشایانی

هەخامەنشیو .... پەیدا کرد ، ئەوە دەرکەوت کە ئەو نوسراوە ناوبراوانە بە سێ زمان نوسراونەتەوە ، وە ئەمە خۆی ئەوە ئەگەیەنێت کەزمانە کانی ئاسیایان بەراستی بۆ لێك نەدراوەتەوە . زازاوەی [زمانە تۆرانیەکان] کە زۆر ئالۆزو نادیار بوو تا ئێستە پشت گوێ خراوە.دوای ئەوە شێوەی [ئەسکیتی]هاتە پێشەوە ، ئەم وشەیە لەبەر بیروڕای مێژوودا شتێکی کەمو کورتو ناتەواو بوو . چونکە ئەسکیتەکان بە زمانی هیندیو ئەوروپایی ئەدوان ، لە ئەنجامدا [ژ. ئوپر] رۆژهەلاتناسی ناسراوی فەرەنسی‌یی ئامۆژگاری خۆی بەم جۆرە راگەیاندوە کە بەشی دووەمی نوسراوە هەخامەنشیەکان بە زمانی ماد بزانن[١٢٣] .

ئەم لێکدانەوەیە بیروڕای خۆمە کە پادشایانی ئێران نوسراوەکانی خۆیان بەزمانی گرنگترین عونسوری ئەمپەراتۆرێتەکەی خۆیان نوسیوە . لەو کاتەدا هیچ زانیاریەك لەبارەی عیلامەوە بە دەستەوە نەبووە ، بەلام زانیاری ئەو رۆژە ئاگای لە کیشوەری ماد بووەو شارەزای رۆژگاری ماد بوە ،وە مادیان بە مەرکەزێکی پادشایی گەورە دائەنا کە بەر لە دامەزراندنی ئەمپەراتوریەتی هەخامەنشیەکان ماد بووە . بەلگەی تەواوی بیروڕای [ئوپرت] زۆر لاوازە ، زدلاتر]و[١٢٤] [ویسباخ][١٢٥] ئەو بیروڕایەیان بە تەواوی داوەتە دواوە ، تەنیا یەك بەلگەی بەدەستەوە ماوە کە وشەی ماد mada لە رەگەزدا لە زمانەکانی هیندو ئەوروپایدا نیە[١٢٦] .

لە شوێنەوارە هەلکەندراوەکانی شوش پایتەختی عیلام [ناوچەیەك لە خواروی رۆژئاوای ئێران ــ لە دەراوی روبارەکانی کرخەو کارون] مەرگ ئالایە نوسینەکانی [ئوپر] . ئەو نوسینو بەلگەو سەنەدانەی کە لەوێدا دۆزرابونەوە [کە لە هەزارەی سێیەمەوە دەست پێ ئەکاتو لە سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زاینیدا کۆتایی دێت] ئەوەیان سەلماند کە بە تەواوی زمانو نوسینی عیلامی بە وشێوەی کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا بوە ،

تا ئەوروخسارەی لە بەشی دووەمی نوسراوە هەخامەنشیەکاندا دەرئـەکەوێ ئەتوانرێت بە شێوەیەکی رەوان شی بکرێتەوە • لێکۆڵینەوەکانی دوایی ئەوەی دەر خست کە زمانی عیلامی لە پارسدا بەر لە پارسی بەهادار بوەو لە دەوری هەخامەنشیەکانیشدا دیسان لەپارسدا زمانی ئیداری دەوڵەت بووە •

[ن• یا• مار] دوایی زۆر ئێکۆشـاوە تـاکو نوسینەکانی [ئوپر] زیندو بکاتەوە [ن• یا• مار] نوسینی زمـانی عیـلامی زۆر ئەخوێندەوە بۆ ئـەوەی نوسراوەی زمانەکانی [یافتی] لـە هەمو دنیادا نمونەیان بێنێتەوە ، بەڵام ناوی زمانی عیلامی بەم ناوە نەبردوە ،وە ئەمەش لەبەر ئەوە بوە کـە ئـەوانەی بەرپەرچی ئەمیان ئەدایەوە واتا ئارەزو خوازانی زمان شوناسی زمانی ناوبراو ئەیان وت [ن•یا•مار] بێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێ بە بێ هیچ مەرجو بەستنێك(١٢٧) ئەو زمانە بـە زمانی ماد دائـەنێ • بەداخـەوە گـەلێك لـە رۆشنبیرانو زانایانی ئازربایجانی دیسان تا ئەم رۆژگارەی دوایی بـەشوێن ئەودا رۆیشتن وە مـەسەلەکەیان بـە سـەرپێ بیەوە سـەیر ئـەکردو بـە سادەیان ئەگرت •

بەم شێوەیە لەگەل ئەوەدا بەڵگەی زمانـە ناوچەییو کۆنەکانی ماد زۆر کار ئەکاتە سەر چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئاڵۆزاوی ئەو کەسانەی کە بە شوێن مێژوی ئەورۆژگارەدا بە پەرۆشن وە ئەهمیەتێکی زۆریان هـەیە بـۆ چارەسەر کردنی دو دڵیەکانیان • تا ئیستا ناتوانین لـەم روەوە هیچ شـتێك بڵێین •• ناوی شوێنەکانو نژادو نوسراوەی ئەو کەسانە کـە لـە سەردەمی ناوبراوا هاتوە رەنگ بێ بـە جیاجیـا سـودیای لێ وەربگیرێت ، وە ئـەمە نیشانەی ئەوەیە لەو سەردەمەدا کـە مەبەستەو لـە فلان شـوێنی دیاریکراوا زمانێکی تر کە بۆ ئێمە روناکتر بێو بەنرخ نەبووە •

لەلایەکی تریشـەوە لەسەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا [یان تاکو کوتایی سەدەی نویەم] سەرچاوە [ئاشوری ـ بابلی] یەکان گـەلێك ناو کـە

تارادەیەكی ئاشكرا ڕیشەیان لە زەمینەی هیندو ئەوروپاییدا هەیە ،وە بە تایبەتی لە بارەی مادی ڕۆژهەڵاتەوە دەست ئەكەوێت[١٢٨] •

ئەو نوسراوانەی نوسەرە یۆنانیەكان كەباسی مادیان كردوە ـ لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای ئەو سەرزەمینەدا ـ زوربەیان بەم جۆرە بوە •گەلێك ناوی شوێنی تر هەیە كە پەیوەندی بەو سەرچاوە باسكراوانەوەیە • نوسەرە یۆنانیەكان دیسان چەند وشەیەكی مادیان لەناو نوسینەكانی خۆیانا هێناوە ، ئەو وشانەی كە باسكراون هیندو ئەوروپاین •وەكو ئەوە وایە وشەی مادی ئەسپك Spaka «سەگ»كە هردوت نوسیویتی وە وشەی مادی «تیگریس» Tigris «تیز»كە [ئاسترابون] ناوی بردوە[١٢٩]لە زمانی ئاویستادا [ئەو زمانەی كە بە تەواوی دراوەتە بەر سەرنج وە كەرەسەی زمانی ئەو بە تەواوی ئیرانیە] ئەسپك بە [سەگ]وە تیگریس بە [تیزی]و [نوكەتیر] و [تیر] ئەڵێن • لەزمانە ئیرانیەكانی ترا چەند ریشەیەكی پەیوەند بە یەكترەوە هەیە • چەند شێوەیەكی زمانی تر دیسان بە ڕێكەوت لە نوسراوەكانی سەردەمی كۆندا لەزمانی ماددا ماوەتەوە • بەگشتی ئەوانە ئەتوانین بڵێین هەمویان زمانی ئیرانین] •

ئاسترابون جوگرافیازانی سەدەی یەكەمی زاینی ئەوەی دركاندوە كە زمانەكانی مادو پارسو باكتریەكان لەیەك ئەچن[١٣٠] دیسان باسی ئەوەی كردوە كە زمانی ئەسكیتەكان لە زمانی مادەكانەوە نزیكن • هەمو ئەو نوسینانەی سەرەوە ئەم نوسینانەی خوارەوە ئەسەلمێنن • ئەو زمانەی كە بە زمانی خەڵكی سەردەمی كۆنی مادەكانیان ناو ئەبرد پەیوەندی بە زمانە ئیرانیەكانەوە بووە ، وە لەم ڕاگوزەرەدا وەكو ئەو زمانانە بوە كە هۆزە نیشتەجێكان بویانە ، وە بەلای كەمەوە زوربەی هۆزە بیابان نشینەكانی ئاسیای ناوەڕاست ـ كە زوربەیان نەوەكانیان ئیستاش بە زمانێك لە زمانە توركیەكان قسە ئەكەن ـ بەبێ جیاوازی هەمویان لەسەردەمی

کۆندا بەو زمانە دواون ، [تاکو یەکەمین سەدەی زاینی] • لەو جێگایە کــە ئەم زمانە ــ لەناو کۆمەڵگای ئیرانیدا ــ لە سەردەمی کۆندا بە [ماد] ناو ئەبرا، ئیمە دیسان ــ هەروەکو لە نوسراوەکانی ئیستادا دەرئەکەوێ ــ بەکار هێنانی ئــەم رووەیان پاراستوە ، بــەڵام ئــەوەمــان لــەیاد نــەچێ کــە لـــە کاتی لێکۆڵینەوەی ئێمەدا هــەمو [مادەکان] وە لــە ســەرەتاوە بــەم زمانە قسەیان نەکردوە • لەبەر ئەوە ئەو زمانانەی تر کە ئیرانی نین‌و لەســەر خاکی مادا بون ئەتوانین ئەوانە بە واتەیێك بــەزمانی دەریای [ قەزوین ] [ کاسپئی ] دابنێین •

لە قۆناغەکانی مێژودا رۆژگارێك هاتبوە کایەوە کە بەبێ ماوە لەدوای رۆژگاری یەکێتی هۆزەکانی ماد ــ تەنیا لە دوای ماوەیەکی پەنجا تا حــەفتا ساڵی دەوڵــەتی مــاد دروســت بوو ــ ئەم دەوڵەتە بریتی بوو لــە کۆمــەڵێك دەزگای سەربازی‌و دارایی ، کە پەیوەندی بەشــە ئابوریەکانی دەوڵەت زۆر لاواز بوو ، وە رشتەی پەیوەندی لە نێوان هۆزو ناوچەکانی ناو دەوڵــەتدا زۆر سست بوو ، وە ئــەو هــۆزانــە شێوەی زمـــانە کۆنــەکانی خـــۆیان ئەپاراست ، لەبەر ئەوە پێك هاتنی قەوارەی زمانێکی یەکگرتوی ماد کارێکی گران بوو ، وە چەند جۆرێک شێوەی زمان‌و قسە کردن لــە ناوا هەبوە بەڵام لەسەدەی سێیەمی پێش زاینیدا کە خاکی ماد کرا بە دو بەشەوە مادی خوارو ، مــادی ئاتروپاتین دروست بوو •• مــادی ئاتروپاتین ســەربەخۆیی وەرگرت ، چــەند پیویستی‌یەك بۆ ســەرەتای پــەیدا بونی نەتــەوەی مــادی ــ ئاتروپاتین ــ هاتە پێشەوەو دروست بو •

ئەگەر ئەو نوسینانەی ئاویستا لەبارەی مادەوە راست بێ ، ئەبێ زمانی ئاویستا بەزمانی ماد دابنێین ، زمانی ئاویستا زۆر بــەباشی لێك دراوەتەوە ، کەرەسەیەکی زمانی‌ی زۆری تیایە ، هــەروەکو زانراوە زمــانێکی هیندی‌و ئەوروپایی‌و ئیرانیە ، بەڵام چەند بەڵگەیەك بەدەستەوەیە کە ئاویستا ئەگەرچی

لەگەل زمانی ئیرانئی کـە ئەو سەرچاوانەی هـەیەتی بـە مادی ناو ئـەبرێن نزیکن‌و ، لەگەل ئەوەشدا بەرامبەرن •

لە بارەی زمانی مادەوە جگە لەو زانیاریانەی کە ئەتوانین ــ بەهۆی ناوی تایبەتیەوە بەدەستی بێنین ، لەو وشانەی کە زمانەکانی تر وە بە تایبەتی زمانی پارسی کۆن کە لەمادیان وەرگرتوە هـەندێك بەڵگەمان دەست ئەکـەوێ ، دۆزینەوەی ئەم زمانانە ئاسانە ، لەگەل ئەوەدا هیندی‌و ئەوروپاییو ئیرانین ، بەلام دیسان لەناو چوار چێوەی شێوەی بـەکار هێنانی دەنگی زمـانی فارسی دانین • ئەم نوختەیە زۆر گرنگە ، بە تایبەتی ئەگەر سەرنج بدەین کە یەك زمان ، وشەیەك لەگەل شتێك یان مانایەك کە ئەو وشەیە ئەو مانایە بگەیەنێ لە زمانێکی ترەوە وەر ئـەگیرێ ، بـەم جۆرە ئەتوانین نـەخشێکی فراوانی مادەکان لەناو مێژوی پارسدا تارادەیەك بی هێنینە بەرچاومان •

**خشتەی ژمارە (٢)**

| | دەنگی هیندو ئەوروپایی | دەنگی روسی | دەنگی مادی | دەنگی ئاویستایی | پارتی | سگدی | خوارزمی | کۆمەڵە دەنگێکی ئەسکیتی | کۆمەڵە دەنگێکی فارسی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | شێوەکانی ڕۆژگاری دوایی | | | | |
| Перед гласным | $k_1$<br>$g_1$, $g_1h$<br>$k_1$u̯<br>ttr | c<br>з<br>св<br>тр | s<br>z<br>sp<br>ϑr, tr | s<br>z<br>sp<br>ϑr | s<br>z<br>sp<br>ϑr > hr | s<br>z<br>sp<br>dr, š | s<br>z<br>sp<br>š | s<br>z<br>sp > ſs<br>tr, ϑr > rϑ, rt | ϑ > h [1]<br>d [2]<br>s [3]<br>ç > s [4] |
| | t,<br>su̯ | ть<br>св | ϑy<br>f | ϑy<br>hv, χᵛ | ś<br>χv > vχ | ś<br>γw | * ti > ts<br>χw | ti > ts<br>χw, χo | ś(i)y[5]<br>(h)u̯ > hv, [6]<br>χv |

ئێمە ئەم جەدوەلەمان ــ بە شێوەیەکی تەواو وەکو خۆی نیشان نەداوە ، بەڵکو تەنیا بەشێکی کە گرنگترین لایەنی لەیـەك نەچوی هـەندێ لـە زمانە

ئێرانیەکان نیشان ئەدا ، ئێمەش ئەیخەینە بەرچاو[۱۳۱] •

ئەوە ئاشکرا بو کە گرنگترین زمانێک کە لە مادی کۆندا بایەخی بووە ـ واتا هەمان زمان کە لـە ئەنجامی خوێندنەوەی نوسینە یۆنانیەکانو خـەتە بزماریـەکاندا وە بـە تایبـەتی لـە رێـگای وەرگرتنی ناوی تایبـەتیو ناوی شوێنەکانو زمانە پەراگندەکانەوە بۆ ئێمە رون بوەتەوە ، وە سـەرچاوەکانی سەردەمی کۆن بە [مادی] ناو ئەبەن ـ پەیوەندی بـە زمانی ئێرانیو قسـەی سەرزارەکی زمانی هیندو ئـەوروپاوە بوە ، وە هـەروەها زمـانی ئاویستاش پەیوەندی بەو زمانەوە هەیە • نابێت ئەم زمانانە بەهیچ جورێك بـە زمـانی پارسی کە زانراوترین زمانی ئێرانیە دابنێین •

جەدوەلی ژمارە (۲) بە باشی نیشانی ئەدا کە زمـانی پارسی کۆن لەروی فونەتیکەوە لەسەر زاری ئێرانی جێگایەکی تایبەتی هەیە ، بـەڵام لـە بارەی زمانی مادەوە لـەروی دەنگـەوە ئەبێ بڵێین لـەگـەل زمـانی پارسی کۆندا جیاوازیەکی تەواوی هەیە[۱۳۲] وە لەگـەل زمانی ئـەو هۆزانەی کـە لـە ئاسیای ناوەڕاست دا بون [وەکو ئاویستاییو سگدیو خوارزمیو زمانی کۆنی ئەو هۆزانەی کـە لە سەرزەمینی ئوکراینو قەفقازی ژورودا ئەژیان ـ واتا ئەسکیتەکان ـ سکاییەکان] نزیکـە • زمانی مـاد لـە شـەش سـەردەمدا ، سەردەمێك لەگەل ئاویستا ، پارتیو ئەسکیتی کۆن تەنیا لە دوو سەردەمدا ، لەگەل سگدیو خوارەزمی [تەنانەت لە لەکاتی] سەرنجدانی جیاوازی نێوان رۆژگارو زمانەکان] لە سێ سەردەمدا ، وە لـەگەل پارسی کۆندا لـە هـەر شەش سەردەمەکەدا جیاوازی هـەیە • لەگـەل ئەوەشدا کـە شوێنـەواری پارسی کۆنو ماد کە بەرامبەر کراوون لەیەك چەرخدا بون •

ئاشکرایە کە گۆڕانی دەنگ لە رەوتی مێژودا یان فونەتیکی مێژویی لە بەراورد کردنی زمانەکان نابێتە تەنیا هۆی بەکەڵك • دارشتنی شێوەی زمانو ساختومانی دەستوری ئەویش ئەهمیەتێکی تەواوی هەیە • بەداخەوە زانیاری

ئێمە لەبارەی دارشتنی شێوەی زمانی مادەوە کەمو کورتە ، وە لە بارەی ساختومانی دەستوری ئەویش ئەهمیەتێکی تەواوی هەیە • بەداخەوە زانیاری زمانەوانی ئەو زمانە لەگەل زمانەکانی ئەسکیتیو خوارزمیو سگدیو هینی ترا جیاوازی لە جۆری دەنگدا زۆرتر بو بێت •بەم جۆرە بەشێوەی گشتی بە بێ لادانو چەندو چون ئەتوانین بلێین کە ئەم زمانانە زۆر لە یەکترەوە نزیک بون •

بە شێوەی گشتی لێکدانو لێکۆلینەوەی زمانە ئیرانیەکان وەکو لای خوارەوە دێتە دی :

**زمانە ئیرانیەکان ئەکرێن بەسێ بەشەوە ، بەم جۆرە :**

١ ـ کۆمەلەی لقی [ئەسکیتی ـ ئاسیای ناوەڕاست] ، یان وەك تر بلێین [کۆمەلەی ئیرانی رۆژهەلات] •

٢ ـ کۆمەلەی لقی [مادەکان ـ پارتی یان وەك تر بلێین]ژوروی رۆژئاوا]•

٣ ـ کۆمەلەی لقی [خواروی رۆژئاوا]کە تەنیا نوێنەری کۆنی ئاشکراو دۆزراوەی هەمان پارسی کۆنە •

بەلام دوو بەشە باسکراوەکەی دوایی کراون بەیەك بەناوی [کۆمەلەی ئیرانی رۆژئاوا]وە ناو ئەبرێن •• دانانی ئەم ناوە لەروی شێوەی زمانو دەستورەوە لە نێوان زمانەکانا نزیکی ئەنوێنێ ، بە زۆری لە نێوان زمانەکانی دواتردا وەکو کۆمەلە کانی [ژوروی رۆژئاوا]و[خواروی رۆژئاوا] « پارتیو پارسی » هەیە ، وە لێك چوونیان لە سەردەمەکانی دواییدا لە هەندێك گۆڕینی دەنگی ئەم زمانانەدا بەرچاو ئەکەوێ بەلام لەوە ئەچێ ئەم نزیك بونەوەیەو لێك چونە لە پلەی دووەمدا ئەهمیەتی هەبێت • وە لەوەی ئەچێ لە ئەنجامی کارکردنەیەکی زمانەکانی مادو پارتیو پارسی کەبەرامبەر بە یەکتر بویانە ئەمە بوبێت ، کە رۆژگاری یەکێتی ئیداریو سەربازی ئەم سەرزەمنانە ـ لە کۆتایی رۆژگاری بەندایەتیو سەرەتای سەدەکانی

ناوەڕاستدا ـ بووبن بە هۆی ئـەم کار تێکردنە • زانراوە کـە ئێستە لـە سەرانسەری کیشوەری ئێراندا یـەك زمانی ئەدەبی یەکگرتو ، واتا زمـانی فارسی یان پارسی تازە خۆی سەلماندوە [ئەگەرچی پاشماوەی زمانەکانی پێشو هەروەها ـ یان بە وێنەی چەند شێوەیەك کـە تێکەڵی فارسی بوە لـە چـەند شوێنێکی دیاریکراوا قسەی پێ ئەکـەن وەیان سەربەخۆیانە ـ بونیان هەیە] بەلام ئەم زمانە پارسیە تازەیە بە تەواوی پاشماوەی زمانی پارسی کۆن نیە ،وە لە سەدەکانی نۆیەم‌و دەیەمی زاینی لەناوچەکانی رۆژهەلات وە زۆرتر لەسەر بناغەی ئەو شێوانەی تر کە هەیە پەیدا بووە ، جگە لەوەش لـەناو رۆژگارە جۆربەجۆرەکانی بەر لە مێژوی خۆیدا گەلێك وشەی زۆرو زەبەندەی لەناو زمانەکانی مادو ـ دوای ئەویش ـ بە تایبەتی پارتی راکێشاوەو وەری گرتوە• [ بـە بیرورای و•ئەی• ئابایێف ـ تاکو دوسـێ یـەك ][133] بـە تایبـەتی کارتێکردنێکی گەورەی فەرهەنگی زمانی ماد ـ واتا زمانی قەومی کـە لـەو رۆژگارەدا گەلێك بالا بووە ـ لە پارسی کۆندا لەو نوسینانەی کە لە دامێنی جەدوەلی ژمارە (٢) وە وەیان ئەو جێگایانەی تر کە هاتوە دەرئەکەوێ : لە ئەنجامی لێکدان‌و لێکۆڵینەوەی زمان شوناسی دەرکەوتوە کە زاراوەی ئیداری‌و دەوڵـەتی لەوێنـەی [شاە] [خشای ثی] و [ساتراپ] ، هـەروەهـا زاراوەی کشتوکاڵ وەکو [ئاسا ـ درو] وەهەندێك وشە کە پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە وەکو [ فرنـە Farna ] بەمانا [ هێزی بـەربەیان وشانازی شاهـانە ]و [خۆشبەختی]وەناوی خواوەند «میترا»وە[زاراوەی Aniyaha bagaha ئانی یا هەبگا هە] کە مانایەکی ئاینی هەیەو مادی‌یـە • زاراوەی « پیرۆز » [ برزەن Braizman ]و « توهین » و [ فشـار ] «زور Zura » و [ سەنگی لاجوەرد ] [ کسـك Kasaka ] وهی‌تر کـەمـادی وەیان باکتریائین[134] • بەتایبەتی زۆر لەوە ئەچێ کـە ناوی هـەندێك لە هۆزە ئیرانیـەکان مادی بن • هـەرچۆن بێ نوسراوە کانی هۆزی [ ماسپیان ] و [ساگارتیان] مادین [لەیەك کاتا بەواتەی غەیرە پارسی «سپ» Sp سـەرنج

ئەدەین وە لە کاتێکی ترا بـە شێوەی مادی « ئەسگرتیا asaqartiya کونەبەرد ] ، « غارنشین » لـە جێگای شێوەی پارسی بـە « ئاتگریتی » ئەگەین •

بەڵام ئەوەی کەزۆر جێگای سەرنجە ئەوەیە کـە ناوی فارس [پارس] وشەیەکی مادی یە(١٣٥) ، ئەبێ بـە زمانی پارسی کۆن بە شێوەی [ پارت ] بەکاری بێنین • بەڵام بە پێچەوانەوە وشەی (پارت) کە ئەبێ بەزمانی پارتیو مادی [ پرسو Parsava ] بەکار بێت(١٣٦) [ پرثو ] بـەکار هـاتوە ، [ پرسو Parsava ] یان بە ئاشوری [پارسوآ](١٣٧) بەناوچـەیەکی تریان ئەوت کە کەوتبوە ئەوبەری رۆژئاوای خاکی مادەوە کە سەرچاوەی ئاشوریو ئورارتوییەکان بە ئێمەیان ناساندوە ، ئەم روداوە رێکەوت نیە ، ئەم زاراوانە بە وشـەی ئێرانی [پارس Pars وپرســـو Parsau ] کـە بـە مانا [کەنار]ە(١٣٨) وە [پارس] و [پارسوا] و [پارت] ئـەوانیش لـە کـەناری خاکی مادا بون • لە خوارەوە [پارس] لە رۆژ ئاواوە [پارسوا] وە لـە روژ هەڵاتـەوە [پارت] بوە • [وە لـە ژوروی مـاد لـەناو هۆزەکانی ترا نـاوی [پارسەکان] دیسان هەیە • هەرسێ ناوەکـە مانای [کەنار] ئەگرێتەوەو ماد مەرکەزی [پارسوا] و [پارس] بوە • لەوە ئەچێ (پارت) بەو هۆزانە وترابێ کە بە شێوەکانی خواروی رۆژئاوا قسەیان ئەکردو لە [کەنار]دا ژیاون •

لـەو جـەدوەل نوسراوانـەی کـە دەستمان کـەوتوە پـەیوەندی لـە نیوان زمانی مادو زمانی ئاویستادا دیارە ، کە ئەم دوزمانە لە گەلێك شتا یەك ئەگرنەوەو زۆر لە یەکەوە نزیکن ، بەڵام تا ئەو رادەیە نیە کە هەردوکیان بە یەك زمان بزانین ، وە بەو لێکچونانەی نێوان هەردو لایان قایل بین • زیادو کـەمی زۆری دەنگ لـەنێـوان [ فرن Farna ـی مـادی « هـورن huarena » ی ئاویستا ] و زاراوەی « بەگ Baga » ی مادیو « یزت Yazata » ی ئاویستایی هـەیە • زمانی ئاویستا مـادی نـەبووە

بەڵکو زمانێکی ترە ، راستیەکی زۆر کە ئیستە لێرەدا ماوەی ئەوە نیە باسیان بکەین زمانی ئاویستا بە کۆمەڵە لقێکی زمانی [ئەسکیتو ئاسیای ناوەراست]ەوە ئەبەستێ • هەروەکو زانراوە زوربەی لێکۆڵەرەوەکانی شورەویو رۆژئاوا ئاویستا بە زمانی ئاسیای ناوەراست ئەزانن • بەم جۆرە غفوراف ، جکسون ، کیگر ، ئالت هیم ، «باکتریا» وە ترور «سگد» و• ئاسترۆوە «مرغیان» و تالسوف و هنینگ ، خوارەزم بە زادەگای ئاویستا ناو ئەبەن • وە هەروەها هەندێکی تر لەو باوەڕەدان کە ئاویستا زمانی مادە • [ماکوو لسکی] و [هرتسفلد] لە سەدەی نۆزدەهەم و گەلێك کەس باوەڕیان وابو کە ئاویستا زمانی مادە [یوستیو تاڕادەیەك ئاشپیکلو چەند کەسێکی تر ئەوانیش هەر لەم باوەڕەدا بون] •

کاتێك سەرنجی ئەم نوسینانەی لای سەرەوە ئەدەین نابێ ئەو راستیەمان لەبیر بچێ کە کیشوەری ماد لە رۆژگاری کۆندا وە بەر لە کەرت بونی هەرگیز کیشوەرێکی یەکگرتوی یەك پارچە نەبوە ،وە لە سەرەتاوە یەکگرتنێکی هۆزەکان بوەو دواجار دەزگای سەربازیو ئیداری کە هۆزو کیشوەرە جۆر بەجۆرەکانی پێکەوە ئەبەست بووە •وە لەو کاتەدا کۆمەڵەیەك سەربازیو ئیداری کە هەخامەنشیەکان هێنابویانە کایەوە تیاهەبوە ، وە لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاینی بوو بە دوو بەشەوە : یەکێك [مادی ئاتروپاتن] ئەوی تر [مادی بچوك] • لە رۆژگاری بەندایەتیدا ئەم دو بەشە هەرگیز یەکیان نەگرتۆتەوەو نەبونەتەوە بەیەكو وە لەناو هەریەك لەم دو کیشوەرانەدا چەند هۆزیکی تازەی سەربەخۆ پەیدا بون • لەگەل ئەوەدا کە خەڵکی مادی ئاتروپاتین خەڵکی پیشونانی وڵاتی ئازربایجانن وە دانیشتوانی مادی بچوك کە هەمویان جیاوازن بەشێکی ئەوانی تر نەبون • لەم هاتوهوتەدا بەر لە سەرەتای دروست بونی هۆزەکانی مادی ئاتروپاتینو ناوچەکانی دەورو بەری زمانی هۆزەکان [بەر لەزمانی نەتەوایەتی] لە کاتی [یەکیتی ماد]دا کە

دەسەڵاتدار بون ، بەم جۆرە لە رۆژگاری بەر لە دروست بونی مادی ئاتروپاتین لە خاکی مادا یەك زمانی رەسەن‌و سەربەخۆ [ئیرانی وەیان کاسپئی] نەبووە • « زمانی مادی ئیرانی » کە ئەو سەرچاوانەی ئیستە هەن باسی لێوە ئەکەن هێشتا زمانێکی خێڵەکیانەو سەرەتایی بوو لە گەل ئەهمیەت‌و برخی خۆیا ــ هەروەکو لە سەنەدو بەڵگەی زۆر سود وەرگیراوە ــ تەنیا یەکێك بوە لە زمانە خێڵەکیەکانی سەرزەمینی ماد [وە بە تایبەتی مادی رۆژهەلات] • هەرچون بێت لە کاتی ئەم لێکۆڵینەوەی ئێمەدا لەناو سنوری مادی ئاتروپاتین دا چەند زمانێکی تر ــ کە غەیرە ئیرانی بون ــ هەبوون •

هەمو ئەزانین کە هیچ هوزێك لە رۆژ هەلاتی نزیك‌و ناوچەکانی تر ئەو زمانەی کە چەندەها هەزاران ساڵ بەبێ ناوبەین [فاصلە] لەمەوپێشەوە قسەیان پێ کردوە ــ ئیستا هیچ قسەی پێ ناکەن ــ لە میسر زمانی میسری کۆن جێگای خۆی بە قبطیەکان‌و دوایی بە یۆنانی‌و لە ئەنجامدا بە عەرەبی دا • لەگەل ئەوەشدا کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لە ناو نەچون‌و لە ولاتی خۆیان دەرنەکران‌و بەبێ گۆڕان تا ئیستا ماونەتەوە • هەروەها لە عیراقدا دیسان زمانەکانی سومەری‌و هوریتی بەرێك‌و پێکی جێگای خۆیان دا بە « ئاشوری ــ بابلی » [ئاکدی]و ئارامی‌و عەرەبی • لە ئاسیای ناوەڕاستدا زمانە ئیرانیەکانی وەکو خوارزمی وسگدی‌و باکتریائی‌و پارتی بوو بە زمانی تورکی ئەزبەك‌و قرەقلپاقیان‌و تورکمان • هەروەها ئەم گۆڕانانە بەسەر زمانەکانی مادیشدا هاتود • بەلام هۆی بنەڕەتی گوڕینی ئەم زمانانە ئەوە نیە کە خەڵکەکانی ئەم کیشوەرە یان ئەم سەرزەمینە نەمابن‌و خەڵکی تر هاتبنە جێگاکانیان ، وە بەم هۆیەوە هۆزەکانی ئیستا ــ لەگەل ئەوەدا کە ماوەیەك بە زمانێکی تر قسە یان‌ئەکرد ــ بە شێوەی گشتی نەوەی راستی دانیشتوانی کۆنی ئەم کیشوەرانە شن • ئەو دانیشتوانەی کە میراتی رۆشنبیری **و میژویی‌و** تەژادی‌یان بەهۆزەکانی ئیستا گەیاندووە •

× × ×

## ٤ ـ میژوی ماد لەبەر سەرنجی زانستی ئەمڕۆدا(١٣٩)

**ئەتوانین میژوی سەردەمی ماد بکەین بە دوو بەشەوە :**

بەر لە دزۆینەوەی سەرچاوە رەسەنەکانی رۆژهەڵات [بە تایبەتی خەتە بزماریەکان] ودوای دۆزینەوەی ئەوان •

لە سەردەمی یەکەمدا ـ واتا تاکو چواریەکی دوایی سەدەی نۆزدەیەم ـ میژوی ماد بە پێی وتەی نوسەرە کۆنەکان لەناو سنورێکی دیاریکراوا بوو ، وە هەوڵو تەقەلا ئـەدرا کـە زانیاری نابەجێی سەرچاوەکانی زۆرەوزۆر بکرێ ، وە هەر شتێك کە لە ناویا نەبێو دروستکراو بێ باسی‌بکەن • لـەو رۆژگارەدا [ئـەم وتەیـە جێگای سـەرنجی تایبەتیە] ئەیانویست قسـەکانی کتسیاس لەگەل نوسراوەکانی هردوتو تەورات تا ئەتوانن بیان گونجێنن •

رۆژگـاری کـۆن کـاتی سـەرنجـی میژوی کیشـوەرەکـانی رۆژهەڵاتی کۆنو سەردەمی نوسینەوەی رەخنەی نوسەرانی کۆن بوە ، کـە لـە روی نوسینەوەی دەسخەتەکانەوە نوسیویانەتەوە • ئەمـە کارێکی زۆر گەورەو وردبینانە بوە کـە کار شوناسانی ئەدەبیاتی کۆن لە سەردەمی تازە کردنـەوەدا [رنسانس] یان بـەکارهێنا ، وە بـەشێك لـەوانە لـە سـەدەی نۆزدەهەمدا نوسراوەتەوە •

دوای ئەوە گەلێك تەقەللایان داوە تا مێژوی ماد کە نوسەرە کۆنەکان نوسیبویانەوە لەگەل داستانو بەسەرهاتی ئەفسانەی زەردەشتیەکاندا تێکەڵیان بکەن(١٤٠) •

مێژو نوسە ئەوروپاییەکانی سەدەی هەژدەهەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم کە مێژوی جیهانی کۆنیان ئەنوسیەوە بەپێی زانینی ئەرکی مێژویی یە مێژو نوسە یۆنانیو روسیەکان زیاتر لە باسەکەوە دور نەکەوتونەتەوە ، بە زۆری زانیویانەو ئاگادار بون • بە پێی بیروڕای ئەوان مێژوی کۆن بریتی بوە لە چەند زنجیرەیەکی شەڕو شۆڕ • لەبەر ئەوە تاکو چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەهەم ئەوەی کە لەبارەی مادەوە نوسراوە وەکودیارە هیچ شتێکیان تا ئێستا ئەهمیەتی خۆی نەپاراستوە – جگە لە هەندێك بیروڕا نەبێ – وەکو رونکردنەوەی دەستورو سیستەمی مێژوی [کتسیاس]کە لەساڵی ١٨١٤ بە هۆی [ولنی] هاتە کایەوە ، تا دیاریکردنی مێژوی پەیمانی ئاشتی (صلح) لە نێوان مادو لیدی یەکانا [کە «نلدکە» بە تەواوی لە ١٨٨٧ دا دیاری کردوە] کە لەبەر رۆژ گیرانەوە – بە هۆی ئەم دوداوەوە لێکدرایەوە – پێك هات •

یەکەمین بەڵگەی سەرچاوەکانی رۆژهەڵاتی کۆن کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا دەسکەوتوە تارادەیەك بێ کەڵك بووە چونکە زۆری بە دروستی نەخوێندراوەتەوە ، وە هەروەکو تەواو کەری باسو ••• نوسینی نوسەرە کۆنەکان دائەنران • وە بەم هۆیەوە یەکەمین نوسینێك کە سودی لەو سەرچاوانەوە وەرگرتبێ لەبارەی مێژوی مادەوە لەگەل نوسراوەکانی پێشودا ئەوەندە جیاوازی یان نیە •

یەکەمین کەسێك کە لە بارەی نوسینی مێژوی مادەوە سودی لە نوسراوە بزماریەکان وەرگرتوە [فرانسو النورمان] بوە ، [لەساڵی ١٨٧١]دا(١٤١) لەو کاتە بەدواوە وردە وردە چەند نوسەریکی تریش لەبارەی مێژوی مادەوە لێکۆڵینەوەو نوسینیان نوسیوە • ئەو نوسراوانەی کە لە بارەی مێژووی

کێشوەرەکانی تری رۆژهەلاتی کۆنەوە کۆ کراونەتەوە ئەوەندە فراوان نەبون کە سەرنجی نوسەرەکان لەبارەی لێکۆلینەوەو نوسینی میژوی مادەوە رابکێشێت[١٤٢] لەناو ئەو نوسینانەدا کە لە چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا پەیدا بوە ئەبێ ناوی کتێبی [ ئوپر ] بەرین • ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ‌و دەری ئەخات کە[بەشی دوەمی نوسینەکانی هەخامەنشی]لەگەل زمانی ماد هاوشانن •• ئەم کتێبە لەگەل ئەوەدا کە هەندێك بیروڕای بۆ لای خۆی راکێشاوە و بە ئاشکرا ئەم لایەنەی تیا بەدی ئەکرێ ، بەلام زۆر کۆن بوە وە لە بارەی بەلگەو سەلماندنی نوسینە کانیەوە نباغەیەکی ئەوتۆی نیە • جگە لەمە [ئوپر] خوی دیسان لەبارەی میژوی مادو ئەو باس‌و بە سەرهاتانەی کە پەیوەندی‌یان بە میژوی مادەوە هەیە ڕاڕا بووە • [دلاتر] بەلگەکانی [نوپر]ی بە وردی داوەتە دواوە ، بەلام سەرکەوتنی [دلاتر] زورتر لایەنی [نەفی] کردنی بوە چونکە بیروڕاکانی کتیبی [ئوپر]و [هنری]و [جرج راولینسون] و هینی تری ئەدایە دواوە • ئەوەی کە [دلاتر] لە بارەی نوسینەوەی میژوی مادەوە پشتی پێ ئەبەست‌و بەراستی دائەنا کەم بوو ،بەلام ئەو نوسراوەی راست‌و نیوە راستی لەبیروڕای ناراست‌و باوەڕ پێ‌نەکراو جیا کردۆتەوە ، وە ئەمە خزمەتێکی گەورەی ئەو بووە • دیسان لەبارەی نوسینی میژوی مادەوە وە بە سوك تەماشای ئەو نژادانەی ئەکرد کە هیندی‌و ئەوروپایی نەبون وە ئەم روالەتە لە نوسینەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەدی ئەکرا •

[هوگو وینکلر][١٤٣] و [روست] گەلێك شتیان لەبارەی میژوی مادەوە نوسیوەتەوە ، لەو سەردەم‌و رۆژگارە بەدواوە گەلێك کتێب‌و نوسراوە لە بارەی میژوی مادەوە پەیدا بوە ، زوربەیان لە پێشا لە هەخامەنشیەکانەوە دەستیان پێ ئەکردو چەند لاپەڕەیەکیان بۆ تەرخان ئەکرد ، رۆشنبیران‌و زانایانی کۆتایی سەدەی رابوردو میژوی مادیان[١٤٤] بە پێشەکی میژوی

هەخامەنشیەکان ئەزانی • لـە کتێبە میژوییەکانی هـەموو رۆژهەڵاتی کۆندا دیسان باسی میژوی ماد کراوە[١٤٥] •

لە سەرەتای سـەدەی ئیستادا لـە زەمینەی نوسینەوەی میژوی ماد لـە سەردەمی [لنورمان] و [دلاتر]دا ئەوەندە دەست پێشکەوی نەکرابو • بەلام چەند سەرەتایەکی گـرنگ لـە جوگرافیای میژویی ماد – سەدەی نۆیەم تا حـەوتـەمی پێش زاینی –[١٤٦] هاتبـوە کایـەوە • لـە کـاتی دۆزینەوەی سەرچاوەی نوسـەرە یۆنانیەکان بـە هـەوڵو تەقەللای [مارکوارت][١٤٧]و [پراشـك] و[١٤٨] [ ژاکوبی ]و[١٤٩] چـەند نوسەرێکی تر هـەندێك پێشکەوت • بلاو بونەوەی چەند باسێکی سەرزارەکی ئاشوریەکان – کە بـە بۆنەی دەرچونی [کشتریتی] لـە ماد پەیدا بوو ، بەهۆی [کنودتسون] لەساڵی ١٨٩٣ و [کلائوبر] لە ١٩١٣ دا زۆر ئەهمیەتی هەبو • بەلام ئەو راستیەی کە لە رووداوەکانا دەرئەکەوت – واتا دامـەزراندنی پادشایەتی ماد – هـەروا بەتاریکی مایەوە[١٥٠] •

بە شێوەی گشتی تا ئەو کاتە میژوی ماد هەروەکو بو زورتر بە چەندەها باسی جۆربەجۆرو کـەموزۆر زیرەکانـە و بـە پێی نوسینەکانی هردوتو کتسیاس باسی لێوە ئەکراو لێك ئەدرایەوە •

یەکەم : نارەحەتی لەوەدا بو کـە ئەوەی ئاشکرابێ هیچ پەیوەندی‌یەك لە نێوان سەرچاوە ئاشوریەکانو نوسەرە یۆنانیەکانا نەبو ، سەرچاوەی یەکەم وڵاتی مادی لـەروی سیاسیەوە زۆر بـە ئاڵۆز دائەنا بەلام یۆنانیەکان دانیان بەوەدا ئەنا کە ئەمپەراتۆریەتێکی سەربەخۆ لـەو وڵاتـەدا بووە ، لەناو ئـەو هەمو سەرچاوە ئاشوریانەدا تەنیـا یـەك پەنجەیان بۆ حوکمرانیو پادشایەتی مادەکان رانەکێشاوە[١٥١] •

جگـە لـەوە گـەلێك زاراوە سـەریان لـەلێکۆلەرەوەکان ئـەشێواند هەروەکو زاراوەی [ئومن – مند] تاوێك ئـەیانکرد بـە هی [کیمر]یـەکانو

تاویك بەهینی مادەكانیان دائەنا • بـەم جۆرە چـەند بیروڕایەكی جیابەجیاو جۆربەجۆر پەیدا بوو پادشایانی مادیان جاروبار بە [كیمری]و جاربەجار بـە ئەسكیتی [سكایی] دائەنا[١٥٢] •

ئەم باسە كـە نوسراوە بزماریەكان – لەبارەی روخانی ئاشوریەكانەوە لەلایەن مادەكانەوە بە روناكی باس ناكـەن ئەمە گـەلێك ئالۆزی نایەوە بۆ ئەوە كە باسەكە لـەناو بیسەرانا بـە شڵەژاوی وەربگیرێ • تا ئـەو كاتـەی كە زانیاریەكی ئـەو تۆ دەست نەكەوتبو ئـەم باسانە لـە نێوان نووسینەكانی هردوت‌و كتسیاس‌دا كەم‌و زۆر وەر ئەگیراو بەراورد ئەكران[١٥٣] پەیوەندی ماد لەگەل ئـەو كیشوەرەدا كـە زادەگای پەیدابونی ئاویستا بو بەهیچ جۆر روناك نەبو ، [هەروەكو تا ئیستا رۆشن نەبۆتەوە] •

دیسان شتێكی تری گرنگ ئەوەیە ئەوانەی كە لەبارەی مادەوە شتیان نوسیوەو لێی كۆڵاونەتەوە یـەك لایـەنی بووە چونكـە زانایانی بورژوازی رۆژئاوا تەنیا لـە نەزەرگـەی دەسـەڵاتی [ئاریاییەكانەوە] پەیوەندی خۆیان لەگەل میژوی ئەو كیشوەرەدا دەر ئەبڕی ، زانایانی ناوبراو لەسەر ئەو ڕێبازو ڕێچكەیە ئەرۆیشتن وە وایان ئەزانی كە هۆزەكانی رۆژهەڵات – جگە لـە هەندێك لەوانەی كە دەركەوتون – توانای میژویەكی سەربە خۆیان نیە ،وە بە پێچەوانەوە ئەوانەوە كە بە زمانەكانی هیندی‌و ئەوروپایی ئەدوێن خاوەنی نوسراوەیـەكی میژویین • [ ئـەم بیروڕایە لـەلایـەن زانـایی ناوبراوەوە بەشێوەیەكی رەوان‌و پوخت «نژادی ئاری»یان تێكەڵ بـە داستانی ئەفسانەیی كرد ] • ئەم زانایانە بـە هۆی جۆربەجۆرەوە شوێنەوارو نیشـانەی زمـانی هیندو ئەوروپاییان لە وڵاتی مادی گەورەی كۆندا رازاندۆتەوەو بـە تایبەتی گرنگی‌یان پێ داوە كە لەپێش هاتنی هیندو ئەوروپاییەكان بیابان نشین‌و خانە بە كۆڵ‌و كۆچەرەكان لەم سەرزەمینەدا فەرهەنگێكی باڵاو دەوڵەتێكی تەواویان [ وەك لە سەرزەمینی ماننا ]دا بووە ، وە ئەمـە خۆی لەگـەل رەوتی خۆ

پێگەیاندنی مێژوییدا کە پلەی شارستانێتی‌یان نزمتر بوە پێ گەیشتوون •

ئەو هیندو ئەوروپاییانەی کە ئەچنەوە سەر رەگەزی [ ئاری ] لەسەرزەمینی مادا نەخشەیەکی گەورەیان دیاری کردوە • دانیشتوانی مادی خوارو [مادی بچوك] لە رۆژگاری پێشوودا هیندو ئەوروپایی بون •هۆزەکانی هیندو ئەوروپا بەش خۆیان رۆشنبیری‌و فەرهەنگیان لەو سەرزەمینەدا بووە ، وە بە هیچ جۆرێك لە شان بەشانی هۆزو تیرەکانی تری ئەو سەرزەمین‌و رۆژگارەدا دوا نەکەوتوون • زانیاری رۆژئاوا لەم سەردەمەدا بەتەواوی هاتنی دەسەلاتی ئەوانیان لە سەرزەمینی مادو جولانەوەی وردە وردەیان لەرۆژ هەلاتەوە بۆ رۆژئاوا تێ گەیشت(١٥٤) بەلام مەبەست ئەوەیە کە زانیاری رۆژئاوا زۆر بەگرنگی بایەخی بەو هۆزانە داوەو لەمێژودا جێگای تایبەتیان بۆ داناوون ، هەروەها پێشکەوتن‌و فەرهەنگی ناوچەیی‌یان ـ کەلاوەکانیان رائەکێشا ـ بێدەنگ کردو بلاویان کردەوە کە کۆمەلێکی تریان وەکتر بلێین چەند هۆزێکی تر [لەدەرەوەی مێژووەوەن] باس کردنی مەسەلەکە بەم جۆرە لە واقیعا ستایش کردنی زۆر ستەمە کە دەسەلاتدارەکان ـ ئیمپریالیستەکان بەرامبەر بە ژێردەستەکانیان رەوای ئەبینن •

لەو رۆژگارەدا [پراشك](١٥٥) لیکۆلەرەوەی چیکی لە زۆر کەسی تر زیاتر لە بارەی مێژوی مادەوە هەولی داوە ،کتێبی مێژوی مادی ئەو لەو کاتەدا باشترین کۆمەلە نوسراوو زانیاریەك بوە کە پەیوەندی بە مەسەلەکەوە بوەو نەخشەیەکی گرنگی دیاری کردوە • لەگەل ئەمەشدا نوسراوی ناوبراو بەهیچ جۆرێك ناتوانێت لە دەرونی خوێنەوارەکانا بەتەواوی جێگای خۆی بکاتەوە • نەك لەبەر ئەوە کە گوایە هەندێك لەو باس‌و نوسراوانەی کتێبەکە کۆن بون ، بەلکو لەبەر ئەوەیە کە [پراشك] لەو کاتەدا کەوتبوە بەر زەبری ئەو بیروراییانەوە کە کۆنەکانیان پەسەند ئەکرد •

لەبارەی مێژوی مادەوە [پراشك] بە بیری خۆی زۆر بەوردی سەرنجی

لە بابەتو باسەکان ئەدا ، ئەو ئەڵێت : « ئەوکاتەی ...کە ئاریەکان لەسەر زەمینی مـاددا بـەهێز بون دانیشتوانی ناوچـەکـەیان دەرکردو دەسـەڵاتی سیاسی کەوتە دەست لاوە لێهاتوە ئاریەکان • بومیەکان نەیان ئەتوانی ژیانو مێژوو دوارڕۆژی خۆیان بەڕێوە بەرن »(١٥٦) •

ئەم بیروڕایە ڕاست نیە چونکە [بومیەکان] لەو ڕۆژگارەدا هەرچەند لە ناو هیندو ئەوروپاییەکاندا دەرنەکەوتبون خاوەنی مێژوی ژیانی خـۆیان بون • [پراشك] ئەم باسەی نەدرکاندوە کـە مادە بومیەکان لـەگـەل دراوسێـکانی خوارو و ڕۆژئاوای خۆیان کـە ئاری نـەبون چـەندە جیاوازی شارستانێتیان لـە ناوا بوە • پراشك بـە شـوێن مارکواتدا(١٥٧) وە هـەروەکو بیروڕای ئەو ئاتروپاتین بە بەشێکی ماد نازانێت(١٥٨) ، وە ئەمە شتێکی ڕێکـەوت نیـە چونکـە ئـەبوا لـەبارەی ئـەم شـتە نابـەجێیـەوە بیروڕای خـۆی بـەبێ بناغە بزانیایە •

لەگەل ئەوەدا [لنورمان] دو ڕەگەزی لـە وڵاتی مـاددا دەست نیشان کردوە ،بەڵام بە بیروڕای [پراشك] نژادی ناوچەگەری لە کێوەکانو شیوەکانا داناوە ،وە نژادی هیندیو ئەوروپایی زۆر بە گرنگ گرتوە • ناوی تایبەتی مادەکان کە لە سەرچاوە ئاشوریەکانەوە وەرگیراوە ڕەگەزی زمانی ناوچەیی لە بەشەکانی ڕۆژئاواو ناوەڕاستو ژوروی وڵاتی ماد نیشان ئـەدات ، وە ئەمە لەگەل بیروڕاکانی پراشك ناگونجیو بیروڕاکانی پراشك بە درۆ ئەخاتەوە • چونکە تەنیا بەمەندە دەس بەردار ئەبێ کە نوسراوەکانی وەکو [بیت ظتی] و [بیت تزکی] وهی تر ئەمانە هیندیو ئەوروپایین • تەنیا بەم بەڵگەیە کـە بـە شێوەی گشتی لـە ناوی هیندیو ئـەوروپاییدا شێوەی دەنگی [طت] و [تز] هەیە ، بەڵام بـەهیچ جۆرێك لـەبارەی ڕونکردنەوەی مانای ئـەم دەنگانەوە نادوێت ..لەچەند شوێنێکیترا دیسان بەبێ هیچ بەڵگەو ڕونکردنەوەیەکی فلان یان هـەمان ناوی ئـەبرد • ئـەو هەوڵی ئەوەی داوە کـە مادەکانی هیندو

ئەوروپایی لەهـەمو سەرانسەری خاکی ماددا ـ تەنانەت لـەو پەڕی ناوچەی ڕۆژئاوای ئەو سەرزەمینەوە ـ بکات بەیەك وەبەم جۆرە ئەو ناوە جوگرافیانەی کە بە [کینگی] و [کین] و [کینەی]و هی‌تر دەست پێ ئەکات و لـە ناوچەی کێوەکانی [ زاگـروس ] داهـەیـە بـەکاریان بێنێ و ڕەگـەزی [ کین ] لەگەل وشەی ئاویستایی [کنها Kanha ] پێکەوە بگونجێنێ ، لەگەل ئەوەدا کە لێکچوونیان زۆر دورە ، وە بەشەکانی تری ئەم ناوانە کە لە دواوە دێن بە تەواوی هیندیو ئەوروپایی نین • چاپکردنی هـەندێك لـەو سـەرچاوە هەلانەو خوێندنەوەی هەندێك لەو وشانەی [ئەو سەرچاوانەی کە ئەو سودی لێ وەر گرتوون(١٥٥) بوو بە هۆی ئەوە کە هەندێك وشەی شێوە هیندیو ئەوروپایی لە کتێبەکەی [پراشك]دا پەیدابێت •• هەمو ئـەمانە ڕوی واقیعی باسەکە تاریك ئەکەنو سەر لە خوێنەران ئەشێوێنن •

کتێبەکەی [پراشك] ـ لەگەل ئەوەدا کە ئەو لەنوسینی ترەوە سـودی وەرگرتوە ، وە لـەو سـەرچاوانـەوە بـەهرەی وەرگرتوە کـە شـارەزای کۆنەشوناسی بون ـ بەلام کەموکورتی زۆری تیایە ، سەرچاوە ئاشوریەکانی بـە شـێوەیـەکی کورت هێنـاوەتـەوە وە لـە بـارەی جوگرافیـاوە وردی نەکردونەتەوە ، ئەهمیەتی لەشکرکەشی ئاشوریەکانی نیشان نەداوە ، بەلام لە بارەی مێژوی پادشایانی مادەوە ئەبێ بلێین کە نوسینەکانی ئـەو بۆ گۆڕینی نوسینەکـانی هردوتو لـەبەریـەك نـەکـەوتنی بیروڕایان ـ داینـاوە(١٦٠) ناوەڕۆکی ناوی پادشایان لـە کتێبەکەی پراشكدا نـە لەگـەل نوسراوەکانی هردوتدا ئەگونجێ ،وە نـە لەگـەل کتسیاسدا • ناوەڕۆکی ناوبراو بـەم شێوەیە : دیوکی یەکەم (؟) کیاکساری یـەکـەم ، مامی تیارشو = دیوکی دووەم (؟) توکدامی ، ئاستیاگی یـەکەم(١٦١) ، کیاکساری دووەم ، ئاستیاگی دووەم ، [ناوەڕۆکی پادشایان لە کتێبی هردوتو کتسیاس لاپەڕەی ١٨ ـ ٢٦ تەماشای بکە] •

نوسەرەکانی تر لەبارەی نوسینەوەی باس‌و سەنەدو سەرچاوەکانی میژوی مادەوە زۆرتر گومانیان پەیدا کرد ، بەلاّم زاناو نوسەرە لێهاتوەکانی وەکو [ماسپرو] (کە لە میژوی کۆنی میللەتەکانی رۆژهەلاّتەوە خۆی دەربارەی میژوی ماد بەتایبەتی نوسراوی بەکەلکی زۆرە) ئەو هیچ پەنای نەبردۆتە بەر ئەم جۆرە نوسین‌و بیروڕایانە ، وە بە بێ ئەوەی زیرەکانە دەسکاری باسەکان بکات ئەو زانیاری‌یانەی کە لە شوێن هردوت‌و کتسیاس ماونەتەوە هەر بەو جۆرەی کە بە دەستی ئێمە گەیشتووە ئەویش نوسیونیەتەوە[١٦٢] .

لە دوای پراشك ماوەیەکی دور کەسێك لە زانایان‌و نوسەرانی رۆژئاوا کتێبێکی تایبەتی لەبارەی میژوی مادەوە نەنوسی ، بەلاّم لە هەمان کاتا چەند جۆرو شێوە نوسینێك لە لایەن چەند کەسانێکەوە ئەنوسرایەوەو هەندێکیان زۆر جێگای سەرنج لێدان بون ،وە ئەم جۆرە نوسینانە تاڕادەیەك بونە هۆی ئەوە کە نوسینەوەی میژوی ماد سەربگرێ . لەسالّی ١٩٢١ [ فورر ] ئەوەی دۆزیەوە کە سەرچاوە ئاشوریەکان باسی مادیان کردوە ، وە مادیان بە پادشاهی‌یەکی سەربەخۆ داناوە . لە دوای ئەم دۆزینەوەیە لێکۆلەرەوەکان توانیان [کشتریتی] لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینی لەگەل میژوی دامەزراندنی پادشاهی مادو ناوی تایبەتی [کشتریتی] لەگەل [فرائورت] ـ کە ناوی لە میژوی هردوت دا هاتوە ـ یەك بخەن . لە سالّی ١٩٢٣ میژوی روداوە رۆژانەکانی بابلیەکان لەبارەی لەناوچونی ئاشورەکانەوە بلاّو بوەوە ، زۆر بە سەر بلاّو کردنەوەی ئەودا تێ نەپەڕی کە مانای زاراوەی [ئومان ـ ماندا] روناك بوەوەو بەم جۆرە گەلێك لەو ئەفسانانەی کە میژونوسەکان لەبارەی میژوی مادەوە هەلّیان بەستبو ، هەمویان فەوتان‌و نەناوچون .

هەروەها هەندێک زانیاری لەبارەی ئەو زمانانەی کە هیندی‌و ئەوروپایی

مادو عیلام نین دۆزرایەوە ، بەڵام داخەکەم بە هۆی کەمی ئەو سەرچاوانەو گرانی ئوسلوبی زانستیانەیان زانایانو دانشمەندانو نوسەران زۆر لە لیکدانەوەکانیان ئەترسانو لە ئەنجاما ئەوەندەی کە پێویست بووە بە قسمەت نەبوە • هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ـ وەکو [سرك]و[هیوزینك] و[کنیك] ـ کە ئەم ئەرکەیان خستە ئەستۆی خۆیان(١٦٣) ئەوانیش دیسان بەشێکی کەمیان بۆ لێك درایەوە • نوسینەکانی [ هیوزینك ] لە هینی ئەوانی تر پڕ ماناترە(١٦٤) وە زۆر جار بەگەرمی سەرنجی خوێنەران رائەکێشێت •• لە بارەی رۆژگاری پێشتری مێژوی هۆزەکانی [زاگروس]ەوە نوسینەکانی [ئەشپیزر] ـ کە یەکێکە لە زاناو نوسەرەکانی هۆزی هوری ـ زۆر گرنگو بەکەڵکە(١٦٥) • ئەوەی لە مێژوی ماد بکۆڵێتەوە ناتوانێ پەنا نەباتە بەر نوسینە جۆربەجۆرەکانی [ا• هرتسفلد] لە بارەی کۆنەشوناسیو مێژوییو زانستی جوگرافیاییەوە(١٦٦) •

[هرتسفلد] کە نوسەرێکی لێهاتوو بە تواناو زاناو بیرفراوانە گەلێك لێکۆڵینەوەی جۆر بەجۆری لەباسی هەمە چەشنەو تایبەتیدا لێکداوەتەوە ، کە سەرنجدانی هەریەکێکیان رویەکی تایبەتیو ئەهمیەتێکی تایبەتی کەموزۆری هەیە • داخمان ناچێ ئەم نوسینانە نەك تەنیا ئەبنە هۆی ئەوە کە هەمو بیروڕای ناوبراو لەبارەی ئەو مەسەلانەوە کە باسی لێوە کردون ناتەواوون [ لەم روەوە لە دوایدا قسەی لێوە ئەکەین ] بەڵکو لەبارەی شێوەی نوسینەکانیشەوە شکستی بە بەرهەمەکەی ئەدات • ناوبراو لەبارەی ئەو سەرچاوانەوە کە سەلمێندراون [ یا بەهۆی خۆیەوە یان پێشوونان سەلماندویانە ]وە هەروەها لەبارەی ئەو مەسەلانەوە کە هێشتا نەسەلمێندراوون وەیان بەتەواوی ناراستن ئەو بەبێ زیادوکەمو وربونەوەو بیروڕا دەرخستنی خۆی هەمویان بەراست ئەداتە قەڵەم ، وە بە جۆرێك باسیان لێوە ئەکات کە ئەڵێی ئەم باسە زۆر راستە • هرتسفلد لەگەل سەرچاوە نوسراوەکانا

ڕەفتارێکی سەیری هەیە ، ئەو نووسینانەی کە بەدەستی ئێمە گەیشتووە ئەو بەسودی بیروڕای خۆیو لێکدانەوەکانی [ڕاستیان ئەکاتەوەو دەسکاری یان ئەکات] ،وەیان هەندێکیان لێ ئەگۆڕێت • [ ئەگەرچی ئەم باسو لێکۆڵینەوانەش هەندێ جار هەر باسێکی سادەی سەرپێیی بێت ](١٦٧) ئینجا لەبەر ئەمە ئەوەی بیەوێ باوەڕ بە نووسینەکانی بکات تێ ئەکەوێ • هەندێك هرتسفلد بە زمان زانێکی لاوازو میژوو نوسێکی کۆنەشوناسی لێهاتو دائەنێن ،وە کۆنەشوناسەکان بەزمان زانو میژو نوسی دائەنێن بەلام ئەڵێن لەبارەی کۆنەشوناسیەوە کەم تواناو لاوازە • بەراستی ئەگەرچی نوسینەکانی ئەو لەبارەی زمانەوە لەبەردەم ڕەخنەگرانی زمانا خۆی ناگرێ بەلام هەندێك جار زۆر سەرنج ڕائەکێشێو باسەکان بەشێوەیەکی زانستیانە ئەرازێنێتەوە ، وە بیروڕای کۆنەشوناسی ئەو ئەگەرچی لەبارەی گەلێك باسو بابەتەوە خەیاڵییە ،بەلام لەگەلێك شوێندا بەگەرمی سەرنج ڕائەکێشێو بایەخی هەیە • گرنگی کتێبەکانی [ هرتسفلد ] لەمەدایە لەبارەی کۆنەشوناسیەوە پێشتر کەس باسی لێوە نەکردووەو یەکەمین جار بلاوی کردۆتەوە ، ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئەهمیەتی پێ بدرێ •

بەلام وەکو وتمان ئەبێ بە سەرنجدانو لێکدانەوەیەکی وردەوە سود لە نوسینەکانی هرتسفلد وەر بگرین ، وە بەر لەوەی هەر باسێکی لێ وەربگرین ئەبێ لە پێشا بیدەینە بەر سەرنجو باسەکە خۆماڵیانە شی بکەینەوە• چونکە ئەو [تیئۆری]یە میژوییەی کە لە کتێبەکانی ئەودا هەیە ڕاست نیە •

زاناو نوسەرانی ڕۆژئاوا لە سەردەمی ڕابوردوودا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا میژوویان وەکو باسی لەشکر کەشیو ناوی پادشایان دائەنا ، بەلام زانیاری ڕۆژئاوا لە ڕۆژگاری دواییدا هەوڵیدا کە [ تیۆری ] بیروڕای جۆربەجۆری تایبەتی خۆی لەناو میژووەکەدا دەربخات •

[ ئەو تیئۆریانەو تێبینیانەی ]کە دانشمەندانو زانایانی ناوبراو کە لە

زانستی میژودا بەکاریان هێناوە چەند جۆرێکە ، لـە بارەی میژوی مادەوە زۆرتر ئەوبیروڕایەی کەپەیوەندی بـەتیوری [ ئەدواردمیر ]ەوە یـە سودیان بەخشیوە ، بـە پێی تیئوری ناوبراو لەگـەل ئـەوەدا لـە میژوی ئەوروپادا بەنۆرە رۆژگاری فیودالەکانو سەرمایەدارەکانیان کردوە بـەجێ نشینی یەکتر [کۆمەڵگای کۆنی یۆنانو رۆم بەشێك لەم رۆژگارەن] •• ئاسیا تا هـەتایە لـەرۆژگاری فیودالـەکانا مایـەوە ، گوایا هۆزەکانی ئاسیا توانای سەربەستیو بەرز بونەوەیان نـەبو • بەپێی بیروڕای ئـەوان لـەو کاتەدا رەوتی میژوو بریتی بو لـە پیاهەڵدانی [ هۆزە خاوەن دەسەلاتەکان ] کـە کۆمەلێك لە [بارونی فیودالەکان] خۆیشیان ئەزانن ،وە ئاشکرایە کە لەناو ئەوانەدا مەسەلەی پیشەوایەتی پەیوەندی بـە [ئاری]یـەکان ، یان وەك تر بڵێین بەشێوەی گشتی بە هیندو ئەوروپاییەکانەوە هەبوە •

ئەم [تیئوری]یە لـە بیروڕای زوربـەی هـەمو ئـەو زاناو نوسەرانەدا چەسپاوە ، هرتسفلد خـۆی بەناچاری لـەسـاڵی ١٩٣٤دا خـاکی ئەڵمـانی [ئاریانژاد]ی بەجێ هێشت ، لەگەل ئەوەشدا کـە ئامۆژگاری کـەرو بلاو کەرەوەی ئەم [تیئوری]یە بوە(١٦٨) •

لە ماوەی سەدەی بیستەمدا ئەو نوسینانەی کـە بە تایبەتی لـە بارەی میژوی مادەوە نوسراوەتەوە بـەرەبەرە کـەم بۆوە ، ئـەو باسو نوسینانەی نوسەرەکانی سەردەمی کۆن کـە لە راستیەوە دور بوون بڕیان نـەکرد ، زانیاری رۆژئاوا لەبارەی پێك هێنانی میژویەکی رەسەنی زانستیانەی مادەوە دۆش دامابو ، چونکـە ئـەو تیۆریە کۆنانەی بە پوچ دا ئـەناو راستی تازە دۆزراوەی میژوی مادیش بە ئاسانی دەست نەئەکەوت •

[ کنیك ] زوربـەی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بـۆ ئیران لـە سـەردەمی هەخامەنشیەکانو عیلامدا تەرخان کردوە ، ئەو شتەی کە لە نوسینەکانی ئەوا زۆر جارو لە هەمو جێگایەکدا بەرچاو ئەکـەوێ دەسەلاتو بـەرز فڕینی

هێزە ئێرانیەکانە ، نوسراوەکەی ئەو لەم روەوە تەواو دەرناچێ •
[کنیك] هەروەکو [هرتسفلد] لە هەمو بابەتێکداو لە هەمو شوێن‌و کاتێکدا
پشت بەخۆی ئەبەستێ‌و قسە ئەکات • بەڵام لە نوسینەکانی [هرتسفلد] دا
بیری سەرنج راکێشەرو وتەی گونجاوو تێبینی ورد ئەبینرێت • کەچی ئەم
شتانە لە نوسینەکانی [کنیگ]دا شوێنەواریان هەر نیە • [کنیگ] خرابترین
روی نوسینەکانی دانشمەندانی رۆژئاوای سەردەمی رابوردوی زۆر
بەگەرمیەوە وەرگرتوە ،وە شتە پڕوپۆچەکانیانی گەورە کردوە ، بیروڕای
بێ بناغەی تیا داناوون • هەروەکو لەگەل ئەوەدا کە مانای زاراوەی [ئومان ــ
ماندا] ماوەیەك لەوەبەر رۆشن کراوەتەوە ،کەچی [کنیگ] لە پالیمی ئەم
وشەیەوە بە هەوەسی خۆی نوسیویە •

[بابلیەکانی] رۆژگاری دوایی ، مادەکان‌و هەمو هۆزەکانی ژورویان
[مەبەست ژوروی بابل]ە ، بە [ئوما ــ ماندا] ناو ئەبرد • بەڵام [کنیگ] ئەڵێ
ئەوانە خەڵکی دەریائی بون ، [ بە کورتی یۆنانی وەیان ژاپونی بون ]کە
بەهۆی بلاو بونەوەی شارستانیتی‌و فەرهەنگەوە پادشایەتی گەورەی هیندو
ژاپۆن[١٧١] یان دامەزراند • ناوی تایبەتی مادی کە ناتوانین بە ناوێکی
ئیرانی دابنێین ••بەناوێکی ئەڵەمانی داناوە[١٧٢] لەوە ئەچێ ئەمەی بۆ ئەوە
کربێ کە کتسیاس لە بیروڕا هەڵەکانی پاك بکاتەوە[١٧٣] •

[میژوی ئیرانی کۆن] کە [کامرۆن] نوسیویتی زۆر بایەخدار ترە ،ئەم
میژوە بەراستی میژوی عیلامە ، زانیاری کامرۆن لەم بارەیەوە بریتی‌یە لەو
نوسینانەی کە لە بارەی عیلامیەوە نوسراون وە لە ئانستیتوی رۆژهەلاتی
شیکاگۆ رێك خراوە ، وە دەستوری زمانی عیلامی کە خۆی نوسیویتی‌و
[هێشتا بلاو نەکراوەتەوە] ••کامرون گەورە ترین کارشوناسی میژوی
عیلامە ، بەلام کتێبەکەی ئەو هەندێك باسی لەبارەی مادەوە تیایە ،ئەم کتێبە
کورتەیەکی راستی ئەو هەمو نوسراوە بزماری‌و نوسراوانەی سەردەمی

کۆن‌و شوێنەواری کۆنە شوناسی‌یە لەبارەی روداوە میژوییەکانەوە ، هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە تا روخاندنی پادشایەتی ماد [لە دەوروبەری سالأنی ٥٥٠ی پێش زاینی دا] وە ئەمانە پرن لـە شتی راست‌و میژویی •• ئـەم کۆمـەڵە نوسراوە باسکراوە تارادەیەك ئەو نوسینانەیە کە تا ئیستا بلأو نەبونەتەوە ،وە ژمارەیەك لـە ئاشور شناسە ئەرمەریکاییەکان یارمەتی نوسەریان داوە ،کـە ئەمەش دیسان شتێکی سود مەندە • نوسەر تەنیا بیری لە روداوە کۆنەکانی میژوو نەکردۆتەوە ، جگـە لـەداستانی لـەشکر کـەشی‌و گۆرینی پادشاکان ناتوانین شتی تریش لە کتێبە کەیا بدۆزینـەوە ، ئـەو لـە هـەمو مەسـەلە میژوییەکانا [آ•ت•ا• ئولمستد] میژونوسی ئەمەریکایی رۆژهەلأتی کۆن بـە مامۆستای خۆی دائەنێت(١٧٤) •

یەکەمجارە کە هەندێك راستی میژووی ماد لەکتێبی (کامرون)(١٧٥) هەروەکو پێویستە رون بکرێتەوە ، ئـەم کتێبە کۆمەڵە سەنەدو بەلگەیەکی سەرەتاییە کـە زانایـەکی دانشـمەندی لێ‌هاتوی رۆژئاوا رێکی خستووە ، بێگومان شتێکی زۆربایە خدارە ، ئەگـەرچی میژوی مادی زۆر بە پەرپوتی باس کردوە ، بـەلأم لـەواقیعدا لـەبارەی مـەسـەلەی سـەربازیەوە جوانی باس کردوە •

نوسـەری کتێبی سێیەم ــ ر• گیرشمن لـە هـەمو ئـەو کارشـوناسە فەرەنسەییانەی کە لە کۆنەشوناسی ئێران کۆلأونەتەوە لە هەمویان گرنگترە ، کتێبەکەی ئەو رواڵەتێکی ساکاری هەیە ، بەلأم لـەبارەی کۆنەشوناسی یەوە چەن باسێکی ــ واتا کۆنەشوناسی ــ نوسیوە • بەلأم لەبارەی میژووی مادەوە ــ بەتایبەتی ــ گیرشمن لە [کامرون]ی وەرگرتوە •

لە روسیا بەر لەشورش دانشمەندەکان میژوی مادیان بەگرنگ نەئەزانی‌و بە وردی سەرنجیان لێ نەئەدا ، وە لـە بارەی مادەوە ئـەوەندە شتی باش‌و بەکەڵکیان بلأو نەکردبۆوە ،مەگەر نوسینەکانی [ز•ئا• راگوزینا]کە ئەویش

نوسینی خەڵکی کۆ کردبۆوەو هەموی کـەڵەکە کردبوەوە لەسەریەك[١٧٦] دانابون • لـە [میژوی رۆژهەڵاتی کۆن دا]کـە [ب•ئا•تورایف] نوسیویتی چەند لاپەڕەیەکی بۆ میژوی ماد تەرخان کردوە ، وە لەو لاپەڕانەدا هەندێ روداوی بە تەواوی‌و راستی نوسیوە •

نوسینەکانی سەردەمی شورەوی بە شێوەی گشتی دیسان لەبارەی میژوی مادەوە بـەکورتی لـە کتێبـەکانی میژوی رۆژهەڵاتی کۆندا[١٧٧] ـ هەروەکو بەشێك لە میژوی ئێران ـ باس کراوە •

لەناو دانشمەندانی شورەوی‌دا یەکەمین کەسێك کە میژوی مادی[١٧٩] ـ وەکو باسێکی سەربەخۆ ـ باس کـردوە [ئەقرار عـەل ئوف] میژونوسی ئازربایجانی‌یە • ئەو یەکەمین تەقەللای لەبارەی رێکخستنی میژوی تـەواوی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری خەڵکی مادەوە داوە[١٨٠]•داخمان ناچێ کە نوسینەکانی [عەلی ئوف] تیوریە هەڵەکانی [ن- یا• مار] لە بارەی زمانەوە کاری تێکردوە وە[١٨١] نوسینەکانی لە روی زمانەوانیەوە ئەوەندە ورد بینانە نیە • [ا• عەلی نوف] ئیستەش هەر سـەرگەرمی تەواو کردن‌و رێك‌و پێك کردنی مەسـەلە بنەڕەتیەکانی میژوی مـادە ، وە ئەوکـەمو کورتیانەی کـە لـە ناو نوسینە سەرەتاییـەکانیـا هـەیـە لایـان ئـەبات ، وە وا چـاوەڕوان ئـەکرێ کـە گرنگترین مەسەلەی میژویی ماد لەگەل میژوی هۆزە کۆنەکانی نیشتەجێی ئازربایجانی شورەوی‌دا کە پەیوەستەگیان پێکەوە هەیە لە نوسینەکانی داهاتویا رون بکاتەوە •

نوسینی [گ• ئا ملیکیشویلی]لە میژوی [مانا] بەشێکی زۆری لە میژوی مادی کۆندا بە مانای وشەیەکی سەرپێ‌یی هـەیە • [ مانا ] لـە سەدەکانی هەشتەم‌و حەوتەمی بەر لەزاینی لەو خاکەی کـە لە دوایی‌دا بوو بـە بەشی ژوروی ولاتی ماد گـەلێك بایـەخی بووە[١٨٢] پارچە نوسراوێکی ناوبراو لەبارەی سەرکەوتنەکانی ئەمپەراتوری مادەوە لە رۆژئاواو ژوروی رۆژئاوا بە

تایبەتی ئەدوێ[١٨٣] • گەلێك نوسینو رونكردنەوەی كۆنە شوناسانی سنورەوی لە بارەی مادەوە دواون ـ ئەوانە بە پێی تیوری زانستی لە باسەكان كۆڵاونەتەوە ـ وا چاوەڕوان ئەكرێ كە لێكۆڵەرەوان لەبارەی ئەو مەسەلەو باسانەوە بكۆڵنەوە كە پەیوەندی بە كۆمەڵی مادەوە هەیە •وە زیاتر لەم رادەیەی ئێستا باسەكانو بەسەرهاتەكان رون بكەنەوە •

## ٥ ـ مەرجە جوگرافیاییەكان

ماد هەروەكو سەرزەمینێكی مێژوییو بەمانای فراوانی ئەم وشەیە لە سەردەمی كۆندا ئەو خاكەی كە لە لای ژورووەوە بە روباری ئاراسو لوتكەكانی ئەلبورز [لە خواروی دەریای خەزەر] وە لە رۆژهەلاتەوە دەشتە شورەكاتەكان دەشت كویر ،وە لە رۆژئاواو خوارووەوە بە زنجیرە چیاكانی زاگروسەوە بەندەو بەم سنورە چەرخە دراوە پێیان وتوە خاكی ماد •

خاكی ناوبراو لەروی جوگرافیاییەو ە[هەروەها مێژو یش]ەوە ئەكرێ بەسێ بەشەوە :

**بەشی یەكەم :**

كە ئێمە پێی ئەڵێین بەشی رۆژئاوا یان [مادی ئاتروپاتین] بەشی ژوروی روباری ئاراسەوە تا كێوی ئەڵوەند لە خوارەوە درێژ بۆتەوە ،وە ناوچەی دەریاچەی (ورمێ) [كە ئێستە پێی ئەڵێن رەزائیە] وە روباری [جەخەتو] و روبارەكانی تر كە شان بە شانی ئەو ئەرژێنە ناو دەریاچەی ناوبراوەوە ، هەروەها ناوچەی دەراوی روباری قزل ئوزون [ روباری سپی ] كە كێوی ئەلبورزی كەرت كردوە لە نزیك شاری [رەشت]ی ئێستاوە ئەڕژێتە دەریای خەزەر ، ئەم ناوچەیە ئەگرێتەوە •

سەرانسەری ئەم ناوچەیە ئەكەوێتە ناوچەكانی ئازربایجانو كوردستانی ئێرانەوە •• ئەو زنجیرە چیایەی كە لە سەرەوە تاخوار وەیان لە ژوروی رۆژئاواوە بۆ خواروی رۆژهەلات درێژ بۆتەوە هەمووی داپۆشیوە •

بەشی رۆژئاوای [مادی ئاتروپاتین] بە پانایی [تاکو دوسەد کیلومەتر] لە زنجیرە چیاکانی چیای [زاگروس]ی گرتۆتەوە • ئەو کێوانە بەرێك‌و پێکی دیارن ، لەناو لونکەی ئەو کێوانەی کە لە ژوروی رۆژئاواوە بۆ خواروی رۆژ هەڵات درێژ بونەتەوە چەند دەراوێکی بەرامبەر بە یەکیان تیایە ••لە هەندێك شوێن‌دا ئەو روبارانەی کە وشك نابن دەراوێکی تەنگی دروست کردوەو لە دیواری شاخەکانی دابڕیوە ، هەندێك لەو دەراوانە یەکتر ئەگرنەوە ،ئەم راگوزەرانە زۆر تەنگەبەرن‌و بۆ هاتوچۆ کردن ناڕەحەتن ،وە زوربەی کاروان بە چیاکانا ئەڕۆن کە هەندێکیان راگوزەری باشیان تیایە بۆ رۆیشتن •بەم جۆرە روی سەرزەمینی کوێستانی زاگروس پڕیەتی لە دەراوی بچوك‌و تەنیا کە هاتوچۆ کردن لە نێوانیانا ئاسان نیە ،وە دارستان‌و جەنگەلی چڕ زۆرتر رۆیشتن بە ناویاناى ناخۆش کردوە •لە سەردەمی کۆنا تا رادەیەکی دیاریکراو دامێنی چیاکانیان داپۆشیبو ،دیسان لە زستانانیشدا بەفر رێگای رێوارەکانی ئەبەست‌و گیرو گرفتەکەی زیاتر ئەکرد•

لە رۆژ هەڵاتی زاگروس چەند ریزە چیایەکی بەرامبەرو ئاگراوی کۆن بەریزەو لە یەکترەوە دور هەیە ، کێوی ناوبراو بەشێوەیەکی مام ناوەندی لە چیاکانی زاگروس بەرز ترن پانترین شوێنی ئەم ناوچەیە لە خوارەوە بە دەوری دەریاچەی ورمێ‌دایە ،وە روباری جەخەتوو روبارەکانی بەرامبەری ئەم سەرزەمینە ئەبڕن •

بەرزی ئەم زنجیرە چیایە نزیکەی ٢٥٠٠ ـ ٢٠٠٠ مەتر لەروی دەریاوە ،وە ١٠٠٠ مەتر لەروی دەراوە کانەوە بەرزن بەرزترین لوتکەی چیایان کە کێوی [کامگا]یە لە ریزی قەرەداخ‌و لە کەناری خواروی روباری ئاراسدایە ، بەرزیەکەی ئەگاتە **(٣٣٥٨)** مەتر ••وە کێوی [ خوڕەم داخ ] [سەهەند] لە خواروی دەریاچەی ورمێ **(٣٧٢٢م)** مەترەیە ،وە کێوی [سبلان داخ]کە کەوتوەتە خواروی دەراوی روباری قەرەسووە ـ بەشێکە لە ئاراس ـ

(٤٨٢٢) مەترەو ئاق داخ کــە کۆتایی ژوروی ڕۆژئاوای زنجیرەی ئەلبورزە نزیکەی (٤٠٠٠) مەترە بەرزە •

لای ژوروی چیاکان لــە دامێنی خــەتی بــەفرە هــەمیشەییەکانەوە ، شوێنێکی زۆر کوێستانی‌یە ، وە لە خوار ئەو شوێنە کوێستانیەوە لــە بەری ڕۆژئاوای زاگروس دارستانی بەڕوو گوێزو بادامو ••• یان بێشەی دارستانی گەورە و دەوەنی وا هەیە کە ڕۆیشتن بە ناویانا زۆر زەحمەتە ، ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی پڕ لە دارو دەوەنە ، لە دەراوەکانا لــە هەر شوێنێکدا کە ئاو بۆ ئاوداشتن هەبێت ئاوو هەوای ئەو ناوچەیە بۆ پەروەردە کردنی باخو باخاتو درەختی هەنارو هەنجیر زۆر بەکەڵکە •

بەم جۆرە لە ڕۆژگاری کۆندا بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ئەم ناوچانە بیابان نشینو نیوەکۆچەری ڕۆژگاریان بردۆتە سەر •

کۆچەرەکانی کوردستانی ئیستا لەزستانا ئەچون بۆ ناوچە گەرمەکانو نیوە بیابان نشینەکانیش هاوینان ئەچۆن بۆ شوێنە کوێستانیەکان •

لە ڕۆژگاری کۆندا ناوچەی ورمێ گرنگترین ناوچەی کشتوکاڵی بوە، ئاوی دەریاچــەی ورمێ سوێرەو گیــانداری تیــا ناژی وبــەکاری ئاودێریش نایەت •• کەنارەکانی ئەو دەریاچەیە دیسان بێ دەرامەتن ، شۆرەکاتی زۆر کە لە ناوچەی ئازربایجاندا هەیە بەجۆرێک ئاوەکانی سوێرو تاڵ کردوە کە سودی کشتوکاڵیان لێ نابینرێ ، مەگەر لــە مانگــەکانی بــەهارا [هەروەکو روباری ئاجی چای] کە لافاوو ئاوی بەفری کوێستانەکانو باراناوەکان ئەگەنە ئەم ناوچانە مەگەر ئــەوانە سودی کشتوکاڵیان تیا بێت • ئاوو هــەوای ئەم شوێنە وشکە ، لەو شوێنەی کە ئاوی تیابێ زەویەکەی زۆر بەپیتو بەرەکەتە، لەسەردەمی ڕۆژگاری کۆندا بەرو بومی گەنمو جۆو ترێو هەندێک میوەو دانەوێڵەی تری یەجگار زۆر بوە ، دیسان لە ڕۆژگاری کۆندا لــەو ناوچانە ـ هەروەکو ڕۆژگاری ئیستا ـ داری سپیدارو چناریان ئەناشتو پەروەردەیان ئەکردن •• بــەلام بــەشــەکانی تری وشــکو بایــەر بون • هــەرچــەند بەلای خواروی ڕۆژهەلاتدا نزیکتر بیتەوە وشك ترە •

له رۆژگاری زۆر کۆندا ، وه دەوری بەردی تازه [ نیولیت ] له هەر جێگایەك سودیان له ئاوی کوێستانەکان وەربگرتایە کشتوکاڵیان تیا ئەکرد ،وه کشتوکاڵەکانیان بـه ئاوی کوێستانەکان ئاو ئـەداو ئـەیان هێنانه بـەرهـەم [ئاودێری بـه هۆی جۆگەوه] •• دوای ئـەوه بـەرەبـەره جۆری ئاودێری پێشکەوت [ئاودێری به هۆی کارێزەکانی ژێر زەویەوه] •• بـەلام دەزگای ئاودێری گەوره گەوره ـ وەکو ئەوانەی که له بابل‌و میسر دروست کرابون پێویست نەبو ، ئەم باسه له چوارچێوەی دامەزراندنی بەندایەتی‌و [دوای ئەوان فیودالی] کارێکی زۆری کرده سەر مێژوو دوارۆژی چارەنووسی ماد •

**بەشی‌دووەم ماد :**

ئەتوانین بلێین مـادی بچوك ـ سەرزەمینێکی پڕ لـه گردو تـەپۆلکـه بوو ، کەوتبوه نێوان دو ریزه چیـاوه ، لـەلای ژوروەوه لکابو بـه چیـای ئەلبورزەوه که له خوارەوه بۆسەر دەریای خەزەر درێژ بۆتەوه [بەرزترین چیای ئەو ناوچەیه کێوی دەماوەنده •• وه له خوارەوه ریزه کێوی رود ـ که به درێژایی زنجیره چیاکانی زاگروس واتا لەژوروی رۆژئاواوه تاکو خواروی رۆژهەلات درێژ بۆتەوه ـ ئەمانه سنوری مادی بچوکیان دیاری ئەکرد • له خواروی رۆژهەلاتی ئەم ناوچەیەوه دەشته پانه شۆرەکاتەکان هەیه •

لەم ناوچەیه ئەو روبارانه کـه ئەرژێنه دەریاچەی حـەوزی سـوڵتان‌و دەریای خوێ (نمەك) وه ئەو جۆگانەی ـ که له چیاکانی ئەلبورزەوه بەرەو حوارو ، وه دواجار بەلای رۆژهەلاتا لار ئەبنەوه ـ زەوی‌و زارەکانی ئـەم ناوچەیه ئاودێری ئەکەن •

چیای گەورەو پڕ له بەفری دەماوەند بەسەر ئەم ناوچەیەدا ئەڕوانێت ، مادی بچوك که به هۆی دیواری چیای ئەلبورز له دامێنی پڕ ئاوو دارستانی کەناری دەریای خەزەر جیا بۆتەوه ، وه ئـەو کێوەی ئەوی له [خلیج] جیا کردۆتەوه ناوچەیەکی دەشتی کاکی بـه کاکی خۆڵـەمێش رەنگ‌و زەردو

وشك‌و ناسازه که له زستانا ئه‌بێته سه‌هۆڵ به‌ندان‌و به‌هاوینیشا گڕه‌ی لێ هه‌ڵئه‌سێ •• وه له لای رۆژهه‌ڵاتیه‌وه به‌ره به‌ره ده‌شتێکی شێوه شۆره‌کاته ، به‌ڵام له دامێنی کێوه‌کانه‌وه که‌مێك ته‌ڕایی هه‌یه‌و بارانی لێ ئه‌بارێ وه له ئه‌نجامدا چه‌ند شوێنێکی بۆ کشتوکاڵ چاك کراوه •

**به‌شی سێیه‌م پارتاکنا :**

[پارتاکنا] ناوچه‌یه‌کی کۆنه‌و که‌وتۆته نێوان دو ریزه چیای به‌رامبه‌ر به یه‌ك له سه‌ره‌وه کێوی رود ، له خواره‌وه ریزه چیایه‌ك که لکاون به زنجیره چیاکانی زاگروسه‌وه ، ئه‌م ناوچه‌یه پێك دێنن • پارتاکنا به هۆی روباری رودك ئاو ئه‌خۆنه‌وه •

سروشتی [پارتاکنا] وه‌کو سروشتی مادی بچوك وابو ، هه‌روه‌ها له وانیش هه‌ژار تر بون ، مادی کۆن له‌لای ژوروی رۆژئاواوه له‌گه‌ل ئورارتو [وه دوایی له‌گه‌ل ئه‌رمه‌نستان] وه له‌لای ژوروه‌وه له‌گه‌ل ئالبانی هاو سنور بون • وه به درێژایی که‌ناری ده‌ریای خه‌زه‌ر ناوچه‌یه‌کی شێ دارو ئه‌رمه‌سێری له‌و دیو ئه‌لبورزه‌وه هه‌بو ، که بریتی بوله ناوچه دارستانه‌کانی ئاسپی‌و کادوسی‌و گل‌و ورده هۆزه‌کانی تر که ئیستا پێیان ئه‌ڵێن تالش‌و گه‌یلان‌و ••••• له‌لای سه‌ره‌وه خاکی مادیان دیاری ئه‌کرد ، وه له رۆژهه‌ڵاته‌وه ناوچه‌ی کوێستان ریزه‌چیای کوپت‌داخ - یان سه‌رزه‌مێنی کۆنی پارت - خاکی مادی له ئاسیای ناوه‌ڕاست جیا ئه‌کرده‌وه ، به‌شی که‌ناره‌کانی ئه‌و ده‌ریاو ده‌راوه‌کانی روباری گورگان‌و ئه‌ترك هیرکانیایان پی ئه‌وتن • به‌ختیك له‌وه به‌ره‌وخوار تر له خاکی پارت ، سنوری رۆژهه‌ڵاتی مادو ئه‌و ده‌شته پانانه بون که کشتوکاڵیان تیا به‌رهه‌م نه‌ئه‌هات •

کیشوه‌ری کوێستانی [پرسید]ی کۆن له لای خواره‌وه له‌گه‌ل پارتاکنا هاوسنور بو ، وه له خواروی رۆژهه‌ڵاته‌وه لکابو به ده‌راوه‌کانی روباری کارون‌و کرخه که له نێوان دامێنه کانی چیاکانی زاگروس دایه • ناوچه‌ی

ناوبراو هەمان عیلامی کۆن یان سوزیان (شوش)ە کە بنکەیەکی شارستانێتی کۆن بوە لەلای رۆژئاواوە خاکی ماد لەگەل ئاشورەکانا هاو سنور بوە •

خاکی ماد گەلێك کانی (مەعدەن) تیایە ، بەلام زۆر زەحمەتە ئەوە دیاری بکەین کە لە رۆژگاری کۆنا کام کان (مەعدەن) یان دەرهێناوە •• هەرچۆن بێت ئەوە سەلمێندراوە کە لە رۆژگاری زۆر کۆندا لە چیاکانی زاگروس‌و ناوچەکانی رۆژهەلاتی مس وە لە رۆژگارەکانی دوای ئەوەش دا مەعدەنی تریان دەرهێناوە •

لە دامێنەکانی رۆژئاوای زاگروس‌و ناوچەکانی تری سەرزەمینی ماد ،لە رۆژگاری کۆندا ئاگاداری یان لە بارەی نەوتەوە هەبوە[(١٨٤)] وە لە زەمانی کۆندا تەنانەت لە ئەوروپادا بە نەوتیان وتوە [رۆنی ماد] • بەلام ئاشکرایە کە لە رۆژگاری کۆندا نەوت ئەهمیەتێکی پیشەسازی ئەوتۆی نەبووە بەلکو تەنیا بۆ سوتاندن بەکاریان هێناوە ، هەروەها بۆ ئیش‌و کاری ساختومان‌و بیناسازی سودیان لە قیر [ئاسفالت] وەرگرتوە •

ئەو رێگایانەی کە شارستانێتی ئاسیای کۆن‌و قەفقازی بە ئاسیای ناوەراست‌و هیندستانە وە ئەبەست بە خاکی ماددا تێ ئەپەرین •

بە تایبەتی زێرو بەردی لاجوەردی باکتریا لە ئاسیای ناوەراست لە رێگای مادەوە ئەگەیشتە ئاسیای کۆن •• ئاشۆریەکان کێوی دەماوەندیان بە کانی بەردی لاجوەرد دائەنا ، ئەم مادەیە لە سەرانسەری رۆژهەلاتی کۆندا بەکار ئەهێنراو زۆر نرخدار بووە ، بەلام بیروڕای ئاشوریەکان هەلە بوو ، بەردی لاجوەردی کە لە رۆژهەلاتی کۆندا بەناوبانگ بوو لە [بەدەخشان]ەوە ئەهات ، واتا لە باکتریای کۆن ، بەلام ئەویش هەر لە رێگای مادەوە ئەگەیشت •

ماد بەمانا ــ بەو شێوەو سنورە بوە کە لە سەردەمی پادشایانی زنجیرەی هەخامەنشیەکان‌و سەردەمی ئەسکەندەری مەقدونی بوە ، وە بەو جۆرە بەر

بیروڕای جوگرافیایی یۆنانیەکانو رۆمانی کۆن کەوتووە • بەڵام وشەی [ماد] بەدرێژی میژوی خۆی جاروبار بەمانا فراوانترو هەندێ جاریش کەمتر بووە ، وە هەندێ جار زیاتر لە زەویو خاکی ناوبراو زۆر تر وە هەندێ جاریش لەوە کەمتر بوە ، لە ئەنجامدا ناوچەی میژویی ماد کراوە بە دوو بەشەوە : بەشی ژوروی رۆژئاوای کە پێیان ئەووت [ ئاتروپاتین ] وە رێگایەکی درێژی بە سەربەخۆیی تەواو بڕی ، رێگایەک کە لەگەڵ میژوی تەواوی ئالبانی [کە لەبارەی نژادو فەرهەنگەوە لە ئاتروپاتین نزیک بوو]وە کەوتبوە ئەوبەری ئاراسەوە • نوسراوە جوگرافیاییەکان لە رۆژگارە جۆربەجۆرەکانا شتێکی ئەوتۆ نادەن بەدەستەوە ،وە نوسراوە جوگرافیاییەکانی سەردەمی کۆنو سەدەکانی ناوەڕاست ناتوانن بە تەواوی مەسەلە جوگرافیاییەکانی رۆژگاری پێشتر رون بکەنەوە •

گیروگرفتی رێکخستنی جوگرافیای میژوی ماد [میژوی سەردەمی زۆر کۆنی] دو جۆرە : لەلایەکەوە شوێنو ناوچەو شار کە لەسەرچاوە باسکراوەکانا هەیە [زورتر لەبارەی لەشکرکەشی پادشایانی ئاشورەوە] لەبارەی شوێنو جێگاو ناوچەو شوێنە نیشتەجێکان کە لە کەناری ئەو ناوچە یان شارەوەیە پێشتر ناسراوە ، دیاری ئەکات • شوێنی ناوچەکانی ئەوپەڕی رۆژئاوا کە لەسنورەکانی ئاشورو بابلدا بون - بەپێی ئەو بەڵگانەوە کە لە شارەکانا هەڵکەندراوەو دەست کەوتوە - وردتر جێگامان دیاری ئەکات • بەڵام هەرچەند روو بە رۆژهەڵات زۆرتر بڕوێن لەوە ئەچێ هەڵە لە دیاریکردنی شوێنەکانا زۆرتر بێت ، چونکە دیاریکردنی ناوبراو بەندە بەراستی دیاریکردنی پێشوو ترەوە وە لە ئەنجامدا بەم جۆرە هەڵە لەسەر هەڵە کۆ ئەبێتەوە • بەم جۆرە وە بە تەنیا لە ناوچەی رۆژئاوای ماد شوێنو جێگای نوسراوە جوگرافیاییەکان کە لە ٤٨ پلەی درێژی رۆژهەڵاتی ئەولاتر نابێت ئەتوانین بەراستی بزانین •

له لایەکی ترەوە گەلێك له لێکۆڵەرەوان هـەوڵیان داوە لـە شکرکەشی پادشایانی ئاشور لەگەل نەخشەکەدا بگونجێنن بەڵام بەپێی ئەو بەڵگانەی کە باسەکانیان لێوە وەرگرتوە بۆیان نەگونجاوە • بەڵام چونکه لـە سەرچاوەی ناوبراوا [تەنیا بەرێکەوت] ناوی روبارەکان دیاری کراوە سەری گرتوە بەڵام دیاریکردنی کێوەکان تا ئیستا گیروگرفتی هەر تیایە • ئەم ئوسلوبە نابێ پشتی پێ ببەستین بە تایبەتی کە ناوە جوگرافیاییەکانی ماد هەموی گۆڕاوە ،وە تەنیا له چەند شوێنێکدا کە ئەویش بەرێکەوت لـەوە ئـەچی لـەروی نـەخشەی نیستاوە ئەو سەرزەمینە فلان ناو بـە هۆی بیروڕاو باسەکانەوە لەگەل ناوێکی گۆڕاوی کۆندا لـەیـەك بچن‌و بـە یـەکیان بزانین • لێکۆڵەرەوەکان وەکو پێویستە تا ئیستا ئـەم خاڵەیان بـە وردی نـەداوەتە بـەر سـەرنج‌و شی‌یان نەـکردۆتەوە ،کە له ناوچە کوێستانیەکانا گواستنەوەو کۆچکردنی هۆزەکان‌و سەقامگیری دەوڵەتـەکان زوربـەیان بـەپێی شێوەی سـروشتی بـەشکردنی کیوەکان‌و دەراوەکان بووە ، وە بەم هۆیەوە نوسراوەی ئاشوریەکان ، ناوچە [کیشوەر]ەکان ئەبێ بە شێوەی گشتی لەگەل دەراوەکانا بەرامبەر کات •وە فلان یان هەمان ناوی میژوویی‌و جوگرافیایی ناتوانرێ [ناوچەیەك]یان پارچەیەك زەوی پێناو بنرێ ، ئـەگـەرچی میژو نووسێکی باوەڕ پێکراوی راستگۆی وەکو [ماسپرو] داینابێ •

بەم هۆیەوە جوگرافیای میژوویی مـاد پـەیوەستەیـە بـەباسی کێوەکانی ئەو سەرزەمینەوە[١٨٥] • له کاتێکدا بـەم جۆرە ئەهمیەت‌و مانای ئابوری‌و هاتنی سوپاو سیاسەت‌و روداوی میژوویی هەر کیشوەرێکی کۆن بەبێ زانینی شوێن‌و جێگای لـەشکرکەشی زۆر ستەمە • ئێمـە ئـەبێ لـە بارەی چۆنێتی کێوەکانی خاکی مادەوە رونتر قسەبکەین • ئەو شوێن‌و ناوچە کۆنانەی کـە ساڵنامەکانی ئاشوری باسیان ئەکەن‌و دیاریکردوە ئەبێ نیسبەت‌و چۆنێتیان لەگەل دابەشکردنی سروشتی کیشوەرەکەدا باس بکـەین •وە زۆرتر لـەزاراوەی

جوگرافیای سیاسی له سەدەکانی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی کە لە هەمو ئاڵۆزاوتر بووە • وە لە هەمو زیاتر پێویستە باس بکرێ ئەبێ لێوەی بدوێین • بەم رێگایە بـە پێویستی ئـەزانین ناوچە سروشتی‌یەکانی خاکی مـــاد کـە ناوەکانیان لە ماوەی سەدەکانا گۆڕاوە ژمارەیەکی چەسپاویان بۆدابنێین ، لـە لاپەڕەکانی دوایی ئەم کتێبەدا ،وە بۆ دیاریکردنو دانانی شوێنی نوسراوەکانی جوگرافیای سیاسی‌و نژادو ئەو زاراوانەی کە هەمیشە گۆڕاوون لەو ژمارانە سود وەر بگرین •

سەرزەمینی مێژویی ماد بە پێی ئەو خەتانەی ئاوی دەراوەکان دابەشی کردوون ئەکرێن بە چەند ناوچەیەکی جوگرافیای رەسەنەوە •

## × مادی ئاتروپاتین

### ١ ــ لە روباری ئاراسەوە تا کێوەکانی ئاورین داخو قەرەداخ :

ناوچەی شارەکانی ئێستا قتورو خوی‌و مرند ، ئەم ناوچەیە ئاشوریەکان پێیان ئەوت [سان‌گی بوتو] وە لە سەدەی نۆیەم تا کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی هەمووی بەشێك بوە لە [ئورارتو] وە سەرەنجامی ئەو ، لەدوای ئەو مێژووەوە تا سەردەمی لەناوچونی ئاشورو [ئورارتو] رون نیە •

ناوچەی[ سان‌گی بوتو] ناوچەیـەکی کشتوکاڵی‌و پڕ پیتو بـەرەکەت بو ، ئەو کێوانەی کە ئەو ناوچەیەیان لە دەراوی ئاراس جیا ئەکردەوە ، وە ئەو ریزە چیا هاوشانەی کە بە درێژی [لوتکەی قتور] ناوچەی ناوبراو لـە [فلات]ی ئەرمەنستان جیا ئەکاتەوە لە سەردەمی کۆندا هەمووی بە دارستانی زەبەند داپۆشرابون •

### ٢ ــ دەراوی روباری قەرەسو [بەشی خواروی ئاراس] :

سەرچاوە کۆنەکان لەبارەی ئـەم ناوچـەیەوە هیچ زانیاریەکی ئـەوتۆ

بەدەستەوە نادەن  لە دواییدا [کادوسیەکان] لەوێدا نیشتەجێ بون •

**٣ـ ناوچەی دەریاچەی ورمێو ئەو روبارانەی ئەرژێنە ناو ئەو دەریاچەیەوە•**

ئەم ناوچەیە ئەکرێ بە سێ بەشەوە :

أ ـ کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ ـ واتا «گیلزان»ی کۆن (؟) لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینیدا ـ ئەمە ناوچەیەکی سەربەخۆ بوە ، وە لەوە ئەچێ لە دواییدا بووبێت بە بەشێك لە ناوچەی [ئورارتو] یان [مانا] وە یان لەنێوان هەردو لادا بەش کراوە •

ب ـ کەناری خواروی دەریاچەی ورمێو دەوروبەری چەمی [جەخەتو] وە ئەو روبارانەی کە شان بەشانی ئەو ئەڕۆن • ئەم ناوچەیە لە سەدەی نۆیەم ناوی [زاموا]ی ناو خۆ بووە ، وە کرابو بە چەند بەشێکی ناوچەیی سیاسیەوە وەکو [حارانا ، مانا ، مسی ، وەهینی تر] • لە دواییدا لەم ناوچەیە دەوڵەتی [مانا] دامەزرا ، وە لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی بە دواوە ئەتوانین بە مەرکەزی ئابوری مادی دابنێین • بەم مانایە کە لە سەرەتاوە بنکەیەکی سەرەکی ئابوری سەرانسەری کیشوەری ماد بووەو دوایی بوە بە هینی مادی ئاتروپاتین •

ج ـ کەناری رۆژهەڵاتی دەریاچەی ورمێ ، سەر بە [مانا]بووە ،وە کە ناری ژوروی ـ واتا دەراوی روباری (ئاجی چای)و ناوچەی تەورێزی ئیستا ـ ئەمە سەر بەخۆ بووە ، وە لەم شوێنەدا هۆزی [ دالیان ] ئەژیان •

ناوچەی ٣و سێ ناوچەی بچوك [لقی] یەکەی لەروی ئابوریەوە لە ناوچەکانی تر باشتر بوون ، تەنانەت ئیستا لەوانەیە لە زوربەی ئەو شوێنانە کشتوکاڵو باخداری پێشکەوتوتر بێت • وە لە [گیلزان] کانی مسی تیا دەر ئەهێنرا •

**٤ ـ دەراوی روباری قزل ئوزون [روباری سپی]و پارچەکانی :**

روباری قزل ئوزون بـە شێوەیـەکی مـار پێچی بووە ، لـە دەراوی ناوبراوا چەند ناوچەیەکی تایبەتی بووە •

أ ـ ئەگەر لە [مرداب] هەروەکو لە نزیك شاری ئیستای [رەشت]ەوە کـە ئاوەرێژگەی روبارەکەیە(١) پێچەوانـەی رۆیشتنی ئاوەکـە برۆین لـە سەرەتاوە راستەوخۆ رووەو خوارو ئەروێن ، روباری ناوبراو بـە ناوچـەی [گەیلان]دا تێ ئەپەڕێو لـە رێگادا دەروازەیەکی تەنگی کێوە بەرزەکـەی ئەلبورز ئەبڕێ • ئەویا ناوچـە دارستانیە گەرمەکەیە • قزل ئوزون بـەرەو زورتر لەم ناوچەیە لە ژوروی رۆژئاواوە بۆ لای خواروی رۆژهەلات بـەناو چیـاکانی [ئاقداق] «لەپاڵ ئەلبورزدا» وە [ئاق گدوك] ئـەڕوات ، وە ئـەو دەراوەی کـە ئـەم ناوچەیـە یێکی دێنێت لـە رۆژگاری کۆندا پێیـان وتوە [ ئاندیا ] •

ب ـ لە بەشی ژوروی رۆژهەلاتی ئەم دەراوەوە چەمێك کە لە کوێستانی [سەهەند] سەرەوژێر ئەبێتەوە ، وە شاری [میانەی] ئیستا لە قەراخیا دروست بووە ، ئەو چەمە ئەڕژێتە ناو ئاوی قزل ئوزون • دەراوی ئەم چەمەو ئـەو جۆگانەی ئـەڕژێنە ناویـەوە لەسـەردەمی کـۆنا پێی ئـەوترا ناوچـەی [ زیکرتو ] •

ج ـ قزل ئوزون ، لە ژور ئەو شوێنەوە کە بە چەمی ناوبراو ئەگەن لە خوارەوە بۆ سـەرەوە ئەروات • بەشی سـەروی ئەو ناوچەیە ـ قافلانکو ـ [ گیزیل بوندای کۆن ] لەناوچـەی ژمارەی (٣) [ مانا ] جیا ئەکاتەوە ،

---

**(١) لەوە ئەچی لـە سـەردەمی روژگاری کۆندا ئاوریژگـەی روباری سپی لەنزیك (رشت)ە وەبوبێت بـەلام ئیستا روباری سپی لـەنزیك حسن کیادەوەیە ـ کە زور لە رەشتەوە دورە • لەویدا ئەرژێتە ناوە دەریاوە •**
**وەرگێر**

ئاشوریەکان زوربەیان ئەم بەشەیان بە قزل ئوزونی ماد [مادای] ناو ئەبرد •

د ـ لێرەدا بەشی لای راستی [ قزل ئوزون ] ـ روباری زنجان ـ دەراوێکی جیا دروست ئەکات ، [کە ئیستا کەوتۆتە دەوروبەری شاری زنجان وە پێی ئەڵێن خەمسە ] •

**٥ ـ بەشی سەرەوەی روباری زێی بچوك •**

ئەو سەرزەمینانەی کەوتونە خواروی رۆژئاوای ناوچەکانی ژمارە [٣و٤] ئەو بەری ریزە چیا درێژ کشاوەکان زۆرتر بەلای ئاشورو بابلدا ئارەزۆگەیان هەبو •

**٦ ـ هەروەها چەند ناوچەیەکی تر هەیە لێرەدا باس نەکراو**

دو ناوچەی ٥و٦ ، [زاموا] و «پارسوا» زور گرنگو ئەهمیەتدار بون چونکە دەراوەکان زێی بچوکو دیالە لە کێوەکانی زاگروسەوە چەند زنجیرە شاخێکیان ئەبری و بە ناوچەکانا ئەڕۆیشتن • ئەو کێوانەی کە لەو ناوچەدا بون راگوزەریان بەلای رۆژهەلاتدا بو ، لەبەری رۆژئاواوە رێگای گەیشتن بە خاکی ماد [کە ئیستا رێگاکانی کاروانی روی بانە ،سنە ،هەمەدان، سلێمانی ، زەهاو ، کرماشان]ە بە وێدا ئەڕۆیشتن • بەتایبەتی روباری دیالە هاوشانی رێگای پەیوەندی بابلو ناوچە دورەدەستەکانو ناوخۆی ئیرانو ئەو کیشوەرانەبوو کە کەوتبوونە بەری رۆژهەلاتیەوە • ئەم رێگایە بە [دەروازەی ماد]دا [کە ئیستا کێوێکە لە دەراوی ماهیدەشت کۆتایی دێ(*) تێ ئەپەڕی و ئەچوو بۆ ئەکباتانی کۆن [هەمەدانی ئیستا] •

**٧ ـ بەشی ناوەڕاستی ناوچەکانی روباری دیالە :**

[لە نزیك شاری خانەقینی ئیستاوە] ئەم بەشە بە ولاتی [نەمر] ناو

---

**(*) مەبەست گەردنەی [پاتاق]ە ـ وەرگیر**



**نەخشەی ناوچە ژمارەدارەکانی**
**« ماد »**




**شوێنی نیشتەجێی کۆمەڵە نژادەکانی سەرزەمینی ماد**
**لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دا**

ئەبراو ـ لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زاینی بە تەواوی لەژێر دەسەڵاتی سیاسی بابل دا بووە ـ لە خواروی دەراوی دیالەو بەشەکانی تری ئەو وڵاتەوە [بیت همبان] [کامبادن ، جوگرافیایە کۆنەکان • ناوچەی ژمارە هەشت کە لە دواییدا باسی لێوە ئەکەین و بە بەشێکی کامبادن یان دائەنا] هەبو •

**٨ ـ دەراوەکانی بەشی سەروی روباری کرخە :**

**ئەم ناوچەیە** کە لە رۆژهەڵاتەوە خەتی **ئاوبڕی دیالەو** کرخە ئەگرێتەوە ، وە لە بەشی سەروی ناوچەی کرخە ـ دەراوەکانی گاماسیاب و سیمرەو ماهیدەشت ـ لەروی جوگرافیەوە ئەدرا بە عیلام بەڵام بەپێی بیروڕاو سەرنجی میژویی سەر بە وڵاتی ماد بووە • چەند رێگایەکی بازرگانی گرنگ بەرەو رۆژ هەڵات و ئەکباتان [هەمەدان] بەم ناوچەیەدا ئەڕۆیشتن •

لەم دەراوەدا تا ڕادەیەك ئاو هەبو ، زەوی و زارەکانیشیان بەرهەمدار بون ، بەشی سەروی کرخە هەمان کیشوەری [ئیلی‌پی] کۆنە کە لە دواییدا ناونرا [ئیلی مائیدا] • لەم ناوچەیە لە نزیك شاری کرماشانی ئیستاوە بەردە پەناوبانگەکەی بێستون و نوسراوەی گرنگی سێ زمانی [**داریوشی یەکەم**] هەیە •

لە خواروی [بیت همبان]و دامێنی [ئیلی پێ]لە کێوەکانی لوڕستانی ئیستادا ، کوێستانیەکان [کاسیت] ـ کە لەوە ئەچێ لەگەل دانیشتوانی عیلامدا تێکەڵیان هەبووبێ ـ لەویدا ژیاون •

## × مادی بچوك [ خوارو ]

**٩ ـ ناوچەی هەمەدان :**

کەوتۆتە ئەو شوێنەوە کە مادی ئاتروپاتین و مادی بچوك بەیەك ئەگەن ، ئەم ناوچەیە [**٣٢٧٠** مەتر] لە دامێنی کێوی ئەلوەندەوەیە ، ئاوی ئەو

بەفراوانە ئەخۆنەوە کە لە چیای ئەڵوەندەوە دێت • زوربەی ئەو جۆگاو نیوو لافاوانەی بەشی سەروی روباری [قەرەسو] ـ کە بە حەوزەی دەریاچەی حەوزی سوڵتان ـ واتا ناوچەی [١٠] ئەگرێتەوە ، پێك ئەهێنێ • بەڵام زنجیرەی چیای [کوەرود] کە کەوتۆتە سنوری مادی بچوك نەختێك بەلای خواروی رۆژهەڵاتیەوە دەس پێ ئەکات •• بەم هۆیەوە ئەتوانین ئەم ناوچەیە بە هێڵی ناوبەینی نێوان مادی ئاتروپاتین‌و مادی بچوك دابنێین •وە رێگاوبانی کاروان ئەم ناوچەیە بە مادی ئاتروپاتینەوە ئەبەستێ•شەقامە رێگای ئەم ناوچەیە بەرەو رۆژئاوا ــ بو کرماشان [ئیلی پی] ودواجار [بابل]و لەلای رۆژهەلاتیشەوە ـ ناوچەی نزیك تاران [رەی کۆن] وە خوارو ـ واتا عیلامو [پارتاکنا] درێژ بۆتەوە •

لەبەر ئەوە مەرکەزی ئەم‌ناوچەیە ـ شاری هەمەدانی ئیستاو ئەکباتانی کۆنی یۆنانیەکان ـ کە بە زمانی ماد [هەنگ متنا] واتا [جێگای کۆبونەوە] ئەگرێتەوە رێکەوت نیە ، وە ئەویا پایتەختی ماد بوە •

**١٠ ـ حەوزەی دەریاچەی (حەوزی سولتان) و (دەریای خوێ) و روباری (ئەبهرچای) و (قەرەسو) و (روباری قوم ـ قم) •**

ئەم ناوچەیە لە ناوەڕاستی مادی بچوك بوە ، سێ چەم لە لای دەریاچەکانی [حەوزی سوڵتان]و [دەریای خوێ] وە ئەڕۆن • لە ژوروی رۆژئاوا [ئەبهرچای ـ لە دەراوێکدا کە شاری قەزوین لە وێدایە] ـ وە لە رۆژئاواوە [قەرەسو کە لە هەمە دانەوە ئەڕوات] وە لە خواروی رۆژئاوادا [روباری قم ـ کە ئیستا شاری قم لە قەراخیایەتی] ، ئاشوریەکان ئەم ناوچەیانە بە [مەڵبەندی چۆمەکان] ناو بردوە لەم ناوچەیەدا باشترین شوێن بو دانیشتن‌و کشتوکاڵ دامێنەکانی چیای ئەلبورزە ، کە لە لای سەرەوە بەم ناوچەیەوە لکاوە ، وە [ کوەرود ] لەلای خوارەوە تا ڕادەیەك لە نزیك دەریاچەکانەوەیە • ئیستا شاری تاران کەوتۆتە دامینەکانی خواروی چیای

ئەلبورزەوە ، وە لە سەردەمی کۆندا [رەی]یان [رەگ] کە یەکێك لە شارە گرنگەکانی ماد بووە لەو نزیکەوە دروست کراوە ، ئیستە لە دامێنەکانی ژوروی [کوەرود] شاری کاشان هەیە •

لە رۆژهەلاتی [رەی] لە نزیك قەلای بەفرینی دەماوەندا نوتکەیەك هەیە لە سەر رێگای مازەندەران [سەرزەمینی کۆنی کاسپیانو گلانو ئامردان] ـ کە پێیان ئەووت [دەروازەی کاسپیان] •

**١١ ـ ناوچەی ژوروی دەشتی کویر :**

ئەم ناوچەیەش دیسان لە دامێنەکانی خواروی ئەلبورزەوەیە ، بەلام لە [دەروازەی کاسپیان] بەرەو رۆژهەلاتی ترە • وە لە لای خوارەوە بە بیابانی شورەکاتەوە لکاوە • لە رۆژگاری کۆندا ئەم ناوچەیە پێیان ئەوت [خوار]یان [حورنا] • رێگای کاروان روبە ئاسیای ناوەراست لەم ناوچەیە وە [ ئیستا لە لە شارەکانی سمنانو داموغان ]ەوە گوزەر ئەکاتو ئەروات •بەشی رۆژهەلاتی [خورنا] بە فلاتی [خوراسان] ـ واتا بەشی خواروی پارتی کۆن ـەوە لکاوە •

## پارتاکنا

دەراوێکی پانو وشکەو کەوتۆتە خواروی ناوچەی ژمارە (١١) ، لە ژوروی رۆژئاواوە بۆ لاخواروی رۆژهەلات درێژ بۆتەوە ، کە لەلای ژوروی رۆژئاواوە لکاوە بە ناوچەی ژمارە (١١) [ئەکباتان]ەوە ، وە لە لای خواروی رۆژئاوا کێوەکان لە عیلامی جیا ئەکەنەوە ، وە لە خوارووی رۆژهەلات بە هۆی ئەو دەشتە بیابانەوە کە هەیە لە دەشتەکانی پارس [پرسید] جیا ئەکرێتەوە •

لە بەشی ژوروی رۆژئاواوە چەمێك هەیەو شاری ئەسفەهان [ئەسپدانـی کۆن] لە کەناری ئەو چەمەدایە ، ئـەم چەمە ئەرژێتە دەریاچەی سوێرەوە • بەرانبەر ئەوو هەندێك ـەلای رۆژهەلات تردا وئـەوبەری ریزە چیالانی

[کوهەرود] دەراوێکی تر هەیە [کە ئیستا پێی ئەڵێن ناوچەی یەزد] ئەم ناوچەیە لە سەردەمی کۆنا زوربەی جار هەر بە بەشێك لە ولاتی پارس ناسراوە •

چەند ناوچەیەکی تر هەیە لێرەدا باس نەکراوە دیسان چەند ولاتێکی تر لە دەرەوەی سنوری تایبەتی ماد ــ لەگەل ئەو دەولەتەدا پەیوەندیو تێکەڵیان هەبوە • هەروەکو ئەوە بو سەرزەمینەکانی کەنارەکانی کاسپی کە تەنیا لەرێگای ماد یان ئەلبانیەوە لکابون بە دنیای دەرەوە • لەناو دارستانەکانی ناوچە گەرمەسێریەکانی ئەم ناوچەیەدا چەند هۆزێك ئەژیان کە زوربەی رۆژگار خەریکی راو کردن بون ، وە لە مادەکانو ئالبانییەکان بە جێماو ترو دواکەوتو تر بون • لەو سەردەمەداو [لەدواتریشدا] پاشماوەی ئەو زمانانەی کە لەناو خاکی مادو ئالبانی دا لەناو چوبون پاشماوەکانیان مابۆوە ، ئەم روداوە بوو بە هۆی پەیدابونی جیاوازی نژاد لە نێوان دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە لەدوایدا باس کران وە نێوان خەڵکەکانی کەناری کاسپی [خەزەر] • هێشتا لەم رۆژگارەدا تاتو تالشو گیلکو مازەندەرانیەکان بە جۆرە شێوەیەکی زمان قسەیان ئەکرد کە لە پاشماوەی زمانی هیندو ئەوروپاییەکان ئەچو کە لەسەرەتای زمانی مادی رۆژهەلاتا بوە(١٨٧) • ئەم زمانانە لەگەل زمانی پارسیدا زۆر جیاوازی یان هەیە(١٨٨) وە لەگەل زمانی مادو پارتو ئاویستا لەیەك ئەچن(١٨٩) • بەم هۆیەوە ئەگەر تاتو تالشەکان بە ئالبانی وەیان ئەو مادانە بزانین کە بە زۆر بونەتە پارس ، ئەوە بە تەواوی بە هەڵەدا چوین(١٩٠) • لەبەر ئەوە کە لەو شێوە زمانانەی باسمان کردن لەبارەی سەرهەڵدانی زەخیرەی زمانەوانیەوە زوربەی زمانی فارسی ئەگرێتەوە [وە ئەمە خۆی بە گرتنەبەرچاوی دەسەلاتی سیاسیو ئەدەبی زمانی فارسی پەی پێ ئەبرێ] ، بەلام بەتەواوی بناغەو مایەی مادی خۆیان پاراستوە •

بەلام زمانی مادی هیندو ئەوروپا لە ناوچەی کاسپی [خەزەر] دیاردەیەکی

دوەمە • لە رۆژگارو سەردەمی سەڵتەنەتی مادەکانا [کاسپی] یەکانو ئەو هۆزانەی تر کە لە کەناری دەریای کاسپی [ حەزەر ] دا ئەنیشتن ئەو شێوە زمانە کۆنانەی تری هینـدو ئەوروپایی خۆیان - کە لـە مادی رۆژئاواشدا بەکار ئەهێنران - بەکاریان ئەهێنا •

ئەبێ سەرزەمینی ئالبانی کە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی دا لە بارەی رەوی لەشکرکەشیو گواستنەوەو هاتوچۆی هۆزەکانەوە بەرکەنار بوە ، ئەو سەرچانەی کە لـە رۆژگاری بەتایبەتی پێش ماد بوە ماوەیەکی درێژتر پارێزرا • بەداخەوە کە سـەرچاوە کۆنە شوناسەکانو نوسراوە کۆنەکان ماوەی ئەوەمان نادەن کە لەبارەی بوارە تایبەتیەکانی مادو ئالبانی یەوە وردتر لێکیان بدەینەوەو باسیان لێوە بکەین(١٩١) •

ئاشکرایە ماد لەگەل ناوچە خوارووەکانی ترا پەیوەندی یەکی تایبەتیان بوە ، وە بەتایبەتی لە رۆژگارە کۆنەکانا ، خەڵکی ئەو سەرزەمینە لەگەل [کاسیت]ەکانو دانیشتوانی عیلام لەروی زمانو نژادەوە زۆر لەیەکترەوە نزیك بون • ماد لە رێگای [پارتاکنا]وە لەگەل پارس [پرسید] کە لە کۆنەوە لەناو عیلامیەکانا نیشتەجێ بون پەیوەندییان بووە ، بەڵام لـە هـەمان کاتا مەسافەیەکی زۆرو پانی ماد کە بەکار کشتوکاڵ نایەت لـە خوارووو خوارووی رۆژهەڵاتی ئێرانی جیا ئەکردەوە •

هەروەکو وتمان شەقامە رێگای کاروان رۆیی کە ئاسیای ناوەڕاستی بە ئاسیای نزیکەوە (مقدم) ئەبەست بەناو خاکی مادا تێ ئەپەڕی •• ئەم رێگایە کە لە ناوچەی ئەکباتانا (ژمارە ٩) تێ ئەپەڕیو دواجار لە دامێنەکانی خوارووی ئەلبورزو ناوچەکانی ژمارە (١٠) وژمارە (١١) دا درێژ ئەبۆوە ئەهمیەتێکی ئابووریو جوگرافیایی زۆر گەورەی لەمێژووی مادا هەبو •

هەرچۆن بی هێنینـە بەرچاومان خـەڵکی کـەنارەکانی رۆژهـەڵاتو رۆژئاوای دەریای (کاسپی) - خـەزەر - لـەروی مێژووەوە لـەگـەل مـادا

پەیوەندیەکی باشیان هەبوە وە لە روی فەرهەنگ‌و ( بەشی زوربەی ئەوان ) نژادەوە وەکو یەك وابون • ئەتوانین ئەوە بڵێین کە چارەنوسی ماد هەمیشـە لەگەل روداوو چارەنوسی ئاسیای ناوەراستدا پەیوەندیدار بوە •

پەیوەندی مادی بچوك لەگەل رۆژهەلات‌و خواروو ناکوکی سروشتی‌یان لەگەل مادی ئاتروپاتین‌دا [کە لە ئەنجامی ئەو کامڵ بونەدا مـادی بچوك بـە بسبەت مادی ئاتروپاتینەوە کەمێ دواکەوتو تر بووە] ، بو بە هۆی ئەوە کە پەیوەندی نێوان هەردو بەشی ئەم کیشوەرە بێ‌هێز بکات ، وەبـەم هۆیـەوە لەسەدەی چوارەمی پێش زاینیدا دوا رۆژو چارەنوسی هـەردولا جیاواز بون وە هەر لەبەر ئەمە پێگەیشتنی هۆزایەتی‌و تیرەگەری هـەردو لایان لەگـەل یەکتردا جیاوازیان هەبو •

# بەشی یەکەم

## سەردەمی کۆمەڵە سەرەتاییەکان لەخاکی « ماد » دا

# سەردەمی کۆمەڵە سەرەتاییەکان لە خاکی «ماد» دا

## ١ ـ چەرخی بەردو بەردو مس [ ئانیولیت ]

لەبارەی ئەوەوە کە ئادەمیزاد لە چ سەردەمێکدا لە سەر خاکی ماددا نیشتەجێ بوەو یەکەمین جار هاتۆتە ئەو شوێنەوە هیچ زانیاریەکی راست بەدەستەوە نیە ، بەڵام تا ئەم رادەیە زانراوە کە لە سەردەمی کۆنی بەرد [پاپالیولیت] دا ئادەمیزاد لەو ناوچەیەدا ژیاوە ، ئیستا لە ئەنجامی تەقەللادانی کۆنە شوناسیەوە گەلێك شت ـ کە پەیوەندی بە سەردەمی [ئاشل] و [موسیتە] و [ئورینیاك]ەوە(١) هەیە [ئەو هەوارگەو ئەشکەوتانەی نزیك سلیمانیو ئەشکەوتەکانی نزیك بێستونو « تامتام» لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئازربایجانی ئیرانو چەند شوێنەوارێکی فراوانی تر] دەست کەوتوە • لە کیشوەرەکانی دراوسێ دا(٢) ـواتا ئاشورو ئاسیای ناوەڕاست دیسان شوێنەواری سەردەمی کۆنی بەرد [پالیولیت] دۆزراوەتەوە • لەگەڵ ئەمەدا ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی دانیشتوانی سەرزەمینی مادەوە لەسەردەمی چەرخی بەردا کەتا ئیستا دەست کەوتوە زۆر کەمە ،وە بۆ میژونوسان بەش ناکات • بەڵام ئەتوانین بڵێین کە بەرویهەم رێگاکانی کامڵ کردنی ئادەمیزادی

چەرخی بەرد لەسەر خاکی ماد بەشێوەی گشتی لەگەل کیشوەرەکانی ترا کە ڕاستەو خۆ خەریکی جولاندنەوەو گۆڕان بون یەکسان بون ، بەم جۆرە داوا لەخوێنەران ئەکەین کە تەماشای ئەو کتێبە گشتی‌یانە بکەن کە لەبارەی مێژوی ئادەمیزادی چەرخی بەردەوە نوسراونەتەوە •

تا ئیستا شوێنەوارێکی بەکەڵکی وا کە پشتی پێ ببەسترێ لەبارەی چەرخی نیولیت [چەرخی تازەی بەرد]ەوە لە خاکی ماد نەدۆزراوەتەوە • هەروەها لە کیشوەرەکانی دەورو پشتی مادیشدا [جگە لە ئاشورو بین‌النهرین‌و هینی تر] هەندێک شوێنەوار لە بارەی چەرخی تازەی بەردەوە دەست کەوتوە(٣) لە بارەی چەرخی بەردو مسەوە [یان ئانیولیت] چەند بەلگەیەکی کۆنە شوناسی بەدەستەوەیە •

ئەو شوێنانەی کە لە چەرخی بەردو مس‌دا لە رۆژگاری زۆر کۆندا تیا نیشتەجێ بون ـ هەروەکو لە سەرزەمینی ناوچەکانی دەوروبەری ماددا واتا پارسن [پرسید] لێی کۆلاونەتەوە ـ لەخاکی ماد بەقەدەر پێویست نەبوە • بەلام ئەتوانین بلێین ئەو شوێنە نیشتەجێ تایبەتیانەی کە لەو شوێنەدا [ لە پرسپولیس ـ ئەستێلک ] دۆزراوەتەوە ، وە لەبارەی نزمترین پلەی چەرخی بەردو مس [ئانیولیت]ەوەیە(٤) ئەوە بۆ رونکردنەوەی روی کۆمەلایەتی کاملی ئەو سەردەمەی کیشوەرەکانی مادو دەوروبەری ماد دەست ئەدات •

شوێنی نیشتەجێی ناوبراو بەهۆی [هرتسفلد]ەوە دۆزراوەتەوە ئەوە بریتی بوە لە نیشتەجێی گلین‌و جۆری جۆری خانو بەرەیان رواڵەتی مێ وەجاخی نیشان ئەدات(٥)،هەروەها وێنەو نیگاری بەرازو بزن‌و مەڕ••کە لەسەر روی سواڵەتی گۆزەو دیزە [ کە بە چەرخی گۆزە سازی سەرەتایی دروست کراوە ]و پەیکەری بچوك بچوکی گاو مانگا ـ کە لەوە ئەچێ ئەمانە پەیوەندی‌یان بە بوارە ئاینیەکانەوە بێت ـ لەبارەی نیشتەجێ کانەوە وەکو چیرۆك‌و بەسەرهات ئەیانگێڕنەوە •

له بارەی کۆمەڵگای مادەوە له چەرخی بەردومس دا ئەتوانین بەهۆی ئەنجامی هەڵکەندراوەکانی تەپۆڵکەی [حەسار]لەنزیك داموغانەوە [له ئەوبەڕی ڕۆژهەلاتی ناوچەی ژمارە «١١»ی بەشکردنی خۆمانو سنوری پارت][٦] وە تەپولکەی گیان لە نزیك نهاوند [ناوچەی «٨»ی خۆمان][٧] وە تەپولکەی سیلك لەنزیك کاشان [ناوچەی «١٠»ی خۆمان][٨] وە تەپولکەی نزیك رەزائیە [ کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ ] « ناوچەی ژمارە ٣ی خۆمان »[٩] تارادەیەك رونی بکەینەوە ٠ هەمو ئەم ناوچانە کەوتونەتە سنوری مادەوە ٠ له ناوچەی ژوروو مەرکەزی مد کە بەر له بەشەکانی تر جێگای سەرنجدانی ئێمەیە تائیستا هیچ هەڵکەندراوێکی گرنگ دەست نەکەوتوە[١٠] ٠

کۆنترین توێکڵی ئەو تەپۆڵکە ناوبراوانە [لەروی کۆنە شوناسیەوە ــ له تەپۆڵکەی حەسار ( Ia ) ، لەگیان O ــ وە بە تایبەتی لە گوی تەپولکەی نزیك رەزائیە [M] و [ K ] ــ ئەتوانین بە هینی رۆژگاری کۆتایی هەزارەی چوارەمو سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دابنێین ٠ لەگەل تەماشا کردنی ئەو گۆڕانانەی کە بە تازەیی لەمێژوی دانانی تۆکڵەکانی بین‌النهرین دانراوە وە لە واقیعدا کلیلی رۆژگارو مێژوی شارستانیەتەکانی ژێر خاكو کۆنە شوناسی ئاسیای رۆژئاوایە] ٠ تا لەو رۆژگارەدا سەرزەمینی ماد کە بە نەخشەی شارستانێتی سوالەتی رەنگاورەنگ ناو ئەبرێ وە له سوریەو فەلەستین تا ئاسیای ناوەڕاستو چین درێژ بوبۆوە ، لەگەل ئەمانەدا پەیوەندی هەبو ٠ یەکەمین نیشانەی دابەشکردنی ئیشو کار بوە لەنێوان هۆزە شوانکارە پیشەییەکانو کشتوکاڵ کارەکانا کە پەیدا بوە ٠ له دامێن چیاکانەوە لە جۆگاکان ئاویان ئەبرد بۆ کشتوکاڵو سودیان لێ وەر ئەگرت ، وە یەکەمین جار دەخڵەماڵیەکانیان ــ وەکو جۆو گەنمو گەنمی کێوی‌یان ئەچاند[١١] ، ئەو مەڕو ماڵاتانەیان بەخێو

ئەكرد كە وێنەو نیگارەكانیان لە سەر روی سوالەتەكان كێشاوە • لە ناوچە كشتوكالیەكانی شوێنە نیشتەجێ هەمیشەییەكانا [وەكو لادێكان] ـ كە هێشتا خۆیان نەگرتبو] ـ پەیدا بوو • هەندێك كەرەستەی دروستكراوی مسین ـ لە دوایدا چەند پارچە ئالەتێكی مسین ـ دروست بووە ، هەمو ئەم بێنسكەوتنانە ماوەی ئەوەیان دا كە پیشەگەری تەنین و گۆزەكردن پێش بكەوێ • بەرە بەرە [نەختێك دواتر] لە دوەمین خولی گرنگی دابەشكردنی نیش و كاری كۆمەلایەتیدا ـ واتا دابەشكردنی پیشەی كاركردنی پیشەیی و كشتوكال ـ هاتە پێشەوە • رازاندنەوەی پێچاو پێچی ئەندازیاری گۆزەگەری [وەهەروەها تەنین] یەكێكە لە روالەتە تایبەتیەكانی ئەو سەردەمە • كە لەو كاتەدا تەنین و گۆزەگەری نمونەی هونەرو بەرهەمی هونەرمەندانی ئەو رۆژگارە بووە •

باس كردنی ئەم شتە پێویستە كە شارستانێتی و فەرهەنگی هەریەك لە شارەكانی ئەو سەردەمە لەبەر لێكۆلینەوەدا هەندێكیان لە هەندێكی تریان ئەچون كەچی لەگەل یەكتردا جیاوازییان هەبوە ،وە هەریەكە شارستانیەت و فەرهەنگێكی تایبەتی خۆی بوە ، وە ئەوە بزانین كە هەریەك لەو ناوچانە زەوی و زارێكی تایبەتی و ئابوریەكی عەشیرەتگەری و كشتوكالێكی هۆزایەتی تایبەتیان بوەو پەیوەندیان لەگەل یەكتریدا زۆر كەم بوە •

هەرچۆن بێت سوالەتەكانی تەپۆلكەی گیان و تەپۆلكەی حەسار لەگەل سوالەتەكانی شارەكانی سوریەو ئاشورو بین‌النهرین و شارستانێتی دۆزراوە لە [سامەرا] و [تل‌خلف]و [عبید] لەلایەكو شارستانێتی و فەرهەنگی ئاسیای ناوەراست [ئانائو I ] لەلایەكی ترەوە ، وە لەگەل سوالەتەكانی عیلام ـ شوش Ib » و « شوشر I وە [كەمێك دواتر] « لەگەل تویكلی گیان ٤ » ـ « شوش ٢ » زۆر لە یەكتر ئەچن • مێژوی هەمو ئەم شارستانیەت و فەرهەنگانە لە هەزارەی چوارەم و سەرەتای هەزارەی سێیەمی

پێش زاینیدا بووە ، هەروەها پەیوەندیشیان لەگەل قەفقازو ئەوبەری چیای قەفقازدا هەبو ، هەروەکو توێکڵی « K لە گۆی تەپەو نیسبەت بە شوێنە نیشتە جێکانی چەرخی بەردو مس لە قەفقازی مەرکەزیو ژوروداو ئەوبەری چیای قەفقاز ـ وەکو «شرش بلور» [لە نزیك ئەچمیادزین ـ ئەرمەنستانی شورەوی]و کایاکنت [داغستان ، هەروەکو نەخشێکی هەڵکەندراوی سەرسواڵەت]و هی‌تر هەیە • بە بیرواری « ب•ب پیوتروسکی » شوێنە یشتەجێ ناوبراوەکان هینی هەزارەی سێیەمی پێش زاینین ، هەروەکو ئەم بوارانە ئەتوانین بە بواری شارستانی چەرخی بەردو مسی سەرزەمینی مادی دابنێین لە سێ هەزار ساڵەوە تاکو دو هەزارو پێنج سەد ساڵ بەر لە زاینی • بەڵام دیاریکردنی شارستانیو فەرهەنگیو بەرابەری کردنیان لەروی نژادو فەرهەنگەوە یاخود لە یەکچونیان لە هەندێك شوێنی جۆربە جۆردا ، وە رون کردنەوەیان کە ئایا تاکو چ رادەیەك لە یەك ئەچن کارێکی زۆر گرانە[١٢] •

لە ئاسیای ناوەڕاست دا سواڵەتە رەنگا ورەنگە دروست کراوەکان زۆریان پەیوەندی بە مەردوم شوناسیو نژادی خەڵکی دەریای ناوەڕاست [مەدیترانە]وە[١٣] هەیە ، [وەکو دانیشتوانی ئیستای تورکمانو ئیرانو بەشی زۆری ئازربایجان] ، وە لە کێوەکانی زاگروسو ئاشورو بین‌النهرین ـ ئەوەی دیارە ـ وەکو خەڵکی ئەمڕۆی ئەم شوێنانەو ئەرمەنستانو سوریەو فەلەستینو •••• هتد لە نژادی [شێوەی ئاشوری] ـ شێوە ئەرمەنی ـ ئەچون[١٤] • بەڵام لە بارەی مادو [فلات]ی ئیرانەوە ، کۆنترین دانیشتوانی ئەویش لەبارەی مەردوم شوناسیەوە ، دەموچاو رەشو سەردرێژو لە جۆری شێوە ئەوروپایی کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست [مەدیترانە] بون[١٥] • کە ئیستەش وێنەی ئەوانە لە خوراسانو ئازربایجان[١٦] ئەژینو بەزۆری ئەبینرێن •

ئەو شتانەی کە لە شوێنەواری تەپۆڵکەی حەسار دۆزراوەتەوە ئەوەمان بۆ رون ناکەنەوە کە لەو شوێنانەدا هاتوچۆو کۆچو کۆچباری ئەو سەردەمە چۆن بووە ، بەڵام هەرچۆن بێت لەوە ئەچێ ئەم ناوچانە لەبارەی مەردوم



**دەفرێکی نەخشینی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی لە تەپۆلکەی سیلك دۆزرا وەتەوە •**



**دەفرێکی نەخشینی [مادەکان] هەزارەی دوەمی پێش زاینی لە تەپۆلکەی گیان دوزراوەتەوە**

شوناسیو نژادەوە یەك جۆرو رەگەز نەبون ، ئەو هەڵکەندراوانەی کە پەیوەندی بە هەزارەی دوەمی پێش زاینیەوە هەیەو لە تەپۆڵکەی حەساردا دۆزراوەتەوە هەندێ کاسە سەری بچکۆلەی تیایە کە هەندێك لە مەردوم شوناسەکان ـ بەر لە بڵاو بونەوەی دوا ئەنجامیان ـ ئەمانەیان بە چەشنی شێوە مەغول دائەنا ، دوای ئەوەش هەندێ کاسە سەری تر دۆزرایەوە کە گۆیا ئەمانەیان لە « نژادی ژورو ـ نوردیك » بون[(١٧)] • ئەم دو بۆچۆنو بەراورد کردنە هەردوکیان گومانیان تیایە •

لە خواروی ئێران ـ تاکو دەراوی روبارەکانی کارونو کرخەو لە گۆشەی خوارووی رۆژئاوایانەوە [عیلامی کۆن لەگەل **پێشکەوتنی ئەوکاتەی**

کنتوکاڵیاندا] وەکو دەرکەوتوە مەردومی [شێوە رەش] کە لەوە ئەچێ لەنژادی دراویدی بووبن ، زۆر بوە • بەڵام ئەم جۆرە خەڵکە لەناو مادو ناوچەکانی تری ژوروودا نەبون •

**٢ ــ دانیشتوانی کۆنی مادی رۆژئاوا لە هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا**

## [ هوریو عیلامی ] ••

بەشێك لەخاکی ماد لە چارەکی سێیەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا ناوچەیەك بووە کە سەرچاوە نوسراوە کۆنەکان زۆر بە شپرزەییو پەرپوتیەوە باسی ئەکەن •• ئەو شوێنەوارو سەرچاوە نوسراوانەی کە لە بارەی ئەم ناوچەوە دواوونو بەزمانی سومەریو ئاکادیو هوریانی نوسراونو دەست کەوتوون ئەڵێن : کە کێوە نزمەکانی رۆژئاوای زاگروسو ئەو جێگایانەی کە دوایی بوبون بە مەڵبەندی مادی رۆژئاواو هۆزەکانی هوریو لولۆو گوتیو چەند هۆزێکی تر کە لە عیلامیەکانەوە نزیك بون تیادا ئەیشتنو ژیانیان تیا بەسەر ئەبرد •

ئەو هۆزانەی بە زمانی هوریانی [ hurrohe ] قسەیان ئەکرد لە هەزارەی دوەمی پێش زایینی دا لە بین‌النهرینی ژورو تا ڕادەیەك لە سوریەو هەروەکو هەندێك لەو نامانەی کە باسی شوێنو خەڵكو کەسایەتی ئەکەن دەرئەکەوێ ــ لە سەرانسەری [فلات] بیابانەکانی ئەرمەنستان بڵاو بوبونەوە •

ئەمانە تا ناوەراستی هەزارەی یەکەمی پێش زایینی لە کەناری ئەو هۆزانەوە کە سەرچاوەیەکی تریان هەبو مانەوە(١٨) ، زمانی هوریەکان لەگەل [ئورارتویی] زۆر لە یەکترەوە نزیکن(١٩) نوسراوێك بە خەتی ئاکادیو بەزمانی هوریان لە پیاوێکەوە کە ناوی [ تیشاری ] پادشای [ ئورکیش ]و [ناوار] بوە لە چارەکی سێیەمی هەزارەی سێیەمی پێش زاینیەوە بووە دەست ئێمە کەوتوە ، شوێنی [ئورکیش] نازانرێتو باسی لێوە ئەکرێ(٢٠) بەلام

(ناوار) شوێنێکه که له دواییدا پێیان وتوه [نامار] یان [نامرو] • واتا دەراوی روباری دیاله که هەمان ناوچەی ژماره [حەوتی] نەخشەکەی خۆمانە • لە رۆژهەلاتی دجلەو خاکی ئاشور له هەزارەی سێیەمی پێش زاینی ، [بە تایبەتی له بارەی ناوی کەسایەتیەوە] بونی هوریانەکان ئەسەلمێنێ ، وه لە هەزارەی دوەمی پێش زاینی دیسان ئەوانە له ناوچەی کەرکوکی ئیستا [ئاراپخای کۆن] ژیاون[٢١] • بەلگەی لەمە روتر له بارەی بونو نیشانەی هوریانەکانەوە بە دەستەوە نیە ـ ئەگەرچی هەندێك وتویانە کە خەلکی ناوچەکانی ٣و٤ی نەخشەکەی خۆمان[٢٢] تا هەزارەی یەکەمی پێش زاینی لەوانەیە هوریەکان بوبن •

خاك و نیشتەجێی رەسەنی عیلامیەکان دەراوی کارونو کرخە بووە یان عیلامی کۆن ـ کە ئیستە پێی ئەلێن خوزستانو کەوتۆتە لای خواروی رۆژئاوای ئێرانەوە ، بەلام له رۆژگاری کۆندا بنکەی عیلامیەکانو شوێنی پەیدا بونی زمانی ئەوان بوه ، هەروەکو لە [بوشەهر] لە کەناری خلیج [لێیانی کۆن] نوسراوێکی بە زمانی عیلامی کە بەروارەکەی له دەوروبەری ناوەراستی هەزارەی سێیەمی پێش زاینییە دەست کەوتوه[٢٣] • له شوێنەکانی تری فارس‌دا دیسان چەند نوسراوێکی عیلامی بەخەتی بزماریو جۆرەها بەخشی هەمەجۆرەو مانادار دۆزراوەتەوە • بەلام لەبارەی خەتو نیگاری بیروزی [هیروگلیف]ی عیلامی کە بەر لە خەتی بزماری وە تاکو کۆتایی هەزارەی سێیەمو سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاینی نوسراوی پێ نوسراوەتەوەو بەکار هێنراوە ، حەوت سەنەد بە خەتی ناوبراو له تەپۆلکەی [سیلك] ـ خاکی ماد ـ له هەلکەندراوی ٤ [کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی ؟] دۆزراوەتەوە[٢٤] • لە چەند ناوێکی جوگرافیایی سەردەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاینی وا دەرکەوتوه کە له کۆنترین سەردەمەکانی کۆندا له مادی رۆژهەلاتو مەرکەزی خەلکی عیلام ژیاون • ئەبێ ئەوەش

بزانین که کاسیەکانو هۆزە کوێستان نشینەکانی تر کــە لە هەزارەی دوەمی پێش زایینی‌دا لە سنوری مادو عیلامدا ئەژیان ، لەوە ئەچێ شێوەی زمانیان لــە عیلامەکان چوبێتو زمانەکەیان لەگــەل زمانی عیلامیدا لــە یەکترەوە نزیك بووبن • بەداخەوە زمانی عیلام تا ئیستا لەگــەل زمانەکانی ترا بــەشێوەیەکی تەسەل بەراورد نەکراوە ،[گەلێك تەقەللا درا کە ئەو زمانە ــ زمانی عیلامی ــ لەگــەل زمانــەکانی هوریو قەفقــازی .کوێستانیو درویدیانی هیندو ئورالو ئالتائیو ••• هینــی تر پێکــەوە ببــەستن] •• جگــە لــەوەش ئــەم زەخیرە زمانەوانیەی زمانی عیلامیەکان کەمتر باسی لێوە کراوە ، وە بەم جۆرە تا ئیستا ناتوانین بە تەواوی زمانی کاسیەکان بــە زمانی عیلامی دابنێین ، وە یان لــە بارەی ئەو نوسراوانەوە کە باسی شوێنەکان ئەکەن زمانی عیلامی بــە زمانی ماد دابنێین •

دەوڵەتە بچکولە عیلامیەکان تاڕادەیەك لەگەل دەوڵەتە تازەکانی سۆمەردا لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا زمانەکانیان یەك خست •• گەلێك لەوانە بە ناو ئــەیاناناسین • وەکو [ئاوان] ، [ئادامشول] یان [ئادامدون] ، [رەنگ بــێ هەمان عیلام بن ــ کــە بــە زمانی عیلامی هالتامتی ، هــالامتی Haltamti - Halamti [ســیماش] [باراخە] و هی‌ترو هینی تر •• قسەیان ئەکرد ، بەڵام [شوش]یەکان ، لە ئەنجامی دۆزینەوەی شوێنەوارەکان کە لەناو هەڵکەندراوەکانا دۆزراونەتەوە ئەتوانین بە باشی بناسین • وە رەنگ بێ سەرزەمینی دەوڵەتی گرنگی عیلام بەناوی [ئانچان] لە نزیك [دەراوی شار] لە دەراوی [سینمرە] بوبێ • عیلام لە سەردەمی کۆندا زۆر پەیوەندی لەگەل سۆمەردا هــەبوە ــ پەیوەندیەکی وا کــە جاروبار دۆستانــەو جــاروباریش دوژمنانــە بوە ، وە لــە ســەدەی بیســتو سێیــەمی پێــش زاینــی لــەژێر دەسەڵاتدارێتی زنجیرە پادشایانی [ئاکاد] دا بون • بەداخەوە لەو بارەیەوەش لــەســەر زمینــەکانی ناوچــەکانی ژوروتر هێچ جــۆرە زانیاریــەکمان بــە دەستەوە نیە[٢٥] •

## ٣ ـ لولوییەکان

هۆزەکانی لولو بەشێکی زۆریان لە کێوو شاخەکانی بەشی سەردوەی دیالە گرتبۆوە تاکو دەریاچەی ورمێ [ وە تاکو ئەولاتر بەرەو ژوروی روژئاوا] ئەم ناوچەیان داپوشیبو • لە [ئاراپخەنولو] ـ ی هوریانی [ لولو ] بەمانا بەو کویستان نشینانەیان ئەوت کە سەرانەیان لێ ئەسەندن(٢٦) • بە زمانی [ئورارتویی] [لولو] بە [بێگانە] بە [دوشمن] ئەڵێن • لە زاراوەی ئاکادی [لولو بوم] یان [لولوبوم] [وە لە دوایدا ئاشوریەکان زاراوەی ـ نولومە]یان بەکار هێناوە(٢٧) • زاراوەی لولو بە زمانی ئاکادی بە تەنیا بەکار هێنراوە(٢٨) • ئەم نمونانە ئەوە نیشان ئەدەن کە لولوییەکان لەروی نژادەوە لە هۆزەکانی هوریانی ـ ئورارتویی نەبون ، بەڵکو بە پێی بیروڕای زوربەی شارەزایان لەگەل عیلامیەکانا تێکەڵو نزیك بون(٢٩) •

نوسراوەکەی [نارام ـ سوئنا] نەوەی سارگون لە زنجیرەی ئاکادیەکان سەدەی بیستو سێیەمی پێش زاینی] لە نوسراوە پیرۆزە بەناوبانگەکەیا بۆ یەکەمین جار باسی لولوییەکانی کردوە • لە نوسینێکدا کە نیوەی کوژاوەتەوە بەم جۆرە باسن ئەکات : [ سیدور «رو (؟) کە» ] کوێستانیەکانی لولو بومی کۆ کردەوە •••](٣٠) « ئەم نوسینە حەتمەن لە بارەی وێنەی دوژمنێکەوەیە کە [نارام ـ سوئن] شکاندویێتی » ، لە شکرکەشی بۆ سەر [لولوبوم] لە دوای زنجیرە بگرەو بەردەو شەڕێکەوە بوە کە ئەو پادشایە کردویەتیە سەر کێو نشینەکانی زاگروس ـ وە لە دژی [ناوار] لە دەراوی روباری دیالەو [سیموروم] لەسەر روباری زێی بچوكو مارخاش لە عیلامو هینی تر بە کاری هێناوە(٣١) •

کە دەسەڵاتو قودرەتی [نارام سوئن] و کوڕەکەی [شارکال شاری] لاواز بوو ، [پوزور ـ ئین شوشی ناك] عیلامی زۆر تێکۆشا تاکو [سەڵتەنەتی

چوار کیشوەری جیهان]ی خۆی پێک هێنا ، لەشکریەکانی عیلام زنجیرە شەڕو بگرەو بەردەیەکیان لە دژی [موتوران] لە [نزیك بەغدا] و [شیلوان]و [زگوتو] «کیشوەری گوتیەکان» و [کاسن] [کیشوەری کاسیەکان] و [خو - مو - رتوم]و [خوخونوری] و [کیماش] - لە نزیك کەرکوکی ئیستاوە - دەست پێ کرد • ئەم شوێنانە زوربەیان وڵاتو شوێن نیشتەجێی هۆریانو لولویەکان بون[٣٢] •

لەوە ئەچێ نوسراوەی [ئانو بانی نی] سولتانی لولویی کە لەسەر بەردەکەی سەرپل لەنزیك شاری زەهاو [ ناوچەی ٦] هینی ئەو سەردەمە بێت [سەدەی بیستو دووەمی پێش زاینی] ناوی ئەم پادشایە ئاکادییە[٣٣] ، وە نوسراوە کورتەکەی ئەو دیسان کە لە سەر ئەو وێنانەوە نوسراوون کە دیلەکانیان بۆ لای پادشا هێناوە هینی خواوەندی [ ئیشتار ]ە وە بە زمانی ئاکادی نوسراوە •



**قەباڵەیەکی ئابوری عیلامیەکان [پارتکنە - مادی خوارو] لەکۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا •• لە تەپۆلکەی سیلکدا دۆزراوەتەوە**

هەروەها نوسراوەی ناوبراو ئەوە ئەگەیەنیت کە لولویەکان لە نیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دەوڵەتێک بوونو بریتی بون لە چەند چینێکی کۆمەڵایەتی ، بەڵام وەکو سەرچاوە ئاشوریەکان باسی ئەکەن

ئالاو دامەزراندنی یاسای دەوڵەتی لەناو ئەو هۆزانەدا تەنیا لەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا بینراوە • وە ئەمە لەگەل ئەو شتانەی ترا کەباس کراون جیاوازیان هەیە • لەوە ئەچێ کە لە نوسراوەی [ئانو بانی نی] قسەی لەبارەی دەوڵەتێکەوە تیا بێ کە هوریانەکان یان ئاکادیەکان[٣٤] لە دەراوی دیالە ـ بە پشتیوانیو هاوکاری هێزە چەکدارەکانی هۆزە لولوییەکان کە لەژێر دەسەلاتی دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتەدا بووە ـ پێکیان هێناوە ،وەیان [ئانوبا نی نی] تەنیا داواکاری سەڵتەنەتی لولوییەکان بووە[٣٥] • پێویستە ئەوە باس بکەین کە ئەوبەردەی سەرپل کە وێنەو نوسراوەکانی لەسەر نەخش کراوە دوربوە لە دەسەلاتی [ئانو بانی نی] یەوە وە یاخود سنورەکەی ئەوی دیاری کردوە • لەو نوسراوەیەدا وتراوە [ کە ئانو بانی نی پادشای لولوبوم وێنەی خۆیو وێنەی ئیشتاری نەخش کردوە ][٣٦] هەروەها ناوی شوێنی بەردە نوسراوەکە بە ئاشکرا باس کراوە ، ئەوە نیشان ئەدات کە ناوی ناوبراو زۆر ئەهمیەتێکی تایبەتی هەبوە ، وە لەوە ئەچێ شتێکی پیرۆز یان سنوری دەسەلاتداری ئانوبانی نی بو بێت[٣٧] ، وا دێتە بەرچاو ئەگەر ئەو نوسراوە لەمەرکەزی دەسەلاتداریێتی ئەوا بوایە ـ پێویست نەئەبو ناوی کێوەکەی بۆ خوێنەران باس بکردایە چونکە هەمو ئاگایان لەوە ئەبوو وە ئەوەیان ئەزانی •

ئەو دوو شوێنەوارە نیگاریە باسکراوە ـ واتا نوسینەکەی [نارام ـ سوئن]و نەخشە هەڵکەندراوەکەی «ئانوبانی نی» ـ تا رادەیەك جلو بەرگو کەلو پەلو سیمای کۆنترین دانیشتوانی خاکی مادمان بۆ رون ئەکەنەوە • لە نوسینەکەی [نارام ـ سوئن][٣٨] دا لولوییەکان بەرگی سوكو دامێن پوشیان لە بەرایە وە پارچە پیستێکیان لە سەرشان ناوە ، وە ئەمە خۆی لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینی دا جلوبەرگی ماناو مادی رۆژئاوا[٣٩] کاسپیەکان بوە [بە قسەی هردوت][٤٠] ریشیان کورتو پرچیان درێژە،لە نەخشە هەڵکەندراوەکەی

[ئانوبانی نی] ئەو پادشایەی بە جل‌وبەرگی ئاکادی یەوە نیشان داوە ،[کلاوی نباد (؟)ی ریشودار لەگەل پشتێنی کەمەربەستەو کەوشی سەندەڵ]ی لەپێدایە ،وە دیلەکانیش کلاویان لەسەرایە • لە نۆ وێنەی دیلەکان هەشتیان



**نیگارێك لە روی بەردەكەی ئانوبانی‌نی پادشای لولوییەكان گیراوە**
**نیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی**

کلاوی سومەری‌و ئاکادیان هەیە ، وە نۆیەمیان [ئەوەیان کە لە ریزی ژێرەوە وە پێشەوەیە کلاوی [یاتاج] ـ کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینی‌و بە تایبەتی هی مادەکانی رۆژهەلات[٤١] بووە وە دوایی پارسەکان لەوانیانەوە وەرگرتوە ـ لەسەریاندایە •

هەمو ئەو نوسینانەی سەردوە ئەوە نیشان ئەدەن کە لە نێوان هەزارەی سێیەم‌و یەکەمی پێش زاینیدا عادەت‌و نەریت‌و رەووشتی دانیشتوانی مادی داهاتو ـ لەبارەی نژادو مەردوم شوناسیەوە[٤٢] ئەوەندە نەگۆراوە •

## ٤ ـ گوتیەکان

چوارەمین کۆمەڵی هۆزەکانی ئەم ناوچەیە کوتیەکانن کە بە پێی بیروڕای زوربە لە ناوچەیەکی رۆژهەڵاتی تر لە لولوییەکان ئەژیان(٤٣) •

پێویستە چەند قسەیەك لە بارەی [گۆتی]یەکانەوە بکەین •

لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنی نوسراوەکان ئەوەمان نیشان ئەدات کە ناوی [گوتی] تەنیا لە هەزارەی سێیەمو دووەمی پێش زاینیدا بووە ، وە بە کۆمەڵێکی هاو نژادییان ئەووت کە لە رۆژهەڵاتو ژوروو ژوروی رۆژئاوای لولوییەکان ـ وە رەنگ بێ لە ئازربایجانی ئیستەی ئیرانو کوردستاندا ژیابن دوای ئەوە لەوە ئەچێ ئەم زاراوەیە بەو هۆزە جۆربەجۆرانە وترا بێ کە لە ژوروو رۆژهەڵاتی بابلدا ژیاون ، وە تاکو نیستا مانای شوێنێکی دیاریکراوی یەکپارچەیی نەگەیاندوە(٤٤) • لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینی هەمو ئورارتوییەکانو خەڵکی ماناو ماد پێیان ئەوتن [کوتی] • بەڵام هەندێك جار لە نوسراوەکانی سارگونی دووەم مادە ئیرانی زمانەکان لە [گوتیەکان] جیا کراوەتەوە •

گۆتیەکان لە سەدەی بیستو سێیەمی پێش زاینی دا وە لە سەردەمی سەڵتەنەتی [نارام ـ سوئن] پادشای ئاکاد ـ کە لەو رۆژگارەدا سەرانسەری بین‌النهرینی تا کێوەکانی زاگروسو ئەرمەنستانو کێوەکانی تاورووس لە ئاسیای بچوك لەژێر دەسەڵاتیا بووە ـ لە لاپەڕەکانی میژوودا هاتوە عیلام(٤٥)و رەنگ بێ بەشێ لە سوریەش دیسان سەر بەو قەڵەمڕەوە بووبێت •

بە پێی باسو بەسەرهاتەکانی دوایی ئاکادی [نارام ـ سوئن] ـ وەکو دەر ئەکەوێت ـ لە کۆتایی سەڵتەنەتەکەیدا لەگەل گۆتیەکانا کەوتۆتە شەڕەوە ،وە لە کاتی شەڕدا لەگەل گۆتیەکانا لەناو چووە(٤٦) •

[یاکوبسون] سومەری ناسی دانیمارکی ئەڵێت کە [ ئانریداوازیر ] پیشەوای گۆتیەکان دوای ئەوە کە بەسەر [نارام ـ سوئن]دا سەرکەوتوە

توانیویێتی لەناو جەرگەی ناوچەی خواروی بین‌النهرین حوکمڕانی بـکات وە [نیپور] شاری پیروزی سومەریـەکان بگرێتـە ژێر دەستی خۆی وە لـەوێ بەرچە نوسینێك کە نوسەرە ئاکادیەکان بۆیان نوسیوەتەوە داینـاوە(٤٧) •

بەتەواوی گۆتیەکان لـەو ڕۆژگارەدا لـەشـکرو سـوپایەکی رازاوەو بەهێزو پڕ چەکیان نەبوو وە لەڕۆژگارێکی سەرەتاییو کـەم گشتوکاڵو بێ شارستانێتیو فەرهەنگی [سەردەمی سواڵەتی رەنگاو رەنگ]دا ئـەژیان ، وە رون نیە کە لەگەل ئەم بارە نالەبارەدا چۆن توانیان ئەو لەشکرانەی کە بـە بەراوردو بیروڕای هەمو کەسێك لە هەمو دەوڵەتێکی ئەو ڕۆژگارە بەهێز تر بون تێکیان بشکێنێ ؟ لەم ڕوداوەدا شتێك کە سەر سوڕهێنەر بێ نیە • لەگەل ئەوەدا کە ناوچەی بین‌النهرین بـەهۆی بەپیتو بەرەکـەتی زەویـەکانیەوەو پیشـکەوتنی کشتوکاڵو شارستانیەتو دەرامـەت کۆمـەڵکایـەکی فرە چینی پێگەیشتووی تیابو •••وە لەشکری ئاکادیەکان کـــە زوربەیان لـە سـەر ئارەزوی خۆیان چەکیان هـەڵگرتبو چەکەکانیان زۆر سەرەتایی بو [کلاوی مسینو کەمانو تەورزین بون] ئەم جۆرە چەکانە ئەوەندەی بەســەر چەکی گۆتیەکانا نەبو • هێزی لە شکری ئاکادیەکان زۆر لەوان زۆرتر بون(٤٨) • بەم جۆرە ئەگەر کوێستان نشینە پەلامار دەرەکان زور بوبن ئەوا سەرکەوتنیان مسۆگەر بووە • وەکو ئەکەوێتـە بەرچاو کـە سەرکردەکانی گوتی توانیان هۆزەکان کۆ بکەنەوەو بـە یەکێتییەکی تەواوەوە بچن بەگژ ئاکادیەکانا • جگە لـەوەش ئەمـە رەنگ بێ لـەناو خۆی دەوڵـەتو کیشوەری زنجیرەی ئاکادیەکانا دیسان یارمەتی ئەوانیشی دابێت •

بەم جۆرە [شارکالی شاری] کوڕی [ نارام – سـوئن ] ڕۆژگاری بـە قازانجی خۆی گیراوە ، بە هەر جۆر بێ زەویو زاری تایبـەتی خۆی واتا (بين النهرين)ی پاراستو [سارلا گاب] پیشەوای گۆتیەکانی گرت(٤٩) بەلام لە دوای مردنی [شارکالی شاری] شەڕو شۆڕێکی زۆر سـەخت کەوتە نێوان

میراتگرانی تاج‌و تەختی ئاکادەوە •

نوسەری ناوەڕۆکی ناوی پادشایانی سۆمەر لەم روەوە ئەڵێت : [ کێ پادشا بو کێ پادشا نەبو ؟] « ئەلولومیش » پێشەوای گوتی دیسان بەشداری ئەم شەڕو شۆرەی کردوە[٥٠] • لە ئەنجامدا دەوڵـەتی ئاکاد زیندو بۆوە ، بەڵام تەنیا ئەهمیەتێکی ناوچەیی هەبو ، وە گۆتیەکان دەسەڵاتداریتی بەرزی بین‌النهرینیان بەدەست هێنا •

لەبەر ئەوەی کە بەڵگەو سەنەدی مێژویی کەمە ئەو بەڵگەو نوسراوانەی کە بەدەستەوەیە لەبەر لێکدانـەوەدا ئـەتوانین سـەرکەوتنەکانی گۆتیـەکان‌و فەرمانڕەواییان لەناوچەی بین‌النهرین دا دیاری بکەین •

ئامانجی ناوەڕۆکی لیستەی ناوی پادشایانی سومەر کە دەمو دەس لـە دوای لە ناو چونی دەسەڵات‌و قودرەتی گۆتیەکان[٥١] لە چەند سەرچاوەیەکی جۆر بەجۆرەوە وەرگیراوەو رێك خراوە ، رازاندنەوەی دەسـەڵاتی ئەبەدی دەوڵەت بوەو بۆ بەرچاو خستنی ئەوە کە پادشایانی بین‌النهرین کوڕ لە دوای باوك بە بێ بچڕاندن سەڵتەنەتیان کردوە ــ سوڵتانەکانی گوتی شیان دیسـان لەناو ئەوانا هێناوە ــ بەڵام ناوەڕۆکی ناوی پادشایانی گوتی هۆی دو شتە کە ئەوانەیان لە هینی تر هەڵاواردوە : ماوەیەکی زۆر کـەم سەڵتەنەتی ئەوان‌و رونکردنەوەیان کراوە ئەویش لەسەرەتای ناوەرۆکی ناوەکانیانەوەیە • ئـەو رونکردنەوەیە بـەم جۆرەیـە : « هۆزی گۆتیـەکان پادشایان نـەبو »[٥٢] [ ئەگەرچی بەبێ بچڕاندن لە دوای ئەو ناوەڕۆکەوە ناوی « پادشایان »ی زنجیرەی گوتی هاتوە] ••

لـە رۆژگاری کۆندا ئـەم رونکردنەوەیـە جێـگای سـەرسوڕهێنەری نوسـەران‌و لـــە سـەردەمی ئێستاشدا هـــۆی بیرکردنـەوەو واق وڕمـانی دانشمەندان‌و زانایانی رۆژئاوایە •• بەڵام ناوەڕۆکی سەرسوڕهێنەر نیە : بە پێچەوانەوە هەروەکو هۆزێك یان یەکێتی هۆزەکانی گوتی ــ کە بە تەواوی

لە سەردەمی کۆمەڵایەتی سەرەتاییدا ئەژیان ـ پادشایان بوە • ئەمە هۆی سەرسوڕهێنانە لەوە ئەچێ نوسەری ئەو ناوەڕۆکە لەدوای ئەم رونکردنەوەیە دەمودەس ناوی پادشایانی گوتی هێناوە ، ئەمە خۆی شتێکی سەر سوڕهێنەرانەیە • بەڵام ئەمە دیسان لەگەل گیانی ئوسلوبی نیگارکیشی تارادەیەك ناڕەوایەکی مام ناوەندی یە[٥٣] ـ بەڵام هەمان ناوەڕۆکی ناوی [پادشاهان] خۆی ئەم قسەی ئێمەیە ئەسەلمێنێ[٥٤] •

کۆتایی رۆژگارو سەردەمی سەڵتەنەتی پادشایانی گوتی چۆن بەراورد ئەکرێ ؟ دانشمەندانی ئەوروپای رۆژئاوا ئەم شتە بەم جۆرە لێك ئەدەنەوە کە گوتیەکان هەمیشە سەرگەرمی شەڕۆ شۆرو بگرەو بەردە بون ، وە پادشایانی ئەوان پادشایەتیان بۆ نەکراوەو لەناو چون • بەڵام ئەگەر وابێت چۆن توانیویانە ٩١ ساڵ حوکمڕانی کیشوەرێك بکەن کە لەو رۆژگارەدا لە روی ئابوریەوە لە پلەیەکی باڵاو کامڵدا بووە ـ واتا کیشوەری سۆمەرو ئاکاد ـ وە لە دواییدا لەناو بچن (؟)[٥٥] •

جگە لەمانە [وەك• شیلیکو] ئەوەی سەلماندوە[٥٦] کە فەرمانڕەوایی گۆتیەکان زۆر بەهێز بوە ، فەرماندەکانی وڵاتی سومەر باجو خەرجی گرانیان بۆ ئەناردن ، وە لە هەمان کاتا لە سەرانسەری کیشوەردا ئارامی حوکمی ئەکرد • کەوابو ماوەی کەمی سەڵتەنەتی پادشایانی گوتی ناتوانین بەهۆی جەنگو بگرەو بەردەوە دابنێین • ئەمەمان لەبیر نەچێ کە ئەم سەڵتەنەتە کورتانە لە پادشایانی دوەمەوە تا حەوتەم هەریەکەیان شەش ساڵ حوکمیان کردوە [جگە لە ـ ئینمابا کش ـ کە بەر لەتەواو کردنی ماوەکەی خۆی مردوە] دوایی [یارلاگاب] هاتوە کە ١٥ سال سەڵتەنەتی بەدەستەوە بوە ، وە دوای ئەوە لەپادشای نۆیەمەوە تاکو دوازدەهەم هەریەکە زیاتر لە سێ ساڵ سەڵتەنەتیان نەکردوە ، وە لە پادشای سیازدەهەمەوە تاکو شازدەهەم هەریەکەیان کەمتر لە دوساڵ وە لە حەڤدەهەمەوە تاکو نۆزدەهەم هەریەکەیان

حەوت ساڵ [جگە لە هەندێك لەوانە كـە كەمتر لـەو ماوەيـە سەڵتەنەتيان كردوە ، وە رەنگ بێ بەر لەو ماوەيە مردبن وەيان لەشەڕا كوژرابن] •

وا دێتە بەرچاو كە ئەم ماوەيانە رێكەوت نيە ، ئەگەر واى دابنێين كـە پادشايان وەيان بـە وتەيەكى راستر – سەركردە لەشكريەكانى گۆتيەكان – هەروەكو لەناو كۆمەڵە كۆچەريەكانا بو بـە نەريت بۆ ماوەيەكى دياريكراو هەڵ ئەبژێردران ، بـەم هۆيـە بوە كـە [هۆزەكانى گوتى پادشايان نەبوە] ناوبردنى پادشايانى ئەوان ، واتا ئەو سەركردە هەڵبژێردراوانە ، لێهاتوو بە نوانا بون ، تەنانەت لەوانەيە ئەو نوشوستيانەى كـە لە سەردەمى سەڵتەنەتى خۆيانا بويانەو بەسەريانا هاتوە لـە ئەنجامى شەڕى ناوخۆيى خۆيانو لێدەو بگرەو بەردەى خۆيان بو بێت ، ماوەى كۆچەرەكان شەش ساڵ بوە [ئەگـەر ئيمتا » ، « شا » يەكـەمجار تەنيا سێ سـاڵ سـەڵتەنەتى كردبێ – لەوە ئەچێ – لەبەر ئەوە بوبێت كـە لە يەكەمين سـاڵى پادشايەتى خۆيەوە بـە سوڵتانى بين‌النهـرين ناو ئەبرا](٥٧) • دوايى [يارلاگاب] هـەشتەمين پادشا زۆر تێكۆشاوە كە درێژە بە سەردەمى حوكمڕانى خۆى بداتو كـەس لـە جێگاى دانەنيشێت ، وە ماوەى پازدە ساڵ پادشايى كرد • دوايى نەك دەستيان كردەوە بە هەمان هەڵبژاردنى پيشەوا [بۆ ماوەيەكى دياريكراو] بەڵكو ماوەى فەرمانڕەواييەكەى ئەويان يەكەمجار بە سێ ساڵ دانا ، وە دوايى دو ساڵيان لێ كەم كردەوە •

سوڵتانەكانى زنجيرەى سێيەمى گۆتيەكان وەكو ئاكاديەكان دەرچون(٥٨) سەركردەو پياو گەورەى هۆزەكانى گوتى لـەو سەردەمەدا لەگەل سۆمەرىو ئاكاديەكانا تێكـەڵ بونو جۆشيان لـەگـەڵا خواردن ، دەسـەڵاتى پێشەوايانى گوتيەكان لە واقيعدا وردە وردە بەشێوەى دەسـەڵاتداريەكى سـەڵتەنەتى يان لێ هات ، ئايا درێژە دانى ماوەى حوكمڕانى دواپادشاى ئەوان پەيوەندى بەم روداوەوە نابێت ؟

بەڵگەیەکی تر کە لەگەڵ بەراورد کردنەکەمانا ئەگونجێ ، لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا وە بە تایبەتی لەو سەردەمە زۆر کۆنەدا ، کە هەر ناوێك کۆمەڵێك بوە لە ستایشی ناودارێك وە یان باوکی ئەو – بەرێکەوت ناوی دوبارە کـراوەمان دێتە بەر – بە تایبەتی ناوێك لەناو چەند بنەماڵەیەكو چـەند هۆزێکدا دوبارە نەبۆتەوە ، [بەڵام پادشایانی گوتی بە پێچەوانەی هەمو پادشاکانی ترەوە کە لە ناوەڕۆکی ناوی پادشایانی سومەریەکانا هەیە وە لە یەکتر ئەچن ، ئەمان لـەو ناوەڕۆکەدا هێچیان لـە هێچیان ناچن] • بەم جۆرە دوبارە کردنـەوەی ناوی ئەوان لەوە ئەچێ هۆی ئەوە بووبێت کە هەمان کەسی دیاریکراو جارێکی تر هەڵیان بژاردبێتەوە بۆ پێشەوایی ، لەو بابەتەن :ـ ئینگشوش[٥٩] [ژمارە ٢ لە دوای ٢٣ سـاڵ ژمـارە ٧] و « یارلاگاب »[٦٠] [ ژمـارەکانی ٨ و١٠ ] و [هابیلکین][٦١] (ژمارەکانی ١٢ و١٦) •

ئەڵبەتە ئەوەی کە وتراوە جگە لەباسو بەراورد کردنو بیرورا بەو لاوە هیچی تر نیە ، بەڵام پادشایانی گوتی چونکە هەمیشە سەرگەرمی شەڕو شورو بگرەو بەردە بون لەو ماوە کەمانەدا چون بەرێكو پێکی توانیویانە سەڵتەنەت بکەن ؟ ئەمەش دیسان جێگای سەرنجە • هەرچۆن بێ بیرورای دوایی لەگەڵ جەرهەری روداوەکانا زیادو کەمی هەیە •

گوتیەکان لـە بارەی نژادەوە لە چ کۆمـەڵێك بون ؟ بـە پێی ئـەو زانیاریانەی کـە بـە زمـانـەکانی کـۆنی ڕۆژهـەڵاتـەوە زانراوە ناتـوانین نوسراوەکانیان بە وردی لێك بدەینەوەو بـەراوردیان بکـەین ، پێشتر ئـەو نوسراوانەیان بە بەشێك لـە ناوی هۆرینەکان دائەنا ، بـەڵام ئیستا تارادەیەك قەوارەو ئورگانی دەستوری زمانی هوریانیمان بۆ رون بۆتـەوە ، وە کـەمو زۆریك شارەزای زمانەکەیان بونو ناوی تایبـەتی ناو زمانەکـەیان بە باش ئەزانین ، ئەتوانین بە تەواوی بڵێین کـە نامەو نوسراوە گوتیەکان بە هاوکاری زمانی هۆریانی ناتوانرێ لێك بدرێتەوە •

پێویسته پیتی « ای I » که له سەرەتای ناوەکانەوە هەیە وە دوایی پاشگری [ آب ـ آپ ab/p ] وە ش s که وشه بەمه کۆتایی یەت سەرنج بدەین ، ئەم پاشگرەی دوایی له هەزارەی دووەم‌و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایینی لەناوە جوگرافیایەکانی ناوچـە کوێستانیەکانی زاگروس [ ناوچەی سێ تا پێنجی نـەخشەکەی خۆمان ] واتا لـە خـاکی مـادەرزادی گۆتیەکاندا زۆر جار بەکار هێنراوە[٦٢] سومـەری‌و ئاکادی‌یەکان زۆر بـە نارەحەت فێری زمانی گۆتیەکان ئەبون ، ئینجا لەبەر ئەمە ئـەو نوسراوانەی کـە بـە زمانی گوتی نوسراونەتـەوە بـەزۆر شێوەو جۆر لێك دراونەتەوەو نوسراوانەتەوە ٠ ئەمە جیایی شێوەی ئەو زمانە ئەسەلمێنێ ٠

بەڵام زمانی گوتی زمانێکی سەربەخۆو خاوەن رێزمان بوە ، هەروەکو وتمـان لـەوە ئـەچێت تارادەیەك لـەگـەل زمانەکانی کۆمـەڵە عیلامیـەکانا لەسەرانسەری ناوچـەی زاگروس [ عیـلامی‌و کاسی‌و لولوبی‌و رەنگ بـێ کاسپی‌یەکانیش ] دا پەیوەندی بوبێت ٠ لەلایەکی ترەوە شێوەی بەکار هێنانی زمانی گوتی پیچاو پیچ ـ که لەوە ئەچێ وا بوبێت ـ بەرامبـەر بـە دەنگی سادەو رەوانی عیلامی لەوە ئەچێ نیشانەی نزیکی زمـانی گوتی بیت لـەگەل زمانەکانی ترا ٠ ئـەو زمانانەی لـەم دواییەدا باسمان کردن بریتی بون لـە هوریانی‌و زمانی بومی ئالبانی[٦٣] ٠

[ ز ٠ ای ٠ یامپولسکی ] لەم بارەیەوە بیروڕای خۆی بۆ نوسەری ئـەم کتێبە باس کردوە که ناوی گۆتیـەکان هـەمان ناونیشانی نژادی‌یە کـە لـە سەرچاوەی زمانە زۆر دواکەوتوەکانەوە بە شێوەی [ئوتیان]وە [ئوئیتیان][٦٤] وە [ئودیان] وە [ئودینیان] وە [ئاتیان] دروست بوە ٠ هـەروەها وەکو ئـەو ئەڵێت ناوێکە که ئالبانەکان خۆیان بەو ناوەوە ناو نابو ٠ کاتێك ئـەم قسەیە ئەسەلمێندرێ هیچ نەبێ نیشانەیەکی بەم جۆرە بەدەستەوە هـەبێ کـە نزیکی ئالبانی‌و گۆتیەکان باس بکات ٠

**میژوی سەرکەوتنی گوتیەکان بین‌النهرین وەکو لای خوارەوە باس ئەکەین :**

وەکو وتمان لە سەردەمی دەسەلاتداریتی [نارام – سوئن]دا گۆتیەکان ئاکادیەکانیان شکاند ، وە لەو رۆژگارەدا [ئانریداوازیر] پێشەوای گۆتیەکان گوایا بە شێوەیەکی کاتی لە بین‌النهرین دا فەرمانی ئەکرد • وا دێتە بەرچاو کە [نارام – سوئن] لە شەردا کوژراوە [٢٢٠١ – ٢٢٠٢ پێش زاینی][٦٥] دوا جار شەڕو شۆر لە ماوەی فەرمانڕەوایی [شارکالی شاری] [٢٢٠١ تا ٢١٧٧ پێش زاینی]وە چەند کەس لە سەرکردەکانی گوتی بەناوی [ئیمتا] (؟) وە [ئینگە شائوش] وە [سارلاگاپ] وە [یارلاگاش] وە [ئیلولومش] حوکمیان کردوە • ئەگەرچی [سارلاگاب] بەدیل گیرا بەلام [ئیلولومش] [لە ٢١٧٨ تا ٢١٧٣ی پێش‌زاینی] وە جێ نشینەکانی خۆی [ ئینی ماباکش ] وە [ ئینگەشائوش ] [ئینگەشائوش دووەم – یان خۆ جاری دووەم هەلبژێردراوەتەوە] ئەمانە توانیان دەسەلاتی گۆتیەکان لە ناوچەی بین‌النهرین‌دا بچەسپێنن •

ئوتوهیگال یان [ئوتوخگال] پادشای شاری [ئوروك]و دوژمنی بێ بەزەیی گۆتیەکان لە دوایدا لە نوسراوەکەی خۆیدا[٦٦] گۆتیەکان بە [مارگەستە کوێستانیەکان‌و بێ‌بەش لە بەزەیی خوا ناو ئەنێ کە سەلتەنەتی سومەریەکانیان گوێزاوەتەوە بۆ کوێستان وە هەمو سەرانسەری ولاتی سومەریان پڕ کردوە لە رقەبەرایەتی‌و دوژمنی نانەوە ، ژنیان لە مێردو کوڕیان لە دایك‌و باوك کردوەو بونەتە هۆی زۆرو ستەم‌و کەم باوەڕی‌و دوژمنایەتی کردنی یەکتر لەسەرانسەری کیشوەردا[٦٨] مانای ئەم قسانە کە گۆتیەکان [تالانی‌و دەستدرێژی‌و ستەمیان] لە بین النهرین‌دا دامەزراندوە ، جگە لەوە کە ئەوان هەندێك لە خەلکی ئەو ناوچەیانە لە دژی هەندێکی تریان هانداوە شتێکی تر یە [واتا چینێك لە دژی چینێکی تر] • ئەمە زۆر لە راست ئەچێ • چونکە زانیویتی کە لە نیوەی دووەمی سەلتەنەتی زنجیرەی ئاکادیەکانا شیرازەی حوکمی ولات لە هەمو رویەکەوە کرژ بوبو ، وە هەمو خەلك دوچاری

گیروگرفتو چەوساندنەوەی پادشاکان بون • سەرانسەری مێژوی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی زنجیرەی ئاکادیەکان پڕە لەو شەڕو شۆڕانە لە سەرەتاوە بوە هۆی تێکشکانی بەربەرەکانێی گەورە ناوچەیەکانی [شارو ـ دەوڵەتەکان]ی پێشین ، بەڵام لە دواییدا وردە وردە هەمو دانیشتوانی شارەکانی گرتەوە(٦٩) •

زۆر لەوە ئەچێ کە بەم جۆرە خەڵکی ستەمدیدەی کیشوەری ئاکاد سودیان لە پەلاماردانی گۆتیەکان وەرگرتبێ‌و هەوڵیان بۆ ئازادی خۆیان دابێت • هەروەکو زانراوە لەبەر ئەوەی کە بیرو باوەڕی چینایەتی نەبوە بەرنامەیەکی شورشگیرانەیان نەبوە •

بەم جۆرە لەوە ئەچێ سەرکەوتنی گۆتیەکان لەپلەی یەکەمدا ئازادی بەخش بووە • بەڵام ناوچەی بین‌النهرین لە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی نایبەتیا ئەژیان •

بەبێ لایەنیانە سەیری مەسەلەکە بکەین ، یەکیتی سەرانسەر ناوچەی بین‌النهرین کە لەژێر دەسەڵاتی ستەمکاری‌و چەوسێنەرەوانەی دەوڵەتێکی کۆیلە پەرستی زنجیرەی ئاکادیدا بو ، حەزی بە سەرکەوتن‌و پێشکەوتنی ئازادی ئەکرد(٧٠) ؛ وە ئەیانویست سیستەمێکی ئاودێری یەگرتوو هێزێکی بەتەکان‌و بەدەسەڵات پێکەوە بنێن‌و هێزی بەرهەمدەر پێش بخەن •• وە روخاندنی ئەم دەوڵەتە ئەو ڕێبازگەیە گۆڕی ، بەم هۆیەوە ئەگەر ڕاپەڕینی ئازادیخوازانە بە سەرۆکایەتی گۆتیەکان ببوایە ـ لەوە نەئەچو ڕاپەڕینێکی ئاوا ئەنجامێکی چەسپاوی لێ رو بدابایە •• ئاشکرایە مەرجی پێویستی روخانی یاسای کۆیلەیی [عبودیەت] نەبو •

لە ئەنجامدا دەرکەوت کە پەلاماری گۆتیەکان بوو بە هۆی وێرانکاری ناوچەی بین‌النهرین وە تاڵان‌و هەژاری بوو بە توشی دانیشتوانی ناوچەکەوە •• شارەکانی [ئاکاد] و [ئاکشاگ] و [خورساگ کالاما] و [در] و [نپور] و [ئاداب] و [ئوروك] و [لاراك] وێران بون ، وە پەرستگاکان‌و ئەو وەقفانەی

سەر بە پەرستسگاکان بون وێران کران[٧١] ، سەرکردەو سەرۆك هۆزەکانی گوتی بەهیچ جۆرێك هەوڵی ئازادیو خۆشگوزەرانی تەواوی خەڵکەکانی بین‌النهرینیان نەئەدا ، تەنیا ئەیانویست لەو کیشوەرەدا هێزو دەسەڵات لەدەست سۆمەریو ئاکادیەکان وەر بگرنو خۆیان بنە جێ نشینی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی بکەن ، وە لە جیاتی پادشا ستەمگەرەکانی ئاکاد پادشایانی خۆیان لەسەر تەخت دابنێن ، دیمان کە [ئانریداوازیر] هەوڵی دا چاو لە [نارام ـ سوئن] بکات وە نازناوی ئەوی لە خۆی نا ، هەروەکو پادشایانی سومەرو ئاکاد ـ پێشینانی خۆی ـ لە پەرستسگاکانی سۆمەرو لەوحە نوسراوەکانی دانا . [لائراب] پێشەوای گوتی ئەویش هەندێك نوسراوەی شاهانەی خۆی بەجێ هێشت[٧٢] . [یارلاگاب] حەوتەمین پادشای گۆتیەکان رەنگ بێ تێکۆشا بێت تا ماوەی ژیانی سەڵتەنەتی هەر بەدەستەمی بمێنێت . گەورە پیاوانی گوتی لە زنجیرەی دووەم بەدواوە کورەکانی خۆیان بە ناوی ئاکادی ناوئەنا . خەرجو باجێکی زۆریان خستە پێی خەڵك[٧٣] ژیانی ئەو خەڵکەیان گیرایەوە بۆ دۆخو سەردەمی ئاکادەکانو خراپتریش ، بەم جۆرە دەسەڵاتی پادشایانی گوتی بە تەواوی لەناو کۆمەڵانی خەڵکیدا نەئەگونجاو لایەنگیریان نەئەکراو بە بارێکی گران تەماشایان ئەکرا .

شێوەی بەڕێوە بردنی [ ئیدارە ]ی کیشوەر کە لە لایەن پادشایانی گوتیەوە دائەنرا زۆرتر یارمەتی ئەم باری ژیانە تازەیە ئەدا . لەناو گوتیەکانا ئەو کەسانەی کەلێ هاتوو شارەزا بونو کاریان‌پێ ئەسپاردن نەیانتوانی ئیشو کاری دەوڵەت بە باشی بەرێوە بەرن ، لە دەوڵەتی سومەرو ئاکاددا نەبون ، لەبەر ئەمە پادشایانی گوتی ئیدارەو بەڕێوە بردنی کیشوەرەکەیان بەرامبەر بە باجو خەراج دایەوە بە پیاوە گەورەکانی ناوچەکە . لەژێر دەسەڵاتی گوتیەکانا چەند زنجیرەیەکی جۆربەجۆری ناوچەیی پەیدا بو .

له ئاكـاد پادشایانی خوی‌و ناوچـه‌یی « دودو » وه « شو – دورول » هه‌روه‌كو پێشو سه‌ڵته‌نه‌تیان ئه‌كرد • [له ۲۱۷۲ تا ۲۱۳۷ ی پێش زاینی] ، دوای ئه‌مانه‌ش زنجیره‌یه‌ك له خوارووـ له [ئوروك] دامه‌زرا • [له ۲۱٤۲ تا ۲۱۰۸ ی پێش زاینی] شاری [لاگاش] لـه‌و سـه‌رده‌مه‌دا بوو بـه یه‌كـه‌مین شانشین ولاتی سۆمه‌ر • شوێنه‌واری ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی [لاگاش] كـه ماوه‌ته‌وه زۆر وه زۆر یارمه‌تی میژونوسان ئه‌دات • سـه‌ره‌تای رۆژگاری تازه‌ی باری سیاسی [لاگاش] رێكه‌وتی سه‌رده‌می [ئانسی] [ PA-TE-SI ] [ ئـور – بائو ] یان [ئور – بابا] بووه ، كه له‌وه ئـه‌چێ هاوچه‌رخی سه‌رده‌می لـه‌ناو چونی یه‌كجاره‌كی ئاكاد بو بیت له دوای [شودورول] • [ئوربائو] په‌رستگای زۆری له [لاگاش] دروسـت كرد ، وه لـه‌وه ئـه‌چێ سـولتانێكی گـه‌وره‌و ده‌وڵه‌مه‌ندو به‌ده‌سه‌لات بو بێت • وا گومان ئه‌برێ كـه ئه‌و له‌ژێر فه‌رمان‌و رابه‌ری گوتیه‌كانا ده‌سه‌لاتی خۆی به‌سه‌ر ولاتی سومه‌ردا سه‌پاندبێ •

له دوای مردنی [ ئوربائو ] ده‌سه‌لات له [ لاگاش ] كـه‌وته ده‌سـت [كوده‌ئا]ی زاوای ، ئه‌ویش ماوه‌یه‌كی درێژ سه‌ڵته‌نه‌تی كرد(۷٥) بـه ته‌واوی حوكمی به‌شی زۆری بین‌النهرینی ئه‌كرد • ئه‌و نـه‌ك ته‌نیـا ناز ناوی [ ئینسی لاگاش ]ی بۆ خۆی دانا به‌ڵكو خۆی به [شوانێكی ره‌ووشت جوان نه پادشای كیشوه‌ر] ناو نا • وه له هه‌مان كاتا هه‌روه‌كو – [وه‌ك• شیلیكو] به رویـه‌كی گه‌شه‌وه به ئه‌نجامی گه‌یاندوه‌و(۷٦) سه‌لماندویتی – ئه‌و پادشایه‌كی سه‌ربه‌خۆ نه‌بوه به‌ڵكو خه‌رج گوزاری گوتیه‌كان بووه • به‌م جۆره نه‌ك هه‌ر ته‌نیا لـه [لاگاش](۷۷) به‌ڵكو له [ئور]یش كـه‌لێك ساختومانی گـه‌وره‌و بایـه‌خداری كردوه ، له عیلام كرێكارو له كه‌ناری خه‌لیجی عه‌ره‌بی‌و بـه‌شی ناوه‌راستی فورات‌و ژوروی سوریه كه‌ره‌سه‌ی بیناسازی هێنا • ئه‌مه خۆی ئه‌وه ئه‌گه‌یه‌نێ كـه زۆر بـه ده‌سـه‌لات بوه ، وه لـه سه‌رزه‌مینێكی زۆر فراواندا فـه‌رمانی ئه‌رۆیشت ، وه له كیشوه‌ره‌كه‌دا ئارامی به ته‌واوی جێگیر بوبو •



پەیکەری سەرێك ـ وێنەی پادشای گۆتیەکان (؟) لە حەوجۆش دروستکراوە ، دەستکری ئاکادی یان عیلامیەکانە لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا (؟)



پەیکەری سەرێك لە حەوجۆش دروستکراوە - زۆر کۆنە ٠
لە سلماس دۆزراوەتەوە (؟) نازانرێ هینی چ سەردەمێکە

باس کردنی ئەم باسە تەنیا لە بارەی تواناو دەسەڵاتەوەیە [گودیا] وە نەبێ تەنیا سەربە گوتیەکان بوبیت بەڵکو بە تەواوی حاکمێکی دەست نیشاندەی ئەوان بوە لە ناوچەی بین‌النهرین‌دا • ئەم باسەکانی [ئور - بائو] و [ناماخانی] جێ نشین [گودیا] [کە ئەویش زاوای - ئور - بائو - بو] سەلمێندراوە •

لە دوای ئەم سەردەمە فەرمانو دەسەڵاتی بین‌النهرین لە دەست سوڵتانەکانی [لاگاش] دەرچو ، بەو جۆرەی - کە دیمان - گوتیەکان شێوەی ئیدارەو بەڕێوەبردنی کیشوەرەکەیان بە هۆی گەورەکانی ناوخۆوە نەگۆڕی، گوتیەکان تا تەواو بونی کار سەرپەرشتی خواروی بین النهرین‌یان ئەکرد • نوسراوێکی [ئوما] کە دراوسێی [لاگاش] بووە دەست کەوتوە کە مێژوی سەڵتەنەتی [سیوما] نۆزدەهەمین پادشای گوتی پێوەیە(۷۸) •

«ئوتوخگال» پادشای شاری [ئوروك](۷۹) دەسەڵاتی گوتیەکانی لەناو برد ، دو پارچە نوسراوەی رونوسی نوسراوەکانی ئەو لە شەڕێ لەگەل گوتیەکانا ئەگێرنەوە(۸۰) سەرپێچی‌و دەرچونی [ئوتوخگال] لە سەردەمی ئاڵوگۆڕ کردنی پادشایانی گۆتی دەستی پێ کرد • [بە پێی ئەو باس‌و روداوە کۆنانە کە لەناوەڕۆکی پادشایانی سومەریدا دەر ئەکەوێ دواین فەرمانفەرمای گوتی کە ناوی «تیریکان» بوە تەنیا ٤٠ روژ سەڵتەنەتی کردوە] •زەبروزەنگی پادشایانی گوتی خەڵکی سۆمەریان زۆر بێزارو قین لەدڵ کردبو [ئوتوخگال] لەلایەن هەمو کۆمەڵانی خەڵکەوە پشتیوانیان ئەکرد ، ئەو لەشکرانەی کە لە دژی [ئوتوخگال] کەوتبونە شەڕەوە ئەو شەڕکەرە ئارەزو خوازانە بون کە لەناو هۆزەکانەوە کۆبوبونەوەو هاتبوون‌و لەگەل [نارام - سوئن]دا شەڕیان ئەکرد •

لەو کاتەدا هەندێك پیاو گەورەی سومەری‌و ئاکادی سەرکردایەتی لەشکری گوتیەکانیان ئەکرد وەکو [نەبی ئەنلیل]ی ئاکادی‌و [ئور- نینازو]ی سومەری - ئەوانە رەنگە لە ئەمیران‌و پیاوەگەورەکانی ژوروو خواروی بین

النهرین بوبن که لەژێر چاودێری گوتیەکانو لەسەر ڕێکەوتی ئەمیرانی [لاگاش] حوکمی کیشوەرەکەیان ئەکرد • گومانی‌تیا نیە کە لەناو ئەو لەشکرە باسکراوەدا چەند دەستەو تاقمێکی تایبەتی سەر بە گوتیەکان هەبووە • ئەو کارەی کە یەکەمین سەرکردەکانی گوتیەکان بە ئەنجامیان گەیاند واتا کۆ کردنەوەی کۆمەلانی خەلکی هۆزەکان بە مەبەستی فەرمانڕەوایی کردنی ناوچەی بین‌النهرین ، بە تەواوی ئەوە ئاسان تر بو کە ئەو کۆمەلە بۆ پارێزگاری کردنی زەویە داگیرکراوەکانی تر کۆ بکرێنەوە • بە تایبەتی کە دەرامەتی ئەو زەوی‌وزارانە هینی ئەندامە وردەکانی عەشیرەتی گوتی نەبون ، بەم هۆیەوە شەڕو شۆری [ئوتوخگال]و [تیریکان] کە دو لەشکری چەکداری بەرامبەر بە یەکیان بەدەستەوە بو دەستی پێ‌کرد • بەلام ئەوانەی لایەنگیری [ ئوتوخگال ]یان ئەکرد بەگیانو دل ئیشیان ئەکرد لە دژی زۆردارانی ناوچەییو بێگانە خۆیان پرچەك کردبو • لەو شەڕەدا کە لە سالی ٢١٠٩ی پێش زاینیدا دەستی پێ‌کرد [ئوتوخگال] زۆر بە ئاسانی سەرکەوت • [تیریکان] لە مەیدانی شەڕدا رای کردو زۆر هەولی دا لە ئاوایی [دوبروم] خۆی بشارێتەوە بەلام خەلکی ئاوایی گرتیانو دایان بەدەست [ ئوتوخگال ]ەوەو کوشتیان •

بەم جۆرە [ئوتوخگال] سەلتەنەتی سومەرو ئاکادی زیندو کردەوە بەلام هەمو ئەو خەلکانەی کە یارمەتی ئەویان دابو سودیان لە بەروبومی ئەو سەرکەوتنە وەرنەگرت ، نەختێك لەو سەرکەوتنە بەسەر [ تیریکان ]دا تێ نەپەڕی [ لە سالی ٢١٠٨ی پێش زاینی ] کە ئوتوخگال خنکاو دەسەلاتی فەرمانڕەوایی لە بین‌النهرین کەوتە دەست [ئور - نامو]ی حاکمی [ئور]و دامەزرێنەری سێیەمین زنجیرەی [ئور] ، ئەم زنجیرەیە بە شێوەیەکی زۆر ستەمگەرانەو بێ رەحمانە حوکمی ولاتیان ئەکردو خێرو خۆشیان لە خەلکی ئەو ناوچەیە تال کرد •

ئاشكرایه كه پێشكەوتنی گوتیەكان لە دوای گرتنی بین‌النهرین ستەم بو شتێكی پایەدار تر پەیدا بێت ، پێشەوایانی گوتی‌و سەرۆك هۆزەكان ، هەندێك خەڵكی هۆزەكانیان تێ خرۆشان‌و هێنانیانە جوڵە ، لـە سـەرەتاوە پێشكەوتنی گوتیەكان هۆی ئەوە بو كە خەڵكی ناوچەی بین‌النهرین بە تەواوی پشتیوانیان لێ ئەكردن ، بەڵام ئەوە دەركەوت كـە سەركردەكانی گوتی لە دواییدا هەر خەریكی سامان كۆ كردنەوەو خۆ دەوڵەمەند كردن بون ، وە دەستیان كرد بە تاڵانكردنی شارەكانی ناوچەی بین‌النهرین ، پیاو گـەورانی هۆزەكانی گوتی دەمودەس لەگەل دەسەڵاتدارەكانی سومەرو ئاكادا یەكیان گرت‌و رێكەوتن وە هەمو خەڵكی ناوچە یەیان هێنایە ژێر ركێفی ستەمگەرانەی خۆیانەوە •وە بە پێچەوانەی سودی زوربەی خەڵكی هۆزەكانی گوتیەوە كەوتنە گزی [خیانەت] كردن ، وە بونە هۆی توڕەبون‌و بێزار بونی كۆمەڵانی خەڵك • لە ئەنجامدا گوتیەكان چون بۆ كێوەكانی ئازربایجانی ئیستای ئێران‌و زیانێكی زۆریان لێ كەوت •• وە هەروەها نزیكەی سـەردەمی سـەد ساڵەی فەرمانڕەوایان لـە ناوچـەی بین‌النهرین تـەنیـا ژیان‌و كات بردنـە سـەربو ، وە هیچ جـۆرە گۆڕانێكیان لە ژیانی كۆمەڵایەتی خـەڵكی ئـەو ناوچەیەدا پێك نەهێناو هیچ ئیسلاحاتێكی كۆمەڵایەتیان نـەكرد • ئـەو پیاوە گـەورانەی گوتیەكان كـە دەوڵەمەند بوبون ئەوانیش بە هۆی سەركەوتنی دوژمنەكانیانەوە نابودو لەناو چون • گوتیەكان لەو سەركەوتنەیانا زیاد لـە سامان‌و ماڵ كۆ كردنەوە هیچ دەسكەوتێكی تریان بـەدەست نەهێنا وە بـەم هۆیـەوە لـە دوای تێك چونی دەسەڵاتیان زۆریان پێ نـەچو ئـەو سـامـان‌و ماڵـەش كـە كۆیان كردبۆوە لەناو چون •

هەندێك شوێنەواری هونەری بـەدەستەوەیە كـە ئـەتوانین بڵێین هینی سەردەمی فەرمانفەرمایی گوتیەكانە كـە لـەناوچەی بین‌النهرین دا حوكمیان ئەكرد • بێگومان لەناو ئەو شوێنەوارانەدا پەیكەرێكی [لاگاش]ی سـەردەمی

[گودەئا] [کە دەسەڵاتی پلەی هونەری سەردەمی ئاکادەکانی تیا بەدی ئەکرێو سەرکەوتنەکانی سومەرىو ئاکادیەکان ئەنوێنێ] یەکێکە لەو شوێنەوارە گرنگانە •

ئیستا لەم کاتەدا نامانەوێ لە نوسراوو شوێنە نوسراویەکانی سومەرىو ئاکادی بکۆڵینەوە ، بەڵام بەکورتی ئەوانەیان کە پەیوەندی بەباس‌و بەسەرهاتی گوتیەکانەوەیە پەنجەیان بۆ رائەکێشین •

بۆ ئەوەی میژوی پێشهاتەکەمان راست دەرچێ(٨١) بێگومان پەیکەری کەللە سەرێك کە بەرێکەوت لە نزیکی هەمەددان ــ لە سەرزەمینی ماد ــ دۆزراوەتەوەو دوا جار براوە بۆ مۆزەخانەی [برمرگلری] ئەمەریکا لە نیویورك ، ئەمە لە نێوان شوێنەوارە کانا جێگایەکی تایبەتی هەیە • بە بیروڕای زوربە ئەو پەیکەرە ناوبراوە کە بەرای ئیمە کەللە سەری یەکێکە لە پادشایانی گوتی ، یەکێك لە مامۆستایانی ئاکادی یان عیلامی دروستی کردوە ، وە یان دەسکردی وەستایەکە کە زۆر ئاشنای ئاکادیەکان بووەو زۆر شارەزایان بوە، چونکە لە هەمو رویەکی هونەریەوە تەواو بووە ، بەرای ئێمە شوێنەواری [ئەم پەیکەرە] لەناو پەیکەرەکانی بین‌النهرین دا لە نیوەی دوەمی هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا شوێنێکی تایبەتی‌و بەرزی هەیە • پەیکەری کەللە سەری [ برمرگلری ] وە سەری پادشای ئاکاد لە [نەینەوا] وەیان بڵێین [سەری سارگونی کون] وە پەیکەری سەردەمی [گودەئا] بەشێکن لەو کۆمەڵە پەیکەرە بچکۆلانەی ئاسیای رۆژئاوای کۆن • هەروەکو زانراوە هونەری ناوبراو لە دوای ئەوە دەسەڵاتی زۆرداری دەستی پێ‌کرد لە رۆژهەڵاتی کۆندا ئیتر پێش نەکەوت •

پەیکەری پیاوێکی بەردین کە دۆزراوەتەوە ئەوە نیشان ئەدات ئەو پەیکەرە لەروی نژادەوە لە مرۆڤێك ئەچێ کە ئیستاش لە کێوەکانی زاگروس‌دا ئەژین(٨٢) مێزەرێکی گەورەیان لەسەرناوە کە نەختێك لە مێزەری عیلامیەکان ئەچێ(٨٣) وە لە ژێر ئەوەدا دەستەیەك موو دیارە •

چاوەکانی بادامیە [لە سەردەمی کۆندا لە مادەیەکی تری جیا لە مادەکەی خۆی دروست کراوە خراوەتە جێگای چاوەکانیەوە] روی پانو گردە ، هەمو نیشانەکانی پیاوێکی تیا دیارە ، ئەم پەیکەرە بەنمونەیەکی هونەری پێشکەوتوی رۆژگاری رۆژهەڵاتی کۆن دائەنرێت • هەروەها لە نەخشی روی بەردەکەی [شیخ خان] لە بەشی سەروی روباری دیالە دیسان نمونەیەکی ئەم نژادە کراوە بە پەیکەر •

[ا•ت•ئامی][٨٤] ئادەم شوناسی فەرەنسایی ئەو پەیکەرە لەگەل ئەو تیپە مرۆڤانەی ئیستا کە لەنێوان ئازربایجانیەکانی ناوچەی [شوشە] ئەبیندرێن بەراورد ئەکاتو بەیەك نژادیان ئەزانێت • ئەم تیپە مرۆڤانە لەنێوان [کاسیت]ەکانو کوێستان نشینەکانی تری زاگروس‌دا زۆر بون[٨٥] •

ئەو نەخشە هەڵکەندراوە رواڵەتی پیاوێك نیشان ئەدا کە سەرتا بەدامان خۆی داپۆشیوەو مێزەرێکی وەکو [کلاوی بابلیەکان]ی لە سەردایەو مل پێچێکی لەملی ئالاندووەو تەورزینێکی کردوە بە پشتێنەکەیا ، کەمانێکی بە دەستی چەپی گرتوەو بەدەستی راستیشی خەریکە تیر لە تیردانەکەی [نەرکەش] دەرئەهێنێ (؟) پێی ناوەتە سەر روی دوژمنەکەیو دوژمنەکەی تری لەبەرامبەریەوە دەستی پاڕاندنەوەی بەرز کردۆتەوەو داوای لێبوردنی لێ ئەکات • نوسراوێك لەم بارەیەوە لەروی نەخشەکەدا هەیە کە باسی لەشکرکەشی بۆ سەر کیشوەری [زابان] «؟» ئەکات ،وە ناوی ئەو کەسە ــ کە پەیکەرەکە هی ئەوە ــ ناوی [لی‌شیر ــ پیرئانی] یە • [کیشوەری زابان] لەسەر روباری زێی بچوکە لەنزیك [ئاڵتون کوپری] ئیستاوە • ناوی ئەو پیاوە ئەگەر ئیمە باشمان خوێندبێتەوە ــ ئاکادی یە[٨٦] لە لەوحەکەی [شیخ‌خان]دا دەر ئەکەوێ کە مامۆستای نیگارکێشو نەقاڕ زۆر دەست رەنگین نەبووە ، وێنەکە شێوەیەکی ناتەواوی هەیە ، هەرچون بێت ئەم پەیکەرە تارادەیەك شێوەی نژادەکە رون ئەکاتەوە ، ئەو نوسراوە لەوە ئەچێ

له دو هەزار ساڵ بەر لە زایینی‌یەوە کۆنتر نەبێ ـ وە بەرای زوربە ئەڵێن کۆنترە ـ خاوەنی ئەم وێنە کێشراوە هەڵکەندراوە نازناوی پادشایەتی نیە ،وە



**پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی ـ لێ‌شیر ـ پیرئانی]**
**لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایینی دا هەڵکەندراوە**

رەنگ بێ وەکو [گودەئا] ئەمیش سەرکردەیەکی سەربەخۆو یان یەکێك لە دەسەڵاتداران بوە • بە تەواوی ئەتوانین بڵێین خاوەنی ئەم نیگارە گوتی‌یە ، بە تایبەتی کە ناوی خاوەن نیگارەکە ناوێکی بیگانەیەو زمانی ئاکادی نیە ، هەرچەند بە ئاکادی لێك ئەدرێتەوە بەڵام هیچ پەیوەندیەکی بە ناوی تایبەتی ئاکادیەوە نیە •

لەوە ئەچێ دوەمین پەیکەری سەری [برمرگلری] ئەویش نمونەی هونەری گوتیەکان بێت[٨٧] •

شوێنەواری باس لێوەکراو ، ئەگەر دەسکردی گوتیەکان بێت ـ ئەوە نیشان ئەدات کە ئەوان زۆر تەقەللایان داوە کە هونەری خۆیان سەربەخۆ بکەن • وە سود لە مامۆستا نیگارکێشە نەقارەکانی سومەری‌و ئاکاد وەربگرن

ـ بەڵام لە نەخشەی گوتیەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینی یەك کۆمەڵی چینایەتی تەواو ـ کۆمەڵێك کە لەسەر ئەساسی چینەکان پێك هاتبێت ـ نەبو وە ئەوان لەناو چەرخو چوارچێوەی کۆمەڵگای چینایەتی بین‌النهرین‌دا نەگونجابون ، وەلە کێوەکانی زاگروسیشدا دیسان مەرجی پێویستی بونی کۆمەڵگایەکی بەم جۆرەیان تیا نەبو •

زانیاری تری ئێمە لەبارەی گوتیەکانەوە وە بە شێوەی گشتی لەبارەی هۆزەکانی دانیشتوی کێوەکانی زاگروسەوە بچڕ بچڕو ناتەواوە ، پادشایانی زنجیرەی سێیەمی [ئور] هەمیشە لەدامێنی کێوەکانی زاگروسەوە خەریکی شەڕو شۆڕبون ، مێژوی ئەم زنجیرەیەو زنجیرەکانی دوایش بەپێی [فورمولی مێژونوسان] ئەزانین : لەبەر ئەوە چونکە سەرەتای مێژوی تایبەتی لەبارەی ژماردنی ساڵەکانی مێژووەوە لە سۆمەرو ئاکاددا نەبووە ، دانانی مێژوی روداوەکان گرنگ بوە •

ناوی هەریەکە لەو روداوانە بە ساڵێك دانراوە کە روداوێکی گەورەی تیادا قەوماوە وەیان بەناوی ساڵێك لە دوای ئەو روداوەوە ، لە [فورمولی مێژونوسان] زنجیرەی سێیەمی «ئور» زوربەی بە لەشکرکەشی دژی [ئوربیلو] [ئاربل ـ کە ئێستا پێی ئەڵێن ئەربیل] ناونراوە • وە [سیموروم] بە قسەیەکی ر [زابان] کە ئێستا پێی ئەڵێن [ئاڵتون کوپری] وە لەسەر زێی بچوکە ،وە [شاشروم] یان [شا ـ ئاشوروم] [؟ ـ کە دوای ئاشور ئێستا بەقەڵای ـ شرگات (؟) ناونراوە] سەرنج ئەدەین • وە ئیتر لەشکر کەشی دژی [لولوبو] و [خارشی] [کیماش] و [خومورتی] و [گانخار][٨٨] کە زوربەیان لەشارەکانی هوریتی کوهپایە نشینەکانی دورە دەستی زاگروس بون ، قسەیان لێوە کراوە• شوێنی ناوچەی [لولوبو] ئێستا ئەزانین • [کیماش] لەوە ئەچێ لە نزیك کەرکوکی ئێستاوە [خومورتی] لە نێوان [کیماش]و [خارشی]دا بوبێت • ئەو ناوچەی ئەم دوایە باسمان کرد لەوە ئەچێ هەمان [کێوی خارسی] ئاشوری

بێت کە لـە سنوری ناوچـەی ٤ [جـەدوەلی میژوی جوگرافیایی خۆمـان]و [ئارستیا] ـ ی ئورارتو ـ یی [کە لـە نزیك «توز ـ خورماتلی» ئیستاوەیە] بوە • لەم ناوچەیە یان نەختێك نزیکتر بـە خـاکی ئاشور ئەبێ [زابشالی]و [خوخونوری]و ئەو شارانەی تر کە لەلایەن پادشایانی ئەم زنجیرەیەوە داگیر کرابون هاتوچویان کردوە[٨٩] •

لە کۆتایی سەردەمی دەسەلاتداریتی زنجیرەی سێیەمی [ئور] زوربـەی زەوی‌و زاری دەوروبەری روباری دجلەو ئـەو بـەری بەدەست [ ئانسی ] [حاکم ـ جێ نشینی][٩٠] شاری [لاگاش]ەوە بون • هەروەکو [ئاراد ـ نانار] جێ نشینی [لاگاش] لە سەردەمی پادشایی [شور ـ سوئن] «٢٠٤٦ ـ ٢٠٣٨ی پێش زاینی»و هەندێکی تر ناز ناویان بە [ئانسی] [سابوم][٩١]وە کیشـوەری گوتیـوم[٩٢] وە حاکـم [دیمات ئین لی‌لیـا]و [ئال ـ شو ـ سـین]وە [ئانسی] [خامازی]و [گانخار]و ئـەمیر [ئیشار]و هۆزی [سو] [سوباریان = هوریان]وە کیشوەری [گارداك]و هینی تر نرابون[٩٣] •

سەرچاوەکانی دال کـە لەبـەر ئەوەی لـەلایـەن دانیشتوانی ناوچـەی باسکراوەوە مـەترسیەك روی کردە بین‌النهرین کـە سولتانـەکانی زنجیرەی سێیەمی [ئور] ئەیانویست لەشکرکەشی تیا بکەن ، بەدەستەوە نیە • لەو کاتەدا لەو سەرزەمینە باسکراوانەدا شەقامەڕێ یەك کـە بین‌النهرین بـە ناوچەکانی [موهنجو ـ دارو]وە [خاراپی][٩٤] کە خاوەنی فەرهەنگێکی هیندیانە بون و بە یەکیەوە ئەبەستن بە دەراوی دیالەدا تێ ئـەپەڕی •• بـەلام هۆی بنەڕەتی لەشکرکەشیەکانی پادشایانی سومەرو ئاکاد بۆ کوێستان زەمینـەکان زۆرتری لەبەر گرتنی دیلەکان بووە ، لەوە ئەچێ لەو سەردەمەدا هەروەکو هـەزارەی دوەمـی پێـش زاینی وەکو لولوییو گۆتیـەکان بـوبن لــە ناوچــەی بین النهرین دا[٩٥] •

ئاکاد میسین [و•و• ناستر‌ووە][٩٦] گەلێك سەنەدی سەرنج راکێشەری

لەبارەی شێوەی پێویستی‌و ئازوقەی هەوردوگای ژنە دیلەکانەوە کە لە سەردەمی یەکێك لەپادشایانی زنجیرەی سێیەمی [ئور]دا بەتالآنی گرتبونیان بلاو کردۆتەوە [ئەو سەنەدو بەلگانە بە مێژوی سالی پێنجەمی سەلتەنەتی شا «بور - سوئن» واتا رەنگ بێ لە ۲۰۵۱ ی پێش زاینیدا نوسرا بێت] ئەو وێنەو شێوە نووسینانە کە تەنیا چوار مانگ لەگەل یەکتردا ماوەیان هەیە شێوەی رەوالەتی دڕندانەو ژیانی ناخۆشی ژنە دیلەکان دەرئەخات •

ئاکاد میسین وەوە ئاستروەوە لەو باوەڕەدایە کە بەلای کەمەوە هەندێك لەو ژنەدیل‌کراوانە هوریانی بون ، بەلام لە بەرئەوە لەناو ئەو نوسراوە باسکراوانەدا ناوی سومەری[۹۷]و ئاکادی[۹۸] بەرامبەر هەندێك ناوی هوریانی[۹۹] هەیە ، بەرای ئێمە ناتوانین زوربەی ئەو نامانە بە نوسراوی هوریانی دابنێین •

ئاکاد میسین وەوە ئاستروەوە وتویە لەوە ئەچێ زوربەی ئەو دیلانە لە کاتی لەشکر کەشیدا بۆ سەر [ئوربیلوم] [ئاربل][۱۰۰] گیراوون • ئەم ناوچەیە ناوپارەی ناوچەکان‌و شوێنی بەیەك گەیشتنی ناوچەکانی نژادی ئاکادی [ئاشوری]و هوریانی‌و گوتی بووە • وە لەوە ئەچێ گەلێك لە نوسراوەی ژنان کە لەو نوسراوانەدایە گوتی بوبێت[۱۰۱] ، ئەم سەنەدانە شێوەیەکی روناکی تایبەتی پەیوەندی داری بەرامبەر دەولەتی خاوەن کۆیلەیی بین‌النهرین‌و هۆزە کوێستانیەکانی زاگروس ئەدات بەدەستەوە • پلەی بەرزی فەرهەنگ‌و شارستانێتی بین‌النهرین لەو رۆژگارەدا لە مێژوی جیهانا هەرچی بوبێت ، ئەمە راستە کە لە بارەی هۆزەکانی گوتی‌و لولوئی‌و سومەری‌و ئاکادەوە زۆردارو ستەمگەر بوون ، وە ئەم هۆزانەیان بە گەنجینەیەك دائەنا کە تالآنی‌یان تێدا ئەکرد •

### ٥ ـ دانیشتوانی مادی رۆژئاوا لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا

## کاسیەکان[١٠٢]

لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا چۆنێتی نەختێك گۆڕا ، لە هەزارەی دوەمی پێش زاینیدا گەلێك گۆڕانی کۆمەلایەتیو هاتنە پێشەوەی باری ژیانێکی نوێ لەو سەرزەمینەی کە لە دوایدا پێیان ئەووت [ماد] [وە ناوچەکانی دەورو بەری وەکو قەفقازو ئێران] دەستی پێ کرد ، لەو سەردەمەدا سەرەتای چەرخی گۆزەگەری لە هەمو شوێنێکدا دەستی پێ‌کردو پەیدابو ، هەمو جۆرە شتێك گۆڕاو جۆری رازاندنەوەی بەرهەمە پیشە دەستیەکان گۆڕدرا بە کورتی بەگشتی شارستانیەتێکی نوێو فەرهەنگێکی دیاری روناك کەوتە ناو مادەکانەوە ، بەم هۆیەوە گەلێك لە دانشمەندەکانی رۆژئاوا لەو کاتەدا دیسان لەبارەی رووداني یەکێك لەو کۆچکردنانەوە کە بە شێوەیەکی کەمو زۆر ریکخراو روی ئەدا قایل بوون[١٠٣] .



ئێسقانو کەلوپەلە وردەی ناو گۆڕێك لە تەپۆلکەی [ سیلك ]
کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاینی

له سەردەمی خێڵەسەرەتاییەکانا هێشتا سودیان لە تالآنیو دیل کردنی خەڵك وەرئەگرتو ئەم کارە چەند جار دووپات ئەبۆوە ، لە سەردەمی سەرکەوتنی گوتیەکانا دیل گرتنی بێگانەکان بو بو بە شتێکی ئاسایی •لە هەڵکەندراوەکەی [گۆی تەپە] لەناو [١٢] گۆڕدا کە هەڵدراونەتەوە [چوار سنوقی بەردینو هەشت سنوقی گڵێن] دۆزراوەتەوە • لە چوار سنوقە بەردینەکەداو بەلای کەمەوە لە سێ سنوقی گڵێندا ـ لە هەر یەکێکیانا ئێسقانی دوو لەشی ئادەمیزاد وەیان زۆر تر لە دوان دۆزراوەتەوە • لەوە ئەچێ یەك بنەماڵە گۆڕستانێکی تایبەتیان بووبێت ، بەڵام بە بێ گومان ئەتوانین بڵێین کە هەندێك لەو گۆڕە دۆزراوانە [بە تایبەتی گۆڕی هەشتەم کە بەهۆی «براون»ەوە هەڵکەندراوە وە یەکێك لەو ئێسقانانە [ئەسکلت] بە ئاستەم تیایا درێژ کشابوو ،وە کاسەیەکی لە ژێر سەرابوو ، چوار ئێسقان بە چوار مشقیو دوان بە دانیشتنەوە لە گۆشەکانی گۆڕەکەدا نێژرابون][١٠٤] لەوە ئەچێ لە هەندێك کاتا ئەبوایە زنیش لەلای مێردەکەیەوە بنێژرایە • ئەگەر وا بوایە ئەمە ئەوە نیشان ئەدا کە نێروەجاخ جێگای مێ وەجاخی گرتۆتەوە •

پەیدا بوونی حەساری بەرگری لەهەر چوار لای ناوچەکانەوە ئەوە نیشانەی ساماندارییو بەدەستەلآتی بووە ، [ «گی تەپە» ، تورنگ تەپە ، لە نزیك ئوسترابادی ئێستاوە لە سەر خاکی هیرکانی کۆن ] لەو سەردەمەدا سامانی رەسەنیان ئاژەڵ بووە ، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ژمارەی ئاژەڵە وردەکانی وەکو ـ بەرازو بزنو بە تایبەتی مەڕ ـ بەرەبەرە لە ئاژەڵە گەورەکان زۆر تر ئەبون ، ئاژەڵداری وردە وردە لەگەل ژیانی خەڵکیدا دەقی ئەگرتو خەڵکیش هاوینان ئاژەڵەکانیان ئەبرد بۆ کوێستان زەمینەکان •

لەو رۆژگارەدا یەکەمین بەشی گەورەی کۆمەلآیەتی پەیدا بو وە هۆزە شوانکارەکانو کشتوکاڵ پیشەکان پەیدا بون • لە لایەکی ترەوە هەندێك لە

هۆزەکان خەریکی بەرهەمهێنانی هەمو جۆرە کەرەستەیەکی سەرەتایی پیشە سازی [وەکو فلزات] بون ، وە گەلێك پیشەی هەمە جۆرەیان گرتە بەر ، وە ئەم پیشانەش بە ناوچەی نیشتەجێ بوونیانەوە پەیوەند بوو •

بۆ نمونە هۆزە کوێستانیەکانی ئەو ناوچانەی کەوتبونە نێوان مادو عیلام [لە لورستانی ئیستادا] لەروی پیشەسازی یەوە زۆر تەڕ دەستو لێ هاتو بونو گەلێك پیشەیان گرتە دەست •

سەرچاوە نوسراوەکان وا ئەگەیەنن کە لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا دانیشتوانی ئەو سەرزەمینەی کە لە دواییدا ناویان نا [ماد] یەك جۆر نەبون ، وە لە رووی شارستانیو فەرهەنگەوە دیسان یەکدەستو یەك جور نەبون ، بو نمونە شارستانێتیو فەرهەنگی تەپۆلکەی [گیان] [هەڵەندراوەکانی ٤ تا ٢] ـ لەروی کۆنە شوناسیەوە ـ لە هێنی عێلام ئەچێ • فەرهەنگو شارستانێتی [گۆی تەپە] هەڵکەندراوەکانی G ] و [ D ] کە لەهێن گوتیەکان ئەچن شوێنێکی جیاوازی هەیە ، بەلام لە هەندێك رووەوە لە شارستانێتی قەفقاز ئەچێ • فەرهەنگو شارستانێتی [ تەپەی حەسار ] [هەڵکەندراوی ٢] وە تەپۆلکەی [سیلك] و[تورنگ تەپە] پەیوەندی یان بە ئاسیای ناوەڕاستەوەیە(١٠٥) •

سەرچاوە نووسراوەکان زۆرتر لە بارەی کاسیەکان یان [کاسیت]ەکانەوە ئەدوێن کە لەو کاتەدا گرنگترینو بە هێز ترین هۆزی کوێستان نشینی ناوچەی زاگروس بوون ، ناوچەی زاگروس تێکەڵی لەگەل فەرهەنگو شارستانێتی بابلیەکاندا هەبوو •

شوێنی نیشتەجێی [کاسیەکان] بە ئاکادی ـ کاشی ـ Kassu ] لە رۆژگاری کۆنەوە تا ئەو کاتەی ئەسکەندەری ماکدونی ئێرانی گرت ـ کیشوەرە کوێستانیەکان بووە کە ئێمە لە جەدوەلەکەی خۆمانا ژمارەی [٨]مان بۆ داناوە • [واتا لە بەشی ژورووی ئەو روبارانەوە کە دەڕاوە کانیان لەسەر

دەمی کۆندا کیشوەری عیلامی لێ پێک هاتبو] وە ئیستە پێی ئەڵێن لورستان• سەرچاوەی نژادی کاسیەکان لە پەنجا وشەو ناوی تایبەتیەوە وەرگیراوە کە کە بە زمانی ئاکادی نووسراوەو لە نووسراوەی بابلیەکانو ئاشوریەکاندا ماوەتەوە • هەروەها هەندێك ناوی تایبەتی کە لەناو سەنەدە بازرگانیو ئابوریەکانی بابلیەکاندا ماوەتەوە ،وە ئەو نوسراوانەی پادشایان کە هین سەردەمی هەزارەی دووەمی پێش زاینی بووە بەدەستمان گەیشتوە • ئیستە ئەتوانین ئەم باسە زۆرتر بەراست بزانین کە کاسیەکان هۆزێکی کوێستان نشین بون وە پیشەیان ئاژەڵداری بووە وە بە زمانێك قسەیان کردوە کە زۆر لە زمانی عیلامی چوە(١٠٦) •

سەردەمێك وایان ئەزانیو ئەیانووت گوایە کاسیەکان هیندو ئەوروپایی بون ، وەیان پەیوەندییەکی قوڵو ئاشنایەتیەکی بەهێزی هاو رەسەنیان لەگەل نژادی هیندیو ئەوروپاییدا بووە ، کە زمانو فەرهەنگو شارستانێتی ئەوان لە هیندو ئەوروپاییەکانەوە وەرگیراوە(١٠٧) •

بەڵام هەندێك سەرچاوە کە زۆرتر پەیوەندی بە بوارەکانی هیندو ئەوروپاییو کاسیەکانەوە هەیە ئەوەندە سستە کە بە هیچ جۆرێك بەڵگەیەکی بەکەڵك لە بارەی پەیوەندی نێوان کاسیەکانو هیندو ئەوروپاییەکانەوە نادات بەدەستەوەو بەهیچ جۆر باسیان لێوە ناکات •

لەوە ئەچێ کاسیەکان لە رۆژگاری کۆندا کە هیچ کەسی بەیادیا نایەت لە ناو چەی ناوبراودا ژیاوون • هەروەها عیلامیەکان کە دراوسێ وەیان خزمی ئەوان بون لە سەرزەمینی خۆیان ئەژیان ، هەرچۆن بێت کاسیەکان لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زاینی لەو شوێنەدا ئەژیان وە لە دواییدا خەریکی ئاژەڵداریو نێوە نیشتەجێ بون ، وە لە ناوچە کوێستانیەکانی کێوەکانا ئەژیان • زۆر لەوە ئەچێ هۆزەکانی [لور]ی ئێستا کە لە کوێستانەکانا بە بەخێو کردنی مەڕومالاتەوە خەریکنو بە ئاژەڵداری ئەژین ئەوانە

پاشماوەی ئەوان بن ، وە لەرووی زمانەوە بوون بە ئێرانی ، واتا زمانیان بووە بە ئیرانی •• وە ئیستەش دیسان هەر لەو سەرزەمینەدا ئەژین و نیشتەچین • ئەو سەرزەمینەی بەناوی ئەوانەوە ناونراوە [لورستان] لە چواریەکی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا هەندێك لە کاسیەکان لە جموجوڵ و کۆچکردنی هۆزەکان لەکێوەکانەوە هاتون بۆ دەراوی روباری دیالە ، وە لەوێوە جاربەجار دەستیان لە بابل ئەوەشاند • زوربەی لێکۆڵەرەوەکان ئەم بگرەو بەردەو دەست وەشاندنەی کاسیەکان بە پەیدا بوونی ئەسپ ئەزانن کە بۆ بارو گواستنەوەو سواری بەکاریان ئەهێنا •

لە رۆژگارەکانی کۆندا خەڵکی ئاسیای رۆژئاوا ئاشنایەتیان لەگەل ئەسپدا بووەو ئەسپیان بەخێو کردوە • بۆ نمونە سۆمەریەکان ئاگاداری پەروەردە کردنی ئەسپ بون و پێیان ئەوتن کەری کێوی [رۆژهەڵات] — [ئانشوکور][١٠٨] • بەڵام ئەسپ لەو رۆژگارەدا هێشتا کەوی نەبوبو • لە وڵاتی سومەر گوێ درێژیان ئەبەستە عارەبانەی جەنگی و گالێسکەی بار • بەڵام وێنەی هەندێك گیان لەبەر کە بە عەرەبانەو گالێسکەوە بەستراوە بە دەستمانەوەیە کە لە گوێ درێژ نەختێك گەورەترن[١٠٩] • ئەمانە رەنگ بێ قاتر بوبن ، یان ژمارەیەکی کەم ئەسپیان رائەگرت تاکو لەگەل گوێ درێژدا جوتە بگرن[١١٠] • لە سەنەدە بابلیەکانا هەر لەدوای چەرخی [حامورابی] « سەدەی هەژدەیەمی پێش زاینی » باسی ئەسپە ماڵی کراوەکان ئەکەن[١١١] •

[ب•ب• پیو طروسکی][١١٢] سەرکەوتن و تورەقی کردنی ئەسپ بە تورەقی ئاژەڵداری نیمچە نیشتەجێ بووەکان دائەنێ [چونکە ئەسپ سوار لە شوێنە دورەکانەوە ئەیانتوانی بگەنە شوێنێکی تر] •• بەم جۆرە تورەقی ئەسپ داری لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا بووە • ئەسپ داری بووە هۆی ئەوە کە هۆزە شوانکارەکان زۆرتر جموجوڵ بکەن و کوچ بکەن ، وە

هەندێك لەو هۆزانەی کە ئاژەڵداری یان ئەکرد لە هەندێك ناوچەدا بەتەواوی بیابان نشین بون وە بە هۆی ئەسپەوە ماڵو کۆچە کانیان ئەگوێزایەوە •

لە چواریەکی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا ئەسپ - وەکو گیان لەبەرێکی ماڵی - لێهاتو لـە زوربەی کیشوەرەکانی ئاسیای نزیك دا ئەسپ داری بوو بە باو • لە ئاسیای بچوکدا لـە ناوچەی ژێر دەستەکراوی ئاشوری [کانس] - سەدەی بیستەم پیش زاینی - وێنەی عارەبانەیەك ئەبینین کە ئەسپ رای ئەکێشی[113] •

لە چواریەکی سێیەمی هەزارەی دوەمدا لە کیشوەری هیتی نەك تەنیا بۆ عارەبانەی جـەنگی ئەسپیان بـەکار هێناوە بەڵکو جوتیشیان پێ کردوە[114] ئەسپو عارەبانە لە سەدەکانی هەژدەو حەڤدەیەمی پیش زاینیدا لـەگـەل گیکسوسەکان[1] چونە میسرەوە •

لە کیشوەری هوریانی [می تانی] کە لـە ناوەراستی هەزارەی دووەمی پیش زاینی بـەشی ژوروی بین‌النهرینو بەشی خواروی فلاتی ئـەرمەنستانو هەندێك لە سوریەو ئەو سەرزەمینانەی کـە کەوتوونەتە رۆژهـەڵاتی دجلەوە ئەیگرتەوە ، زۆر سودیان لـە ئـەسپ وەرگرتوەو ئەسپیان بـە تایبـەتی بـە عارەبانەوە ئەبەست ، لەوە ئەچێ کـە [می‌تانی] تەنانەت مەرکـەزی بـەخێو کردنی ئەسپ بووە • چونکە لەم رووەوە گـەلێك نووسراوەی زمـانی هوری لەسەر زەمینی پادشایی هیتی‌یەکانو ئاشوریەکاندا تەرجومە کراوە[115] •

ئەم قسەیە جێگای سەرنجدانە کە زاراوەی [غاز غارێنی ئەسپ] کە لە نوسراوەی [کی کولی] لە خەڵکی [می‌تانی]یەوە بەجێماوە هیندیو ئەوروپاییە،

---

(1) ئەو هۆزە بیابان نشینانەن کە لە ئاسیای نزیکەوە هێرشیان بردۆتە سەر میسر وە لەبەشی رۆژهەڵاتی دلتای نیل پایتەختی خۆیان دروست کردو ناویان نا [ئاواریس] وە لە سەردەمی فیرعەون [خەموسی یەکەم] ٥٩ـ١٥٨٤ پێش زاینی هەمویان لەناوچون ـ وەرگێر •

یان ئاشکرا تر بڵێین هیندیو ئێرانیە [وە ئەگەر زۆرتر سەرنج بدەین لەوە ئەچێ هیندی بێت][116] جگە لەمەش زوربەی گەورەکانی هوریانی لەو سەردەمەدا ناوی هیندیو ئێرانیان ئەنان[117] لێکۆڵەرەوەکان وای دائەنێن کە عارەبانەی ئەسپی هۆزەکانی هیندو ئێران لە کاتێکدا کە پەلاماریان بردۆتە سەر ئاسیای نزیك لەگەل خۆیان بۆ ئەوێ یان بردوە • ئەم بیروڕایە ڕاستیەکی ترمان بۆ ئەسەلمێنێ ــ بەم مانایە کە لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا[118] هۆزە هیندیو ئێرانیەکان لە هیندستان ئەوانیش ئەسپو عارەبانەیان بووە • وە هەر لەو سەردەمەدا شارستانێتی کۆنی دراویدی(؟) « موهنجو ــ دارو » لە ناوچو •

لەوە ئەچێ لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاینی هۆزەکانی هیندو ئێرانی کە ئەسپیان ماڵی کردبو عارەبانەیان پێ ڕائەکێشان بە پەلە لە شوێنی کۆچەری خۆیان دەرچونو لەملاولا پەرەدەوازە بون • ئەبێ ئەوە بزانین کە لەو سەردەمەدا ئاسیای ناوەڕاست شوێنی نیشتەجێی ئەوان بووە[119] • لەوە ئەچێ کە هۆزەکانی هیند بەر لە خەڵکی‌تر کەوتنە جموجوڵەوە ، وە هەندێك لقیان لە دواییدا هاتنە ئێرانەوە ، وە لەوێوە چوبن بۆ ئاسیای نزیك [مقدم] وە خەڵکە ڕەسەنەکانی ئەو هۆزانە لە ژورووی ڕۆژئاوای هیند نیشتەجێ بون • ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە هیندی زمانەکان ئەبوا بە عارەبانەکانی خۆیان نە ڕێگای دەراوەکانی زێی بچوكو دیالەوە[120] بۆ ناوچەکانی بین النهرین سەرەو خوار بنەوە •

لەگەل ئەوەشدا وەکو لەمەوبەر وتمان ماڵی کردنی ئەسپ بەهیچ جۆرێك تەنیا هین هیندو ئەوروپاییەکان یان هیندو ئێرانیەکان نەبوە • چونکە سۆمەریەکانیش تا ڕادەیەك شارەزای پەروەردە کردنی ئەسپ بون • ڕاستە کە لە ڕۆژگاری زۆر کۆندا لە ناوچەو دەراوەکانی ڕۆژهەڵاتا ئەسپ پەروەردە نەئەکرا[121] بەڵام لە فلاتەکان دا لەوە ئەچێ لەیەك ڕۆژگارا

کۆمەڵە نژادە جۆربەجۆرەکان پێکەوە دەستیان کردبێ بە پەروەردە کردنی ئەسپ[١٢٢] وە دۆزینەوەو داهێنانی هۆزێك بە خێرایی ئەگەیشتە هۆزەکانی تر ، نەك تەنیا هیندو ئێرانیەکان بەڵکو هۆزەکانی تریش کەوتنە جموجوڵو جولاندنەوە ، وە یەکێك لەو هۆزانەش [کاسیەکان] بو • بەلام ئەوەی کە گوایە کاسیەکان ئەسپیان ماڵی کردوە لەم قسەوە رون ئەبێتەوە کە لە سەنەدەکانی بابلیەکاندا لە سەرەتای رۆژگاری کاسیەکاندا زۆرجار باسی ئەسپیان کردوە ، وە لەسەر روی بەرد [لەو رۆژگارەدا] جۆرە گیان لەبەرێکی سەیری ئەفسانەییان لە شێوەی ئەسپ وەرگرتوەو هەڵیان کەندوە • وە ئەم نەقشانە لەو رۆژگارەدا زۆر بووە •

ئێستە دێینە سەر ئەوە کە [گانداش] دامەزرێنەری زنجیرەی [کاسی] هاوچەرخی [سامو ئیلونی] کوڕی [حامورابی] پادشای بابل بوە • سەرچاوە بابلیەکان ئەڵێن کە لە ساڵی نۆیەمی سەڵتەنەتەکەی [سامسو ئیلونی] – ١٧٤١ پیش زاینێ – لەگەل کاسیەکانا کەوتە شەرەوە ، وە لە پەرستگا گەورەکەی بابلیەکان خوای [ئینلیل] لە شاری [نیپور] تێزەیەك دۆزراوەتەوە کە ناوی [گانداش]ی لەسەر هەڵکەندراوە ، ئەمە ئەوە ئەگەنێت کە گانداش نەك تەنیا لە بەشی ناوەراستی خاکی بابلدا حوکمی کردوە بەڵکو چەندێك لەوێدا ماوەتەوە • ئەو کاتە بە سەرەتای زنجیرەی کاسیەکان دائەنرێت • لەگەل ئەمەشدا [سامسو ئیلونی] توانی سەر لەنوێ لە بەشی زوربەی خاکی بین‌النهرین دا دەسەلاتی خۆی بەدەست بێنێ ، پادشایانی کاسی رەنگ بێ لەو کاتەدا دەراوی دیالەیان بەدەستەوە بووبێت وە بەشی خواروی ئەو دەراوە [پادشایەتی کونی – ئاشنون – یان – ئاشنوناك] لەو کاتەدا پێیان وتوە [توپ لیاش] بوە •

ئێمە یەکەمین پادشای کاسی بە ناویك ئەزانین وە لە بارەی سەڵتەنەتی ئەو ناوەوە کەمێك شارەزاییمان هەیە [گانداش رەنگ بێ لە ١٧٤١ تا ١٧٢٦ ی پێش زاینی ، ئاگومی گەورە لە ١٧٢٥ تا ١٧٠٤ ، گاشی تی لیاشی یەکەم لە

١٧٠٥ تا ١٦٨٣ ، ئاوشی لە ١٦٨٢ تا ١٦٧٤ ، ئابی راتاش لە ناوەڕاستی سەدەی حەقدەیەمی پێش زاینی ، ئورشی گورومـاش لـە کـۆتایی سـەدەی حەقدەیەمی پێش زاینیدا بوبن] بـەڵام لـەبارەی ئەو ئیش‌و کارانەوە کە بە ئەنجامیان گەیاندوە یان رووداوێك کـە لە سەردەمی سـەڵتەنەتی ئـەوانا بووە شتێکی ئەوتۆ نازانین • بەڵام نوسراوەی [ئاگومی دووەم] کـە نازناوی [کاك رم] بووە [کە رەنگ بێ مانای شمشیری رەحمەت بگرێتەوە یان شتێکی بـەم جۆرە مانایە بگەیەنێت][١٢٣] کە بەپێی بیروباوەری ئـەو چەرخـەو دیسان وەکو ئەگێڕنەوە هیتیەکان بابلیان تالان کردوە • [ئەو رووداوەش کە لە سالی ١٥٩٥ی پێش زاینی بوو بە هۆی لەناوچونی زنجیرەی «حامورابی» ] ئەویش تارادەیەك زانیاری بەدەستەوە ئەدات •

لـەو نوسراوەدا [ئاگومی دووەم] خۆی بـەجێ نشینی نورانی خواوەند [شوکاموناا][١٢٤] وە پادشای کاسیان‌و ئاکادیەکان‌و پادشای کیشوەری بەرینی بابل کە ئاشنونانك لەگەل ژمارەیەکی زوروی دانیشتوان دروستی کردبو ، وە پادشای [پادان] و [ئالمان] وپادشای [گوتیە لێ نەهاتوەکان]و هینی تر ناو ئەبردە• ئەو ئەڵێت کە پەیکەری خواکان لە فوراتی ناوەراستەوە بردۆیەتیەوە بۆ بابل ، لەوە ئەچێ ئەو پەیکەرانە هیتیەکان لـە دوای تالان کردنی بابل لـەوێ دایان نابێ • بەم جۆرە [ئاگومی دووەم] لەو نەخشانەی کە لە دوای پادشایانی بابل بە جێماوە دەر ئەکەوێ ، ئەو تا ئەو کاتەی کە پادشایانی زنجیرەی [حامورابی] لـە بابـل دا حوکـم ڕەوا بون واتا تاکو سـالی ١٥٩٥ی پێش زاینی [بە پێی مێژوی ئوستروەوە ـ ئاسمیت][١٢٥] نەی ئـەتوانی ئـەوشارە بگرێتـە دەست خۆی • بـەڵام چونکە کوڕی [ئورشی گوماروشی] بو [هـەرووەهـا لـە کاتی گانداش ئەگـەر سـەرنجی مێژووی ١٧٤١ - ١٧٢٦ ی‌پێش زاینی بدەین‌و بەراستی بزانین] ناتوانین سـەردەمی سـەڵتەنەتی [ئاگـومی دووەم] لـەدوای سەرەتای سەدەی شازدەیەمی پێش زاینیەوە بزانین •

بەڵام ئەو بابلی لە دوای هیتیەکان کـە لـە بابل کشانـەوە[١٢٦] گرتە ژێر دەسـتی خۆی ، وە بـەم هۆیەوە وە بەراستیش بوو بـە دامەزرێنەری زنجیرەی تازەی پادشایانی کاسی لە بابل دا •



**نمونەی مۆرێکی تەستونی هەڵکەنراوی سەردەمی کاسیەکان کە لە بابل دۆزراوەتەوە ـ چارەکی سێیەمی هەزارەی دووەمی پێش زاینی**

لەگەل ئەمەشدا [ئاگومی دووەم] تەنیا پادشای بابل نەبو ، بەڵکو خۆی بە پادشای [پادان]و [ئالمان]و [پادشای گوتیەکان] دائەنا • ئالمان [کە لەوە بـە دوا پێیان ئەووت «هالمان» هەمان حەلوان ـ یان ناوچـە چیایـەکانی دامێنی زاگروسـە لەسـەر رێـگای بـەشی ژوروی روباری دیالـە[١٢٧] • بـەڵام [پادان][١٢٨] رەنگە بێ هـەمـان [پادیر] بێت کـە لـە نووسـینی پادشـای [ئانوبانی نی] و [پیتان] دا هەیە ، کە لە سەدەی حـەوتەمی پێش زاینیەوە لـە سنوری کوێستانی ژوروی عیلامەوە بووە • لە داهاتودا قسەی لێوە ئەکەین • بەڵام لە بارەی گوتیەکانەوە کـە ئاگوم بـە [پیاوی لێ نەهاتو] ناوی بردون ئەبێ بڵێین کە ئەوانە لە ناوەڕۆکی نازناوە کانیا نوێنەری سەرزەمینێکی فراوان بون کە لە دواییدا بون بە ناوچەی ژوروی روژئاوای کیشوەری ماد • وە لەو سەردەمەدا جێی نیشتەجێی چەند هۆزێك بووە کـە لـە سـەردەمی چاخی کۆمەڵە سەرەتاییەکانا ئەژیان • لەبـەر ئەمـە پادشای کاسی خاوەنی حکومەت ویان بەلای کەمەوە حوکمی بەشێکی زۆری خاکی مادی ئاینده بوە •

بەڵام ئایا بەڵگەیەکی بۆ ئەم داوا کاریەی هەبو ؟ بەراستی ئەو نەیتوانیوە

بلێ لە ناو گوتیەکان دا کە لە دۆخی چۆنێتی کۆمەڵایەتی پێش چینایەتیەوە ئەژیان حکومەتێکی تەواویان هەبێتو دەسەڵاتداریتی بەسەریانەوە بکات • بەڵام رێی تێ ئەچێ جاروبار پەلاماری لادیکانیانی دابێتو هەندێکی تاڵان کردبن‌و مەڕو ماڵاتەکەشیانی بە ناوی – خەرج – ەوە بردبێت • بەڵام کاسیەکان لە هەندێك ناوچەی مادی ئایندەدا نیشتەجێ بوبون ، وە زۆر لەوە ئەچێ ناوچەی ناوبراو بەشێك بو بیت لە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە تازەیەی [کاسی] وە بە ناوی [کار – دونیاش]ەوە ناو نراوە[١٢٩] • ئەم ناوچەیە لە پلەی یەکەمدا بەشێك بووە لە زەوی وزاری ناوچەی دیالە ، ئەوە بو کە بەشی خواروی دیالە – یان ئاشنوناك ـی کۆن لەو سەردەمەدا ,لەناو کاسیەکانا نیشتەجێ بوە (؟) بە ناوی کاسی [توپلیاش]ەوە ، ئەم چونێتیە لە بەشی ناوەراستی ناوچەی دیالە – واتا نامار [نامرو ، ناواری کۆن] هاتە پێشەوە • لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینی [ناوار] بەشێك بوە لە زەویو زاری هوریان [هەروەکو باسمان کرد کۆنترین نوسراوەی هوریانی کە پەیوەندی بە تیشاری پادشای ئورکیش‌و ناوارەوەیە] ئەڵی لە دوایدا خەڵکی ئەو شوێنانە بون بە ئاکادی • لە سەردەمی کاسیەکاندا ناوچەی ناوبراو کەوتە ژێر دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی گەورەکانی هۆزی کاسیەوە[١٣٠] •

شوێنەواری شوێنی نیشتەجێی کاسیەکان لەو ناوچانەی کە لە مادەوە دور دەست بون تا هەزارەی یەکەمی پێش زاینی هەروا مابونەوە • [لەم روەوە تەماشای سەرچاوەکانی دوایی بکەن] • بەم جۆرە نژادی کاسی لە سنوری خواروی رۆژ ئاوای ماد لە سەردەمی سەڵتەنەتی کاسیەکانا تارادەیەك بلاو بوبونەوە ، رەنگ بێ ئەو رۆژگارە بو بێت •

پێویستە سەرنجی ئەم وتەیە بدەین کە کاسیەکان نازناوی سەڵتەنەتی [یانزی] یان زۆر بەکار هێناوە • ئەم نازناوە وە نەبێ بە تەنیا کاسیەکان بە کاریان هێنا بێ [لە زمان نامەی بچوکی کاسی – ئاکادیدا کە ماوەتەوە ، وە

لـه ناوی تایبەتی[١٣١] دا بینراوە] رەنگ‌بێ لە خاکی نامارو دراوسیسکانیشیا [ بیت هامبـان ][١٣٢]و ناوچـەی [ ئالابری ] لـە خـوارووی دەریاچـەی ئورمیەوە[١٣٣] وە ناوچـەی [خوبوشکی] لـە دەراوی روباری بوختان – لە خوارووی دەریاچەی وان[١٣٤] دیسان ئەم نازناوە بووە • لە بارەی ئەو دو ناوچەیەوە کە لەم دوایەدا باسمان کردن ئەگەر بلّێین ئەوانە کاسی بون ئـەمە زۆر ستەمە • بەلاّم ئەتوانین بیان‌کەین بە گوتی[١٣٥] وە بە گوتی‌یان دابنێین• بەم جۆرە رون ئەبێتەوە کە زاراوەی [یانزی] نەك تەنیا لەناو کاسیەکانا بەکار هێنراوەو بلاّو بۆتەوە بەلّکو گوتیەکانیش بەکاریان هێناوە • ئایا ئەم روداوە مانای نزیکی زمانی ئەوانە بـە یەکتر ئەگەیەنێت ؟ رەنگ بێ ئـەم زاراوەیە گوتیەکان لـە کاسیەکان وەیان کاسیەکان لـە گوتیەکانیان وەر گرتبێ •• وە هەر لە هەمان کاتا ئەم بۆچونە هەیە کە دوو کۆمەلـە نژادی ناوبراو [کاسی‌و گوتی] لە روی زمـانەوە تارادەیـەك لـە یەکترەوە نزیك بووبن • پاشگری [ش‌وآش] کـە بە تایبەتی زمانی کاسیە لـەگەل [ئوش‌وئیش] کە وشەیەکی گوتیە بەرامبەری بکەرەوە[١٣٦] •

لە دوای ئاگومی دووەم پادشایانی کاسی هـەروەکو پادشای راستەقینەی بابلیان لێهات ، ئەگەرچی نووسراوە کاسیەکان لـە نێوان ئەندامانی خانەدانی سەلّتەنەت‌و بۆرە پاواندا ماوەیەکی زۆر – واتا تاکو سەدەی یازدەهەمی پێش زاینی ئەبینرێت[١٣٧] • تا ئەو کاتـە کـە دەراوی دیالـە بـە دەسـت پادشا کاسیەکانی بابلەوە بوو ، وە ئەوان توانیویانە هەروەکو جاران پەیوەندی‌یان بە ناوچە کوێستانیەکانی خۆیانەوە بێت‌و رەگەزی نژادی کاسی بپارێزن ، وە لـە ناو کۆمەلاّنی خەلّکی بابلدا ون بێت • لـە سـەدەی پازدەیـەمی پێش زاینی ئاشوریەکان زۆر تەقەللایان داوە لە ناوچەی [ ئاراپخۆ ] – کەرکوکی ئێستا ئەو رێگایانەی ئەچن بۆ [نامار] بیانگرنە ژێر دەستی خۆیانەوە • لـە سەدەی چواردەیەمی پێش زاینیدا – لە دوای ئەو شکستیەی کە بە هۆی [ئادادنراری]

یەکەم پادشای سەرکەوتوی ئاشورەوە توشی [نازی ماراتاش] پادشای کاسی هات سنورێك لە نێوان ئاشورو بابل دا [لە ناوچەی بەرامبەر پی لاسکی (؟) لە کەنارەکەی تری دیجلەوە لە رێگای کێوی [ئارمان] [بە] [ئوگار ـ سالّلی](۱۳۸) تاکو [لولومیان](۱۳۹) کێشرا • ئەم کارە مەترسیەکی راستەوخۆی لە دەراوی دیالەدا پەیدا کرد ، لەگەل ئەمەشداو لەگەل ئەو هەمو داخوازیو داوا کاریەدا کە ئاشوریەکان لەبەر دەسەلاّتداریتی خۆیان لە ناوچەکانی خواروترا بەکاریان هێنا ، تاکو دوای لەناو چونی زنجیرەی کاسیەکان لە سەدەی دوازدەیەمی پێش زایینی دا ـ هێشتا ناوچەی ناوبراو بە دەست بابلیەکانەوە مابو(۱٤۰) لە لایەکی تریشەوە ئەو بەلگەو سەرچاوانەی کە دەستەلاّتداریتی ئەو سەردەمەی پادشایانی کاسی لە زەویو زاری سەر زەمینی فراوانی ناوچە کوێستانیەکانی رۆژهەلاّتا ئەسەلمێنن [ کە لە سەردەمی ئاگومی دووەمدا بووە ] بە دەستەوە نیە •

لە سەرانسەری رۆژگاری حوکمڕەوایی زنجیرەی کاسیەکانا ، شەرکەرەکانی ئەو هۆزە پشتیوانو پاشکەوانی ئەو زنجیرەیە بون ، تەنانەت لەشکرێکی رێكو پێکیان پێک هێنابو کە لە بارەی نژادەوە تارادەیەك وە یان بە تەواوی لەگەل بابلیو ئاکادیەکاندا تێکەلّ بون،دیسان هەروەکو جاران بە ناوی [کاسیەکانەوە] ناو ئەبران • هەر چۆن بێت لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینی دا سەرکەرە کاسیەکانیان بە بابلی ناو بردوە(۱٤۱) • خوایانی کاسی وەکو [شوکامون] و [شیمالی] و [کاشو] [بە زمانی ئاکادی لە جیاتی کاشو Kassu کاشی] دیسان لە دوای لە ناوچونی زنجیرەی کاسیەکان [لە ۱۱۷۱ی پێش زایینی دا] زۆر رێزیان گیراوە •

روداوو بەسەرهاتەکانی ناو مێژووی کیشوەری کاسیو بابلیەکان [کار ـ دویناش]و بوارەکانیان لەگەل میسرو هیتیەکانو بەربەرەکانی ئەوان لەگەل ئاشوردا ـ کە هەندێك جار ئەم لایان سەر ئەکەوتو هەندێ جاریش ئەولا ـ

وەهینی تر ئەمانە لە بارەی مێژووی بابلەوەیە ، وە ئێمــە ئەو روداوانە باس ناکەین • بەڵکو ئەبێ هــەندێك لە بارەی فەرهەنگ‌و شارسانێتی کاسیەکانەوە بدوێین •



**نیگارێکی دەستکردی حەوجۆشی لوڕستان (؟)**
**ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زاینی**

ئەو شوێنەوارە کۆنانــەی کـە بــە هینی لوڕستان ناوبراوە هینی هۆزە کوێستانیەکانی [کاسی‌یە] • ئەوانە چــەند یادگارێکی دروستکراوون کـە لــە ئەنجامی هەڵکەندنی ناشایستانەی ساڵەکانی کۆتایی ۱۹۲۰ و۱۹۳۰ لە ناوچەی لوڕستان [ئێرانی ئیستا] وە بــە تایبــەتی لــە ناوچەی هەرسین [لەبــەر جادەی کرماشان ـ خــورم ئاباد] دەست کــەوتووەو جــاروبار گوێزراوەتــەوە ، ئــەو یادگارە ئەنتیکانەی لوڕستان تارادەیەك ســەرنجی کۆنــە شوناسانی ئەوروپای

راكێشاوه ، كـه ئاشكرا بو هەمو گۆڕه كانيان تالآن كردن [ ١٤٣ - ١٤٤ ] دانشمەندانو لێكۆڵەرەوەكان لەپاش بەراورد كردنو چەندو چونێكی زۆر ئەم يادگارانـەی لوڕستانيـان بـەهێنی سـەردەمی ناوەڕاستی هـەزارەی دووەمو سەرەتای هەزارەی يەكەمی پێش زاينی داناوه •

زۆرتر ئەم شتانه زينو بـەرگ‌و كەرەستەو كەلوپـەلی ئەسپه • وەكو ئەڵقەی لەغاوو لـەغاوگره ، هـەروەها چەكی ئـەو سـەردەمەو شتی جوانو كەرەستەی ئاينو ئاين پەرستی [وەكو عەسای سەحارو هەندێ شتی تر] • كه له غاوو ئاوزەنگی ئەسپ له لوڕستان دۆزرايەوه ئەمه ئەوه ئاشكرا ئەكات كـه لەو سەردەمەدا عارەبانه بووه ، وه ديسان ئەوه دەر ئەخات كه ئەو شتانه هێنی هەزارەی دووەمی پێش زاينیيه • له هەزارەی يەكەمی بەر لەزاينی دا عارەبانه كەمتر له شەڕەكانا بەكار هێنراون ، وه ئێستە كـه كـەڵو پەڵو شتومەكی عارەبانه لـه لوڕستان دۆزراوەتەوه له بارەی ساختومان سازیيەوه بـەگشتی وەكو كەڵو پەڵو شتومەكی عارەبانەی رۆژگاری ئاسيای نزيك بووه ، بـه تايبەتی لەگەل هێنی سومەرەكانا لەيەك جۆر بوون •

ئەو شته دەسكردە نايابانەی كـه زۆر تر سـەرنجمان رائەكێشیێو لـه لوڕستان دۆزراوەتەوه هەندێك كەلوپەلی جوانی پێچاو پێچه كه هێنی سيحرو خوا ئەفسانەييەكانه وه وەكو وێنەی ئادەميزادو ددانو [بزنه كيوی ، پڵنگ ، شێر ، گا ، ئەسپ ، گريفون - كه لاشەی وەكو شێرو باڵو سـەری وەكو هەڵۆو گوێی ئەسپو پۆپنەيـەكی وەكو باڵی ماسی بووه - وه ئەبولهەولو هێنی تر] ، كـه بـه شێوەيەكی تێكـەڵاوی دروست كراوه • زۆر باش دەر ئەكەوێ ئەوەی كه ئەم پيشه دەسكردانەی دروست كردوه • زۆر گرنگی به خەتو خاڵو نـەقش كردنيانی داوه • ئەو باسـه ئەفسانەييانەی كـه لـەو شوێنەوارانەدا دەر ئەكەوێ زۆر سەرنج راكێشەرن ، لەگەل ئەوەدا زوربەی ئەو باسانه له شوێنەواری بين النهرينی كۆندا بووه ، [هەروەكو وێنەی جەنگی



کەلوپەلی لە حەوجۆش دروستکراوی لوڕستانی ، هەزارەی دووەمی
پێش زاینی ٠٠ لە ئەنتیکەخانەی ئەرمیتاج

روبەڕوی پاڵەوانەکان لەگەل ددان] لەم دواییەدا دەرکەوتوە کە هەندێك لەو باس‌و بابەتانە بە داستانی ئەفسانەییەکانی ئاسیای ناوەراست‌و ئێرانی دابنێین ـ کە بە تایبەتی لە ئاویستادا دیارە ـ •

هەندێك روی داستانە کاسیەکان لە بارەی هونەری بەرد تاشی بابلەوە چەرخی سەڵتەنەتی زنجیرەی کاسیەکان ـ ئەدوێت • لەو رۆژگارەدا نیشانەی داستان‌و ئەو وێنانەی کە کاسیەکان خۆشیان ئەوێن لەسەر مۆری بابلیەکان هەڵکەندراون • هەروەکو سەلیب [نیشانەی رۆژ کە لە سواڵەتەکان‌و هەندێك جار لە یادگارەکانی لوڕستاندا بینراوە] وە نیشانەی تر لە شێوەی بادام کە ئەمانە بە تایبەتی هێنی ئافرەت بون وەکو زینەوەری باڵدارو هێنی تر •

بەڵام لەبارەی یاسای کاسیەکانەوە ـ لەو شوێنەوارە نوسراوانەدا بە شێوەی گشتی جگە لەناوی خواکانیان هیچ شتێکی گرنگ دەستگیر نەبوە • بۆ نمونە یەکێکیان پەیکەری خوای [کاشو]یە ، ئەم ناوە بە زمانی [ئاکادی] بەم جۆرە بەکار هێنراوە وە شێوەی کاسیەکەی دیار نیە(١٤٥) ، کە بە خوای هۆزو تیرەی کاسیەکان دانراوە(١٤٦) •



نەقشی مۆرێکی ئەستوونی ، سەردەمی کاسی‌یەکان ••

یەکێکی تر [شیمالی] خوای کوێستان نشینەکان[١٤٧] کە ناوەکەی تری [شیبارو]یە ، یەکێکی تریان [شوکامون] یان [شومو][١٤٨] خوای ئاگری ژێر زەوی[١٤٩] وە پشتیوانی زنجیرەی پادشایان • [هاربـە] و [شیخو] لـە خوا زۆر گەورەو خوشەویستەکان بون کـە لەگـەل خوایانی بابل دا [ ئینلیلە ] سوڵتانی خوایانو خوای زەمینیو مەردوکو خوای دەوڵەتیو بابـل یـەکسان بون[١٥٠] • لەوە ئەچێ هەردو ناوەکە یـەك خوا بوبن • خوای رۆژ بـە [ساخ] یان [شوریاش] ناو ئەبرا • ئەو ناوەی لەم دوایەدا باسـمان کرد یان سیفەتە وەیان ــ هەروەکو هەندێك لێی تێ گەیشتوون ــ ناوی رۆژە بە زمانی هیندی ئەوروپایی کە لەناو کاسیەکانا باو بووە • ئەم پەیوەندییە لـە نێوان ناوی [هیتیـەکان]و[١٥١] [ئوبریاش] ــ بوریاش ــ کـە دو خوای شـەستو بارانو رەهێڵە بون ، وە هەروەها لـە نێوان ناوی [ گیدار ] و [ ماراطاش ] ــ ماروطاش ــ ، ــ کە دو ناوی خوای شەڕ بون ــ هەیە[١٥٢] • [کامول] وە خوای [میریزیر][١٥٣] و [دور][١٥٤] ئەبێ بە خوای بەرەکەت بزانین •خوای پشتیوانی بنەماڵەی پادشایان [ئیمیریا]ی ناوە[١٥٥] •



**دەفرێکی نەخشینراوی لوڕستانی ، کۆتایی هەزارەی دوەمو سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی ••**

خواکانی کاسی لەگـەل هینی عیلامیەکانا بەرامبـەرن[١٥٦] وە لـەناوی گوتیدا دیسان [کە بەشێك لەوانە تەنیا ناوی خواکانیانە] ئـەو کەسانەی کـە

ئەمانە بەشێوەی خوای کاسی دائەنێن نیە • وە هیچ جێگای سەرسوڕمان نیـە کە لە تەمەنی ژیانی هۆزێکدا چـەند بیروڕای هاوبەشی ئاینی [داستان وە یان ئەفسانەی خواکان]و نەریتی ئاینی وەها زانرابێ • بە تایبەتی هۆزێکی دیاری کراو بوە[١٥٧] ،وە هۆزەکانی دراوسێی ـ لەگەل ئـەوەدا کـە ئـەوانیش داستانو ئەفسانەی خواکانیان بووە لـەوە ئەچێ لەگـەل داستانو ئـەفسانەی خواکانی هۆزەکانی ترا لەیەکتر چوبن ـ بەڵام زوربـەیان خواکانیان بـە شێوەی گشتی لەگەل هۆزی ناوبراوا جیاوازیان بووە ـ ئینجا لەو وێنـەیەو یان وەکو ئەو ئەفسانەیەی خواکان بەڵگەی ئەوەیە کـە مـەرجی سروشتیو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیو ژیانی ئەو هۆزانە لە یەکتر چوون •

## ٦ ـ لەشکرکەشی یەکانی ئاشوریو عیلامی لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا ••

لەو کاتەدا کە پادشایەتی کاسیەکان دامەزرا تا کۆتایی هات ، پادشایانی ئاشور چەند جار دەست درێژی یان کردە سـەر ناوچەکانی ژوروو ترو ئەو پەڕی ناوچەکانی سەرزەمینی لولوییو گۆتیەکان • لـە بارەی ئـەم لەشـکر کەشیانەوە هەندێك سەنەدو سەرچاوەی ناتەواو هەیە ، ئێمە لەم روەوە ئەمەندە ئەزانین کە هەندێك لە پادشایانی ئاشور خۆیان بە داگیر کەری گۆتیەکان ناو ئەبەن[١٥٨] ئـەم سـەنەدو بەڵـگەیە بۆ رون کردنەوەی ئـەم وتەیـە بەسـە کە زاراوەی [گوتیەکان] لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا لە روی نژادەوە وشەیەك بوو کـە لـەگـەل واقیعی هۆزەکانی ژورووی رۆژهـەڵاتو رۆژ هەڵاتی ئاشوردا ئەگونجا • هەر چۆن بێت ئاشوریەکان لە هەزارەی دووەما لە ناکاو دەستیان لە کوێستان نشینەکانی گوتیو لولوییو هینی تر ئەوەشاند ، وە لە بارەی مەحکەم کردنو بەهێز بونی دەسەڵاتی خۆیانەوە نەخشەیەکیان نەبوە•

لە کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا ئەو لەشکر کەشیانەی کە لە

لایەن پادشایانی دەوڵـەتێکی کوێلـەداری ترەوە ـ واتا عیلام ـ بە مەبەستی فراوان کردنی وڵاتـەوە بووە ، وە لـەئەنجامدا سـەرچاوەکانی تر لە بارەی مێژووی سەرزەمینی ئایندەی مادەوە بە دەستی ئێمە گەیشتووە کـە ئەوانیش هەروەك هەمان نوسراوەی عیلامیەکانن • بەڵام بـە داخەوە تا ئیستە نوسراوە عیلامیەکان ـ کە تەنیا بـەو زمانـە نوسرابێتەوە ـ وەکو پێویستە لـێی تـێ ناگەین • بەڵام باسەکە بە شێوەی گشتی روناکە •

وەکو لەمەوبەر وترا دامەزراندنی دەوڵەتی عیلام کە یەکێك بووە لـە کۆنترین کۆمەڵگاکان وە لە بارەی کشتوکاڵەوە بە ئاوی روبارەکان ئاودێری یان کردوە • لە نیوەی یەکەمی وەیان ناوەراستی هـەزارەی سێیەمی پێش زاینی پێك هاتوە • عیلامیەکان چەند جار نیشانی سـومەرو ئاکادەکانیان داوە کـە دراوسێیەکی نارەحەتو مەترسیدارن ، بـۆ نمونـە لـە تێك چونی دەوڵـەتی زنجیرەی سێیەمی [ئور] کـە نزیکـەی دوو هـەزار سـاڵ پێش زاینـی بـو بەشداری یان کردو دوایی لە سەدەی نۆزدەیەمی پێش زاینی [کوتورماپوك] کە حوکمرانی یەکێ لە ناوچە سنوریەکانی عیلام بو کورەکانی خۆی [ لە پێشدا «واراد ـ سین» وە ئەو جار «ریم ـ سین» چونە سەر تەخت ، بە دەسەڵات ترین پادشای بین النهرین واتا [لارسا] کـە دواجار حامـورابی گرتی • هـەروەها عیلامیەکان وەکو کاسیەکان لـە بابـل دا خەریك خۆ قایم کردنو خۆ گورج کردنەوە بون ، لـە ناوەراسـتی هـەزارەی دووەمـی پێـش زاینـی عیـلام ئەمپەراتورێتێکی بە دەستەڵاتی هـەبو ، لـە سـەدەی چواردەیەمی پێش زاینی سوڵتانەکانی عیلام کەوتنە پیلان دانان بۆ ئەوەی بابل بگرنـە ژێر دەستەڵاتی خۆیان • لەو کاتەدا کە کاسیەکان هەوڵی ئەوەیان ئەدا عیلام داگیر بکەن • بەڵام کۆمەڵە سەرکەوتنێکی عیلامیەکان لە سەدەی دوازدەیەمی پێش زاینی دا رویدا • واتا لـە سەردەمی سەڵتەنەتی [ شوتروك ـ نا خونتەی یەکەم ] وە [شیلخاك ـ ئینشو شیناك] •

[شوتروك ـ ناخونتەی یەکەم] بە یەکجاری بابلیەکانی شکاندا ، کە لەو کاتەدا بابل بە دەستی کاسیەکانەوە بۆ [لە **١١٧٥**ی پێش زاینی دا]وە لە دوای ئەوە زنجیرەی سەلتەنەتی لەوێدا گۆڕا • بـەلام لـە بارەی کردەوەو بگرەو بەردەی شەڕە کانیەوە لە نوسراوەکانی خۆیا ئەوەندە زانیاری ناداتە دەست ، وە لـە شوێنـەوارە نوسراوە جۆربەجۆرەکانا وە یـان شتێکی تر کـە بـاسی شارستانیەت‌و فەرهەنگی بابل بووەو ئەو تالانی کردوە چەند سەرچاوەیەك بـە دەستەوەیە(١٥٩) •

ئەوە ئەزانین کە ئەو شاری [ئاشنوناك] ـ نیشنونوکو ـ ـکە لەو کاتەدا سولتانی تایبەتی بووە ـ داگیری کردوە(١٦٠) •جگە لەمە لەگەل لەشکریەکانی خۆیا لە ناوچە کوێستانیـەکانی [پادان] کـە زوربـەی جار لـەژێر دەسەلاتی کاسیەکانا بووە ماوەیەك لـە گەلیانا ژیاوە(١٦١) • وە پێشکەوتنی ئاشور دانای یەکەمی پادشای ئاشوری لەو ناوچەیەدا ئیفلیج کرد • نوسراوەکانی [شوتروك ـ ناخونتەی یەکەم] لە کێوەکانی [خاشمار] کـە لـە دەرەوەی سنوری زەوی‌و زاری کاسیەکاندا بوو(١٦٣) وە [کرینتاش] کـە لەوە ئەچێ شاری [کرند]ی ئیستا بوبێت باسی ئەکات(١٦٤) •

[شیلخاك ـ ئینشوشیناك] ، [لە نزیکەی **١١٦٥** تا **١١٥١** ی پێش زاینی] کوڕی دووەمی [شوتروك ناخونتەی یەکەم] چەند جار لەشکری هێناوەتە سەر زاگروس‌و ئاشوریەکان • وە ئەمە بۆتە هۆی دەس بەسەرا گرتنی دەراوەکانی دیالە [ئادم]و•••(١٦٥) • بـەلام عیلامیەکان نەیان ئەتوانی دەستەلاتی خۆیان ماوەیەکی درێژ لەو ناوچانە بەهێز بکەن [نابو خود نوسوری یەکەم] « بخت النصر » پادشای تازەی بابل لە کەنارەکانی روباری (**کرخە**) دوایەمین پادشای عیلامیەکانی شـکاند • وە جارێکی تر دەراوی ئەو ناوچەیەی تاکو [خاشمار] داگیر کرد • هەروەها سەنەدێکمان دەست کـەوتوە کـە [ نابوخود نوسوری یەکەم ] زەوی‌و زاری سـەرداری خۆی « ریتی ـ ماردوك » لە خانـەدانی

کاستی(؟) [کار زیابکو]ی ــ کە کەوتۆتە نامار ــ لە هەمو رسوماتێکی باج و خەراج بەخشی[166] • وە نەختێك دواتر ئەبینین کە یەکێك بە ناوی [ ئەعاموکین زری ] لە خەڵکی [ خاشمار ] لەسەر تەختی سەڵتەنەتی بابل دانیشتوە[167] •

[ نابوخود نوسوری یەکەم ] باسی سەرکەوتنەکەی بەسەر لولوییو کاسیەکانا ئەکات •

سەدەی یازدەیەمی پێش زاینی سەردەمی بەرز بونەوەی ئاشور بوو ،لەو سەردەمەدا [تیگلا تپالاساری یەکەم] بابلی داگیر کردو کیشوەری ناوبراو دوای ئەوە ماوەیەکی درێژ لەناو کۆڕی دەوڵەتە گەورەکانا دەرچوو • بەڵام لە عیلام دوبارە ماوەیەکی درێژ پادشای داگیرکەرو لێ هاتویان تیانەبوە ، چونکە لە کۆتایی سەدەی یازدەیەمی پێش زاینیدا ، ئاشور لە ئەنجامی بەربەرەکانێ لەگەل بیابان نشینە کوچەرە پەلامار دەرە ئارامیەکانا کە لە بیابانی سوریەوە هاتبوون [وە زورتر لەبەر باری ناخۆشی کۆمەڵایەتی ناو خۆ] زۆرتر لاواز بوو • وە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا لەشکرکەشیو پەلاماردانو بگرەو بەردە کە تا ئەو کاتە لە شوێنە جۆربەجۆرەکانەوە پەلاماری سەرزەمینی مادی ئایندەیان ئەدا ، راوەستابو • لەم کاتەدا رێڕەوی کۆمەڵایەتی ناوخۆیان لە بارەی پێکەیشتنی کۆمەڵایەتیەوە رێگای سروشتی گرتبو ، وە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی کۆمەڵگای ناوبراو پێی نایە ناو قۆناغێکی نوێ وە ، رۆژگارو سەردەمی پەیدا بونی چینایەتیو کۆمەڵگای خاوەن کۆیلەیی دەستی پێ کرد •

لەو جێگایەی کە لەو سەردەمەدا لەشکرکەشی دەوڵەتە خاوەن کویلەکان بۆ سەر ناوچە شاخاویەکانی زاگروس راوەستابو ، بەداخەوە قۆناغەکانی ژیانی سەرەتایی ئەو سەردەمە هیچ سەرچاوەیەك رونیان نەکردۆتەوە • وە ئێمە تەنیا لە هەمان لێکۆڵینەوەی لەشکرکەشیەکان سوود وەر ئەگرین ، وە

ناچارین بەشی داهاتوی مێژووی ماد لە سێ سەدە بەدواوە واتا لە سەدەی نۆزدەیەمی پێش زایینییەوە دەس پێ بکەین • بەم هۆیەوە ئەبێ رونکردنەوەیەکی گشتی پێك بێتو بێتە کایەوە ، وە ئەوە بزانرێ کە ئەو سەرزەمینەی لە دوایدا ناونرا ماد لە کوتایی هەزارەی دووەمی پێش زاینیەوە لەروی جۆری نژادی دانیشتوانو بەهێزی لەشکرەکانو روالەتی پەیوەندی لە چ پلەیەکدا بو بێت •

## ٧ ـ روخساری نژادی خەڵکی ماد ، هەزار ساڵ پێش زاینی

دروست بونی نژاد یان رەسەنی ماد ـ وە بەلای کەمەوە بەشی رۆژ ئاوای ئەو سەرزەمینە لەو رۆژگارەدا ـ بە ئەندازەی پێویست بۆمان رون بۆتەوە ، لەگەل ئەوەشدا لەوە ئەچێت هەندێك لەو زاراوەو نامە نژادیانە لە نووسینەوەدا گۆڕا بێ ، بەلام بەڵگەیەك بۆ گوڕینو گۆڕانە گرنگەکانی کۆمەلانی خەڵکی یەك نژادو یەك رەسەن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەدەستەوە نیە • وە بەم هۆیەوە ئەتوانین بڵێین کە دروست بونی • نژادی خەڵکی ئەو سەرزەمینە بە گشتی لە هەزاری سێیەمەوە تا سەرەتای هەزارەی یەکەم بەبێ گۆڕان بووە • خەڵکی سەراسەری ئەم ناوچەیە لە دەریاچەی نورمیەوە گرتویە [یان وەکو ئەو کۆمەڵە نژادە بچوكو سەربەخۆیانە کە لە دورگە نژادییەکانی لای دەریاچەی [وان]ەوە بون ١٦٨] • وە لولوییەکان لە ناوچەکانی رۆژ ئاوا ترو گوتیەکان لە ناوچەکانی روژ هەلات تر نیشتەجێ بون(١٦٩) • لەوە ئەچێ کە سێیەمین عونسوری نژادی کە لە هەمان ناوچە نیشتەجێ بون ئەوانە [مهرانی](١٧٠) بوبن •ناوچەی خواروی رۆژئاوا ئەمانە نژادی [کاسی] بوون(١٧١) • لەوە ئەچێ دانیشتوانی دەوروبەری کەناری دەریا ـکە لە دوایدا نووسەرەکانی سەردەمی کۆن بە [کاسپی] یان دائەنان •

وه له گەل کۆمەڵی کاسیو عیلامی تێکەڵ بون •

سەرەنجام لەوه ئەچێ کە له هەندێك ناوچـەی دەوروبەری دەریاچەی نورمیه [بە تایبەتی لـه رۆژئاواو ژووروویدا] وه هەروەها لـه هـەندێك لـه دەراوەکانی رۆژئاوای زاگروس نژادی هوریانی ئەژیان(١٧٢) • چەن سەنەدو بەڵگەیەکی شێوه راستو ناراست کـە لـه بارەی زمـانی ئـەم هۆزانەوه بـە دەستمانەوەیە بە تەواوی لەبارەی هوریانیو عیلامەکانەوەیە •

له سەرەتای هەزارەی یەکەمدا ، هەروەکو له خوارەوه دەر ئەکەوێ له رۆژهەڵاتی مادەوه عونسورێکی زمـان تازەو نژادی تر لـه ئاسیای ناوەراست دا بووه •

سەنەدو بەڵگە له بارەی بەهێزی هێزەکانی هۆزەکانەوه زۆر کـەمـە • بەگەل ئەمەدا بـە دڵنیاییەوه ئـەتوانین بڵێین کـە ئاژەڵداری لـە ناویانا زۆر تەشەنـەی کردبوو [بـە تایبـەتی بـەخێو کردنی ئەسپ] بووه ـ لـە دامێنی کێوەکانەوه ـ کشتوکاڵ زۆر بایەخی بووه و پێشکەوتو بووه(١٧٣) • وه لـه بارەی فلزکاریەوه [یان حـەوحۆش سازی] زۆر باش شـارەزا بون ، بـەڵام ئاسن تەنیا له سەرەتای هەزارەی یەکەم دا بەرە بەرە لـەو ناوچەیە بوژایەوە [هەر وەکو له زوربەی ناوچەکانی تری ئاسیای نزیك بەم جۆرە بوه] • ئەو ئالەتانەی کە بە بەردە چەخماخ [سیلکس] دروسـت کراوه هێشتا وازیان لێ نەهێنرا بوو [تیری بەردەچەخماخی تەپەی حەسار] •

له بارەی سازمانی کۆمەڵایەتی هۆزە ناوبراوەکانەوه ئـەتوانین چـەند بیروڕایەکی کەمو زۆر وه تاکو رادەیەك راست بینینەوه بۆ ئەوانە لـە بارەی وزەی قەوارەی ئابوریەوه یەکسـان نەبون • اولوییەکان کـە له کۆنا لەگـەل ناوچە پێشکەوتوەکانی ترا ـ کە پەیوەندی چینایەتیان تیا دەرکەوتبو ـ پەیوەندی دار بوون وه زیاد لەوانی تر پێشکەوتو بوون •

سـەرچاوه ئاشوریـەکان لـە سـەدەی نۆیەمی پێش زاینیـدا لـە روی

پیشەسازی [فلز]ەوە زۆرتر پێگەیشتوو [کامل] بوون چونکە شارەزاییەکی تەواویان لەو پێشەیەدا هەبوە ، وە ئەم پیشەیەش لە کۆنەوە لەناویانا باوی بووە .



**شوێنی نیشتەجێی کۆمەڵە نژادیەکان لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی دا ..**

ئەڵێن ئـەو سـەرچاوە ناوبراوانە لـە بارەی کشتوکاڵی لولوییـەکانەوە دواوون • فەرهـەنگ‌و شارستانێتی‌و زمـانی بابل‌و ئاشور لـەناو لولوییەکانی رۆژ ئاوادا زۆر بایەخی بووە گەڵیکیان لـە سـەردەمی کۆندا ناوی تایبـەتی ئاکادیان بووە[١٧٤] •



**سەرە پایەیەك کە وێنەی جوت کردن بە گا نیشان ئەدا ، لە تەپۆلکەی حەساردا دۆزراوەتەوە ـ هینی دەوروبەری دو هەزار ساڵ بەر لە زاینی‌یە**

هۆز پیشکەوتوەکانی تر [کاسی] دیسان بـە هۆی پەیوەندی نزیکی‌یەوە کە لەگەل بابلیەکانا بویانە روی قەبارەی بەهێز بون‌و پێ گەیشتنیان بـەرز تر بووە • وە لەوە ئەچێ چەند چینێکی جیا جیا بەرە بەرە لـە نیوانیانا پـەیدا بوبێت • ئەم وتەیەمان لە یاد نەچێ کـە ئەگەر ئـەو زاراوەی بەناو [مەفرغی لورستانی]یەوە ناو ئەبرێ ئەمە لە واقیعدا پەیوەندی بـە کاسیەکانەوە بووە • نابێت لە بارەی بایەخی فەرهـەنگ‌و شارستانێتی بابلیـەکانەوە لەناویانا هیچ بشارینەوە ،تارادە یەك شوێنەوارە هونەریەکانی[لورستان] سەر سوڕ هێنەربون•

بەلاّم لە بارەی گوتیەکانەوە •• نیشانەیەکی تر لـە بارەی سەربەخۆیی ئەوانەوە لەو شوێنەوارانەدا لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا دەر نەکەوتوە• بەلاّم ئەبێ ئەوە بلێین کە سەرچاوە ئاشوریەکانی ئـەو سـەردەمە بـە پێی

نەرێت باسی ئەوەی نەکردوە کە خەڵکی فلان وە یان هەمان ناوچەو لە کام هۆز بون ـ مەگەر لە هەندێك کاتا کە باسی بیابان نشینەکان بکەن وە یان ساختومانی فلان هۆز زۆرتر لە روی سیاسیەوە خراوەتە بەرچاو ـ بەم جۆرە جێگای سەرنجە کە سەرچاوە ئاشوریەکان ـ وەکو ـ تەنیالە [ مادای ] madai لە گەل یەکێتی مادا ئەدوێ وە لە بارەی هۆزەکانی مادەوە بە جیا جیا هیچ نادوێ • وە ناوی هۆزە ناوبراوەکانی ئێمە تەنیا لە نوسینەکانی هردوت وەری ئەگرین • بەلام لە باردی یەکێتی هوزەکانی مادەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی لە سەرچاوەکانا باس کراوە • وە لەو کاتەدا شوێنی ئەوان ـ هەروەکو لە دوایدا باس ئەکەین ـ لە رۆژ هەلاتی مادی ئایندە وە تارادەیەك لە بەشی ناوەراستی ئەوا نوسیویانە • لە سەرزەمینەکانی رۆژ ئاواتر لە چەند ناوچەیەکی بچوك وەیان تەنانەت باسی شوێنێکی نیشتەجێ بونمان بۆ ئەکات • وە ناوچەو شوێنە باسکراوەکانی ئەم



**دەفرێکی جوان لەرمواندز**
**[ سنوری رۆژئاوای ماد ]**
**نزیکەی هەزار ساڵ بەر لە زاینی**



**دەفرێکی جوان لە [ماننا]**
**سەرەتای هەزارەی یەکەمی**
**بەر لە زاینی**

دوایە لە ناوچەیەکدا بون کە دیاری کردنی شوێنەکان بەلای خەڵکەکانی ئەو ناوچەیەوە زۆر گرنگ بووە • نەك دیاری کردنی هۆزەکان ، وە ئەمە خۆی نیشانەی پەیدا بونی کۆمەڵگای چینایەتی دەر ئەخات •

هەروەکو لە یادمانە لـە ناوچەی ژورووی ڕۆژ ئاوا ـ واتا سەرزەمینی گوتیو هوریانی ـ یەکەمین نیشانەی دابەشکردنی کۆمەڵ بەچـەند چینێك زوتر ئاشـکرا بو • [هەروەکو لە شتومەکی ناو گۆڕەکانی گۆڕستانی گۆی تەپە دەر ئەکەوێ • لە ڕۆژگارێکدا کـە ئیستە مەبەستی ئێمەیە کۆیلەداریو خاوەن کوێلەیی زۆر باوی بووە ، هەروەکو لە گۆڕی گوی تـەپە [ جۆرە سنوفێکی بەردین ] ـ کە لەوە ئەچێ هین سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی بێ ـ دوازدە قەوارەی ئیسقانی تیا دۆزراوەتەوە کە بە بیروڕای نزیك بەراست زوربەیان هینی خاوەن کوێلەکان بووە(١٧٥) •

بڵاو بوونەوەی فراوانی هەندێك لە جۆری پیشە دەستکردەکان [وەکو دەفری شێوە قۆری وە ملوانکەی عاقیقو هینی تر کە لەو سەردەمەدا لـەو ناوچەفراوانـەدا پـەیدا بوو] بـە فراوانیو هـەمیشـەیی لـەنێوان هۆزەکـاندا دروسـت ئـەکرا • لـەگـەڵ ئەمـەشـدا نیشانەی ئـەنجامی دابەشکردنی کارو پیشە لـە نێوان پیشـە گـەرەکانو کشتوکاڵیەکان لـەناو هـەر هـۆزێکدا کـە مـەرجی پێویسـتیو پـەیدا بونی ئابوریو ناکوکی چونێتی دارایی خەڵکی ئەبو ـ لـەو ڕۆژگارەدا هێشتا نـەبوبو • ناکوکی خەڵك لەبارەیماڵو ناڵەوە لـەروی نەرێتی ڕۆژگارەوە واتا سـود وەرگـرتن لـە رادەی بـەرهـەم هێنـانی کشـتوکاڵیو ئاژەڵداری وەکویەك نەبون •

هەروەها لە دووەمین بەشی کۆمەڵایەتی کارکردن کە سەرەتای پـەیدا بوونی کومەڵگای چینایەتە ـ لە گـەلێك روەوە ئێمـە شتێکی کـەممان بـە دەستەوەیە • ئەگەر پیشە سازیە فلزیەکانی لوڕستان [کە وێنەیان لە بەشـە کانی تری ماددا نە دۆزراوەتەوە] ئەوە بگەیەنێ کـە ئەمە پیشەی کۆمەڵێك بووە • لـە لایـەکی ترەوە هـەر وەکو چـەرخی گۆزەگـەری کـە تـەنیا گۆزەگەرەکان ئەیکەن لە هەموو جێگایەکدا نەبوبو بە باو •

ئەگەر بڵێین لە کۆتایی هەزارەی دووەمو سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی لە مادی رۆژئاوادا کۆمەڵگایەك لە چوار چێوەی پەیوەندی ناوبراوا لە دۆخی کامڵ ترین ناوچەی ئەو سەرزەمینەدا بووە • لە ناوچە کوێستانیەکانو شوێنە دوا کەوتوەکانی تر لە بارەی پەیوەندی ناوبراوەوە تەنیا شوێنەوارێك دەست کەوتوە ، وە یان بە شێوەی گشتی هێشتا نەریتی کۆمەڵایەتی سەرەتایی لە ویدا باو بووە - بەڵام لە بارەی مادی رۆژ هەڵاتەوە تا کوتایی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی هیچ جۆرە سەنەدو بەڵگەیەکی بەکەڵکی ئەوتومان لەم بارەیەوە بە دەستەوە نیە [جگە لە هەڵگەندراوەکانی تەپەی حەسار کە لە دەرەوەی سنوری ماددا بووە - بەڵام لە بارەی بەراورد کردنەوە لەگەل رۆژگاری دوایدا ئەتوانین قسەی لێوە بکەین کە ناوچەی ناوبراو بە تایبەتی بەشی رۆژئاوای زۆر دواکەوتو بوە ، وە لە ئەنجامدا باری کۆمەلایەتی سەردەمی کۆمەڵە خێڵەکیە سەرەتاییەکان بە تەواوەتی فەرمانڕەوا بون تیایا •

لەگەل ئەمەشدا لە هەندێك شوێنی ئەو ناوچانەی لەم دوایەدا باسمان کردن کشتوکاڵ لە پەرەپێدانو پێشکەوتنا بووە ، وە ئەمەش وە نەبێ تەنیا بە هاوکاریو شێوەی کوڵۆکوتی بەردین سەرەتایی بەڵکو تەنانەت لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا بەهۆی ئامێرێکی شێوە گاسن کە بە گا رایان ئەکێشا سودیان وەرگرتوە • رونکردنەوەو دۆزینەوەی کۆنە شوناسان لە بارەی پەیدا بونی چەکی بەرگریو پەلامار دانەوە [خەنجەری مسو سەرە نێزە کلاوی ئاسنین] وە فراوانی ئالو گۆڕی نێوان هۆزەکان [دۆزینەوەی عەنبەرو عافیقی سورو پیرۆزەو بەردی لاجیوەردو بەردی مارو بەردی یەمانی] باس ئەکەن لە گۆڕستانەکانا ، چەند گۆڕێکی گەورەی پێشەواکان لە نێوان گۆڕە بچوکەکاندا کەلەوە ئەچن گۆڕی بۆرە پیاوان بووبن بەرچاو ئەکەون• وە ئەمە خۆی بەڵگەی سەرەتای پەیدا بوونی ناکوکی ژیانە •

# سەردەمی پێکهاتنی بنەڕیتی کۆیلەداری لەسەر زەمینی ماددا

## ١ ـماناو یەکێتی هۆزەکانی ماد

لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا ـ لە دوای راوەستانێکی سێ سەد ساڵەیی جارێکی تر لە بارەی چۆنێتی سەرزەمینی مادەوە چەند زانیاریەکمان دەست کەوتوە ، هەرچەند وا بڵاوە کە ئەو سەرچاوانەی باسی مادیان کردوە بێ کەڵکن ، سەرچاوە ئاشوریەکان ـ لە سەدەی نۆیەمەوە تا حەوتەمی پێش زاینی ـ نەك تەنیا بۆ زیندو کردنەوەی مێژوی ئەو سەردەمە بەسە ، بەڵکو هەندێك شتی وردیش رون ئەکەنەوە[١] •

لەناو ئەو دەوڵەتانەدا کە یەکەمجار لە سەرزەمینی ئایندەی ماددا کە لەو سەردەمەدا دامەزران‌و ئێمە باسیان لێوە ئەکەین ،لە سەرەتاوە نەخشبەیەکی رابەری کردنیان لەوددوڵەتە بچوکانەی لە ناوچەی [زاموا] کە نیشتەجێی لولوو گویتەکان بۆ ئەکێشا • دوایی ـ وەکو دیمان ـ دەوڵەتی [ مانا ] لەو سەردەمەدا دامەزرا ، پایتەختی ئەم دەوڵەتە لە ناوچەی خواروی دەریاچەی ئورمیە بووە ، دەوڵەتی [مانا] لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینی چەند جار لەگەل ئاشورو [ئورارتو]دا کەوتۆتە شەڕەوە ، وە لە ئەنجامدا لەبەر هیچ دەوڵەتێکیان نەشکاوە • لەگەل ئەوەشدا دەوڵەتی ناوبراو کەمتر لە دەوڵەتە

گەورەکانی ئەو سەردەمە ـ واتا ئورارتو عیلامو فریجیە ـ ناوبانگی بووە • ئەمەش هۆی زۆر تری ئەوەیە کـە هێشتا نوسراو یان بەردە نوسراوەکانی پادشایانی مانا نەدۆزراوەتەوەو بە دەستەوە نیە • وە لە هیچ کام لە شارەکانی [مانا] دا شتی هـەڵکـەندراوە نـەدۆزراوەتـەوە ، وە ناچارین هـەمو ئـەو زانیاریانەی کـە لە بارەی ئـەم دەوڵەتەوە هەیەو لـە ساڵنامەکانی ئاشوریو ئورارتویی دا هەیە وەریان بگرین وە ئەم سەرچاوانە جونێتی دەوڵەتی مانا لە سەردەمی سەرکەوتنی ئاشوریان ئورارتودا [کە زۆر ئاڵۆزە] واتا چەرخی پێ نەگەیشتنو شکستی مانا باس ئەکەن(٢) •



**چەند پیاوێکی مادەکان یان مانناییەکان لە نەخشێکی ئاشوریەکانا وەرگیراوە ، سەردەمی شاروکین [لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی دا] •**

لەگەل ئەمەشدا تەنانەت ئـەو سەرچاوانەی بـە دەستەوەن تا رادەیەك زیندو کردنەوەی مێژووی مانایان کە دەوڵەتێکی سەرنج راکێشەر بووە،

وه لە مێژووی رۆژهەڵاتدا لـە هەزارەی یەکـەمی پێش زاینی دا دەورێکی گرنگی هەبوە ـ بۆمان رون ئەکەنەوە • کیشوەری مانئا لە دواییدا لـەروی فەرهەنگ‌و شارستانێتی‌و ئابوریەوە کۆڵەکەی ئەمپەراتوری مادیان لە سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا دامەزراند •

بەڵام لە سەرەتای هەزارەی یـەکـەمی پێش زاینی [ مانئا ] کـە لەو سەردەمەدا دەوڵەتێکی بچوکی لولویی‌و گۆتیەکان بوو جیا بوو لـە یەکێتی هۆزەکان ـ کە ئەویش لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی لـە ناوچەی خوارو نرو خوارووی رۆژ ئـاوا دا پـەیدا بوبو وە [ یـەکێتی هـۆزەکانی مـاد ] یان پێ ئەوتن •

لەم روەوە کە ئایا کام هۆز یان بەشێك بون لە یەکێتی ناوبراو ، لـەم بارەیەوە لـە سـەرچاوە ئاشوریەکانا هیچ زانیاری‌و بـەڵگـەیەکمان دەست ناکەوێ چونکـە ئاشوریـەکان خـۆیان لـە بارەی دابـەش کـردنی هۆزی ناوچەکانەوە کە بوبون بە مەیدانی لەشـکر کـەشی ئەوان هیچ زانیاریەکیان نەبو • ئەم سەرچاوانە تەنیا بـەرێك‌و پێکی باسی مادەکان ئەکـەن[٣] لەگەل ئەوەدا خاکی ئەوان بە چـەند ناوچەیەکی بچوك‌و سـەربەخۆ ناو ئەبات • وە ئەوە نیشان ئەدات کە یەکێتی هۆزەکانی ماد هەمویان قەوارەیەکیان بووە کە ئاشوریەکان بە ناچاریەوە حیسابیان بۆ ئەکردن • لەبەر ئەمە ناچارین کە بوونی یەکێتی هۆزەکانی ماد بەشتێکی راست بزانین • هێزە کانیشیان هەر لە ناو قەوارەی ئەو یەکێتی‌یەیاندا بووە ، چونکە لـە روی ئابوریەوە ئەوەندە بەهێز نەبون •

هەمو هۆزەکانی ماد لەناو ئـەو یەکێتی‌یەدا نـەبون ، وە هـەر بـەم هۆیەوە ئاشوریەکان هەندێك بە مادیان دانەئەنان‌و بە [مادای] یان نە ئەزانین• ئەو سەرزەمینەی کـە پێ‌یان ئـەوت ماد رواڵەتێکی گرینگی بووە ، وە ئەمە خۆی لەگەل ئـەو گۆڕانانەدا بووە کـە لـە بارەی دروست بونی واقعیەتی

یەکێتی هۆزەکانەوە پەیدا ئـەبو • ئەبێ ئەوەش بڵێین کـە لەبارەی نژادەوە ئەمە لە فلان هۆزەو یان ئـەم ناوە فلان هۆز ئـەگرێتەوە ئـەوەندە شتێکـی گرینگ نەبووە ، وە باسەکە لەسەر ئەم ریچکەیە روون نابێتەوە •

بۆ دیاری کردنی ناوی ئـەو هۆزانەی ئـەندامی یـەکێتی بون ئـەبێ قسەکانی هرودوت بێنینەوە • ئەو ئـەڵی : [١٠١ر١] مادەکان ئـەکران بـە شەش بەشەوە : بوسی، پارتاکنی ، ئاستروخاتی، ئاریزانتی ، بودی ،موغەکان

Bousai, **Paretakenoi**, Strouknates, Arizantoi, Boudioi, **magoi,**

لەناو ئەم هۆزانەدا تەنیا ناوی یـەك هۆز واتا [ پارتاکنی ] هەیـە وە



تیر هاوێژێکی ماننایییەکان سەدەی هەشتەمی پێش زاینی (؟)



پادشایەکی ماننایییەکان بە بەرگی ئاشوریەوە، لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا (؟)



مانناییەك بە بەرگی بابلیەوە لە سەدەی هـەشتەمی پێـش زاینیدا (؟)

هەروەها پارتاکنی یەکان لەگەل مادەکانا بەجیا ئەژیان وە هەندێك جار خۆیان بە بەشێك لەوان دائەنا [٧] بەلام لە بارەی هۆزەکانی تری مادەوە تەنیا ناوی [ئاریزانتی] رونە[٨] [ئاری- زنتو] arya-Zantu یان هۆزی ئاری•

بەم هۆیەوە پێویستە لە بارەی زاراوەی [ئاریا] – arya – کە دانشمەندەکانی رۆژئاوا زۆرتر لە هەر زاراوەیەکی تر سودیان لێ وەرگرتوە زۆر بە درێژتر قسەی لێوە بکەین •

لە رۆژگارێکدا کە زمانی سانسکریتی بە بنچینەی رستەی زمانەکانی هیندو ئەوروپا[٩] دائەنراو هیندستان بە سەرچاوەی رەسەنی هۆزەکانی هیندو ئەوروپایی ناو ئەبرا[١٠] ناوێك کە هیندیەکان لە رۆژگاری کۆنا لە خۆیان نابو واتا [ئاریا – arya ] دانشمەندەکان ئەم ناوەیان بە ناوی هەمو ئەو هۆزانە دائەنا کە بە زمانەکانی هیندو ئەوروپی قسەیان ئەکرد •



**چەند سوارێکی ئاریزانت یان پارتاکنی مادەکان ،لە سەر مۆرێك نەخش کراوە لە تەپۆلکەی سیلك دۆزراوەتەوە ، سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی**

لە دوایدا ئەوە سەلمێندرا[١١] کە هیندستان سەرچاوەی رەسەنی هیندو ئەوروپایی نیە ، وە بە پێچەوانەوە ئەم هۆزانە لە رۆژگاری دوایدا هاتونەتە ئەوێ‌و هەروەها زمانی سانسکریتیش بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت بکرێتە بنچینەی زمانەکانی هیندو ئەوروپایی • بەم جۆرە بەکارهێنانی زاراوەی

[ زمانە ئاریاییەکان ]و بەتایبەتی [ هۆزە ئاریاییەکان ] لەبارەی هەموو ئەو کەسانەوە کە بە زمانی هیندو ئەوروپایی دواوون کردەوەیەکی نازانستیانە بووەو پشت گوێ خراوە • دوای ئەمە فاشیزمە ئەلەمانیەکان ئەم زاراوەیانە گرت بەدەستەوەو ماناو ئەهمیەتی نژادی‌یان پێ داو لەگەل ئەوەشدا هیچ کات ئەمە مانایەکی زانستیانەی نەبووەو زاناکان بەمە رازی نەبون •

بەکار هێنانی زاراوەی [ئاریایی] لە بارەی ئەو هۆزانەوەیە کە لە سەرزەمینی کۆنی خۆیانا پێیان ئەوتن [ئاریا – arya وەکو][12] ماد[14]و ئەسکیت[15]و ئالان[16] و•••• بەلام تەنانەت نەبینراوە کە هۆزێك خۆی بە کۆمەلێکی تر وەیان بنەمالەیەکی زمانی تر بیت‌و خۆی بەم ناوەوە ناو ببات •

ئەو باسەی کە [ای• علیوف] قسەی لێوە ئەکات[18] زۆر لەوە ئەچێت ئەم زاراوەیە لە وشەی [ئاری بی – Aribi ] [عەرەبەکانی رۆژهەلات] کە یەکجار لە نوسراوەی ئاشوریەکانا لە بارەی هەندێك لە خەلکەکانی مادەوە بەکار هێنراوە وەر گیرابێ • وە [ئاری‌بی] بەم جۆرە دابنرێت کە پێك هاتوە لە [ئاری] لە گەل پاش‌گری عیلامی بۆ کۆمەل کە [ پە ] – Pe – بەکار هێنن [واتا ئاریەکان] بەلام ئەگەر ئەم قسەیە راست بێت ، تەنیا لەوە ئەدوێ کە ئاشوریەکان بەهۆی زمانی عیلامەوە لەگەل ئەم زاراوەیەدا ئاشنایەتیان پەیدا کردوە •

وە ئەمە ئاشکرایە کە [ئاریەکان] عیلام زمان نەبون[19] • هەندێك جاریش ئەنجام وا دەرئەکەوێت کە ئاریا – arya – و ئاریەکان ناوی هەمو ئەو هۆزو تیرانە بووە وە ئەم هۆزو تیرانەش خۆیان بەم جۆرە ناو بردوە • وە ئەمە بەلگەی ئەوەیە کە [ئاریزانیتەکان] [هۆزی ئاریاییەکان] لەبارەی زمانەوە پەیوەندی یان بەم کۆمەلەیەوە بوە •

بەلام باسێکی ترمان ئەمەیە کە ئایا چۆن ئاریزانیتەکان لەناو هۆزەکانی

ڕا بە [هۆزی ئارییایی] ناو ئەبران • [وە ئەمە بە ئەندازەی پێویست ڕوە تایبەتیەکانیان نیشان ئەدات] وە هۆزەکانی تری ماد نەیان ئەتوانی خۆیان بە [ئاریایی] حیساب بکەن ، قسمەیەکی تر وا ئەگەیەنێ کە کۆمەلانی خەلکی ماد لە گوتیو عیلامی زمانەکان وە بە شێوەی گشتی هۆزە [کاسیەکان] کە فێری زمانە تازە پێ گەیشتووەکانی هیندو ئەوروپایی بوبون لەوانە پێك ئەهاتن • وە نەبێ دانیشتوانی ئەو شوێنە هەموی گۆڕابن • ئەم باسە تا ئیستە لەبارەی ناوی هۆزەکانی [بوس] و [مغ] و [مغەکان] و [بودی] کە ریشەیان هیندو ئەوروپایین شتێکی وامان بە دەستەوە نیە کە ئەم باسە بسەلمێنێ •

[مغەکان] کە لە سەرانسەری ئێراندا کاهنەکان لەوان بون ، ئامۆژگاری ئاینی خۆیان بە زمانی ئێرانی ڕائەگەیاند[٢١] • لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینێ بە دواوە تا ڕادەیەك زوربەی هەمو ئەو نوسراوانەی ماد کە پێمان گەیشتوە ریشەیەکی ئاشکرای ئیرانیان هەیە[٢٢] وە جگە لە ناوی [هوزی ئاریزانتەکان] ـ کە قسەمان لێوە کرد ـ هەروەها نامەی هۆزەکانی پارتاکنیو ئاستروخانی ئەوانیش ریشەی زمانی ئێرانین • ئەم بەلگانە بەسە بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنین کە زمانی مادی [کۆمەلی ئێرانی] زمانی هاوبەشی تێکڕای یەکێتی هۆزەکانی ماد بوە[٢٣] •

وشەی [مادەکان]، [بەزمانی ـ ئاشوری = مادای madai ، ئامادای amadai ، ماتای matai ، بە زمانی عیلامی تازە = ماتاپە mata-pe بە زمانی عیبری کۆن = مادای madai ، بەزمانی پارسی کۆن = ماد mada ، بە زمانی یۆنانی کۆن = مدی medoi-madoi بە زمانی ئەرمەنی کۆن = مار ـ ك mar-k پارتی مات mat یەکێکە لە ناوەنژادیو جوگرافیەکان ، کە ریشەیەکی ئاشکرای لە زمانە ئێرانیەکانا نیە • لەگەل ئەوەشدا لەناو خەلکی ئەو سەرزەمینەدا کە لە

سەدەی نۆیەمی پێش زاینی بـە زمانی ئێرانی قسەیان کردوە باو بووە • وە ئەمە خۆی بە وشەیەکی تر واتا [ئامادای] کە بەرانبەر [مادای] لـە سەرچاوە ئاشوریەکانا دانراوە • ئەم شێوەیـە پێشگری [ئا] (a) وە بـە بێ ئـەوە بێ ئەوە شێوەی زمانە ئێرانیەکانە ، وە لە بارەی پەیدا بونی ناوی هۆزەکانەوە هاتۆتە دی • [ماردوی‌و ئاماردوی mardoi-amardoi بـەیۆنـانـی مـارتـا mareta ئەویستای ناوەراست ـ بەمانا [شەڕکەر] و [پیاوکوژ] ،وە یان پاسیانوی‌و ئاپاسیا کوی‌و(٢٤) هینی تر(٢٥) •

هەمو ئەو سەرچاوانەی سەرەوە وا ئەگەیەنن کـە لەوە ئەچێ یەکێتی هۆزەکانی ماد بەشێوەی یەکێتی‌یەکی هۆزایـەتی نا ئێرانی بوبێت‌و بـەشێك ئێرانی دانیشتوانی سـەرزەمنی ماد لـە دواییدا بەشێوەی [هۆزی ئاریایی]ی جیاواز دروست بوون(٢٦) • بیروڕایەکی تریش دۆزراوەتەوە ئەڵێ کونترین ناوی ماد لە زاراوەی نژادی [ماکت • پ](٢٧) کە بـە زمانی عیلامی تازەیە وەلەگەل وشەیەکی تری ئەو زمانەدا یان [ماتا • پ] مانای [مادەکان ـ وـماد] ئەگرێتەوە ئەمە شاردراوەتەوە(٢٨) •

لەوە ئەچێ زاراوەی [مادەکان] ریشەی زمانی [عیلامی ـ کاسپی]بوبێت • سەرچاوە ئاشوریەکان بەرامبەر بـە شێوەی [ مادای ] و [ ئامادای ] madai-amarai کە مانای یەکێتی هۆزەکانی مادە وشەی [ ماتای ] matai کە ریشەی عیلامی هەیە هێناویانە •

ئەمەش دیـآن لەوە ئەچێ کە زاراوەی [ مادەکان ] لـە کۆنەوە لەو سەرزەمینەدا باو بوە •

هەرچۆن بەراوردی بکەین نژادی ئێرانی کە بەرەبەرە زوربەیان لـە یەکێتی هۆزەکانی مادا بون لـەنژادی بومی ئەوسەرزەمینە نـەبون • ناوی شوێنەکانی ماد کە ماوەیەکی زۆر لـە سەرزەمینی مادا بایـەخی بووە بـە شێوەی گشتی ئێرانی نیـە [لـە هەندێك کاتا عیلامی بوە] ئەمـە خۆی ئـەم راستیەمان ئەدات بە دەستەوە • بەڵام ئەم باسە خۆی لە خۆیا ئەوە ناگەیەنێ

که لەو سەرزەمینەو لە سەردەمی ئەو کەسانەدا بەلای ئەوانەوە کە ئێرانی نەبونو لەو ناوچەیەشدا ژیاون ـ لە کاتێکدا کە زمانی دانیشتوان نەخشەیەك ئەگۆڕێ ناوی شوێنەکان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە ، وە ئەمە شتێکی ئاسایی یە • بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەم دیاردەیە بە ئاشکرا ئەوە نیشان ئەدات کە بەر لە دانیشتوانە ئێرانی زمانەکان ، خەڵکی تر لەو ناوەدا ژیاوون وە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە زمانی ئێرانی بەرەبەرە وە بە بێ تواندنەوە یان دەرکردنی دانیشتوانی ناوچەکە ، وە لە رێگای یەکگرتنەوەی قسە کەرەکانەوە هەردوو زمانەکە هاتە کایەوە ، وە ژمارەیەك خەڵکی رەسەنی بومی لە وانەی کەتازە هاتوون زورتر بون • هەروەها لەو نامە کۆنانەدا دەر ئەکەوێ کە بومیەکان نەیان ئەتوانی بە تازەپێ گەیشتووەکان بگەنو ناوی جوگرافیای بومی یان بەناوی ئێرانی‌یەوە ئەنا •

لە سەرزەمینی ماد لە سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی ـ چ لەروی زاراوەی جوگرافیایی‌و چ ناوی تایبەتیەوە ـ زمانی ئێرانی لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژ ئاوا پێشکەوت • ئەگەر پەیوەندی نیوان زمانی ماد لەگەل زمانەکانی ئاسیای ناوەراستدا بگرینە بەرچاومان گومانی تیا نامێنێ کە سەرچاوەی رەسەنێتی نژادی ماد لە ئاسیای ناوەراستدا بووە •

لە رۆژگارێکدا کە سەرچاوە ئاشوریەکان باسی لێوە ئەکەن زمانی ئێرانی تارادەیەك لە سنوری ناوچەی [٤و٣] بە ولاوە نەبود ، وە لە ناوچەکانی [٧و ٦و ٥ و٤ وە رەنگ بێ ٣ی نەخشەکەمان] رەگەزی ئێرانی بە تەواوی ون بوبو • وە لە ناوچەی [١٠و١١و١٢] [سەرچاوەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی بەدواوە بە دەستەوەیە] • زمانی ئێرانی رەگەزەکانی تری داپۆشیبو • وە زمانەکانی تری ناوچەکانی ئیستای ئازربایجانو کوردستانی ئێران لە سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی ئێرانی نەبون ، وە دانیشتوانی ئەو ناوچانە بە زمانی لولویی‌و گوتی‌و لەو

بابەتە قسەیان کردوە • بـەڵام رۆژهەڵاتی مـاد واتا ناوچـەی تارانی ئیستاو ئەسفەهان هەمویان بە زمانی ئێرانی [کە بە هۆی هۆزەکانی ئاسیای ناوەراستەوە کە بە پەروەردە کردنی ئەسپو سوارچێتی‌یەوە خـەریك بونو هاتبونە ئـەو ناوچەیەوە] ئەدوان •



**سوارێکی ئاریزانتی دادەکان ، لەروی مۆرێکی عیلامیەکان نەخش کراوە •• سەدەی حەوتەمو شەشەمی پێش زاینی •**

بەڵام لە بەر ئەوە ئەو هۆزانە بـە پەروەردە کردنی ئەسپەوە خـەریك بون لە چەند بابەت بینراوە : یەکەم ئـەو زاراوانەی لـە بارەی پـەروەردە کردنی ئەسپەوە بەکار هێنراون وە لە هەزارەی دووەمی پێش زاینی بەزمانی هیندیو ئێرانی بووە [رەنگ بێ هیندی] لـەم سـەردەمـەدا ئیرانیو مـادی بوبیت[٢٩] • هەروەکو ئاس ــ asa ــ ی فارسی کون واتا ــ ئەسپ ــ وە لـە زمانی پارسی کۆندا وردە وردە بوە بە ئەسپ ــ aspa ــ ی مـادی

پارتی • له بابل که چاندنی شه‌ودر لـه بین‌النهرین دا تازه دۆزرابوه‌وه بـه زمانی مادی پێیان ئه‌وت [ئه‌سپست asp-a-asta ـ واتا خوارده‌مه‌نی ئه‌سپ •وه یه‌که‌مجار له سه‌ده‌ی هه‌شته‌می پێش زایینی باسی لێوه کراوه[30] • ئه‌و ئه‌سپانه‌ی که له سه‌رزه‌مینی مادا په‌روه‌رده ئه‌کران[31] لـه کۆندا زۆر به ناوبانگ بون ، وه ئاشوریه‌کان له جیاتی باج‌و خه‌راج ته‌نیا ئه‌سپیان لـه ماده‌کان وه‌ر ئه‌گرت • ره‌نگ بێ بـه‌هۆی ئه‌مـه‌وه ئاریزانتیه‌کان توانیبێتیان له‌ناو یـه‌کێتی هۆزه‌کانی مادا شوێن‌و پایه‌یـه‌کی وا گرنگ بگرنـه‌وه کـه زمانیان تێکه‌ڵ به زمانی ئه‌و هۆزانه ببێت • ئه‌مه بوو به هۆی ئه‌وه کـه ببنه سوارکارو خاوه‌نی عاره‌بانه‌ی ئه‌سپی •

شوێن‌و ناوچه‌ی هه‌ریه‌ك له هۆزه‌کانی ئه‌ندامی یه‌کێتی ناوبراو به‌راستی نازانرێت • به‌ڵام ئه‌ڵێن که ئاریزانیته‌کان له‌و پـه‌ڕی ناوچه‌ی رۆژهـه‌ڵاتی ماد ژیاوون ، وه ره‌نگ بێ مغه‌کان ئه‌وانیش هه‌ر له‌و شوێنانه‌دا ژیابن [ له نزیك رغا ــ که له سه‌ده‌کانی ناوه‌راستدا پێیان وتوه «ره‌ی» ] ، له نزیك تارانی ئێستاوه • هرودوت له باره‌ی باسکردنی هۆزه‌کانی پارسه‌وه [۱/۱۲۵] به پێشا ناوی پاسارگادیان ئه‌بات کـه بنه‌ماڵه‌ی خانـه‌دانێتی هـه‌خامه‌نشیه‌کان نه‌وان بووه • ئه‌گه‌ر هرودوت هه‌ر به هه‌مان به‌ڵگه [بوسیه‌کان]ی زۆرتر له هۆزه‌کانی تری ماد ناو ببردایه ، له‌وه ئه‌چێ شوێنی نیشته‌جێی ئه‌وانی بـه ناوچه‌ی هه‌مه‌دانی ئێستا [که له دواییدا بوو به پایته‌ختی ماد] دابنابایه • ئه‌وه ئه‌زانین کـه [ پارتاکنیان ] لـه نزیك ئه‌سفه‌هانی ئێستاوه ژیاوون • به‌ڵام [بودیه‌کان] ره‌نگ بێ شـوێنیان لـه ئه‌وپـه‌ری ناوچـه‌ی رۆژئاوای هـۆزی ماد بوبێت[32] •

ف• ئینگلز له باره‌ی په‌یدابونی یه‌کێتی هۆزه‌کانه‌وه به‌م جۆره ئه‌ڵێت : [پێویستی ئه‌و سه‌رده‌مه ئه‌وه‌ی ئه‌خولقاند کـه یـه‌کێتی لـه نێوان هۆزه‌کانا پێك بێت ، که ئه‌و پێویستی‌یه نه‌ئه‌ما ئه‌و یه‌کیه‌تیه‌ش له‌ناو ئه‌چو ، لـه‌گه‌ل

ئەمەدا لە هەندێك ناوچەدا چەند هۆزێك کە لە سەرەتاوە لـە یەکتر نزیك بون‌و لە دوایدا لەیەکتر دور کەوتبونەوە سـەر لەنوێ یەکێتی‌یەکی درێژ خایەنیان دروست ئەکردەوە وە بەم رێگایە بەرەو یەکخستنی میلەت هەنگاویان ئەنا] ئەو لە بارەی [ئیروکزەکان]ەوە ئەڵێت :[1] [چونکە ئەو ناوچەیانە بـە تازەیی داگیر کردبو بە تەواوی هۆزە ناوبراوەکان لـە دژی ئـەو هۆزانەی کـە دەریان کردبون یـەکیـان گرت ، وە ئەمـە ناویانا بوو بـە نـەرێتێکی کۆمەلایەتی] ئـەم یـەکێتی‌یـە هۆزەکانی خۆیانی بـەهێز ئـەکردو خۆیان بۆ پەلاماردان ئامادە ئەکرد ، وە ناوچـەکانی دەوردبەریان داگیر ئـەکردو هـەندێکی خەڵکەکەیان لـەو سەرزەمینە دەرئەکردو ئـەو بەشەکەی تریشی باج‌و خەراجیان ئەخستنە پێ • بەلام یەکێتی هۆزەکانی ماد هەر لە سەرەتاوە ئەیان توانی ئـەم جۆرە کارانە بکـەن [جگە لەوە ئـەم یـەکێتی ئەو هۆزە ناوچەییانە بون کە لە دژی سواران‌و ئەسپ پەروەرەکانی ئاسیای ناوەراست دابون وەیان بە پێچەوانەوە ئەو یەکیەتیە لە دژی هۆزە ناوچەییەکان بووە] •

پلەی پێگەیشتن‌و کامڵ بونی مادەکان لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا لە [ئیروکز]ەکان پیشکەوتو تربوە ، هەروەکو لە دوایدا دەرکەوت دابەش کردنی زەوی کومەڵو هۆی دروست بونی دەوڵەت لەناویانا پەیدا بوبو • بەم جۆرە تایبـەتیەکانی یـەکێتی هۆزەکانی ماد ، تارادەیـەك لـەگـەل یـەکێتی [ئیروکز]ەکان جیـاوازی هـەبو ، نوسـەری باسکراو ئەڵێ : کـە یـەکێتی [ئیروکز]ەکان یەکیتیەکی هۆزەکان بووە کە لەگەل یەکتردا لێکەوە نزیك بون‌و زمانێکی هاوبـەشیان بووە • هـەمو یـەکیتیەکانی هۆزەکانی هیند یان ژوروی ئەمەریکا بەم جۆرە بوە ، بەبێ [کریکیان]کـە هۆزێکی بێگانە بون‌و لەناو یەکیەتیەکەیانا بون[33] • یـەکێتی [ئاتس‌تکان] بومیـەکانی ئەمـەریکا

---

**(1) ئەوروپاییەکان شـەش کۆمـەڵی پیست سـور لـە خواروی رۆژئاوای دەریاچەکانی ئاریەو ئونتاریودا بەم جۆرە ناو ئەبەن ـ وەرگێر •**

لەبارەی پلەی پێ گەیشتنیانەوە لە یەکێتی هۆزەکانی ماد زۆرتر نزیک بون
اماکو ئەوان ، یەکێتی ناوبراو لە سەرەتاوە شێوەیەکی بەرگرییانەی هەبو ،
وە دواجار شێوەی پەلاماردانی تیا پەیدابو(٣٤) وە ئەو هۆزانەی کە زمانیان
لە هۆزە رەسەنەکانەوە نزیك نەبوە ئەوانیش هەر ئەندام بون بەڵام نەك بە
شێوەی ئەندامێکی رەسەن ، چونکە لەبەر جیاوازی زمانی ئەوانیان لەناو
ئەنجومەنە گشتییەکانا دەرئەکرد وە بە کاریان نەئەهێنان(٣٥) .



**عەرەبانەیەکی مادەکان کە بە ماین رای ئەکێشن ، لە [پرسپولیس ـ ئەستێل]**
**سەدەی پێنجەمی پێش زاینی**

تەنیا رێگای لابردنی ئەم کارە ئەوە بوە کە زمانی یەکێ لە هۆزە
بایەخدارەکان بە ناوی زمانی هاو بەشیەوە لە نێوان هۆزەکانا بووە . وەکو
ئاشکرایە ئەم کارەش لەناو هۆزەکانی مادا رویداوە . بەم جۆرە بە ئاشکرا
دەرئەکەوێ کە بە پێی فراوان بوونی سنوری سەر زەمینی ماد لە سەدەکانی
حەوتەمو شەشەمی پێش زاینیدا بوو بە هۆی بلاو بوونەوەی زمانی مادی ـ
ئیرانی ،وە یەکێك لە نیشانەکانی هەمان فراوانی بلاو بونەوەی ناوی
مادی ـ ئیرانی یە .

ف. ئینگلز ئەوە دێنێتەوە یاد کە یەکێتی هۆزەکان لە سەر پایەی ئەو هۆزانە پێك هاتبون کە ئەندامی دامەزرێنەری ئەو یەکیەتیە بون . یەکێتی هۆزەکان وەکو سەرەتای دروست بونی دەوڵەتێکی تازە وابون ، هەروەکو لە سەرنجدانی مێژوودا دەرئەکەویت دەوڵەت بە رێکەوت لەسەر بنچینەی یەکێتی هۆزەکان پێ ئەگات وە هەندێك جار ئەو یەکیەتەش لەناو ئەبات . کۆنترین دەوڵەتیان لەو بەشانە پێك هاتوە کە لە یەکێتی هۆزەکان بچوکتر بون(٣٦) . لەگەل ئەمەشدا لە سەرزەمینی ماد یەکێتی هۆزەکان لە سەردەمی کوچەریەکانا دیسان دەوڵەتیان راگرتوە ،[هەروەکو پاشماوەی دامەزراوەکانی کوتایی سەردەمی کۆمەڵگای سەرەتایی] مابونەوە .

ئەگەرچی ئیستە بە نارەحەت ئەتوانین هۆیەکانی دروست بونی یەکێتی هۆزەکانی ماد رون بکەینەوە ، وە ئەم گیرو گرفتە کە یەکێتی ناوبراو لایەنی بەرگری بووە یان پەلاماردان چارەسەر بکەین ، لەگەل ئەوەدا کە ماوەی درێژی ئەو رۆژگارە لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ماد ، وە پێویستی



**دەفرێکی نەخشینراوی [پارتاکنا – خواروی رۆژ هەڵاتی ماد] لە تەپۆلکەی سیلك دۆزراوەتەوە .. [سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی]**

هاوکاری هۆزە ناوبراوەکان باس بکەین – چاو پوشی لە سەرچاوەو کۆمەڵەکانیان – خەریکی بەربەرەکانێی پەلامار دەرانەی ئاشوریەکان بون لە

[٨٣٤ تا ٧٨٨ی پیش زاینی] •

لەو سەرزەمینەی کە لەدوایدا بوو بە بەشی رۆژ ئاوای دەوڵەتی ماد بەرامبەر بە [مانا]و یەکێتی هۆزەکانی ماد چەند کۆمەڵێکی سەربەخۆو بچوكو پادشایانی زۆر بچوك هەبون ، وە ئەمە لە رۆژگارێکدا بووە کە هۆزەکان لە هەوڵو تەقەلادا بونو هێشتا یەکیەتیەکی گەورەو دەوڵەتێکی سەربەخۆیان نەبووە • بەم جۆرە مادی رۆژئاوا لە سەدەی نۆیەم تاکو حەوتەمی پێش زاینی یەکەم پلەی کامڵ بوونی کۆمەڵگای چینایەتیو دەوڵەتی پێك هێناوە •

## ٢ ـ یەکەمین رۆژگاری پەلامار بردنی ئاشور ••

لەشکر کەشیەکانی ئاشور کە لە سەدەی نۆیەمدا لەو شوێنە باسکراوانەدا تازە بونەوە لە سەرەتاوە ـ هەروەکو پێشوو ـ زۆر بە دەستو بردانە بوو ، وە مەبەستیان زۆرتر تالان کردنیو بردنی مەڕو مالاتو دیل گرتنو بردن بوو ، هەرکات لەشکری ئاشوریەکان نزیك ئەبونەوە [بەرای زوربەی خەڵك ـ هەروەکو لە ئورارتودا باو بووە ـ لەسەر لوتکەی چیاکان ئاگریان ئەکردەوە ئەمە مانای ئەوە بووە کەوا لەشکری ئاشور هاتو نزیك بۆتەوە] ئینجا زوربەی دانیشتوان ئاوایەکانی خۆیان بەجێ ئەهێشتو ئاژاڵەکانیان ئەبرد بۆ پۆپەی چیا بەرزەکان ، ئیتر دوژمن تەی ئەتوانی شوێنیان بکەوێو تالانیان لێ بگرێ • وە ئەو ئاوایانەش کە شوێنەکانیان سەخت بوو وە یان شورایان بە دەورا کرابو مەڕو مالاتەکانیان لە ئاوایدا کۆ ئەکردەوەو لەگەل ئاشوریەکانا ئەکەوتنە شەڕەوە • بەم هۆیەوە ئەمارەتە بچوکەکان نەیان ئەتوانی دەست درێژی بکەنە سەر ئەو ئاوایانەی کە شورای مەحکەمیان بە دەورا کێشرابوو ، بەلام لەو کاتەدا دەستەلاتو شورایەکی وا مەحکەم لە ئاوایەکانا نەبوە کە بتوانن بە ئاسانی

بەرپەرچی پەلاماری ئاشوریەکان بدەنەوەو لە رویانا بوەستن[٣٧] • لە ئەنجامدا چاریان هەر ئەوە بووە کە پەنا بەرنە بەر کێوەکانو خۆیانو مەڕو ماڵاتەکانیانی تیا قایم بکەن • ئاشوریەکان بەرە بەرە دەستیان کێشانە سەر زەمینە کوێستانیەکان بۆ ئەوەی کە بە درێژایی کات تالآنیان بکەنو سودیان لێ دەست بکەوێ •



**قەلایەکی مادەکان لە نیمچەشاری ئیستای سیلك**

لە کۆتایی سەدەی دەیەمی پێش زاینی [ئاداد نراری] پادشای ئاشور [٩١١تا ٨٩٠ی پێش زاینی] ناوچەی [ئەو بەری زێی بچوك – سنوری کیشوەری لولومیەکان ـ لە [هابهی][٣٨]و [زاموا] تاکو گەردنەکانی کیشوەری [نامار][٣٩] لە روناکیدا ئەبینی ، وە بەر لەوە دیسان بەرەو سەرچاوەی زێی گەورە [زێی ژورو] رویشتبوو ، وە گەیشتبوە کیشوەری [میهری] کە لە نزیکی کەنارەکانی رۆژئاوای دەریاچەی ئورمیەیە[٤٠] • لە سەردەمی پادشایانی دوایی تری ئاشوریەکانا [توکولتی نینورتی دوەم] ، [کە لە ٨٨٥ی پێش زاینیدا لەشکر کەشی کرد][٤١] وە [ئاشور ناسیرا پالی دووەم] ، [کە

له ٨٨٣ و٨٨١ و٨٨٠ى پێش زایینیدا لەشكر كـەشی كرد] لەشكر كـەشیو دەست درێژی بۆ سەر ئەم ناوچانە هەر بەردەوام بوو[٤٢] •

لەشكر كـەشیەكانی [ئاشور ناسیراپالی دووەم] لە دەستدرێژیەكانی تر بەهێز تر بوو ، لـە لەشكر كەشی ســاڵی ٨٨٣ى پێش زایینی ئـەوەندە دەست درێژی یان نەكردە ســەر ناوچــەی زاموا ، وە پادشای ئاشــور لە رێـگای [كیروری]یەوە چو بو ناوچەی زێی گـەورە ئەو جار بـە گورجی چو بۆ ژوروی رۆژئاوا • لەگـەل ئەوەدا ناوچــە كوێستانیەكانی دەورو بەری ئەم راگوزەرە واتا [كیروری] و [سمیس] و [سیمرە] و [ئولمانیا] و [ئاداعوش] و [خارگا] و [خارماسا] نەك تەنیا ئـەسپو هێسترو ئاژەڵی شاخدارو شــەرابو دەفری مفرغیان بە دیاری بە پادشای ئاشور ئەدا بەڵكو خــەرجو باجیشیان خســتە پێ • دانیشتوانی ســەرزەمینی [گیلزان] ـ لە كـەناری رۆژئاوای دەریاچەی ئورمیە ـ[٤٣] ئەوانیش هەروەكو ئەوان چەن دیاریــەكی وەكو ئەسپو زیوو قالاییو مسو پارچە دروستكراوی مفرغییان بۆ ئەناردن •

لولوبیەكان مانای ئــەم لەشكر كەشیەیان زۆر باش لێك دابوەوەو ئەیان زانی كە ئەمە یەكەمین هەنگاوی نەخشەی داگیركردنو بەدیل كردنو تالان كردنی ئەوانە ، وە لـە ساڵی ٨٨١ى پێش زایینی بــە هــەمو توانایەكەوە بۆ بەرەنگاری كردنیانو بەهێز كردنی خۆیان كەوتنە خۆ ، وە پێشەوای هۆزی [ ناسیكو Nasiku ]بەشی [داگار] كە بە زمانی ئاكادی پێیان ئەوت [نور ـ ئاداد][٤٤] بوو بە سەركردەیان • ئەو خەڵكی سەرانسەری وڵاتی زاموای لە دەورو بەری خۆی كۆ كردەوەو لەشكرەكەی وەكو حەسار لێ كرد[٤٥] • بەڵام ئاشور ناسیراپال مۆڵەتی بە [نور ـ ئاداد] نەدا ئیشو كاری خۆی بــە ئەنجام گەیاند ، وە بــە لەشكرێكی زۆرتر لە لەشكرەكەی [نور ـ ئاداد]ەوە مەركەزی زاموای داگیر كردو هێنایە ژێر دەســەڵاتی خۆیەوە [نور ـ ئاداد] ناچار بو پەنای بردە بــەر كێوەكان [ئاشورناسیراپال] تا كێوی [نسیر] [كـە

ئولوبیەکان - کی نی پای پێ ئەڵێن] چوە پێشەوە • بە پێی باس و بەسەرهاتە بابلی و ئاشوریەکان کەشتی نوح لە دوای تۆفان لەسەر ئەو چیایە نیشتۆتەوە [ ئەم کێوە بە تایبەتی بەهی گۆتیەکانیان ئەزانی ][٤٦] ئاشور ناسیراپال سێ پادشای بچوکی زاموایی لەسەر رێگای خۆی لەت و پەت کرد • بەم جۆرە : [داگار] پادشای [نور - ئاداد] وە پادشای [موساسینا][٤٧] کە مەرکەزی ئەو قەڵای [بوناسی] یان [بونائیس] بوو ، وە پادشای [کیرتیارا] کە مەرکەزی ئەو لە قەڵای [لاربوسا] بو[٤٨] • هەمو مەڕۆماڵات و ئاژەڵەی [کە زوربەیان لە کێوەکانا شاردرابونەوە] هەموی تالان کردن ، ئەو کاتە ئەمیرەکانی زاموا ملیان بۆ کەچ کرد • [ئاشورناسیراپال] ئەمجار وازی لێ هێنان و بەڵام وڵاتەکەیانی بەست بە وڵاتی ئاشورەوەو خەرج و باجێکی زۆرو گرانی وەکو ئەسپ و زیوو زەڕی خستەپێی خەڵکی ناوچەکە[٤٩] • ئەم وڵاتە کە لە ساڵی ٨٨١ی پێش زاینی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئاشورناسیراپالەوە، لە دوایدا [بەپێی سەرچاوەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی] ناونرا [ زاموا ] یان [ مازاموا ] وە بەشی زوروی ئەم کیشوەرە [مانا]یان پێ ئەوت •

دو میرنشینی زاموای خوارو : [ئامکا] و [ئاراشتوا] ساڵی دوایی ئەو خەرج و باجەی کە خرابوە پێیان نەیان دا بە ئاشوریەکان ، وە ئەمە بوو بە هۆی ئەوە کە لەشکر بکرێتە سەریان[٥٠] ئاشورناسیراپال ویستی بەر لە لەشکری [زاموا]یەکان بگرێ و بەریان کەوێت وە تەنیا بە سوارەو عارەبانەی شەڕەوە کەوتە رێ و چاوەڕوانی گەیشتنی هێزی پیادەو ئەندازیارە سوپاییەکانی نەکردو [ ئامالی ]و قەڵای [ ئاراشتوا ]ی داگیر کردو تالان و کوشتارێکی زۆری نەکرد تەنیا لە نێو بنە ماڵەی پادشاکانی [ئاراشتوا] بەڵکو میرنشینەکانی دەورو بەری [کیرتیارا]ش کە [بار] مەرکەزەکەیان بوو ، وە [سابینا] - مەرکەزی خودون - وە [موساسینا] کە مەرکەزەکەی - بوناسی -

بو ، تا ئەگاتە گەردنەکانی [خاشمار] دەست پێ کردو تالآنی کردن • بــەلاّم ـ داگارا ـ سەری دانەواندو بەڵێنی دا کە باج‌و خەراجیان بداتێ‌و ئــەویش وازی لێ هێنان • وە لە شوێنەکانی ترا شوێنەواری دانیشتوانی ناوچــەکەی بڕی • خەڵکی پێ گەیشتوو ئیشکەری بە تالاّنی بردو منداڵەکانی لە ئاگردا سووتانن • دواجار ئاشوریەکان رویان کردە ئەمارەتی [ئامکا] وە بەرەو ئەو ناوچەیە کشان[٥١] • [ئامکا]و کەسوکارەکانی دەوروبەری لە کێوەکانا خۆیان شاردەوە ، بەلاّم ئاشوریەکان لە قەلاّکەیانا کــە پێیان ئەوت قەلاّی [زاپو]و ئاواییەکانی دەورو بەری کە چۆڵ‌و ویران کرابون[٥٢] کەل‌و پەل‌و خشل‌و شتومەکی هەمە جۆرەو پێویستی ماڵ‌و گەلێك جۆرە بابەتی تریان بۆ خۆیان کۆ کردەوە • ئاشوریەکان بە دەیان شەڕ کەری ئامکارایان بە دیل گرت‌و بە هەمو جۆرێك سزاو ئازاریان ئەدان‌و لەناویان ئەبردن ، ئینجا لەشکریان کردە ســەر پادشایــەك کــە ناوی [ئاتا] بوو ، وە ئــەو هیچ پەیوەندییــەکی بــە زامواییەکانەوە نەبو • ئەم پادشا نشینە کــەوتبوە دامێنی ژورووی کێوەکانی [نیشپو] ـ کــە داگارا کەوتبوە خوارویەوە ـ ئــەم شانشینەشیان هەروەکو میرنشینەکانی تر تارومارو وێران کرد • لەویدا [ئاشور ناسیراپال] هــەندێ شتومەکی مفرغی دروستکراوی لەلایەن کیشوەری [سی پیرمن کە لەوە ئەچێ بە زمانێکی بێگانەی نەزانراو دوابن] بە دیاری بۆهات •

داخمان ناچێ باسی ئەم بەشە چونکە لە هیچ سەرچاوەیەکی ترا نــەمان دیوە ناتوانین لەمە زیاتر لەسەری بدوێین •

ئاشور ناسیراپال رویشت ،لە زامرو لە قەلاّی [ئارکادی] گلی خواردەوە، بادشایانی ناوچەی زاموا جارێکی تر هاتن بۆ لای‌و هەریــەکەیان دیاریەکی گرانبەهای بۆ هێنا • لــەو کاتەدا خەرج‌و باجی ساڵانەی زاموا پاشــەکەوت کەوتبو ، هەمو جۆرە شتومەکێك کە لە جیاتی خەرج‌و باج وەر ئەگیرا وەکو پەشم‌و کەلوپەلی مەفرەغی‌و شەراب‌و ئاژەڵی شاخداری وردو ••• هەمو کۆ

کرانەوە ... زاموایيـەکان [ پیشەکارانی زاموا ] بـە بێگار بردیانن بـۆ دروستکردنی ساختومان لە شاری [کلخو]ی ئاشور . جگـە لـە پادشاکانی زاموا ، پادشایانی گیلزانو [خوبوشکیە] لـە خواروی دەریاچەی وان ـ وە قەڵای کاسی [خارتیش] ئەوانیش هەریەکە دەسە دیاری خۆیان نارد (٥٣) .

ئاشور ناسیراپال لەمانە رازی نەبو جارێکی تر هەوڵی دا کە خەڵکی زاموا ئەوانەیان کە لە چیاکانا خۆیان شاردبۆوە بیان گرێت(٥٤) ، ئەو وەختە قەڵای [ئاتلیل] کـە ماوەیەك بـە دەست پادشایانی کاسی‌یەوە بووە تازەی کردەوەو کردی بـە مەرکەزی کۆ کردنەوەی ماڵیاتو باجو خەراجی ولایەتـە تازە دامەزراوەکانو هەماری ئاڵفـو زەخیرە بۆ لەشکرکەشیەکانی ئایندەی خۆی بۆ لای رۆژهـەڵاتـەوە . دوایی هـەندێك لـە خـەڵکی زاموا [ بەتایبـەتی پیشـەسازەکان] بردنیانن بـۆ پایتەختـە تازەکـەی ئاشور ناسیراپال ـ شاری [ کلخو ] ـ(٥٥) .



**چەرمەسەرە دانی پێشەوا گیراوەکان ، کە بەرپەرچی ئاشوریەکانیان دابووە ، لە نەینەوا نەخش کراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ] ..**

هەروەکو لـە مەوبەر باسمان کرد [ئاشورناسیراپال] پادشا بچوکەکانی زاموای هێشتەوە بەڵام هەندێك لە دەستو پێوەندەکانی خۆی کردە چاودێر

بەسەریانەوە ، وە هوردوگایەکی لەو ناوە دروست کرد کە باج‌و خەراجیان پێ کۆ بکاتەوە ، بەلاَم ئەوەندەی پێ نەچوو کە [زاموا] وەکو ولاَتێکی ئاشوری لێ هات • لە رووداوەکانی ساڵی ٨٢٨ی پێش زاینی بۆ یەکەمین جار بەناو [حاکم - یان جێ نشینی مازاموا] باس ئەکەین[٥٦] • بەلاَم ئەیالەتی زاموا [مازاموا] نەبوە بەشێك لە بەشەکانی خواروی ئەو کیشوەرە ، هەروەها ئەوەندە بەسەر لەشکرکەشی ساڵی ٨٨٠ی پێش زاینیدا نەڕۆیی کە خەڵکی ئەو بەشانە دیسان سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتەوە • [سالمانا ساری سێیەم] لە ساڵی ٨٥٩ی پێش زاینی لەشکرێکی بۆ سەرزەمینی ناوبراو هێنا[٥٧] •

ئێمە لەبارەی لەشکرکەشیەکانی [ئاشورناسیراپال]ەوە بە دورو درێژی باسمان کرد - لەبەر ئەوە لە ساڵنامەکانا بە کورتی باس کراوەو بە تایبەتی باسی سەرکەوتن‌و لەشکر کەشیەکانیان گرینگی پێداوە ، وە لە لایەکی ترەوە

چونێتی کۆمەڵگای سەرزەمینی مادی ئایندەی نیشان داوە کە لەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا بووە •

کۆمەڵگای [زاموا] - هەروەکو لە ساڵنامەکانی ئاشورناسیراپال‌دا باس کراوە - کۆمەڵگایەکی چینایەتی بووە [نور - ئاداد] بە شا ناو نەبراوە ، وە تەنیا پێشەوای هۆز یان [ناسیکو]یان پێ وتوە • پیشەسازی کە لە ئاشوردا زۆر بایەخیان پێ دابو وە زۆر پێشکەوتوو بو ، بە پێویستی زانراوە کە پیشەسازی لە کشتوکاڵ جیا بکرێتەوە[٥٨] وە بەم هۆیەوە گەلێك کەل‌وپەل تارادەیەك هاتە بەرهەم • بەلاَم ئەم کۆمەڵگایە لە سەردەمی کۆچەریدا چینایەتی تیا دروست بوبو وە دەوڵەت لە ناویا لاواز بو ، وە لەم لاو لەو لای ئەو سەرزەمینەدا چەند دەوڵەتێکی بچوك پەیدا بوبون ، کە نەیان ئەتوانی بەرامبەری بوەستن‌و بەر لە لەشکری ئاشوریەکان بگرن • ئەبێ دروست بونی کۆمەڵگای چینایەتی لەوێدا لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زاینی دابنێین • وە لەوە ئەچێ پەیدا بونی چینایەتی لە دوای دەسەلاَتدارێتی

کاتی بابل بوبێت لە سەردەمی کاسیەکانا وە لەو سەردەمەدا هاتبێت بە خۆیا •

ئاشوریەکان تا کۆتایی سەردەمی حکومەتی ئاشورناسیراپالی دووەم نەگەیشتبونە پۆپەی چیاکانی سەر سنوری زاگروس‌و دەستیان بەسەر شوێنە دوور دەستەکانی ناو خۆی ئەو ناوچەیەدا نەئەڕۆیی •• بەڵام لە دوای ئەوە کە بنکەیەکی شەڕی یان لە [زاموا] بۆ خۆیان دروست کرد گەلێك پەلاماری گەورە گەورەیان بردە سەر سەرزەمینی مادو دەریای کاسپی [خزر] •

لەبەر ئەوە دانیشتوانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی ماد ئەیانویست ئازادی‌و سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن ئەبوا لە بەرامبەر ئەو دەست درێژی‌یانەی ئاشوردا ریکخستنێکی رێك‌و پێك ترو بەدەستەڵات تر لە کۆتایی سەدەی دەیەم‌و سەرەتای سەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا لە خاکی زامووادا بوایە وە یان بی هێننە دی •

رەنگە بێ دەوڵەتێك کە لەو سەردەمەدا لە ناو خۆی [زاموا]ی کە لە کەنارەکانی دەریاچەی ئورمیە خۆی بەستبوو ، وە یان یەکێتیەکی وەکو یەکێتی هۆزەکانی ماد لە توانایدا بوایە ئەم کارە بکات •

لە دوای قەلاچۆ کردنی میرنشینە بچوکەکانی دەرەوەی [زاموای] لە سەردەمی گرنگترین پادشای ـ زاموا ـ یی‌دا ، دەوڵەتێك هەبوو [لە زاموای ـ ناوخۆدا] کە [نیك‌دیارا]یان [مکتیارا] سەرۆکایەتی ئەکرد • بەڵام نیك دیارا زۆر ناحەزی زۆر بوو • لە ساڵی ٨٥٥ی پێش زایینی‌دا لەشکر چیەکانی ئاشور [ سالماناساری سێیەم ] [ شولمان ـ ئاشارد ] لە رێگای گەردنەی [بونائیس]ەوە پەلاماری خاکی [نیك دیارا]ی دا[٥٩] ، وە چون ئەیویست لە رێگای دەریاچەوە بە هۆی ئەو قەیاغانەوە کە لە لقی دار بیەکان دروست کرابون لە دەستی ئاشوریەکان رابکات [سالمانسار] کەوتە شوێنی وە لە دەریاچەکەدا لەگەڵیا کەوتە شەڕەوە[٦٠] • بەڵام ئەوەندە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا وە بە شێوەی گشتی لە سێ چارەکی یەکەمی سەدەی نۆیەمی

پێش زاینی دا له ناوچەی ئورمیەو روباری [جەخەتو] بێ گیروگرفتی گەورە چەند دەوڵەتێك دامەزرا •

[نیکیدیارا] رابەری یەکی نیوەو ناچلی ئەکردن ، بەلام لە بارەی یەکێتی هۆزەکانی مادەوە ••• ئەوانە تاکو دەوروبەری دەیەی سێیەمی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی هیچ هاتوو چوو پەیوەندییەکیان بە ئاشورەوە نەبووە •

×

لە ساڵی ٨٤٢ی پێش زاینی [سالماناساری سێیەم] ئاژاوەکەی [نامار]ی خامۆش کردەوە ، [سالماناسار] [یانزی] پیشەوای[٦١] بیت هامبان کە دراوسێی ناوچەکە بوو کردی بە پادشای ناوچەکە • ئەو لە ساڵی ٨٣٤ی پێش زاینی سەرپێچی لە فەرمانی ئاشوریەکان کرد ، وە ئەمە بوو بە بیانووی یەکەمین لەشکر کەشی سالمانسار بۆ سەر خاکی ماد •

کەشکریەکانی ئاشور لە لای ژوروی رۆژهەڵاتو لە رێگای گەردنەکانی چیاکانی خاشمار [خاشیمور]ەوە بۆ سەر [نامار] سەرەو ژێر بووەوە • ئاشوریەکان قەڵاکانی [نامار]یان هەمو وێران کرد[٦٢] ، ئەو کەلو پەلانەی کە لە کوێستانەکانا شاردرابونەوە هەمویان داگیر کرد • ئەم کارە ئەوەندە بە پەلە جێبەجێ کرا کە ماوەی بۆ تالانکەرە ئاشوریەکان خۆش کرد کە ئەوانیش بە پەلە هەر بۆ تالان واڕەیی خۆیان بکوتنە ناو خاکی مادەوە • [یانزی] پادشای [نامار] رای کردبوە وڵاتی مادەوە ، وە ئەمە بوو بە بیانوی ئەوە کە ئاشوریەکان پەلاماری خاکی ماد بدەن • لەشکری ئاشور یەکەمجار چوونە کیشوەری [ پارسوا ] وە سەرانەیان لە[٢٧] پادشای ئەو کیشوەرە سەند •

لەمەوبەر وتمان کە وشەی ئاکادی [پارسوا] – Parsua – بە [پرسو] ئەڵێن[٦٣] کە بە مانا [خطه]و [سنورو کەنار ئەگرێتەوە] • لە

نوسراوەکانی زمانی [ ئاشور ناسیراپال ] شوێنی کیشوەری [ پارسوا ] بە بەشەکانی خواروی کیشوەری [زاموا] یان ئەووت[٦٤] • ئەم گۆڕینی ناوە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەگەرچی زمانی خەڵکی ئەو سەرزەمینە هەروەکو لەوەبەر [کاسپی] بووە ، وە لە ماوەی [٤٥-٤٠] ساڵی رابوردووا خەڵکەکە بە زمانی مادی - ئیرانی بەلای رۆژئاواوە رویشتوون ، گەیشتبونە ناوچە ئەشەشی نەخشەکەی خۆمان • وە هەندێك زاراوەی جوگرافیایی ناوخۆیان گۆڕیبو ، پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین کە پێچەوانەی بیروڕای ئەو کاتە تەنیا روی هاوبەشی وشەی [پارسوا] لەگەل [پارس] - پرسید - ئەمە یەکە هەردو زاراوەکە بە مانا [مەرز] و [کەنار] ئەگرێتەوە ، وە هیچ بەڵگەو سەنەدێك نیە کە [پارسوا] وڵاتی پارسەکان بوبێتو وە ئەو هۆزە لە کۆتایی سەدەی هەشتەم تا ناوەراستی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی لەو ناوچەیە کۆچیان کردبیت • پێویستە ئەوەمان لەیاد بێ کە [پارسوا] ناوچەیەکی کشتوکاڵی بودو خەڵکی ئەو ناوچەیە نیشتەجێ بون ، وە ئەگەر دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە چوبن بۆ پارس [پرسید] کە [٦٠٠] کیلومەترە لەوێوە دورە ئەمە زۆر ستەمە • ناوی شوێنەکانو خەڵکی سەرزەمینی [ پارسوا ] بەهیچ جۆرێك ئیرانی نیە •

ئاشوریەکان لە چیاکان پەڕیونەوەو چۆن بۆ سەرزەمینی [مستی] لە بەشی ژوروی روباری [جەخەتو][٦٥] وە لەوێوە سەرەوژێر بونەتەوە ،دواجار بەلای زنجیرە چیای ناوبراوو - ناوچەی [ئارازیاش] و [خارخار] کە لەو کاتەدا بەشێك بووە لە یەکێتی هۆزەکانی ماد رویشتوون • سەرچاوە ئاشوریەکان بۆ یەکەمین جار ئەم سەر زەمینە بە [ ئامادای ] ناو ئەبەن ، لە خوارەوە لە بارەی شوێنی ئەم ناوچەیەوە بە درێژی باسی لێوە ئەکەین بەلام ئێستە ئەمەندە بەسە کە بڵێین ئاشوریەکان لە هەندێ ناوچەی نەخشەکەمان تیپەڕین •

ساڵنامه‌كانی [سالماناساری سێیه‌م] باسی چوارقه‌ڵا ئه‌كات كه‌ له‌ خاكی مادا به‌كاری هێناون ، ئاشوریه‌كان كۆمه‌ڵێكیان له‌ دانیشتوانی ناوچه‌كه‌ بـه‌ تالانی بردوه(٦٧) ، بـه‌شی زۆری دانیشـتوان‌و ئاژه‌ڵـه‌كانیان كـه‌ لـه‌كێوه‌ كانا شاردرابونه‌وه‌ ، ئاشوریه‌كان ماوه‌یه‌ك لـه‌ ده‌راوه‌كانا فـه‌رمانڕه‌وایان كرد ، ته‌نانه‌ت له‌ [خارخار] وێنه‌ی [سالماناسار]یان له‌ سه‌ر به‌رد هه‌ڵكه‌ندبو ، له‌گه‌ل ئه‌مه‌دا دوایی ڕێگای گه‌ڕانه‌وه‌یان گرته‌به‌ر وه‌ [یانزی] پادشای [نامار] كه‌ به‌ دیلی گرتبویان له‌گه‌ل خۆیانا بردیان ، وه‌ هیچ جۆره‌ خۆگرتن‌و خۆ به‌هێز كردنێكیان له‌ خاكی مادا نه‌كرد(٦٨) • سالماناسار له‌ كاتی لـه‌شكر كـه‌شی دواییدا كه‌ له‌ ساڵی ٨٢٨ی پێش زاینی دابو(٦٩) زۆر پیرو په‌ككه‌وته‌ بوبو ، وه‌ خوی نه‌یتوانی به‌شداری شه‌ڕه‌كان بكات وه‌ شه‌ڕه‌كه‌ی به‌ سه‌ركرده‌كانی له‌شـكر وه‌كو [ تورتان ] سـه‌ردار [ دایان - ئاشور ] سپارد • ئـه‌مجاره‌ له‌شكره‌كه‌یان روی كرده‌ ئه‌ماره‌ته‌كاتی یان پادشا نشینه‌ بچوكه‌كانی ناوچه‌ی [ زاموای - ناوخۆ ] له‌ پێشا [ دایان - ئاشور ] له‌ ده‌راوی زێی گه‌وره‌ كه‌وته‌ جوڵه‌و به‌ره‌و [خوبوشكیه‌] كه‌ كه‌وتۆته‌ خواروی ده‌ریاچه‌ی [وان]ه‌وه‌ ڕۆیشت ، وه‌ دوا جار به‌ ناو خاكی یه‌كێدا كـه‌ ناوی [ماگدوبو - مالخیس] بووه‌ تێپه‌ڕیوه‌ ووو بـه‌ خواروی ڕۆژهـه‌ڵات ملی نـاوه‌ ، تـاكو گـه‌یشتۆته‌ سه‌رزه‌مینی [ئوئالكی] پادشای [مانا](٧٠) •

[ئوئالكی] رای كرد بۆ چیاكان‌و خۆی شـارده‌وه‌ ، بـه‌ڵام ئاشوریه‌كان مه‌ڕوماڵاتێكی زۆریان به‌ تالان برد ، ئاواییه‌ چۆڵه‌كانیان داگیر كرد ، ئاوایی [ئیزیرتو] [یازیرتو] كه‌ شوێنێكی سه‌خت‌و قه‌ڵادار بو(٧١) داگیریان كرد • دواجار له‌شكره‌كه‌یان له‌ میرنشینی [خارون] كه‌ [شولوسونو] فـه‌رمانڕه‌وای بو تێپه‌ڕین(٧٢) ئه‌و له‌گه‌ل ئاشوره‌كانا ڕێكه‌وت كه‌ هه‌ر ساڵێك چه‌ند ئه‌سپی عاره‌بانه‌كێش به‌ناوی خه‌رج‌و باجه‌وه‌ بدات بـه‌ ئاشور [ ئارتا سارۆ ](٧٣) پادشای [شوردورا] دیسان(٧٤) كۆمه‌ڵێك دیاری پێشـكه‌ش بـه‌ ئاشوریه‌كان

کردو ئینجا ئاشوریەکان چون بۆ پارسواو چەند جێگای تر وە خەرجو باجیان لە هەندێك لە پادشاکان سەندو هەندێك شانسینیشیان تالآن کرد •

[دایان ئاشور] ئەم لەشکر کەشیەی جارێکی تر لـە ساڵی **٨٣٧**ی پێش زاینیدا دوپات کردەوە ، ئاشوریەکان لەپێشا چون بۆلای سـەرچاوەی زێی گەورە ، وە دواجار سەرزەمینی [گیلزان] لـە کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ئورمیەیان داگیر کرد(٧٥) • [دایان ـ ئاشور] کۆمـەڵێك ئاژەڵی شـاخدارو ئەسپی لـەگیلزانو پادشا نشینەکانو هۆزەکانی دەوروبەریان تاکو [ئاندیا]و بەشی خوارووی روباری قزل ئوزن بەناوی خەرجو باجەوە وەرگرت(٧٦) • وە لە زاموای ناوخۆ تێ پەڕینو بەرەو [نامار] سەرەوژێر بونەوە ، لە رێگادا قەڵای کوێستانی [بوشتو] لە سنوری [مانا]و چـەند شوێنو(٧٧) قـەڵایەکی تری [مانا]یی (؟)(٧٨) یان داگیر کردو [نامار]یان لـەناو بردو ناوچەکـەیان کرد بە گۆمی خوێن • لە کۆتایی ئەم لەشکرکەشیەدا شەڕ کەرەکانیان چونە ناو وڵایەتی [زاموا]ی ئاشوریەوە(٨٠) •

لەبارەی لەشکر کەشیەکانی **٨٢٧ ـ ٨٣٤**ی پێش زاینی ، زویو زاری دەوروبەری دەریاچەی ئورمیەو چەند لایەکی تر کەوتنە ژێر دەسەڵاتی پادشا بە دەستەڵاتە کانەوە • وەکو : پادشا نشینی [ئوبو] ، [گیلزان] ، [ئوئالکی] «مانا» ، [شولوسونو] «هـارون» ، [ئارتاسارو] «شـوردیرە» ، [نیكدیارا] ، [نیك دیما] ، [نینی] «ئاریدو» ، وە هینیتر • بەڵام دەستەڵاتی هەندێك لـەم پادشا نشینانە هەروەکو پادشا نشینی [ئوئالکا]و [نیك دیارا] بەرە بەرە بەسەر ئەوانی ترا سەرئەکەوتن وە خەڵکی هەمو دەورو بـەری دەریاچەی ئورمیەو زاموای ناوخۆی بە کێشوەری ماناکان] ناو ئەبرد • واتا بە ناوی هۆزێکەوە کە لە یەکێك لەو سەرزەمینانەدا نیشتەجێ بون(٨١) •

لە لایەکی ترەوە لەشکر کەشیەکانی ئاشوریەکان لەگـەل ئەوەدا کـە رواڵەتێکی تالآن کەریو شت بردنی بوو لـە هەمان کاتا تارادەیەك مەبەست

ئەوە بوە کە ئەو سەرزەمینانە هەمویان بێننە ژێر رکێفی خۆیانەوە تاکو بتوانن باج‌و خەراجیان لێ بسێنن • بەلام ئەو سەردەمە لەم رێگایەوە ئەوەندە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بو بەلام لە کاتی رێکەوتا [هەروەکو لە کاتی – شولوسونو – شای هارونا] ئەیان توانی خەرج‌و باجی هەمیشەیی لە شانشینەکان بسێنن • لەکاتی پێشەوا کانی تراو پادشا ناوچەییەکانا تەنیا لە کاتی نزیك بونەوەی لەشکری ئاشوریەکانا دیاری یان بۆ ئەناردن تەنانەت خەڵك مەڕو ماڵات‌و ئاژەڵەکانیان لە چیاکانا ئەشاردەوەو حەسارێکی وشك‌و قەلای چۆلیان بۆ تالانکەرە ئاشوریەکان بەجێ ئەهێشت •

لە ساڵی **٨٦٧**ی پێش زاینی دا لە ئاشوردا شەڕێکی خۆماڵیانەی قورس دەستی پێ‌کرد ، وە لە ساڵی **٨٢٣**ی پێش زاینی دا [ شامشی – ئاداد ] پێنجەمین پادشای تازەی ئاشور سەرکەوت ، سەر لە نوێ حکومەتێکی رێك‌و پێك‌و بە دەستەلاتی لە سەراسەری ولاتی ئاشوردا دامەزرانەوە • لە نوسراوەکەی ئەودا نوسراوە : کە سنوری رۆژهەلاتی ئاشور لە سەردەمی ئەوا لە [شوردیرا]و [ئاریدا] تێپەڕیوە • واتا لە دامێنی رۆژهەلاتی ئەو چیایانەوە کە لەلای رۆژ ئاواوە لکاوە بە [ماننا]و چەند لایەکی ترەوە ، درێژ بۆتەوە • [ئیشپوئینی] پادشای ئورارتو لە کاتی شەڕی خۆماڵی ئاشوریەکانا چوو بۆ کەناری دەریاچەی ورمێ وە پادشا نشینی گیلزانی خستە سەر ئورارتو[٨٢] • وە پادشای [ماننا]ی بە سەختی شکان • وە لە دەیەی دووەمی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی [شارسینا] کوری[٨٣] [مکیتارا] «نیك دیارا»ی فەرمانڕەوای پادشا نشینەکانی خواروی دەریاچەی ئورمیەی لە جێگای پادشای [ماننا] **دانا** •

[شامشی – ئادادی پینجەم] بەو مەبەستەی کە حوکم‌و چۆنێتی ئاشور بچەسپێنێ لەشکر کەشیەکەی بۆ لای رۆژ هەلاتەوە تازە کردەوە ، وە یەکێك لە هۆیەکانی ئەم پێشکەوتنە روبەرویی کردنی ئورارتوییەکان بو ، لەشکر

کەشی ساڵی **٨٢١**ی پێش زایینی(٨٤) بە پێی ناوەڕۆکی ناوی ساڵی پیاوانی(١) ئاشوری [ساڵنامەی پیاوان](٨٥) کە لە دژی [سیگ ریس] بوە(٨٦) ، بە سەرکردایەتی سالار [موتاریس ئاشور] بوە •

بەم جۆرە یاوەرانی کۆمەڵی ئاشوریەکان [شارسینا] و [**ئیشپوئینی**] بونە پادشای ئورارتو • لە نوسراوەکەی [شامشی ـ ئادادی پینجەم] **نوسراوە** کە [**موتاریس** ـ ئاشور] گەیشتە [دەریای هاتنبی رۆژ] ئیتر نازانرێ مەبەستی دەریاچەی ورمێیە یان دەریای خزر [کاسپی] • بەڵام لەوە ئەچێ دەریای دواییان بوبێت(٨٧) • ئاشوریەکان ئەیان زانی کە لە دامێنی دەریاچەی نورمیەوە بە ئەندازەی پێویست بە هێزن وە لە ساڵی دوایی **٨٢٠**ی پێش زایینی لەشکر کەشیەکی گەورەیان کردە سەر مادەکان [ شامشی ـ ئادادی پینجەم ] لە کێوی [کولار](٨٨) تێپەڕی ، دیاری پادشای [بوشکیە] ـ لە خواروی دەریاچەی وانەوە ـ وە [ شارسینا ]و هۆزەکانی [ مانا ]و [سوبنی‌یەکان]و [تئورلی‌یەکان] ـ کە لە دواییدا چونە ناو ماناوە ـ بەسەر سەرزەمینی مسیەکاندا تێپەڕین‌و چون بۆ بەشی ژوروی [جەختەتو] ئەو لەو شوێنانەدا ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵو مەڕو ماڵاتی [مسێ] یەکانی داگیر کرد • لەم ئاژەڵو تاڵانیەدا جگە لە ماڵیاتی شاخداری وردو کەڵو گوێ درێژو ئەسپ کۆمەڵێکی زۆر وشترو دوکوپانی‌باکتریا کە تازە لە خاکی مادا پەیدا بوبون بە تاڵانی بردنی(٨٩) گەلێك ئاواییو شوێنی نیشتەجێیان سوتان ، مسیەکان زیانێکی زۆریان لێ کەوت ، ئەوکاتە ئاشوریەکان رویان کردە کوێستانی [گیزیل بوندا] کە ناوچەکانی دەوروبەری ئورمیەی لە سەرزەمینی ماد جیا ئەکردەوە •

دوای ئەوە کە ئاشوریەکان یەکەمین قەڵای کوێستانی ناوچەی

---

**(١) ساڵی پیاوان : چونکە سەرەتایەکی میژوییان نەبوە ساڵەکانیان بە ناوی روداوێکی گرنگ‌و پیاوە گەورەکانەوە ناو ئەنا ـ وەرگێر •**

ناوبراویان داگیر کرد(٩٠) دو پیشەوای [گیزیل بوندا](٩١) بەو مەبەستەی کە دۆستایەتیان لەگەلا دامەزرێنن کۆمەڵێک ئەسپی بارو عارەبانەیان بە ناوی دیاری یەوە پێشکەش کردن • بەڵام پێشەوای سێیەمیان کە ناوی [پیریشاتی] ـ کە نوسراوەی ئاشوریەکان بە پیشەوای [گیزیل بوندیان]ی ناو ئەبات ـ ویستی بەرامبەریان بکات • هەمو دانیشتوانی گیزیل بوندا چونە ناو قەلای [ئوراش] بوو ، بەڵام ئەو قەڵایە زۆر کۆنە بو ، بۆ ئەوە نە ئەشیا ببێت بە بەرگری کەر لەروی ئەو لەشکرەی ئاشوریەکانا کە بە هەمو جۆرە چەکێکی کاریگەری ئەو سەردەمە پڕ چەك بون ، ئوراش‌و قەلا بچوکەکانی تری دەورو بەری کەوتنە ژێر دەستەلاتی ئشوریەکانەوە ، بە قسەی ئەوان شەش هەزار شەڕکەر لەو شەڕەدا کوژرا ١٢٠٠ کەسیش بە چەکی خۆیانەوەو [پیریشاتی] بەدیل گیران • سەردارێکی تری گیزیل بوندا کە ناوی [ئینگور] بوو دەغالەتی کردو پادشای ئاشوریش وێنەی خۆی‌و نوسراوەیەکی لەسەر بەردێك هەڵکەندو لە قەڵاکەیا کەناوی [ سیبار ] بو دای نا(٩٢) • لەو سەردەمەدا ئاشوریەکان لە رۆژهەڵاتی روباری قزل ئوزون بون • رێگا بۆ سەرزەمینی ماد کرابودوە •

هەروەکو دیمان لە ناوچەکانی دەورو بەری رۆژئاوای مادەکان ـ هێشتا هەندێکیان یەکێتی‌یان نەبوو ـ لەناو پادشاکانیانا هەندێك بیروڕای جیاوازو سیاسەتی ناکوکی‌یان هەبو بەڵام تەواوی خەڵکەکە لە کاتی تەنگانەو روبەروویی کردنی دوژمندا یەکیان ئەگرت ، وە بە پێچەوانەوە ، مادەکان خۆیان پێشەوایەکیان یەکێتی یەکەیان هەبو کە ناوی [ هانا سیروکا ] بو(٩٣) وە لە قەڵای [ساگ بیتو](٩٤) دائەنیشت • ئەو ویستی لە چیا بەفرینەکانی ئەلبورزدا خۆی بشارێتەوە بەڵام [شامشی ـ ئاداد] مادەکانی ناچار کردو شەڕی کرد بە نووشیانەوە • بە پێی نوسراوەی ئاشوریەکان دەست درێژ کەران زیانێکی زۆریان بە مادەکان گەیاند [٢٣٠٠ کەس کوژراو ١٢٠٠ ناوچەی نیشتەجێ

لەگەل قەلای ـ ساگ‌بیتو ـ ویران کراو ١٤٠ سواریان بەدیل گرت ، بەلام خۆراگرتنی مادەکان بەمـە تێك نەشكا] وە [مون سوارتا][٩٥] فەرمانفەرمای ئارازیاش لە کاتێکدا کە ئاشوریەکان لە [کێوەکان]دا تێ ئەپەڕین[٩٦] رێگای لێ گرتن بەلام مادەکان لێدانێکی باشیان لێ درا ، [بە پێی ئەو نوسراوەیە کە باسی ئـەکات ١٠٧٠ کـەس کوژراوە] وە ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گرتن‌و کۆمەلێك ئاژەل‌و مەڕو مالاتیشیان بە ناوی دیاری یەوە لێ سەندن •

هۆزەکانی ماد هەرگیز بەم جۆرە دوچاری نوشوستی نەبوبوون ،ئەمەش هۆی دوو بەرەکایـەتی‌و شـەڕی ناو خـۆیی یان بو ، ئالۆزی‌و پـەرێشانی تا ماوەیەکی زۆر لـە نێوان دەسەلاتدارەکانا ئەگەڕا [٢٧]یان [٢٨] کـەس لـە فەرمانفەرمایانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی ماد بەر لـەوەی پادشای ئاشور لـە گەردەنەی کێوی [کولار] رو بە سەرزەمینی خۆی بگەڕێتەوە دیاری یـەکی زۆریان پێ دا •

ئەو نوسراوەیە یەك بە یەك باسی خۆیان‌و سەرزەمینەکانیشیان ئـەکات • وە بریتی‌یە لە کۆمەلێك نوسراوەی ناوچەکان‌و بەسەرهاتە کانیان ئەگێڕێتەوە، ئەمە لە بارەی ناوی زوربەی فەرمانڕەوایانەوە راستە ، وە ئەمانەیان زوربەیان فەرمانڕەواکانی رۆژ هەلات ترینی ناوچەکانن[٩٧] •

**ئەم لەشكر كەشی‌یەی ئاشوریەكان سێ ئەهمیەتی گەورەی هەبو :**

**یەکەم :** بەرگرتنی لە یەکێتی خەلکەکانی [ماننا]و مادەکان لە لایەك وە نورارتو کە بوبو بە خاوەنی هێزێکی بەرگەگر لە لایەکی ترەوە •

**دووەم :** تالان کردن‌و بەدیل گرتنی خەلك •

**سێیەم :** خۆ گورج کردنەوەی لەشکرکەشی‌یەك لە دژی بابل کـە لەو کاتەدا حوکمی [نامار]یشی ئەکرد •• بگرەو بەردەی شەڕەکانی دوایی [سالی ٨١٩ی پێش زایینی] روی کردە بابل ، وە زۆرتر خاکی [نامار]ی گرتـەوە ، ئاشوریەکان لە سالەکانی دواییدا خـەریکی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی [بین‌النهرین] بون ، بەلام مادیان لە یاد دەرنەکردبو •

[شامشی ـ ئادادی پینجەم] لە ساڵی ٨١٠ی پێش زاینی لـە دنیا دەرچوە [ئاداد نراری سێیەم] کە منداڵێکی بچکۆلانەبو بوو جێگـەداری تاج‌و تـەختی



**قەڵایەکی کوێستانی مادەکان ، لە نەخشێکی ئاشوریدا لە سەردەمی شاروکین دا هەڵکەندراوە ، [ کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی ]**

ئاشور • بەڵام شاژن [سامورامات] کە لە مێژوودا بە سمیرامید [سمیرامیس] بە ناوبانگە وڵاتەکەی بەڕێوە ئەبرد • فەرمانڕەوایی ئەو ژنە گەلێك کاری کردە سەر ئەو هۆزو ناوچانەی کە لە زەمانی باوکی پادشادا داگیریان کردبو • وە گەلێك ئەفسانەی جۆربەجۆر لە بارەیەوە ، تەنانەت لە سەردەمی ئێمەشدا لـە هەندێك ناوچەدا ئەیگێڕنەوە(٩٨) •

لە سەردەمی حوکمڕەوایی [سمیرامید] داو کورەکەی کـە ناوی [ئاداد نراری سێیەم] بوو کـە لە ساڵی ٨٠٥ی پێش زاینی کاروباری وڵاتی گرتـە دەست [ ئەگەرچی لـە دوای ئـەم بـەروارەوە سمیرامید هـەروەکو جـاران فەرمانڕەوایی هەر ئەکرد ](٩٩)، چەند جارێك لەشکریان کردە سەر مادەکان‌و مانا • لە ساڵەکانی ٨٠٩و ٨٠٧ی پێش زاینی دا لە دژی [مانا] وە ساڵی ٨٠٦

دیسان دژی ماننا ، وە ساڵەکانی ٨٠٠ و٧٩٩ ، ٧٩٧ لـــە دژی [نامرو] ، وە ساڵـەکانی ٧٩٣ و٧٩٢ و٧٨٨ی پێش زاینی ئاشوریەکان بـە تەواوی خۆیان گورج کردەوە کە خاکی ماد بـە تەواوی داگیر بکـەنو بی هێنە] ژێر رکێفی خۆیانەوە • بەڵام داخەکەم ئێمە لە بارەی ئـەم لـەشکرکەشیانەوە تەنیا لـە ناوەڕۆکی [ناوی پیاوانی ساڵ]و یەك نوسراوەی رەسمی ترەوە کـە نەختێك رۆشنترە چەند زانیاریەکمان بە کورتی بە دەستەوەیە(١٠٠) •

ساڵنامەکانی [سمیرامید] و [ئادادنراری سێیەم] بە دەست نەکەوتوە ، لەو نوسراوەیەدا وا دەر کەوتوە کە ئاشوریەکان لە ساڵی ٨٠٢ی پێش زاینی(١٠١)



**قەڵایەکی مادەکان ، لە سەردەمی شاروکین‌دا نەخش) هەڵکەنراوە ،**
**[ کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی ]**

لە [ئیللی پی] لە نزیک [خاخار]و [ئارازیاش] وە مستیو کیشوەری مادەکانو [سەرەاسەر] گیزیل بونداو [مانا](١٠٢) [ئاللابریا] فەرمانڕەوایان کردوە •وە

ناوی [خارخار]و [ئارازیاش] به جیا نوسراون • وه له نوسراوەی ساڵی ۸۰۲ی پێش زاینی باسی کیشوەری ماد [مادای] کراوه ، ئەوه مەبەست لەو ناوچانەیە کە کەوتونەتە ئەودیو ناوچەی قەزوین‌و دامێنەکانی ئەلبورزەوه • لــه بارەی روداوەکانی دوای ساڵی ۸۰۲وه وه ناشارەزاین • [سمیرامید]و [ئادادنراری] له دوای ئەو مێژووەوه پێنج جار لەشکریان کردۆتە سەر خاکی ماد • به وتەی کتسیاس سمیرامید لەشکری کردۆتە ســەر ناوچــه دوردەستەکانی رۆژهەلات ـ تاکو باکتریا ـ وه شەڕی لە گەلا کردون • ئــەگەرچی ناتوانین باوەڕ بــه وتەکانی ئــەو بکــەین بــەلام رەنگ بێ تا ڕادەیــەک بەســەرهاتی راستیشی نووسیبێتەوه ، چونکه له ماوەی ساڵەکانی ۸۰۲ و۷۸۸ی پێش زاینی رەنگ بێ ئاشوریەکان پێشرۆیشتنێکی گەورەیان بــەرەو رۆژهەلات بــەدەست هێنابێ • ئەگەرچی ئەوه رون نیه کە دەسیتان بەسەر خاکی باکتریادا گرتبێ •

هەرچون بێت ئەو بەسەرهات‌و باسانەی کــه له بارەی داگیر کردنی ماد بەهۆی سمیرامیدو شووەکەیەوه لەناو خەڵکدا بلاو بۆتەوەو باسی لێوه ئەکەن‌و کتسیاس نووسیسویەتیەوه هەموی راسته ، ئەگــەرچی نووسەری ناوبراو بــه ئارەزوی خۆی لەو روەوه ئەفسانەیەکی زۆر دورو درێژی ساز کردوه(۱۰٤) •

## ۳ ـ پەلامار بردنی ئورارتو

سەردەمی فەرمانڕەوایی [ئادادنراری] لەگــەل سەرەتای پەلامار بردنی [مینوا] پادشای ئورارتو بۆ خوارووی رۆژهــەلات یــەکانگیر بو [سمیرامید]و [ئادادنراری] دوجار لەگەل پادشای ناوبراوا له ناوچەی مانا لەـ ۸۰۷ و۸۰٦ی پێش زاینی ـ وه پینج جار له خواروی دەریاچەی وان لــه [خوبوشکیه] لــه ۸۰۱ و۷۹۸ و۷۹۱ و۷۸۵ و۷۸٤ی پێــش زاینــی کــەوتنــه شــەڕەوه • [سالماناساری چوارەم] جێ نشینی [ئادانراری سێیەم] دیسان لــه ساڵی ۷۸۱ تا ۷۷۸ی پێش زاینی لەگــەل ئورارتودا لــه جــەنگدا بوو ، بــەلام بــه ئاوات

نەگەیشت(١٥٠) لەو سەردەمەدا ئورارتو مەترسیەکی گەورە بو لە بەردەم ئاشوریەکانا • تاکو کۆتایی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی(١٠٦) ئورارتوییەکان [موساسیر]یان لە بەشی ژوروی زێی گەورە داگرتبو وە هەڕەشەیان لە ئاشوریەکان ئەکرد ، وە لە سەرەتای سەدەی هەشتەمدا چونە بەشی ژوروی ناوچەی فوراتەوە(١٠٧) •وەنگ بێ لەشکر کەشیەکانی [مینوا] بۆ سەر [مانا] لە کۆتایی سەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا بوبێت وە زیاتر لە جارێك ئەم لەشکر کەشیەش کرابێت(١٠٨) • پادشای ئورارتو قەلایەکی لەخاکی مانا دروست اکرد [ مشتا – تاش تەپەی ئیستە – لە نزیك شاری میاندواو ] وە پارچە نوسراوێك لەوێدا ماوەتەوە کە باسی ئەم روداوە ئەکات •

لە بارەی چونێتی ژیانی رۆژهەلاتی کۆنەوە ، دروست کردنی ساختومانی قەلاکان نیشانەی ئەوەیە کە ئەو سەرزەمینانە حاکم نشین بون ، لەگەل ئەوەشدا لە سەدەکانی هەشتەمو نۆیەمی پێش زاینیدا لە ئاشورو ئورارتودا ئەمە باو بووە کە حاکم یان جێ نشینی پادشا بۆ ناوچەیەکیان دیاری ئەکردن کە حوکمی بکەن ، بەلام پادشا ناوچەییەکانیان دەست لێ نە ئەداو ئەیان هێشتنەوە • هەروەها ئەم نەرێتە لە سەردەمی [مینوا] لە ماناشدا هەبو •وە ئەمە لەو سەرچاوانەدا دەر ئەکەوێ کە لە دوایدا باسیان لێوە ئەکەین وە ئەوە دەر ئەکەوێ کە دەولەتی مانا هەروەکو خۆی بوە •

مانا لە سەرەتای دەسەلاتداریتی [ئارگیشتی یەکەم] لە [٧٨٠ر٧٧٩ی پێش زاینی دا] پادشای ئورارتو هێشتا لە ئورارتو بو • وە بە پێی [سالنامەی خورخور] [ئارگیشتی یەکەم]یان پێ ئەووت(١٠٩) ئەو لە ناوچەیەك کە کەوتوەتە خوارەوی [مانا] وە واتا لەو سەر زەمینەی [ناوچەی – ئارسیتا – شارەکانی «بوشتو» و «باروتا»(١١٠) سێ جار [لە سالەکانی پێنجەمو شەشەمو هەشتەمی سەلتەنەتی خۆیا ، واتا لە ٧٧٥ و٧٧٤ و٧٧٢ی پیش زاینیدا] کەوتە شەڕەوە ، وە لەگەل لەشکری ئاشوریەکانا روبەرو بوەوە لە شەڕی دژ بە ئورارتوو

**ناماردا** له ناوەڕۆکی [پیاوانی ساڵ]ی ئاشوریەکانا له خواروی روداوی ساڵی **٧٧٤**ی پێش زاینیدا باس کراوە[١١١] •

لەبەر ئەوە لەو سەردەمەدا [مانا] هێشتا بە دەست ئورارتوییەکانەوە بو، ئەوانیش لەنامار ••• خەریکی شەڕ کردن بون ، ئەبوایە لە خاکی مانادا بنکەیان ببوایە • وە ئەوەمان لەیاد نەچێ کە لە ساڵنامەکانی [ ئارگیشتی ] پادشای ئورارتودا تا ئەو کاتە لەبارەی دەغالەت کردنی ماناوە هیچ قسەیەك لەناوا نیە •

ئەوەندەی پێ نەچو مانا لە ئورارتو جیا بوەوە ، وە دەوڵەتو حوکمی مانا لە هەمو ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ئورمیە ـ جگە لە کەنارەکانی رۆژئاواو ژوروی ـ بڵاو بوەوە • وە لەگەل ئورارتودا کەوتە شەڕو بگرەو بەردەوە ، دەوڵەتی مانا بە سەخت لە روی پادشایانی ئورارتودا وەستا[١١٢] ئورارتوییەکان ئیتر لە توانایاندا نەبو سەر بە دەوڵەتی مانا دابنەوێنن‌و باج‌و خەراجیان لێ بسێنن •

هەروەها جاروبار نەختێك سەرکەوتنیان بە دەست ئەهێنا ، بۆ نمونە لە ساڵی **٧٧٥**ی پێش زاینیدا [ئارگیشتی] توانی [بوشتو] بێنێتە ژێر دەستی خۆیەوە ، وە لە **٧٧١**ی پێش زاینی دا(؟) [شاری شاهی][١١٥] [شیمری خادیری] ـ رەنگ بێ هەمان [شوردیروە] بێت کە سەرچاوەی ئاشوریەکان باسی ئەکات ؟ ـ ئەمانەی داگیر کرد • بەڵام ئەم سەرکەوتنانەی [ئارگیشتی] کاتی بوو ، بەڵام مانا لەکۆتایی سەردەمی دەسەڵاتداریتی [ئارگیشتی] کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئورارتو • [ساردوری دووەم] کوڕی ئارگیشتی جارێکی تر لەشکری کردە سەر [نامار] لە **٧٥٠**ی پێش زاینیدا ـ[١١٦] ئەم پادشایە لە دواییدا باسی ئەکەین • یەکەمین جار لە ساڵی **٧٤٤**ی پێش زاینیدا لەشکر کەشیەکی گەورەی کردە سەر ماد ، لەوە ئەچێ کە [ساردوری] لە هەمان ساڵدا لەگەل [مانا]دا بە ناچاری کەوتبێتە شەڕەوە•هەروەکو لە ساڵنامەدا باس

کراوە[117] • لەدوای گرتنی قەلآی [داربو] ــ لە کەناری رۆژهەلآتی دەریاچەی ئورمیە ؟ ــ ئەو سەرزەمینەی خستە سەر خاکەکەی خۆی[118] • لەشکر کەشیەکانی ئورارتو لە دژی [مانا] بەهۆی ئەو شکستیەوە کە لە لایەن [تیگلا تپالاساری سێیەم]ەوە لە سالی ٧٤٣ی پێش زاینیدا توشیان هات •• بەو هۆیەوە پەلامار دانەکەیان راوەستا •

روداوەکانی سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زاینی لەبارەی مێژووی مادەوە ئەهمیەتێکی زۆر گەورەی هەیە ، لەو سەردەمەدا کە ماد هێشتا خۆی بۆ شەڕی دوژمنانەی ئاشوریەکان گورج نەکردبۆوەو خۆی یەك نەخستبوو ئامادە نەبو ، ئەمپەراتۆریتی نیزامی ئاشوریەکان چاویان بڕیبوە تالآنو گرتنی خەلكو داگیر کردنی ئەو ناوچەیە • پەلامار بردنی ئورارتو کە لە دەریاچەی ئورمیە تاکو دەراوی هەندێ ناوچەی گرتبوەوە ، وە تاکو سنوری عیلام درێژ بۆبوەوە کەوتە نێوان ئاشورو مادەوە ، وە بەونیازە کە ماد لەژێر دەسەلآتی ئاشور بێتە دەرەوە رزگاری بو • بەلآم چونکە ئورارتوییەکان لە بارەی هۆزەکانی مادەوە گەورەترین مەترسی بون ، بەربەرەکانی ئازادیخوازانەی [مانا] ــ کە هۆزەکانی دەوروبەری دەریاچەی ئورمیەی گرتبوە بەر یەکیان گرت ــ ئەمە مەترسی تازەی لە هۆزەکانی خواروو رۆژهەلآت دور خستەوە •

لە ئەنجامدا چونکە ئورارتو جارێکی تر مانای هێنایەوە ژێر رکێفی خۆیو [ساردوری دووەم] زاتی نایە بەر خۆیو سەر لەنوێ پەلاماری ئاماریدا •

رقەبەرایەتی نێوان دو ئەمپەراتوری کیشوەر گوشاد ــ واتا ئاشورو ئورارتو ــ کومەکیان بە خەلکی ماناو ماد کرد • ئەو شکستیەی ئورارتوییەکان کە بە هۆی لەشکری ئاشوریەکانەوە لە کاتی [تیگلاتپالاساری سێیەم] لە سالی ٧٤٣ی پێش زاینی توشیان بو ئورارتوییەکان وایان لێك دایەوە گوایا خۆیان وازیان لە مانا هێناوە ، مانا سەردەمی خۆشبەختی دەستی پێکرد لەو کاتەدا مانا لەروی هێزو ئەهمیەتەوە ئەوەندە لە ئاشورو ئورارتو کەمتر نەبو •

ئەو زانیاریانەی لە بارەی [مانا]وە هەمانە هینی سالّی ۷۱۹ی پێش زاینیە، بەلاّم گەلێك باس لە سەرچاوەی ئاشوریەكانا هەیە كە مێژوی سەردەمی بەختیاری ژیانی ئەو كیشوەرە لە ٧٤٣ وە تاكو ۷۲۰ی پێش زاینی باس ئەكات •

قەلاچۆو كوشتاری [ساردوری دووەم] كە لەشكرەكەی [تیگلاتپالاساری دووەم] بە پەنامەكی كردیانە سەر مانا ، ئەو پادشایەی كە لەو كاتەدا حوكمی مانای ئەكرد [ئیتر نازانین كە ئایا هەمان ـ ئیرانزو ـ بووە كە لە دەوروبەری سالّی ۷۱۸ی پێش زاینی لە دنیا دەرچووە یام نەء ؟] لەبەر ئەوەی گەلێك ناسۆرو ناخۆشی دیبو لەو چۆینەتیەی كە هاتە پێشی سودی وەرگرت • لە ئەنجامدا لە دەیەی سێیەمو دووەمی سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا كیشوەری ماناو ناوچەكانی ، بە هەر بەراوردێك بێ هەمو ناوچەكانی خواروی دەریاچەی ئورمیە كە بەلای كەمەوە تا ئەو خەتەی ئاوەكە لە نێوان ئورمیەو ئاراسدا بەش ئەكات(۱۱۹) وە رەنگە بێ هەندێك ناوچەی تریشی بەر بكەوێ ، سنورەكانی ژوروی رۆژهەلاّت وە بە تایبەتی ژورووژوروی رۆژئاوای مانا بۆمان رون نەبۆتەوە •

بە وتەیەكی تر زەوی‌و زاری ماناو ناوچەكانی وە ئەوەی كە لە دواییدا ناونرا [مادی ئاتروپاتین]و ئەمانە رون كراونەتەوە •

## ٤ ـ دەوڵەتی [مانا]و جۆری رێكخستنی

هەندێك بەڵگەو سەنەدو سەرچاوەمان لە بارەی ریكخستنی كۆمەلاّیەتی‌و دەولەتی [مانا] بە دەستەوەیە(۱۲۰) ، دانیشتوانی مانا وەكو ناوچەكانی تر زۆر تر مەڕومالاّتیان بەخێو ئەكردو بە ئاژەڵداریەوە خەریك بون ، [وەكو بەخێو كردنی مەڕو ئاژەڵی گەورەو شاخدارو ئەسپو گوێ درێژو تارادەیەك

وشتری دوکۆپان][121] لەگەل ئەمەشدا لە هیچ بەشێك لـە بەشەکانی مادی ئاینده کشتوکاڵ شان بەشانی ئاژەڵداری ئـەو ئەهمیەتەی کـە لەمانا بویەتی لەوێ نەی بووە • بۆ نمونە لە سەردەمی لەشکرکەشی [سارگونی دووەمدا] کە لەشکری کردە سەر [ئورارتو] واتا لەساڵی ٧١٤ی پێش زاینی خـەڵکی مانا ئاردو خواردنەوەی سەربازە ئاشوریەکانیان جێبەجێ ئەکرد[122]،لە راپورتە جەنگیەکانی [سارگونی دووەمدا] زۆر جار باسی ئەو ناوچانەی تیا کراوە کـە لـە نێوان ئورارتوو مانادا ناکۆکیـان بووە لـە سـەری‌و باسی کشتوکاڵیـان کردوە[123] ، لەشاری [تیر] - یان صور - کە لە ولاتی فنیقیەکانا بو جۆرە گەنمێك ئەچێنرا ئەم جۆرە گەنمە ئەکڕراو ئەفرۆشرا وە ئەوەیان لـە سـەر رەمینی یـەهودو ئیسرائیل ئـەکرێ ، وە ئەمـەیان لـەگـەل ئـەسپی طوغارما [ئەرمەنستانی بچوك]و عاج‌و ئابەنۆس کە لە ئاسیای بچوك‌و جەزائرو دەریای ناوەراست - مەدیترانە - (؟) ئەفرۆشران‌و ئاڵوگۆڕ ئـەکران ؛ وە بـەرامبەر بەرهەمە پیشەسازیەکانی سوریەو شـەرابی دمشق‌و شتی ترا ناو ئەبران[126] لە مانادا پیشە گەری - بە شێوەی گشتی لە زاموا - وەکو باسمان کرد زۆر ترتورەقی کردبو ، گەنجینەیەك کەلەم رۆژگارەی تازەدا لـە زیویەی نزیك سەقزەوە دۆزراوەتەوە لـە بارەی تـەڕدەستی‌و هونـەر مـەندی ماموستایانی ماناوە - لە سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی - رواڵەتی هونەرمـەندی ئاسنگەری ئـەو سەردەمـە نیشان ئەدات [ لـەم بارەیـەوە سـەرنجی بـەشی شەشەم بدەن ] •

کۆمەڵگای مانا تا رادەیەك نەریتی عەشیرەتگەری‌یان لـەناوا باو بووە ، ئەم باسە بۆ ئەوە ئەشێ بووترێ کە نوسراوەکانی ئورارتویی دەوڵەتی ناوبراو [کیشوەری مانا]ی بە - مانا - -نی ئابانی- ناو بردوە • بـەلام سـەرچاوە ئاشوریەکان هـەمیشە بەکیشوەری هۆزەکانی مانایان ئەوت [مات مانانی] وە بەم ناوەوە ناویان ئەبردن[127] • ئەو شوێنەوارانەی لـە ئاشوریەکانەوە بـە

جێماون جگە لە مانئا ـ یان گەلێك هۆزی تر کە ئەوانیش هەر لە کیشوەری مانادا بون بەم ناوانە ناویان ئەبەن : [تەئورلیەکان ، مسیئیەکان ، دالی ئیەکان ، سونبی‌ئیەکان ، کوموردیــەکان] ، گــەلێك عورفو عــادەتو چاولێکــەری سەردەمی سەرەتایی‌و کوچــەری لــەناو هۆزەکانی مانادا مابوەوە ، خــەڵکی هێشتا ـ پێچەوانــەی کیشوەرەکانی تری رۆژهەڵاتی کۆن ـ هاوبەشی ژیانی کۆمەڵایەتیان ئەکرد • دوایی هەروەکو بەرچاو ئەکەوێ ، خــەڵکی مانئا لــە دژی یەکێك لە پادشایانی ئەو کیشوەرە شورشیان کرد ، وە ئەمە لە مێژوی رۆژهەڵات زەمینی‌دا ـ لەو چەرخو سەردەمەدا دیاردەیەکی بێ وێنە بو، چونکە زوربەی ئەو روداوانەی کە روی ئەدا لە بارەی زورو ستەم یاخی گەریەوە ئەبو نەك شورشی جەماوەری خەڵك • لەبارەی شورشی (خەڵکە کانەوە) کــە لەدژی زۆرداران‌و بێگانــە راپەڕیون هەندێك سەرچاوەمان بــە دەستەوەیە ، هەرچەند هەڵکردنی ئاڵای یاخی گەری لەدژی ستەمکاران خۆی نیشانەی ئەو راپەڕینە کۆمەڵایەتیەو هەستی یەکگرتوی دەروونی تەواوی خەڵکەکانی ئەو سەرزەمینەیە ، کە هەندێك لە هۆزەکان بــەهۆی هــەندێك مەرجی مێژویی کۆمەڵگای بــەندایەتی زۆژ هــەڵاتــەوە لــەو یــەکیەتی‌و تێ خرۆشانــە بێ بەری بون •

بە پێی نوسینەکانی [سارگونی دووەم](١٢٨) پادشای مــانئا کــاروباری دەوڵەتی بەجۆرێکی ستەمگەرانەو زۆردارانە بــەرێوە نەئەبرد بــەڵکو دەستو پێوەندەکانی لایان لێ بڕیبووەوەو کەوتبونە زوڵم‌و زۆر کردن لــەناو خەڵکا ، پادشای ئاشور : شای مانئا [لەسەر رێکەوتنی گــەورە پیاوان‌و راوێژ کاران‌و دەست‌و پێوەندەکانی خۆی‌و سەرکردەو حاکمــەکان کــە وڵاتەکەیان بەرێوە ئەبرد ] لە سنور چوو بە پیری‌یەوە ، ئەو کاتە پادشای مانئا بەر لەوە [سارگون] دەست بکات بە شەڕ کردن‌و بکەوێتە خۆ داوای کرد کە تۆڵەی ئەو بیانوانەی بۆ وەربگرێتەوە کــە پێی گیراوە [ وە ئــەم داوا کاریــەشی لەســەر رای

راویێژکارە گـەورەکانی کیشوەرەکـەی خۆی بو ][129] • مـەبەست لـەو ریکخستنەیە کە لە سەرەتای مێژووی کۆمەڵگای چینایەتیدا بووە ، وە پێیان ئەوت ئەنجومەنی پیـاو گـەوران وە لـە رواڵـەتدا پاشـماوەی ریکخستنی کۆمەڵگای سەرەتایی بوو ، بەڵام چونکە لەبـەر ئەوەی چینێکیان ئەکرد بەگژ چینێکی تراو لەم کردەوەیە سودیان وەر ئەگرت لە پێش [بولەی] یۆنانیەکانو [سەنا]ی رۆمیەکانەوە دائەنرا • نوسراوەکەی [ سارگونی دووەم ] لەبارەی دامەزراندنو دروسـت بونی ئـەو ریکخستنەوە بـە دورو درێژی ئـەدوێ • چونکە ـ راوێژکارانی کیشوەرەکەی ـ کە لـە کاتی دووەمدا باس کـراوە هەمویان هەر ئەو پیاو ماقوڵو سەرکردەو گەورە پیاوانو راوێژ کارانە بون] کە یەکەمجار باس کراون • گـەورەکان واتا [پیاو ماقوڵانی کیشوەر]ی مانا کـە ئەندامی ئەنجومەنی گـەورە پیاوان بون وە ئەوانـەش بریتی بون لـە کەسایەتیـە گـەورەکانو پێشـەوایانو سـەرکردە ناوچـەییەکانو دەسـتو پێوەندەکانی پادشاو فـەرمانبەرانی وڵاتەکـەی ، کـە لـەنێوان گـەورە پیـاوە رەسـەنـەکانی ناوچـەکـەو پیـاوانـی دەوروبـەری پادشـاوە هـەڵ ئەبژێردران[130] •

لەبەر ئەمە ئەتوانین بڵێین کـە دەوڵەتی مانا یەکـەم قۆناغی کۆمـەڵگای چینایەتی بو کـە پادشاو ئەنجومەنی گـەورەپیاوان ـ کە لە گـەورە پیـاوە رەسەنەکان پێک هاتبو ـ هەمویان پێکەوە وڵاتەکەیان بەرێوە ئەبرد ، وە هەمو خەڵکەکانی تر کـە لەگـەل حکومـەتو بنەماڵە بـەرزەکانی دەوڵـەتیدا لـە بەربەرەکانێدا بون هەر خەریکی چالاکیو خۆ یەك خستن بون •

دەوڵەتی مانا کرا بە چەند بەشێکەوە کە بە زمانی ئاشوری [ناژە]ی پێ ئەڵێن : [ سوریکاش ] (؟) [ مستّی ] بەشی ژوروی روباری [ جەختەتو ] ، [ئوئیشدیش] ـ کـەناری رۆژهـەلاتی دەریاچـەی ورمـێ ـ [ئارسیانشی ـ ئارشتەیانا]و هی تر •••وە ئەمانە هەریەکە حاکم ودیان جێ نشینی [شاکنو] کە

له سەرچاوە ئاشوریەکانا قسەیان لێوە کراوە ، بۆ ئەم ناوچانە دیاری کرابون • سنوری ئـەم ولآتانە ـ تا رادەیـەکی زۆر ـ هەمـان سنوری قـەڵـەمڕەوی هۆزەکان بو • [کوێخاکان ـ یان خاوەن ئاواییەکان] کە بـە زمانی ئاشوری پێ یان ئەوتن [بل ئالی] وەیان [ئیدئوگرا] ، [هازانو]یان پێ ئەوتن کە بە مانا [کوێخای کۆمەڵ]ە • کە ئەمانە بەشێك بون لە بەڕێوەبەرانی مانا وە دیسان لە یەکێتی هۆزەکانی مادا بـە گرنگ سـەیریان ئـەکراو ئیش‌و کاریان پێ ئەسپێردرا • بەم هۆیەوە لە بارەی ئەم زاراوەیەوە رونتر قسەی لێوە ئەکەین• ئێستە بەمەندە دەس بەردار ئـەبین کـە مەبەست پێشەوای هۆزیان سـەرۆکی کۆمەڵەی عەشیرەت یان زەوی‌وزارە • [ واتا پێشەوای ئەو خەڵکانە کـە لـە ناوچەیەکی دیاریکراوا نیشتەجێ بون نەك قەڵەمڕەوو هۆزەکان ] •

گومانی تیایـە کـە تاڵانوارەیی لـە مـانادا باو بووە • فـەرهـەنگ‌و شارستانێتی مادی کیشوەری مانا لە پلـەی شارستانێتی ئورارتودا بووە ، وە ئەتوانین لێرەدا بڵێین کە ساختومانی کۆمەڵایەتی هەردو لاوەکو یەك وا بون • ئەتوانین کۆمەڵگای [مانا] بە سەردەمی سەرەتایی کۆیلەداری دابنێین ، قسەی لێوە کراوە کە کوێلەداریی لەو کۆمەڵگایەدا ئەوەندە بایەخی نەبووە وە بـە زۆری لـە سـنوری میرات گری‌و تاڵان کـردنی بنەماڵەیەك بـەو لاوە تـێ نەئەپەڕی •• بارو دۆخی ریکخستنی کۆمـەڵـگای [ مانا ] لـە سـەدەکانی هەشتەم حەوتەمی پێش زاینیدا بەم جۆرە بووە •

## ٥ ـ سەرەتای پەیدابوونی دەوڵەت

## لە وڵاتی یەکگرتووی [ماد]دا

مانا ئەوەندە بـە دەستەڵات نەبو کـــە بتـوانێ هـۆزەکانی خوارووی رۆژهەڵات بگرێتە ژێر دەستی خۆی ، وە نەك تەنیا لە دەستدرێژی ئورارتو

بەڵکو لەشکر کـەشیەکانی ئاشوریش ماوەی ئـەوەیان نەئـەدا کـە دەسـت بژەنێتە ناو کاروباری وڵاتی مادەوە هـەروەکو خۆی ئـەیویسـت • قۆناغی سەرکەوتن و پێشکەوتنی یەکیتی ماد هاوچەرخی بەربەرەکانێی سەختی نێوان ماناو ئورارتو بو • ئەو بەربەرەکانێیەی کە لە پێناوی ئازادی خۆیا کردی لە ساڵی ٧٨٨ی پێش زاینیدا [دوا لەشکر کەشی سمیرامیدو ئادادنراری سێیەم بۆ سـەر خاکی ماد] تا ٧٤٥ی پێش زاینـی واتا تاکو سـەرەتای دەستدرێژی تازەی ئاشور ـ ی خایاند • لـە ئەنجامی سەرکەوتنی ئاشورو زیانی ئورارتو مانا توانی خۆی راست بکاتـەوەو پشوویەك بدات بـەڵام ئـەم سـەرکەوتنە مەترسییەکی زۆر گەورەی بۆ یەکێتی هۆزەکانی ماد دروست کرد ، وە مانا لەو سەردەمەدا نەیئەتوانی ئەمە لا ببات • لـە سەرەتای تاج گوزاری [ تیگلا پالاساری سێیەم ] کە چوە سەر تەختی ئاشور ، بوو بـە هۆی نوشوستیو شکستی ئورارتو ، هەروەها بوو بە هۆی رەونەقێکی کاتی دەوڵەتی [ مانا ] سەردەمی سـەختی دەستدرێژی تازەی ئاشوریەکان بۆ سـەر خاکی یـەکێتی هۆزەکانی ماد دەستی پێکرد •

سەرچاوە ئاشوریەکان ناوی دەیەها لـە ئەمیرەکانی سـەرزەمینی مادیان نوسیوە ، بەڵام هیچ یەك لەناو ئەوانی ترا جیاواز نەبووە •

هەروەها لە دواییدا لـە سـەردەمی دەستدرێژی ئاشوریەکانا ـ یەکەمین لەشـکر کـەشی لـە ٨٣٤ تاکو ٧٨٨ وە دووەمینیان لـە ٧٤٤ تا ٦٧٨ی پێش زاینی ـ لە باسە سەر زارەکیەکان و فەرهـەنگ نامـەی گشتیدا دیارە دەستی پێ کردوە • وە ئەمە بەکردەوەو لەشکرکەشی ژنـە جـەنگاوەر یان شـاژن [سمیرامید] بڵێین ناو ئەبەن •

لە بەسەرهاتە کانی مادیدا ئەم باسە تەواو بەرونی ماوەتەوە کە لە دوای دەستدرێژی ئاشوریەکان سەردەمی سەربەخۆیی دەستی پێ کرد ، کـە هەر چۆن بێت دەوڵەتی ماد دامەزرا ، ئەم بەسەرهاتە هرودوت بۆ ئێمـەی بەجێ

هێشتووەو نووسیویە وە [کتسیاس] ئـەمـە بەراسـتـو ڕەوانی ناگێڕێتەوە • هرودوت نوسیویە : [١/٩٦/٩٧] [ئاشوریەکان لە ماوەی پێنج سـەدو پـەنجا ساڵدا لە ئاسیای ژورو[١٣١] حوکمڕانیان کرد[١٣٢] •وە یەکەمین جار مادەکان سەرپێچیان لە فەرمانەکانیان کرد ، وە بۆ ئازادی خۆیان لەگـەل ئاشوریەکان کەوتنە شەڕەوە ، زۆر مەردانە چون بەگژ ئاشوریەکانا ، خۆیان لە زنجیری دیلێتی ئاشور رزگار کرد • دوای ئەوە هەندێك هۆز هاتنە پاڵ مادەکانەوە ، مادەکان پیاوێ ئازاو لێ هاتویان هـەبو ، کە ناوی [دیوك] کوری [فرائورت] بوو ، ئەم [دیوك]ە حەزی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو ، وەکو لای خوارەوە کـەوتـە ئیش کردن : مادەکان لـەو سەردەمـەدا لـە لادێکانا ئەژیان[١٣٣] • ئەو کە زۆر تر لە دیێی خۆیاندا رێزو قەدرو حورمەتی هەبو ئەگەرچی ئەیزانی کە بێ دادی لەگەل داد پەروەریدا ئەجـەنگێ ـ باشترو زۆرتر لە پێشتر دادپەروەری کرد بـە پیشە ، وای لێ هاتبو لـەو کاتەدا لـە سەرانسـەری خاکی ماددا بێ قانونی حوکـم ڕەوا بوو ، مادەکانی دانیشـتوی دێکەی ئەو کە چاویان بـە رەفتارو کردەوەکانی کەوت کردیان بـە دادوەر [حاکم]ی دادگای خۆیان • وە کـە دزیو بێ قانونی کردن لـە لادێکانا لـە زووتر زۆرتر بوو ، مادەکان لە شوێنێکدا کۆبونەوە وە هەریەکە قسەی خۆی کرد ، وە هەر کەسە لـە بارەیەکەوەو بـە پێی بیروڕای خۆی دوا[١٣٤] بۆ ئەوەی یەکتر رازی بکەن کە سەر بۆ دەستەلاتو سەڵتەنەتی [بازیلوستای] دا بنەوێنن‌و لە فەرمانەکانی دەر نەچن •

چەندجار وتراوە کە لەم کاتەدا هـەندێك کرداری پێچـاو پێچو درێژ خایەن بە شێوەی سادە نووسین لە بارەی مێژووی سەردەمی ژیان‌و کردەوەی ئەو پیاوەوە نووسراوە ، وە لەگەل ئەمەشدا چۆنێتی کۆمەڵکای ناوبراو بەر لە پێک هاتنی دەوڵەتەکەیان بە شێوەیەك کە زۆر تر لە راست بچی نیشان دراوە• لادێ سەربەخۆ کانی [کومە] جیاوازی لە ناو خەڵکدا ، بەر بەرەکانی کردنی

یەکتر ، دزی کردن ، بونی ئەو کاربەدەستانەی کە هێشتا لە هەڵبژێر دراوەکان بوون ، بەڵام لەو کاتەدا حەزیان لە دەستەڵات‌و سەڵتەنەت ئەکرد ، کۆمەڵە خەڵکی هەمە جۆرە بوو(١٣٥) • بەو شێوەیەی کە هرودوت نوسیویێتی لەگەڵ مێژوی مادا زۆر بە جوانی ئەگونجێ ، وە ئەو ساڵانەی لە دوای کۆتایی دەسەڵاتداریێتی حوکمڕەوایی ئاشوریەکان [ساڵی ٧٨٨ی پێش زاینی] وە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی ماد [کە لە دەورو بەری ساڵەکانی حەفتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا بو] لەوە ئەچێ ئەم باسەی سەرەوە نەدرابێتە بەر سەرنج •• وردتر بڵێین ئەو سەردەمەی کە هرودوت باسی لێوە کردوە لەوە ئەچێ سەردەمی بەر لە سەرەتای دەست پێ کردنی سەرکەوتنەکانی ئاشور لە ٧٤٤ی پێش زاینیدا بووە • کە لە باسە سەرزارەکیەکانا فەرامۆش کراوە ، وە مادەکان لەگەڵ سەردەمی دەستدرێژی ئاشور لە کاتی دەسەڵاتداریێتی سمیرامیدا تێکەڵیان کردوە(١٣٦) •

ئەگەر مێژووی ساڵەکان کە لە نووسینەکانی هرودوت دا هەیە بەبێ گۆڕانوەر بگرین ، سەرەتای حکومەتی [دیوك] ئەتوانین لە ساڵی ٧٢٧ی پێش زاینی دا بنێین•[وە بە حیسابێکی‌تر(١٣٧) ٦٩٩ی پێش زاینی بووە]•بەڵام چۆنێتی سەردەمی سەڵتەنەتی [دیوك] لە نوسینەکانی هرودوت‌دا لەگەڵ ئەو شێوەیەی کە سەرچاوە ئاشوریەکان لەو رۆژگارەدا ــ ٦٧٥ ــ ٧٤٥ی پێش زاینی نوسیویانە ئەوەندە جیاوازی‌یان هەیە کە هەندێك مێژوو نوسی تری ناشارەزا هینەکانی هرودوت یان داوەتە دواوە •• لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وردەکاریە ئەوەندە نیە ، وە هەروەکو زوربەی لێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان بڵێین ئەو باسانەی کە هرودوت نوسیونی لە ماوەی سەڵتەنەتی زنجیرەکەدا دای رشتوە ، ئەمە زۆرتر لە راست ئەچێ ، هەر بەو شێوەیەی کە پێشتر باسمان کرد ساڵەکانی ٦٧٥ ــ ٧٤٥ی پێش زاینی کە رۆژگاری تاڵ‌و سەختی سەر زەمینی ماد بوە لەو باسە باسکراوانەدا نیە • بەم جۆرە ئەبێ لە

ناوەڕۆکی ناوی پادشایانی دیوکی وەیان دیوکیەکان دا نوسرابێت • [ لەم بارەیەوە پێویستە تەماشای سەرچاوەکانی دوایی بکەین ] هەرچۆن بێ لەگەل ئەو هەمو جیاوازیەدا کە لە گێڕانەوەی باسەکانا هەیە ئەتوانین سەردەمی سەڵتەنەتی دیوك نەختێك بەرینە دواوە بۆ ماوەی نێوان ساڵەکانی **٧٨٨** و**٧٤٥**ی پێش زاینی •

ئەم ماوەیە چونکە سەرچاوە ئاشوریەکانیش وای دا ئەنێن ،دیارە راستە• وە بە پێی سەرچاوەی ناوبراو لە ساڵی **٧١٥**ی پێش زاینی پیاوێك کە ناوی [دایا ئوکو] بو بە دیلی کەوتە دەست ئاشوریەکانو دوریان خستەوە ، بە تەواوی لەو باوەڕەدان کە [ دایائوکو ] هەمان [ دیوك ] بوە کە کتیبەکەی هرودوت باسی ئەکات(١٣٨) •

ئەگەر بی هێنینە یادمان کە هرودوت ماوەی سەڵتەنەتی [ دیوك ]ی **٥٣** ساڵ [ یان پەنجا ساڵ ؟ ] داناوە ، لەوە ئەچێ کە سەرەتای حوکمی سەڵتەنەتەکەی لە دەورو بەری ساڵی **٧٦٧**ی پێش زاینیدا بوبێت • وە ئەمە لەگەل بیروراکانی سەرەوەدا بە تەواوی ئەگونجێ • لەگەل ئەمەشدا ئەبێ ئەمەش نەکەین کە بە قسەی هرودوت **٥٣** ساڵ دیوك حوکمی کردوە ، [ئەم ژمارەیە هەر چۆن بەراورد بکرێ لە راست ئەچێ ، هەمو ماوەی سەڵتەنەتی پادشایی کە نوسەری ناوبراو نوسیوێتی – وە ئەبێ لە ماوەی حکومەتی دیوكو فرائورتدا جێی بکاتەوە – راستە • لە کاتێکدا کە سەرەتای حکومەتی فرائورت – بەم جۆرە بو کە دیمان – لەوە ئەچێ لە دەورو بەری ساڵ **٦٧٣**ی پیش زاینیدا بوبێت • رەنگ بێ سەڵتەنەتی دیوك نەختێك دواتر بوبێت – وە لە دوای لەشکر کەشی [تیگلاتپا لاساری سێیەم] دەستی پێ کردبێت ، وە یەکێتی مادەکانو کۆ کردنەوەیان بە سەردەمی دیوك دابنێین •

ئەمە شتێکی راستە کە دیوك نەیئەتوانی – بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هرودوت نوسیویە – پادشای سەرانسەری ماد بوبێت • بەلام ئەو یەکێك بوە

له فەرمانڕەوا بچوکەکانیو تـەنیا ئامادەکەری کۆمەڵانی خەڵکی ماد بووە • بەڵام لە مێژوی ئەوەی داهاتویانا دەر ئەکەوێ ، کە ئەو تەنانەت فەرمانڕەوای ناوچەیەکی گەورەی سـەر بـە خۆش نـەبوە ، سـەرچاوە ئاشوریەکان لـە رووداوەکانی ساڵی ٧١٥ی پێش زاینیدا [دیوك] بە حاکمێك ئـەزانێ کـە لە لایەن [مانئا]وە دانرابێ[١٣٩] •

زۆر لەوە ئەچێ کە لە سەرەتای کاردا دیوك ئیشکەرێکی داناو لێهاتوو زانا بوبێتو دەوڵەتە بچوکە تازەکەی خۆی بە سایەی حکومەتی مانئا بوبێت. کە لەو سەردەمەدا [مانئا] بە دەستەڵات بووە ، لە دواییدا تێکۆشاوە کـە بـە تەواوی سەربەخۆ بیت ، وە لەبـەر ئـەم مەبەستە پـەیمانی یـەکێتی لـەگەل [ئورارتو]دا بەست ، هـەروەکو دیمـان هـەمان یـەکێتی بوو بـە هۆی لـە ناوچونی •

شوێنی فەرمانڕەوایی [ دیوك ] نازانرێت ، بەڵام چونکە ئەو لە لایەن [مانئا]وە حوکمی پێ سپێردرابو قسـەی لێ ئەکرێ کـە قەڵەمڕەوی ئەو ا ە دەوروبەری سەرزەمینی مانادا بوبێت وە هەمان سەرزەمین بوبێت کە سەرچاوە ئاشوریـەکان پێیان ئەوت [مادای] لە دەراوی قزل ئوزن • رون نیـە کـە [ئەکباتانا] ــ هەروەکو هەردوت ئەڵێ ــ لە سـەردەمی [دیوك] دا مەرکـەزی پادشایی بووە یان نەء ؟ ــ هەروەکو پێشتر باسمان کردوە گرنگترین رێگای کاروانچی لە ئەکباتانا بەیەك ئەگەیشتن •• ئەکباتانا بە ناوەراستی مادی کۆن ناو ئـەبرا ، وە لـەوە ئەچێ کـە ئـەوێ یان کردبێت بـە بنکـەی سیاسی کیشوەرەکەیان ، چونکە لەو باوەڕەدان کە زاراوەی [ئەکباتانا] بە مانا [شوێنی کۆبونەوە][١٤٠] واتا [بازاری مەکارە] یان شتێکی بەم جۆرەو لەم بابەتە مانا بەخش بێت •• بەڵام بـە بیروڕای ئێمـە دیسان لەوە ئەچێ [بە تایبەتی لـە ناو داستانی هرودوت]دا هەیە ،کە لەو شوێنەدا کوبونەوەی گشتی ئەکراویەکێتی هۆزەکان کۆ ئەبونەوە ، وە لـە یـەکێك لەو کوبونەوانەدا [ دیوك ]یان بە

رابەری یەکێتی هۆزەکان هەڵبژاردوە ، وە هەر لە هەمان کاتا وەکو داوەری کۆمەڵەکەی خۆی لە دەراوی قزل ئوزون مایەوە(١٤١) •

لەبەر ئەوە کە باسە سەرزارەکیەکان [کە لە هرودوتە وە گێڕدراوەتەوە] سەرەتای یەکێتی ماد بەو رۆژگارەوە ئەبەستێ ، چۆن هەر لە هەمان کاتا وڵاتی بچوكو سەربەخۆ ـ کە سەرچاوەکان باسیان کردوە ـ توانیویانە بمێننەوەو بە شێوەی خۆیان بژین ؟ ئەم دیاردەیەو وەڵامی ئەم پرسیارە چۆن لەو نوسراوەی سەرەوەدا بە ئەنجام ئەگەیەنیت ؟ بەڵام لەوە ئەچێ ئاشوریەکان [دیوك] یان لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوای وڵاتێکی بچوكو حاکمی نێردراوی [مانئا] بووە بە پێشەوای هەمو مادیان نەزانیوە •

نوسراوەی بەسەرهاتەکانی ماد لەبارەی ساختومانی کۆمەڵایەتی مادەوە هەر لە دیوك وە لە زەمانی ئەویشدا کە لە نووسراوەکانی هرودوتدا دەرئەکەوێ لەگەل نووسینەکانی سەرچاوە ئاشوریەکانو ئاویستا دا ئەگونجێ • هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ئەگەر ئاویستا بە تەواوی لە ئاسیای ناوەڕاست دا نە نوسراوەتەوە • بەڵام لەوە ئەچێ لە ئەوپەڕی رۆژهەڵاتی ماد پەیدا بوبێت •• نیشان ئەدات کە بە بێ گومان بە شێوەی گشتی نەرێتو رەوشتی هەندێ هۆز بووە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی دا ،وە هەروەها ئەتواندرێ بەلای کەمەوە چۆنیەتی [ئاریزانتەکان] رون بکاتەوە • وە لە کاتی بەرامبەری کردن لەگەل سەرچاوە ئاشوریەکانا دەر ئەکەوێ کە رازی بون تا ڕادەیەك لە نێوان مەرجەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هۆزە ئێرانی زمانەکانو هۆزە ناوچەییەکانی گوتی ـ لولوبی زمان [کاسپی] ئەمە کارێکی زۆر گرانە • دابەشکردنی کۆمەڵگا بە زنجیرەی دیاریکراو سەرچاوەکەی لە کۆمەڵگای سەرە تاییەوە هەڵ ئەگرێت ، بەڵام لە یاسا ئاینیەکانا تۆمار کراوە ، وە لە سەردەمەکانی دواییشدا هەروەکو خۆی ماوەتەوە ، بریتییە لە دابەش بە دمانا

Demana ویسی Vis و شویثر soitra دهیو Dahyu

[ له گاتەکانا ](١٤٢) یان [ نمانا nmana - وویس vis وزنتـو zantu ودنگهو Danhu وله ئاویستای بچوکدا(١٤٣) ئەمانە ئەتوانین بیان بینین بەم جۆرە کە ئەم دابەش کردنە لە مادیشدا ئـەبێ ، وە بـە پێی سـەرچاوەی ئاشوری‌و هرودوت لـە بـارەی پارسیشەوە راستە • لـە دوای لێکدان‌و بەراورد کردنی ئەم زاراوانە ئەتوانین لە بارەی چۆنێتی کۆمەلآیەتی ئەو سەردەمەوە هەندێك بیرورا رون بکەینەوەو هەندێك شتی بەکەڵك بدەین بە دەستەوە •

١ ـ [نمانا] بە مانا خانوو شوێنی نیشتەجێیە بەلآم [خانەدان‌و بنەماڵەش دیسان هەمان مانا ئەیگرێتەوە] واتا بنەماڵەی شازادەکان کە خاوەن کوێلە کانیش ئەگرێتەوە ، وە لە سەر ئەوانەوە پیریان [باوکی شا] وەیان [خانەی خوا] هەیە [نمـانوپاتی ، نمـانی Nmanopati,Nmanya ] • لـە کتێبـەکـەی هرودوت [ئیکیا ـ Oikia ](١٤٤) بە وشەی [نمان nmana گۆڕیوە وە بە وردی ماناکەی ئەگەیەنێت ••وشەی پارسی کۆن [ maniya ] ـ کـە چارێکی تر قسـەی لێوە ئەکـەین ، ئەویش هەر لـە هەمان ریشەیە ، لـە نوسراوەکانی داریوشی یەکەمین پادشای ئێراندا لە بێستون نوسراوە ئەو(١٤٥)

Abicaris Gaitanca maniyamca vitbisca

کە لە گئوماتای موغی گرتبو دایەوە بە شەرکەرەکان ، ئەم زاراویە ماوەیەکی زۆر لێکۆلەرەوەکان لە سەری ئەکۆلآنەوە ، ئەگەرچی زوربەیان زیاتر لە سەر ئەوە رێکەوتن کە مانای Abicaris [مرتع]ە وە gaita کـە لوپەل [ئاژەڵ] ئەگرێتەوە(١٤٦) •

لەم دوایەدا دو جۆر لێکدانەوە بۆ وشـەی [ maniya ] بـەکـار هێنراوە ، یەکێکیان لە لایـەن [ و•أ•تیورین ](١٤٧) ئـەوی تریان [ ای• گرشویچ ](١٤٨) هەردو لێکدانەوەکە لەسەر ئەمە رێکەوتون کـە لـە روی

وزەی ئابوریەوە لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا کە لە [ستێلك] دەست کەوتوە وشەی [ کورتش ] ـ kurtas ـ زۆر دوبارەو چەند بارە کراوەتەوە ، وە لەو نوسینەی بێستوندا ئەم وشەیە بە عیلامی زمانی پارسی کۆنی مانی maniya تەرجومە کراوە • بە وتەی [ و•أ•تیورین ](١٤٩) [کورتش ـەکان ـ kur-tas ]ی دەرەوەی ئەستێلك بە شێوەیەکی تایبەتی خۆیان کە بویانە ••••هەروەها هێزی کارگەرانی بنەماڵە کشتوکالیەکانو ئەو شوانانە کە خەریکی بەخێو کردنی ئاژەڵ بونو بەلاَم هێشتا هۆیەکانی بەرهەم هێنانیان لە دەست بەرنەدابو وە لە کۆمەڵی [وپتاپتی vitapatiy ]ـ بەشە رەوی‌و زاریان بۆ ـ پێك هاتبون • ئەگەر خۆی سەرۆکی بنەماڵەی کورتش نەبوایە •••• مانیام maniyam ئەو •••واتا [ خەڵکی خانوەکەی ] یان ئەندامی بنەماڵەکەی زوربەیان وەکو کورتش kur-tas ئەبون ••••]وە هینی تر •••••

لێرەدا لەبەر ئەوەی بیروړای [و• أ تیورین] تاکو چ رادەیەك لە بارەی ساختومانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کۆنی پارسەوە لە راستیەوە نزیکە باسی ناکەین •وە لە دوای ئەوە باس ئەکەین •

بە بیروڕای [و•أ• تیورین] وشەی فارسی کۆنی مانی maniya بە مانا [خەڵکی خانو]وە پەیوەندی‌یان بە [خانەو خانەدانەوە]یان مانا mana وەیە •• [ نمانا ـ وـ دمانای کۆن ] ئەم رستەیە لێرەدا بۆ ئێمە زۆر جێگای سەرنجە •

[ای• گرشویچ] بیروڕایەکی تری هەیە ئەو لێکدانەوەیە کە [کامرون] بڵاو کەرەوەی نوسینەکانی ئەستێلك لە بارەی وشەی کورتش kurtas لە پارسی کۆنی کرتا krta ـ کردە ـ یان [کرتار] ـ krtar ، کبرتا krta «کنندە» ] پێشنیاری کردوە ئەیداتە دواوە ، وە بە شێوەیەکی بەڵگەنامە ئەیسەلمێنێ کە ئەم وشەیە وشەیەکی پارسی کۆن [ گردا

Grda ⁽¹⁵⁰⁾ وە ئاویستای گردا Gereda ـ لـە مانای خانوەوە وەرگیراوە ، کە بە تەواوی لەگەڵ مانی ـ maniya ـ لـە مان mana وەرگیراوە کە مانای خانو ئەگرێتەوە • گرشویچ وتەکەی [بیلی] بە بەڵگەی راستی بیروراکەی هێناوەتەوە وە ئەوەمان دێنێتەوە یاد کـە بـە زمانی تخاری وشەی [مانیە] manye [بۆ کۆ کردنەوە بەکار دێت] یان کۆیلەکان ، لـە زمانی ئێرانیەوە هاتوە •وە زاراوەی[مانیا maniya ]وکورتش kurtes لەگەڵ وشەی یۆنانی ئۆیکتس oiketes [کۆیلەی ناومال] ئەگرێتەوە •

هەرچۆن بێ هەردو ماناکە لەم وشەیەدا ئەگونجێن ، هەروەکو وشـەی لاتینی [ فامیلیا ] ـ Familia ] نەك تـەنیا ژنو منـاڵو ژنانو منـاڵان ئەگرێتەوە بەڵگو کوێلەکانیش ئەگرێتەوە •

وشـەی ئێرانی دمانا ، نمانا ، مانا Demana,Nmana,Mana دیسان بەلای کەمەوە لە سەرەتاوە بە هەمو ئـەمو ئـەو وتراوە ، بە بیروڕای وە• أ تیورین ئیشو کار بەرێوە بردنی کورتش kurtas بێـگارو کاری نەخستە پێی خەڵکی لادێکان ، بەلاّم هەروەکو لە هەندێك سەرچاوەی لەیەك چوو لە کۆمەڵگاکانی کۆنی رۆژهەلاّت وەرگیراوە بێگارو کار واجبی هـەمو کەسێك بووە ، نەك هـەر بە تەنیا خرابێتـە پێی کۆمـەڵە هـەژارەکان • دەوڵەمـەندەکان رەنجبەرەکانی خۆیان ئـەنارده بێـگار وە خـەڵکی تریش خێزانەکەیان ئەنارد ، لە هەردو شێوەکەدا ئەم کرێکارە بێگار کێشانە لـەوە ئەچێ بە وشەی هاوبەشی مانیا maniya [خەڵکی خانو] «ئەندامی بنەماڵە»ی پێ وترا بێ • بەلاّم لە بارەی گئوماتای ـمغـەوە بـە پێچـەوانەی بیروڕای [وە• أ• تیورین] ـ گومانی تیا نیە کە ئەو لـە ئەندامانی کۆمەڵە هەژارەکانی ئـەندامانی بنـەماڵە کـەی ئـەوانیان نـەگرتوە وجیانـەکردبێتەوە ، بـەلاّم کۆیلەکان وە لەوە ئەچێ کەلوپەلی بنەماڵەی ئەوانیشیان پێ بوبێت •

لەبەر ئەوە گۆڕینی ئـەم وشانە بە بیروڕای زوربە بەوەی دائەنێن کـە

شێوەی دەستوری[١٥١] چۆن لێك بدەینـەوە ـ بە مانا [مرتع ، کـەلوپەلی گوێزراوە ـ ئاژەڵ ـ خەڵکی خانو][١٥٢] لەگەل شوێنە نیشتەجێکانو لادێ وەیان بە مانا [مرتعو کەلوپەلی گوێزراوە ـ ئاژەڵ ـ وخەڵکی خانوو هەروەها شوێنی نیشتەجێ] ؟ .

زۆر جێگای سەرنجە بە پێی نوسراوەی سەرەوە لـە کۆتایی سـەدەی شەشەمی پێش زاینیدا کەلوپەلی پارسەکان بە شێوەی گشتی بریتی بووە لــە ئاژەڵو هەندێك کۆیلە ، کێڵگەو باخو دەزگا کشتوکاڵیەکان بەشێکی رەسەنو تایبەتی موڵکی یەك نەفەری پارسی نەبوە ، وە بەلای کەمەوە لـە سـەردەمی پـەیدا بونی ئەمانـەی سەرەوەدا وابوە[١٥٤] . پیشـە تایبەتیەکان ئـەوانیش ئەوەندە بەهایان لە پارس‌دا نەبوە[١٥٥] چۆنێتی ئەو خەڵکە کە ئاویستا باسی لێوە کردون ئەوانیش هەروەها بون . وە لەوێشدا خەڵك هـەر خـەریکی ئاژەڵداری بون وە بە تایبەتی پەروەردە کردنی ئاژەڵی گـەورە کـە شێوەی رەسەنی بەرهـەم هێنـان بووە[١٥٦] . بـەڵام لـە بارەی کشتوکاڵو دەزگا ئاودێریەکانـەوە دیسان زانیاریـەکی زۆر فـراوانیان بوە[١٥٧] . ئەندامـە سادەکانی کۆمەڵ لـە ئاویستای بچوکدا پێیان وتراوە واستری ـ فشوینت ـ vastrya-Fsuyant [ئاژەڵدارەکان ـ کشتوکاڵیەکان][١٥٨] . لـە لایـەکی ترەوە دووەمین بـەشی کۆمـەڵایـەتی کار ـ واتا جیـاکردنـەوەی پیشـەلە کشتوکاڵیەکان ـ تازە دەستی پێ کردبو .

ئاویستا تەنیا یەك جار باسی پیشەکاران [هوتی ـ huti ] بەرامبەر بە کاهنەکانو پیاوگەورانو [ئاژەڵدار ـ کشتوکاڵیەکان ئەکات[١٥٩] ، وە بە پێی بەڵگە ئەتوانین بڵێین کە پیشەو پیشە سازی ئیشی ئەو کەسانە بون کـە ئازاد نەبون[١٦٠] .

ئاویستا باسی کۆیلەکانی وایسو vaisu ی کردوە ، ئەوانە کۆیلەی خانـەیی بون وە بـەشێك بون لـە بنەماڵـەکان وە یان بـە عەشیرتی vis

ناسراون[١٦١] • به تایبەتی ئافرەتە کۆیلەکان [کەنیزەك] زۆر بون[١٦٢] •

سەرزەمینی ماد کە کەوتبوە نێوان کیشوەری ئاویستاو پارسەوە ـ هەروەکو دیمان ـ لەروی پێك هاتنی کۆمەلایەتیەوە لەگەڵ هەردو دراوسێ کەیا تێکەڵ بون • وە لە شێوەی بنەماڵەی [پەدەرشاهی ـ باوکەکاری] بێ بەش نەبون • بۆ بەڵگەی راستی جیاوازی نێوان خەڵكو بونی شەڕی تالانگەری و داگیر کردنی مڵكو ماڵی خەڵکی تر لە مادی ئەو رۆژگارە ئەو هەمو قەلا گەورانەیە کە وێنەکانیان دەستی ئێمە کەوتووەو هۆی پەیدا بونیشیان ـ هەروەکو زوتر باس کراوە ـ بۆ بەرگری کردن لە پەلاماری ئاشوریەکان [کە لە دواییدا پێویستی پەیدا کرد وە هەر چۆن بێ ئەو قەلایانە توانای خۆراگرتنیان لە رویانا] نەبوە • بەڵکو بۆ زنجیرە شەڕێك بووە کە هەمیشە لە نێوان سەرکردەکانی ماددا هەر بوەو درێژەی کێشاوە ئەو سەردەمەی کە باسی ئەکەین ، سەرزەمینی ماد گەلێك شتی لە شێوەی کۆمەڵگای کویلەداری تیا بوە ، هەروەکو دانشمەندەکان باسیان کردوە ، بۆ نمونە : [شار ـ قەلا]کان کە حەسارێکی بەردیان خشتیان بەدەورا ئەکراو ناو بەناو قوللەی شەڕکردنیان تیا بووە ، سەرەتای دابەش کردنی پیشەگەری ، شەڕو شۆرو بگرەو بەردە ، کە بوبو بە [پیویستیەکی رۆژانەی هەندێك لە کۆمەلانی خەڵك] •••هتد • بەم جۆرە ئەتوانین باوەڕ بە کەموکورتیەکانی تری ئەو هۆزانە بکەین ، واتا بنەماڵەی سەردەمی باوکەکاری ، کویلەداری ، گۆڕینی پلەکانی بەرێوەبردنی عەشیرەتیو هۆزایەتی ـ واتا هاتنە دی ئەمانەو گەورەکانی عەشیرەت بۆ چەوساندنەوەی هۆزەکەی خۆیان بەکاریان ئەهێناو سودیان لێ وەر ئەگرتن ، لەم روەوە شتی تایبەتیو راست کە لە گەل مێژوودا بگونجێ بە دەستەوە نیە •

بەلام لە هەمان کاتا ئازادی تەواوی خەڵك هێشتا تەواو نابود نەبوبو ، هێشتا کۆمەلانی خەڵك مابون[١٦٣] وە کردرای کۆمەلایەتی تەواوی خەڵکە

**ئازادیخوازەکانی** کۆمەڵەکان هێشتا تارادەیەك ئەجوڵانەوە •

**٢ ـ ویس vis ـ ئەم وشەیە دوو مانای هەیە :**

أ ـ عەشیرەت‌و خێڵ(١٦٤) • ب ـ شـوێنی نیشـتەجـێ یـان ئاوایـی [وەکو ـ وس ـ Bes کە لـە روسی کۆندا هـەمان مانای بووە] •• مانای رەسەنی ئەم وشەیە ئەوەی یەکەمجارە • ویس vis عەشیرەتی نێروەجاخە، وە بـەم مـانایـەوە [ تئوخمن Tauhma ]ی ئـاویسـتاییو [ تئوهم Tauxman ]ی پارسی کۆنیشیان پێ وتوە • وەکو باو بووە ناوێکی تایبەتی کە هەمان ناو نازناوێکی تری بووە • هەروەکو فەرێدونی ئەفسانەیی [ثرائی تئون] بە قسـەی ئاویستا لە عەشیرەتی [ئائوبا] بوەو ، وە ویشتاسب پەناگای زەردەشت بـە عەشیرەت یان خانەدانی [ئئوتر] کورش‌و داریوش‌و پادشایانی تری ئێرانی کۆن بە خانەدانی هەخامەنشیەکان دائەنێ • نەوەی پادشایانی ماد خۆیان بە بنەماڵەی کیاکسار ئەزانن [بێستون II و٥] هرودوت‌ئەم خانەدانەی بەم [فرتره] phretre ناوبردوە(١٦٥) •

باشترین ئەندامی خانەدانەکان ئەبون بە سەرۆکی خانەدانەکە ، بەڵام لە بنەماڵەی پادشایانی ئێراندا لە سەردەمی ساسانیەکانا مەرج نەبووە کە سەرۆکی خانەدانەکە پادشا بوبێت •

بە پێی پارچـەیـەك لـــە نووسینەکـەی بێسـتون ویث = ویـس (vis-vit) ]یەکێتی ئابوری کۆمەڵگا بووە،وە نمان Nmana بنەماڵەیەکی دیاریکراو ـ یـان بـەشێك لـە ویس vis بوە • بـەڵام ویس vis تەنیا مانای خانەدان‌و عەشیرەت نیە بەڵکو ناوی ئاوایی‌و شـوێنی نیشتەجێش ئەبێ ، وە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە لە سەرەتادا لادێکان عەشیرەت‌و خانەدانی بون • وە لـەبـەر ئـەمـە [ خـاوەنی ویس vis ] [ لـە ئاویستادا ـ ویسپتی vispati ](١٦٦) بە تەنیا پیرو گەورەو بنەماڵەو عەشرەت نەبوە،

بەڵکو بە سەرۆکی ئاواییشیان وتوە • بەم جۆرە ئەوەی لە نوسراوەی ئاشوریەکان لە بارەی زوربەی [بل ئالی Belali ] یان [خاوەن ئاواییەکان] سەربەخۆ باسکراوە جێگای سەر سوڕمان نیە ،وەکو دەرئەکەوێ ئەم وشەیە تەرجومەی [ویسپاتی] مادی [خاوەنی ویس vis بو بێت[١٦٧] • [خاوەنی ئاوایی] یەکێك بووە خاوەن شوێن‌و جێگەداری سەرخانەدانی سەردەمی کۆمەڵگای سەرەتایی – بەڵام لە سەردەمێکدا کە کۆمەڵگای چینایەتی بەرەبەرە پێ ئەگەیشت ئەم خاوەن ئاواییانە بون بە شوێن‌و جێگایەکی دەرکەوتو تاکو بونە چینی گەورە پیاوان‌و بون بە حوکمڕەوایان • لەوە ئەچێ هەروەکو چۆن لە نوسراوەکەی بێستوندا دەر ئەکەوێ نوێنەرەکانی ئەم کۆمەڵە لە خەڵکی تر زیاتر کەلوپەلی جۆر بەجۆریان بووەو لە ئاواییەکانا [یان بنەماڵە خانەدانیەکان‌و عەشیرەتەکان] یان خاوەنی ئاواییەکان بون • بە تەواوی لەوە ئەچێ خاوەن ئاوایی هەڵ ئەبژێردرا[١٦٨] وە جێگای بە میرات نەئەدرا بە یەکێکی تر •

بەم جۆرە ئەگەر کۆمەڵگایەك کە لە ئاویستادا باس کراوە وە کۆمەڵگای ماد [لە سەدەکانی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی] ـ کە لەو ئەچۆ ـ ریکخستنی کۆمەڵایەتیان لەسەر بناغەی خانەدانێتی‌و خزمایەتی دامەزرابو ، دروست بونی چینەکانیان کەوکورتی تیا بووە • هەروەکو ئەزانین لە کاتێکدا کۆمەڵگا لە جیاتی دابەشکردنی عەشیرەتی‌و خانەدانێتی لەروی نیشانەی خاکەوە دابەش بکرێ ئەمە خۆی لە خۆیا یەکێکە لە نیشانەکانی پەیدا بوونی دەوڵەت[١٦٩] • بەم جۆرە ئاواییەکان [ویس]ەکان ، هەندێ جار عەشیرەتی تایبەتی نەبون ، ئەگەرچی نەریتی عەشیرەتگەریشیان بەکار بهێنابایە ، هەرچۆن بێت ، بە یەك کۆمەڵگای هاوبەشی یەك زەوی دائەنران ، کە لە کتێبی [گاتا] کاندا پێیان وتون [شوئیتر] وە یان [کێڵکە]و [زەوی کێڵراو] • شوئیتر پارچە زەویەکەو [ئاوو زەوی] پەیوەندی پێوە هەیە[١٧٠] ، بە زمانی پارسی کۆن [ وردن

vardana ] واتا [ئاوایی] یان شـوێنی نیشتەجێ بونیان پێ ئەوت(۱۷۱) • بەرامبـەر بـە زاراوەی [ ورزن verzana ] لـە لایـەك [ هواتیو — Huaitu ] بە مانا [خزمایەتی] پێ ئەڵێن ••وە لە لایەکی ترەوە [ ئاریامن Aryaman ] بەمانا کۆمەڵ یان یەکێتی ئاینی یە • وشەی [ورزن] لە گەل ریشەی کرداری ورز varez بە مانا کارکردنە • لەوە ئەچێت کە [ورزن] شوێنی نیشتەجێیان ئاوایی چـەند کۆمەڵێکی لادێیی دەورو بەری یـەکتر بووە • وە لەوانەیە لەگەل [ویس — vis ] — یان ئاوایی — لەیەك بچن ، وە یاخود چەند [ویس]ێك کە بە یەکەوە لکابن بەوەیان وتوە • لەبەر ئەمە [شوئیتر] هەندێك لە ناوەڕۆکا بەرزتر لە [ویس]و هەندێك جاریش جێ نشینی ئەو ئەگرێتەوە •

لە نووسراوەی ئاشوریەکانا وا دەرئەکەوێ کە لـە خاکی ماددا چـەند شوێنێکی نیشتەجێی سەختی قەڵا ئاسایی [ئالانی دنوتی alanidannuti] وە چـەند شـوێنێکی نیشتەجێی بچوکتر لـە دەوروبەری ئـەودا [ ئالانی سهروتی Alani sehruti ] هەبووە • دانیشتوانی ناوچەی دوایی لـە کاتی تەنگانەو پێویست دا ئەیان توانی پەنا بەرنە بەر ناو حەساری قەڵاکەوە • ئەو جیاوازی‌یەی کە لە زمانی پارسی کۆندا لە بارەی ناوی شوێنە نیشتەجێ‌کانی [ ویـس vis و وردن vardan ] کـە بـە زمـانی ئـاکـادی [ ئـالو — alu ] تەرجومە کراوە ، وە قەڵاکان [دیدا Dida و گـە لـە ڕاستیدا بە حـەسار وتراوە وە بـە ئاکادی [ ئالو — alu یـان بیرتو — Birtu — یان پێوتوە(۱۷۲) هەیەو هەر لەو جیاوازیە ناشیە ئەچێ • ئـەو قەڵایانە ئەبوا شوێنی نیشتەجێی هەمیشـەیی وەیان پەناگای کاتی بوونایە — واتا ئەو حەسارەی کە لەناو دەرونی ئەو شوێنەدا بۆ خەڵك و ئاژەڵ بوایە(۱۷۳) • وێنەو نیگارە ئاشوریەکان کە لە قەڵاکانی ماددا بـە جێماوە ئەوانە بەروونی چۆنێتی سەختی‌و مەحکەمی قەڵاکان باس ئەکەن •

ئەم قەڵایانە ساختومانی مەحکەم بون لەسەر لوتکەی بەرزو شاخە بەردینەکان وەیان هەندێك جار لەسەر گردە دەستکردە تورەکە رێژە دروست کراوەکان دروست ئەکران • بەهەر چوار لای دا دیوارێك وەیان چەند دیوارێك وەکو حەسار دروست ئەکرا ،وە لەسەر روخی حەسارەکان لەبەر تیر ئەندازیو کەمان هاویشتن گوێسودانەیان بۆ دروست ئەکردن ، لە هەندێك شوێندا هەروەکو گردێکی سروشتی لە خشتو خۆڵ تەپۆڵکەیەکیان دروست ئەکرد • ئورارتوییەکان زۆرتری لە بەرد دروستیان ئەکردنو دیوی ناوەوەی دیوارەکەیان لە خشتی کاڵ دروست ئەکرد ، زۆر جار بە چوار دەوری قەڵاکەدا جۆگایەکی قوڵیان هەڵ ئەکەندو لە کاتی تەنگانەدا ئاویان تێ ئەکرد •

هەروەها لە ناو قەڵاکانا ژوری سەرکردەو حاکمە کانیان لە ژورەکانی تر مەحکەم تر دروست ئەکردو ئەم لاو ئەو لایان بورجیان تیا دروست ئەکرد، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو حەسارە دەسکردە خشتانە کە بە هەمو جۆرە هۆیەکی جۆربەجۆر پارێز گاری کردنی قەڵاکان دروستیان ئەکرد ، مێژووی شەڕەکانی مادو ئاشور ئەوەمان نیشان ئەدات کە مادەکان بەرێکەوت هەوەجەیان ئەکەوتە ئەوە کە پەنا بەرنە بەر ئەو حەسارانەی کە دروستیان کردوە بۆ خۆ پاراستن ••

لەوە ئەچێ [ئاوایی – قەڵا] کان(١٧٤) بارەگای فەرمانفەرمایانی بچوك بوە کە وەکو سەرچاوە ئاشوریەکان باسی ئەکەن(١٧٥) ، وە هەر وەها ئاویستاش بە [ساستر sastar ] ناوی ئەبات • [لە سەرچاوەکانی پارسی کۆندا هیچ باسی ئەم فەرمانفەرما بچوکانەیان نەکردوە] • ئەو ناوچەیەی کە سەر بەم فەرمانفەرمایە بووەو پەیوەندی بە قەڵاکەیەوە بوە [خشاترا] بوە بە مانا [دەسەڵات] یان قەڵەمڕەویان پێ وتوە(١٧٦) لەوە ئەچێ لەگەڵ قەڵەمڕەوو کۆمەڵو شوێنتر یەك بن •وە دیسان لەوە ئەچێ لەگەڵ [کیشوەرو سەرزەمینی]

[ دنگهو ، داهیو Danhu,Dahyu ] ـ كه له بارەی ئەم زاراوەیەوە له دوایيدا قسه ئەكەين ـ له زاراوەی زمانی ئاكادی دا له سەردەمی مادا وشەی [ نـاگو Nagu] كـه مـانای ولايـەتو ناوچـه ئـەگرێتـەوه بـەكاريان هێناوە(١٧٧) • لەبەر ئەمه لەوه ئـەچێ [ ساستار ـ sastar ] هـەمـان دنگهوپتی ـ Danhupati يان [خاوەنی كيشوەر](١٧٨) بو بێت • بـه داخەوه چونكـه زاراوەی [خشتر] مانای زۆر هـەيه كەلێك له نووسراوەی [گاتا]كان هێشتا به شێوەيەكی بنەبڕانه ئێك نەدراونەتەوه •

ئەگەرچی لەوه ئەچێ كه دەستەلاتی فلان يان هەمان فەرمانفەرما ، لـه هـەندێك كاتا تەنيا لەيەك ئاوايی مـەحكەمدا [وه چەند شوێنێكی نيشتەجێی بچوك له دەورو بەريا كه له هەمان عەشيرەت بون] دەسەلاتيان بووه ، بەلام به شێوەی گشتی فەرمانفەرمايان [ساستار] بـه [سـەروك يان خاوەن ئاوايی يان گەورەی عـەشيرەت] كـه [ويس پتی vispati ] پـێ وتراوه جيـاوازی هەبووه • بەلای كەمەوه له روی سەرنجدانەوه ويس پتی ـ لەناو عەشيرەتو هۆزەكانا خاوەن جێگا بووه ، هەروەكو وتمان لـەوه ئەچێ بـه هەلبژاردن هەلیان بژارديه • بـەم جۆره رەنگ بێ لەگـەلێك شوێندا ويس پتی بـه نوماينده‌و نوێنەری قازانجی زوربەی ئـەندامانی كۆمـەليان دانابێ •• ئـەم خوداوەنده [پير]ی ئاوايی لـه هـەمان كاتا داوەرێكی هـەلبژێردراو وه يان سەرۆكی دادگای كۆمەل بووه •

بـه قسـەی هـرودوت ديوك Deyok لـه ئاوايـەكـەی خـۆيدا [ كومـه kome ] جێگايەكی دياری [ديكاستس Dikastes ]ی بووه ، بەلام له دوايیدا ديوك بوو به فەرمانفەرمای هەمو ماد • هەروەكو له ئاويستادا ئەلێ فەرمانفەرمای [كيشوەر] [دنگهو Danhu ] نـەك تەنيا فـەرماندەی سوپايی بووه بەلكو فەرماندەی داوەريش بووه(١٧٩) •

٣ ـ زنتو ـ ئەگەرچی عەشيرەتەكان ماوەيەك وەكو كۆمەلی نێروەجاخی

بەشێکی تەواوی سیاسیو نژادیدا کە پارچەیەك بووە لە قەڵەمڕەوی ساترا(١٨٩) وە یان ناوچەیەکی بچوك بووە لە ناو ئەو قەڵەمڕەوەدا(١٩٠) لە سەردەمی بەشەکانی ئاویستادا کە لە بارەی سەردەمەکانی دواییەوە نووسراوە [چەرخی پارتەکان](١٩١) ئەبێ بە تەواوی لە بارەی وشەی دهیو Dahyu مانای فراوانتری دەرکەوتوە ، بەڵام لە بەشە کۆنەکانی ئاویستادا دنگهو دیو زۆر لەوە ئەچێ شتێك بێ لە کیشوەرە بچوکەکان بچێت کە بەپێی سەرچاوە ئاشوریەکان لەسەر زەمینی مادا بون وە فراوانی خاکەکەیان لە قەڵەمڕەوی هۆزێك بچوکتر بووە ، بەم جۆرە گاتاکان دهیو Dahyu بە دوای شوئیترەوە باس ئەکەن • کوی ویشتاسب پەناگای زەردەشت ئەویش فەرمانفەرمای یەکێك لەم [دهیو]انە بووە(١٩٢) •

ئەوەی کە باسمان کرد بە پێی سەرچاوە ئاشوریەکان لەگەل چونێتی باری سەرزەمینی مادا ئەگونجێ • چونکە سەرزەمینی ماد بوبو بە چەند کیشوەرێك کە هەریەکە خۆی بەڕێوە ئەبردو سەربەخۆ بون ، وە زوربەیان پادشایان بووە ، [ زۆرتر لە بەشەکانی ژوروی رۆژئاواو کەمێك لە رۆژهەلات ](١٩٣) • بەڵام سەرچاوە ئاشوریەکان فەرمانفەرمای ئەم کیشوەرانەیان بە پادشا دانەناوە بەڵکو [بل ئالی – Bilali ] یان پێ وتوون ، واتا زاراوەیەکە کە لە گەل [ویس پتی]دا بەرامبەرەو بەکاریان هێناوە • لەم کاتانەدا لەوە ئەچێ لەگەل پادشایەنی وەکو [ ساسترا ]ی ئاویستایی سەروکاری نەبوە ـ بەڵکو [دهیوما]یی Dahyuma [دنگهوپتی]هەیە کەوەکو [ویس پتی] پێشەوایی کۆمەڵی سەردتایی ئەکرد • ئەو سەرۆکی کۆمەڵێك یان چەند پارچە زەویەك بوە ، بەڵام لەوە ئەچێ هەندێك جار لەو دیو پەردەوە یەکێتی هۆزێك وەیان عەشیرەتێك بو بێت •

هەرچۆن بێت نابێ وای دابنێین کە ئەم پادشایانەی ماد وەکو سوڵتانە ستەمگەرەکان بەڵام بچوکتر بۆن ، چونکە لەو سەردەمەدا هێشتا دەستەڵاتێکی

ستەمگەرانەی ئەوتۆ پێویست نەبو بخولقێ(١٩٤) • هرودوت ئەڵێ : مادەکان کۆمەڵانو ئەنجومەنی خەڵکیان هەبو [١/٩٧] • وە بە بێ گومان ئەنجومەنەکانی پیاو گەوران لە باشترین پیاوانی ماد پێك هاتبون • ئاویستا ئەویش دیسان لە بارەی ئەم جۆرە رێکخراوانەوە بەناوی [ هنجمن ] Haniamana وە(١٩٥) [ویاخ] و [یاخمان] Vyaxman,vyaxa ناویان ئەبات(١٩٦) •

زانیاری ئێمە لە بارەی سەرەتای دابەشکردنی خاکی کۆمەڵگا لەسەر زەمینی مادو کیشوەرەکانی دەوروبەریا بەو جۆرە بو کە باس کرا ، وە ئەمە خۆی ئەوە ئەگەیەنێ کە کۆمەڵگای چینایەتیو دەوڵەت لەوێدا بووە ، نوسراوەکانی سەرەوە وا ئەگەیەنن کە لە سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی لە سەرزەمینی مادو تەواوی ئەو کیشوەرانەی کە ئاویستاو گاتاکانی تیا نوسراوەتەوە هەروەها لە پارس [ پرسید ] سەدەی شەشەمی پێش زاینی مەرجەکان چون یەك بون [لەوە ئەچێ نەختێك هاو سەردەم نەبوبن] •

**ئاویستای بچوك لە بارەی دابەشکردنی کۆمەڵگاوە کۆمەڵە پیشەییەکان ئەکات بە سێ بەشەوە :**

١ – ئاترون atravan یان [ کاهنەکانو ئەوانەی خزمەتی ئاگریان ئەکرد ] •

٢ – رتیشتر Rataistar یان [عارەبانە سوارەکان] •

٣ – واستری فشوینت vastrya-Fsuyant یان [ ئاژەڵدارو کشتوکاڵیەکان ] •

جگە لەمانە لەیەك کاتا [ هوتی Huti ] کە بەمانا پیشەوەر ئەگرێتەوە(١٩٨) باس کراوە • وە لەبارەی کۆیلەکانە وە زانیاریمان هەیە بەڵام ئەوانە بە بەشێك لەم چینانە دانەئەنران •

بێ گومان ئەم دابەشکردنە دواکەوتوە ،وە هەر بەم شێوەیە لە سەرچاوەی

نری سەردەمی ساسانیەکانەوە دیسان پێمان گەیشتووە ،وە لەوە ئەچێ هێنی سەردەمی سەڵتەنەتی پارتەکان بێ • ئەوەی لە ئاویستای بچوکدا باسکراوە ئەو چۆنیەتیەی کە بە پێی یاسای [مانو] لە هیندا بووە ئەی هێنێتەوە یادمان: یاسای ناوبراو چوار [وارنا] یان پیشەی تایبەتی ئەناسی :

١- برهمنەکان [کاهنەکان] ٢- کشتریەکان [جەنگیەکان] ٣- وایشیەکان [پیشەگەرانو سەوداکەران] ٤- شودر[199] • لەگەل ئەو ناکۆکیانەدا کە لە بەشە وردەکانو تایبەتیەکاندا هەبووە ناکوکی بیروباوەر کە یاسا رەسمیەکانی هەردو کیشوەری ئێرانو هیند لە پارەی ئەهمیەتی پیشەگەریەوە بویان ، ئەم دابەشکردنی پیشەگەریەی کۆمەڵگایە لە هەردو کیشوەرەکەدا خاوەنی مەرجی کۆمەلایەتی لە یەکچووبون • مێژووی وردی یاساکانی [مانو] نادیارە ، بەلام رێکخستنی یەکجاری ئەو لە دوای پەیدا بوونی دروست کراوە ، بەم جۆرە گومان نابەین کە مافی ئەوەمان هەبێت دابەشکردنی پیشەگەری ناوبراو لە ئاویستای بچوك بۆ سەردەمەکانی پێشتر کە جێگای سەرنجی ئێمەیە رازی ببین • لەو زانیاریانەی کە لە نوسینەکانی سەردەمی کۆندا هەیە ئەلێ : کە موغەکان رێزێکی تایبەتیان لەناو خەڵکدا دروست کردبو ، وە لەبەر ئەوە خەڵکەکانی ترو ئەندامانی کۆمەڵەکان لە جۆرە خەلکی دیاریکراوو دەولەمەندو بێ دەستەلاتو تالانوارەو بەرهەم هێنەرە بچوکەکان پێك هاتبون • بەلام گومان لەوەدا نیە کە ئەنجامی ئەم دابەشکردنە بە شێوەی ریزی تایبەتی پێك هاتبێ • لەگەل ئەمەشدا ناونانی گەورەکان [ عارەبانە سوارەکان ] خۆی نیشانەی پێشکەوتنی ئەم زاراوەیە [ئەگەرچی لەوە ئەچێ نە سەرەتای ئەم وشەیەدا باسی دابەشکردنی ریزەکان نەکراوە] چونکە عارەبانە بە شێوەیەکی بلاو لەو رۆژگاردا کە سەرچاوە نوسراوەکان زانیاری تیا ئەدەن بەدەستەوە لە بارەی هونەری شەرەوە نەبو • لە سەدەکانی نۆیەمو هەشتەمی پێش زاینی بەشێك لە مادەکان بە سواری شەریان ئەکرد[200]

بەڵام هیچ شتێکمان لـە بارەی عارەبانەی جەنگی‌یەوە نەبیستووە • هرودوت [۱/۱۰۷] لە بارەی ریکخستنی لەشکری مادەوە لـە سـەردەمی کیاکساردا قسەی کردوە تەنیا باسی سوارەکانی ماد ئەکات بـەڵام لـە بارەی عارەبانـەی شەڕەوە بێ دەنگە •



**پادشایەکی مادەکان نمونەی قەڵاکەی پێشکەش بە پادشای بابلیەکان ئەکات، لە سەردەمی شاروکین‌دا نەخش کراوە [کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی]**

نوسراوەکانی داریوشی یەکـەم لـە بێسـتون [ II ۲۰، ۳۳، III ٤٦ ] ئەوەی هرودوت لـە بارەی لەشکرچیـەکانی خشیار شـاوە وەری گرتوە تەنیا باسی پیادەو سـوارەکان ئەکات(۲۰۱) • بەڵام هیندیەکان‌و هۆزەکانی تری دەوروبەری سودیان لە عارەبانە وەر ئەگرت •

لە کۆتایی سەردەمی هەخامەنشیەکانا جارێکی تر عارەبانەی تێغ‌دار هاتە کایەوە کـە بۆ لەناوبردنی پیادەکان بەکاریان ئەهێنا(۲۰۲) • لـە سـەردەمی پارتەکانا دیسان لـــە سـوپادا لـەشـکری سـوارە هـەبو نـەك لەشـکری

عارەبانەی تایبەتی •

لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا هێشتا لەشکری ماد لە خەڵك دور نەکەوتبوەوە ، زاراوەی کار kara کە لە نوسراوەکەی بێستوندا بەکار هێنراوە ئەویش بەمانا لەشکر ئەگرێتەوە وە هەم بە مانای خەڵکیش هاتوە(۲۰۳) • وەکو دەرکەوتوە لەشکرەکەیان لە ئارەزو خوازانی هۆزەکان بووە ، بە قسەی هرودوت [۱/۱۰۳] لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دابەشکردنی لەشکری ماد لە روی هۆزایەتیەوە بووە نەك لە روی جۆری چەکەوە • لەوە ئەچێ لە کۆمەڵگای بەندایەتیدا لەشکری داخوازی لە ئەندامە ئازادەکان پێك هاتبێ ، خۆی ئالەتی دەسەڵاتدارێتی بەندەدارەکان بووە بەسەر بەندەکانا • بەڵام لە کۆمەڵگای کوێلەداریدا کە بەتەواوی کامڵ بوبێت لەشکری پیشەیی پێك ئەهات وە چینی خاوەن کوێلەکانو دەوڵەتەکەیان لەوانە بون • لە سەرزەمینی ماد چۆنێتییەکی ئاوا لە سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا هێشتا نەهاتبوە دی • وە بە شێوەی یەکەم تەنانەت لە سەدەی هەشتەمیشدا هەر نەبو •• هەر ئەندامێکی ئازاد کە توانای هەڵگرتنی چەکی بوایە ئەوەیان بە لەشکر چی دائەنا رێکەوت نیە کە ئاشوریەکان هەمیشە ناوی مادەکانیان بە [بەهێز] ناو ئەبرد • ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە مادەکان لەگەل ئەوەدا کە دو بەرەکایەتیو دابەشکرابون بە چەند کێشوەرێکی بچوکەوە [کە لەوە ئەچو بە هیچ جۆرێك ئەم شێوەیە بە هێز نەبێت] یەکگرتوو بون • بە قسەیەکی تر جگە لەوە کە نامەی دەسەڵاتدارە بچوکەکان کە پێیان ئەوتن [مادای ـ madai ] ئەوانیش مادەکانیان بە خاوەن هێزو توانا دائەنا، ئەمانە هەمو ئەوە ئەگەیەنن کە یەکێتی هۆزەکانی ماد بە شێوەی گشتی هەر مابوەوە •

لە قەڵەمڕەوی یەکێتی هۆزەکانی مادا ئەندامانی کۆمەڵ بە شێوەی گشتی خەریکی ئاژەڵداری بون وە شارەزای کشتوکاڵو ئاودێری تازە بون ،

ئەو کاتەدا بەخێو کردنی ئەسپ زۆر بایـەخی بووە [ئاشوریەکان تا ڕادەیەك جگە لە ئەسپ هیچ شتێکی تریان بـە ناوی باج‌و خەراجەوە لە مادەکان وەر نەئەگرت] •• ئاژەڵی گەورەی شاخدارو مەڕیشیان بەخێو ئەکرد ، وشتری دو کۆپانیشیان [باکتریایی] ئەزانی بەخێو کەن(٢٠٤) •

لە دوای بـەراورد کردنی هـەمو ئـەو زانیاریە ڕاستەو خۆو ناڕاستەو خۆیانەی کە لە بارەی کۆمەڵگای مادو هۆزەکانی دەورو بەریانەوە هەیە لـە سەدەکانی هەشتەم‌و حەوتەمی پێش زاینیدا •• بە پێی ئەو زانیاریانە ئەتوانین ئەم باسانەی خوارەوە فەراهەم بێنین :

ئەتوانین بڵێین کە قەوارەی کۆمەڵایەتی سـەرزەمینی یـەکێتی ماد لـە سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا لە قۆناغی گواستنەوەی کۆمەڵگای سەرەتاییەوە بووە بۆ قۆناغی بەندایەتی ، دابەشکردنی کۆمـەڵگا لـە ڕوی سـەرەتاکانی زەوی‌یەوە دەستی پێ کردبو ، وە کیشوەری بچوك بچوك کـە هەر یەکەیان سەرۆکێکی هەبو دروست بوبون ، بەڵام لە هەمان کاتا دابەشکردنی هۆزایەتی هەر مابو ، لـەشـکر کۆ کردنەوە لەناو هۆزەکانا پێك ئـەهـات ، زوربـەی سەرکردەکانی لەشکر سەرۆکی هۆزەکان بون ، هـەروەها هێشتا دەبدەبەی کۆمەڵگای سەرەتایی مابو ، هەروەکو کۆمەڵەی خەڵك‌و ئەنجومەنەکانی پیاو گەوران‌و خانەدانەکان [وە بە قسەی ئاویستای بچوك عارەبانە سوارەکان] وە ئەو خەڵکانەی سەر بەوان بون •

لەم کاتەدا بچوکترین بەشی کۆمەڵ خانەوادەی نێروەجاخەکان بو بەم جۆرە ئەوە ئەچێ کـە دابەشکردنی خاك‌و هۆزو عـەشیرەت‌و دەزگاکانی کۆمـەڵی سەرەتایی‌و دامەزراندنی کۆمەڵگای چینایەتی لەو ڕۆژگاردا بـە شێوەیەکی سەرسام هێنەرانە هاتە دی • وە هەمیشە تێکەڵ‌و لەگەل یەکتری‌دا لە شەڕدا بون • هرودوت [٩٨ ـ ١/٩٦] لـە سـەردەمی خۆیا تایبەتیەکانی کۆمەڵگای مادی لەسەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا بە باشی باس کردوە •

لادێکان‌و شوێنی نیشتەجێ بون تارادەیـەك نـەریتی عەشیرەتگەری‌یان بووە • بەڵام قەڵاکان شوێنی دانیشتوانی هەر جێگەیەك‌و ، لـەوە ئـەچێ لـە زوربەی کاتا بارەگای فەرمانفەرماکان بون • وە بونی ئـەم قەڵایانە نیشانەی پەیدابونی ناکۆکی‌و شەڕو بگرەو بەردەی نێوان پادشایان‌و دەوڵەتـە وردەکان بووە • چەند جار ئەوەمان باسکردوە کـە ئـەو قەڵایانە بۆ شەڕی ناوخۆیی بووە نەك بۆ پێشگری لە ئاشوریەکان •

لە رابوردوا ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە بووە ، لە شەڕەکانا دیلیان ئەگرت ، دیلەکانیان بە تالانی خۆیان دائەنا ، دەوڵەمەندەکان سودیان لە هەژارەکان وەر ئەگرت ، ئەم رواڵەتە کات لە دوای کات بێ بەندو بار تر ئەبوو(٢٠٦) لەگەل ئەوەدا خەڵکە ئازادەکان مافیان پێ شێل نەکرابوو • هەر سەرۆك بنەماڵەیەك لەشکری‌و ئەندامی ئەنجومەنی کۆمەڵێك بوو •

هەمو ئەم بەڵگەو مەرجانە بوونە هۆی ئەوە کە مادەکانی ئەندامی یەکێتی هۆزەکان لـە سـەدەکانی هـەشتەم و حـەوتەمی پێش زاینیدا شـەڕ کـەرو سوارچاك‌و پیادەو دلێرو خۆبەخت کـەربن • هێشتا رێکخراوەی ئـەوان تا رادەیەك لە ئازادی بەهرەی وەرئەگرت وە ئەندامە کانیان ریکەوتبون بـەڵام هـەر لـە هـەمان کاتا لـەبارەی دروسـت کردنی دەوڵەتەوە بـەرەو پێش رۆیشتبوون ، وە چینی حوکمڕەوای مـاد بـە مـاوەی رۆژگـار توانیـان ئەمپەراتوریەکی بەهێز ــ لە روی سیاسی‌و سەربازیەوە ــ دابمەزرێنن ، لـە دوای چـەندێك ئاشوریـەکان زانیان کـەماد بوە بـەخاوەنی هێزێکی سیاسی گرنگ ، بەڵام ئەگەرچی لە سەدەی هـەشتەم مادەکانیان بـە بەهێزو خاوەن توانا دائەنا بـەڵام ئەوان لـەو کاتەدا هێشتا هێزێکی سیاسی پتەویان نەبوبو ، لەناوچونی مەترسی درێژخایەن لەناویانا پەیوەندیە خێڵەکیەکانی شل کردەوەو کۆمەڵگا بە چەند بەشێکی بچوك کە پادشا وردەکان سەرۆکایەتیان ئـەکردن‌و هەمیشە خەریکی شەڕ کردن بون لەناو یـەکا ئەمانە هەمویان لە ناو چون •

سەڵتەنەتی ماد ـ واتا دەوڵەتی دیوك ـ تەنیا یەكێك لەو كیشوەرە زۆرانەبو ، مادەكان لەبەر بەرەكانێ كردنی دوژمنێكی وەكو ئاشوردا هێشتا خاوەنی تاقی كردنەوەیەكی تەواو نەبون • ئەم هۆیانە سەركەوتنی تازەی ئاشوری لە سەرەتای كاردا تێك دا •

## ٦ ـ سەردەمی دووەم دەسدرێژی ئاشور تیگلا تپالاساری سێیەم

ئاشور لە ساڵی ٧٤٤ی پێش زاینی پەلاماری [ئامار]ی دا ، پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێ كە تیگلاتپالاساری سێیەمو جێنشینەكانی هەروەكو پادشایانی پێشوی ئاشور لەگەل ناوچە داگیر كراوەكانا ئەجولانەوە ، لەوە پێش بەشی زۆری دانیشتوانی ناوچە داگیر كراوەكانیان سەر ئەبڕیو ژمارەیەك پیاوی لێ هاتوویان روت ئەكردەوەو زنجیریان لە گەردن ئەكردنو بە تالانی ئەیان بردن • بەلام لە سەردەمی سەڵتەنەتی تیگلاتپالاساری سێیەمدا بیریان لەوە كردەوە كە ئەم شێوە كردارانە زۆر ناشیرینو نابەجێ یە •• وە لە ئەنجامدا سود بە دەسەلاتداریتی ئاشور ناگەیەنێتو بەلكو ئەبێتە هۆی زەرەرو زیانیش • هەروەكو توانیان ناوچە داگیركراوەكانیان ئەخستە سەرئاشور • خەڵكی ئەو ناوچەیەیان ، یان لە شوێنی خۆیانا ئەهێشتنەوە ماڵیاتەكانیان بەسەرا دابەش ئەكردن وەیان ـ لە زور بەی كاتا ـ خەڵكە كەیان لەگەل هەندێك كەلوپەلو شتومەكی ناو ماڵداو لەگەل ماڵو خێزانەكانیانا ئەیان ناردن بۆ ئەو شوێنانەی كە بە هۆی لەشكركەشیو شەڕی ئاشوریەكانەوە ویران بو بو ، وە خەڵكی تری سنورەكانی ئەمپەراتوریەكەی خۆیان كە داگیریان كردبون ئەیان هێنانە شوێنە كانیان ، بەم جۆرە سەلیقە لەناو ئەمپەراتوری ئاشوریەكانا پەیدا بو ، وە درامەتی ولاتەكەیان بەرێكو پێك تر دەس ئەكەوت •

له سالّی ٧٤٤ی پێش زاینی لەشکری ئاشور کە ساڵێك لەوەبەر خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کردبو هەمو خۆیان گورج کردبۆوە(٢٠٧) ، رویان کردە بەشی زوروی روباری دیالەو چونە سەر خاکی [پارسوا] ـ زاموای خواروی پێشوو ـ • لەو سەرزەمینەدا گەلێك خەڵکی لێ بوو ئێرانی نەبون ، وە لە کۆتایی سەدەی نۆیەمی پێش زاینیش هەروەها بو • ئەوانە چەند دەولەتێکی بچوکیان هەبو ، وە سالنامەکانیان بەناوی دامەزرێنەرانی زنجیرەی پادشایانیانەوە ناو ئەنا • [بیت کاپسی ، بیت سانگی یان بیت ساگی ، وە بیت تزکی](٢٠٨) • ئەم شەڕو بگرەو بەردەیە گەلێك دیمەنی جیا جیای گۆڕیو گەلێکیشی دروستکرد هەروەکو لەمەوبەر قسەمان لێوە کردون • خەڵکی ئەو ناوچانە بە کێوەکانا خۆیان شاردبۆوەو بە رێکەوت پەنایان ئەبردە ناو قەڵاکانەوەو بەربەرەکانی گەمارۆدانیان ئەکردو لەروی دوژمنا رائەوەستان ،ئاشوریەکانیش لادێو شوێنە نیشتەجێ کانیان کە داگیر ئەکرد ئەیان سوتاندنو هەرچیو هەر کەسێکیان دەست بکەوتایە بە تالانیو دیلی ئەیان بردن(٢٠٩) • ئاشوریەکان هەندێك لە فەرمانفەرماکانیان دەستگیر کرد ، [هەروەکو ـ کاکی ـ پادشای بیت زاتیو ـ میتاکی ـ پادشای بیت سانگی] • پادشاکانی تر توانیان لەگەل دەستو پێوەندەکانیانا خۆیان لە کێوەکانا بشارنەوە • ئەو بەدیل گیراوانە چونکە لەو کۆمەڵە خەڵکانە بون کە بە سەختی دوژمنایەتی ئاشوریەکانیان ئەکرد ، لەبەر ئەوە ئاشوریەکان ئەو دیلانەیان زۆر بە ناسورو ئەشکەنجە ئەکوشت ، وە ئەیانکردن بە نیشانەی تیرەو تیرە بازی • بەشێك لەو سەر زەمینە داگیر کراوانە بوو بە خاکی ئاشور وە ناویان نا حاکم نشینی [پارسوا](٢١٠) وە بنکەیان لە قەڵای [نیکور] بو •

ئەوەی کە باسمان کرد وا دەرئەکەوێ کە لەشکر کەشی [ تیگلا تپالاساری سێیەم] لەگەل لەشکرکەشیەکانی پادشایانی تری ئاشوردا لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی زیادوکەمی نەبوە • بەلام لەگەل ئەمەشدا لایەنە

تایبەتیەکانی ئەم لەشکرکەشیانەیان ریّك و پیّك ئەکرد • [ تیگلاتپالاسار ] لـە [بیت زانی] ـ کە بەشیّك بو لـە حاکم نشینی تازە ـ ژمارەیەك لـە دیلەکانی ئازاد کرد ، بەلاّم لە پیّشا پەنجەکانیانی برین تاکو جاریّکی تر نەتوانن شەڕیان لەگەلا بکـەن ، وە لـە ولاّتی تازە بونیادی ئاشـور وەکو کـریّکارو کاسـب بمیّننەوە • [تیگلاتپالاسار] زۆر هەوڵی دا تاکو لەو خاکانەدا کە بـە دەست ئاشوریەکانەوە نەبو بەروبومو دەرامەتیان لیّ بسیّنیّو خەرجو باجی سالاّنەیان بخاتە پیّ •

بۆ نمونە لە [بیت کاسپی] ئەمەی کردو [بانتانو] پادشای ئـەو ناوچەیە بانگ کردو خەرجو باجو کۆ کردنـەوەی ماڵیاتو دەرامـەتی خستە پیّ • [تیگلاتپالاسار] ئیتر وازی لیّ هیّناو نەچوە ناو قەلاّکـەیەوە کـە ناوی [ کار ذاریخوندیر ] بو •

بەداخەوە ساڵنامەکانی [تیگلاتپالاساری سیّیەم] کـە لەسـەر بـەرد یان پارچە شتی تر نوسراونەتەوە ، نوسینەکانی شکاوەو زۆری لیّ کوژاوەتەوەو بە نیوە چڵی دەستمان کەوتوە • ئەیانویست جاریّکی تر لـە کۆشکی سوڵتان [ئاسار خادنا] لە سەدەی حەوتەمی پیّش زاینیدا سودی لیّ وەربگرن • نوسینە شکاوەکان شویّنەواریان ناخویّندریّتەوەو ئەوەی بە دوای ئەو رستە کوژاوەیەدا دیّت زوربەیان مانا نادەن بە دەستەوە • ئەگەر بـە لیّکدانەوەکانی [شرادر]و [روست] باوەر بکـەین[٢١١] وەکو ئەڵیّن [تیگلاتپالاساری سیّیەم] بـە داگیر کردنی خاکی [پارسوا] دەس بەردار نەبوەو چۆتە ناو خاکی مادەوە • رستە براو براوەکان لە بارەی ئاوایی [ئارنزیاش]ەوە ئەوە باس ئەکەن کە خەڵکی ئەم شویّنە[٢١٢] لە دژی [بی‌سی خادیر] فەرانفەرمای [کیشەسو][٢١٣] رایان کردبو •دوایی باسی راکردنی [راماتئا] فەرمانفەرمای [ئارازیاش] ئەکات[٢١٤] وە هەروەها وتراویشە کـە لە ئاواییەکانی ئـەوا جگـە لـە ئـەسپو ئاژەڵی شاخدارو زەخیرەو بەردی لاجیوەردی بەکتریاشیان دەست کەوتوە،بەشیّوەیەك



گەمارۆ دانێك لەلایەن لەشكری ئاشورەوە ، لەروی بەردێك لە نەینەوا نەخش كراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ]

که له نوسراوه‌که‌دا به رونی ده‌ر ئه‌که‌وێ دوا نوخته‌ی له‌شکر کـه‌شی لـه قه‌ڵای مادی [زاکروتی] بووه • ئه‌وه ده‌رئه‌که‌وێ [ئارازیاش] به‌شێك نه‌بووه له یه‌کێتی هۆزه‌کانی ماد هه‌روه‌کو له سه‌رده‌می [ ئێدانراری ]دا دیسان سه‌ر به‌و یه‌کیه‌تیه نه‌بوه ، دوایی ئاشوریه‌کان رێگای چونه پێشه‌وه‌یان گرته به‌ر ، وه دوایی باسی ده‌غاله‌تی [تونی] فه‌رمانفه‌رمای [سومورزوو] ، [کـه که‌وتبوه ده‌راوێکی لقه‌کانی خواروی رۆژ هه‌ڵاتی دیاله‌وه ؟] وه کوشتنی له‌شکره‌که‌ی‌و داگیر کردنی [سومونزو]و [بیت ـ همبان] ـ که ئه‌وانیش هـه‌ر لـه ده‌راوی دیاله‌دا بون ـ خستنه سه‌ر وڵاتی ئاشور نوسراوه(٢١٥) •

ئه‌م له‌شکر که‌شیه له هه‌مو ئه‌و گیروگرفتانه‌ی له کیشوه‌ری ماد له ماوه‌ی نیو سه‌ده‌دا تووشی بوبو ویرانکاری تر بو ، وه [تیگلاتپالاسار] له دوای ئه‌وه داوای کرد که [خاوه‌ن ئاواییه‌کان]ی کویستان زه‌مینـه‌کان ، واتا سـه‌رۆك تۆمه‌ڵه‌کانی سه‌رانسـه‌ر کیشوه‌ری [ماده به‌هێزه‌کان] تاکو کێوی [ بیکنی ] ـ ده‌ماوه‌ند ـ وه‌کو لای خواره‌وه خه‌رج‌و باجی ساڵانه‌ی بده‌نێ : ٣٠٠ تالآنت [ ٩ته‌ن ] بـه‌ردی لاجیوه‌ردو ٥٠٠ تـالآنت [ ١٥ ته‌ن ](٢١٦) دروستکراوه مه‌فرغیه‌کان • ئه‌م ژمارانه زۆرتری به‌ڵگه‌ی توڕه‌یی‌و هه‌ڵچونی یه‌تی •له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا [تیکلاتپالاسار] یه‌کێك بووه له پادشا لێزان‌و کارامه‌کانی ئاشور ،له ساڵنامه‌کانا ناوی ئه‌و فه‌رمانفه‌رمایانه‌ی(٢١٧) که ئه‌م خه‌رج‌و باجانه‌یان که‌وتۆته ئه‌ستۆ •• پێ نوسراوه(٢١٨) •

**ئامانجی** [تیگلاتپالاساری سێیه‌م] له باره‌ی له‌شکر که‌شیه‌وه بۆ سـه‌ر خاکی ماد چی بوه ؟ [روست] که ساڵنامه‌کانی ئه‌وی نوسیوه‌ته‌وه له‌و باوه‌ڕه‌دا بوه که مه‌به‌ستی ئه‌و پاراستنی سنورو راوه‌ستان له روی کوێستانیه‌کاندا بووه، له‌وه ئـه‌چێ کوێستان نشینه‌کان ده‌ستی به‌هێزیان لـه زه‌وی‌و زاری سنوری ئاشور وه‌شاندبێت ، به‌ڵام ئه‌م ده‌ست وه‌شاندنانه له باره‌ی فراوانی‌و بێ به‌زه‌یی‌و خوێن خواردنه‌وه‌وه لـه‌گـه‌ل ئـه‌وه‌شـدا کـه ئاشوریه‌کان [ بلاو که‌ره‌وه‌ی

شارستانی‌و فەرهەنگ ] یان ئەویست بە هیچ جۆرێك بەرابەری ناکرێن •

پەلامار دانی [تیگلاتپالاسار] بۆ سەر سنوری ماد جیاجیا بو ، بەر لە هەموشت مەبەستی ئەوە بوە(٢١٩) کە لە شکرەکەی هەمیشە لە مەیدانی شەڕدا بێت‌و گورج‌و گۆڵ بێت وە بە دزی‌و تالآن کردن خۆیان دەولەمەند بکەن • بەم هۆیەوە فراوان بونی سنوری ئاشور بەهۆی لەشکر کەشیەوە دەستی پێ کرد • وە مەبەستێکی تری [تیگلاتپالاسار] ئەوە بوو کە جێگای چۆڵ بوی دانیشتوانی ناوچە وێران بووەکان بە خەڵکی سەرزەمینە داگیر کراوەکان پڕ بکاتەوە •• وە خەڵکی زەوی‌وزاری باسکراو لەگەل دانیشتوانی سەرزەمینە تازە داگیرکراوەکانی ترا پێکەوە نیشتەجێ بکات ••• هتد • لەبەر ئەمە هەمیشە چەند کۆمەڵێك خەڵك ئامادەی هاتن‌و رویشتن‌و کۆچ کردن بون •

بەڵام گرنگترین هۆی لەشکر کەشی ئەمە بووە کەدەست بەسەر سامانی مادەکانا بگرن‌و داگیری بکەن‌و خۆیان دەولەمەند تر بکەن ، وە بە تایبەتی ئەسپی زۆریان دەست بکەوێ •• لەبەر ئەوە هەمیشە لەشکری ئاشوریەکان ئامادەو پڕ چەك بون‌و بەڵام زۆر پێویستیان بەعارەبانەی جەنگی‌و بە تایبەتی سوارەو ئەسپی عارەبانە بوو • وە لەو کاتەشدا پەروەردە کردنی ئەسپ تەنیا لە ناوچە کوێستانیەکانا ـ واتا مادو ئورارتوو ئاسیای بچوك ـ بە زۆری بەخێو ئەکراو پێش ئەکەوت •

لە ئەنجامدا لەشکر کەشی کرایە سەر هۆزەکانی ماد بەو مەبەستەی لایەنێك مسۆگەر کەن بۆ شەڕ کردن لەگەل [ئورارتو]دا ، لە واقیعدا لەشکر کەشی ساڵی ٧٤٤ی پێش زاینی سەرەتای پەلامار دان بو بۆ سەر [ساردوری دووەم]و شەڕی درێژ خایەنی ئاشور لەگەل هاوپەیمانەکانی ئورارتو دەستی پێ‌کرد ، هەروەکو لەشکر کەشی ساڵی ٧٣٧ی پێش زاینی بۆ سەر مادەکان سەرەتای پەلاماردانی ساڵی ٧٣٥ـ٧٣٦ی پێش زاینی بۆ سەر کوێستان نشینەکانی

ئورارتو ئەژمێردرا •

ئەنجامی یەکەمین لەشکر کەشی [تیگلاتپالاسار] بۆ سەر خاکی ماد بوونی هەمان دوو ئەیالەتی تازە بو لـە قەڵەمڕەوی ئاشوریەکانا ، واتا [ پارسوا ]و [بیت ـ همبان] کە ئەم دو ئەیالەتە تاکو دوا کاتی لەناوچونی ئاشور بەشێك بون لە وڵاتی ئاشور(٢٢٠) •



عارەبانەیەکی جەنگی ئاشوریەکان ، لەروی بەردێکی ئاشوریەکان لە نەینەوا کێشراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ]

لەمەوبەر وتمان کەوا باو بوە گوایا [پارسوا] یەکـەمین [پارس] بون وە دواجار لە دوای ئـەوە ناوچەکەیان کەوتە ژێر دەستی ئاشوریەکانەوە(٢٢١) لەوێوە بۆ پارس [پرسید] کۆچیان کردوە ، ئەمـە لـە راست ناچێت •• لـە لایەکی ترەوە ئەتوانین بەر پەرچە ئەم بیروورایە بدەینەوە : یەکەم لێکدانەوەی ئەو ناوانەی کە سەرچاوەکان بەهێنی [پارسوا]ی دائەنێن ـ ئەمانە ئەوە نیشان

ئەدەن کە خەڵکی ئەو سەرزەمینە هــەرگیز ئارییایی نەبون ، وە لــە ئەنجامدا ناتوانن خۆیان بە [پارس]ی دابنێین • دووەم ناوی کورشی یەکەم پادشای پارس [پرسید] لــە سەرچاوەی ئاشوریدا لــە ســەرەتای دەیەی سێیەمی ســەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا دەر ئەکەوێ ••وە هەروەها [پارسوا] لەو مێژووەدا بەشێك بووە لە ئاشور وە دەسەڵاتی ئاشور هێشتا لەوە بــەهێز تر بووە کــە ماوەی رۆیشتنی دانیشتوانی ناوچە ژێر دەستەکانی بدات(٢٢٢) •

جگە لە وڵاتی پارسوا (٢٢٣)و [بیت ـ همبان]لە ئەنجامێکی تری لەشکر کەشی ساڵی ٧٤٤ی پێش زاینی بریتی بووە لە بەدەست هێنانی ئاژەڵو ئەسپو بردنی کۆمەڵێك لە پیشە کارەکانی [پارسوا] بۆ ئاشور ، دوایی هەندێك لــەو دانیشتوانەی کە لە وڵاتە تازەکانی ئاشوردا نیشتەجێ بوبون ئــەوانیشیان لــە ناوچەکانا دور خستەوە • ساڵنامەکانی تیگلاتپالاسار لە روداوی ساڵی ٧٣٨ی پێش زاینی نوسیویە کــە ژمارەیەك لــە گوتییە دیل کراوەکانو دانیشتوانی [ بیتسان گیبوتی] [ بیت سانگی ] لە زۆروی وڵاتــی ســوریەو فنیقیــەی زۆرو نیشتەجێ بون •

کوچکردوەکانیان بە ناوی هۆزەکانیانەوە یان ناوچەی زایندە یانەوە ناو ئەنان ، وەکو : ئیللیلی ، ناکابی ، بودی ئی ، دونی ئی ، بیلی ، بانــی تی ، سانگیلی ، دا نیشتوانی ئاوایی بابل(؟) [ نرگال ، ئیلو ، ئینا ، مانی ] رەنگە بێ لەمانە بودییەکان لە هۆزی مادی بودیو وەیان دانیشتوانی دێ [بودو] بووبن کە لە سنوری بابلو عیلامدا بوو ، وە تیگلاتپالاسار لە ساڵی ٧٤٥ی پێش زاینی داگیری کردوە • ئەگەر ئەم قسەیە راست بێت ئەمە خۆی لــەبارەی شوێنی نیشتەجێی هۆزی بودییــەکانــەوە کــە یــەکێکە لــەو شــەش هۆزە باسکراوەی کە هرودوت باس کردوون لەو بەری رۆژئاوای مادەوە ، ئەمە تاکو رادەیەك لایەنێکی باسەکە رون ئەکاتەوە • لەگەل ئەمەشدا زۆر لــەوە ئەچێ کە لەو کاتەدا ناوی هۆزەکان بە ناوی ئاواییەکانەوە بوبێت • زانیاری ئێمە لە باردی ناوەکانی ترەوە هەر ئەمەندەیە •

خەڵکی وڵاتی پارسوا بە پێی دۆخی رۆژگار بەرە بــەرە هەمویان بون بە ئاشوری ، تەنانەت دوای ئــەوە چــەند ماوەیــەك بــە وتــەی بطلیموس [ ٦/٢/ Vi ] ئــەو سەرزەمینە پێ یان ئەوت [سوری مادی] • [یونانیەکان زوربەیان ئاشوریەکانیان بە ـ سوری ـ ناو ئەبرد] •

لە سالی ٧٣٧ی پێش زاینیدا [ تیگلاتپالاساری سێیەم ] ســەر لــەنوێ لەشکری کردەوە سەر مادەکان وە تەنانەت ئەو ناوچانەشی سەر لەنوێ داگیر کردەوە کە لە سالی ٧٤٤ی پێش زاینیدا هێنا بونیە ژێر دەستی خۆیەوە ، وەکو ولایەتی [بیت کاپسی] •

لەشکری ئاشوریەکان لە [بیت سانگی]و [بیت تازاکی]کە لە سالی ٧٤٤ی پێش زاینیدا داگیرکرابون تێ پــەڕین •• وە کــەلێك ئاوایــان(٢٢٤) وەکو [ئیشتار] کە پەرستگای خواوەندی ئیشتاری ئاشوری بنکەیان بوو .وە پیاوێك کە ناوی [با] (؟) بو حوکمی تیا ئــەکرد ئەویشیان داگیر کرد ، ئاشوریەکان لەم شوێنەدا پەرستگای پیرۆزی [نیوزتا]ی خوای ئاشورو بابلیان دروست کرد • سەرکردەکانی ناوچە دورەکانی رۆژ هەلاتی ولات خۆیان لە چیاکانا شاردبۆوە ، وەکو [ ئوپاش ] فەرمانفــەرمای [ بیت کاپسی ] وە ئوشوروی [نادیروتا] ـ ئی (؟)و [بوردادا]ی [نیروتاکتائی] •بەلام ئاشوریەکان پێشەوای باسکراوی دوایان بە دیل گرت • بــەم جۆرە لەشکری ئاشور تاکو قــەلای [سیبور] سیبارت رۆیشتن وە ئەوێشیان داگیر کرد • هــەروەکو لەمەوبەر وتمان [شامشی ئادادی پێنجەم] لە سالی ٨٢٠ی پێش زاینی ئەو قــەلایەی لــە نزیك زنجانی ئیستاوە دروست کردبو ، وە بۆ بەرهەلستی پەلاماری لەشکری تیگلاتپالاساری دانابو • ئەو لەو ناوچەیە بووە کە لە سەردەمی [شامشی ئادادی پێنجەمدا] بەشێك بوە لە رۆژهەلاتی ولاتــە کوێستانیەکانی [گیزیل بوندا] • ئەگەرچی لە سالنامەکانی تیگلاتپالاساری سێیەمدا ئەو ناوچەیە بە ماد [ مادای madai ] زانراوە ، لەوە ئەچێ ئاشوریەکان لە خوارەوە بەشی دەراوی قزل



بەزۆر کۆچاندنی مادەکان ، لەروی بەردێکی ئاشوریەکان لە نەینەوا کێشراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ]

ئوزونیان گەمارۆ دابێو وە لە بەشی ژورویەوە تێپەڕیبن بۆ سیبور •

باسی ئەم لەشکر کەشیە بچڕ بچڕ دەست کەوتوە ، بەڵام ئەم باسەیان ئاشکرایە کە ئاشوریەکان لە ناوچەی [ بوشتو ] تیپەڕین(٢٢٥) ، نابیت ئەم [بوشتو]ە بەو قەڵایە تێ بگەین کە لە بەیەك گەیشتنی [ماننا]و [پارسوا]و [ گیزیل بوندا ]دا هەیە • ئینجا گەیشتنە ناو جەرگەی خاکی یەکیتی مادەوە(٢٢٦) • لەوە ئەچێ ناوی ناوچەی [نیشتا]یان [نیشای] [بیابانی «نیسە» بێ کە لە نوسراوە کۆنەکانا باس ئەکرێ لە دەوروبەری قەزوینی ئیستاوە ؟]، وە بەشێك لە ساڵنامەکان کە ناوی ناوچەکانی ئاریام [ ئاریا ـ ئورواى ] ئیرانی ؟ ئەبات(٢٢٧) وە کیشوەری خروسان [مات تارلوگالە] و[ساکسوکنو] کە تیایا باسکراوە رەنگ بێ لەم ناوچەیەدا بو بیت • نوسینەکانی تری تیگلاتپالاسار باشتر باسی ئەو ناوچانە ئەکات کە مەبەستی لەشکر کەشیەکەی بیا دەر ئەکەوێ بەڵام بە داخەوە شوێنی ئەو ناوچانە لەو نوسراوانەی کە لە دواییدا باسکراون کە بە شێوەیەکی گشتی باسی ئەکەن ناتوانین دەست نیشانی بکەین • لەو نوسینانەدا وا دەر ئەکەوێ کە ئاشوریەکان زوربەی هەمو خاکی مادیان گرتە دەستو بەرەو شوێنێکی نادیار کە ناوی [ کیشوەری زێڕ ] بو [ لەوە ئەچێ شیکراکی بوبیت ] رویشتنو گەیشتنە کیوی [ روا ] [ کە لە رۆژهەڵاتی شاری تارانی ئیستاوەیە ؟] وە بیابانی خوێو [دەشتی کویر]ە •

لە وێدا لە رێگەی ناوچەی [ ئوشکاکان ]ەوە کە لەوە ئەچێ دەراوی [فەرەسو] بێت گەڕانەوە ، لە دواییدا چونە ناوچەی [بیت ساگ بیت](٢٢٨)وە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە زوربەیان لە قەڵای بابلیەکان [ سیلحازی ] خۆیان شاردەوە • ئەو سەرچاوانەی بە دەستمانەوە وا ئەگەیەنن کە ئەم قەڵایە لە ناوچەی ئەکباتانا [هەمەدانی ئیستا]دا بووە • ئاشوریەکان ئەم قەڵایەو دەورو بەرەکەیان(٢٢٩) کە پێیان ئەووت [تیلاشوری] داگیریان کردن • ئەم شوێنە مەرکەزی پەرستنی مەردوك خوای بابلیەکان بوو • [تیگلا تپالاسار] قوربانی

بۆ سەر ئەبرِی • هەروەها فەرمانیشی دا کە پارچە نوسراوێك لە بارەی خۆیەوە لەو شوێنەدا دابنێن ، ئاشوریەکان لێرەوە لە رێگای ناوچەی [بیت زو ئالزاش] و [ بیت ماتی ] دەراوی روباری دیالەوە گەرانەوە بۆ خاکی خۆیان[٢٣٠] لە رێگادا پادشای [ئیللی پی] – لە نزیك کرماشانی ئیستاوە – دیاریەکی دۆستانەی بە ئاشوریەکان دا • سەرچاوەیەکی هەڵە ئەڵێ[٢٣١] ئەو ناوچانەی کە ئاشوریەکان لە ساڵی ٧٣٧ی پێش زاینیدا بە ناویا تێپەڕیبون نەیان خستنە سەر وڵاتەکەی خۆیان[٢٣٢] • لەوە ئەچێ سەرۆکی ناوچەی [پارسوا] سەرپەرشتی ئەو ناوچانەی کربێ تاکو ئاشوریەکان لە ئایندەدا بتوانن دەسکاری کاروباری ناوخۆی ماد بکەن •

لە دوای لێکدانەوەو بەراورد کردنی لەشکر کەشیەکانی تیگلا تپالاسار [ئەوەندەی کە بۆ ئێمە ئاشکرایە] ئەتوانین چەند باسێکی گرینگی تیا هەڵبژێرین • یەکەم : ئاشوریەکان ئەگەرچی لەوە ئەچێ لە سنوری کوێستانی خواروی ناوچەی ماناوە رۆیشتبن [ئەگەر – گی – زین کیسی – هەمان – گیزیل بوندا بیت[٢٣٣] وە ئەگەر – بوشتو – بو ستوس – لەم شوێنانەدا بوبێت ••• هتد] • بەڵام ئاگاداری ئەوە بون کە لە ناوچەی جەختەتوو ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی مانتا وە تەنانەت لە دەراوی قزل ئوزون سەرەوژێر نەبنەوە • وەکو دەرئەکەوێ ئەم خۆ ئاگادار کردنەی ئەوان ئەوە بووە کە یەکەم مانتا بەهێز بووەو ئاشوریەکان نەیان ویستوە لەو کاتەداو لەو ناوچەیەدا لەگەل دوژمنێکی بە دەستەڵاتدا لێك هەڵبرژێن ، وە تالانی ئورارتو دمشق یان بەس بوە ، لە لایەکی تریشەوە لەوە ئەچێ کە لەو سەردەمەدا پەیمانێك لە نێوان ئاشوریەکانو ماناندا بوبێت لە بارەی هاو بەشی کردنی سودی وەختی یەوە لە کاتی شەڕ کردندا لەگەل ئورارتو[٢٣٤] •

ئەتوانین دیسان ئەوە بڵێین کە نوسراوە ئاشوریەکان لە بەشەکانی رۆژئاوای کیشوەری ماددا زوربەی وڵاتەکان بەناوی زنجیرەکانەوە ناو ئەبات

لەگەل زیاد کردنی «بیت» ـ «خانە»] • نەك بەناوی راستی [بەم جۆرە دەست نیشان کردنی ئەمانە نارەحەتە] • لە بەشەکانی رۆژهەلاتی ماددا ئـەم جۆرە باوی نەبوە ، چونکە لەوە ئەچێ لەوێ حکومـەتی هەلبژێردراوی عەشیرەتیو هۆزەکان حوکمی کردبێتو زنجیرەی فەرمانڕەوایی یان نەبوبێت • نوسراوەی تیگلا تپالاساری سێیەم(٢٣٥) بـە تایبەتی لـە بارەی فەرمانڕەوایانی بەشەکانی رۆژهەلاتی مادەوە بە [بل ئالی Belali ]ناو ئەبات وە ئەمە خۆی جارێکی تر ئەوە ئەسەلمێنێ کە مادی رۆژئاوا لە بارەی کۆمەلایەتیو ئابوریەوە لـە بەشی رۆژهەلاتی ئەو سەرزەمینە پێشکەوتو تر بووە •

پێویستە ئـەوەش بلێین کـە هـەندێك ناوی جوگرافیایی شـوێنـەکانی رۆژ هەلات کـە لە نوسینەکانی تیگلاتپا لاساردا باس کراوە تا رادەیەك ئـەو ناوانە ریشەی ئێرانیان هەیە [وەکو : ئاریارما ، نیشا ، ئوریمزان ، ئورتنا ، ئاراکوتتو ، هەروەها چەند ناوێکی تر](٢٣٦) لەگـەل ئـەوەشدا ئـەم جۆرە ناوانە لە ماوەی سالەکانی ٧٣٧ ـ ٧٤٤ی پێش زاینی هێشتا لە رۆژئاوای هێلی قەزوین ـ هەمەدان تێ نەپەڕیبون • دوو سـێ ناوی تایبەتی فەرمانفەرمایانی ناوچەکان کە نەکەوتبونە رۆژ هەلاتی ئەم هێلەوە ئەتوانین ئەوانیشە هەر بـە ناوی ئێرانی بدەینە قەلەم(٢٣٧) •

لە لایەکی ترەوە گـەلێك ناو کە تەنانەت هێنی ناوچـە رۆژهەلاتیەکانن ئەوانە ئێرانی نین ، وە دەرئەکەوێ کە هەندێك لەوانە ریشەیان عیلامیە(٢٣٨) • بەم جورە نـەك تەنیا لـە خاکی ماناو پارسواو سەرزەمینەکانی دەوروبەریان بەلکو هەر لە ناو کیشوەری مادای marai یەکێتی هۆزەکانی ماد و هەروەها لە ناوەراستی سەدەی هـەشتەم زمانی ئێرانی بـە بێ بەربەرەکانێو شەرێك حوکم فەرما نەبوە • هەرچۆن لـە بەشەکانی ٧ـ١ نەخشەکـەمان بایـەخێکی ئەوتۆی نەبوە •

لەمەوبەر وتمان کە دەولەتە بچکولەکەی [دیوك deyok ] لـــــەو

سەردەمەدا لە بنچینەی پادشایەتی ماد ئەچو ، کەوابو بۆچی لـە نوسراوەکانی تیگلا تپالاسار دا باس نەکراوە ؟ بـە داخەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئـەم پرسیارە بەڵگەو سەرچاوەی تەواومان بە دەستەوە نیە • هەروەکو وترا [ دیوك ] لـە لایەن ماناوە کرابو بە حاکم وە تیگلا تپالاسارو لەشکریـەکانی چاودێر بون کە لەگەل مانا دا بگونجێن • بەم جۆرە لـەوە ئەچێ نـە چوبنە ناو ئـەو ناوچەیەوە کە دیوك حوکمی تیا کردوە • دووەم ناوی تایبەتی ناوچەی دیوك نازانین وە رەنگە بێ بەم هۆیەوە نەتوانین دەست نیشانی بکەین • وە دیسـان نابێ ئەوەمان لەیادنەچێ کە سەردەمی سەڵتەنەتی حکومـەتی دیوك لـە دوای مردنی تیگلاتپالاساری سێیەم [ کـە لـە سـاڵی ۷۲۷ی پێش زاینیدا بووە ] دەستی پێ کردوە •

ئەگەر ئەو سـەرزەمینەی دیوك حوکـم رەوای بو بکـەوتبێتـە ژوروی کێوەکانی [گیزیل بوندا]و بـەشی خواروی ناوچەی ماناوە ، ئـەوا دەوڵەتی مادیش هەر لە هەمان شوێن‌دا پەیدا بووەو دەسەڵاتی پەیدا کردوەو زنجیرەی دیوکەکان هەر لەو سەرزەمینەدا حوکمیان کردوە • بەڵام ئەوە ئەزانین کە دەوڵەتی ماد لەو سەر زەمینە پێك نەهاتوە لە لایەکی ترەوە ئەوە سەلمێندراوە کەلە سەردەمی لەشکرکەشیەکانی تیگلا تپالاساری سێیەمدا مانا لە ناوچەی خوارو ترەوە لـە [گیزیل بوندا] کـەمتر نـەبوە • بـەڵام هیچ بـەڵگەیـەك بەدەستەوە نیە کە بڵێین دیوك لە سەردەمی تیگلاتپالاساردا لـە لایەن ماناوە کراوە بـەحکومـەت • نوسـراوەکانی سارگونی دووەم دیوك بـە حاکمی دانراوی مانا ناو ئەبات • دوای ئەوە واتا لە ماوەی ساڵـەکانی ۷۳۷و ۷۱۹ی پێش زاینی‌دا لەوە ئەچێ دەسـەڵاتی مانا رو بـە خواروی ناوچەکە زیادی کردبێت وە لەو کاتەدا دیوك خۆی لە ژێر دەسەڵاتداریتی مانادا دانابێت • هەروەکو لە رۆژگاری دوای ئـەمەدا ئەکباتانا [ هەمەدانی ئیستا ] بوو بـە پایتەختی پادشایی ماد لـەوە ئـەچێ سـەرزەمینی دیوك کـەوتبێتە نێوان قزل

ئوزونو نێوان ناوچەی ژوروی هەمەدانەوە ، رەنگ بێ دەسەڵاتی دیوك لە دوایيدا [لە دوای تیگلا تپالاسار] گەیشتبێتە ناوچەی هـەمەدان ، وەیان بـە پێچەوانەوە لە ناوچەی هەمەدانەوە گەیشتبێتە ئەوێ • بەڵام بەشی دووەمی بەسەکە رێی تێ ئەچێ ، کە تیگلاتپالاسار لـە ناوچەی دیوك وە یان ئـەو ناوچەیەی کە دوایی بوو بـە بەشێك لـە وڵاتەکـەی دیوك تێیـەڕ بوبێت ، هەرچۆن بێت ئەگەر وا بوبێت ئەوا ئەمەلە ساڵی ۷۳۷ی پێش زاینیدا بووە لە لەشکرکەشیەکەیدا[٢٣٩] • دیسان لـەوە ئـەچێ کـە تیگلاتپالاسار لـەو لەشکرکەشیەدا لە بەشی ناوەوەی دەراوی قزل ئوزون خۆی دابێ لە مەکۆو ئاشوریەکان لە رێگای بەشی ژوروی روباری ناوبراوەوە بەرەو خوار بۆ لای [سیبور] ـ نزیکی زەنجانەوە ـ رەویان کردبێ •

ئەمەیان راستە لـەو دۆخـەدا کـە ئاشوریەکان بـەهۆی پـەلاماردانو لەشکرکەشیەکانیانەوە دروستیان کردبو خاوەنـەکانی دەوڵـەتی مـاد ئـەیان توانی لەژێر دەستەڵاتی پاراستنی ماننادا خۆیان دەرخەن ، بەڵام ئـەو پەڕی رۆژ هەڵاتی ناوچەی ماد گیرۆدەی دەستی ئاشوریەکان بوبون ، هەروەها لەو شوێنانەدا رەوتی کۆمەڵایەتی زۆر دواکەوتو بو ، بەڵام بەشەکانی تری خاکی ماد گەلێك زیانیان بە هۆی پەلامارو شەڕو شۆری ئاشوریەکانەوە لێ کەوتو گەلێك رێچکەی کۆمەڵایەتیان گەڕایەوە دواوە • لەوانە بو یەکێتی سیاسیو راپەڕینێکی جەماوەری لەژێر سایەی ماننادا کـە لە ناوچەکانی تر پێشکەوتو تر بـوو ، وە توانـای خـۆ دەرخستنو خـۆ رێکخستنی زۆر تر تیـا بـو بەرپا ببێت •

لە دوای ساڵی ۷۳۷ی پێش زاینی لـە سـەردەمی ژیانی تیگلا تپالاسار دیسان لەشکرکەشیەکی تری ئاشوریەکان بـە سـەرکردایەتی [ ئاشوردانی نانی ] کە سەر کردەیەکی ئاشوریەکان بو کرایەوە سەر خاکی ماد ، بەڵام نوسراوە ئاشوریەکان لەم بارەیەوە هیچ جۆرە باسێك ناگێڕنەوە ، وە تـەنیا

ئەوە ئەدرکێنن کــە (٥٠٠٠) ئەسپو ژمارەیەکی زۆر خەڵکو چەند کۆمەڵێک ئاژەڵی گەورەی شاخداریان لێ سەندوون[٢٤٠] •

## ٧ ـ بەهێز بونی مـاننـاو شەڕەکانی سـارگونی دووەمی ئاشوری

لە ماوەی دەیەی دووەمی سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا لەشکرکەشی ئاشوریەکان بەرەو رۆژ هەڵات راوەستا ، لە دەوروبەری ساڵی ٧٢٠ی پێش زاینیدا چۆنێتی باری سیاسی وڵات بەم جۆرە بو : ئەوپەڕی ژوروی وڵات [نەوبەری دەریاچەی ورمێ] لەژێر دەستەڵاتی ئورارتودابو ، وە ناوچەکانی تری سەرزەمینی ئازربایجانی ئیستای ئێران راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی [ ئیرانزو ]ی پادشای مانادا بو • بەڵام لە سنورەکانیا چەند پادشا نشینێکی بچوکی شێوە سەربەخۆ فەرمانڕەواییان ئەکرد کە ئەمانە مەترسییان بۆ سەر حکومەتی مانا هەبو[٢٤١] • ئەمانەش بریتی بون لە پادشا نشینەکانی [ئوئیشدیش] ـ لە نزیك ناوچەی مەراغەی ئیستادا ـ وە [زیکرتو] ـ لە ناوچەی میانە ـ ئاردبیلی ئیستا ـ وە [ئاندیا] ـ لە بەشی خواروی دەراوی قزل ئوزون ـ روباری سپی ـ کە لە نەخشەکەی ئێمەدا [ ژمارە ( A ٤ ) ] بو دانراوە] وە سەرزەمینی [دیوك] ـ کە رەنگ بێ لە بەشی ژوروی هەمان دەراو بوبێت ـ ئەمانە هەمویان چەند پادشا نشینێکی بچوك بونو سەر بە حکومەتی مانا بون • هەروەها لە سنوری ئاشوریشدا پادشا نشینەکانی [ئالابریا]و [کالارزا] لە بەشی سەروی زێی بچوكو ناوچەکانی دەوروبەریا هەبو ، کە ئەمانە تا ڕادەیەك سەر بەئاشور بون ، لە ناوچەکانی خواروو رۆژ هەڵاتیدا هەروەها چەند وڵاتێکی بچوکی شێوە سەربەخۆ هەبون ، کە ئەمانیش هەندێکیان سەر بە ئاشورو هەندێکی تریان سەر بە مانا بون ، وە یان بە تەواوی سەربەخۆ بون ، وە ئەمانە بە

**زۆری** سەرزەمینی یەکێتی هۆزەکانی ماد بون • بەڵام ئەم یەکیەتیە لەو سەردەمەدا بەهیچ جۆرێك خۆی دەر نە ئەخست ، تەنیا لە ناو ئەوانەدا پادشانشینی [ئالی‌پی] ـ لە نزیك کرماشانی ئیستاوە ـ بەو هۆیەوە کە لەگەل دەوڵەتی گەورەی عیلامدا هاو سنور بوو تارادەیەك ئەیتوانی خۆی لەبەر دەسەلاتی پەلاماری ئاشوریەکانا رابگرێو وە لەبەر ئەمە بە دەوڵەتێکی بەهێز ناو ئەبرا •

بەرز بونەوەی دەسەلاتی ماننا لە سەردەمی [ئیرانزو] دا کە بوبو بە دەوڵەتێکی بە تواناو لە پلەی یەکەمدا ئەژمیردرا پادشاکانی ناوچە نیوە سەربەخۆکانی دەوروبەری کە ئارەزووی سەربەخۆیی تەواویان ئەکرد نارەحەت کردبو • گومانی تیا نیە کە دەستەلاتی مانناو وەکو حکومەتەکانی تری ئەو سەردەمە ئەرکێکی گەورەی خستبوە سەر شانی خەڵك • پادشا نشینەکانی دەوروبەری مانا هۆی بنەرەتی زاوەستانی چالاکی پێشکەوتنی مانا بون ، گەورە پیاوانی ئەو ناوچانە هەوڵو تەقەلایان ئەدا کە لە سەرزەمینە بچوکە کانیانا خۆبەخۆ فەرمانڕەوایی خۆیان بکەن وە ئەمەش ئەبوە هۆی ئەوە کە دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەهێز لە ناویانا دروست نەبێتو بێگانە بتوانێ بەسەر ناوچەکانیانا زاڵ بێتو کیانی نەتەوایەتی لەناویانا دوا بکەوێ • هەرچۆن بێت ئەم دۆخەی کە خەڵکی خولقاندبوویان لە باری دەسەلاتی مانا خراپتر بو بەسەریانەوە • هەروەکو لە مەربەر وتمان دەوڵەتی مانا لە واقیعدا حکومەتی چەند خانەدانێکی بەدەستەلات بوو ، وە داکوکی لەسەر دەسکەوتو قازانجی خانەدانەکان ئەکردو گوێی بە زەرەرو زیانی کۆمەلانی خەڵکی تر نەئەدا • بەم هۆیەوە لە ناوخۆی وڵاتو حوکومەتەکەدا بیزاری تەواوی خەڵکی گرتبووەوە ، ئەگەر فەرمانڕەوایەك یارمەتی خەڵکەکانی بدابایەو پشتی بگرتنایە زۆر بە ئاسانی ئەیتوانی دەوڵەتێکی جەماوەری بەهێز دروست بکات • بەڵام لە سەدەی هەشتەمی

پێش زاینیدا فەرمانڕەوایەکی بەم جۆرە نەبو [وە ئەو ڕاپەڕینەی خەڵك ئەویش دیسان ناکامڵ بو] ، وە هەرچی بکرابایە هەر یاخی گەری هەندێك پادشای بچوك بوو کە ئەویش مەبەستی یاخی گەریەکەی لەگەڵ ئاواتی خەڵکەکەدا نە ئەگونجا • وە هەروەها چونکە سیاسەتی دەرەوەو ڕقەبەرایەتی نێوان دەوڵەتە گەورەکانی وەکو ئاشورو ئورارتوو ماناو عیلام بەرپەرچی یەکتری یان ئەدایەوەو ئەم بارە سیاسیەی دەرەوە تاڕادەیەك ئاڵۆزیو پشێویو یاخی گەری لە ناوچەکانی وڵاتدا دروست ئەکردو هەر کۆلکە پادشایەك لە لایەکەوە سەر بە لایەنێکی تر ئەبون • ماننا کە لە دەوڵەتەکانی تر لاواز تر بو ئەبوا لە ناکوکیەکانی نێو دەوڵەتەکان هەمیشە سودی وە بگرتابایە •• لەبەر ئەمانە مانا زۆرتر سەر بە ئاشوریەکان بوە وە لە نوسراوەی ئاشوریەکانا [سارگونی دوەم] چەند جار نوسراوە کە [مانا] سەر بە ئاشور بووە ، بەڵام ئەم وتەیە ڕاست نیە • چونکە ئاشوریەکان لە کاتێکدا کە باری مانا ئاڵۆز بو نەك وەکو وڵاتێکی سەربەخۆ یان لەگەلیا ئەجوڵانەوە بەڵکو وەکو وڵاتێکی هاوپەیمانو هاوکار سەیریان ئەکرد •

یەکەمجار ئاشوریەکان بەپێی داوای [ئیرانزو] لە ساڵی ٧١٩ی پێش زاینیدا دەسکاری کاروباری ناوخۆی مانایان کرد • دوو قەڵای مانناییەکان [شوئان داخول]و [دور دوکا](٢٤٢) لە ژێر دەسەڵاتی [ ئیرانزو ] چونە دەرەوە ، سوارەو پیادە شەڕکەرە کانی متاتیو زیکرتو یارمەتیان دان سێ قەڵای [ سوکا ] و [ بالا ] و [ ئابی تیکنا ] لەگەڵ [ روسای یەکەم ] پادشای ئورارتو پەیمانیان بەست [ شوێنی ئەم سێ قەڵایە نازانرێ وە نازانین ئایا لە خاکی مانادا بوە یام نەء ؟] • [سارگونی دووەم] پادشای تازەی ئاشور چەند دەستەیەك لەشکری خۆی نارد بۆ کۆمەك کردنی [ئیرانزو] • قەڵاکانیان گرتو بەپێی عادەتی لەشکری ئەو سەردەمە لەگەلیانا جوڵانەوە ، واتا دانیشتوانی قەڵاکەو کەلوپەلەکانیان بردن بۆ ئاشور وە خاكو قەڵاکانیان دا بە [ئیرانزو] •

ئەم روداوە لە سەردەمی ژیانی ئیرانزودا کە پیر بوبو روی دا ، وە لە ریزی پێشەوەی روداوە سامناکەکانی ژیانی دائەنرێ ، لە دوای مردنی شەڕ لە نێوان کوڕەکانیا لەسەر میراتو تاجو تەخت دەستی پێ کرد •

[ئیرانزو] هەر لە ساڵی ٧١٦ی پێش زاینی لە دنیا دەرچوو ، لەو ساڵەدا [ئازا]ی کوڕی چوە سەر تەخت(٢٤٣) متاتی فەرمانفەرمای زیکرتو(٢٤٤) وە ئلوسینا فەرمانفەرمای [ ئاندیا ](٢٤٥) وە بگداتو(٢٤٦) فەرمانفەرمای [ئوئیشدیش] کە ئەوانیش هەروەکو دیوك لەلایەن ماناوە کرابون بە حوکم رەوا(٢٤٧) لە دژی [ئازا] راپەڕین • وە ئازایان بەوە گوناهبار کرد کە لەگەل سارگون پەیمانی یەکێتی بەستوە • ئازا گیراو کوژراو تەرمەکەی لەکێوی [ ئاوائوش ] فرێ درا • سارگون دەمودەس پەلاماری دانو [باگداتو]ی دەستگیر کردو فەرمانی دا پێستەکەیان لە لەشی کردەوەو لاشەکەیان لە پیشانگای سەیر کردنی مانناییەکانا دانا •• کوڕەکەی تری [ئیرانزو] کە ناوی [ئولوسونو] بو لەسەر تەختی پادشایی دانیشت ، لەگەل ئەوەشدا [ئولوسونو] کە لە ناو دارو دەستەی ئاشوریەکانا گەمارۆ درابو دەمودەس لە ئاشور جیا بوەوەو تێکۆشا کە پەیمانی یەکێتی لەگەل ئورارتودا ببەستێ • وە [٢٢] قەلای(٢٤٨) لە ناوچەی سنوری ئاشوریەکان دا بە [روسا]ی پادشای ئورارتو ، وە فەرمانفەرماکانی ناوچەکانی ژوروی زێی بچوك [ئیتی فەرمانفەرمای ئالابریاو ئاشور(٢٤٩) فەرمانفەرمای کارالا] یان لە دژی ئاشوریەکان راست کردەوە •

سارگون نەگەرایەوە بۆ ئاشور تاکو [ ئیزیرتو ]ی پایتەختی ماناو دو قەلای گرنگی مەرکەزی [زیبیە](٢٥٠)و [ ئاماریت ]ی داگیر کرد ، [ئولوسونو] خۆی تەسلیم کردو پادشایی پێ درایەوە ، بەلام لەبارەی [ئیتی]و [ئاشورلە] •• یەکەمیان بە پێی ریکەوتنی بنەماڵەی خۆیان دور خرایەوە بۆ ئاشورو دووەمیان بە زیندویی پێستیان کرد ، وە ناوچەکەیان خستە سەر

ئاشوری زاموا[٢٥١] • ئاشوریەکان دو ناوچەی سەر سنوریان [نیك ساما]و [شورگا دیا] یان داگیر کردو لە مانایان جیا کردەوەو خستیانە سەر ولاتی ئاشور • ئەو کاتە سارگون بەرەو ناوچە دورەکانی تر بەرەو خواروی ئەو ناوچانەی کە مانا دەسەلاتی بە سەریانەوە لاواز بوبو یان دەسەلاتی تیایانا نەمابو لەشکری خستە رێ • یەکەم جار قەلای [ کیشەسو ]ی[٢٥٢] لە لاژوروی قزل ئوزون داگیر کردو فەرمانفەرماکەی کە بە ناوی ئاشوری - بابلی [ بل شاروسور ] - بالتا سار - یان پێ ئەوت بەدیل گیرا • ناوی قەلاکەیان گۆری بە [کارنین ئورتا] یان وەکو هەندێك سەرچاوەی تر باسی ئەکەن ناویان نا [کار - ئوریگالی][٢٥٣] وە پارچە نوسراوێكو وێنەیەکی سارگونیان تیا داناو هوردوگایەکیان تیادا دروست کرد • بەم جۆرە ولاتی تازەی ئاشور [کیشە سو] پێك هاتو ناوچەکانی [بیت ساگبات]و [بیت خیرمامی]و [بیت ئومارگی]و قەلاکانی [خارخوبارا] [٢٥٤]و [کیلامباتی]و [ئارمانکو] کە سەریان دانەواندبو خرانە سەر ئاشور •

پەیوەندی هەندێك لەو قەلایانەی کە کەوتبونە دامینەکانی خواروی کێوەکانی [گیزیل بوندا]و دامینەکانی ئەلوەند بە هۆی ئەم گۆرانەوە لەگەل مانادا بچرا ، وە فەرمانرەوایانی ئاشور حوکمیان تیا ئەکردو پەیوەندیشیان لەگەل مادی رۆژهەلاتا نارەحەت بو • دانیشتوانی قەلای [خارخار] خاوەن ئاوایەکە کە ناوی [کیبابا] بو دەریان کردو داوایان لە [تالتە][٢٥٥] پادشای [ئالیپی] کرد کە ئەمانە بە دارو دەستەی خۆی دابنێ • هەروەکو لەمەوبەر وتمان [ئالیپی] لە نێوان پادشا بچوکەکانی مادی خوارودا لە هەمویان گرنگتر بوە ، وە لە نێوان ئاشورو عیلامدا بە زۆرزان ناسرابو •

هەروەها سارگونی دووەم لەشکرکەشیەکی تری بەرەو ناوچەکانی خوارو کردو [خارخار]ی داگیر کردو دانیشتوانی ئەو شوێنەی بە دیل گرت • وە لە جێگای ئەو خەلکیەی پێشو چەند کۆمەلێکی تری خەلکی لەم

لاولاوه هێناو تیایا نیشتەجێی کردن • خار خاری زۆر مەحکەم کردو کردیان بە مەرکەزێکی ولاتی ئاشور[۲۵۷] ئەم ولاتانەی ناومان بردن بریتی بون لە ناوچەکانی زێی گەورە یان [ئارانزشو] ـ ئارازیاش یان ئارنزیاش کە سەرچاوەکانی تر باسیان لێوە کردوە ـ وە ناوچەی زێی بچوك یان [بیت رامانوا] ـ یان بە شێوەیەکی تر بڵێین [بیت راماتئا] ،واتا [زنجیرەی راماتەکان] [ئەم ناوچەیەش دیسان بەشێك بووە لە ئارازیاش] وە ناوچەکانی ئوریکاتوو سیگریس‌و شاپاردا یان [ساپاردا]و ئوریاکو بوە • لەم ناوچانە ئارانزشو ـ ئارانزیاش ـ ناوچەیەکە کە لە بارەی لەشکر کەشیەکانی پێشوی ئاشورەوە باسی کراوە • وە لە بارەی ئەم ناوچەیەوە زانیاری تەواومان هەیە وەکو دەرکەوتوە ناوچەی زێی گەورەو زێی بچوك کە ناوچەی زێی [شانارتە ـ sanarte ] یان پێ وتوە هەمان دەراوو روبارانە بوە کە لە ئەڵوەندەوە سەرەوژێر ئەبونەوەو دوایی ئەرژانە روباری قەرەسووەوە • [سیگریس]و [ساپاردو] ئەوانیش لەنزیك ئەم ناوچانەوە بون •

لەگەل ئەوەدا کە لە دواییدا چەند جار لەشکری ئاشور چونە ناو خاکی مادەوە بەڵام سنوری ئەمپەراتورێتی ئاشور زیاد لەو سنورەی کە سارگون دیاری کربو تێ نەپەڕی • ئاشوریەکان تەنانەت لەناو ئەو سنورەدا بە نارەحەت ئەیان توانی خاکی ماد سەرپەرشتی بکەن : بەشی سەروی زێی بچوك‌و دیاله [ناوچەکانی ژمارە ۷ـ۵ی نەخشەکەمان] بە تەواوی گرتبوە دەست •• سنوری ژوروی ولات لە چیاکانی گیزیل بوندا [کێوی قافلان]و ناوچەی زنجان قزوین‌دا تێ ئەپەڕی • لێرەدا سنوری رۆژ هەڵاتی ناوچە داگیر کراوەکان دەست پێ ئەکات ، وە بۆ رۆژ ئاوای قەزوین‌و رۆژ هەڵاتی هەمەدان درێژ ئەبێتەوە ، سنوری بەشی خواروی ئەو ناوچانەی خاکی ماد کە بە دەست ئاشوریەکانەوە بو لە کیوی ئەڵوەندەوە دەست پێ ئەکات‌و لە زنجیرە چیاکانی ژوروی دەراوی کرمانشا بەلای رۆژهەڵات‌و رۆژ ئاواوە

تاکو ناوچەکانی دیالە درێژ بۆتەوە • لە سەرەتاوە ئەم زەوی‌و زارانە کە بە دەست ئاشوریەکانەوە بوو کرابون بە پێنج ناوچەوە ، وەکو لای خوارەوە : زاموا ، پارسوا ، بیت ـ همبان ، کیشە سو ، خارخار • وە لە دواییدا ئەم دو ناوچەیەی کە لە دوادا باسمان کردن کران بە چەند بەش‌و ناوچەی بچوك بچوکەوە •

پەیدابونی ئەم پایەگا جەنگی‌یەی ئاشور لە پشتی سەری ماناوە گەلێك کاری کردە سەر سیاسەتی دەوڵەتی ناوبراو ، ئەنجامی ئەم کارە لە ساڵەکانی دواییداو لە سەردەمی لەشکر کەشیەکانی [سارگونی دووەم] بەرەو رۆژ هەڵات لە [٧١٣ ـ ٧١٥]ی پێش زاینی هاتە دی •

ناوچەکانی کیشەسوو خاخار(٢٥٨) کە بە هۆی سارگونی دووەمەوە دامەزرا بون ـ وەکو ئاشکرایە ـ بەشێکی گرنگ لەو هەرزەمینەی کە [دیوك]ی لەلایەن ماناوە تیا کرابو بە حوکمڕان لێی جیا کرایەوەو خرایە سەر خۆی ، بەڵام بەشێکی تر لە دەراوی قزل ئوزون لە ژورووی ناوەراستەوە لەژێر دەسەڵاتی ئەوا مایەوە • ئەو جارە زۆر بە ئاشکرا دەرکەوت ، پادشای مانا کە سەری بۆ ئاشور دانەواندوە ناتوانێ داکوکی لەسەر دەوڵەتی دیوك بکات‌و پشتیوانی بێ • [روسای یەکەم] پادشای ئورارتو ئەمەی بە دیوك راگەیاند کە [روسا] لەو کاتەدا لە دژی [ئولوسونو]ی مانایی دەستی بە شەڕو شۆر کردبوە ئەمە سەرەتای تۆڵە سەندن بو بەرامبەر لایەنگرتنی [ئولوسونو] کەلایەنی ئاشوریەکانی ئەگرت •• ساڵنامەکانی سارگونی دووەم ئەوە دەرئەخات کە [روسا] لە ساڵی ٧١٦ی پێش زاینی ٢٢ قەڵای مانای داگیر کردوە ، وە هانی دیوکی داوە کە لە مانا جیا بێتەوە ، وە دیوك کورەکەی خۆی بە ناوی نوماینەدەی خۆیەوە نارد بۆ لای [روسا] بە داخەوە نوسراوە ئاشوریەکان شوێنی ئەو ٢٢ قەڵایەیان دەست نیشان نەکردوە •

بەڵام هەروەکو وتمان ئەو قەڵایانە کەوتبونە ناوچەی نێوان ماناو

ئاشورەوە • چونکە سارگون لـە سالّی ٧١٥ی پێش زایینیدا نەك تەنیا ئـەو قەلاّیانەی لە ئورارتو گرت بە ڵکو راستەوخۆ خستنیانە سەر ئاشور(٢٥٩) وە دواجار لە دژی [دیائوکو] ـ دیوك ـ لەشکری کرد ئەوی لەگەل بنەماڵەکەی دەستگیر کردو ناردنی بۆ [هامات] بۆ سوریە(٢٦٠) سارگون دەستی کرد بـە پەلاماردانی بـەشی خواروی قزل ئوزون(٢٦١) وە چوە ناو [ ئاندیا ] یـان [می‌سییاندا](٢٦٢) ئەم ناوچەیە سەربەخۆ بو پێیان ئەوت [تلوسینا] کـە لـە سالّی ٧١٩ی پێش زایینی بە پارچەیەك لە وڵاتەکەی [روسا] ناو ئەبرا • لەو کاتەدا [ئاندیا] بـە هاوکاری [باگداتو] فەرمانفەرمای [ئوئیش دیش] متـاتی فەرمانفەرمای [زیکرتو] لە دژی [ئازا] کە وتبوە شەڕەوە • لـەم ناوچەیەدا ٤٢٠٠ دیل‌و ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵیان برد(٢٦٣) سارگون نوسراوەو وێنەی خۆی لە سەر بەردێك هەڵکەندو لە [ئینزیرت] پایتەختی ماننا دای نا •

لەو کاتەدا شۆرشێکی گـەورە لـە ناوچـەکانی [ خارخار ] کـە تازە فەرمانڕەوایان دەست کەوتبو بەرپا بو(٢٦٤) ئەم شورشە بەدەسیسەی یەکێتی هوزەکانی ماد بوو ، وە لەوە ئـەچو لـە لایـەن [ ئالیپی ] یەوە یارمەتی شورشگیرەکان ئەدرا ، وە ئەم هـەراو بگرەو بەردەیـە درێژەی کێشا تاکو ناوچەکانی دەوروبەریو [بیت ـ همبان] ـ ناماو ـ یشی گرتەوە(٢٦٥) •

سارگون [بیت سانگی بوتی] و [ئوریاکا] ـ نوریەکا ـ و [سیگریس] و [شاپاردا]و [ئوپاریا]ی بە وڵاتی شۆرش ناو ئەبرد •

لـەشکری ئاشوریـەکان دژی شورشگیرەکان پـەلاماریان بردو توانیـان چەند قەلاّیەك لە سەر زەمینی زێی گەورەو بچوك داگیر بکەن ، هەروەکو ئەم چوار قەلاّیەیان داگیر کردو دەستیان بەسەرا گرتن ، قەلای [کیششلو ، کیدائو ، ئانزاری ، وە ـ بیت باگای ـ ](٢٦٦) کـە ئەمانە بون بـە بنکەی هەمیشەیی لـەشکری ئاشوریەکان(٢٦٧) هەروەکو لە ساڵنامەکانا دەرئەکەوێ قەلاّی [خارخار] بە مەبەستی داگیر کردنی ماد زۆر قایم کرابو ، لە وڵاتی

[بیت همبان] قەڵای [ کیءیرا ] یان داگیر کردو زیاتر لـە ۲٥۳۰ کـەسیان بەدیل برد •



**قەڵایەك لە مانتا ، لەروی بەردێکی ئاشوریەکان کێشراوە ، لە سەردەمی شاروکین دا [ کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی ]**

بەڵام سارگون نەیتوانی ئـەو زەوی‌و زارانـەی کـە دەستی بەسەرا گرتبون‌و داگیری کردبون ـ وەکو وڵاتەکانی تر ـ بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە • فـەرمانفەرما ناوچەییەکان لـە ناوچـەی خۆیان وە لـە سنوری ناوچەکانیان [۲٦۷ دوبارە] مانەوە بـەڵام باج‌و خـەراجیان بـە ئاشوریەکان ئەدا ، وە ئەمە بوبو بە فەرمانێکی ردسمی کە لـە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ماننادا ئیشی پێ ئەکرا(۲٦۸) •

لەوە ئەچێ کە چەند دەستەیەك شـەڕکـەر لـە دانیشتوانی ناوچەکان چوبنە ناو هێزی لەشکری ئاشوریەکانەوە(۲٦۹) ئەو فەرمانفەرما ناوچەییانەی

که سەر بە یەکیتی ماد بون(٢٧٠) [نوسراوەی سارگونی دووەم ئەمانە بە ـ مادای ـ ناو ئەبات‌و ، وە لە ناوچەکانی تری مادی ئاینده که لەو نوسراوەدا ـ گوتیوم ـ] واتا بە [گوتیەکان] ناوی ئەبات ، بە ئاشکراو رونی دەری ئەخات(٢٧١) . لە سەرانسەری قەڵەمڕەوی یەکیتی ناوبراو تاکو [بیك‌نی] ـ کێوی دەماوەند ـ هەموی خەرج گوزاری سارگونی دووەم بون .

دەسەڵاتی تەواوی ئاشوریەکان لەو شوێنانەدا بە تەواوی حوکمیان ئەکرد که قەڵاکانیان بە دەستەوە بوو ، خەڵکی ناوچەکەشیان دەر کردبوو ، وە لە جێگای ئەوان خەڵکیان لە شوێنەکانی ترەوە بۆ هێنابو ، بە تایبەتی خەڵکیان لە سوریەو فەلەستینەوە بۆ هێنا بون‌و تیایانا نیشتەجێ یان کردبون . بەڵام لە دامێنی ئەم ناوچانەوە خەڵکی مادی‌و گوتی لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی پێشین‌و سەرۆکی هۆزەکانی خۆیانا بون وە هەر کاتێك زۆریان بۆ بهێنانایەو ناچار بکرانایە خەرج‌و باج‌و سەرانەیان بە ئاشوریەکان ئەدا .

**

لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا لە سەرزەمینی ماد زیاتر لە پینج ولایەتی ئاشوری هەبو . بەڵام هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نیە کە ئاشوریەکان خاکی تریان لە مادەکان داگیر کردبێت . یەکێك لەو ولایەتە تازانە ناوی [ساپاردا] بو ئەمە لە پێشا پارچەیەك بوو لە وڵاتی خارخار . وە دو وڵایەتی تر کە ناویان [مادای]و [بیت کاری] بو وە لە وڵاتی خارخار یان کیشەسو جیا بوبونەوە . زۆر لەوە ئەچێ مادای یان سەرزەمینی پێشینی دیوك لە خواروی ناوەراستدا لە قزل ئوزون(٢٧٢) بو بیت وە [بیت کاری] بەمانا [یانەی دەرەبەگی] ، [یانەی کوچکردوەکان] ئەوە ئەبێ لە ناوچەی هەمەدان دا بوبێت(٢٧٣) لە ناو نوسراوەی ئاشوریەکانا بە ئاشکرا دیارە کە دەسەڵاتی ئاشور لەو ناوچانەدا زۆر لاواز بوە ، وە هەمیشە ناچار بون بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆیان هەمیشە چەك بە دەستەوە بن ، وە لەوە ئەچێ

هەر لەبەر ئەمە ئەم سێ ولآیەتەیان لە ولآتەکانی [کیشمەسو] و [خارخار] جیا کردبێتەوە • چونکە ئەو دو ولآتەی لە دواییدا باسکراون ـ کە لە سوریەوە خەڵکیان بۆ هێناون‌و تیایانا نیشتەجێ یان کردوون ـ ئەمانە لە بارەی ئیداریەوە سەر بە ئاشور بون ، ئەوە نازانرێت کە داپڕ کردنی ئەم سێ ولآیەتە لە کام مێژوودا بووە • بەلآم وەکو ئەڵێن لە دوای ساڵی ٧١٠ی پێش زاینی دا بووە •

ساڵێك لە دوای کوژانەوەی شورشی خارخار ٧١٤ی پێش زاینی ، سارگونی دووەم لەشکری کردەسەر ئورارتو ، لە بارەی ئەم لەشکرکەشیەوە گەلێك بەڵگەو سەرچاوەمان بە دەستەوەیەو باسی ئەم لەشکرکەشیەش جاروبار لە کتیبی زانستی‌دا هەیە(٢٧٤) •

ئەم لەشکرکەشیە ـ کە بە پێچەوانەی [ئوئیش ـ دیش کە لە ساڵی ٧١٦ی پێش زاینیدا قەلاچۆ کرابو ـ هێشتا سەری دانەنەواندبو] دەستی پێ کرد(٢٧٥) • لە سەرەتای ئەم لەشکر کەشیەدا سارگون ولآتی [سوری گاش]ی داگیرکرد کە یەکێك بوو لە ولآتەکانی [مانا] • رەنگە بێ [سوری گاش] ئەو ولآتە بوبێت کە [روسا] لە ساڵی ٧١٦ی پێش زاینیدا داگیری کردبو • [مانا] بەهۆی ئولوسونو پادشای ئەو کیشوەرەوە راوێژ کارانی خوی دیاری خۆی پێشکەش بە سارگون کرد • ئەوجار سارگون بە ناوچەی پادشا نشینی بچوکی [ئالاباری] لە بەشی ژوروی زێی بچوکدا تێ پەڕی ، وە ژمارەیەکی زۆر ئەسپو ئاژەڵی لە [بلا پالی دین] کە دەست نیشانی خۆی بو وەری گرت(٢٧٦) • ئینجا چوە ناو ولآیەتی ئاشوری پارسواوە •وە لە لایەن خاوەنی ئاواییەکانەوە کە لە خاکی مادا بون‌و لەوە وبەر سەر بە ئاشور بون(٢٧٧) گەلێك دیاری‌یان وەرگرت •نوسراوەکە ناوی ٢٦ فەرمانفەرما ئەبات ، وە ناوی [تالتا] فەرمانفەرمای [ئالی‌پی] لە ریزی پێشەوەی ئەم ناوانەدا ناو براوە(٢٧٨) ئەمانە ژمارەیەکی زۆر ئەسپو ئاژەڵی شاخدارو



مادو ئاسیای نزیك لە كۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا

ووشتری دو کۆپانیەن بە ناوی دیاریەوە دا بـە سارگون(٢٧٩) خەڵك وایان ئەزانی کە سارگون ئەیەوێ دیسانەوە لەشکر بۆ سـەر خاکی ماد بکاتەوە ، بەڵام ئەو نیازێکی تری بوو • شـای ئاشور لـە پارسـوا دەرچوو لـە کێوو تەپوڵکەکان تێ پـەڕیو چوەسـەرخاکی میسو [مسو] کـە یـەکێك بو لـە ناوچەکانی خاکی [مانا] • لەوێدا وەکو بڕیاری پێشتر [ئولوسونو] لە قەڵای [زیردیاکا] ــ سیرداکا ، دوردوکا ــ چاوەروانی ئەکرد ، وە چەند عەمارێکی پڕ کردبو لە ئازوخە ، چەند کۆمەڵـە ئـەسپو ئاژەڵێکی بـە دیاری دا بـە لەشکری ئاشور ، سارگون لە کاتی گوفتوگو کردنا لـەگـەل [ئولوسونو]ی شای [مانا] گویا لە سەر ئارەزوی ئەو رێکەوت کە لەشکر لە ئورارتو بکات وە ئەو زەویو زارانەی کە مانا لە کەناری رۆژ هەلاتی ئورمیە لێی داگیر کراوە پێی بداتەوە • لـەوێدا ئاهـەنگی زیافـەت رێکخرا ، پادشای مـانا ئەگەرچی لەژێر دەسەلاتی سارگون دا بو بەلام لە جێگای خۆی مایەوە ، بەم جۆرە مانا بە کیشوەریکی یەکگرتوی ئاشور ناو ئـەبرا • لـەویدا دیاری فەرمان فەرمایانی هەردو قەلای [گیزیل بوندا] ــ واتا [زیزی] لە [ئاپاتار]و [ زالا ] لە [ کیت پات ] کە کەوتبونە سنوری پارسواو لە ناردنی دەرنگ کەوتبون ، وەرگیران •

سارگون لە سەر بەڵێنی خۆی کـە شەڕ لەگەل [روسا]دا بکات بەرەو سنورەکانی خواروو خوارووی رۆژهەلاتی مانا کەوتە رێ(٢٨٠) ،وە روی کردە [زیکرتو] • لە قەلایەکی مانادا کە پێیان ئەووت [پانزیش] کە لەگەل [زیکرتو]و [ئاندیا] هاوسنور بوو وە کەوتبوە خواروی ناوەراستەوە کرا بـە بنکـەی ئازوقەی ئـەم لـەشـکر کـەشیە • ئـەوجار سارگون لـە روباری [ ئیشتارائورا ](٢٨١) تێپەڕیو چووە ولاتی [ ئائوکانە ]وە لە سەر زەمینی [متاتی] زیکرتو • متاتی قەلاکەی خۆیان قەلای پاردو لە نزیك ناوەڕاستەوە چۆڵ کردو بەجێیان هێشت وە چونـە چیـای [ئاواشدیریکا] وە خۆیان تیا

قایم کرد • بەلآم بەمە دەس بەردار نەبو بە پەلە هێزەکانی خۆی نارد بـۆ [روسا ـی یەکەم] • روسا کە لە نیازی سارگون تێ گەیشت کە لە ناوچەی خزر [زیکرتو] چی ئەکات لە لای رۆژ ئاواوە بە پەلە پشتی لە لەشکرەکەی گرت تاکو لە ناوی ببات[٢٨٢] •

لەو ناوەدا سارگون ئەو بنکە پارێز گاریانەی کـە متاتی لـە چیاکانی [ئاواش دیرمکو]دا داینابون لـە ناوی بردن وە ١٣ قـەلآی زیکرتوی تالآن‌و وێران کرد[٢٨٣] وە لە ناکاو روی لەشکرەکەی گۆڕی‌و بـەرەو رۆژئاواو ولآیەتی [ئوئیشدیش] کە سەر بە مانا بو لە ناوچەی مەراغەی ئیستادا وە لـە لایەن ئورارتووەوە داگیر کرابو پەلاماری برد ـ رەنگ بێ لە ساڵی ٧١٥ی پێش زایینی دا بو بێت • [ئوئیشدیش] زانی کـە لـە لایەن جاسوسەکانیەوە خەبەریان داوە کـە لـە شکری روسا نزیك ئەبنەوە ، وە ئـەم جاسوسەش [بلاپالیدین] بو کە یەکێك بو لە پادشا بچوکەکان[٢٨٤] •

هەرچۆن بێ نەخشەکانی [روسا]و [متاتی] بونە نـەخشی سـەر ئاو ، لەشـکری کوێستانی [ئوئائوش] [سەهەند] ئاشوریەکان هێزەکانی ئـەوانیـان تەفروتونا کردو راویان نانە سەرزەمینی ئورارتووە ، سارگون بە پەلە کەناری رۆژ هەلآتی دەریاچەی ئورمیـەی گرت‌و روەو ژورو هێزەکانی خۆی تیا مۆڵدا ، خەڵکی کە ئاگری سەرچیاکانیان ئەبینی تێ ئەگەیشتن کە لەشکری ئاشور نزیک بۆتەوە ، دەمو دەس شوێنی خۆیان بەجێ ئەهێشت • یەکەم جار [ئوشکایا] [ئەسکوی ئیستا لە دامێنی رۆژئاوای چیای سەهەند] کـە قەلآیەکی سەرسنوری ئورارتوبو داگیر کرد[٢٨٥] ئـەم قەلآیـە قەرەوڵی رێگای نێوان [سوبی]و ولایەتەکانی زرند بوو • بە پێی نوسینی سارگون[٢٨٦] ناوچەی سوبی لە لایەن پادشای ئوراتووە بۆ پەروەردە کردنی ئەسپ تەرخان کرابو •

هەر لەو شەڕەی کێوی [ئوئائوش] دانیشتوانی [ئوشکایا] ناوچەکـەیان بەجێ هێشت وە سارگون بێ ئـەوەی هیچ بگرێو بـەردەیـەکی توش بێت

داگیری کرد • وە فەرمانی دا دیوارەکانی کە ٤ چوار مەترە بەرز بون تێکیان دا ، وە هەمو خانەکانی قەڵای ئوشکایا [بە پێی ئەو نوسینە]و ۱۱٥ ئاوایی دەورو بەری ئاگریان تێ بەردا • دوای ئەوە ئورارتوەکان لەو ناوچەیە دەرچون ـ مانا ئەیتوانی دەستەڵاتی خۆی بەرەوژورو فراوان بکات بەڵام ئاشوریەکان نەیان ئەویست بە هاوکاری خۆیان ئەو وڵاتەی وێران نەبوە ئاوەدانی بکەنەوە ، وە قەڵای [ ئایناشتاینا ] لەگەل تەویلەی ئەسپەکانو ئازوخەی لەشکری ئورارتو ۱۷ ئاوایی دامێنی [ لە سوچی ژوروی رۆژ هەڵاتی دەریاچەی ئورمیە ] وە قەڵای [ تاروئی ـ تارماکیس ] [ تەوریزی ئیستا ] لەسەر زەمینی هۆزی [دالیان] ـ کە ئەویش مەڵبەندی پەروەردە کردنی ئەسپی سوارانی لەشکری ئورارتوو زەخیرەی لەشکر بوو ـ هەمویان وێران کردن • لەشکری ئاشوریەکان هەمو عەمارە گەنمو جۆ کانیان داگیر کردبو وە ناوچەکانیان تاڵان کرد •

سارگون دوای ئەوە لە وڵاتی ئورارتو [سان گی بوتو] [لەگەل سان گی بوتو یا ـ [بیت سان گی بوتی] رۆژئاوای ماد نەگۆرێ] کەوتبوە ژوروی دەریاچەی ئورمیەوە ، بەویدا تێ پەری(٢٨٧) ئەم سەرزەمینەی لە دوایدا باسمان کرد لە سەردەمی [مینوئا] واتا سەد ساڵ لەوەو بەر سەر بە ئورارتو بو ، وە گەورەترین شاری [ئولخو] بو ، کە بە هۆی قەڵای [ساردوری خورد] بەرگری لێ ئەکرا • پادشای ئورارتو لەم شارەدا کۆشکێکی کردبۆوە ، نوسراوەکانی سارگون باسی جۆری کشتوکاڵو ئاودێریو کارێز کەندنی ئەم ناوچەیە بە ئاشکرا ئەکا(٢٨٨) لە دامێنی [ئولخو] یەك پارچە باخو باخات بو ئاشوریەکان هەمویان سوتاندنو تاڵانیان کردن ئاواییە بچوکەکانی دەوروبەری ئەم قەڵایە ئەوانیش دوچاری سوتاندنو وێرانیو تاڵان کردن بون ، بەڵام خەڵکەکانیان رایان کردو لە ناوچە شاخاویەکانا خۆیان شاردەوە •

هەروەکو لە نووسینەکانی سارگون دا دەرئەکـەوێ [ئولخو] زەوی‌و زاری پادشایی تیا بو ، وە هەروەکو ئاواییەکانی دەورو بـەری خـەڵکیشی هەریەکە بەشی خۆی زەوی‌و زارو باخ‌و باخاتی هەبو[٢٨٩] •

لە رۆژ ئاوای [ ئولخو ] گـەلێك ناوچـەی دەوڵـەمـەندو ئاوەدان‌و پێشکەوتو هەبو ، گەلێك لەم ئاواییانە زۆر مەحکەم بون بەڵام لەشکری [روسا] داکۆکی لەسـەر ئەمانە زۆر نـەکرد ، ئاشوریەکان بـە ئاسانی ئەچونـە ناو قەڵاکانیانەوە کە خەڵکەکانیان لە ترسانا خۆیان شاربۆوە[٢٩٠] بەم جۆرە لەو شوێنانەدا گەلێك ئازوخە دەست لـەشکری ئاشور کـەوت ، هـەندێك لـەو خەڵکەی کە پەنایان بۆ کێوەکان بردبو بە دەستی ئاشوریەکان لەناو چون • ئاشوریەکان هەروەکو کردبویان بـە عادەت ئاواییەکانیان سـوتاندو تالانیان کردن‌و ئینجـا لـە گەردەنەی [قوتور]ەوە[٢٩١] چونـە ناو خاکی ئـەسڵی ئورارتو • یەکێك لە نوسراوەکانی سارگون ئەڵێ : کە لەم شوێنەدا پادشای ئاشور ئەو ٢٢ قەڵایەی کـە لـە ساڵی ٧١٦ی پێش زایینی‌دا [روسا] داگیری کردبو وەهەروا دو قەڵا کە لە کاتی لەشکرکەشی هەمان ساڵدا لە [روسا]و [متاتی] گیرابون دای بە [ئولوسونو]ی پادشای ماننا • یەکێك لەو دو قەڵایەی کە لـە دواییدا باسـمان کردن [ ئوشکایا ] وە ئـەوی تریان [ پاردا ] یان [ئایناشتاینا] بووە • وە رەنگ بێ گـەلێك سودی تریان وەرگرتبێ‌و چـەند پارچـە زەوی‌و زارێکیان لە زەوی‌و زاری پێشوی ئورارتو لـە ناوچەکانی ژوروی کەناری دەریاچەی ورمێ‌دا گیر کردبێ • لـە نوسینەکەی سارگون دا ، بە بونەی داگیر کردنی قەڵاکانی بەشی رۆژئاوای [سان‌گی بوتو] لەنزیك خۆی زۆر بە سەیر باسی ماننای کردوە ، وە لەوە ئەچێ [ئولوسونو] داوای کرد بێ سنورێکی تازە لە زنجیرە چیاکانی کـە ئیستە سنوری نێوان ئێران‌و تورکیە بەناویا تێ ئەپەڕێ دروست بکات • چونکە ئورارتوییەکان ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئـەم زنجیرە چیایانە لـە دەست دەرچوبو ، وە ئاشوریەکان کـە

سنورێکی هاوبەشیان لەگەل ئەم سەرزەمینەدا نەبو نەیان ئەتوانی دەستەلاتی خۆیانی تیا پایەدار بکەن‌و بی‌هێڵنەوە ٠

شتێکی تر ئەمە ئەسەلمێنێ : لەگەل ئەوەدا کە سارگون لە نوسینەکەیا سودی لە هەر هەلێك وەرگرتوە سەردانەواندن‌و فەرمانبەرداری مانا دێنێتە پێشەوەو یارمەتی ئەو دەولەتەی ئەدا ، بۆ نمونە لە ساڵی **٧١٤ی** پێش زاینی‌دا ئولوسونو دو جار خەراجی داوە بە ئاشور بەلام لە دوای ساڵی **٧١٣ی** پێش زاینی لە بارەی دیاری‌و خەرج‌و باجەوە هیچ نابیستین[٢٩٢] تەنانەت تا رادەیەك مانا ئازایەتی بەرخۆی هێنا بو کە پەلاماری زەوی‌و زارەکانی سەرسنوری ئەدا کە ئاشور داگیری کردبو ٠

ئەگەر بە وردی نوسراوەی سارگون بخوێنینەوە ئەمەمان بەرچاو ئەکەوێ کە مانا ـ وە رەنگ بێ ـ ناوچەکانی ژورو تری دەورو بەری ورمێ کە لەوەوبەر لە ژێر دەسەلاتی حکومەتی ئورارتودا بو ـ واتا ئازربایجانی ئیستای ئێران ـ لە بارەی پێشکەوتنی ئابوریەوە لە زوربەی ناوچەکانی مادی رۆژ هەلات لە پێشتر بون ٠ ئەم وتەیە بۆ وتن ئەشێ کە لە نێوان سەرکەوتنەکانی ئاشورو ئورارتودا زیادو کەمی هەبوە ٠ ئاشوریەکان لە بارەی پێشکەوتنی کشتوکاڵی ناوچە داگیر کراوەکانەوە کەمتر سود مەند بون چونکە لەسەر زەمینە کۆنەکانی ئەمپەراتوریتەکەی خۆیان کشتوکاڵ زۆر پێشکەوتوتر بو ٠ بە پێچەوانەوە ئورارتوییەکان کشتوکاڵیان دواکەوتو تر بو ، زۆر هەوڵیان ئەدا لەروی کشتوکاڵەوە پێش کەون ٠ هەروەکو نوسراوەی سارگون باسی ئەکات لەم ناوچانە لە هەندێك شوێنا کشتوکاڵ بە باشی پێشکەوتو بو[٢٩٣] وە ئەمانە لەسەرزەمینی یەکیتی هۆزەکانی ماد پێشکەوتو تر بون ٠ ئەتوانین بلێین کە لە خاکی مانادا کە مەرجی کشتوکاڵ‌و پیشەگەری زۆر دواکەوتو نەبو رەوتی کۆمەلایەتی لە ناوچەکانی خواروی رۆژهەلات بالاتر بوو ٠

مانا زۆر لەبار بو کە ئابوری تیا پێش بکەوێ وە بە مەرکەزی ئابوریو سیاسی سەرانسەری ناوچـە کوێستانیەکانی رۆژ هـەلاتی ئاشـور دائەنرا ، ئەیتوانی ببوژێتەوە ، وە وەکو دەوڵەتێکی گرنگ خۆی بنوێنێ ، بەلام بـو ئەوەی ئەم نیازە بێتە دی ئەبوا نەریتی کۆنی خانەدانە فەرمانڕەواکان لـەناو بچن • وە دەولەتێك دروست بکەن کـە تەنیـا سەر بـە خانەدانەکان نەبێت بەلکو نوێنەری هەمو چەوساوەو ئازادیخوازەکان بێت ، بەلام هێشتا سەردەمی دروست بونی دەوڵەتێکی ئاواو بەو جۆرە نەهاتبوە پێشەوە • لەگەل ئەوەشدا مانا لە بارەی سیاسەتی دەرەوە ــ هەروەکو وتمان ــ لە دوای سـالی ٧١٤ی پێش زاینی لە جاران مەحکـەم تر بو ، وە ئەیتوانی تاڕادەیەك سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت •

سارگونی دووەم لە سالی ٧١٣ی پێش زاینیدا لەشکری کردە سـەر خاکی مـاد ، مـادەکان لـە سـالی ٧١٤ی پێش زاینی دا چـاوەروانی ئـەم پەلاماردانەیان ئەکردو زۆر لێی ئـەترسان ، بیانوی ئـەم لەشـکر کـەشیە شورشێك بو کـە لە ناوچەی [کارالا] کەوتبۆوە ــ یەکێ لـە دەراوەکانی بەشی ژوروی زێی بچوك ــ دانیشتوانی ئەوێ پیاویك کـە ئاشوریەکان لـە سەر ئەو ناوچەیـە دایان نابو دەریان کرد ، سارگون دانیشتوانی [کارالا]ی قەلاچۆ کرد[٢٩٤] وە لەوێوە پەلاماری مادو ئالیبی دا ، دوای ئـەوە چووە [ئالیبی] [دالتو] یان [تالتو] پادشای ئەوێی لـەسـەر سـەلتـەنەت هێشتەوە چونکە پادشای ناوبراو سەر بە ئاشور بو وە دەسەو دایەرەو پیاو گەورەکانی حکومەتی لەبەر ئەمە لێی دلگیر بون[٢٩٥] • لەشکری ئاشور لەوێوە چونە ناو خاکی مادەوە • سەرچاوە نوسراوەکان بەم جۆرە باسی ئەکـەن[٢٩٦] : [کیشوەری سیگری] سو ، کیشوەری بائیت عان ، (؟)[٢٩٧] ولاتی مـاد کـە لە سنوری [ئالیبی] یـە[٢٩٨] [کیشوەر ••••] کیشوەری ئاپسـا خوتی ، کیشوەری پار نوئاتی ، کیشوەری ئویترنا ، ئاوایی دیریستانو ،[کیشـوەری

••••••] ، کیشــوەری ئوریاکی ، کیشــوەری ریمـانوتی (؟) ولاّتــەکانی کیشوەری ئوبــورئی ، [کیشـــوەری] ئویادوئوئـــە • کیشـــوەری بوستیس ، کیشـــوەری ئاگازی ، کیشــــوەری ئامبـــاندا ، کیشـــوەری دانانو ، ولاّتـــە دووردەستەکان لـــە ســنورەکانی کیشــوەری ئاری بی روژهــەلاّتی[299] وە هەروەها[300] ولاّتــەکانی مــادە بــە دەستەلاّتــەکان[301] کـــە یوغی خوای ئاشوریان لەناو برد وە لەکێوەکانو بیابانەکان ، هەروەکو دز رویان نا — من سوتاندنم[302] وە هەمو ئاواییەکانی ئــەوان ، وە سەرانسەری سەرزەمینی ئەوانم ویران کردو کردم بە خۆڵ[303] •

ئەم پارچە نوسراوەی سەرەوە لە چەند رویەکەوە شایانی سەرنجدانە ، رێرەوەکەی سارگون وەکو پێویستە رونو ئاشکرانیە ، بــەلاّم بــە شێوەی گشتی مەبەستی ئــەو [ئالی‌پی] — بو — لــە نزیك کرمانشای ئێستاوە — لەو شوێنانەی ناویان براوە ناوی [ئوریاکی] ئوو [ئوپوریا؟] ئاشنایــە • [ئوپــاریا لەوە ئەچێ هەمان — نی (؟) پاریا — ی تیگلاتپالاسار بێت] هەردو شوێنەکە سەر بە ولاّتی خارخار بون • ئەم باسە لــە بارەی ناوچەی سیگریس — کە ناوی لە سەرەتای نووسینەکەدا هاتوە ـ راستە • لەبەر ئەمــە ولاّتەکانی تر نابێ بە ناوچەیەکی دابنێین کە لەوەبەر پەیوەندی بە ئاشورەوە نەبوبێ •

لەگەل ئەمەدا نووسراوێکی تری سارگون ئەوە ئــەسەلمێنێ[304] کـــە ولاّتی [ئاگازی] و [ئامباندا] سەر بە ناوچەکانی مادەکانی سەرسنوری [ئاری بی] رۆژهەلاّت بون •

ناوەکانی وەکو [ئاپساخوتی] و [پازئواتی]و هی تر لە نوسراوەکانی ترا باسیان لێ نەکراوە ، وە لــە رۆژهــەلاّتی [ئالی‌پی] دا بون ، لــەوە ئــەچێ رەگەزی زوربەی ئەم ناوانە ئێرانی بن • ئەو نوسراوەی سەرەوە باســـمان کرد ولاّتی ناوبراوی بەدو بەش داناوە : ولاّتێك کە کەوتۆتە سنوری ئاری بی رۆژ هەلاّتەوە ، وە ولاّتی مادە بە دەستەلاّتەکان کە لــە کێوو بیابانەکانا

ئەگەڕان •

زاراوەی ئاری بی Aribi لـە نوسراوەی ئاشوریەکانا بـە پێی شێوەی زمانی ئاشـوری بۆ کۆمـەڵ بـەکار هێنراوە ، وە لـە کاتی ناوێکی تەنیادا ئارابو Arabu وە ئارو بو Arubu یان ئاراب ئەوترێ • بەڵام ئەمە راستە کە لەم کاتەدا باسەکە [عەرەب] نیە وە [ئاریبی رۆژ هەڵات] کە لە نوسراوەکانی سارگوندا باسی کراوە مانایەکی تری هەیە • ئەتوانین بە دو جۆر لێکی بدەینەوە ، جۆری یـەکەمیان ئەوەیە کـە مـەبەست لـە [بیابان نشینەکانی رۆژهەڵاتە](٣٠٥) واتا بە تەواوی لەو باوەڕەداین کە بـە هۆزە بیابان نشینە ئێرانیەکان وتراوە • بەڵام بـە پێی لێکدانەوەی جۆری دووەم پاشگری [ بی Bi ] ئەبێ بە [ پە Pe ] بخوێندرێتەوە [هەروەکو لە ئالی بی Elli-Bi ] بـەم جۆرەیە • واتا وەکو پاشگری عیلامی بـۆ کۆمـەڵو وە ئاری پـــە Ari-Pe بـــەم جـۆرە مـانای ئاریاییـەکان ئەگرێتەوە(٣٠٦) لەمەوبەر وتمان کـە ئـەم لێکدانەوەیە بـە پێی بیروڕای ئێمە راستە ، وە هەڵەمان ناکات کە ئەم [ئاریاییانە] بە عیلامی زمان بزانین • لێرەدا ئەوە دێتە روو کـە مەبەست لـە ئاریزانتەکان بێت ، واتا ئەو هۆزە مادییانە کە بە بیروڕای ئێمە لە کۆنەوە ئێرانی زمان بوون • ناوی شوێنەکان لە سنوری ئاریبی [لەوە ئەچێ لە نێوان سنوری ئاریبی دیسان تەرجومە بکرێ] ئێرانیە •وە ئەمە خۆی لە سەرزەمینی ماد – لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینی – بەرێکەوتبوە ، وە ئەمە لەگەل بیروڕای سەرەوەدا ئەگونجێ •

نوسراوەی سارگون لە نێوان [مادە دەسەڵاتدارەکان کە لـە کێوەکانو بیابانەکانا ئەژیان]و ئاریبیـەکـان [ ئاریاییەکان ] جیاوازن • نوسـەرەکانی سارگون لە بارەی نژادی دانیشتوانی مادەوە باش شارەزا بون [ئەوەمان دی کە هەمە جورە خـەڵکی ئەسڵی مادی رۆژ ئاوایان گوتیەکانیان لە هۆزەکانی یەکێتی ماد – مادای – جیا ئەکردەوە] • بـەم جۆرە جێگای سـەرنجە کـە

ماده‌كان [ماداى] یان [له ئاریاییه تایبه‌تیه‌كان یان ئاریبی به جیا ئه‌زانێ] نابێ لێره‌دا بەم جۆره‌ی لێك بده‌ینه‌وه كه له‌و سه‌رده‌مه‌دا له نێوان [ماداى] یه‌كان به مانای وشه ئێرانی نژاد زۆر به‌هێز نه‌بوه • بـه پێچـه‌وانه‌وه نوسراوه‌ی نوماینده‌گانی [ماداى] به وردی باسی ئه‌مه ئه‌كه‌ن كه زۆر به‌هێز بووه ، به‌ڵام هه‌رچۆن به‌راورد بكرێ ئـه‌و نژادانه حوكمڕه‌وانه بون وه بـه تایبه‌تی لـه ناوچه‌كانی رۆژئاواو ناوه‌ڕاست دا •

نوسراوه‌یه‌كی تری سارگون[٣٠٧] كه داخه‌كـه‌م زۆر بچڕ بچڕ بوه زۆر بـه وردی باسی وڵاتـه وێران كـراوه‌كان‌و پـه‌لاماری ئاشـوریـه‌كان‌و له‌شكركه‌شی ساڵی ٧١٣ی پێش زاینی ئه‌كات‌و به‌رونی ناوی فه‌رمانفه‌رماكان ئه‌دات به ده‌سته‌وه[٣٠٨] هه‌ندێك له‌م نوسراوه‌یه له‌گه‌ل كۆتایی نوسراوه‌ی ساڵی ٧١٤ی پێش زاینیدا به‌رامبه‌رن •

هه‌روه‌ها ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ی كه دیوك دای مه‌زراندبو [ هه‌رچی بو بێت ] هێشتا پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه كه هرودوت وتویه ده‌وڵه‌تێك نه‌بوه كـه سه‌رانسه‌ری مادی پێكه‌وه به‌ستبێ •

دوا له‌شـكر كـه‌شی ئاشوریه‌كان بۆ سـه‌ر خاكی ماد لـه سـه‌رده‌می سارگونی دووه‌م له ساڵی ٧٠٦ی پێش زاینیدا بو[٣١١] • [ تات ] پادشای [ئالی‌بی] كه خزمه‌تكارێكی گوێ گری ئاشوریه‌كان بو له‌و كاته‌دا نه‌مابو ،وه براكه‌ی ئه‌و كه ناوی [نیبه] بو وه به [شوتروك ــ ناخونته‌ی دووه‌م] پادشای عیلام به‌ناوبانگ بو له دژی [ئه‌سپبارا][٣١٢] ناوێك كه ڕوبه‌ڕوی ئاشوریه‌كان بوبوه‌وه راپـه‌ڕی • سارگون حـه‌وت كـه‌س لـه سـه‌ر كرده‌كانی وڵات‌و له‌شكره‌كانیانی[٣١٣] تێكه‌ڵاوی شه‌ڕی [ئالی‌پی] كردو تێوه‌ی گلاندن [نیبه] له‌گه‌ل (٤٥٠٠) كه‌مان به‌ده‌ستی عیلامی له قه‌ڵای [مرعو بیشتو] خۆی دا له مه‌كۆ ، به‌ڵام قه‌ڵاكه كه‌وته ده‌ست دوژمن‌و دواجار كردیان به هوردوگایه‌كی هه‌میشه‌یی ئاشوریه‌كان[٣١٤] •

لەگەڵ ئـەوەشدا کـە [ ئالی‌پی ] سەربەخۆیی خۆی پاراستبوو ، وە هەرگیز لەوە نەئەچوو وەکو لایەنێکی سیاسی تێکەڵاوی یەکێتی دا هاتوی ماد بێت • وە چۆن لـە ساڵی ٧٠٢ی پێش زاینی [سی ناخریب] کوری سارگون جارێکی تر لەشکری کردە سەر [ئالی‌پی] ئەو دەوڵەتە لاواز تر بو[٣١٥] •

لەشکر کەشی ساڵی ٧٠٢ی پێش زاینی چەند بگرەو بەردەیەکی درێژ خایەن بوو کە ئەو پادشایە لـە دژی عیلام دروستی کرد ، وە لـە واقیع دا جەنگێکی ناهەموار بوو لە دژی عیلام وە ئامانجێکی تری ئەو شەڕە ئەوە بو کە لەو سەر زەمینەدا بەر لە دەسەڵاتی عیلام بگرێ • یەکەم ئامانجی ئـەم لەشکر کەشیە ئەوە بو کە هۆزە کوێستان نشینەکانی کاسیو بیابان نشینەکانو [یاسوبی گالایان] لە خواروی [ئالی‌پی] [کە لـە کاسیەکانەوە نزیك بون] •• ئاشوریەکان ژمارەیەکی زۆر ئـەسپو گوێ درێژو قترو ئاژەڵی شـاخدارو چەند کۆمەڵێك دیل‌یان لێ گرتن وە هەمو ناوچە کوێستانیەکانیان خستە سەر وڵاتی [ئاراپخا][٣١٦] • لە یەکێک لەو سێ قەڵا گیراوانە[٣١٧] ئەو دیلانەی کە لە بابلەوە هێنرابون دایان نان وە لە دوو قەڵای ترا ئـەو کاسیانەی گۆیا رایان کردبو بۆ کوێستانەکانو گێڕابوو نیانەوە ئەوانیشیان نیشتەجێ کرد ، سیناخریب لەوێدا لەگـەڵ لەشکرەکەی خۆی بـەرەو [ئالی‌پی] سـەرەوژێر بودوە ، ئەمجارە لە وێدا ئەسپارا لەگەڵ عیلام یەکیەتیان هەبو ، وە قەڵاکانی [مرعوبیشتو] و [ئاکودو]ی داگیر کردو ، دیلێکی زۆرو ژمارەیەك ئـەسپو قاترو گوێدرێژو وشترو ئاژەڵی شاخداریان بە تالانی برد ، هەروەها وڵایەتی [بیت‌باروا]ش دیسان کە [لە نوسراوەی ئورارتویی – باروانا – باس کراوە] دابڕ کرا[٣١٨] وە ئەو دیلانەی کە لە شوێنەکانی ترەوە هێنا بوینان لەوێدا هەمویان کۆ کردنەوە ، وە ئەو ناوچەیانە خستە سەر وڵاتی [ خار خار ]ی ئاشوریەکان • ئەوە دەر ئەکـەوێ [بیت باروا] کـە تیگلا تپلاساری سێیەم خستبویە سەر وڵاتی ئاشور لەژێر فەرمانی ئەو دەوڵەتە چو بوە دەرەوە ،وە

لەگەل [ئالی‌پی] پەیوەست بوبو • ئەم روداوە لە ساڵی ٧١٥ی پێش زایینی‌دا بووە • کە خەڵکی ناوچەکانی مادی رۆژ ئاوا لە دژی ئاشور هەستابون •

ئالی‌پی لە دوای نوشوستی وشکانی ساڵی ٧٠٢ی پێش زایینی سەر لـە نوێ لەگەل ئاشوریەکانا تێك چوونەوە ، وە لە ساڵی ٦٨٩ بـەشداری ئـەو یەکگرتنەی کرد کـە لـە نێوان [خومپانی منا]ی پادشای عیـلامو موشزیب مردوك] پادشای بابـلدا لـە دژی ئاشوریـەکان بـەسرابو[٣١٩] • هـۆزە جۆربەجۆرەکانی ئارامی‌و کلدانی ئەوانیش هاتنە ناو ئـەم یەکگرتنەوە ، وە کیشوەرەکانی [ئانزان] و [پاشری] ئەوانیش تێکەڵاوی ئـەم یەکگرتنە بونو پشتگیری‌یان لێ کردن[٣٢٠] • لـەشـکری ئـەم ناوچە یەکگرتووانـە لـە [خالولە] لەسەر روباری دجلە روبەروی ئاشوریەکان بونـەوە • شـەڕ لـە نێوان هەمودا دەستی پێ کرد ، [خومپانی منا] لـە ناکاو برینداربو ، بـەم هۆیەوە شەڕەکە لەناو خۆی عیلامدا گـەرم بوو ، ئاشوریەکان بابلیان داگیر کردو وێرانیان کرد ، وە ئـەمجارەش دیسان وەکو جارەکانی پێشوو ئـەو هەوڵو تەقەللایەی کە ئەیاندا لـە ژێر دەسەڵاتی ئاشور رزگاریان بێت ژێر کەوتو سەری نەگرت •

ی

بەم جۆرە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایینی‌دا دەسەڵاتی ئاشور لە جاران زۆرتر لە خاکی مادا بەهێز تر بوو • لەو کاتەدا سەردەمێکی تازە هاتە پێشەوە ، سەردەمی خۆ ئامادە کردن بـۆ پێك هێنـانی پادشایەتی مـادو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی ماد •

# ٨ ـ دانیشتوانی ماد لە ماوەی حەوت سەد سال پێش زاینی دا

**بەر لەوەی بچینـە ناو باسی سـەردەمی مێژووی مـادەوە با لـە بارەی جۆری نژادی ئەو سەرزەمینەی حەوت سەد سال بەر لە زاینی بدوێین :**

لە ناوچەکانی ئازربایجانی ئێستادا کە کەوتۆتە کەنارەکانی رۆژ هەڵاتو خوارووی دەریاچـەی ئورمیەو زەوی‌و زارەکانی خوارو تر چـەند هۆزێکی جۆربەجۆر لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بۆن کە سەرچاوە ئاشوریەکان بە گوتی‌و لولو ناویان ئـەبـەن • لەناو ئەم سـەرزەمینـەدا دیسان باسی زمـانی مهران کراوە[٣٢١] ، ناوچەکانی ژورو کیمرەکانی [گیزیل بوندا] بەشێك بون لـە کیشوەری ماننا ، وەزەوی‌و زارەکانی خوارتری کـەمو زۆر بـە بەشێك لە خاکی ئاشور دانراوە ، وە زەوی زارەکانی نزیك بە کەناری دەریای کاسپی [خزر] وە نیوەی خواروی دەراوی قزل ئوزون‌و ناوچەکانی ژورو تری چەند پادشا نشینێکی بچوکیان تیا بو ، وە چـەند هۆزێك لەو ناوچانە ئەژیان کـە نوسەرەکانی سەردەمی کۆن لە دوایدا ئەوانەیان بە ـ گل‌و گادوسی‌و کسپی‌و •••هی‌تر ناو ئـەبرد ـ وە بێگومان ئـەوانـە لـەگـەل گوتی‌و مانی‌یـە کانا پەیوەندی‌یان هەبوە ، جگە لەمانە مرداکان وە یان [ئامردا] کان کـە نیودیان بیابان نشین بون لـەگەل ساگارتی‌یەکان کـە ناویان لەناو نوسراوە کۆنەکانا هەیە ئەوانیش لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بون ، ئەمانە لەوە ئەچن لە ناوچەکانی [ئاندیا] و [زیکرتو]و کیشوەری [دالی]و گیزیل بوندا نیشتەجێ بووبن •زۆر جار زیکرتو ساگارتی‌یەکانیان بە یەك زانیوە ئەگەر ئەم وتەیـە راست بێت ، کەوابو لەناو ئەمانەدا هەندێك هۆزی ئێرانی هەبون ، وە بونی هەندێك ناوی ئێرانی لە سەدەی هەشتەمدا لەو ناوچانە ئەم راستیە ئەسەلمێنێ •

لە بەشی ژوروی دەراوی قزل ئوزون بـەرەو رۆژ هەلات تا ئـەگاتـە

دەشتی کویر سەر زەمینێك بووە کە ئاشوریەکان پێیان ئەوت کیشوەری مادەکان [مادای] • بەشێك لەو سەرزەمینە لەژێر دەسەلاتی حکومەتی ئاشوردا بووە ، ئەگەر لە روی ناوی خەلك‌و شوێنەکانەوە – کە تاکو ئەگاتە قەزوین – وە هەمەدان رەواجی بوە – لێکی بدەینەوە ، لەم ناوچەیەدا دیسان زمانی لولوئی‌و گوتی حوکم فەرما بووە • بەلام لە ناوچەکانی رۆژ هەلاتی ترا خەتی ناوبراو تەنیا لەگەل رۆژگارا باسی ناوەکان کراوە ، بەرە بەرە زمانی ئیرانی تیا سەرکەوتوە ، لە سەرەتاوە ئەمە زمانی هەمان هۆزی ئاریزانتی بووە کە لە یەکێتی هۆزەکانی مادا بوبو بە زمانێکی یەکگرتوی نێوان هۆزەکان • وە هۆی بە نرخی ئەم زمانە – بە تایبەتی لە بارەی ناوی کەسانەوە – ئەمەیە •• هەرچۆن بێ بە پێی ئەو سپەنەدو بەلگەو سەرچاوانەی کە هەیە ئەگەر بە تەواوی بلێین کە مادەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زایینی‌دا بە تەواوی زمانیان ئێرانی بووە ، ئەمە راست نیە •وە ناوچەکانی خواروی ماد [لە ئالیپی کە بە تەواوەتی(٣٢٢) بە بەشێك لە مادای ئەژمێردرا ، وە لە ناوچەی کاسیەکان‌و هی‌تر] نژادی عیلامی‌و کاسی دەوریان هەبوە ، بە پێچەوانەوە لەوپەڕی ژوروی ولات لە نێوان ئارس‌و ورمێ ، هەروەها لە کەناری رۆژ ئاوای ئەو دەریاچەوە – رەنگ بێ نژادی هوریانی – ئورارتو – بە دەستەلات بوبن • نوسەرەکانی سەردەمی کۆن ماتیانیەکانیان – کە بە هیچ جۆرێك بەشێك نەبون لە هوریانەکان – بە خەلکی نیشتەجێی ئەم ناوچەیانە ئەزانن • بەشیك لە هوریەکان – رەنگ بێ لە سەردەمی کۆندا لە ناوچەی دەریاچەی ورمێ ژیابن‌و بەشێکی تر دیسان لەوە ئەچێ لە کاتی ئاوەدان کردنەوەی ئەو ناوچانەدا کە ئورارتو لە کۆتایی سەدەی نۆیەم‌و سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زایینی دەستی پێ‌کرد بۆ ئەو ناوچانەیان ناردبن • چونکە خەلکی ئەمپەراتوریتی ئورارتو تەنیا ئورارتویی نەبون بەلکو بەلای کەمەوە لە چوار رەگەز پێك هاتبون • بەم

جۆرە ئورارتوییەکانو هوریەکان کە لەگەل یەکترا پەیوەندییان هەبو وە لەگەل ئیبریو گرجیەکانو ئەرمەنەکان [ئارمینان][٣٢٣] بون •

لە دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ی پێش زاینی بەشی رۆژئاوای کیشوەرێك ـ کە لە دوایيدا ناویان نا ماد ـ لە ژێر دەسەلاتی ئاشوریەکانا بو ، وە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی خودی ناوچەکە چۆڵیان کردبو ، وە خەڵکیان لە سوریەو فەلەستینو بابلەوە بە زۆر ئەهێناو لەو شوێنەدا نیشتەجێ یان ئەکردن •زمانی هاوبەشو یەکگرتوی ئەمانە وەکو بەشەکانی تری ئەمپەراتوری ئاشور ئارامی بو ، واتا زمانی سوریەو بین‌النهرینی ژورو • لە دوایيدا ئەم ناوچەیە بە [سوری ـ ماد] ناو ئەبرا •

لە دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ی پێش زاینیدا ئەو زەویو زارەی کە لە دوایيدا پێیان ئەوت [ماد] یەکیان گرت ، بەلام لە بارەی نژادو رەگەزی نژادیەوە تێکەڵ بون • ئەو ناوچانەی کە دانیشتوانەکانیان گوتیو لولومئیو تا رادەیەك هوریئی ـ ئورارتویی بون وە زیاتر لە هەمو ناوچەکانی دەورو بەری دەریاچەی ئورمیە واتا ماناو خەڵکی سەرزەمینەکانی دەورو بەری لە بارەی فەرهەنگو شارستانیەوە پێشکەوتو بون • لەم ناوچانە باری ئابوری لە شوێنەکانی تر باشتر بوو • وە پەیوەندی چینایەتی زۆرتر پیشکەوتبو ، بەلام ریکخستنی دەوڵەتی لەم ناوچانە بریتی بو لە حکومەتی چەند بنەماڵەیەکی بە دەستەلات ، یان [ئولیگارشی] وە بەم هۆیەوە مانا نەی ئەتوانی سەرکردەیی هەمو کیشوەرەکە بگرێتە دەست خۆیو هەمو ولاتەکە بکات بە ولاتێکی یەکگرتو • چونکە بۆ بەجێ هێنانی ئامانجێکی وا پێویست بوو کۆمەڵێك خەڵکی ئازادی خوازی ئەو سەرزەمینە لە دەوری دەسەلاتی دەوڵەتێکی ئاوا کۆ بنەوە •

لەو رۆژگارەدا رەوتی ئابوریو پلەی ئابوری زۆر ئاشکراو دیار نیە ،لە کەناری ناوچە کشتوکاڵیەکانا کۆمەڵگای چینایەتی کامڵ بوبوو ، وە بەرەو

پێشکەوتن ئەڕۆیشت ناوچەی ئاژەڵداری تایبەتی هەبو ، هەروەها بیابان نشینەکانیش رەوتێکی دیاری کراویان هەبوو ، کە تازە ئەچونە ناو کۆمەڵگای چینایەتیەوە • وە لە لایەکی ترەوە ناوچە کوێستانیەکان کۆمەڵانی سەرەتایی زۆریان تیا بو [هەروەکو لە نێوان کوێستان نشینەکانی کاسیو جێ نشینەکانیان] چەند سەد ساڵێك لە دوای ئەوەش هێشتا هەر مابونەوە •

# «ماننا» وپادشایی ئەسکیتەکان «سکایە یەکان»

## ١ ـ راپەڕینی [کشتریتی]و پەیدابونی پادشایی «ماد»

•

لەماوەی سنوری سەدەکانی هەشتەم و حەوتەمی پێش زاینیدا هۆیەکی سیاسی تازە لە ئاسیای نزیکدا [مقدم] پەیدا بو ،کە هێزە حوکمڕەواکانی لە بنەڕەتەوە گۆڕی • ئەم هۆ تازەیە هۆزە سوارەکان و بیابان نشین و کیمری و نرری و ئەسکیتەکان بون ، کە لە ناوچەکانی کەناری دەریای ڕەش کۆچیان کردو لە ئاسیای ڕۆژ ئاوادا دەسەڵاتیان پەیدا کرد •

سەرچاوە کۆنەکانی ڕۆژ هەڵات هەندێك مەسەلە کە پەیوەندی بەم هۆزانەوە هەیە بە باشی ڕونی ئەکەنەوە بەڵام باسی جموجوڵ و کوچ کردنیان وەکو پێویستە باس ناکەن ، سەرچاوە کۆنە شونەسیەکان ئەوانیش لەم ڕووەوە هیچ یارمەتیەك نادەن ، چونکە هەمو کەلوپەلێکی دوزراوەی ئەسکیتەکان لە ناوچەکانی کەناری دەریای ڕەش هی سەدەی حەوتەمی پیش زاینییە • لەبەر ئەوە شوێنەواری فەرهەنگی و شارستانێتی ئەم هۆزانە لە سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینی کە لەگەل خۆیانا هێناویانە بۆ

ئاسیای نزیك وه ئەو شتانەی كە لە كۆنە شوناسی كە ناری دەریای رەشدا بە هی ئـەسكیتەكان ناسراوە بێ ناوو نیشانـە • كیمری ئەسكیتەكان كـە لـە سەرچاوەكانی ئاشوریو سەرچاوە كۆنەكانی تری ئاسیایی سەدەی هەشتەمو سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ناویان هاتوە ئەوانە لە بارەی كۆنـە شوناسیەوە پەیوەندییان بە شارستانێتی پێش ئەسكیتەكانەوە هەیـە • ئـەبێ ئەوەمان لە یاد بێ كە لەگەل ئەو باسو لێكۆڵینەوەی كۆنە شوناسانەدا وە بـە تایبەتی لێكدانەوەكانی ب• ب پیوطروسكی هێشتا ناتوانین شوێنەواری كۆنی ئەسكیتەكان لە ئاسیای نزیكدا لە شتەكانی تر بە رەوانی جیا بكەینەوە • جیا كردنەوەی شوێنەواری كیمری زۆر نارەحەت ترە ، ئەو شتانەی كە بە هێنی سكاییـەكان زانراوەو لـە كـەنارەكانی دەریای رەش دۆزراوەتەوە ـ واتا شنومەكی كۆتایی سەدەی حەوتەمو سەدەكانی شەشەمو پێنجەمی پێش زاینیدا بنێین ـ بەلام ئەبێ لەو چەرخەدا فەرهەنگو شارستانێتی ئاسیای نزیك لەگەل شارستانێتیو فەرهەنگی ئەو هۆزانەی كە زمانیان لـە یەكترەوە نزیكە ئەبێ كاریان كردبێتە سەر یـەكتری • وەكو [مادو باكتریاو سكایەكان] وە ئـەو هۆزانەش كە پەیوەندی خوێشانەیان نـەبووەو بـەلام ئەسكیتەكان لێیانەوە نزیك بون وەكو [سـەرزەمینەكانی دەورو بـەری ئورارتوو ئاسیای بچوكو ماناو خەڵكی ئالبانی كۆنو ••• هێنی تر] • ئەمانە ئەبوا حیساب بكرانایە • بەم هۆیەوە ئەو سەنەدو بەڵگانەی كە پەیوەندییان بـەو چـەرخەوە هـەیە لە ئاسیای نزیكدا ناتوانین كتو مت بە هێنی ئەسكیتەكانیان دابنێین •هەروەكو وتراوە ئەوەی كە بە پەیكانی ئەسكیتەكان ناوبراوە لـەناو كۆمـەڵە چـەكی گەمارۆ دراوەكانی ئەو قەڵایانەدا كە ئەسكیتی تیا نەبوە ، دەست كەوتوە[1] • ئەم وتەیە لەگەل وتەكانی هرودوت [١/٧٣] لەبەر ئەوەی كـە مادەكان لـە ئەسكیتەكانەوە فێری تیر ئەندازی بون ـ زۆر باش ئەگونجێ • لـەم جۆرە باسانەدا ناتوانین چاوپۆشی لە وتەو لایەنگرتنی سەرچاوە كۆنەكان بكەین •

سەردەمی ئەو سەرچاوانە لە روداوە باسکراوەکانەوە زۆر دورە بەلاَم لەگەل ئەوەشدا زۆر جێگای سەرنجە چونکە ئەوەی کە باسەکەی گێڕاوەتەوە سەرنجی جۆری ژیان‌و جموجوڵ‌و کۆمەلگای هـۆزە سوارەکانی کـەناری دەریای رەشی داوە – وە ئەم بەسەرهات‌و باسانە لـەگـەل باس‌و بەسەرهاتە کۆنەکانی کۆنترا لە یەك ئەچن • کۆنترین سەرچاوەی یۆنانی واتا ئەوانەی [هومر] ڕێکی خستوە ، هیچ باسی ئەسکیتەکانی نەکردوە[٢] ، بەلاَم ئەلێ : یۆنانیەکان وا ئـەزانن[٣] لـە سـەدەکانی دەیـەم تا هـەشتەمی پێش زاینی دراوسیکانی ژوروی [فراکیە] – لە کەناری رۆژ ئاوای دەریای رەش – چەند هۆزێك بون کە خەریکی بەخێو کردنی ئەسپ بون ، وە لـەوە ئـەچێ بـە بیابان نشین ناویان بردبن •

لە [ئەدیسا] قارەمانان لە دورگەی ئەفسانەیی [ئائە][٤] بەرەو کیشوەری ئەفسانەیی تاریکستانی ژورو [لە سنوری ئوقیانوسێ کـە لە ژرفاوە دیت][٥] ئەڕون • ئەو جێگایە خەلك‌و شاری کیمریەکان بوە [ یان زمستانی ؟ ] وە هـەمیشـە هـەورو تاریکـی دایگرتبو وە هـەرگیز رۆژو روناکی تیـا دەر نەئەکەوت[٦] بە وتـەی باسکراو دەرگای کیشوەری مردوەکان لەویدایە • بەم مانایە کە دور ترین هۆزی ناوچـەی ژورو [کیمریەکان] بوزە ، وە هیچ ناوو زاراوەیەکی راست لەم روەوە بـە دەستەوە نیە • چونکە [دموس] و [پولیس] لە بارەی کیمریەکانەوە نا شارەزان •

لە کۆتایی سەدەی شەشەم‌و لـە سـەدەی پێنجـەمی پێش زاینیدا لـە کەنارەکانی ژوروی دەریای رەش کیمـری نـەبوە • هرودوت [١،٣،١٠،٤، ١١ وە دواتر] ، باسی بەسەرهاتێك ئەکات کە گوایە کیمریەکان لە رۆژگاری کۆندا لە کەناری بوسپور کیمری [تەنگەبەری کرج] ئەژیان وە لەوە ئەچێ ئەسکیتەکان ئەوانیان لەوێ دەر کردبێ وە کیمریەکان کۆچیان کرد بێت بۆ ئاسیای نزیك • بەلاَم هرودوت لە دوای باسکردنی ئەم ئەفسانەیە دەمودەس

بەسەرهاتێکی تر [هەروەکو دیمان] کە هەموی راستەو پێچەوانەی بەسەرهاتی پێشووە بە تەواوی ئەی گێڕێتەوە ، کە ئەسکیتەکان [گۆیا کەوتونەتە شوێن کیمریەکان] وە لە رێگایەکی ترەوە رۆیشتوون ، واتا کیمریەکان لە کەناری دەریای رەش کەوتونەتە رێو رۆیشتوون[٧] وە ئەسکیتەکان لە کەناری دەریای کاسپی [خزر] ماونەتەوە • بەلاّم بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنین کە کیمریەکان سەردەمێك لە ناوچەکانی کەناری ژوروی دەریای رەش نیشتەجێ بون هیچ بەڵگەو سەنەدێکی راست لەم بارەیەوە بە دەستەوە نیە ، تەنانەت ئەو وتەیەش کە ئەڵی : کیمریەکان لە تەنگەبەری کرچ ژیاون ئەمەش دیسان هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو کە پشتی پێوە ببەسترێ بە دەستەوە نیە •

هرودوت باسی ناوە جوگرافاییەکان ئەکات ،هرودوت [ IV ، ١٢] لە [ بوسپور کیمری ] ، [ گذر کیمری ] ـ بەشێك لە تەنگەبەری کرچ کە باسمان کرد ـ ناوچەی [کیمری] ـ کە بە ئاشکرا شوێنەکەی دیاری ناکات ـ وە [قایمەکاری کیمری] هرودوت باسی ئەمانە هەموی ئەکات • نووسەرەکانی دوایش ئەوانیش چەند ناوچەیەك بە ناوی شاری [ کیمریك] [٨] یان [کیمرید] لە تامانو کریمە ـو کیوی [کیمریە][٩] باس ئەکەن • بەم جۆرە زۆر لەوە ئەچێ [بوسپورکیمری] هەمان [بوسپور فراکیە] بێ کە بەناوی کیمرییان [ژورو] ناونراوە ، ئەم ناوە لەگەل شێوەی زمانێ کە هومر بەکاری هێناوەو پەیوەندی بە سەدەی هەشتەمی پێش زایینیەوەیە ئەگونجێ •• وە دۆزینەوەی نیمچە دورگەی کریمەو تەنگەبەری کرچ ئەوانیش ـ یۆنانیەکان ـ بە هینی ئەو چەرخەی ئەزانن[١٠] • هەرچۆن بێت خەڵکی ئەو ناوچەیە کە یۆنانیەکان لە سەرەتای ئاوەدان کردنەوەی کریمەوە تێکەڵیان لەگەلا پەیدا کردن ـ ئەم تەنگەبەرەیان بە [پنتی کپە] Panticapa

واتا رێگای ماسی[١١] ناو ئەبرد ، نەك [تەنگەبەری کیمری] وە ئەمە خۆی

له ناوی شارێکەوه هاتوه که لەوێدا دروست کراوه • [پنتی کپیه کـه ئیستە پێی ئەڵێن کرچ] لەو شوێنەدا هەیه • بەڵام ئەبێ ئەمـه بـه تەنگه بزانرێ نەك به شار • بەلای کەمەوه له سەرەتاوه بەم جۆره بوه ، بەڵام ناوەکانی تر وەکو گیمریك ، قایمەکاری کیمری ، گزرکیمری] ••• لەوه ئـەچێ لـه ناوی تەنگەوه وەرگیرابێ • وشەی کێوی کیمری تەنیا یەك جار له نووسینه کۆنەکانا ئەبینرێ وه لەوه دڵنیانین کـه لـەم روەوه ئەسترابون لێی تێکی نەچۆبێ • ئەم وتەیه شایانی باسکردنه کـه ناوی فلان شـوێنی نیشتەجێ یان شوێن به ناوی کۆمەڵێکەوه یان هۆزێك ئەوه ئەگەیەنێ که ئەو کۆمەڵه یان ئەو هۆزه له بنەڕەتا نیشتەجێو خەڵکی رەسەنی ئەو شوێنه نین • ئەو ناوه به نیشانکردنێکی رەسەن دانانرێت • بەم هۆیەوه به بیروڕای تەواو لەوه ئەچێ تەنگەی کیمری سنوری شـوێنی نیشتەجێی کیمریەکان بو بێتو بـەس • ئەمێنێتەوه سەر مەسەلەی سەرزەمینی کیمریەکان ، ئیتر ئـەوه نازانین کـه شوێنی نیشتەجێیان لـه کوێدایه ! هەرچۆن بێ لـەروی رێڕەوی رویشتنی کیمریەکانەوه بـەرەو ئاسیای نزیـك ئەتوانین بڵێین کـه شوێنی سـەرەتایی ئەوان بـەشی رۆژ ئـاوای قـەفقازی ژورو بووه ، وه رەنگ بێ نیمچـه دورگەی [تامان] یش بگرێتەوه • وه هەروەها لەوه ئەچێ کـه لـه نیمچه دورگەی کریمه ژمارەیەك له کیمریەکان لەگـەل دانیشتوانی رەسـەنی ئەو شوێنەدا واتا [تاور]ەکان دا هـەبوبن • بـەڵام کاتێك یۆنانیەکان کریمـەیان داگیر کردو کردیان به ژێر دەستەی خۆیان باسی کیمریەکانیان نەکردوه •

هەرچۆن بێ بۆ سەلماندنی ئـەم باسه کیمریەکان دانیشتوانی سەرەتایی سەرانسەری سەرزەمینی که ناری ژوروی دەریای رەش [ئافراکیه] بون •وه ئەمه ناوێکی یەکگرتووه کـــه هۆزه نیشتەجێکانی ئـەو ناوچەیه بـەر لـه ئەسکیتەکان خۆیان پێ ناو نابو • بـەڵگـەی تەواومان بـه دەستەوه نیـه ، ئەسترابون که نوسەرێکی [دواکەوتو] به نیسبەت ئەو رۆژگارەوه بووه بەڵام

راستگۆو وردکار بوەو سەرچاوەکانی بە وردی لێکداوەتەوەو بەراوردی کردون ، لە بارەی پەلاماری کیمریەکانەوە بۆ سەر ئاسیا ، وە شوێنی سەرەتایی ئەوان بیرورایەکی تری هەیە •

بیرورای ئەسترابون وەکو لای خوارەوەیە : [ئەو نوسینانەی کە لەگەل نوسینەکانی هرودوتدا لەیەك ئەچن وە یان لەو وەرگیراوون لابراوون][12]•

ئەسترابون نوسیویە کە لە سەردەمی هومر یان کەمێك پێشتر کیمریەکان تاکو [ئائولید]و [یونیە] ئەرۆیشتن[13] • [وەکو هومر ئاگای لە کیمریەکان بو •• لە مێژووی ئەو روداوانەدا کە لە سەردەمی پەلامارداناو هاتنی کیمریەکاندا رویداوە کەمێك لەوەبەر وەیان هەر لەو کاتەدا رویداوە • [١/٢/٩] •

کیمریەکان لەناکاو پەلاماریان ئەبردە سەر دانیشتوانی ناوخۆی کیشوەرەکە ئەوانەیان کە کەوتبونە لای راستەوە [پونت] [واتا کەناری خواروی دەریای رەش] تاکو [یونیە] XI ، ٢،٥] «کالیسفن»[14] ئەلێ کە یەکەمجار کیمریەکانو ئینجا ترریەکانو لیکیەکان ناوچەی ساردیان داگیر کرد[15] وە [بە وتەی ئەو] [کالین]ی شاعیر تەواوی ئەم باسە ئەسەلمێنێ XIII ، ٤ ، ٨][16] •

لە سەردەمی کۆنی ماگنتەکان[17] بە تەواوەتی لەناو کیمریەکانو تررەکان دا ون بون ، کالین ئەلێ کە ماگنتەکان هێشتا لەو سەردەمەدا بە سەربەرزیو خۆشی ئەژیان وە بە سەرکەوتنەوە لەگەل ئافستیەکانو ئارخیلوخیەکانا ئەجەنگین[18] • هەروەها ئەو لەو رۆژگارەدا ئاگاداری ئەو گیرو گرفتو نوشوستییە بووە کە روی لەوان کردبو ، کالین لە بارەی پەلامارێکی تری کیمریەکانەوە کە لە رۆژگارێکی لەوەو پێشتردا رویداوە باسی ئەکات ئەنوسێت : ئیستە لەشکرێکی سامناکی کیمریەکان پەلامار ئەدەن، وە مەبەستی ئەو داگیر کردنی ناوچەی ساردە [ XIV ،١،٤٠] •

له بارەی کۆچکردنی کاریەکانو[19] تررو تو کرۆو[20] گالاتـی[21] گەشتە دورو درێژەکانو جـەنگی پێشـەوایان ـ وەکو مـادیای ئـەسکیتیو تئـارکوی[22] کوبای ترریو سسوستریسو پسامتیخ میسری[23] ٠٠ کـەم کەس ئاگاداری هەیە ٠ کیمریەکان ـ کە پێشیان ئـەوتن ترریـەکان وەیان هۆزێك لەو هۆزانەی کە سەر بەوان بون زۆر جار پـەلاماری لای راسـت [پونت]و ناوچـەکانی دەوروبەریان ئـەدا ، وە هـەندێك جـار ئـەچونە ناو [پافلاگونیە][24] وەیان ئـەچونە ناو ناوچەی [فریجیە] وە[25] ٠ زۆر جـار کیمریەکان وەیان ترریەکان ئـەم جۆرە پەلامارەیان لـەناکاو ئـەداو دەستی خۆیان ئەوەشاند ٠ ئەڵێن کە لە ئەنجامدا ترریەکانو کوپ مادیای پیشەوای کیمریەکانیان لەوێ دەر پەڕاندوە[26] ٠ I ، ٣ ، ٢١] ٠



**نەقشێك ٠٠ سوارەی لیدی یان یۆنانی**
**ناوەراستی سـەدەی شەشەمی پێش زاینی**

[٠٠٠٠ لیگدامیس بە سەرکردەیی لەشکرەکەی [مەبەست کیمریەکانە ـ دانەر] تاکو لیدیو یونیە رویشتو ساردی داگیر کردوە بـەلاّم لـە کیلیکیە کوژراوە] [ I ، ٣ ، ٢١] ٠

هەروەکو لە سەرەوە دەرئەکەوێ ئەسترابون لەو باوەڕەدا بووە کە کیمریەکان لەلای ژوروی رۆژئاواوە ورێگای بوسپور فراکیە [بوغازەی بوسفور]ەوە پەلاماریان ئەدا ، وە لە ناوچەکانی [ئائولید] ویونیەو پافلاگونیەو تاکو فریجیە فەرمانیان ئەکرد • بەلاّم ئاشکرایە کە ئەسترابون هەروەکو پێویستە زیادو کەمی نێوان ئەو هۆزانەی نەزانیوە کە لە سەدەکانی هەشتەم‌و حەوتەمی پێش زایینی‌دا پەلاماری ئاسیای بچوکیان ئەدا ، وە هۆی ئەمەیە کە ئەو هەندێك جار کیمریەکان‌و فراکی‌و ترری[٢٧] بە یەك ئەزانێ‌و هەندێك جاریش ئەوان بە ئەسکیتەکان تێ ئەگات • لەگەل ئەوەدا نوسەرە کۆنەکانی سەردەمی کۆن ئەم هەڵەیانە نەکردوە •

ئەو سودەی کە لە نوسینی نوسەرەکانی سەدەی حەوتەمی پێش زایینی وەرگیراوە ئەتوانین بەم جۆرەی دابنێین : کیمریەکان لە سەردەمی هومردا پەلاماری ئاسیای بچوك [فریجیە ، پافلاگونیە ، ویفینیە ، میسیا ،[٢٨] لیدی ، ئائولید ، یونیە] یان ئەدا [نەك لە دوای سەدەی هەشتەمی پێش زایینی ، وە ئەوان بەشداری ئەو شەڕەیان کردوە کە لە ساڵی ٦٧٤–٦٧٦ی پێش زایینی‌دا[٢٩] کەوتنە قەلاچۆ کردنی شانشینی فریجیە کە میداس دوا پادشای بوو ، وە لە ناویان برد • یەکەمجار ناوچەی ساردیان لە سەردەمی گیگ –لە دەوروبەری ساڵی ٦٥٤ی پێش زایینی داگیر کرد[٣٠] • گۆیا لە هەمان رۆژگارا [ئەفس] یان داگیر کردوە ، دواجار لە سەردەمی ئاردیس کوری [گیگ] واتا رەنگ بێ لە ساڵەکانی ٦٤٦–٦٤٥ی پێش زایینیدا[٣١] لیکی‌و ترری [کە ئەسترابون لە روی هەڵەوە بە کیمریەکانیان ئەزانێ] ساردو ماگنسیایان داگیر کرد • لە ئەنجامدا کیمریەکان لەگەل ئەسکیتەکان رێ کەوتن وە رەنگ بێ وەکو ترری‌یەکان – هاوکارەکانیان – کەوتنە ژێر دەستی[مادیا]پیشەوای ئەسکیتەکانەوە،هەروەکو لەمەولا باسی ئەکەین،سەرکەوتنی مادیا لە دەورو بەری دەیەکانی پێنجەم‌و چوارەمی سەدەی حەوتەمی پێش

زاینی بو[٣٢] • دوای ئەوە وەکو هرودوت ئـەڵێ [ IV ١٢] کیمریەکان لـە کەناری ژورووی ئاسیای بچوك ــ لە نزیك سینوپ ــ نیشتەجێ بون • وە لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی بە تەواوی کـەوتنە ژێر دەستەڵاتی [ئالیات] پادشای لیدی‌یەکانەوە •

لە کاتێکدا کە ئاسترابون دوو پەلامار بۆ سەر ئاسیای بچوك دائەنێ ــ ئەتوانین وای دابنێین کە یەکێك لەو دو پەلامارە [واتا پـەلاماری یەکەم] لـە لایەن کیمریەکانەوە بووە ، وە پێچەوانەی بیروڕاکەی ئەسترابونەوە نەك لـە رۆژ ئاواوە بەرەو رۆژ هەڵات ، بـەڵکو بـە درێژایی کـەنارەکانی قەفقازی دەریای رەش ــ لەو لایەوە کە هرودوت باسی کردوە دەستی پـێ کردوە • [وە رەنگە بێ پلوتارك کە ناوی پێشەوای ئەوانی بەلیگ دامیس ناو بردوە لە روی سەرچاوەیەکی سەربەخۆی ترەوە[٣٣] لایـەنی دوایی داوەتە بـەر سـەرنج] • ئـەسترابون [ I ٣ ، ٢١]و کالیماخ[٣٤] دیسان لـە ناوی پیشـەوای ناوبراوەوە ئاگادار بون • نوسـراوەی دوایی کـە باسـمان کرد ئەنوسێ : کە ئەو نەیتوانی [ئەفس] و [گسیخیا] داگیر بکات[٣٥] •



**دو سواری کیمریەکان (؟)••نەخشی سەر تابوتێك**
**ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زاینی ، یان کەمێك کۆنتر**

سەرچاوەکانی رۆژ هـەڵاتی کۆن بـە شێوەیـەکی نا راستەوخۆ ئـەو

نوسینانەی سەرەوە ئەسەلمێنن ، جگە لە گومان کردن کە لە نوسینە هیرو گلیفیەکان [هیتی] ئارکمیش - ناوەراستی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی[٣٦] لە بارەی کیمریەکانەوە ئەبینین - راپورتی جاسوسە ئاشوریەکن لە ئورارتو - لە ساڵەکانی ٧٢٢ تا ٧٢٥ی پێش زاینی - کۆنترین ئاگاداری مان ئەدەنە دەست[٣٧] • ئەو جاسوسانە لە بارەی ئەو نوشوستییەوە کە بە سەر [روسای یەکەم] پادشای ئورارتوو لەشکرەکەیا هات کە شەڕی لەگەل کیشوەری گامریان دا ئەکرد ئەڵێن کیشوەری ناوبراو - بە پێی رون کردنەوەی راپورت دەرەکان - سەرزەمینی [ناگیو nagiu ] گوریانی [بە ئورارتویی = کوریانی] لە ئورارتو جیا ئەکردەوە ، وە لە سنورەکانی ژوروی رۆژئاوا بوو بە ناوچەی دەسەلاتی ئورارتو[٣٨] • رەنگ بێ سارگونی دووەم پادشای ئاشور لە شەڕی کیمریەکانا لە ساڵی ٧٠٥ی پێش زاینی کوژرا بێ[٣٩] • ئەگەر وا بێت لەگەل لەبەر چاو گرتنی چونیەتی ئەو رۆژگارەدا سنورەکانی بری دول - ئەم روداوە ئەبێ لە رۆژ هەلاتی ئاسیای بچوکدا رویدا بێ •

لە ساڵی ٦٧٩/٧٨ی پێش زاینی بە پێی مێژووی بابلیەکان کیمریەکان چونەتە ناو خاکی ئاشورەوە بەلام ئشوشپا[٤١] پادشای ئەوان لە لایەن [ئاسار خادون] پادشای ئاشورەوە شکا ، وە ئەم نوشوستییە لە ئاسیای بچوکدا رویدا[٤٢] • بەلام لە هەمان ساڵدا دێنەوە سەر کیمریەکان کە لە لەشکری ئاشوریەکانا وەکو کرێ گرتە خزمەتیان ئەکرد[٤٣] • لە دەوروبەری ساڵەکانی ٦٧٤-٦٧٦ی پێش زاینی بە پێی سەرچاوەی کۆن[٤٤] کە بە سەرچاوەی ئورارتویی دانراوە[٤٥] کیمریەکان دەوڵەتی فریجیەیان کە لە مەرکەزی ئاسیای بچوکدا بو تەفروتونا یان کرد ، [هەروەکو دەرکەوتوە بە هاوکاری ئورارتو] ، یەکێتی لە نێوان روسای دووەم پادشای ئورارتوو کیمریەکانو فەرمانفەرمایانی تر - چەندێك دوای روداوی سەرەوە پێك

هات‌و ئه‌مــه بوه هۆی نارەحه‌تی ئاشور • ئاشوریه‌كان زۆر ئـه‌ترسان كــه ئه‌وان [واتا ئورارتوییه‌كان‌و كیمریه‌كان] له شوێنی خۆیانه‌وه[٤٦] پــه‌لاماری ناوچه‌ی [شوباریو] له كێوه‌كانی ساسون بده‌ن كــه كه‌وتبوه به‌شی رۆژئاوای [ناور] وه كــه لــه ســاڵی ٦٧٣ی پێـش زاینـی دا كــه‌وتبوه ژێر ده‌ستی ئاشوریه‌كانه‌وه • لــه ساڵی ٦٦٠ی پێش زاینی لیدی [لـه رۆژئاوای ئاسیای بچوك]و تابال [له خواروی رۆژئاواوه] به‌رامبه‌ر به مه‌ترسی كیمریه‌كان چون به كۆمه‌ك ئاشوریه‌كانه‌وه • له نزیك ساڵی ٦٥٤ی پێش زاینی گوگو [گیگ] پادشای لیدی له شه‌ڕێكدا له‌گه‌ل كیمریه‌كانا كوژرا[٤٧] •

وه‌كو ئه‌بینرێ كیمریه‌كان له رۆژهه‌ڵاته‌وه رویشتوون بۆ رۆژ ئاوا ،به پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌وه كه ئه‌سترابون ئه‌ڵێ له رۆژئاواوه چون بۆ رۆژهه‌ڵات • شوێنی نیشته‌جێی سه‌ره‌تایی كیمریه‌كان لـه ئاسیادا لـه رۆژ هه‌ڵاتی ئاسیای بچوكدا بون‌و دوایی بۆ بـه‌شـه‌كانی ژوروی رۆژئاوای ئـه‌و ســه‌رزه‌مینه رویشتوون • گومانی لێ ئه‌كرێ كه كیمریه‌كان ماوه‌یه‌ك له ئاسیای بچوكدا فه‌رمان ره‌وایان كردبێ •• وه له دوای له‌ناو چونیان [وه‌كو دیمان] له ساڵی ٦٤٥ی پێش زاینیدا حكومه‌تی ئاسیای بچوك كه‌وته ده‌ست لیدیه‌كان •

ئه‌گه‌ر ئه‌و وته‌یه راست بێ كــه كیمریه‌كان لـه رێگای [ داریال ] و [ئالاگیر] چۆبن بۆ قه‌فقاز ، ئه‌وا له‌وه ئه‌چێ له رۆژهه‌ڵاتی ئاسیای بچوكدا له قه‌فقاز بنكه‌یه‌كی نیشته‌جێیان بو بێت •

ئیسته ئه‌م پرسیاره دێته پێشه‌وه : ئایا كیمریه‌كان چونـه‌ته ناوچـه‌كانی رۆژهه‌ڵاتی تر ؟••

گومان له شتێكدا ئه‌كه‌ین كه كیمریه‌كان لـه سه‌ده‌ی هـه‌شته‌می پێش زاینیدا له ئازربایجان نیشته‌جێ بون ؟ ئه‌مه لـه نوسراوێكدا ده‌ركه‌وتوه كـه پیاوێك به‌ناوی [ئاراد ـ سین] بـه ناونیشانی [منادی دولتی] یان [قسه‌كه‌ر]ی ئاشور[٤٨] له سه‌رده‌می شه‌ڕی كیمریه‌كانا له‌گــه‌ل ئورارتودا نوسیویه لــه

ساڵەکانی ٧٢٠ و٧١٤ی پێش زاینیدا •• لە نامەکەدا نوسیویە کـە پیشەوای کیمریەکان لـە ڕێگای سەرزەمینی [ماننا] وە چۆتـە ناو خاکی ئورارتووە ئەگەر وای دابنێین کە لەو سەردەمەدا کیمریەکان هێشتا لە قەفقازدا بنکەیەکی مەحکەمیان هەبو بێت ـ ئەوە ئەگونجێ بەم جۆرە پەلاماریان دابێت •• بەلاّم لە هەمان کاتا بەشی فەوتاوی ئەم نامەیە کـە ئێمە وشەی [مانّا] مان لـە جێ داناوە ئەتوانین بە جۆرێکی تر لێکی بدەینەوە •

لەبارەی نیشتەجێ بوونی کیمریەکانەوە لـە ئازربایجان [لـە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا دوایی قسەی لێوە ئەکەین • ئیستە پێویستە ئەم وتەیە ڕون بکەینەوە : ئایا لەو سەردەمانەدا کە نوسراوە کۆنەکانی ڕۆژهەلاّت لـە بارەی [گامیر] و [گومر] و [گیمی ری] و [گیمی رای] یەوە ئەدوێ ئایا باسی کیمریەکانیش ئەکات یان نە؟

پێشەکی ئەتوانین بڵێین : ڕەنگ بێ ئاشوریەکان کـەمتر باسـی ناوی ناوچەکەو فلاّن و فیساریان کردبێ ، ئەوە ئەزانین کە لـە سەدەکانا وە تاکو سەدەی نوزدەهەمی زاینی کـە لـە سـەردەمی ئێمـەوە نزیکـە ناوی هۆزو ڕەگەزە جۆربەجۆرەکان تێکەڵـە • [هەروەکو هۆزەکانی ئاسیای ناوەڕاستو قەفقاز] وە تەنانەت لەگەل هۆزو نەتەوەکانی تر کە لە یەکترەوە دور بون • لەم بارەیەوە نمونەی زۆر هەیە بیان هێنینەوە وە هەمو ئاگاداری ئەوەن ،لەبەر ئەمـە بەڵگەیەکمان نیـە کـە بڵێین ئاشوریـەکان لـە بارەی دیاری کردنو لێکدانەوەی نژادو زمانی هۆزەکانەوە وردبین تر بون ، ئەگەرچی لـە زمانی ئاکدی بو [خەڵکەکانی ژورو] ـ بـە زمانی ڕەوان ـ یەك وشـەیان بـەکار هێناوە واتا [ئومان ـ ماندا] ـ هۆز یان لەشکریەکانی ماندا ـ(٤٩) بەلاّم وەکو دەرئەکەوێ لە گفتوگوی سەرپێیدا وشەی [کیمریان] ئەویش هەمان مانای گشتی ئەگەیەنێت • هەرچۆن بێ لـە شێوەی زمانی بابلیەکان بـەم جۆرە بووە • ئەوەی پشتگیری لەم باسەمان ئەکات باسی بابلیەکانە کە لە نوسینەکانی

هەخامەنشیدا لەسەر بەرد نوسراوە[٥٠] کە زاراوەی [ گیمی‌ری ] لەو نوسینەدا بە شێوەی گشتی بۆ هەمو بیابان نشینەکان‌و ئەسکیت‌و سکایبەکانی ئسیای ناوەراست بەکار هێنراوە • بەم جۆرە هیچ شتێکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نیە کە نوسراوەی ئاشوری‌و بابلی بە ڕونیشانی [کیمریەکان] ناوی [ ترری ]و ئەسکیتەکانی ناونەبردبێ ، وە ئەوانەی بە ناوێکەوە ناو نەنابێ کە بۆ ئاشوریەکن بابلیەکان ئاسان‌و ئاشکرا بوبێت • هەروەکو بارسەکان هەمو بیابان نشینەکانیان بە ناوی [سکایبەکانەوە] کە لە گوێی ئەوانا ئاسان تر بووە ناو ئەبرد • وە یۆنانیەکان هەمویان بە هۆزە چادر نشینەکانیان یان ڕەشماڵ نشینەکانیان ئەوت [ئەسکیت] •

لەگەل ئەوەشدا ئاشوریەکان‌و بابلیەکان مانای وشەی [کیمری]یان بەکار هێناوە • لە سەرەتاوە [کیمریەکان] ئەوانە هۆزێك بون وە تەنانەت ئەمە [ناوێك] بووە کە ئەو هۆزانەی پەلاماری ئاسیایان ئەدا ئەم ناوەیان لە خۆیان ئەنا • چونکە ئەم هۆزە لەوەو بەر لە لای ئاشوریەکان دەرکەوتو نەبون ، نابێت بە ناوێکی تردوە ـ جگە لەوە کە خۆیان بە خۆیانیان ئەوت ـ وە یان دراوسێکانیان بەو ناوەوە ناو یان ئەنا ـ ناوێکی تریان هەبایە • بەم هۆیەوە زاراوەی کیمریەکان ناوی هۆزێك یان کۆمەڵێکی بچوکی هۆزێك بووە کە لە واقیعدا هەبون‌و بیابان نشین بون وە لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینی دا پەلاماری ئاسیای نزیکیان داوە • وەکو لێکدراوەتەوە ئەڵێن شوێنی سەرەتاییان نیمچە دورگەی تامان یان ناوچەکانی رۆژ ئاوای قەفقازی ژورو بوە • لەبەر ئەمە ئەگەر ئەم زاراوەیە بۆ هەمو دانیشتوانی سەردەمی بەر لە ئەسکیتەکان‌و سەرزەمینەکانی کەناری دەریای رەش بەکار بێنین ئەوا هەڵەیە • بە تایبەتی کە ئەو ئەسکیتانەی لە دوای کیمریەکان پەلاماری ئاسیایان دا بە پێی بیروڕای کۆنە شوناسان ئەوانە هۆزێك بون بەر لە [ ئەسکیتەکان ] بون[٥١] •

ئەگەرچی وەکو باس ئەکرێ ئەسکیتەکان رەگەزێك یان دوان لە دوای کیمریەکان لە ئاسیادا پەیدا بون ، بەڵام بەم جۆرە ئەتوانین بەهاو چەرخی یەکتر دای بنێین • ئەگەر بە پێی بیروورای کۆنە شوناسان کیمریەکان بە بەر لە [ئەسکیت] دابنێین ، ئەم وتەیە لە بارەی کیمریەکانەوە راست دەر ئەچێ ، ئەگەر ئەو ئەسکیتانەی پەلاماری ئاسیایان دا بە پێی بیروورای کۆنە شوناسان بە [ئەسکیت] یان بزانین ئەوا ئەبێ کیمریەکانیش هەر لەو تایەفەیە دابنێین • ئەبێ ئەوەمان لە بەرچو بێ کە کیمریەکان [واتا هۆزێکی بیابان نشین] زۆر لەناو هۆزە ئاسیاییەکانا نەژیان وە بەزویی لەناو چون ، هاتنە روی کتوپری ئەوانو لەناو چونیان لە بیری خەڵکی ئەو سەردەمەدا هەر مایەوە • گرجیەکان سەردەمی کۆنی پاڵەوانان بە سەردەمی ئەفسانەیی [گیمری] ناو ئەبەن[٥٢] لەوە ئەچێ کۆمەڵێك لە هۆزە سکاییەکان ئەوانیش بەو جۆرە بون • [ئەسکیتەکان ـ بەم هۆیەوە ـ گۆڕستانەکانی [پادشایانی کیمری] یان لە کەناری روباری [دنیپر] نیشان هرودوت داوە • لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتدا ئەگەر لە خەڵکی ناوچەکە پرسیار بکەی شوێنەوارەکان بەهینی [مغ]ەکان یان [ئەسکەندەر] ئەدەنە قەڵەم ، وە لەوە ئەچێ ئەسکەندەر بەو ناوچەیەشدا هەر تێپەڕ نەبووبێ •• لەبەر ئەوە ناتوانین پشت بەم وتانە ببەستین •

لەبارەی چارەسەر کردنی گیرو گرفتی لەیەك نەچون یان لە یەك چونی نژادی کیمریەکانو ئەسکیتەکان مەسەلەی زمانیان ئەهمیەتێکی تەواوی هەیە، چونکە لە بارەی زمانی ئەسکیتەکانەوە سەرنجێکی روناکمان هەیە •• بەڵام بە داخەوە بۆ داکۆکی کردن لەسەر زمانی کیمریەکان ئێمە تەنیا سێ ناومان بە بەڵگە بەدەستەوەیە[٥٣] کە ئەم سێ ناوە لەوانەوە بەجێماوون : [تئوشپا ، توگدامی ، ـ بەیونانی لوگدامیس ـ وە سانداك شاترو] ، کە ئەتوانین [سانداکورو] شی پێ بڵێین[٥٤] •

ئەگەر ئەم بیروورایە کە [تئوشپا] بە هەمان [تئیسپ - چیش پیش]ی کورشی پارسی دابنێین [تاکو ئاکاد میسینو • وە ئاسترەوە - بە پێی ئەم بیروورایە [کیمریەکان] کە لە سەرچاوە ئاشوریەکانا باسی کراوە بە نیاکانی پارسیان دائەنا][٥٥] ئا لەو کاتەدا ئێرانی کیمریەکان ئەسەلمێ • بەڵام هەروەکو لەمەوبەر وتراوە ناتوانین ئەم بیروورایە وەر بگرین[٥٦] •

لەبارەی دووەمین ناوی کیمری یەوە واتا [ توگدامی ][٥٧] ئەمیش سەرچاوەیەکی روناکی نیە • چونکە ئەمە هێشتا باش دیار نیە کە بۆچی [توگدامی] بە زمانی یونانی بوە بە [لوگدامیس][٥٨] ئەم بیروورایە لە راستەوە نزیکە چونکە ئەمە ناوێکی ئاسیای بچوکە •

ئەگەر وشەی [سانداك شاترو] مان بە باشی خوێندبێتەوە لە سەرچاوەو پەیوەندی زمانەوە هیچ گومانێکی تیا نامێنێتەوە ، کە رەگەزی [کشاتر][٥٩] بەو جۆرە دیاری کراوە کە ماوەی باسکردنی لێوە نیە • ئەمە هەمان وشەی ئێرانی [خشاتر] بە مانا [حکومەتەو دەسەڵات] [تیول] ، [ناودی]یە • کە زۆرجار لە زمانە ئێرانیەکانا وە بە تایبەتی لە ناوا توشی دێین ، وە بە هیچ جۆرێك لە زمانەکانی غەیری هندو ئەوروپاییدا ئەم وشەیە نیە[٦٠] ، ئەم وشەیە لە نوسراوەکانی ئاسیای بچوکدا زۆرجار هاتوە ، وشەی [ساند]و [ساندا] لە نوسراوەکانی ئاسیای بچوکدا بە رونیو ئاشکراو دیارە • بەو مانایە کە ئەو ناوانە لە ناوی خوای ئاسیای بچوك کە [ساندون] بوە وە لە کیلیکیەو ناوچەکانی تری ئەو سەرزەمینە چەند ماوەیەك پەرستویانە لەوەوە وەرگیراوە • لە سەردەمی کۆنا وایان ئەزانی کە هەر خوایەك پارێزگاری کۆمەڵو شوێنی خۆی ئەکات •• کاتێك یەکێك بچوبایە بۆ کیشوەرێکی بێگانە ئەبوا قوربانی بۆ خواکەی بکردایە ، بە پێی ئەم بیروورایەی سەرەوە رەنگ بێ کیمریەکان لە دوای ئەوە هاتنە ئاسیای بچوکەوەو خواکانی ئەوێیان پەرستبێ • وە لەبەر ئەمەیە ناوی [سانداکشترو] یان رەواتر بڵێین

[ساندا خشترا] یان به [دەسەڵاتی خوای ساندون] لێك داوەتەوە ، وە ئەم جۆرە ناوانە بە تەواوی لەگەل ناوەکانی وەکو [ئارتاخش] بەمانا [حکومەتی خوای ئارتا] ـ خوای داد ـ [ئارتا کزرکس ـ ئاردەشێر] وە ناوە ئەسکیتیەکان [ئالکسارتوس] بە مانا [حکومەتی فرە پێشەوا] وە لەگەل زۆری ترا لە یەکتر ئەچن(٦١) •

ئەگەر باوەڕ بەو بیروڕایانەی سەرەوە بکەین ئەوا ئەتوانین کیمریەکان لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا بە هۆزێکی ئێرانی زمان دابنێین کە لە بارەی شارستانێتی و فەرهەنگەوە زۆر لەگەل هۆزەکانی ئاسیای بچوکدا تێکەڵ بوون • ئەمە ئەتوانێ ئەوە بسەلمێنێ کە کیمریەکان کۆمەڵێکی گەورەی هۆزەکان بون کە دانشمەندەکان بە [ئەسکیت] ناویان بردوون ، وە ئەوە رون ئەکاتەوە کە وشەی [کیمریەکان] بە دانیشتوانی غەیرە ئەسکیت وە یان [پێش ئەسکیتەکان] لە ناوچەی کەناری ژوروی دەریای رەشەوە نەوتراوەو نەبوە(٦٢) • هەرچون بێ بەڵگەمان بە دەستەوە نیە کە کیمریەکانی ئاسیای نزیك بە [فراکی] بزانین • ئەگەرچی زمانیان لەگەل [فراکیەکانا] لەیەك ئەچو(٦٣) •

بە داخەوە ئەبێ ئەوە بڵێین کە ئەو شتەی رونی ئەکەینەوە کەمو زۆر بە پێی سەرچاوەی باوەڕ پێکراو وەرگیراوەو رون کراوەتەوە •

ئیستا ئەوەندە بەسە کە بڵێین پەلاماری کیمریەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا بووە ، وە لە کەناری خاکی مادەوە تیپەڕین • ئەگەرچی وتراوە کە ئەوان لە سەر رێگای [ئورارتو] لە کاتی پەلاماردانا چونەتە ناو خاکی [مانا]وە ، بەڵام ئەمە گومانی لێ ئەکرێ •

## ٢ ـ ئەسکیتەکان لە ئاسیای نزیك دا

دوا بەدوای پەلاماری کیمریەکان ئەوەندەی پێ نەچوو ـ کە بە وتەی

هرودوت [ گەرچی ئەو وا تێ گــە ئەسکیتەکان بــەدوای کیمریەکانا بون ] I ، ١٠٣ ، IV ، ١ـ٤ ، ١٣ ، ١١] ئەسکیتەکان چونە ناو ئاسیای نزیکەوە [مقدم] ، ســەرچاوە رۆژهەڵاتیەکان ئەمانــەیان بــە [ئاشگوزایی] یان [ئاشگوزا]یی وە یان [ئیشکوزا]یی ناو ئەبرد •

با پێ لەوە بنێین کــە باسکردنی ئەسکیتەکان ــ بەو مانایــەی کــە لــە سەرچاوە کۆنەکان‌و کۆنە شوناسەکانا هاتوەو ئێمە ئەیزانین ــ بەو جۆرە نیە • واتا بە شێوەی گشتی مەبەست لەو بیابان نشینانەی کە بە زمانی ئێرانی دواون‌و لە ناوچەکانی کــەناری ژوروی دەریای رەش‌و ژوروی قــەفقازدا ئــەژیان‌و خاوەنی فەرهەنگ‌و شارستانیەتێکی مادی بون ، ئــەوە نیــە • [ئەسکیتەکان] ناوێکی یەکگرتو بو کــە یۆنانیەکان هــەمو هۆزە ناوبراوەکانیان بەو ناوە ناو ئەبرد • تا ئەو کاتەی یۆنانیەکان ئەیان زانی ئەم هۆزانە خۆیان بە [ئەسکیت] نە ئەزانی • بە پێچەوانەوە لەوە ئەچێ ئەو هۆزەی کە پەلاماری بردە ســەر ئاسیای نزیك خۆیان بە [ئاشکیدا] ناو ئەبرد • وە ئەمــە بــە شێوەی زمــانی یونانیەکان‌و لەسەر زمانی ئەوان بوو بە ئەسکی تائی] • لەبەر ئەمە لەوە ئەچێ کە ناوی ئەو هۆزە یان لە هۆزەکانی تر نابێت وەکو زاراوەی [ئەسکیت] [بــە مانای کۆن‌و کۆنەشوناسی] • لە سەرەتای سەدەی حەوتەم هۆزی [ئەسکیتەکان ــ ئیشکوزا] لەبەر بیروڕای کۆنە شوناسەکانا ئەبوا وەکو هۆزی [کیمریەکان] بەر لە [ئەسکیت] بوایە •

ئیستە چــەند وتەیەك دەربارەی ســەر هەڵدانی زاراوەی [ئەسکیت] بــە بیروڕای زوربە شێوەی رەسەنی ئەم وشەیە [ئەشکی‌دا] بووە[٦٤] • چونکــە پیتی دەنگداری [ئا] a وە یان [ئای] i ، کە لە سەرەتای شێوەکانی رۆژهەڵاتا ئەم وشەیە هەبوە [ئاشوری = ئاشگوزا ــ ی یان ئاسگوزایی ؛ بابلی ئیشکوزای ، کیشوەری ئیشکوزا ، عیبری کۆن «ئاشگوز» بە هــەڵە وە شکنز نوسراوە] • بە پێی ڕێزمانی دەنگ‌و فونەتیکی زمانی سامی لــە ســەرەتاوە

وشەکە راوەستاوە[٦٥] • بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە لە سەدەی حەوتەمو شەشەمی پێش زاینیدا زمانی یۆنانی نەك تەنیا پیتی dh یان بەڵکو پشیان نەبوە ، وە بەم هۆیەوە [ Th ] [تتا teta ] یان بەکار هێناوە[٦٦] •

بە پێی ئەو باسو سەرچاوانەی سەرەوە بە تەواوی دەر ئەکەوێ ئەو بیروڕایەی کە ئەڵێ زاراوەی [ئەسکی تش] لە [سك یا سکا] وە هاتوە راست نیە • [وس• میللر] لایەنگری ئەم بیروڕایەیە[٦٧] ئەسکیت بە کۆ کردنەوەی [سك] [سکاکان]و پیتی [ت] یش بە نیشانەی کۆ کردنەوە دائەنێ •• بەڵام بیروڕای [ن• یا• مار] ئەویش کەمتر لە میللر نیە • وە جێگای سەرسوڕمانە کە پیاوێکی وەکو [و•ای• ئابایف] کە زۆر شارەزای زمانە ئێرانیەکانە ئەویش لە سەر بیروڕای [مار]ە • [ن•یا•مار وە و• ای• ئابایف] زاراوەی [ئەسکیت] بە [ئەسکو ـ ل ـتا] بە کۆ کردنەوەی ناوی هۆزو نژادی ئەسکیل ـ ئەسکول ئەزانن • وە سەرچاوەی ناوی ئەسکیتەکان بە واتای [ئەسکولوتەکان] دا ئەنێن[٦٨] •

ناوی هۆزی [ئەشکیتا] [ئەسکیت] هەروەکو ناوی گەلێك هۆزی تر تا بیستە رون نەبۆتەوە ، تەنیا یەك وتە هەیە کە ئەبێت ئەوە لە زاراوەی [ سکا ـ saka ]وە هاتبێ بزانین ، خوێشایەتی نێوان سکایەکانو ئەسکیتەکان هەرچۆن بێ وشەی [ئەسکیت] لە بارەی زمان شوناسیەوە بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە [سکا]وە نیە[٦٩] •

بە بیروڕای ئێمە [شکودا] ناوی هۆزێکی ئێرانی زمان بووە ، ـ کە لە روی شوێنەواری کۆنە شوناسیەوە [بەر لە ئەسکیت] دانراوە ـ وە لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا لە قەفقازی ژورودا ئەژیان وە قەفقازی خواروشیان هێناوەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە • لە دوایدا یۆنانیەکان بە شێوەی گشتی هەمو بیابان نشینەکانی ژورویان بەناوی ئەو هۆزەوە ناو ئەبرد • وەکو

ئەسکیتەکان ، کیمریە بیابان نشینەکان ــ کە لای یۆنانیەکان ناسرابون ــ لــە ئاسیای بچوك شکانو رایان کرد ، یۆنانیەکان چونکە لەوە پێش کیمریەکانیان بەهەمو دانیشتوانی بیابان نشینو کــەناری دەریای رەش ئەزانی ــ ئەفسانەیەك لە بارەی دوژمنایەتی کۆنی ئــەسکیتەکانو کیمریەکان پــەیدا بو ، ئــەیان وت دەرکەوتنی کیمریەکان لە ئاسیادا لــە ئەنجامی شوێن کەوتنو زۆر بۆ هینانی ئەسکیتەکان بوە • بەم جۆرە یۆنانیەکان هــەر ئــەو بیابان نشینانەی کــە لە دواییدا لە ناوچەکانی کەناری ژوروی دەریای رەشەوە ژیاوون پێیان وتوون [ئەسکیت] • هەروەکو ئاشکرایە [وە ئێمەش ئەزانین] هیچ هۆزێکی [ئەسکیت] کەناری دەریای رەش خۆیان بە [ئەسکیت] ناو نەئەبرد[٧٠] •

وەکو دێتە بەرچاو ئەگەر لــە ســەر ئەوە بڕۆین کە [ئەسکیتەکان] یان [شکیدا] هــەروەکو ئوخاتەکان وترا پیانو پارالاتیان وە یان ساورماتیان لــەو هۆزانەی کە پێیان ئەوتن [ئەسکیت] لەوانە بوبن [وە لــە دواییدا بــە پێی بیرورای کۆنە شوناسان بون بە ــ ئەسکیت ــ] •••ئەگەر گوێ بــەم وتــەیە بدەین ئەوا گەلێك کەمو کورتیو ناکوکیو لەیەك نەچون [تناقضات] لە نیوان وتەکانی هرودوتو نوسەرە کۆنەکانی ترا کە هەیە لا ئەبرێن •

یەکەم بەپێی وتەی هرودوت کــە ئەسکیتەکان لــە ئاسیای ناوەراستەوە هاتوون[٧١] لەگەل ئەوەدا کە ئەسکیتەکانو ئەسکولوتەکان خۆیان باسی ئەکەن ئەوانە خۆیان بە دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکانی ژوروی کەناری دەریای رەش دائەنێن ، ئەمانە وەکو یەك دەر ئەچن[٧٢] •

لە واقیعدا هەندێك لەو هۆزانەی کە پێیان ئەوتن [ئەسکیت] رەنگ بێ لە زەویو زاری ئوکراینی ئیستادا ژیابن • وە هــەندێك لــە ئەسکیتەکانی تر [ئانشکیدا] لەوە ئەچێ لەناو هۆزەکانی ترا [هەروەکو هرودوت ئەڵێ] دەرکەوتو بن • ئەو ئەنوسێ : [ئەسکیتەکان بیابان نشین بون ، لــە سەرەتاوە لــە ئاسیادا ئەژیان ، لە دواییدا لە کاتی جەنگدا لەگەل «ماساگتیەکان» توشی زەبرو زەنگ

بون ، لــه روباری [ ئاراکس ]ەوە رویشتوونو چــونــەتــە ســەرزەمینــی کیمریەکانەوە(٧٣) لێرەدا مــەبــەســت لــە نوسینی [ ئاراکس ] هــەمــان [ولـگا]یە ــ Ranha ـی ئاویستا ، Raha ـی ئـەسکیتی ، وە دواجار Rha ـی یۆنانی](٧٤) • ئەم نوسینە باسێکی تر ئەسەلمێنێ بەو مانایە کە لە دواییدا لەئالبان [ئازربایجانی ژورو] ماساگیتەکان هەبون ، وە رەنگ بێ دوابە دوای ئەسکیتەکان هاتبنە ئەو ناوچەیەوە •

دوای ئەوە ئەسکیتەکان بــە پێی وتەی هرودوت [کە زۆر لەوە ئەچێ راست بێ] [ I ، ١٠٦-١٠٣] لە رێگای دەربەندەوە چون بۆ قەفقاز ، [لــە کاتێکدا کــە کێوی قەفقاز کــەوتبوە لای راستی ئەوانەوە] ، دوایی هرودوت ئەڵێ : [لەم ناوچەیەدا ــ واتا دوای ئەوە کە لە چیای ئەسڵی قەفقاز تێ پەڕین وە یان بە وتەیەکی تر لە ناوچەیەك لە زەویو زاری ئازربایجانی شورەوی ــ دانەر ــ مادەکان لەگەل ئەسکیتەکان کــەوتنــە شــەڕەوە بــەڵام شــکان وە فەرمانفــەرمایی ئاسیایان دۆڕاند ، ســەڵتــەنەتــەکــەیان کــەوتــە دەســـت ئەسکیتەکان [ I ، ١٠٤ ] •

بــەڵام هرودوت هــەروەکو پیشــەی خۆیــەتی لێرەدا روداوەکانی بــە شێوەیەکی ئاڵۆز باس کردوە ، لێکدانی نێوان مادەکانو ئەسکیتەکان [بە پێی وتەی هرودوت ٧٥ ساڵ یان ١٠٣ ساڵ(٧٥) پێش لە سەرکەوتنی کۆرش بــە سەر ئاستیاگ دا ــ واتا لــە ســاڵی ٦٢٥ یان ٦٥٣ی پێش زاینی بوە] چــەن رۆژگارێك بەر لەوان لە ئاسیای نزیکدا [مقدم] رویداوە • یەکەمین جار کــە سەرچاوەی ئاشوری باسی ئەسکیتەکان ــ ئاشکوزا [ئاشکیدا] ئەکات ،لەسەردەمی سەڵتەنەتی [ ئاسار خادون ] ــ یان وردتر بڵێین ــ لە ساڵی ٧٠ی ز سەدەی حەوتــەمی پێــش زاینیــە • لەو ســەردەمــەدا ئــەسکیتەکان بــەرابەرایــەتی [ئیشپاکای](٧٦) لەگەل [مانئا] دا لەدژی ئاشور یە کیەتیان بەست(٧٧) •

هەمو سەرچاوە رۆژهەڵاتیەکان ئەسکیتەکانی ئاشکیدا بــە [ مانئا ]وە تا

ڕادەیەك بە [ماد] دا ئەنێن • بەڵام بە شێوەی گشتی ئەو سەرچاوانە زۆر کەم باسی ئەسکیتەکانیان کردوە • جگە لەناوی [ ئیشپاکای ] ئـەسکیت کـە لـە ساڵنامەکانی [ئاسار خادون]دا هاتوە چەند جارێك دیسان لەو پرسیارانەی کـە شـای ناوبراو لـە خوداوەندی شـاماشی کردوە ناوی ئـەوانی بردوە • لـە پرسیارێکدا وتویە : ئەو ئەسکیتانەی کە چونە ناو خاکی ماناوە چ نیازێکیان هەیە ؟[٧٨] لە چەند پرسیارێکی ترا دیسان ـ بە بونەی ڕاپەڕینو بەرپا بونی گەورەی مادەکانەوە کە مانایەکانو کیمریەکانیش هاوبەشیان تیا کرد ـ ناوی ئەسکیتەکان براوە[٧٩] وە لە ئەنجامدا پرسیارێك دەربارەی دوا ڕۆژی یەکیتی لەگەل [پارتاتوا] پادشای کیشوەری [ئیشکوزا] کـە ناوچەی ئـەو ئاشکرا نیە کراوە ، وەکو ئـەڵێن ئاشوریـەکان سـەرۆکی ئـەسـکیتەکانیان بـە پادشـا ناو ئەبرد •

• •

پادشایی [ ئاشکوز ] ـ یان پادشایی ئاشـکناز ـ[٨٠] لـە سـەرچاوە عیبریەکاندا وە بە تایبەتی [کتیبی پیغەمبەر ئارمیاء] وە لە پارچە نوسراوێکیشدا کە بە بەرواری ٥٩٣ی پێش زاینی نوسراوە[٨١] ناوی براوە ، وە هەر وەهـا لە بەرامبـەر ئورارتوو ماناوە ـ ئـەو سـەرچاوە ڕۆژ هەڵاتیانـە باسی ئـەو پادشاییانە ئەکەن کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا بووە • ئـەم مێژووە هی زاراوەی [ناوەڕوکی هۆزەکان] ـ یان بەرنامـەی ناوەکانی دوای نوح ـ بوە • [کە یەهودیەکان ئـەو چـەرخە ئـەویان بـە ناوەڕۆکی ڕەسەنی هۆزە جۆربەجۆرەکان ئەزانی ـ کە لە دواییدا بە [ڕێڕەوی کاهنەکان ناو ئەبرا • [لە سەدەی پێنجـەمی پێش زاینی دا] ئاشکوز [ئاشکناز] لەگـەل [ریفات] و [توهارما] ـ ئەرمەنستانی بچوك ـ بە ناو نیشانی [کوڕەکانی] گومر واتا کیمریەکان ناوی براوە •

ئەسکیتەکانی [شکودا] لە شوێنەواری ڕۆژهەڵاتا بەم جۆرەیە ؟ ئەگـەر چاو پوشی لەود بکەین کە هەندێك جار ئەسکیتەکان بـە ناوی کیمریەکان وە

یان [ئومان ــ ماندا] ناو براون وەكو دیمان سەرچاوە عیبریە كۆنەكان [ئاشكوزا] یان بە كیمری داناوە[٨٢] • لە بیروورای رۆژ هەلاّت زەمینا لە سەدەكانی حەوتەم تاكو پێنجەمی پێش زاینی ئەسكیتەكانی [شكودا] یەكێك بون لە هۆزە كیمریەكان •

هەندێك دۆزراوەی كۆنە شوناسی وە بە تایبەتی ئەو هەلّكەندراوانەی كە لە [ كارمیر ــ بلور ] لە نزیكی یریڤانو [ كاركمیش ] لە كەناری ناوچەی فورات ــ لە لاژووروی سوریە ــ وە لە فەلەستین ژورووی میسر دۆزراونەتەوە ، وە بە تایبەتی ئەو گەنجینەیەی كە لە [زیوە]ی نزیك سەقز خواروی دەریاچەی ورمێو زەویو زاری [مانا]ی پێشو دەست كەوتوە ، وە گەلێك نەختینەی گرانبەهای ئاشوری یان ئاشوریو ئورارتوییی مانناییە • هەندێك لە لێكۆلەرەوەكان ئەلێن گەلێك كاروباری هونەری ئەسكیتەكان لە ئاسیای نزیكدا [مقدم] بووە • ئەمانە هەمویان بەلگەی ئەوەن كە ئەسكیتەكان لە ئاسیای نزیكدا بون[٨٣] • ئێمە بە تایبەتی ئەو ناوچانەی كە سەرەتیری ئەسكیتەكانی تیا دۆزراوەتەوە دیاری ناكەین •

ئەم سەرچاوانەی سەرەوە هەندێ لە لێكۆلەرەوەكانیان خستۆتە سەر ئەو بیرورایە كەوا بزانن لە ئاسیای نزیكدا مەركەزی ئەسكیتەكان ــ تەنانەت لە سەردەمی [ئاسار خادون] ناوچەی مانا بووە ، وە ئەوان لەوێوە پەلاماری كیشوەرەكانی تریان داوە • هەروەكو هرودوت ئەلێ [ I ، ١٠٥ ] وە لێكۆلینەوە كۆنە شوناسیەكان لایەنگیری ئەكەن ــ تاكو میسر ئەرویشتن[٨٤] •

بەلاّم سەرچاوە كۆنەكان هەرچۆن بەراورد بكرێنو لێك بدرێنەوە دان بەوەدا نانێن كە ئەسكیتەكان لە سالّی ٧٠ ــزــ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا ماننایان بە بەشێكی خۆیان دانابێ • چونكە مانا لەو سەردەمەدا وە لە دوای ئەوەش ــ هەروەكو دەر ئەكەوێ ــ هەروەكو بوو پادشاییەكی گەورەو سەربەخۆ بووە ، تەنانەت سنورەكانیشی فراوان كردبو • دۆزینەوەی

گەنجینەکەی نزیك سەقز ئەویش ئەوە ناسەلمێنێ کە مەرکەزی ئەسکیتەکان لە خاکی مانادا بو بێت • چونکـە هیچ بـەڵگەیەك بـەدەستەوە نیـە کـە ئـەو کەلوپەلانەی باسکراون ئـەسکیتەکان بـە تالآنی لە ئورارتوو ئاشورو مانایان سەندبێ‌و تالآنیان کردبن‌و لەوێدا مابنەوە ، وە بە پێچەوانەوە مانناییەکان لـە ئاشورو ئورارتو ئەسکیتەکانیان نەسەندبێ‌و نەیان شاردبێتەوە[(٨٥)] • چونکـە هەندێك لەو کەلوپەلە شاردراوانە ـ لەگەل ئەوەدا تا رادەیەك گۆیا بـە هینی ئەسکیتە کۆچەرەکانیان دائەنێن ـ بەڵام مێژووی ئەوانە چەندێك بەر لە پەیدا بوونی کیمری‌و ئەسکیتەکانە لە ئاسیای نزیك [مقدم] دا • بەم هۆیەوە ئەبێ لەگەل ئەوەدا هاو بیروڕابین کە [ ئاندرەگدار ] لەو کەلوپەلانە کۆڵاوەتەوەو باسەکەیانی بلآو کردۆتەوە ، کە ئەڵێ سەرچاوەی دروست بونی زوربەی ئەم کەلوپەلە دروست کراوانەی ناوچەی سەقز هەر ناوچەی سەقز خۆیەتی •

گودار گەلێك بیروڕای فراوان دێنێتەوە کـە ئـەو کەلوپەلە ناوبراوانە شوێنەواری هونـەری دانیشتوانی رەسەنی ئازربایجان‌و کێوەکانی زاگروسن وە بـە تایبەتی سەرزەمینی [ مانا ] وە ئەوەی کـە پێیان وتون [ ئەسکیتە کۆچەرەکان] ئەوانیش سـەرچاوەکانیان مادو مانایە وە لـە سەردەمی بونی ئەسکیتەکانا لـە ئاسیای نزیك دا پـەیدا بوە • بـەڵام تەنانـەت ئەگـەر ئـەو کەلوپەلانە هینی ئەو ئەسکیتانە بێ کـە ماوەیەکی کـەم لـە ماننادا نیشتەجێ بون [نیشتە جێ بونی کاتی ئەوان لەو شوێنەدا راستیەکە بـە هۆی سـەنەدو بەڵگەی مێژوویـەوە سەلمێندراوە] ••دیسان ناتوانین بـەو جـۆرە بڵێین کـە ئەسکیتەکان مانایان داگیرکردوە ، وە پادشایی ئەسکیتەکان هەمان خاکی مانا بووە • نوسراوەکانی [کتیبی پێغەمبەر ئارمیاء] کە باسی پادشایی ئەسکیت ـجگە لە مانا ـ ئەکات لەگەل ئەم بەراورد کردنەدا جیاوازی هـەیە • لـە واقیع دا ئەسکیتەکان رەنگ بێ ـ هەندێك جـار وەکو دوستو هـەندێك جـار وەکو دوژمن ـ لە ماننادا نیشتەجێ بوبن •

بەڵام لەبەر ئەوە [پادشایی ئەسکیتەکان] ئەبێ لە دەورو بەری ماد وە بـە تایبەتی مانتا دیاری بکەین ئەمە هیچ گومانی تیا نامێنیتەوە •هەندێك سەرچاوەمان بە دەستەوەیە کە لە کۆتایی سەدەی شەشەمو سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زاینی ئەو زەوی‌و زارانەی کە ئەسکیتەکانی تیا نیشتەجێ بون بەشێك بووە لـە ساترابی ماد •



**نیگارێکی هەڵکەندراوی سکاییەکان لە ئەستێلك (پرسپولیس)**
**سەدەی پێنجەمی پێش زاینی**

هرودوت ئەڵی : لـە سـاترابی ناوبراو مـادەکانو [ پریکانیـەکان ]و [ئورتو ـ کوریبانتیەکان] ئەژیان • زاراوەی دوایی تەرجومەی وشەی پارسی کون [تیگرا خئودا] یان [تیزخودان]ە ، کە بە یەکێک لـە کۆمەڵەکانی سکای ئاسیای ناوەراستیان ئەوت(٨٦) • ئەگەر بەم جۆرە بڵێین کە ناوەرۆکی ساتراپ نشینەکان ـ هەروەکو هرودوت بـاسی کردوە وە لـە [ هکاتە میلتی ] وەری گرتوە ـ جگە لە مشتێك نامەو نوسراوەی هۆزەکان کـە بە بێ سەرو شوێن نوسراوانەتەوە شتێکی تر نیە ••• ئەوا بە هەڵە رویشتون •وە [یونگە] ئـەڵێ تیزخودان لە قەڵەمرەوی ساتراپ نشینی ماد نەبوە • ئێمە جارێکی تر ناچارین لەم باسەوە بدوێین • یونگە دیسان ئەڵێ : گۆیا یەکێك لە کۆمەڵە سکاییەکانی

ئاسیای ناوەراست کلاوی نوك باریکیان لە سەرا بووە ، دیسان ئەو بەم جۆرە باسە کە ئەگێڕنەوە ئەڵێ وێنەی سوارە کلاو باریکەکان کە لـە سـەر روی دەفری یۆنانیەکان کە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی نەقش کراوە(٨٧) ئەوانە هینی سکایەکانی ئاسیای ناوەڕاستن • وە هـەروەها لـەو زەمینە کۆنـەدا یۆنانیەکان لەگەل سیمای هۆزەکانی ئاسیای ناوەراستدا ئاشنایەتیان نەبووە ، وە ئەو وێنانە هینی کیمزیو ئەسکیتەکانی [ئاشگید]ە • گەلێك وێنەی ئەسکیتە ئەوروپاییەکان [هەروەکو بۆ نمونە وێنەی دەفرە بەناوبانگەکەی «کولاب» کـە لە مۆزەخانەی ئەرمیتاج دا هەیە] تەنانەت لەو وێنە یەدا ئاسکولوتەکان بە کلاوی باریك‌و بڵندەوە دیارن کە هیچ جیاوازیەکی لەگـەل کلاوی سکاییەکاندا کـە نەخش کراوە نیە(٨٨) • ئەگەر چی لە هیچ یەکێ لەو وێنانەدا ـ نە ئەسکیتە ئەوروپاییەکان‌و نە سکاییەکان ـ کلاوی بەرز لە سەر کراو کە کراوەتە سەر [سکونخا] پیشەوای سکاییەکان‌و لـەسـەر بەردەکـەی بێستون دیارە لـەوانە بـیـە(٨٩) •

هەرچۆن بێ ئەگـەر بڵێین [ئەسکیتەکانی ـ ئاشکودا] کە ناز ناویان تیز خودان بووە لە کۆتایی سەدەی شەشەم‌و سـەدەی پێنجـەمی پێش زاینی لـە قەڵەمرەوی ئەورۆژەی ساتراپ نشینی ماددا ئەژیان ئەوە ئەتوانین بڵێین ! وە هەروەها ئەتوانین شوێنی نیشتەجێ کەشیان بە وردی بدۆزینەوە • وتمان کـە بە پێی ـ نوسینی هرودوت ـ ئەسکیتەکان لـە دوای سەردەمی گـەمارۆدانی چیاکانی قەفقاز لەگەل مادەکانا کەوتنە شەڕەوە ـ واتا مەیدانی نەبەردی ئەوان ئازربایجانی ئیستای سوڤیەت بوو ـ وە هەروەکو لە دواییدا دەرکەوت کە ئەم روداوە تەنیـا لـە دەوروبەری دەیـەی پێنجـەمی سـەدەی حـەوتـەمی پێش زاینیدا بووە •

وا لێك ئەدرێتەوە کـە هـەندێك لـە بەڵگەی کیمریەکان لـە سـەدەی حەوتەمی پیش زاینیدا هینی [ماننا] بێت(٩٠)ـ بە پێی ئەو نووسینانەی سەرەوەـ

دیسان ئەگونجێ هینی ئـەسکیتەکان بن • ئەگـەر باسی ئـەسکیتەکان بکـەین [هەروەکو بۆ ئێمە دەرکەوتوە] ئەگەر لەگەل مانادا یەك بو بێت ، ئەوا هۆی مانەوەی ئەوان لەو سەرزەمینەدا ئاسانە • جگە لەوانە ناتوانین ئەوە بڵێین کـە



**سکونخا پێشەوای سکاییەکان [ئەسکیتەکان ، ماساگتەکان ؟] کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاینی •• لە روی بەردەکەی بێستون نەخش کراوە**

کیمریەکان لەو سەردەمەدا لە رۆژ ئاوای ئاسیای بچوکدا سەرگەرمی شـەڕو بگرەو بەردە بونو توانیویانە لـە هەمان کاتا دیسـان لە مانادا خەریك بەڕێوە بردنی کاروبار بووبن • مەگەر بەو جۆرەی دابنێین کە تەنیا کۆمەڵێك ـ کە لە هەمو هۆزەکان جیا بوبێتەوە ـ دەستیان بەم جۆرە کارانە کردبێ •

بەلام ئەگەر کیمریەکان کە لەو دو سەنەدە دا ناویان براوە وە قسـەیان لێوە کراوە ، ئەگەر هـەمان ئەسکیتی [شکودا] بن ئەتوانین تا رادەیەك دەری

خەین کە لەو سەردەمانەدا لەکوێ بون •• نوسەری نامـەی هابل Habl
– ١٢٥٧ ئەڵێت کیمریەکان بە ئاشوریەکانیان ئەوت [مانناییەکانی بەر لە ئێوە،
[ئەمانەوە] ئێمە ڕێگای خۆمان [گرتە بەر] •• ئەوە ڕاستە کە کیمریەکان لەو
سەردەمەدا هێشتا لە دەرەوەی سنوری مانا بون • بەڵام لەکوێ ؟ لە خوارەوە
نەبون ، چونکە ئەوێ هێشتا بە شێك بو لە دەسەڵاتداریتی ئاشور • لە ڕۆژ
ئاواش نەبون ، ڕۆژ ئاوا سـەر بە وڵاتی ئورارتوبو ، هـەروەها لـە ڕۆژئاوا
دیسان بیابان نشینەکانی یا بو ، کەوابو ئەتوانین لـە سنورەکانی ڕۆژهەڵات و
زوروی مانا یەکێکیان بۆ شوێنی ئەوان هەڵبژێرین • بـەڵام لـەو سەردەمەدا
مانا لە لای ڕۆژهەڵات [هەروەکو ئەزانین ڕەنگ بێ تا کێوەکانی کـەناری
دەریای کاسپی [خزر] درێژ بو بێتەوە • وە لەو شـوێنانەدا ئەسـکیتە بیابان
نشینەکان وە یان کیمریەکان نەیان ئەتوانی بە بێ وەی نیشتەجێ بن • بـەم
جۆرە جارێکی تر ئەگەینە ئەو ئەنجامە کە لـە سەرەتای سـەدەی حەوتەم دا
بیابان نشینەکان لە ژوروی مانا [دەراوی ئاراس] وە لەوە ئـەچێ لـە ناوچە
ژوروەکانی ترا بوبن • هەر چۆن بێت لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش
زاینیدا [پادشایی ئەسکیتەکان] لە هیچ شوێنێك وە لەگـەل ئاشوردا هـاو سنور
نەبون[٩١] •

لـە بارەی شـوێنی پادشـایی ئـەسـکیتەوە باسـێکی تر هـەیـە ••
ئاسـترابون [ XI ، ٨ ، ٤] ئەڵێ : کە [سکاییەکان لـە ئەرمـەنستان[٩٢]
بانترین خاکیان بـە دەستەوە بو ، وە بـە ناوی خۆیانـەوە پێیان ئـەوت
– سکاسنا – ] • ئاسترابون چەند جار باسی ئـەم ناوچـەی [ سکاسنا ]یـە
ئـەکـات [ II ، ١ ، ١٤ ، XI ، ٢،٧،٤،١٤] نوسـەرەکانی تریش
ئەوانیش دیسان شارە زاییان لە بارەی سەرزەمینی [سکاسنا]وە هەیە • وە لەبەر
ئەوە ناوچەی ناوبراو لـە نوسینی ئەرمەنیەکانا [ساکاسینا] یان پێ وتوە ، وە
ناوچەی ئەو تارادەیەك ئەتوانین ڕون بکەینەوە • بەم مانایە کە ئەم ناوچەیە

کەوتۆتە خواروی دەستەکانو ناوەراستی روباری کو [کر] وە لـە ناوچـەی رەئوف ئاباد [گەنجە]ی ئیستا ، لە نزیك ئەو شوێنانەوە کـە بە پێی نوسینی هرودوت ـ شەڕی تیا کەوتە نێوان ئەسکیتو مادەوە ـلەوێدا بوە • لە وتەکانی ئاسترابون دا وا دەرئەکەوێ کە ناوچەی ناوبراو سکایيەکان داگیریان کردبو نەك ئەسکیتەکان • وە وشەی [ساکاسن] خۆی ئەم وتەیە ئەسەلمێنێ • بەپێی ئەو نوسینانـەی سـەرەوە هەندێك لە لێکۆڵـەرەوەکان شوێن بیرورای ئاکاد میسین و• و• ئاسترو[٩٣] کەوتون ، وای نیشان ئەدەن کە جگە لە پەلاماری کیمریەکان لە سەدەی هەشتەمو ئەسکیتەکان لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینی دا ، سکایيەکانیش دیسان لە سەدەی شەشەمی پێش زایینیدا ئەوانیش پەلاماری قەفقازیان داوە • ئاکادمیسینو و•و• ئاستروە تەنانەت شەڕی ـ ئورانی کـە بەرامبەر بە کۆششی داریوشی یەکەم [بە مەبەستی داگیرکردنی ئەرمەنستان لە ساڵەکانی ٥٢ و٥٢٢ی پیش زایینی دا] کە بەو جۆرە بەربەرەکانێی ئەکردن، بـەهۆی دانیشتوانی ئـەو کیشـوەرەی ـ واتا ئـەرمـەنیـەکانو ئورارتویـیو هوریتیەکان ـی دائەنا • وە لەو باوەڕەدا بووە کە ئەوانە تازە پێ گەیشتووە سکایيەکان بون • ئەوانە ئەیانویست ناوچەکەی خۆیان بپارێزن •

بەڵام ئەگەر بڵێین کە لـە سـەرەتای سـەدەی شەشەمی پێش زایینیدا سکایيەکان لە ناوچەی رۆژهەڵاتەوەو لە رێگای خاکی مادەوە دەستیان کرد بە پەلامار بردن ـ ئەمە لە راستیدا بونی ئەمپەراتوری خاوەن دەسـەڵاتی مادمـان لـەو سەردەمەدا ئینکار کردوە ، وە ئەمـە خۆی لـەگـەل هیچ بـەڵـگەو سەرچاوەیەکدا ناگونجێ • لـەوە ئـەچێ ئـەو پـەلامارانـە لـە سـەردەمی سەرکەوتنەکانی کورشدا رویدا بێ لاواز تر بوبن • جگە لەمانە رەنگ بێ هۆزە تازە بیابان نشینەکان لە نێوان هەمو ناوچەکانی ئاسیای نزیك ، قەفقازی رۆژهەڵات دەرکەوتبن ـ واتا لەو سەر زەمینەی کە ئەسکیتەکان ـی ئاشکیدا لە رێگایەکی ترەوە هاتونو ئەوێ یان داگیر کردوە ، تیایا نیشتەجێ بون ، زۆر

لاواز بون • ئەم بیروڕایە ئەوە ئەگەیەنێ کە سکایيەکان لە هەمان ڕێگاوە کـە ئەسکیتەکان لێوەی هاتبونـە قەفقازەوە ــ واتا بە ڕێڕەوی دەربەندا ــ لەوێوە هاتوون •. بەڵام بە پێی بەڵگەو سەنەدی س• ت یرمیان[٩٤] دەر ئەکەوێ کە [ماساگیتەکان] ئەوانیش لە سەرەتای سـەدەی یـەکـەمی زاینیدا لـە ژورەوی ئابشوران تاکو روباری سمور نیشتەجێ بون‌و تیا ژیاون وە ئەو رایەی کـە سکاییەکان بەر لەوان لە وێدا بون‌و لە ناوچەکانی خواروتری ئەوانەوەو لـە نزیك کی روف ئاوا [گەنجە] وە بون ئەوە راست نیە •

بەم جۆرە دەر ئەکەوێ کە ئاسترابون ئەمەی هەڵە کردوە ، وە ئەم هەڵە کردنەش ئاشکرایە چونکە پارسەکان [وە رەنگ بێ مادەکان] ئەوانیش هەمو بیابان نشینەکان یان بە [سکای] ناو ئەبردن • هەروەکو یۆنانیەکان ئەوانیان بە [ئەسکیت]و بابلیەکان [گیمیری] یان پێ ئەوتن • ئەبێ ئەوەمان لەیاد بێ کـە [تێگرا خئودا] ــ تیز خود ــ کە سەرچاوەکان بە [ئورتوکوریباتی] ناوی ئەبەن، نازناوی سکاییەکانە •• ئەگەر ئەوە بە راست بزانین کە ئەسکیتەکانی ئاشکودا [هەروەکو هرودوت ئەڵێ] ئەگەر لەو بەری ولگاوە هـاتبن واتا سەرچاوەی ئەو هۆزە لە ئاسیای ناوەڕاستدا بووە ، ئـەمەیان زۆرتر لـە راست ئـەچێ ، لەبەر ئەمـە ئـەتوانین بڵێین کـە [ساکاسینا] [ساکا ــ شایانا] ی ئیرانی ــ واتا سەرزەمینی ژیانی سکاییەکان ــ ناوێکی رەسمی بوە کە مادەکان بە مەرکەزو سەرزەمینی پێشووی پادشایی ئەسکیتەکانیان ئەوت • وە ئێمە ئەبێ سەرزەمینی ناوبراو لـە نێوان روباری کوراو ناوچەی ژوروی کی روف ئاباد [گەنجە]و زەوی وزاری دەورو بەری دەریاچەی ئورمیە کە سەر بەمانتا بون لە خواروی ئاراسەوە دابنێین •

محەکی راستی ئەم بیروڕایەو دیاری کردنی شوێنی پادشایی ئەسکیت بەم جۆرە ، تەنیا دۆزینەوەی کۆنە شوناسیەکانەو بەس • بە داخەوە لەو ناوچەیەی ئازربایجان سەرچاوەی کۆنە شوناسی تـەواو دەسـت نەکـەوتوە ، وە ئـەو

گۆڕستانەی کــە لــە [مینگە چائور] ایّی کۆڵراونەتەوە کەوتۆتە ئەوپــەڕی سنوری ئەو سەرزەمینەوە کە ئێمە مەبەستمانە • ئەویش هەروەکو ناوچەکانی تری رۆژئاواو ناوەڕاستو رۆژ هەلاتی قەفقاز گەلێك کەلوپەلی دروستکراوی [ئەسکیتەکان] کــە لەگــەل لاشــەی مردوەکاندا نێژراون وەهینی ســەدەکانی شەشەمو پینجــەمی پێش زاینین[٩٥] [وەکو نوکــە تیرو ئایەنەو شتومەکی تر] ئەبینری •• ئەگەرچی بــە گشتی لەگــەل شتومەکە دۆزراوەکانی ناوچــەی کەناری ژوروی دەریای رەش جیاوازیان هەیە •




**کۆمەڵێك نوکە تیری هەمە جۆرەی هۆزو ناوچە جۆربەجۆرەکان**
**لە سەدەکانی ٤ وە ٥ و٦ و٧ و٨ی پێش زاینی دا ••••**

بە پێی ئــەم شــتە دۆزراوانــەدا ئێسقانی مــردوەکان زۆر درێژن[٩٦] سواڵەتە دۆزراوەکانی گۆڕەکانی مینگە چائور لە سواڵەتی ئەسکیتەکانی ئــەو سەردەمە کە لە ئوکراینو ژوروی قەفقاز دۆزراوەتەوە جیاواز ترن • بــەلام وەکو لێك دراونەتەوە ــ دەستکردی ناوخۆیی ــ ن ، ئــەو گۆڕانەی مینگــە چائور لەوانــەیە تێکــەڵاو بوبن واتا هینی ئەسکیتەکانی [ئاشکیدا]و خــەڵــکی

ناوچەیی پادشایی ئەسکیت بوبن •

چەند کۆمەڵە شتێکی لەیەك چوو کە دەستەڵاتی [ئەسکیتەکان] ئەسەلمێنن وە لە ناوچەکانی تری قەفقازدا هەیە •• ئەو کۆمەڵە کۆنە شوناسانەی مینگـە چائور [هی سەردەمی پادشایی ئەسکیتەکان] وە کۆمەڵە شتەکانی تر کـە لـە وانە ئەچن و لە قەفقازدان ئەوەندە لە کۆمەڵە شتومەکە [کلاسیك]ە ئەسکیتەکانی ناوچەی کەناری دەریای رەش ناچن • ئەمە نابێ ببێتە هۆی نیگەرانی ئێمە • یەکەم ئەسکیتەکانی – ئاشکوداو کیمریان – لە ناو خەڵکی شوێنەکەدا – کـە




**نوکە تیری مادو ئەسکیتەکان کە لە گۆڕەکانی سەدەکانی حەوتەمو هەشتەمی پێش زاینی دا لە مینگە چائور دۆزراونەتەوە ••**

خەڵکی رەسەنی ئەو سەرزەمینەن ، لە ناویانا ون بون • ئەو خـەڵکەی کـە پێیان ئـەوتن [ئەسکیت]و لە وێوە چون بـۆ ناو ئاسیای نزیك [مقدم] بێ گومان بەشێك لە خەڵکی ناوچەی قەفقاز – کە لەو سەردەمەدا زۆر تر بیابان

نشین‌و تەنانەت بە بیابان نشینیان ناو ئەبردن ـ لەویدا بون[٩٧] •

یەکەم : لەمەوبەر وتمان ئەو هۆزانەی کـە لـە سەدەی حەوتەما هاتبونە ئەم ناوچانەوە لەبەر سەرنجی کۆنـە شوناسان دا [بەر لە ئەسکیتەکان] بون ، بەم جۆرە دیسان نابێت چاوەروانی ئەوە بین کـە لەگەل نیشانەو شوێنەواری [ئەسکیتەکانا] لەیەك بچن •

ئەسکیتەکانی ئاسیای نزیك لـەوە ئەچێ لـە گەلێك روەوە لـە رێگای سەربەخۆییەوە رەویان کردبێ • بـەم جۆرە گـەلێك بـەڵگـەی فـەرهەنگی ئەسکیتەکانی ئاسیای نزیك [کە بە رای زوربە کیمریەکانی دوایان بـە بەشێك لەوان دائەنرێن][٩٨] پەیوەندی نزیکی ئەوان لەگەل ئەسکیتەکانی ناوچەکانی کەناری ژوروی دەریای رەش‌دا ئەگەیەنن ، ئەم وتەیە بۆ ئێمە رون نیە کـە ئایا ئەسکیت‌و کیمریەکان ئەم شتومەکانەیان لە ولاتی خۆیانەوە ـ لە سەدەی هەشتەم‌و حەوتەمی پێش زایینیدا ـ لەگەل خۆیان هێناوە ، وە یان بە پێچەوانەوە بەشێك لەو شتانە لە زەوی‌و سەرزەمینی تازەدا ـ ئاسیای نزیك ـ پەیدا بووە وە دوا جار ـ لە ئەنجامی پەیوەندی نێوان بیابان نشینەکانی ئەو بەرو ئەمبەری کێوی قەفقازەوە کـە هـەرگیز نەئەبچڕا ـ لەسەر زەمینی تازەوە گەیشتبنە ناوچەکانی ژوروی دەریای رەش • وە یان ئـەو شتومەکە باسکراوانە لـە ناوچەیەکی ترا ـ وەکو ئاسیای ناوەراست ـ دروست بوبێ‌و لەوێوە هاتبێت بۆ ناوچەکانی کەناری دەریای رەش‌و رۆژ هەلاتی نزیك • ئەوەی کە وترا لـە بارەی مەسەلەی ناوچەو شوێنی پەیدا بونی ئەو سەرە تیرانەوە ئەوانە بە هینی ئەسکیتەکان دائەنرێن • هەمو ئەم بابەتانە ئەبێ کۆنە شوناسەکان رونی بکەنەوە وە ئێمە لەم روەوە هیچ بیروڕایەك ناسەپێنین[٩٩] •

بە کورتی ئەتوانین بڵێین کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا چەند هۆی کاریگەر لە مێژوی پەیوەندی دەرەوەی ماددا پەیدا بو • هەندێکیان کیمریەکان بون کە لە سەدەی هەشتەم لەوبەری کێوی قەفقازەوە بەرەو بەشی

رۆژ ئاواو رەنگ بێ مەرکەزی قەفقـاز دەستەڵاتیـان پـەیدا کـردبێ • وە یەکەمجار لەگەل ئورارتو لێك گیرانو لـە دوایدا لـە دەورو بـەری دەیەی حەوتەمی سەدەی حـەوتەمی پێش زاینیدا لەگـەل [روسا]ی دووەم پادشـای ئورارتو پەیمانی یەکیـەتیان بـەست • فریجیە کـە دەوڵـەتێکی سەربەخۆو دەسەڵاتدار بوو لە ئاسیای بچوکدا لەو شوێنەدا فەرمانفەرمایی ئەکرد ، لـە ناویان بردن • لەبەر ئـەوەی زاراوەی [ کیمریەکان ] ـ بـە تایبـەتی لـەو نوسراوانەدا کـە بـە شێوەی بابلی ـ زمانی ئاکادی ـ نوسراوە ـ ئەوە بیابان نشینەکانی تریش ئەگرێتەوە ـ ئیتر ئـەوە ئاشکرا نیـە کـە ئایا دەستەیەکی کیمری لـە قەفقاز ماوەتـەوەو دواجار لـە خاکی ماننادا وە تاکو ماد حوکمی کردوەو وەیان هـەر لـەو کەتەدا باسی ئەسکیتەکان کراوە [ نەك کیمریەکان بە تایبەتی ] •



**هەندێك پارچە خشلی ئەسکیتەکان هینی سەدەکانی شەشەمو حەوتەمی پێش زاینی ، لە مینگە چائور دۆزراونەتەوە ••**

دووەم : ئەسکیتەکانی ئاشکیدا هۆیەکی تر بون ، رەنگ بێ ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیدا ـ کـە یەکێك بون لـە هۆزە ئێرانیـەکانی ئاسیای ناوەڕاست لـە

رێگای رێرەوی دەربەندەوە چو بنە قەفقازی رۆژهەڵاتەوە وە لەوە ئەچێ لـە ناوچەی [کی‌روف ئاباد] [گەنجە]و ئاراس وە بـە هـەرجۆر لـە ناوچەکانی حواروترا تا ورمێ یەکیەتیەکی پتەوی سیاسی [پادشایی] کە لە مێژوی سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا شوێنێکی گرنگی هەبوە ، پێکیان هێناوە • بـە تایبەتی یەکێتی نێوان ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیداو ماننا گەلێك ئەهمیەتیان بوە •

## ٣ ـ چونێتی باری سیاسی [ ماننا ]و ماد لە دوای ســاڵی ٧٠٠ی پێش زایینی

هەروەکو لە بەشی پیشوودا وتمان ماننا لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زایینی دا ســودی لــە ناکوکی‌و لێکدانی نێوان ئاشورو ئورارتو وەر گرتوە ، هێزی خۆی مەحکــەم کرد وە ســەرانسەری ناوچــەی دەریاچــەی ورمێ تا کێوەکانی ناوچەی سێیەم‌و بـەشێك لـە ناوچـەی چوارەمی نـەخشـەکـەی خۆمان ـ ی هێنایە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە [جگە لـە کـەناری رۆژئاواو بەشێك لـە کـەناری ژوروی دەریاچەی ورمێ کـە بـە دەسـت ئورارتووە مابوەوە(١٠٠) رەنگ بێ ماننا لەلای ژوروەوە لە گەل پادشایی ئەسکیت هـاو سنور بوبن •

ناوی ئەو پادشایەی کە لەو سەردەمەدا حوکمی مانای ئەکرد نازانرێ ، رەنگ بێ هــەمان کابرای مانایی بوبێ کـە ئاشوریەکان [بل خابو] یان پێ ئەوت • وە یەکێك لە نوسراوەکانی سەڵتەنەتی ئاشور باسی لێوە کردوە(١٠١) • هەرچۆن بێ ئەو فەرمانفەرمایەکی بە دەستەڵات بوە •

باری چونێتی سەرزەمینی یەکێتی هۆزەکانی ماد پلە بە پلە ئاڵۆز تر بو ، بەشی زۆری ماد [بەشی ژوروی دەراوی قزل ئوزون] قەزوین‌و بـە تایبـەتی ناوچەکانی رۆژئاوای] لە ژێر دەســەڵاتی ئەمپەراتوری ئاشوریەکانا بو ، وە کردبویان بە چەند بەشێکەوە :

زاموا [ژوروی سلیمانی] ، پارسوا [ناوچەی ژوروی دیالە کە مەرکەزی ئەو قەڵای نیکور بو] ، مادای یان ماد ـ بە مانای تەواو [رەنگ بێ لە خواروی ـ کیشەسو ـ لە دەشتی قزل ئوزون](١٠٣) ، ساپاردا [کـە لەوەوبەر بەشێك بوە لە ناوچەی خارخار وە رەنگ بێ لە خواروی خەتی زنجان ـ قەزوینەوە بو بێت(١٠٤) ، خار خار [کە مەرکەزی ئەوان قەڵایەك بوە هەر بەو ناوەوە لە رۆژئاوای هەمەدانەوە](١٠٥) ، بیت ـ کاری [ناوچـەی هـەمـەدان](١٠٦) ، ئاراپخا [کە مـەرکەزی ئەوان شاری ئاراپخا ـ یان کەرکوکی ئیستا بوە ـ وە بەشێك لە ناوچەی پێشووی نامارو تاکو ناوچەی خواروی رۆژهەڵاتی دەراوی دیـالـەی ئـەگرتـەوە ] وە بیـت ـ هامبـان [ لـە رۆژئاوای کـرمـانشای ئیستاوە ] • بوبێتی •

بەم جۆرە بە بێ ناوچەکانی زامواو پارسواو ئاراپخا ـ کە ئاشوریەکان لەو ناوچانە بە تەواوی بەهێز بون [وە بەشێك لەم ناوچانە تەنانەت لە دەرەوەی سنوری ماد بوە] وە لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زاینی ژمارەیەکی زۆر لە بێگانەکان لەوێدا ئەژیان ـ دەسەڵاتی ئاشور لە ناوچەکانی تری ماد تارادەیەك بێ هێز بو ، فەرمانڕەوایی ئەوان لە ناو چەند قەڵایەکدا بوو کـە سوریاییو فەلەستینیو بابلیەکان [قەڵای ئـەلن زاش ، خار خار ، کیشە سو ، هینی تر] تیایا نیشتەجێ بون ، لە دەورو بەری قەڵاکاندا ـ هەمو جێگایەک ـ دەسەڵات بە دەستی پیشەوایانو [خاوەن ئاواییەکان](١٠٧) بوو ، کە زوربەیان سەر بـە عەشیرەتو بنەماڵە کۆنەکانی پێشەوایانی پێشوو بون ، ئاشوریەکان تەنیـا بە زۆری چەكو لەشکر کـەشی ئـەیان توانی مـەڕو ماڵاتو باجو سـەرانە لـە خەڵکی بسێنن •

لـە خواروی ئەو ناوچانەوە کـە بـە دەستی ئاشورەوە بون [ ئیلیپی ] [رەنگ بێ هەمان ئیلی مائیدە]ی نوسەرە کۆنەکان بێت کە مەرکەزی ئـەوان لە نزیك کرمانشانەوە بوە] • هەبو کە پادشا نشینێکی بچوكو نیوە سەربەخۆ

بو ، وە کەوتبوە لای خواروی کیشوەری عیلامەوە •

لە رۆژ هەلأتی ئەو ناوچانەی کـە ئاشور داگیری کردبون سـەرزەمینی هۆزەکانی ماد هەبو کە پێشەواکانیان بە ناوی [خاوەن ئاوایپەکانەوە] حوکمیان ئەکردو لەژێر دەسەلأتی ئاشوردا نەبون ، ئەوەی لـە بارەی ئـەم ناوچـەی بیابان نشینانەوە کە ئەسپیان پەروەردە ئەکرد شیاوی باس بێ [ئاریبی – یەکانی رۆژ هەلأت] بون ، ئەمانە لە روی ئابوریەوە لە ناوچەکانی رۆژئاوا دوا کەوتو تر بون ، ئەمانەیان خستبوە ژێر دەسەلأتی خۆیانەوە • هەروەها مانا لە بارەی پێشکەوتنەوە لە وانە باشتر بو •

بەداخەوە مێژوی سەردەمی [ئاسار خادون] لە ئاشور هەروەکو پێویستە رون نیە ـ چونکە ئەو سالنامانەی کە باسیان لێوە ئەکات بە دەستمانەوە نیە وە تەنیا چەند نوسراوەیەك ماوەتەوە کە بگرەو بەردەی لە شکر کەشیەکانی بـە شێوەی گشتی لە روی جوگرافیاییەوە باس کردوە • لەگەل ئەوەشدا ئەوەی کە پێیان ئەووت [مێژوی بابل] وە گـەورە ترین روداوی بابلو ناوچـەکانی دەوروبەری بە رێكو پێکی هێناوەو بەباسی سـەرپێیی ناو ئـەبرێ • بـەلأم بەداخەوە مێژووی سالو مانگی ئەو روداوانەی کـە لـە سەردەمی سەلتەنەتی [ئاسار خادون] لـە سـەرزەمینی مـاد رویداوە راستەوخـۆ باسی نـەکراوە – ئەگەرچی رونە کە ئەبوا ئەو روداوانە بـەر لـە سـالی **٦٧٣**ی پێش زاینیدا رویدا بێ(١٠٨) •

بەلأم چونکـە روداوەکانی ماد سـودی ئاشوری تیا نـەبوە لـەو بارەوە نوسراوەی تایبەتیو رەسمیان نەنوسیوە ، وە ئێمە بـە شێوەی گشتی بەهۆی زنجیرەیەك نوسراوەی بچرِ بچرو ناتەواوەوە کـە لەناو ئەوانەدا پرسیارەکانی [ئاسار خادون]ی تیایە کـە لـە خوای شاماشی کردوە – بەو هۆیەوە سودمان لە بارەی ئەو روداوانە وەرگرتوە • ئـەو پرسیارانە بەرواری مانگو رۆژی پێوەیە ، بەلأم سالەکانی ئاشکرا نیە •

ئەتوانین کاتی روودانی ئـەو رووداوانەی کـە لـە سەردەمی سەڵتەنەتی [ئاسار خادون] دا لە ژورووی رۆژهەڵاتی کیشوەرەوە رویداوە دیاری بکەین •



**وێنەی ئاسار خادون ، لە سەر بەردێکی ئاشوریەکان کێشراوە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی**

لە ژانوئیەی ساڵی ٦٨٠ی پێش زایینیدا [سەنحاریب] پادشای ئاشور لـە کاتی خوا پەرستیو عیبادەتدا بە دەستی یەکێك لە کورەکانی خۆی کوژراوە، لەسەرزەمنی بین‌النهرینی ژورووی شەری خۆماڵی دەستی پێکرد وە بە راکردنی دوکەس لە کورەکانی [سەنحاریب] بۆ ناوچـەی کوێستانی نیوە سـەربەخۆ [شوبری] ـ لـە خوارووی رۆژئاوای دەشتەکانی ئـەرمەنستان ـ کۆتایی بـە شەرەکە هات • وە لە کۆتایی ئەو ساڵەدا برای سێیەمیان کـە ئارەزو خوازی کۆمەڵی کاهنەکانو بازرگانەکان بوو وە ناوی [ئاسار خادون] بو چوە سەر تەختی شاهانە •

ساڵەكانی سەرەتایی پادشایی پادشای تازەی ئاشور زورتر بو باری سیاسیو نزامی ئالوز لە بابلدا تەرخان كرا ، بەلام لە ساڵی ٦٧٩ی پێش زاینی ـ هەروەكو لەمەوبەر وتمان ـ كیمریەكان دەستیان كرد بە پەلاماردانی سنوری ئاشور(١٠٩) • لەم روەوە سێ راپورت ماوەتەوە ، لە نوسراوەكانی ئاسار خادوندا بەم جۆرە نوسراوە : [•••• ئەماتئوشپای كیمری ئومان ـ ماندای(١١٠) كە جێگاكەی دورە ـ لەگەل لەشكرەكەی لە سەرزەمینی «خوبوشنا» تێكم شكاندن] • وە دوایی لە بارەی لەشكر كەشی ئاشوریەكانەوە بۆ ناوچە جۆربەجۆرەكانی خواروی رۆژهەلاتی ئاسیای بچوك ئەدوێ ••• ئەوەی كە بە مێژوی بابلی [ B ] ناونراوە بەم جۆرە نوسراوە : [لە ساڵی دووەم ••• ـكیمـ ریەكان پەلاماری ئاشوریان دا وە لە ئاشور رایان [كرد](١١١)] • مێژویەكی تری بابلی كە ناوی [مێژوی ئاسار خادون]ە روتر لە مانە ئەلێ : [ساڵی دووەم ••• كوشتار لە «كیشوەر» بو [آ] ئواو [كیشوەر] كیمریەكان لە كوشخنو رویدا](١١٢) بە داخەوە شوێنی [بودائوا](١١٣) و [كوشخنو] نەزانراوە • بەلام لە بارەی [خوبوشنا]وە هەروەكو لەمەوبەر وتمان ـ لەبارەی شوێنی ئەوەوە دو بیرورا هەیە(١١٤) ئەو بیرورایەیان كە زۆر تر رێی تێ ئەچێ ئەوەیە كە خوبوشنا ناوچەیەكی نیشتەجێیی بووە لەلای رۆژ ئاوای كێوی [تاور]و خواروی رۆژهەلاتی ئاسیای بچوك •

ئاشوریەكان بەرپەرچی پەلاماری كیمریەكانیان دایەوە ، وە لە هەمان ساڵی ٦٧٩ دا ئەبینین كە ژمارەیەك لە كیمریەكان لە ئاشوردا بەكرێ چونە ناو ریزەكانی لەشكرەوە(١١٥) چونكە دەستیان كرد بە ئاشت بونەوە لەگەل كیمریەكان وە یان لەگەل بەشێك لەوانا ئاشت بونەوە • ئەبێ لەشكر كەشی ئاشوریەكان لە دژی دەسەلاتداریتی ئاسیای بچوك ـ كە لە نوسینە ناوبراوە كانا لە دوای لەشكر كەشی لە دژی [تئوشپای كیمری] ناوبراوە ـ لە هەمان كات وەیان نەختێك لە دوا ترا بووە •

هەروەکو گ. أ. ملیکی شویلی سەلماندویە ، [روسا]ی دووەم پادشـای ئورارتو[١١٦] لە ٦٧٦ یان ٦٧٥ پێش زاینی بـە پێی رێکـەوتنی لـەگـەڵ کیمریەکاندا لەشکری ناردە سـەر فریجیە وە لـە سـاڵی ٦٧٢-٦٧٣ی پێش زاینیدا ئاسارخادون گـەورە ترین پەیوەندی دۆستانەی لەگـەل [ روسا ]دا بوو[١١٧] ، وە ئـەم روداوە ئـەو سـوڵحو ئاشتیەی ئـەو سەردەمە لەگەل کیمریەکانا ئەسەلمێنێ .بەلام پەیمانی یەکێتی [روسا]ی دووەم لەگەل کیمریەکانا ئەوەندەی بە سەراتێ نەپەڕی کە ئەم دۆستیو پەیمـان بەستنە ئاشوریەکانی خستە مەترسیەوە ، ئەم پرسیارە دەست کـەوتوە کە ئەڵی ـ ئایا ئەم یەکیەتیە مەترسی یـەکی بۆ دەسـەلاتی ئاشور لـە شـوبوریە ـ لە سنوری ئورارتو ـ نابێت ؟.

بەم جۆرە بەرچاو ئەکەوێ کە لە ٦٧٩ تاکو ٦٧٢ی پێش زاینی پەیوەندی ئاشور لەگەل کیمریەکانا دۆستانە بووە . وە زۆر رێی تێ ئەچێ کە مەبەست لەو [کیمریانەی] لەو پرسیارەدا هاتوە وەکو دوژمنی ئاشـور ناسراون ئـەوانە ئەسکیتەکانی ئاشکیدا بون ، [ئەو پرسیارانە بە شێوەی زمانی بابلی نوسراونەتەوە وە هەروەکو لەمـەوبەر باسـمان کرد لـەم کاتانەدا بـەکار هێنـانی وشـەی [کیمریەکان] لەو زمانەدا بینراوە] .

زنجیرە پرسیارێکی بچڕ بچڕ کە لێك دراوەتەوە هینی ساڵەکانی ٦٧٥ تا ٦٥٠ی پیش زاینیە[١١٨] . وە ئـەو پارچـە نوسینانەی کـە لـە سـەردەمی سەڵتەنەتی ئاشورباناپال [لە دوای ساڵی ٦٦٩ی پیش زاینی] بەدەستەوەیە لـە نووسینەکانی تر کەمترن .. زوربەی ئەو پارچە نوسراوانـە هینی ساڵەکانی ٦٦٩-٦٧٤ی پیش زاینیە . وە بـە پێی بیروورای ئێمـە گرنگترین پارچـە نوسراو ـ واتا ئەوانەی کە لە بارەی ـ مانناو مادەوە ـ هەیە ئەتوانین ئەوانە بە دڵنیاییەوە بـە هینی ساڵـەکانی ٦٧٣-٦٧٤ی پیش زاینی دابنێین . چونکـە روداوەکانی مانا بەر لەوە لـە نوسینەکانی ئاسارخادون [کە مێژووی نوسینیان

بەر لە ساڵی ٦٧٣ بوە] تیا دەرکەوتوە[١١٩] •

چوار زنجیرە روداو لەو پرسیارانەدا دەر ئەکەوێ ، کە هەمویان هێنی ئەو سەردەمەن : روداوەکانی ماننا ، روداوەکانی مادی مەرکەزی ، روداوەکانی ئاسیای بچوك[١٢٠] وە روداوەکانی میسر • ئاشکرایە روداوەکانی ماناو مادی مەرکەزی ئەبێ زۆر تر پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت •

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە : کە ئایا لە نێوان روداوەکانی ماناو روداوەکانی مادی مەرکەزیدا هیچ پەیوەندیەك بووە یان نە؟ لێکۆڵەرەوەکانی پێشو ئەم دوو زنجیرە روداوەیان لە یەکتر جیا کردۆتەوە وە روداوی یەکەمیان بە لەشکر کەشی ئاسارخادون لە دژی ماناو ئیشپاکای ئەسکیت بەیەك زانیوە ، وە روداوی مادیان ـ چونکە ناوی کیمریەکانی تیا براوە ـ بە هەمان لەشکر کەشی ئەزانن کە لە دژی تئوشپای کیمری کراوە • هەروەها ئەڵێن ساپاردا کە لەناو روداوەکانی دواییدا باس کراوە ئەو بیابان نشینانە بون کە پەلاماری لیدی یان دابو ، وە لە دواییدا هەندێك ئەوانەیان بە [سپاردا] ناو ئەبرد • [بە ناوی پایتەختی لیدی‌یەوە کە بە یونانی پێیان ئەوت ـ ساردا ـ][١٢١] • بەڵام لەو پرسیارانەدا مەبەست هەمان ناوچەی [سپردا] وە یان [شاپاردا]ی مادە کە زۆر جار لە سەرچاوە ئاشوریەکانیشدا باسی لێوە کراوە[١٢٢] •

ئێستە ئەمە سەلمێندراوە کە لەشکر کەشی لە دژی [تئوشپا] لە ساڵی ٦٧٩ی پێش زایینیدا بووە ، لەبەر ئەوە ئەم لەشکر کەشیە ناتوانین لەگەل ئەو زنجیرە روداوەی مادی مەرکەزی دا کە لە پرسیارەکانا باس کراوە بیان بەستین بە یەکەوە • چونکە روداوی ناوبراو ـ هەروەکو دیمان ـ لە ساڵەکانی ٦٧٣ـ٦٧٤ دا بووە • جگە لەوە [پارتاتوا] پادشای ئەسکیت کە ناوی لەباسی روداوەکاندا هەیە بێگومان هەمان [پروتوتی] باوکی مادیایە کەهرودوت باسی کردوەو ناوی هێناوە ، وە لە ناوەراستی سەدەی حەوتەمی پێش زایندا کردەوەی خۆی نواندوە • بەم جۆرە بە بیرورای ئەو بەر لە مادیا بووە ، وە

لەبەر ئەمە ئەبێ لە دوای ئیشپاکای [کە لە نوسینەکانی ئاسار خادون بە بونەی لەشکرکەشی ماناوە ناوی براوە وە بـە پێی حیسابی ئـەو نوسراوانە لـە سەردەمی ئەوا کوژراوە] بو بێت •

بە پێی ئەو سەرچاوانەی سـەرەوەو بـە پێی بیروڕای ئێمـە ئـەبێ روداوەکانی مادی مەرکەزی لەگەل روداوەکانی ماننادا بە یەك دابنێین وە یەکەم رێکەوتنە کانیش بە شوێن ئەو روداوانەدا دا بنێین •

لەگەل ئەم بیروڕایەدا هەوڵ ئەدەین ئەو زانیاریانەی کە لەو پرسیارانەدا دەست ئەکەوێ بە گوێرەی روداوی مێژوویی رێکیان بخەین‌و جۆری روداوو رواڵەتی روداوەکان رون بکەینەوە[١٢٣] •

بە بیروڕای ئێمە کۆنترین بـەڵگـە لـە بارەی زنجیرەی روداوی ماد ، ئاشورەوە دەست کەوتوە کە بەم جۆرەیە :

KI./22/.Kn/./33/.KI./19/20/.kn ./30/31/.KI./14.

زۆر گرنگە کە تەنیا لە ولاتی ماد ناردنی خەرج‌و باج بۆ شوێنی یەك لەشکر کەشی سامناك بوە ــ بە شێوەیەکی نادیار لەبارەی ئەنجامەکەیەوە ئەبێ پرسیاری بۆ بکرابایە[١٢٤] •

رەنگە بێ پەیامی سێ کەس لە فەرمانفەرمایانی مادی رۆژهەلات کە لـە ناو خەڵکە یاخی بووەکانا کـە لە شـوێن‌و جێگای خۆیان دەریان کردبون ــ لە لای ئاشوریەکان بە سەرەتای روداوی ماد دائەنرێ ، ئەمە دوا روداوێکـە کە لە بەسەرهاتە کۆنەکانی نوسراوەی ئاسار خادون دا[١٢٥] باس کراوە • وە لە هەمان کاتا لێکدانەوەکەی [لە بارەی ئەو جێگایەوە کە لە نوسراوەکەدا هەیە] لە سنوری جوگرافیایی ، کە لە نوسینەکانا نوسراوە لە هەموی بەدەرەو لە بەر ئەوە گومان ئەروات کە لە بارەی روداوێکەوە بێ کە دوای روداوەکە دەست کەوتوەو پاشماوەکەی واز لێ هێنراوە • لەبەر ئەمە ئەو نوسینانە بەر بە ساڵی ٦٧٤ی پێش زاینی نوسراوە ، سـەرەتای روداوەکانی مادیش ئـەبێ

هەر لە هەمان سالدا بوبێت • نوسراوەکانی ئاسار خادون(١٢٦) لە بارەی ئەو روداوەوە بەم جۆرەیە :

لەشکریەکانی ئاشور لەشکریان کردە سەر [کیشوەری مادە دور دەستەکان ] ـ لە سنوری بیابانی نمەکزار ـ وە پاینی کیوی [ بیکنی ] « دەماوەند »(١٢٧) وە ناوچەی [ پاتشو عارا ] ـ [ پدشخوار ](١٢٨) [پاتیشهودار] وە لە رۆژ گاری دواییدا [حوئارن] ـ یان پێ ئەوت • لەم نێوانەدا دو [خاوەن ئاوایی] ، [بل ئالی Belali ]دەستگیر کران ، یەکێکیان پێیان ئەوت [شی تیر پرنە] واتا شانازی داهاتو ، ئەوی تریان ناوی [ئاپاردو] بو ، کە لەوە ئەچێ ئەم ناوانە [عیلامی ـ کاسپی] بوبن(١٢٩) • کەسو کارو مەڕو مالاتەکانیشیان تالان کردن(١٣٠) •

پرسیاری ناتەواوو بچڕ بچڕ کە بە ژمارە [ kn./22 = ] kI./21 نوسراوە وە لە ناویا ناوی قەلای ئانداریاتی [ئانو] ـ هەیە کە لەوەبەر لە نوسراوەکانی سارگونی دووەم ،بە بۆنەی لەشکر کەشیەکانی سالی ٧١٣ و ٧١٤ی پێش زاینیەوە باس کراوە ، وە بە بەشێك لە پەلامار بردنی ئاشوریەکان ناو براوە ـ دیسان ئەبێ بەم لەشکر کەشیە وەیان لە بارەی ناردنی خەرجو باجی ئەو سەرزەمینەوە بوبێت(١٣١) •

لەم سێ باسەدا وا دەرئەکەوێ کە ئاندار پاتیانو [ئانویار پاتیانو] ئەبێ لە رۆژهەلاتی سپرداو لە نزیك ناوچەی قەزوینی ئیستاوە دابنێین • ئەوەندە بەسە کە ئێمە لە بەراورد کردنی [ئاندیارپاتیانو] لەگەل وشەی [ئازربایجان] دا رێ ئەکەوێ ، تەنانەت ئەگەر بۆ ئەم جۆرە بەراورد کردنە سەرچاوەی زمان شوناسی بە کەلك [کە ئیستا هەیە] ئەو کاتە بوایە ، نەبوە(١٣٢) •

لەم پەلامارە سەرکەوتوانەی ئاشوریەکان بردیانە سەر مادی رۆژهەلات سێ پێشەوا [خاوەن ئاوایی] ـ مادە دور دەستەکان ـ دەغالەتیان بە سەرداری ئاشوری کرد وە داوای یارمەتیان لێ کرد ـ ئەم سێ کەسە ئەمانە بون :

[ئوپيس] فەرمانفەرمای [پارتاكی] و [زاناسان] فەرمانفەرمای [پارتوكی] و [راماتی] فەرمانفەرمای [ئوراكازا بارنا](١٣٣) • ئەگەرچی لە هەرسێ كاتەكەدا وشەی نیشتەجێ یان ئاوایی لە نوسراوەكانا هاتووە بەڵام وادیارە نوسراوە ئاشوریەكان بە وردی سەرنجیان نەداوە • زوربەی لێكۆڵەرەوەكان لەسەر ئەو بیروڕایەن كە مەبەست لە ناوچەیە نەك ئاوایی • رەنگ بێ پارتاكا هەمان پارتاكانوی نوسراوەی سارگونی ـ واتا پارتاكنا ـ بو بیت • بە پێی بیروڕای [ئاشترك] پارتوكا دیسان شێوەیەكی تری لە ناوی پێشویدا هەیە كە بە شێوەیەكی ترە • پێویستە ئەوە بزانین كە لە نوسراوەی ئاشوریەكانا ئەم شێوەیە بایەخی بووە ، وە هەوڵیان ئەدا لە ناوەرۆكی زنجیرەكانا ناوی هاوسەرواو لە یەك چوو لە بارەی دەنگەوە لەلای یەكترا بنوسن ،وە هەندێك جار چەند ناوێكی شێوە لە یەك چوو بە شوێن یەكدا بنوسن • بەڵام لێرەدا جگە لە سێ ناو زیاتر نیە وە لەوە ئەچێ كە مەبەست سەرنجی سێ ناوچەی جیا جیا بوە • ئەتوانین بڵێین كە پارتوكا ـ Partukka لە شێوەی ناوی [كورت كراوەی ؟] لەگەل پاشگری كا k=a كە شێوەی زمانی مادە وە هەر لەبەر ئەوەی لەیەك ئەچن لەگەل [پارتاكا] هەڵیان بژاردوە ، بەڵام لەبەر ئەوە ناوچەی ناوبراو بە بەشێك لە ناوچەكانی ماد دراوەتە قەڵەم نابێ سەر لە ئێمە بشێوێنێ چونكە [خوارنا ـ پاتوش عارا] لە دوایدا بوە بە بەشێك لە پارت • هەروەكو لەمەوبەر وتمان زاراوەی [پارتیا] بە مانا [كەنارو كەنارەكان] ئەگرێتەوە •

شوێنی ناوچەی سێیەم واتا ئورا كازابارنا ، یان [ئوراكازا پارنا] هێشتا رون نەكراوەتەوە(١٣٤) •

فەرمانفەرمایانی ئەم سێ ناوچە ناوبراوانە ـ هەروەكو وتمان ـ ئاشوریەكان لە دژی [سەروكی ئاواییەكان] تێ ئەكۆشان بۆ ئەوەی ئەوان لە قەڵەمڕەوی خۆیان دەركەن دیاریو بەردی لاجیوەردو ئەسپی رەسەنیان بۆ ناردن •

سەرۆکی ناوچەکانی سنوری ئاشور بە هاوکاری ئەوان خۆیان گورج کردەوە، بە پێی نوسراوەی ئاسار خادون ئاوایــە باخیەکانیان هێنایە ژێر دەســەڵاتی خۆیان وە خــەرج و باجێکــی دیاریکــراویان خستنە پێ تاکــو ئــەو ســێ فەرمانفەرمایەی باسمان کردن هەمو ساڵێك خەرج و باجەکەیان بنێرن • ئــەم حەرج و باجە لای ئاشوریەکان زۆر گرنگ بووە ، وە لە جیاتی ئەوانە ئەسپیان وەر ئەگرت و ئەبوایــە لــەم راگوزەرەوە پێویستیەکانی سوپای ئاشوریان جێ بەجێ بکردایە ، چونکە ئاشوریەکان چــەندە ئەسپیان پێویست بوایە لــە ماننا وەریان ئەگرت ئیتر لەو رێگەوە بە زۆر ناردنی ئەسپ بڕابو •

بەڵام لەم کاتەدا دیسانەوە چــەند گیروگرفتێك پەیدا بو ، وە دەرکەوت کە لە سەرزەمینی مادەوە کە هەموی داگیر نەکراوە زەحمەتە ئــەم خــەرج و باجە بگاتە جێ • ئەمانە ئاشوریەکانیان ترسان کە لــە لایەن ساپاردا[١٣٥] وە ناوچەداگیرکراوەکانی تری مادەوە لە پشتی سەرەوە پەلاماریان بدەن[١٣٦] •

لــە ناوچەکانی تری مــادا ناردنی ئاژەڵ و ماڵیــات بــەهۆی ســەرۆکی ناوچەکانەوە بۆ ئاشور کەوتە مەترسیەوە ، بۆ نمونــە لــە [ بیت ـ کاری ] [ ١٩ و kI ـ لــە ئولول واتا مانگــی ئاوت ـ سپتامبر ـ رەنگ بێ لــە ساڵی ٧٦٤ ] دا لە [ کاراکاش ] ـ کە رەنگ بێ هــەمان [بیت ـ کاری ] بێت ، ١٤ ، kI ][١٣٧] ، لە مادای [ ٣١و kn ] وە هینی تر • لــە کۆتایی ساڵدا باری وڵات ئاڵۆز تر بو ، ئەسکیتەکانیش بە هاوکاری خــەڵك بەرابەر بە ئاشور وەستان [لە ناوچەکانی بیت کاری و مادای ٢٠و kI ، لــە ناوچــەکانی بیت کاری و ساپاردا ، ٣٠و kn میژوی دوا پرسیاری مــانگی ئازەر واتا فوریە ـ مارس ـ بو • وە رەنگ بێ لە ساڵی ٦٧٣ی پێش زاینــی بوبێت ] •

ئاشکرایە ئەسکیتەکان تەنیا لە رێگای خاکی ماناوە ئــەیان توانی بچنــە ئەوێ ، وە بەم هۆیەوە ئەبێ رونی بکەینەوە کە لەو کاتانەدا [وە لــە وانەیە

نەختێك بەر لەوە] ئـەبێ چ رووداوێك لـە مانادا رویدا بـێ ؟• نوسـراوەی ئاشوریەكان لەبارەی لەشكر كەشیەوە بۆ سـەر مانا زۆر بـە كورتی باس ئەكەن ، وە ئەمـە بـەڵگەی ئەوەیـە سـەركەوتنیان تیا بـەدەست نەهێناوە • نوسراوە :

من خەڵكی كیشوەری ماناو گوتیەكانم پەراگەندە كرد ، وە لـەشكری ئیشپاكای ئەسكیت كە هاوكاری ئەوان بون نـەی توانی رزگاریان بكات بـە هێزی چەك ئەوانیشم بەزان ، داخەكـەم مێژوی ئـەم نووسینانە نەنوسراوە ، بەڵام ئەوە نیشان ئەدات كە جڵەوی كار بە دەستی مانایەكانەوە بووە ،چونكە پادشای ئاشور لە خوای خۆی پرسیار ئەكات كـە ئیسپائایا مانایەكان سـەر ئەكەون یام نەء ؟ قەڵاكانی شارو عیكبیو دور ـ ئالیل داگیر ئەكەن یان نەء ؟ وە [چەند قەڵاو شوێنێكی تر كە ناویان لە یاد نەماوە] • لە واقیع دا مانایەكان سەركەوتنو توانیان چەند قەڵایەك داگیر بكەنو لەوانەش شارو عیكبی تیا بو، ئاشوریەكان لە دوای چەند ساڵێك قەڵای ناوبراویان گرتەوە •

لە زوربەی ئەو پرسیارانەدا ناوی مانایەكان بە بێ یەكگرتنەكانی ئەوان باس كراوە ، بەڵام لە دواییدا دەر ئەكەوێ كە كیمریەكان چونە ناو ئەوانەوە• یەكەمین جار كە ناویان براوە لە نوسراوەكەی [بلوشزیب] غەیب گۆی بابلی دایە • كە لـە دەرباری ئاشوریەكانا بووە ، وە لـە بارەی ئاسار خادونـەوە نامەیەكی دورو درێژی نوسیوەتەوە(١٣٩) • لـەو نوسراوەیەدا ئەڵێ : كـە گفتوگۆ لەگەل كیمریەكانا بووە ، وە ئەوان بەڵێنیان دا كـە لـە بوارەكانی نێوان ئاشورو مانادا خۆیان تێ هەڵ نەقورتێنن • بەڵام نوسەری نامەكە لـەو باوەڕەدایە كە نابێ باوەڕ بە بەڵێنەكانیان بكرێ(١٤٠) وە لە بارەی تێپەڕ بونەوە لەو گەردنەی كە لە خاكی مانادا كۆتایی پێ دێت ، وە هەر وەها چۆن ئەبێ لە نێوان مانایەكانو كیمریەكانا بدۆزرێتەوە چـەند راسپاردەیەكی پادشـای ئاشور ئەكات • [ناوی بلخابو ـی مانایی]یشی لە نامەكەدا هێناوە ، هەروەكو

باس کرا ــ رەنگ بێ ناوی ئــەم پادشایەیماننا لــەو ســەردەمەدا بو بێــت [ ئەگەرچی ئەم ناوە ئاکادی ] یە • بەڕای زوربە ئــەو پرسیارە لە بارەی دوارۆژو چارەنوسی لەشکرکەشی دژی مانناییەکان [٤٢ .kn ]و بەشێك لە پرسیارەکەش [٢٤ .kn ] کــە بارەی کیمریەکانەوە ــ بە بونــەی ناوی [ئاخ پیسم] پادشای مانناوە[١٤١] بە شێوەی سادە باسی کردوە • [ڕۆشن نیــە کە ئایا کیمریەکانی بە دوژمنی ئاشور داوەتە قەڵەم یان ماننا] •

بەم جۆرە ئەبینین کە لە دوای ئەوە نەك کیمریەکان بەڵکو ئەسکیتەکانی ــ ئاشکیدا لە خاکی مانادا مابونەوە • پرسیارێك کە [٤٨ ,kn ] بە میژوی مانگی سیمان ــ ژوئن ــ رەنگ بێ ساڵی ٦٧٤] بووە ئەڵێ : ئایا لــە هــەمان مانگدا [لەشکری ئەسکیتەکان کــە لــە سەر زەمینی کیشوەری مانادا ئەژیان ــیان نیشتەجێ بوبون ــ وە بەرەو سنورەکانی ماننا هاتن لــە گــەردنەی خو بوشکیەوە هاتونەتە ئاواییەکانی خران [خاران] و ئانیس[١٤٣] ئەیانەوێ تاڵان بکەن یان نەء ؟ وە ئایا تاڵانی زۆر ئەکەن وە لە سنورەکانی ئاشور دیلی زۆر ئەگرن یان نەء ؟] • لەبــەر ئەمــە مــەترسی پــەلامار بردنی ئــەسکیتەکانی سەرزەمینی ماننا ــ لە ڕێــگای گــەردەنەکانی خوبوشکیەوە [ناوچەیەکە لــە دەراوی روباری بەختان ــ لە خوارەوی دەریاچەی وانەوە] بۆ سەر ناوچەکانی سنوری ئاشــور زۆر مــەترسی هــەبو • ویستیان هێزێکی ئاشوری بنێرن بــو خوبوشکیە بــەڵام لــەوە ئــەترسان کــە مانناییەکان پەلاماری ئــەو هێزەیان بدەن[١٤٤] •

لە هەمو گرنگتر ئەوەیە کە ئەسکیتەکان لێرەدا وەکو کیمریەکان خۆیان ئەنواند ــ رون کردنەوەی ئەم چونیەتیە دوو روی هەیە : یەکەم ــ لە کاتی رۆیشتنا دەستە کۆمەڵێك لە کیمریەکان لە قەفقازی مەرکەزیەوە بۆ ئاسیای بچوك ــ بەشێك لەوان لە خەڵکی رەسەنی هۆزە ناوبراوەکان جیــا بونەوەو چونە ناو ئەسکیتەکانەوە ، وە بــە پێی ڕێکــەوتنی ئەوانــە چونە ناو خاکی

مانناوه وه لەگـەل ئەو کیشوەرەدا یـەکیان گرت • دوەم ـ سەرچاوە بابلی زمانە کانو هەندێ جاریش ئاشوری زمانەکان لـە هەندێ کاتا [کیمریەکان] بە هەمان [ئەسکیت]ی [ئاشکیدا] ناو ئەبـەن • بـەلای ئیمـەوە روی دوەمی بـسەکە راست ترە •

بەم رێگایە لە سالی ٦٧٤ی پێش زاینی دا ئیتر مانا خەرج گوزارو هاو پەیمانی ئاشور نـەبوە ، بـە بیروورای کامرون ئاشوریەکان ناچار بون بـەم هۆیەوە شێوەی ئەسپ گیری بۆ پڕ کردنەوەی پێویستیەکانی سوپای خۆیان بگورن ، وە لە جاران قایمتر کەوتنە پەلامارداناو تالان کردنی مادەوە •

ئەم روداوە بەر لەوە کە ئەسکیتەکان لە ناوچەکانی مادی ئاشوردا ـ کە کەوتبوە خواروی مانناوە ـ دەسەلات پەیدا کەن ،رویدا • شـەڕ لـە سـەر سنورەکانی مانادا بەهۆی لەشکری گەورەی ئاشورەوە کـە ئەیویست مادی رۆژ هەلات داگیر بکات بەرگری لێ کرا ـ بەلام پەلاماری ئەسکیتەکان بۆ مەرکەزی ماد بناغەی حاکمیەتی ئاشوری لـەو ولاتانەی کـە زوتر داگیر کرابون خستە زەلزەلەوە •

ئەسکیتەکان بەر لە سالی ٦٧٤ی پێش زاینی لە مادی مەرکەزیدا پەیدا بون ، هەروەکو [لەمەوبەر وتراوە] ئەسکیتەکان لەبەر ئـەوەی مادەکان لـە بەرامبەر ئاشورەکانا بە یەکجاری راوەستان پشتگیری یان لە مادەکان کرد بە تایبەتی کە مانناییـەکان لـەگـەل ئەسـکیتەکانا هاوکار بون(١٤٥) • چـەند سەرچاوەیەکیش ئـەلێن : عیلامیـەکانیش ئامـادە بون یارمـەتی راپەڕیوەکان بدەن(١٤٦) • لەبەر ئەمە هەمو هۆزەکان بونە بەردیەکی یەکگرتو ، وە لـە روی دەسەلاتی ئاشورەکانا راوەستان •

## ٤ ـ راپەڕینی کشمتریتی لە ماد

مادەکان لە نەورۆزی ئاشوری مانگی مارس ـ ئاوریل [نیسان]ی سالی

۶۷۳ دا(۱٤۷) راپەڕین • [کشتریتی] خاوەن ئاوایی [کار – کاش] رابەری ئەم راپەڕینە بو • ئەو توانی یارمەتی لە [مامی تیارشو] خاوەنی پێشوی ئاوایی لە ولاتی مادای(۱٤۸) وە [دوسانني] خاوەنی پیشوی ئاوایی لە ولاتی ساپاردا وەر بگرێ • ئاشکرایە کە لێرەدا مەبەست لە خاوەنی ئاوایی ویسپاتی vispati نەبوە بەڵکو دهیوپتی Dehyupati یە •هەریەك لەم سێ پێشەوایە نیشتەجێی ناوچەیەك بون لەو سێ ناوچەیەی ئاشور [بیت کاری ، مادای ، ساپاردا] کە سەروکی ئەو ناوچانە بەهۆی ئاشورەوە لەگەل ئەو هەمو گیرو گرفتانەدا روبەروو گیرۆدە بوبون • ئاشوریەکان بۆ مەبەستی خۆیان لە هەر ناوچەیەك یەکێکیان کردبو بە پێشەوا •

بەم جۆرە خەڵکی سێ ناوچە بە سەرەکایەتی سێ پیشەوای وەکو یەك توشی گیرودار بون ، بەڵام وەکو دەر ئەکەوێ سەرۆکایەتی کشتریتی بێ گیروگرفتو رەخنە بو • بەڵام ئەم هەڵبژاردنە لە نوسراوە ئاشوریەکانا دیار ناکەوێ چونکە ئاشوریەکان ئەویان بە رەسمی نەئەناسی •

لە نوسراوەکانی ئاسار خادون شەڕ لەگەل کشتریتی وەکو لای خوارەوە بوە : [من کیشوەری بارناکا ، دوژمنی محتال ، وە دانیشتوانی « کیشوەر » تیلا شوری کە ناوی لەسەر زاری خەڵکی محزانو(۱۵۰) – شاری – پیتانویە • ویرانم کرد ، ئەم راپورتە نوسراوەیەی سەرەوە ماوەی ئەوە نادات کە لەم کاتەدا ئاشوریەکان بە سەرکەوتو دابنێین • چونکە ئەو سێ پێشەوایە لەیەك کاتا دەستیان بەکار کردن کردوە ، وە لەگەل پادشایی ئەسکیت [رەنگ بێ لەگەل ئیشپاکای] و ماننا [ئەویش رەنگ بێ لەگەل ئاخسیری] یەکیان گرتبو ، راپەڕیوەکان توانیان لەو کاتەدا لە چەند لایەکەوە بکەونە شەڕەوە ، راپەڕینەکە بە گورجی دەستی پێکرد ، زۆری پێ نەچو کە لە سنوری سێ ناوچەی سەرەتایی تیپەڕی کرد • ئەبینین کە لە سەرەتای مانگی ئایار [ئاوریل] لەشکرەکەی کشتریتی لە ناوچەکانی دەورو بەری

[کیشەسو] بون وە قەڵای ئەو سەرزەمینەیان کە بەهەمان ناوی [کیشەسو] ناویان نابو گەمارۆیان دا [ئەمە لە نوسراوەکانی کیشاسو وەرگیراوە][١٥٢] • کیمریەکان [واتا ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیدا]و [مادەکان] [واتا خەڵکی مامی تیارشو] وە مانناییەکان لەگەل ئەوا یەکیان گرت[١٥٣] • هەر لەو کاتەدا ئاشوریەکان لەبارەی دوارۆژی ئەو قەڵایانەی ترەوە کە لە مەترسیدا بون ـوەکو کاربیتو[١٥٤] کە لە لایەن لەشکری ناوبراوەوە گەمارۆ درابو ، وە قەڵایەکی تر کە ناوەکەی لە یاد نەماوە[١٥٥] وە لە لایەن دوسانتی ساپاردی یەوە گەمارۆ درابو ـ لە یەزدان ئەپاڕانەوە •

لە بەرواری ٤ی ئایار لەبارەی دوارۆژو چارەنوسی قەڵای سو ـ با ـ کە لەوە ئەچێ [سیبارا] یان [سیبوار] ـ لە ناوچەی زنجانی ئیستا دابوە ـ لە لایەن لەشکری کشتریتیو هاو پەیمانەکانیەوە گەمارۆ درابو ـ ئەوەی کە مادەکان قەڵای ئاشوریەکانیان گەمارۆ ئەدا زۆر جێگای سەرنج بووە •چونکە نەك هەر تەنیا رواڵەتی شەڕێك نیشان ئەدات بەڵکو بەڵگەی راپەڕینو شۆرشێك بووە کە لە زەمینەیەکی ستراتیژیو هونەری جەنگیدابەرپا بوبو• بۆ نمونە ئەو لەشکرەی کە مەرکەزێکی گرنگی ئاشوری وەکو قەڵای [کیشەسو] یان گەمارۆ دابو ئەوانە نەبون کە لە ترسی نزیك بونەوەی لەشکری ئاشور دێکانی خۆیان چۆڵ کردبو وە پەنایان بردبوە بەر چیاکان •

بەراستی لەم کاتەدا ئەو تاقی کردنەوەی کە مادەکان لە ماوەی ساڵەکانی یەك لە دوای یەکی شەڕکردن لەگەل ئاشوریەکانا وەریان گرتبو بە روناکی دەرکەوت ، جگە لەمانە کشتریتی ـ رەنگ بێ ـ لەگەل بیابان نشینەکانی هاو پەیمانی خۆیا تاکتیکی تایبەتی شەڕو تیر ئەندازیو سواری شەڕو راکردن یان فێر کردبێ • بەم جۆرە لەشکرەکانی ئاشور ئەوانەی لە دوری قەڵاکانەوە بون کەوتنە راکردنو خۆ شاردنەوە کە لەو کاتەدا لەشکری

ئاشور بە لەشکرێکی ئازاو بەهێزو پڕ چەك ناو ئەبران • لە ئەنجامدا مادەکان توانیان بە لەشکرەکەیان قەڵاکانی ئاشوری گەمارۆ بدەن •

هەرچۆن بێ لە سەرەتای مانگی ئایار ناوەراستی ئوریل] ساڵی ٦٧٣ی پێش زاینی ئەو سەرزەمینە فراوانە هـەموی یاخی بو ، خەڵکی سەرانسەری مادی مەرکەزی بـەرپا بونو شورشگیرەکان دەستیان کرد بـە پـەلاماردانو هەرەشەیان لە قەڵاکانی ئاشور ئەکردو گەمارۆیان ئەدان •



**قەڵای مادەکان لە کێشەسو لە روی نەخشێکی هەڵکەندراوی ئاشوری گیراوەتەوە لە سەردەمی شاروکین دا ، کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی**

ئاشوریەکان ئەوەیان لەبەر چاوا بو کە لە [ گەردنەی ساپاردا ][١٥٦] تیپەڕنو قەڵای [کیلمان] داگیر بکەن چونکە لەوە ئـەچو ئەگەر ئـەو قەڵایە

بکرێ بـه پایـه‌گاهی سـه‌ربازی ئـه‌توانن به‌ربـه‌رچی هـه‌ڵمه‌تی مـاده‌کان بده‌نه‌وه(١٥٧) ئاشترك له‌و باوه‌ڕه‌دایه که ئه‌مه هه‌مان [کولمان] بێ کـه لـه نامه‌کانی سه‌ڵته‌نه‌تی ئاشوریه‌کانا باسی لێوه کراوه(١٥٨) وه هه‌روه‌ها له به‌شی خواروی وڵاتی خار خاره‌وه بوه •

هه‌روه‌کو له‌مه‌وبه‌ر وتمان ساپاردا له سه‌ره‌تاوه به‌شێك بووه له وڵاتی ناوبراو • ئێسته باسی له‌شکرکه‌شی دژی ماده راپه‌ڕیوه‌کان ـ له لای خواره‌وه‌ـ ئه‌که‌ین ، که له نوسینه‌کانی ئاسار خادون دا باسی کراوه(١٥٩) گۆیا له‌شکر که‌شی ئاشور سه‌رنه‌که‌وت : له مانگی سیمان [مانگی ـ ژوئن] شورشگێره‌کان جارێکی تر هه‌ڕه‌شه‌یان له قه‌ڵایه‌کی تر کردووه(١٦٠) • له ناوه‌راستی ژوئن [ ٢٥ی سیمان ] پرسیارێکی ترمـان ده‌ســت کـه‌وتوه کـه لـه باره‌ی وڵاتی [بیت‌هامبان] له‌و په‌ڕی خواروه‌وه‌یه [به‌داخه‌وه له‌م پرسیاره جگـه لـه ناوی ئه‌سکیته‌کان ـ ئیشکوزا ـ هیچ شتێکی تر نه‌بو • له‌م کاته‌دا ناوی کیمریه‌کان نـه‌براوه(١٦١) • پرسیارێکی تر دیسـان ده‌رباره‌ی مـه‌ترسی لـه لایـه‌ن کۆمه‌ڵێکه‌وه که ناوی نه‌براوه [ره‌نگ بێ هه‌مان کشتریتی]و [سی سیرتو(١٦٢) که هه‌ڕه‌شه‌ی له قه‌ڵای خارخاره‌کان ئه‌کرد لـه سنوری عیلامدا بوه ، لـه وه‌ڵاما وتراوه ئـه‌م قـه‌ڵایـه ئـه‌ناسین که سیناخریب [ ئاللیپی ] گرتوه وه خستبویه سه‌ر وڵاتی خارخار • وه له ناوچه‌ی [ بیت باروئا ] دایـه ، وه ناوچه‌ی ناوبراو سه‌رده‌مێك به ده‌ست ئورارتوییه‌کانه‌وه بووه دوایی له لایه‌ن تیگلا تپالاساری سێیه‌مه‌وه داگیر کراوه •

ئاشور که سه‌رانسه‌ر خاکی مادی به ده‌سته‌وه بو ـجگه له زامواو ••• ـله ده‌ستی دا ، وه کشتریتی هه‌ڕه‌شـه‌ی لـه دوا گه‌رده‌نـه‌ی ناوچـه‌کانی بین‌النهرین ئه‌کرد • دیسـان له پارسواش باری چۆنێتی به ئارام نه‌بو • لـه‌وه ئه‌چێ ئه‌و نامه‌یه‌ی که [نابوریمان] سه‌رۆکی وڵاته کانی پارسوا بۆ پادشای ئاشوری نوسیبو(١٦٣) له‌و سه‌رده‌مه‌دا بو بێت • ئـه‌وه‌ی نامه‌کـه‌ی نوێ بوه

ئەڵێ : کە ئەندامانی هۆزی [زالیتیپیان] لەشکری ماننا ــ لە کاتێکدا کـە ئەو ئەندامانە خەرج‌و باج‌و ئەسپیان بۆ [نیکور] ئەبرد گرتویانن • چوار کەس



**قەلاکوتێکی ئاشوریەکان ، لە روی نیگارێکی هەڵکەندراوی ئاشوریەکان وەرگیراوە**

لەوانە رایان کردوەو چونەتە [نیکور] وە ئەمەیان بـە سـەرۆکی وڵاتەکان گەیاندوە ، سـەرۆکی باسکراو داوای لـە پادشا کردوە کـە جەنگاوەرێک لە پاسەوانە تایبەتیەکانی خۆی بنێرێ بۆ قسە لێ وەر گرتنی ئەمانە •چونکە زالتیپیان خەرج‌و باجی خۆیان بۆ پایتەختی پارسوا ئەنارد •وەکو دەرئەکەوێ کە خاکی ئەو هۆزە بەشێك بوە لەو وڵایەتە • بەم جۆرە مانناییەکان ئـەیان توانی پەلاماری سەرکەوتوانـە بەرنـە سـەر ئـەو ناوچـەیـەو دەستیان لێ بوەشێنن(١٦٥) •

چۆنیەتی بە پێی بەرژەوەندی ئاشــور نەبو ــ بە تایبـەتی لـە پشتی سەرەوە ــ لە فنیقیە ئاڵۆزی‌و پشێوی دەستی پێ کردبو ، شەڕیش لـەگـەل میسردا هێشتا کۆتایی پێ نەهاتبو • جگە لەمانـە لـە دوای روداوەکانی ماد خەڵکی ئاشور هەمو بێزار بوبون ، ئاسار خادون ناچار بو بـەر لـە کۆتایی جەنگی ماد لەشکری کردە سـەر ناوچـە دارستانەکانی ئەرمەنستان ــ واتا

شوبریا ــ تا ئەو کــەسانەی لــە خاکی ئاشورەوە رایان کردۆتە ئەوێ بیــان گرێت(١٦٦) • گومانی تیا نیە کە کۆمەڵێك لەوانە دیسان رایان کردبوە خاکی مادەوە ــ چونکە لەوێدا ئەیانویست تۆڵەی خۆیان لــە ئاشور بکەنەوە • لــە دوای روداوەکانی ماد ــ لە نیوەی دوەمی ساڵی ٦٧٣ هیچ جۆرە زانیاریەکمان بە دەستەوە نیە(١٦٧) بەڵام ئەوەندە ئەزانین باری ناو خۆی ئاشور باش نەبو، وە لە سەرەتای ساڵی تازەی ٦٧٢ی پێش زایینیدا ئەوانە تێکۆشان تاکو لەگەل کشتریتی دەست بە گفتوگو بکەن •

چەند نوماینەدەیەك چو بۆ لای پێشەوای شورشگێرەکان(١٦٨) ،کۆنترین پرسیارێك لە بارەی مێژووی ساڵی تازەی ئاشورەوە لەوە ئــەچێ سـەرەتای مارسی ساڵی ٦٧٢ی پێش زایینی بوبێت(١٦٩) •

ئاشوریەکان زۆر هەوڵیان ئەدا تاکو دوبەرەکایەتی لەناو یەکگرتوەکانا دروست بکەن وە بەم مەبەستەوە جیا جیا قسەیان لەگەلدا ئەکردن •هەروەها ئــەم گفتوگویــەش لە گــەل ئەسکیتەکانا دەستی پــێ کردبو(١٧٠) • وەکو لەمەوبەر وتمان لــە هەمو پرسیارەکانا تەنیــا باسی کیمریەکانو ئەسکیتەکان [ئیشکوزا] هەیە •

باری چونێتی ناوخۆی ئەسکیتەکان ئاڵۆزا ، چونکە یەکــەمین پادشای ئەسکیتەکانی ئاشکیدا کە ناوی [ئیشپاکای] بو لە شەڕدا کوژرا • ئەم روداوە نازانرێ لە چ بەرواریکدا رویداوە • لە مانای وتە نوسراوەکانی ئاسار خادون وا دەرئەکەوێ کە بەرواری مردنی ئەو لە شەڕی نێوان ئاشورو ماننادا وە لە ساڵی ٦٧٤ی پێش زایینیدا بوبێت • بەڵام لەو نوسراوە ناوبراوانەدا لە بارەی راستی بەروارەکانەوە کــەمتر جێگای پشت پێ بەستنە • بــە بیروڕای ئێمــە ئیشپاکای لە کۆتایی ساڵی ٦٧٣ی پێش زایینی دا کوژراوە ، وە مەرگی ئەو بو بە هۆی سەوکەوتنی ئاشوریەکان •

سەرچاوەی ئاشوری پارتاتوا [ پروتوتی ] پادشای تازەی ئەسکیت بــە

پادشای [کیشوەری ئیشکوزا] واتا پادشایی ئەسکیت لە ئازربایجان ـ ناو ئەبات بەلاّم بـە پیشەوای ئـەسکیت ناوی نابات[١٧١] • وەکو دەرئەکـەوێ کـە پارتاتوا دیسان لە مێژوی ئاشوردا دەورێکی گرنگی گێرابێ[١٧٢] • بەلاّم ئەو دەورەی کە [مادئی] کوڕی گێڕرا بوی گرنگتر بووە •

## ٥ ـ دامەزراندنی پادشایی سەربەخۆی «مـاد»

لە دوای رویشتنی پارتاتوا راپەڕینەکە بە ناتەواوی مایەوە ئاشوریەکان ولاّتی [کیشەسو]و خارخار[١٧٣] و بیت هامبانیان پاراستو دەستیان بـەسەرا گرت ، هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئـەڵێن کـە راپەڕینەکـە بوو بـە هۆی شکستی مادەکان مردنی کشتریتی • بەلاّم سەرچاوەکان پشتگیری لەم وتەیە ناکەن • هۆی وتنی ئەم وتەیە چاولێکەری کوێرانەو شوێن کەوتنی سەرچاوە رەسمیە ئاشوریەکانە کـە تەنیا باسی سـەرکەوتنەکانی خۆیان کردوە[١٧٤] ، بەلاّم لە واقیعدا روداوەکان پێچەوانەی ئەمە بووە ، وە ئـەتوانین بڵێین کـە راپەڕینەکە لە ناوچەکانی بیت کاریو مادایو ساپاردا دا زۆر بەباشی سەری گرت وە دەسـەلاّتی ئاشور لـەو ناوچانـە لـەناو چـوو[١٧٥] ، سـەرچاوە مێژوویەکان لەو کاتە بەدواوە لە جێگای ناوی ئەو سێ ولاّتە باسی پادشایی سەربەخۆیی ماد ئەکەن کە ئەمەش لـە ساڵی **٦٧٣ی** پێش زاینی دا دەستی پێ کردوە •

لە نوسراوەیەکی سەڵتەنەتی ئاشوریەکانا کە لە ماوەی ساڵەکانی **٦٧٢** و **٦٦٩ی** پێش زاینیدا نوسراوە[١٧٦] وە دوایی لە ناوەڕۆکی زنجیرەی ناوی پادشایان دا کە ئاشوریەکان بە سەربەخۆیان دائەنان بـەلاّم سەر بـە ئەوان بون ـ وە لە ساڵەکانی **٦٦٩** تا **٦٥٢** ی پێش زاینی بوە[١٧٧] ناوی پادشانی ماد هەروەکو ئورارتو خوبوشکیەو ماننا ـ وەکو کیشوەرێکی سـەربەخۆ ـ باس کراوە •

لەو پادشا نشینە تازانـەدا کێ فـەرمـانی ئـەکرد ؟ چـارەنوسی سـێ یەکگرتو ـ واتا [کشتریتی]و [مامی تیارشو] و [دوسانی] چی بو ؟ پەیوەندی ئەوانە لە روی کۆمەڵایەتی‌و رەگەزو هۆزایەتیەوە چون بوە پەیوەندی‌یان بە چ جۆرە کەسانێکەوە بووە ؟

[پراشک][178] لەو باوەڕەدایە کە [مامی تیارشو] رابەری راپەڕینەکە بووە ، وە تەنیا بەڵگەی ئەو ئەوەیە کە ئەو نوسراوانەی هەیە تەنیا بە [ماد]ی ناو بردون • بەو هۆیەوە ئەو [مامی تیارشو] و [دیوك] کە لـە نوسینەکانی هرودوت دا باسی کراوە بەیەك کەس دائەنێ • بەڵام ئێمـە لەمەوبەر وتمان کە لەو کاتەدا وشەی [مادای] بە هۆزە یەکگرتوەکانی ماد نەوتراوە ، بەڵکو وا ئەگەیەنێ کە ئەو کەسە لە خەڵکی ولایەتی [مادای] ئاشور بووە ، وە ئەو ولایەتە بەهیچ جۆرێك خاکی ماد نەبوە • ئـەو بیروڕایە کـە ئـەڵێ [مامی تیارشو] رابەریەکەی گرتبوە ئەستۆ لەگەل واقیعدا جیاوازە ، چونکـە وەکو دەرکەوتوە بە بێ جیاوازی کشتریتی بـە یاوەری [ژمارەیەکی] ئاشوریەکان دراوەتە قەڵەم وە ئەوانی تریان بە هاوکاری ئەو زانیوە[179] •

بیروڕایەکی تر دەرکەوتوە [ کـە لە ـ سیس ـ ریشە وەر ئەگرێ ] ئەوەیە کە کشتریتی وکیاکساری یەکەم [کە ـ دیودور ـ لە کتێبەکەی خۆیا ناوی بردوە وە ئەوی لە جیگای دیوك باس کردوە] ئەمە یـەك کـەس بون بەلام دیودور بە هەڵەوە ناوی ئەم پادشایە بردوە ، چونکە لەو کاتەدا وتەکانی هرودوت ئەگێڕێتەوە[180] وە جگە لە نوسراوەکانی هرودوت وکتسیاس لـە سەرچاوەکانی تر سودی وەر نەگرتوە ـ وە لەگەل ئەوەدا هرودوت‌و کتسیاس بەهیچ جۆرێك ناوی کیاکساری یەکەم نابەن • وە جگە لەمەش لـە بارەی زانستی زمانەوە بە هیچ جۆرێك ناتوانی ناوی کیاکسار بەناوی کشتریتی یەوە بکات بە یەك •

راست تر ئەوەیە کە ناوی [کشتریتی]و ناوی مادی [خشتریت] کە لـە

نوسراوەکەی داریوشی یەکەم لـە بێستوندا نوسراوە بەیـەك بزانین • لـەو نوسراوەیەدا وەها وتراوە : [پیاوێك کە ناوی فرورتیش [= فرائورت](١٨١) خەڵکی لەشکری مادی هێنایە شۆڕش • ئەو وتویە : [من کە ناوم خشتریتە لە بنەماڵەی کیاکسارم] هوخشتەر بەم پێیە یەکێک بـە ناوی فرائورت بـە مەبەستی وەرگرتنی یارمەتیو کۆمەکی مادەکان خۆی بە پاشماوەی کیاکسار [واتا دیوکیەکان] ناو بردوە ، وە لەبەر ئەوە مادەکان زۆرتر قانع بن لە جیاتی ناوی ئەسڵی خۆی – کە لە بنەماڵەی دیوکیەکان رەواجی نەبوە – ئەو ناوەی لە خۆی ناوە کە لە هۆزەکەیانا باو بوە(١٨٢) • لێرەدا ئەگەینە ئەو ئەنجامە کە کەسانێك بە ناوی فرائورتەوە لـە بنەماڵەی دیوکەکان نەبووە ، بـەڵام یەکێک بـە ناوی [خشتریتا] وە بوە ، لـەم کاتەدا هرودوت تێ کـەوتوەو گومانی پەیدا کردوە • ئەو کەسەی کە ئەم داستانەی بۆ ئەم گێڕاوەتەوە – بەو جۆرەی بـاس کردوە کـە خـەڵکی باسیان کردوە وە هـەندێك ناوی فەرامۆش کردوە کە لە جیاتی هەریەك لەوانە یەکێکی تری بـە پێچەوانەوە باس کردوە – رەنگ بێ ئەم هەڵەیە کە هرودوت کردویە هۆی ئەوانە بوبێ کە باسەکانیان بۆ گێڕاوەتەوە ، هـەروەها ئـەو کـەسانەی کـە باسەکانیان گێڕاوەتەوە زمانی یۆنانیان نـەزانیوە وەیان هرودوت دوای ماوەیـەك کـە باسەکەی بیستوە ئینجا نوسیویەتیەوە • ئینجا لەبەر ئەمە ئەبێ لە جیاتی ناوی [فرائورت] لە ناوەڕۆکی ناوی پادشایانی مادا [خشتریت] دابنێین • وە ئـەم ناوە بە زمانی بابلیەکان ئـەبێ بڵێین [کشتریتی](١٨٣) وەیان [کاشتریتو] یان شتێك کە لەم شێوەیە بچێ دای بنێین(١٨٤) •

بـەم جۆرە کشتریتی یان رەوانتر بڵێین – خشتریتا – ئەبێ لـە ریزی پادشایانی مادا جێ نشینی فرائورت بێ • ئەگەر باوەڕ بە وتەکانی هرودوت بکەین ئەوا [خشتریتا] کوڕی وە یان نەوەی [دیوك] بووە(١٨٥) •

لەمەوبەر بیروڕامان دەربڕی ، وڵاتەکەی ئەو کە ناوی – بیت کاری –بو

مەرکەزەکەی قەڵای کار ــ کاشی [نیشتەجێی کاسیەکان][١٨٦] بووە ∙قەڵای بابنیەکان یان [سیلخازی] کە رەنگ بێو زۆر لەوە ئەچێ هەمان نیشتەجێی کاسیەکان بووە[١٨٧] ئەبێ لە یەکێک لــە شوێنەکانی ئــەم ناوچەیە ــ واتا لە خواروی رۆژئاوای خــاکی ماد ــەوە بو بیت وە لــە دواییدا پایتــەختی پادشایی ماد ــ کە جێگای کۆبونەوەــی [هنگمتانا ــ کە بە یونانی ئاگباتانا یان ئاکباتانای پێ وتراوە] لەو ناوچەیەدا بوبیت ∙ هەروەکو لەمەوبــەر وتمان ، ئەگەرچی لەوانەیە دەسەڵاتی دیوك تا ئەو کاتە لــە ناوچەکانی خواروداا بو بیت بەڵام بەڵگەیەك کە ئەم قــەیە بسەلمێنێ بــە دەستمانەوە نیە ∙ وە هــەر چۆن لێکی بدەینەوە لە ساڵەکانی **٧١٧** تا **٧١٥**ی پیش زاینی بووە ∙ خاکی دیوك تا ئەم شوێنە دریژ نەبوبوەوە ــ چونکە لە نێوان هەندێ ناوچەو ئــەو ناوچانەی کە دیوك حوکمی تیا کردون زەوی‌وزارێك بووە کــە بــە دەست ئاشوریەکانەوە بووە ــ بەم هۆیەوە خاکی دیوك ئەبێ لە ناوچەیەك لە دەراوی قزل ئوزن ــ لەوێدا بو بێت ∙ بە هەر حاڵ کاتی دیل کردنی ئەو ئاوەها بووەو وا دێتە بەر چاو کە لە دواییدا ئــەم ناوچەیە بــە هەمان ئەیالەتی ئاشوری [مادای] ناو براوە ∙ بۆچێ [خشتریت ــ کشتریتی] لێرەدا جێ گیر نــەبوە وە لە ناوچەی خواروتر لە ناوچەی مادای یەکێک بە ناوی مامی تیارشو بــە دەستەڵات بووە ؟ وەڵامی ئەم پرسیارەمان نیــە ∙ لــەوە ئــەچێ ئاشوریەکان خۆیان بە ئارەزوی خۆیان خشتریت یان لــە بیت ــ کاری داناێ تاکو لــەو ناوچەیەی کە رشتەی رەسەنی خۆیەتی دوری بخەنەوە ∙∙ ئــەبێ ئــەوەمان لەبیر نەچێ کە خشتریت [کشتریتی] هــەروەکو کوڕ وەیان نــەوەی دیوك بووە ــ زۆر لەوە ئەچێ لە خاکی ئاشور پەروەردە کرا بێ ∙ چونکــە دیوك لەگەل بنەماڵەی خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە دور خراوبوە ، ئاشوریەکان لەو باوەڕەدا بون کــە لاوێکی مادی کــە پــەروەردەی دەستی ئەوانە ــ وەکو زوربەی ئەوانەی تر کە پەروەردەیان کردووە لە لایەن ئەوانەوە کراوە بــە

پادشاو حوکم ڕەوا ــ لەسەر ئەو سیاسەتە ئەڕوات کە سودی ئاشوری تیـا بێت • لەوە ئەچێ کە تەنیا کشتریتی لـە ئەوەی دیوك نەبوە ، بـەڵکو مامی تیار شۆش دیسان بە ئەوەی ئەو دائەنرا • وە هەریەك لەم دوانە لە بەشێك لە ناوچەکانی پیشوی سەر بە دیوك دا بە دەستەڵات بون •

خشتریت [کشتریتی] و هاوکارەکانی ئەو لە روی نژادو هۆزەوە کێ بون ؟ ناتوانین بە بیروڕای خۆمان لـە خۆمانەوە حوکـم بدەین • هـەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد زمانی مادی ئیرانی زمـانی هاوبـەشی هۆزەکانی مـاد بووە ، وە پەیدا بونی ئەسکیتەکان رەنگ بێ چۆنێتی ئەو زمانەی زیاتر لـە جاران پتەو تر کردبێ ــ چونکە بەبێ زیادو کەم ئەتوانین بڵێین کە ئەسکیتەکان ئەو زمانەیان بە ئاسانی ئەزانی(١٩٠) وە هەر بـەم بۆنەیەوە ئەمـە بوە هۆی تێگەیشتن و هـاو عەشیرەتی ئـەسکیت و مادەکان • جگـە لەمـە رەنگ بێ ناوبانگ و دەسەڵاتی مغەکان لـە سەرانسـەری خاکی مادا لـەو سەردەمەدا جێگای خۆی گرتبێ ، وە زمانی مغەکانیش زمانی ئیرانی بووە • بەم جۆرە رەنگ بێ کە لەو چەرخەدا لە سەرزەمینی ماد زورتر زمانی نوسینی ئیرانی بایەخدار بووە ــ هەروەکو لە دوای بڵاو بونەوەی ئاینی مەسیحی لە روسیە دیسان نوسراوەی مەسیحی بوو بە باو ، وە لـە کیشوەرە ، ئیسلامیەکانا لـە دوای ئاینی ئیسلام نوسراوەی عـەرەبی باوی پەیدا کرد • لـەوە ئـەچێ هەندێك خەڵك کە زمانیان ئیرانی نەبوە هەروەکو ئەکەوێتە بەرچاو ــ ئەوانە بە هێز تربون ــ وە ئەو نوسراوانەی کە بۆیان لێك نەدراوەتەوە دیسان ئەمە ئەسەلمێنێ(١٩١) • لەبەر ئەمە زۆر بە دڵنیاییەوە ئەتوانین بڵێین کە خشتریت و هاو سوێندەکانی ــ واتا مامی تیار شوو دوسانی ــ ئەمانە ماد بون • بەڵام ئایا لە مادە ئیرانی زمانەکان بون یان کاسپی زمان ؟ ئەوە ناتوانین بـە تـەواوی دەست نیشانی بکەین ، تەنیا یەك وتە هەیە : ئەو ناوچەیەی کـە مەرکەزی دەوڵەتی تازەی تیا دامەزرا ــ لە روی نژادەوە خەڵکەکەیان هـەمـە جۆرە ــ

بوو ـ قەلأی خشتریت [نیشتەجێی کاسیەکان] یان پێ ئەوت •• وە ڕەنگ بێ ئەوە [قەلأی بابلیەکان] پشیان پێ وتبی ، وە لە وێدا بە گەرم خداکانی بابلیان ئەپەرست(١٩٢) • ئەم ناوچەیە کەوتبوە سنوری جوگرافیایی زمانەکانی ئێرانیو [کاسپی] ، [زمانەکانی هۆزە گوتیەکان ـ لولوبئی ـ یان میهران] • وە لە نزیك ئەوەوە چەند ناوچەیەك کە دانیشتوانیان کاسیو عیلامی [ لـە خوارەوە ]وە یان ئارامی [سوریو مادی] وە لە ئاشورە کۆچکردوەکان [لـە لای ڕۆژئاواوە] هەبو • ئاشکرایە کە زمانی ڕەسمی پادشای ماد ـ واتا ئەو زمانە ئێرانیە کە نوسەرە کۆنەکان بە ـ ماد ـ ی ناو ئەبەن ـ بوو بە زمانی یەکگرتوی هەمو هۆزەکان •

خشتریت زۆر بـە ئازایانە توانی گرنگترین ناوچەکانی ماد لـە ژێر ڕکێفی ئاشور ڕزگار بکاتو دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی تیا دابمەزرێنێ •
لە ڕاستیدا خەڵکەکە هـەمویان ئاواتە خوازی ڕاپەڕین بونو ئـەویش ڕابەرایەتی کردن ، خەڵکە ئازادەکانی ماد پشتیوانیان ئەکرد • ئـەم ڕاستیە لێرە بەدواوە دەرئەکەوێ •

هەروەکو دیمان ماد لە سەدەی هەشتەم بریتی بو لە چەند کۆمەڵگایەکی سەرەتای دەوڵەت وە یان چـەند کۆمەڵێك کـە لـە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتێکدا بون ، لەگەل ئەوەشدا لە کۆتایی سەدەی حەوتەم لەگەل ئـەو هەمو گیرو گرفتانەدا کـە دەوڵەتی سـاوای مـادی تیا بو ، ماد کیشوەرێکی یەکگرتوو بەدەستەڵات بو ، وە تەنیا لـە سنورەکانیا [کە لـە دواییدا داگیر کرابون] چەند پادشا نشینێکی خود موختاری هەبو ، لەبەر ئـەوە لـە نێوان ساڵی **٦٧٣**ی پێش زایینیو سەرەتای شەڕی ئاشورو ماد ـ واتا لـە ساڵەکانی **٦٢٥** تا **٦١٥**ی پێش زایینی نەك تەنیا دەوڵەتی ماد بنچینەی دانرا بەڵکو ئـەو پادشا نشینە بچوکانەش ـ کە تا ئەو کاتە بـە سەرزەمینی ماد ناو ئەبران ـ هەمویان لە ناو چونو کەوتنە سەر دەوڵەتی ماد • ئاشکرایە کە ئەمەش بـە

بێ بەربەرەکانێو شەڕی عەشیرەتگەری نەهاتوتە دی[۱۹۳] • وە ئەمە خۆی ماوەی ئەوەمان ئەدات بڵێین کە پادشایانی ماد لەگەڵ تەواوی خەڵکە ئازادەکانا یەك بون ، ـ واتا نەك تەنیا پەیوەندیان بە چینە دەوڵەمەندەکانەوە بوە [ئەو چینەی کە تازە پێك هاتبو] بەڵکو پەیوەندیان لەگەل تەواوی چینە کۆمەلایەتیەکانی ئەو سەردەمەدا وەکو یەك بوە •

پادشایانی ماد دەستەلاتدارو بە جەربەزە بونو [هرودوت]یش ئەمەی باس کردوە ،[۱۹٤] بە هیچ جۆرێك لەگەل چۆنێتی پێشودا کە باسمان کردوە جیاوازی نیە • لە رۆژگاری سەرەتایی هەر کۆمەڵگایەکدا بەربەرەکانی لەنێوان بۆرەپیاوانی ئازادیخوازو سەرەك عەشیرەتەکانا هەربووە، بەلام لە پێناوی لابردنی زورو ستەم لەسەر کیشاوەرزەکان [کشتوکاڵیەکان] خەڵکە ئازادیخوازەکان دەسەلاتی ستەمگەرانەیان ئەنایە گۆڕەوە [ هرودوت I ۹٦ و۹۷] • ئەتوانین ئەمە بە هۆی شێوەی پەیدا بونی رۆژگاری کۆیلەداری دابنێین • ئەم راپەرینە گشتیەی خەڵکی ئازادیخواز دەسەلاتی شورای خانەدانەکانی لەناو بردو سنوری بۆ کێشان • لە شومر[۱۹٥] وە سەرزەمینی یەهود[۱۹٦] و یۆنان بەم جۆرە بو •• لەم ناوچانە تەواوی خەڵکی ئازاد بون ، هەر لەبەر ئەمەیە هرودوت دیوك بە ستەمگەر ناو ئەبا ، بەلام لە بەشی رۆژ هەلاتیدا دەستەلاتی ستەمگەری سەڵتەنەتی لە دوایدا چ گۆڕانێکی بەسەرا هاتو گەیشتە چ رادەیەك ئەمەیان کارێکی ترە • هەر چۆن لێکی بدەینەوە لەناو دەستەلاتی ئەمپەراتوری مادا کە سەدو ئەوەندە ساڵی خایاند ماوەی خراپەو ئاژاوە نەدرا •

لە لایەکی ترەوە لە سەردەمی پادشایی ماددا ، ماد نەیتوانی یەکپارچە بێت • نازانین مامی تیارشوو دوساننی چۆن لەناو ئەو روداوانەدا چونە دەرەوە ، بەلام هەندێك فەرمانفەرمای بچوكو خود موختاری ماد هێشتا لە

دەیەی پێنجەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا ـ وە رەنگە بێ لە دوای ئەوەش ـ هەبوبن •

جگە لەمانە پادشایی ماد بەو جۆرە کە لە لایەن کشتریتی ـخشتریتەوە پێك هاتبو ـ چاوپۆشی لە ترازوی مەرکەزی ناو خۆی ـ هێشتا ئەو کیشوەرەی ماد کە لە سنورەکانی مێژوویی خۆیدا سەقامگیر بو بێت ، واتا ئەو مادەی کە سەرچاوە کۆنە شوناسەکان سەرنجیان داوە ئەوە نەبوە •بەڵام لە ساڵی ٦٧٢ی پیش زاینیدا ئەو سێ بەشە [ئەسلیەی] رەسەنەی کە لە دواییدا بون بە سەرزەمینی ماد واتا پادشایی ئەسکیتو مانناو ماد بە مانای کەلیمە یان بڵێین بە هە مو مانایەك دروست بو •

## ٦ ـ مادو مانناو پادشایی ئەسکیت لە دوای راپەڕینەکە

**دوای رووداوەکانی ساڵانی ٦٧٤ تا ٦٧٢ی پیش زاینی بۆ هەریەك لەو پادشا نشینانەی کە بەشێك بون لە کیشوەری ماد چۆن بوو ؟**

پادشایی ئەسکیتەکان لە روی سیاسیەوە خۆی گرتو مەحکەم بو ، وە بە دەسەڵات ترین ئەمپەراتوریەت واتا ئاشور بە رەسمی بە ناوی [کیشوەری ئیشکوزا] وە ناسی • وە [پارتاتوا] [پروتوتی] سەرۆکەکەی بە شای [ شارۆ sarru ] ناسرا • وە رەنگە بێ ئەو کچەی پادشای ئاشوری خواستبێ کە زوتر داوای کردبو • هێشتا ناتوانین داکوکی لەسەر ئەوە بکەین کە ئەم شێوەیەی دروست بووە تا چ رادەیەك ئەتوانێ بە پادشایی واتا دامەزراندنی دەوڵەت ـ ناو بەرین • بەڵام هەرچۆن بێ ئەوە رونە کە دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە کە زوربەیان ئەسکیت نەبون بەڵکو زوربەیان [ئەلبانیو ئوتیو کاسیو کادوسیو هۆزە نیشتەجێکانی ترو نیوە بیابان نشینو کوێستانی ئازەڵدارو ئەم جۆرە بون] • یەکەمین جار کەوتنە سەر رەوتی شارستانێتیو ژیانی چینایەتی لە ژێر ریژیمی دەوڵەتیدا ، ئەگەر ئەو خەڵکە نیشتەجێ یان نیوە نیشتەجێیانە هاوکاری ئەم کارەیان نەکردبێ ئەسکیتەکان خۆیان توانای

ئەوەیان نەبووە کە دەوڵەتێك لە خۆیان دابمەزرێنن‌و بەم جۆرە شوێنەوارێکی شارستانێتی لە ئاسیای ناوەراستدا بە یادگار لە دوای خۆیان بەجێ بهێڵن ، وە هەر لەو سەرزەمینەدا ئەتوانەوە ، بەڵام کە ئەو بارەی باسمان کرد هاتە پێشەوەو پەیدا بوو خولقا ئەوە بو بە هۆی کاریگەری قەوارەی سیاسی‌و هۆی بنەڕەتی ژیانی سیاسی رۆژهەڵاتی کۆن •

سنورەکانی شانشینی ئەسکیتەکان بۆ ئێمە رون نیە ، بەڵام هەرچۆن بەراورد بکرێ ـ هەروەکو لە پێشەوە وتمان ، کیشوەرەکەیان لەگەل ئاشوردا هاو سنور نەبوە چونکە لە نوسراوەکەی هابل دا ٤٣٤ HABL (١٩٧) بەشێك لە کیشوەرە هاو سنورەکانی ئاشور ـ لە ژورووی رۆژ هەڵات ـ ناوی ئەوان لە ناوا نیە • رەنگ بێ هەروەکو لەمەوبەر وتمان ئەو شانشینە لە زەوی‌و زارێکی بەرینی ترا ـ واتا لەکور [کر] لە ناوچەیەکی روفاباد تاکو سەرزەمینی ژورووی ورمێ وەکو قەرەداخ‌و سبلان داخ درێژ بۆتەوە وە لەو ناوچانەی کە ئوتی‌و ئالبانی‌و کادوسی‌و ••• هی‌تری تیا بوە ـ بریتی بون لە خەڵکی رەسەنی پادشا نشنی ئەسکیتەکان ـ سەقامگیر بون •

ماننا ئەویش هێزێکی پێکەوەنا ، ئاخسیری پادشای ماننا بە بێ زیادو کەم ئەیتوانی خۆی لە بەرامبەر [روسا]ی دووەم پادشای ئورارتودا دابنێت • خاکی ماننا لە لای رۆژ ئاواوە بە ، زیانی ئاشورو ئورارتو تەواو ئەبو(١٩٨) • وە لە ناوچەیەکی بەشی ژورووی زێی گەورە لەگەل خوبوشکیەو ئورارتو هاو سنور بو ، وە سنوری ئەوان لە لای خوارەوە بەرای زوربە بە درێژایی کێوەکانی زاگروس ـ ئەو جێگایەی کە ئێستا سنوری تورکیەو ئێران‌و عیراقە ـ واتا رۆژ ئاوای شاری ورمێ [رەزائیە] وە ئەشنوو سابلاخ ـ درێژ بوبوەوە ماننا لە سەرانسەری کێوەکانی قافلان کو [گیزیل بوندا] لەگەل مادا هاو سنور بوە • لە بەشی رۆژئاوای لەگەل ولاتی ئاشور لە ماد وە لە لای رۆژ هەڵاتەوە لەگەل شانشینی سەربەخۆی ماد هاو سنور بون • سنورە

ڕۆژهەڵات ترەکانی ترو ژورووتری ماننا ڕون نیە •

دیاری کردنی فراوانی پادشا نشینی خشتریت ـ کشتریتی [واتا فرائورتی ناوبراو بە پێی وتـەی هرودوت] گران ترە • وڵاتـەکانی [کیشەسو] یان [کار ـ ئوریگالی] و خارخار ین [کار ـ شاروکین] و بیت هامبان ئەمانە بـە دەست ئاشوردوە مانـەوە ، چونکـە سنوری ڕۆژ ئاوای ماد ـ ڕەنگ بێ ـ نەختێك لـە ڕۆژئاوای ناوچـەی میانە ـ هەمەدان بوبێت • دیاری کـردنی سنورەکانی تری ئەم شانشینە ئەوانیش زۆر گرانن • [هرودوت I و۱۰۲ و۱۰۱] ئەڵێ کە دیوك هۆزی مادی یەك خستو بوو بە پادشایان • بەڵام لـە بارەی فرائورتەوە واتا [خشتریت ـ کشتریتی] ئەوە دەر ئەخا کە ئـەو لـە دوای قایل بونی [ سەڵتەنەت ] حکومەتی مـادەکان بـکات ڕازی نـەبوە وە لەگەل پارسەکانا کەوتۆتە شەڕەوە ، چونکە ئە دو هۆزەی ـ کە هەردوکیان بەهێز بون ـ هێنایە ژێر فەرمانی خۆی ، ئەوجار ئاسیای هێنایە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو هۆزەکانی یەك لە دوای یەك ئەهێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە تاکو لە ئەنجامدا پەلاماری ئاشوریەکانی دا •• هتد • بەڵام ئـەزانین کـە وتەی پێشوی ئەو ڕاست نیە وە جگە لەوە ناتوانین لـەوە دڵنیا بین کـە فرائورت ـ کشتریتی ـ پارسەکانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[(199)] • بەم جۆرە بەرای زوربە لە سەردەمی ئەوا مادەکان یەکیان گرت ، ـ ئەگەرچی پلـەی ئەم یەکیەتیە ناتوانین بە تەواوی دیاری بکەین ـ هەروەکو ناتوانین بڵێین کـە دەوڵەتی [ئالیپی] بەشێك بووە لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ماد یان نەء ؟[(200)] وە سنوری ئەو کیشوەرە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە تا کوێ درێژ بوبوەوە !•

بە وتەی هرودوت [فرائورت] ـ خشتریت ۲۲ سـاڵ واتا تاکو ٦٥٢ی پێش زاینی سەڵتەنەتی بەدەستەوە بووە ، لەو نووسینانەی باسی ڕۆژهەڵاتی کۆن ئەکەن لە زوربەیانا ئەوە وتراوە کە کشتریت لە شەڕدا کوژراوە ، وە ئەم وتەیە تەواو بێ سەرو بنەو لە ڕاستیەوە دورە •

ئاشوریەکان دوای ئەوە شکان [ئەگەرچی ئەوەندەش سەخت نەبو کـە هێزەکانی ئەو دەوڵەتە وەکو ئەکەوێتە بەرچاو بە تەواوی لـەبن هات] بـە ئارامی دانەنیشت • زۆری پێ نەچو کـە ئاشوریەکان جـارێکی تر لەبـەری رۆژ هەڵات خۆیان نواندو دەستیان کردەوە بە چالاکی •

یەکەم ئامانجی پەلاماری ئـەوان مانا بو ، وە دەوڵـەتی ئاشـور زۆر تەقەللای دا کە ئەوەی لــە شــەڕا دۆڕاندویەتی بیگرێتەوە ژێر دەستی خۆی[٢٠١] • کاتێ لەشکری ئاشوریـەکان بە فەرماندەیی [نابو شاروسور] سەرداری لەشکر لە ساڵی ٦٦٠/٥٩ی پێش زاینی دا لە کێوەکانی زاگروس تیەڕین ، [ئاخسری] مانایی گەلێك هەوڵی دا کـە لـە کاتی حەوانەوەی شەوانەیانا پەلاماری لـەشـکری ئاشوریەکان بداتو لەناویان بات ، بـەڵام سەرنەکەوت • پەلاماری لـەشکری مانـا تێك شکاو ناچار بون پاشـەکشێ بکەنەوە ، ئاشوریەکان هـەشت قـەڵایان داگیر کرد کـە کەوتبونە ناوچەی سنوری خواروی ماناوەو پایتەختی ئەو کیشوەرش کە [ئیزیرتا]بو ، داگیریان کرد[٢٠٢] • ئاخسری بارەگای خۆی کە لە [ئیزیرتا] بو لە ترسانا گوێزایەوە بۆ قەڵای [ئیشتاتو] بەڵام ئاشوریەکان کە لاوەی [١٥] رۆژ [ئیزیرتا] ـسەقزی ئیستا ـو قـەڵاکانی دەورو بـەری [ئوزبیا] « زیبیا ، ئیزی بیا ، زیوبیەی ئیستا » و ئورمیاتە [ئارمیات] یان گەمارۆ دابو ، لە گرتنی ئەوانە بێزار بون وە دەستیان کرد بە وێران کردنی ناوچەکانی خوارەوەو خەڵکەکانیان بە دیل گرتو مەڕوماڵاتەکانیشیان بە تاڵانی بردو ئیتر وازیان هێنا •

ئاشوریەکان لـە رێگای گەڕانـەوەیانا دەستیان کرد بـە داگیر کردنی قەڵاکانی سەر سنور کە مانا ییەکان لـە سەردەمی ئاسار خادون دا داگیریان کردبون ، ئەو زەویو زارەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ماناییەکان بو ـ وە کەوتبوە دو شوێنەوە ـ بەشێکیان لە نزیك شوردیرا [= شوردی ؟ ـ کە کـەوتبوە ناوچـەی دەراوێکی بـەشی ژوروی زێی بچـوك] وە کێـوەکانی خـارسی

[ئارسیته کان] که لـه سەرچاوه ئورارتوییەکانا باسی کراوه • وه کـەوتبوه سنوری پارسواوه ،که له دەورو بـەری ئەوانەدا هۆزی ماننایی [کوموردیان] نیشتەجێ بوبون[۲۰۳] • بـەشی دووەم[۲۰٤] رەنگ بێ لـە ناوچـەیـەکی رۆژئاوایی تری دەریاچەی ورمێوه بو بێت • ئاشوریەکان لـە قەلاکانی ئەو ناوچەیەدا گەلێك چەکی هەمه جۆرەو ئازوقەی لـەشکرو ئەسپیان بـە تالانی برد ، مانناییەکان ئەوەیان لەبەر چاوا بوو که لەو قەلایانەدا له کاتی پەلاماری ئاشوریەکانا سود وەر گرن ، بەلام تازه بون به هوردوگای ئاشور •

شکاندنی [ئاخسری] ئەوەندەی تر ناکوکیه ناوخۆییەکانی ماننای هاندا ، ئاشوربانی پال نوسیوێتی ئەلێ : کـه لـه سەرزەمینیماننا راپەڕینی خـەلکی کیشوەری [نیشته ماتی] دەستی پێ کرد ـ ئاشوریەکان ئەم ناوەیان به جوتیارو سەپانه کان ئەوت ـ هەروەکو لەمەوبەر باسـمان کرد ـ له مانادا حکومـەتی خانەدانەکان [ئولیگارشی] هەبو ، خەلکەکه لـەسـەر ئارەزووی راپەڕینێکی جەماوەری بون که پادشایەتی ماد دابمەزرێنن • شورشگیرەکان [ئاخسری]یان کوشتو لاشەکەیان فڕێ دا وه هەمو ئەندامانی خانەدانەکەیان لـه ناو برد • [ئاوالی] کوڕی [ئاخسری] کـه بـه زیندویی مابووەوه دەمودەس جێگـەداری خۆی ئاریسی نی نارد بۆ لای پادشای ئاشوریەکان وه لـه دژی هۆزەکـەی خۆی داوای کۆمەك و یارمەتی لێ کرد ، هـەر لـه بەر ئەوەی ئاشوربانایپال یارمەتیان بدات کچەکەی خۆی بـه دیاری بۆ نارد • ئاشوربانایپال خـەرجو باجی لەسەر ماننا دانا ، بـەلام لـەو نوسراوانـەدا دەرناکەوێ کـه یارمەتی [ ئاوالی ] دابێ ، وه یان لەشکری بـه هاواریەوه ناردبێ • هـەرچۆن بێ پادشایانی ماننا تاکو کۆتایی یەکێتی ئاشور مانەوه ـ وه بەم هۆیەوه وتراوه که له رێگایەکەوه یارمەتیان دراوه که لەوه ئەچێ [مادیا] شای ئەسکیتەکان کـه زاوای ئاشوربانایپال بووه ، وه به پێی فەرمانی ئەو یارمەتی ئەوانی دابێ ، وه ئەمه خۆی بوه هۆی ئەوه که لـه نێوان ئەسکیتەکان و ماددا کـه کەوتبوه

خوارووی مانناوه ـ دڵ نیگەرانی روو بدات[٢٠٥] •

... ئەوه رون نیه که ئایا لەشکری ئاشوریەکان له هەمان سەردەما که چونه ناو مانناوه چونه ناو پادشایی مادەکانیشەوه یان نەء ؟ ئەو نوسراوەی که لـه سەر کۆڵەکەی [ B ] ئاشوربانیپال نوسیویه بـه پێی راپۆرتی راپـەڕینی مانناو چونه سـەر تـەختی ئوئالی ئـەڵێ : [لەو رۆژانەدا بیریسخاردی مـاد ـ خاوەنی ئـاوایی ـ وه هـەروەهـا ساراتی[٢٠٦]و پاریخیا[٢٠٧] کـوڕانی [گاگو] ـ خاوەن ئاواییەکان ـ [کیشموەری ساخو] که سەرپێچی یان له ئێمه کرد • من ٧٥ ئاوایی مەحکەمم داگیر کردو خەڵکەکانیانم بەدیل گرتو خۆم ئەوانەم به زیندویی دەسگیر کرد ، وه هێنامن بۆ نەینەوا] هەروەکو ئەزانین له دوای ئەوه پادشایی ماد دامەزراوه ، خوێندنەوەی وشەی وەکو : ـخاوەن ئاواییەکانی ماد ـ که سەرپێچی یان لـه ئاشور کردبو ـ ئەمە جێی سـەر سوڕمانه • بەڵام زۆر لەوه ئەچێ [بیریس خاردی] له یەکێك لـه وڵاتەکانی مادا که هێشتا له ژێر دەسەڵاتی ئاشوردا بووه [هەروەکو لـه کیشەسو وەیان خارخار] هـەر ئـەو کردەوانەیان ئـەگێڕا کـه کشتریتیو مامی تیار شوو دۆسانتی بەر له راپەڕینەکه له بیت کاریو مادایو ساپاردا ئەیان گێڕا • واتا ئەرکی پێشەوایی خەڵکی ناوچەکەیان له ئەستۆ گرتبو ، وه ئـەوان نوختەی پەیوەندی نێـوان ئیشو کاری بـەڕێوه بردنی خـەڵـکی ناوچەکـەو نێوان دەسەڵاتدارێتی ئاشـور بون • لـەوه ئـەچێ بیریسخاردی لـه راپەڕینەکەدا مەبەستی ئەوه بوبێت که ناوچەی ناوبراو بخاته سەر خاکی پادشانشینی مادەوه، بەڵام ئیتر نازانرێ [کیشموەری ساخو] که لەوێدا باسکراوه چیه ؟ • هەندێك له لێکۆڵەرەوەکان[٢٠٨] سەرزەمینی ناوبراو به هینی سکاییەکان دائـەنێن ، بـەڵام ئـەم بیروڕایـه رێی تێ ناچـێ • [ K ـك] ئیرانـی هـەرگیز بـه [ خ h- ]ی ئـاکـادی نـەوتراوه ، وه ئـەگـەر گـاگو لـەگـەڵ [گوگی تەورات [گوگوی ـ لیدیەکان ، ـ گیگ ـی نوسـەره کۆنـەکان]

بەراورد بکەین دیسان جێگای باوەڕ پێ کردن نیە(۲۰۹) • بەڕای زوربە مەبەست لە کیشوەری [ساخو] یەکێکە لە بەشەکانی ولاتە مادیە کانی ئاشور •

زوربەی لێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان کە ئەو سەردەمانە ناوچەکانی ماناو ماد لە نوسینەکانی ئاشوربانابال دا بەم جۆرە بووە ، ئەوان ناوی گوتیەکانیان کە بە بونەی روداوەکانی ساڵی ٥٦٢ی پێش زاینەوە لە پارچە نوسراوەکانانا باسیان کردوە کە ئەتوانرێ بە هینی مادو ماناو ئلی پیو هینی ریش دابنرێت ــ ئەوان لە بەرچاو دوریان خستۆتەوە ــ چونکە بەکار هێنانی وشەی [ گوتیەکان ] ــ هەروەکو لەمەوبەر وتراوە وەکو باو بوە لەو سەردەمەدا هۆزێکی دیاریکراوو سەرزەمینێکی تایبەتیان بۆ دیاری نەئەکرد(۲۱۰) وە ئەمە ناوێکی گشتی بووە بۆ هەمو ئەو هۆزانەی کە لە رۆژ هەڵاتو ژوروی رۆژ هەڵاتی ئاشوردا ئەژیان •

بۆ ئەوەی لەم راستیە بگەین ئەبێ بە کورتی لە چۆنێتی باری سیاسی دەرەوەی دەیەی پێنجەمی سەدەی حەوتەم ئاشنا بین : لە لای ژوروی رۆژ ئاواوە ، واتا ئاسیای بچوك ، لە دوای روخاندنی دەسەڵاتداریتی فریجیە لە ناوەراستی دەیەی حەوتەم ، کیمریەکان فەرمانڕەوابون وە بەم هۆیەوە گوگو [گیگ] پادشای لیدی ، کە بە هێز ترین دەوڵەتی ئاسیای بچوك بو وە هەروەها پادشایانی کیلیکیەو تابال [لە کێوەکانی تاور] لە دەوروبەری ساڵی ٦٦٠ی پێش زاینی بە پێویستیان ئەزانی لەگەل ئاشوردا بن وە داوای کۆمەکیان لێ بکەن • گوگو دوای ئەوە کە کیمریەکانی لە خاکی خۆی دەرکرد پەیوەندی لەگەل ئاشور بڕی وە لەگەل [پسام متیخ] کە بە هۆی فیرعەونی میسرەوە لە ئاشوریەکان جیا بوبوەوە یەکی گرت • بەڵام کیمریەکان سەر لە نوێ هێزیان بەرخۆیان هێنایەوە [لەوە ئەچێ لە ئەنجامی یەکێتی لەگەل ترریەکانی فراکیە کە لە رێگای بوغازەی بوسفۆرەوە دەسەڵاتیان بەیدا کردبو] • گوگو لە شەڕێکدا لەگەل ئەمانەدا کوژرا وە [سارد] کە

پایتەختەکەی بو تالآن کرا لـە [٦٥٤ی پێش زاینیدا][٢١١] وە [ئاردیس]ی کوڕی ناچار بو سەر لەنوێ داوای یارمەتی لە ئاشور بکات •

لە ساڵی ٦٥٤ی پێش زاینی ئاشوریـەکان زۆر رقیـان لـە کیمریەکان ئەبۆوە ، رقەبەریەکی توندیان لەگەلیانا پەیدا کردبو ، [ئەو نوسراوانەی کە هەن لـەم بارەیەوە بـەشێوەی رەوانی ـ ئومان ـ ماندا ـ ئەخوێندرێنەوە ، مەبەست لە کیمریەکانە] ، لەو سەردەمەدا توگدامی [لیگدامیسی یونانیەکان]و کوڕەکەی [ سانداکشترو ] سـەر حـەڵقەی ئـەوان بون[٢١٢] • هەروەکو ئورارتوییەکان لەگـەل کیمریەکانا هاوپـەیمان بون ، وە ئاشورباناپال ئـەم کردەوانەی ئـەوانی بـە دژی ئاشوریـەکان لێك ئەدایـەوە[٢١٣] • بـەلآم ـ هەروەکو لە کاتی «ئوئالی» دیسان دیمان ـ نوسراوە رەسمیەکان لەبارەی شەڕی ئاشوریەکانو کیمریەکانەوە بێ دەنگن • لە ئەنجامی وتەی سەرچاوە کۆنەکان ئەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامە کە لیگدامیس پێشەوای کیمریەکان لـە کیلیکیە [خواروی رۆژهەلاتی ئاسیای بچوك] ـ واتا لە سنورەکانی ئاشور لـە شەڕی نێوان [مادیا]ی پێشەوای [ئەسکیتەکان]دا کوژراوە • هەر چۆن لێك بدرێتەوە مادیا لەو کاتەدا ـ بە تایبەتی لـە ئاسیای بچوك بەسـەر ترریەکانو [کیمریەکانا][٢١٤] سەرکەوتوە • هەمو ئەم نوسینانە ئەوە نیشان ئەدەن کە لە دەیەی پێنجـەمو چوارەم مادیا کوڕی پارتا توئیو پادشایی ئـەسکیتی ئـەو هەروەکو لەوەو بەر بە ئاشورەوە پەیوەند بون • وە لەگـەل ئەوەشدا کـە توگدامیو کیمریەکان لەگەل ئورارتودا پەیمانی ریکەوتنیان بەهێز بووە • ئەو پەلاماردانانەی سنور کە لەوەبەر [ئانداریا] سەرۆکی یەکێ لـە ولایەتەکانی ئورارتو ـ گۆیا لـەسـەر ئوباڵی خۆی ـ پەلاماری ناوچـە ئاشوریەکانی لـە شوبریا دا بو تیایا ژێر کەوت[٢١٥] • بـەلآم لـە سـاڵی ٦٥٤ی پێش زاینی هەروەکو کیمریەکان شکان وە پادشای ئورارتو لـە یارمەتی گەورە ناهومێد بو ، [روسا]ی دوەم زۆر تێکۆشا کە ئـەو پەیوەندی دۆستایەتیەی کـە لـە

سەردەمی باوکی ئاشوربانابالدا هەبوە لەگەل ئاشوردا تازەی بکاتەوە وە چەند نومایندەیەکی نارد بۆ ئاشور • نومایندەکان وەختێك گەیشتنە بەرەوە کە لەشکرکەشی ئاشوریەکان بۆ سەر عیلام لە ساڵەکانی ٥٤ر ٦٥٥ی پێش زاینی بەسەر کەوتویی تەواو بوبو[٢١٦] •

پێویستە ئەوە بزانین کە مادیاو ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیدای سەر بەو چۆن چونە ئاسیای بچوکەوە ، ئایا رێگای خاکی ئورارتویان کردەوە ؟ یان لە شوێنێکی ژورو تر لە مەرکەزی قەفقازەوە رویشتون !؟ وەیان ئاشوریەکان لە خاکی خۆیانەوە رێگایان داون ؟ بەلام وەلامی ئەم پرسیارانەمان نیە • وتەی دووەم وە بە تایبەتی سێیەم لە بەرچاو ئێمەدا لە بیروڕای یەکەم باشتر ئەگونجێ •

لەم سەردەمەدا بو کە یۆنانیەکانی ئاسیای بچوك لەگەل ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیدا دۆستایەتیان پەیدا کرد • هەروەکو زانراوە ئەو ئەفسانەیەی دوای کیمریەکان بەهۆی ئەسکیتەکانەوەو دەر کردنیان لە ولاتەکەیان لە چەند پارچە شیعری شاعیرێکدا وتراوە کە ناوی [ئاریستی پروکونثی] بووە کە لەو سەردەمەدا ژیاوە • وە ئەوەندەی شارەزای هەلبەستی ئەو شاعیرەین بۆ ئەوە ناشێ باوەڕی پێ بکەین‌و وەکو سەرچاوەیەکی مێژوویی پشتی پێ ببەستین • لەو سەردەمەدا [وەحشیەکان یان بەربەرەکانی ژورووو] ـ کە یۆنانیەکان بە هەلە ئەوانەیان هەمو کردوە بە یەك‌و لە سەدەی هەشتەم‌و حەوتەمدا بە [کیمری]یان ناو ئەبەن ، دیسان بە هەلەو بەلکو ناراست تر [پێیان وتون ئەسکیت] •• وە هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ئەم وشەیە ناوی هۆزێکی بیابان نشینی ئیرانی یان کۆمەلێك لە هۆزە ناوبراوەکان بووە ، وە تەنانەت لەوە ئەچێ کە شوێنی سەرەتای سەرهەلدانی یەکەمین هۆزی ناوبراو لە کەناری دەریای رەشدا نەبوبێت •

## ٧ ـ فەرمانڕەوایی تەواوو گورتی ئەسکیتەکان

ئەوەندە بەسەر ئەو روداوانەدا تێ نەپەڕی کە باسمان کردن لە کۆتایی ساڵی ٦٥٣/٥٢ی پێش زاینی ئەمپەراتوریتی ئاشـور دوچاری مـەترسی ترین گێژاوی سیاسی خۆی بو • هۆی ئەمـەش راپەڕینی [ شاماشوموکین ] برای ئاشورباناپال بو کە لە لایەن ئاشورەوە کرابو بـە پادشای بابل • هاوپەیمانەکانی کنیری [بەر لەوە دیسان نوشوستییەکی گەورە بەر ئاشور کە وتبو کە میسری لێ جیا بوبوەوە][٢١٧] لە دەرەوەو ناوەوەی ئەمپـەراتوریتی ئاشـور هاوکاری ئەم راپەڕینەیان ئەکرد لەنوسراوەی ئاشورباناپالدا[٢١٨] بەم جۆرە نوسراوە:ئەم [شاماشوموکینـە برای بێ وەفا ئەو سوێندەی کە بۆ منی خواردبو وەفای پێ نەکرد ، خەڵکی ئاکادو کلدانیو ئارامیو خەڵکی کەناری دەریا لـە ـ ئاکـابا ـ تاکو « باب ـ سـالی متی »[٢١٩] دەسـتو پیـوەندەکانی مـنو ئومانیگاشای راکردو کە پێی شاهانەی منی ماچ ئەکرد وە من کردبوم بـە حوکمڕانی عیلام ، هـەروەهـا پادشایانی گوتیومو ئامورو ملوخا کـە خۆم دامنابون ـ هەموویانی لە دژی من هانداو ئەوانیش هەموویان بونە هاو پەیمانی ئەو] بە گوێرەی ئەم نوسراوە ئاشوربانپال دەستەو دایەرەکەی شاماشوموکین ئەکات بە سێ بەشەوە :

١ ـ دەستو پێوەندەکانی ئاشور ، واتا بابلیو کلدانیو ئارامی دانیشتوانی دەرەوە یان کەناری بابل •

٢ ـ عیلام کە هاوپەیمانێکی بەهێزی شاماشوموکین بو •

٣ ـ پادشایانی گوتیومو ئامور ملوخا •• مانای ئـەم زاراوەیەی دوایی ئەبێ چی بێ ؟ بە بیروڕای ئاشوریەکانی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ئـەم وشەیە بە مانا پانایی گەورەی ئەگرتەوە وە ئەتوانین بڵێین بەمانای [بەشەکانی جیهان] بووە • ملوخا ـ واتا ئەفەریقا [چاوپوشی لـە مانای سـەرەتای ئـەم

زاراوەیە بکەین] ، ئامورو ـ واتا سوریەو فنیقیەو فەلەستین ، گوتیوم ئەو ناوچانەیە کە کەوتونەتە ژوروو ژوروی رۆژهەلاتی ئاشورەوە ، لە ئەنجامدا ئەوەی کە لە نوسراوەکەی ئاشور باناپالدا دەر ئەکەوێ شێوەیەکی گشتی ئەگرێتەوە ، وە پێویست بە رون کردنەوەو لێکدانەوەی رەمزەکان ئەکات • [ئاشترک] لێکۆلەرەوەی نوسراوەکانی ئاشورباناپال بە درێژی ئەم رەمزەی رون کردۆتەوە(٢٢٠) بەلام ئەم رونکردنەوەیە تەنیا لە بارەی ئامورو(٢٢١) ملوخاوە(٢٢٢) کردوە ، گوتیومی داوەتە کەنارەوە ، ئەوەی لێ تێک چووە کە گوتیوم بە کێوەکانی جودی داخ لە ژوروی ئاشور زانراوە • ئێمە شوێن ئەم زاراوەیەمان لێك دایەوە وە ئێستەش تێ ئەکوشین تاکو مانای زاراوەی [گوتیوم] [=گوتیەکان] کە لە نوسراوەکەی ئاشور باناپال نوسراوە رونی بکەینەوە •

لە سەردەمە جۆربەجۆرەکانی هەزارەی یەکەمی پێش زاینی زاراوەی [کوتیان] ، [گوتیوم] لەبارەی ئورارتوو ماناو هۆزەکانی ماد رەنگ بێ پارسەکانیش بەکار هێنرابێ(٢٢٣) • بەلام لەم شوێنەدا [گوتیوم] ئورارتو نیە، چونکە تازەکی لەگەل گوتیوم پەیوەندی دۆستانە بەسترابو کە لە دواییدا هەرمایەوە(٢٢٤) ، وە هیچ گومانی بۆ ناچێ ماننا ـ کە تازە بەسەختی شکابوبێت • پارسیش دیسان لەو سەردەمەدا ئەهمیەتێکی ئەوتۆی نەبوە • بەم هۆیەوە بەرای زۆربە مەبەست لە مانای [گوتیوم] هەر مادە(٢٢٥) •

لەو سەردەمەدا ٢٢ ساڵ بو کە کشتریتی ـ خشتریتا ، یان بە وتەی هرودوت [فرائورت] لەوێدا حوکمی کردوە •هرودوت [ I و١٠٢] بەم جۆرە ئەنوسێ : فرائورت [دەستی کرد بە داگیر کردنی ئاسیا ، هۆز لە دوای هۆز ئەی هێنانە ژێر رکێفی خۆیەوە ، تاکو لە دژی ئاشوریەکان لەشکری کرد وە هەمان ئاشوریانی(٢٢٦) کە لە نەینەوا نیشتەجێ بوبون(٢٢٧) وە زۆر حوکمڕەوابون و تەنیا کەوتبون ، چونکە هاوکارەکانو هاو پەیمانەکانیان لێ

جیا بوبونەوە ، بەڵام هێشتا بەو پێیە [ لە هەر رویەکەوە ] باش بون ـفرائورت لە دوای ئەمە ٢٢ساڵ سەڵتەنەتی کرد لە لەشکر کەشیەکا لە دژی ئەوان کوژراو زوربەی لەشکرەکەشی لەگەل خۆیا لەناو چون •

تەنانەت لمان ـ خاپوت رایگەیاندبو ، ئەوەی هرودوت لە بارەی ئاشورەوە رونی ئەکاتەوە هەمان چونێتی‌یە کە لە ئەنجامی راپەرینەکەی شاماشوموکین پەیدا بوە • هەرچۆن بێ ئەو شتێکی پێویستی نەنوسیوەو نەی وتوە کە [فرائورت] لە ساڵی ٦٥٣/٥٢ لە دوای ٢٢ ساڵ حوکمڕەوایی کردن کوژراوە • وە سەرەتای حکومەتی ئەو ساڵی ٦٧٣ی پێش زاینی بووە ، بەم هۆیەوە ئەتوانین بڵێین هەمان [کشتریتی] یە کە لە بارەی ئەوەوە پرسیاریان لە [هاتف] بۆ کردوە • رەنگ بێ لەبەر ئەمە بێ لە نوسینەکانی ئاشوربانایپال دا بە هیچ جۆرێك دەربارەی سەرکەوتنی سوپای ئاشور بەسەر مادا دیار نیە ،وە لێکۆڵەرەوەکانی شلەژاندوە لەگەڵ ئەوەدا وەکو باو بوە بچوکترین سەرکەوتنی خۆی گەورە کردوە • بەڵام وا دەرئەکەوێ کە سەرکەوتن بەسەر خشتریتایان [فرائورت] ئازایەتی ئاشوریەکان نەبوە ، بەڵکو بە هۆی یارمەتیدەرەکانیانەوە بووە ، وەکو ئەسکیتەکان وە ئاشوریەکان ئەوانیان [ئەسکیتەکانیان] هەر جارەی ئەکردە گیانی هۆزیکەوەو لە ناوچەیەکیان بەر ئەدان • لە واقیعدا هرودوت دیسان ئەڵێ : [ I و١٠٦ و١٠٣] کوڕەکەی فرائورت کە ناوی کیاکسار بو درێژەی بە شەڕی ئاشوردا ،(٢٢٩) وە نەینەوای گەمارۆ دا [لەشکرێکی گەورەی ئەسکیتەکان سەرکەوت کە مادیا اکوڕی پروتوتی پادشای ئەسکیتەکان یارمەتی ئەدان • ئەسکیتەکان ماوەی ٢٨ ساڵ لە ئاسیادا حوکمڕانیان کرد وە بە هۆی بێ شیرازەیی‌و شل گرتنی کاروباری وڵات‌و سەرنج نەدانیان لە پێویستیەکانی وڵات هەمو وڵاتەکەی وێران بو] •

ئەم پەلامار بردنەی ئەسکیتەکان بۆ سەر خاکی مادو سەقامگیربونی

دەسەڵاتیان لەساڵی ٦٢٥ی پێش زایینی‌دا بووە • چونکە کیاکسار لە ساڵی ٥٨٥ لە دنیا دەرچوە ، وە بە وتەی هرودوت ٤٠ ساڵ حکومەتی کردوە ، بەڵام هرودوت لە بارەی رونکردنەوەی چونێتی لێدان‌و پیاهەڵگژانی ئەسکیتەکان و مادەوە لێی تێك چووە ، ئەو بەم جۆرە ئەڵێ : کە کیاکسار دوای ئەوە سوپاکەی رێك‌و پێك کرد وە تەنانەت لە دوای شەڕی بالیدی ـ ئەو شەڕەی کە بە قسەی هرودوت [ I ،٧٣ ]بوە هۆی دەرپەڕاندنی ئەسکیتەکان ، لە خاکی ماد [ کە بە لای کەمەوە ٢٨ ساڵ لە دوایدا رویداوە ] ـ بۆ یەکەمین جار نەینەوای گەمارۆ داو شکا • ئاشکرایە کە ئەبێ جۆری روداوەکە چۆن هرودوت نوسیویەو باسی کردوە بگۆڕدرێ •• یەکەمین شەڕی کیاکسار لەگەل ئاشور لە سەرەتای بەرپابونیا – واتا بەر لە فەرمانفەرمایی ٢٨ ساڵەی ئەسکیتەکان – بووە ، وە دوا بەدوای شەڕێکدا بووە کە فرائورت لەگەل ئاشوریەکانا هەڵی‌گیرساندبو • وە هرودوت دیسان ئەم باسە بە شێوەیەکی هەڵە نیشان ئەدات‌و ئەڵێ : کیاکسار ئەیویست تۆڵەی باوکی بسێنێ ، ئەگەر ئێمە وای دابنێین کە هرودوت ٢٨ ساڵ حکومەتی ئەسکیتەکانی بە بەشێك لەو ٤٠ ساڵەی ماوەی سەڵتەنەتی کیاکسار دانابێ ئەتوانین یەکەم لێکدانی ئەو لەگەل ئەسکیتەکانا لە ساڵەکانی ٦٢٥ تا ٦١٣ی پێش زایینی دابنێین • بەڵام ئەگەر وابکەین [هەروەکو لە مەودوا بەرچاومان ئەکەوێ] لە بارەی روداوەکانی کۆتایی سەڵتەنەتی کیاکسارەوە رو بەڕوی گیروگرفت‌و ئاڵۆزی گەورە ئەبین • وە ئایا ئەم پرسیارە بۆچی لە نوسینەکانی ئاشوربانایال لە بارەی سەرکەوتنی بەسەر [گوتیوم] واتا مادەوە باس نەکراوە • ئەم پرسیارە بێ وەڵام ئەمێنێتەوە ، وە لە ئەنجامدا ناچار ئەبین ئەوە بڵێین کە کیاکسار وەختی خۆی لەژێر دەسەڵاتی ئەسکیتەکانا بووەو لەگەل ئاشوردا شەڕی کردوە لە ساڵی ٦٠٥ـ٦١٣ی پێش زایینی ئەو کیشوەری داگیر کردوە •• بەڵام ئەگەر بڵێین کە لە ساڵی

دەسەڵاتیان لە ساڵی ٦٢٥ی پێش زایینیدا بووە • چونکە کیاکسار لە ساڵی ٥٨٥ لە دنیا دەرچووە ، وە بە وتەی هرودوت ٤٠ ساڵ حکومەتی کردوە ، بەلام هرودوت لە بارەی رونکردنەوەی چونێتی لێدانو پیاهەڵگژانی ئەسکیتەکان و مادەوە لێی تێك چووە ، ئەو بەم جۆرە ئەڵێ : کە کیاکسار دوای ئەوە سوپاکەی رێكو پێك کرد وە تەنانەت لە دوای شەڕی بالیدی ـ ئەو شەڕەی کە بە قسەی هرودوت [ I ،٧٣]بوە هۆی دەرپەڕاندنی ئەسکیتەکان ، لە خاکی ماد [ کە بە لای کەمەوە ٢٨ ساڵ لە دوابیدا رویداوە ] ـ بۆ یەکەمین جار نەینەوای گەمارۆ داو شکا • ئاشکرایە کە ئەبێ جۆری روداوەکە چۆن هرودوت نوسیویەو باسی کردوە بگۆڕدرێ •• یەکەمین شەڕی کیاکسار لەگەل ئاشور لە سەرەتای بەرپابونیا ـ واتا بەر لە فەرمانفەرمایی ٢٨ ساڵەی ئەسکیتەکان ـ بووە ، وە دوا بەدوای شەڕێکدا بووە کە فرائورت لەگەل ئاشوریەکانا هەڵی گیرساندبو • وە هرودوت دیسان ئەم باسە بە شێوەیەکی هەڵە نیشان ئەداتو ئەڵێ : کیاکسار ئەیویست تۆڵەی باوکی بسێنێ ، ئەگەر ئێمە وای دابنێین کە هرودوت ٢٨ ساڵ حکومەتی ئەسکیتەکانی بە بەشێك لەو ٤٠ ساڵەی ماوەی سەڵتەنەتی کیاکسار دانابێ ئەتوانین یەکەم لێکدانی ئەو لەگەل ئەسکیتەکانا لە ساڵەکانی ٦٢٥ تا ٦١٣ی پێش زایینی دابنێین • بەلام ئەگەر وابکەین [هەروەکو لە مەودوا بەرچاومان ئەکەوێ] لە بارەی روداوەکانی کۆتایی سەڵتەنەتی کیاکسارەوە رو بەڕوی گیروگرفتو ئاڵۆزی گەورە ئەبین • وە ئایا ئەم پرسیارە بۆچی لە نوسینەکانی ئاشورباناپال لە بارەی سەرکەوتنی بەسەر [گوتیوم] واتا مادەوە باس نەکراوە • ئەم پرسیارە بێ وەلام ئەمێنێتەوە ، وە لە ئەنجامدا ناچار ئەبین ئەوە بڵێین کە کیاکسار وەختی خۆی لەژێر دەسەلاتی ئەسکیتەکانا بوودو لەگەل ئاشوردا شەڕی کردوە لە ساڵی ٦٠٥ـ٦١٣ی پێش زایینی ئەو کیشوەری داگیر کردوە •• بەلام ئەگەر بڵێین کە لە ساڵی

٦٥٣/٥٢ی پێش زاینیدا ئاشوریـەکان نـەیان توانیـوە مـادەکان بشـکێنن بەڵکوو مادیاو ئەسکیتەکانی سەر بە ئەو وە رەنگ بێ مانایەکانیش [کـە زورتر هەروەکو هاوکارو هاوپەیمانـەکانی ئاشـور رێکـەوتبون مادەکانیان شکاندوە ـ هەمو شتێك بە باشترین شێوە رون ئەبێتەوە ، وە [٢٨] سـاڵ حوکمرانی ئەسکیتەکان لەگەل سالەکانی ٦٥٢ تا ٦٢٥ی پێش زاینی وەکو یەك دەرئەچێ ، وە ٤٠ ساڵ سەردەمی سەڵتەنەتی کیاکسار ، دیسان وەکو باس کراوە ئەبێ لەگەل ساڵەکانی ٦٢٤ تا ٥٨٥ی پێش زاینی دا بگونجێ٠٠ بەڵام ئەبێ دان بەوەدا بنێین کـە کیاکسار هـەر لـە منداڵیەوە تاجو تـەختی پادشایی بە میرات وەرگرتوە(٢٣٠) •



**لەلای چەپەوە مادەکان شەڕ لەگەل ئەسکیتەکان ئەکەن لەلای راستەوە ٠٠ لە روی مۆرێکی ئەستونی هەڵکەندراوە (سەدەی ٥ـ٦ ی پێش زاینی)**

بێگومان نەمانی سەرداریکی وەك کشتریتی ـ خشتریتا [ فرائورت ] ئەبو نوشوستی یـەکی گـەورەی بـە لـەشکری ماد بگـەیاندبایە وە ئـەو تەقەللایەی کە لە دوای ئەو بۆ درێژەدانی شەڕ لـەگەل ئاشوریەکانا بەکار هێنرا بـە شکاندنی مادەکانو سەقامگیربونی فەرمانفەرمایی ئەسـکیتەکان لـە خاکی مادا روی بدایە •

بەڵام نابێ لەیاد بچێ کە ئامانجی دەسەڵاتداریێتی ئەسکیتەکان لەناوچونی دەوڵەتی ماد بوە • پادشایی مادیش هەروەکو مانا هەروەکو بۆ داکوکی لەسەر مانەوە بونی قەوارەی خۆی ئەکرد وە لـە کۆتایی سـەردەمی دەسەڵاتداریێتی ئەسکیتەکان دا بەهیچ جۆر لە پێشتری بە دەسـەڵات تر نەبو •• ئەسکیتەکان تەنیا خەرج‌و باجێکی سەرپێیان خستبوە سەر مادەکان(٢٣١) • پێشەواکانی ئەسکیت نـەیان ئـەتوانی ئەمپـەراتوریێتیکی راستەقینـە دامـەزرێنن ، بـەڵام دەوڵەتێکیان پێک هێنا کە ئەیتوانی ئەرکی مێژوویی خۆی بەجێ بهێنێ‌و یوغی ئاشور دەربکات •• بەڵام بـە پێچەوانەوە مادە یان دا کـە ئاشوریەکان وەکو بەهۆی راپەرینی ئازادیەوە سودیان لێ وەر بگرن • لە جیاتی ئەوە بە پادشایی ئەسکیت ناو ببرێ کـەچی بو بـە بنکەیـەك بۆ پـەلامار بردنی کیشوەرەکانی دەوروبەری ـ یەکەمجار پـەلاماری ئورارتو درا(٢٣٢) دوایی ئـەو زەوی‌و زارانەی کە هێنی ئاشور بو وە بـە تایبەتی ناوچەکانی سوریەو فەلەستین کـە سەر بە ئاشوربون پەلاماریان دان‌و ئـەسکیتەکان ـ وەکو هەندێك سـەرچاوە باسی ئەکەن ـ تا سنوری خاکی یەهودو فـەلەستین‌و میسـر رویشتن(٢٣٣) • فەرمانفەرمایی ئەسکیتەکان لـە هەندێك روەوە گـەلێك ئەهمیەتی بۆ مادەکان هەبو ، لە لایەکەوە فێری هونەرو تاکتیکی سواری‌و تیر ئەندازی ئەسکیتەکان بون ، وە تەنانەت لـە دوای لەناوچونی حکومەتی ئەسکیتەکان دیسان مادەکان کورەکانی خۆیان بـۆ فێر بونی مـەشقی تیر ئـەندازی ئـەیان ناردن بـۆ ناو ئەسکیتەکان(٢٣٤) • زۆر لەوەئەچێ کـەرەسەکانی تیرئەندازی [ ئـەسکیتی‌و مادی‌و سکایی ] کە بە هۆی دۆزینەوەی پارچـە کەرەسە جۆربەجۆرەکانەوە بۆمان دەرکـەوتوە [کـە تیرەکانی ـ ئەسکیتی ـ یان پێ‌وتون] ئـەوانـە لەو سەردەمەدا پێک هێنراون‌و دروسـت کراون • هـەروەکو لەمەوبـەر وتمـان ناتوانین بڵێین یەکـەمجـار ئـەسـکیتەکان ئـەم جـۆرە تیرانـەیان دروسـت کردوە(٢٣٥) • لە لایەکی ترەوە حاکمیەتی ئەسکیتەکان بەزمانێك ئەدوا کـە نەك تەینا لە قەڵەمڕەوی تایبەتی پادشایی مادا بەڵکو لـە سەرانسەری خـاکی

کیشنوەردا پێی ئەدوان • زمانی ئێرانی مادەکان ئـەوەندە لـە زمـانی ئیرانی ئەسکیتەکانەوە نزیك بووە کە دانیشتوانی شانشینەکانی مادو ئەسکیت بە باشی لە یەکتر ئەگەیشتن ، چونکە زمانی ئیرانی ــ هەروەکو زمانێکی یـەکگرتوی نیوان هۆزەکانی ماننا ــ کە لـە ناو ئەو هۆزانەدا هەبو ــ وە ناوچەکانی تری [کاسپی] زمان قسەیان پێ ئەکرد ، وە هـەمو هۆزەکانی ماد ــ لە ناوچـەکانی ژوروی ئارس یان گرتبو تاکو سنورەکانی پارت ــ ئەمانـە داوای یـەکیتییان ئەکرد ، چونکە ئەم ئارەزوو داواکردنە زمانی نێوان هۆزەکانی بەهێز ئەکرد • بەم جۆرە زمانی ناوبراو وەکو زمانیکی یەکگرتوی نیوان هۆزەکان مایەوە ،وە لە ناوچە جیاجیاکانا زمانی عەشیرەتیو ناوچەیی بەکار ئەهێنرا ــ وە تاکو دوای لەناوچونی حکومەتی ئەسکیتەکان دیسان مادەکان کورەکانی خۆیان نەك تەنیا بۆ فیربونی مەشقی تیر ئەندازی بـەڵکو بۆ فێربونی زمـانی ئـەسکیتی بـۆ ناو ئەسکیتەکانیان ئەناردن[٢٣٦] • ئایا زمانی کۆمەڵێك بیابان نشینی ژێر کـەوتو ئەبێ چ ئەهمیەتێکی بوو بێت ؟ بەڵام رون کردنەوەی ئەمە ئاسانە بەڵام ئەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کـە بەشێکی زۆری مادەکان لـە نێوان خۆیاناو ژیانی رۆژانەیان بە زمانی ئیرانی قسەیان نەئەکرد ، وە ئەوە زمانی پێویستو رەسمی بووە ، وەکو زمانێکی دەوڵەتیو نێوان هۆزەکان جێگای خۆی کردبۆوە •

بە وتەی هرودوت [ I و١٠٦] لە دوای ٢٨ سال « کیاکسارو مادەکان ئەوانەیان بە میوانی بانگ کردو هەمویان گرتنو کوشتنیان ــ ئەو مەبەستی لە ئەسکیتەکانە یانێ ورد تر بڵێین سـەرکردە ئەسـکیتیەکان ــ وە بـەم رێگایـە سەڵتەنەتی خۆیان رزگار کرد ، وە ئەوەی لەوەو بەر بویان داگیر کردن » • لەبەر ئەمە بەو هۆیەوە کە دەسەڵاتی سستو بێ پایەی پادشایانی ئەسکیت لەناو چو پادشایی ماد سەر لە نوێ چوەوە دۆخی جارانی • لـەم کاتـەدا ئەتوانین باوەڕ بە نوسینەکانی هرودوت بکـەین ، چونکـە حاکمیەتی ئەسکیتەکان لـە بنەڕەتا زیانی لە دەوڵەتی ماد نەدا وە تەنیا کیاکسار ئەبوایە بە مەبەستی دەست

وەشاندنی ئەسکیتەکانەوە خەرجو باجێکی دیاریکراویان بخاتە پێ •

بەڵام لە بارەی چارەنوسی دوایی ئەسکیتەکانەوە ئەتوانین بە هۆی ئەمو سەنەدو بەڵگەو سەرچاوانەوە کە بە دەستمانەوەیە باسەکە رون بکەینەوە • بە پێی کتیبەکەی ئەرمیای پیغەمبەر هێشتا لە دەیەی نۆیەمی سەدەی شەشەمی پیش زاینی پادشایی ئەسکیتەکان هەروەکو جاران لە ئازربایجاندا هەبون ، وە ئەمە هرودوتیش باسی ئەکاو ئەڵی : کە لەبەر ئەوان لە نێوان مادو لیدیدا لە ٥٩٥ی پێش زاینیدا جەنگ دەستی پێکرد ، لەگەل ئەوەشدا لە دواییدا پادشایی ئەسکیت ــ هەروەکو دیمان ــ بوو بە بەشێك لە ماد • دیسان هرودوت ئەڵێ : کە لەم کەینو بەینەدا ئەسکیتەکان گەڕانەوە سەر ڕێڕەوی پێشووی خۆیان [ئەو لەم کاتەدا شوێنو وڵاتی ئەوانی بە ئەو بەری «ئاراکس» دانەناوە واتا ئەو بەری [ولگا] بەڵکو لە ناوچەکانی دەریای رەشی داناون] • ئەو تەنانەت [ IV و٤و٢] وەکو داستانی ئەفسانەیی ئەیگێڕێتەوە ، ژنە ئەسکیتەکان کە لە ماوەی سی [٣٠] ساڵدا چاویان لە رێگاوە بوە بۆ ئەوان شویان بە کۆیلەکانی خۆیان ئەکرد ، وە کوڕەکانیان تێ ئەکۆشان بەرامبەر بەو ئەسکیتەنەی ئەچونەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان ــ لە نزیك [میوس]ی ئێستاوە [ IV و٢٠] شەڕیان لەگەلا بکەن ــ بەڵام چونکە لە نەوەی کۆیلەکان بون ــ بە بیانوی ئەوە گوایە ئەسکیتەکان لە جیاتی شمشیر قەمچی یان بەکار ئەهینا ــ ژێر کەوتن • ئاشکرایە کە ئەمانە هەموی ئەفسانەو درۆو دەلەسەن • بە تایبەتی کە [ئەسکیتەکانی ــ ئاشکیدا] رەنگ بێ لە کەناری دەریای رەشەوە نەهاتبنە ئاسیای نزیك • بەڵام لە دوای قەلاچۆ کردنی شاشینی ئەسکیت لە ئاسیای نزیك دا وەکو دەر ئەکەوێ ــ بەشێك لە ئەسکیتەکان ــی ئاشکیدا واتا لە چواریەکی دوایی سەدەی حەوتەم یان سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی ، لە رێگای قەفقازەوە گەڕاونەتەو بۆ ژورو وە دوایی لەگەل ئەوانەدا کە پێیان ئەوتن ئەسکیتەکانی کەناری دەریای رەش تێکەڵ بون • هەروەکو ب• ب پیوطروسکی سەلماندویەتی

بەر لەو مێژووە دیسان پەیوەندی یەکی دۆستانە لە نێوان قەفقازو ناوچەکانی قەراخی دەریای رەشدا بووە • ئێستە گەلێك شوێنەواری زۆر لە ناوچەکانی کەناری دەریای رەشدا دۆزراوەتەوە کە بەڵگەی دۆستایەتی ئەسکیتەکانو فەرهەنگو شارستانێتی مادیو مەعنەوی ئاسیای نزیکە • نوسراوەکانی نووسەرەکانی سەردەمی کۆن وە لە پلەی یەکەمدا بە تایبەتی هرودوت لەم بارەیەوە گومانی نەهێشتۆتەوە(٢٣٧) • وەکو ئاشکرایە بەشێك لە ئەسکیتەکانی کە ناری دەریای رەش ، لە واقع دا کە لە ئاسیای : نزیکەوە هاتبونە ئەوێ وە رەنگ بێ – ئەگەر بیروڕای پیشوی ئێمە لە بارەی پێك هاتنو دروست بونی وشەی ئەسکولوت لە [ئاشکیدا] ئەمە راست بێ – ئەم زاراوەیە لەوانەوە ماوەتەوە • لەگەل ئەوەدا نابێ وا بزانین کە هەمو ئەسکیتەکان بێ ئەوەی شوێنەوارێکیان لێ بەجێ بمێنێ لە قەفقاز دەر چوو بن • سەرچاوە کۆنە شوناسیەکان کە لە هەڵکەندراوەکانی مینگە چائورو سامتاورو شوێنەکانی تر دەست کەوتوە ، هەمویان بەڵگەی یەك فەرهەنگی نیوە ئەسکیتی – کە لە سەدەکانی حەوتەم تا پێنجەم وە تاکو چوارەمی پێش زاینی ئەگرێتەوە – ئەمانە ئەدەنە دەست • بەشێك لە ئەسکیتەکانی – ئاشکیدا – یان [ئورتو کوریبانتی] کۆتایی سەدەی شەشەمو سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زاینی لەناو قەڵەمڕەوی ئەمپەراتوری ماددا مانەوە ، وە لە ئەنجامدا لەگەل خەڵکەکانی تری ئازربایجانی ژوورودا بون بە یەك •

لە دەوروبەری دەیەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا ، پادشایی ماد لە خەرجو باج دان بە ئەسکیتەکان رزگاریان بو ، وە پادشایی ئاشور کە لە گێژاوی دەیەی پینجەمو چوارەوە سەری دەرهێنابو دیسانەوە سەر لەنوێ توشی گێژاوێکی سەختی ناهەمواری ناوخۆیی بوەوە • بە رێکەوتنی بابلو ماد ئەمپەراتوری ئاشور لە مادا نابود بوو ، وە یوغی ئاشوریەکان کە سەدەها بو هۆزەکانی ئاسیای لە دیلێتیدا هێشتبۆوە لەناو چو(٢٣٨) •

# بەشـــــی چـــوارەم

## پەیدا بونی ئیمپەراتورێتی گەورەی مادو

## لە ناوچونی ئاشور

# پەیدابوونی ئیمپەراتۆریێتی گەورەی مادو لەناوچوونی ئاشور

## ١ ـ مادو ئاشور لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا

لە نزیکەی ٦٥٠ی پێش زایندا پادشایی ماد دەوڵەتێکی گەورە بو لـە ریزی دەوڵەتە گـەورەکانی وەکو ماناو ئورارتو عیلام دا ناو ئەبرا • بـەڵام هەروەکو دیمان لە دوایدا بە هۆی ئەو نوشوستی‌یە کاتیانەوە کە بـە هۆی شەڕکەرە ئەسکیتیەکانەوە توشی لەشکری ماد ئەبون لـە ئازربایجانی ژورودا پیشکەوتنی رائەوەستا •

هرودوت لە بارەی چۆنیتی جۆری ئەم لێکدانەوە دو جور باسی دژ بـە یەك باس ئەکات‌و ئـەیان گێڕێتەوە • لـە جێگایەك [ I ، ١٠٣] ئـەڵـێ : [ وەختێك کیاکسار لـە دوای سـەرکەوتنی بەسـەر ئاشوریەکانا نەینەوای گـەمارۆ دا ] ئـەم روداوە رویـدا ، وە چـەند دێرێـك لـە خـوار ترەوە [ I ، ١٠٤] بەم جۆرە باس ئەکات : کە ئەسکیتەکان لـەو زەوی‌و زارانەی کـە بـە بێ هۆ لـە دوای تێـەڕ بون لـە چیاکانی

قەفقاز [ Enthauta ] پێیان نایە سەرو لەگەل مادەکانا کەوتنە شەڕەوە • مەبەستی یەکەم ـ هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد ـ راست نیە ، چونکە کیاکسار بە شێوەی گشتی تەنیا لە دوای کۆتایی کاروزار لەگەل ئەسکیتەکانا توانیویتی گەمارۆی نەینەوا بدات • وە لە ٦٥٢ی پێش زاینی ئاشور هێشتا ئەوەندە بێ هێز نەبوبو کە لەشکری دوژمن بتوانێ نەینەوا گەمارۆ بدات[١] • بەلام مەبەستی دووەم زۆر بێ سەرو شوێنە ، هەروەکو لە پێشترەوە باسمان کرد لە نوسینە ئاشوریەکانا لە بارەی لێدانی مادەکانەوە لەگەل لەشکرەکانی خۆیاناو [ ئاشور ] هیچ جۆرە باسێکی ئەوتۆو نەگێڕراوەتەوە وە بەم هۆیەوە لەوە ئەچێ کە کردەوەکانی [ فرائورت ] [کشتریتی ـ خشتریتا] زۆر تر ئاراستەی هاو پەیمانەکانی ئاشور بووە ، ـوە بۆ نمونە ـ لە پلەی یەکەمدا ئوئلی مانایی بووە • بە وتەی هرودوت ئەسکیتەکان تەنیا لە دوای کوشتنی [فرآئورت] دەستیان بەکار کردوە ، وە ئەوەش رەنگ بێ لە ناوچەی ژووروی ئازربایجان بوبێت • ئەوەش بلێین کە ئەم هەمو سەرچاوانە لە سنوری باسەکان بەدەر نین •

هەرچۆن بێ لە سالی ٦٢٥ی پێش زاینی دا [وەیان ئەگەر بمانەوێ سەرنجمان هەلە نەچوبێ وە پشت بە مێژووەکەی هرودوت نەبەستین ـ لە دەورو بەری دەیەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا] پادشایی ماد لەژێر رکێفی ئەسکیتەکان رزگاری بوو ، وە جارێکی تر وەکو دەولەتێکی خاوەن هێزو سیاسی گرنگ هاتەوە روو •

هرودوت ئەلێ کە لە سەرەتای حکومەتی کیاکساردا پادشایی ماد گەلێك هۆز وە لەوانە پارسەکان لەژێر دەسەلاتیا بون • بەلام لە دەیەی سێیەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی پارس [پرسید] ـ وەکو پادشا نشینە بچوکەکانی رۆژ هەلاتی عیلامو ئەو دیو عیلامەوە ـ هێشتا بە سەربەخۆیی ئەژیا[٢] وە باری چۆنێتی گشتی ئەو رۆژگارە ئەگەر خەراجیان بدایە بە

عیلامیان ئەدا نەك بە ماد(٣) • سەردانەواندنی پارس [پرسید] لـە بـەر ئەمە ئەبێ زورتر بە هی کیاکساری دابنێین • وەرگرتنی ولاّتە جوربەجورەکانی مەرکەزو رۆژهەلاّتی ئێران ئەبێ بە هینی سەرەتای ساڵەکانی حکومەتی ئەوی بزانین [نەك بە هی ساڵـەکانی کۆتایی حکومـەتی کشتریتی] • بـە شێوەی گشتی ـ ئەکەوێتە بەرچاو ـ کە هرودوت مێژووی روداوەکانی [لـە ماوەی سەردەمی یـەك سـەڵتەنەتا] پێـش خستبێ • کردەوەکانی [فرائورت] واتـا ـ کشتریتی ـ بە تەواوی هەروەکو ئەو کردەوانە وابوە کە [باوکی مێژو] بۆ [دیوك]ی داناوە • بەم مانایە کە ئەو پادشا نشینە بچوکەکانی لەناو برد بنکەی دەوڵەتی مادی مەرکەزیو رۆژ هەلاّتی قایم کردو ئەمانەی هەمو کرد بەیەك پادشا نشین • سەرکەوتنەکانی دەرەوە لەوە ئەچو تەنیا لـە دوای دەرکردنی ئەسکیتەکان(٤) لە سەردەمی حکومەتی کیاکسارا ـ دەستی پێ کردبێ • بەلاّم لە دوای ساڵی ٦١٦ی پێش زاینی سـەر لەنوێ چەند زانیاریەك لـە بارەی مادەوە لە نوسراوە بزماریەکانا دەست ئەکەوێو رون ئەبێتەوە کە لەو کاتەدا مانا نـەك هێشتا لـەژێر رکێفی پادشایی مـاددا نـەهاتبوە دەرەوە ، بـەڵکو ئەوەندەی هێز بووە کە بەرامبەر بە ئاشور [ئەڵبەتە ئاشور لـەو کاتەدا زۆر لاوازو بێ توانا بوە] وەکو هاوکارەکان خۆی دەر بخات •

هرودوت لە بارەی کیاکسارەوە ئەڵێ : لە روی مێژوویـیەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە [ I و ١٠٣] «ئەڵێن کە ئەو •••• یەکەم کەسێك بووە کـە هۆزەکانی نیشتەجێی ئاسیای کرد بە چـەند بەشێکەوەو رێکی خستن(٥) وە یەکەمین جار یاساو بریاری جەنگی پێك هێنا : کە نێزە بەدەستو کەمان بە دەستو سوارە جیا جیا بن(٦) • بـەر لـەوە ئەمانە بێ رێکخستنو تێکەڵو پێکەڵ بون» هەروەکو چەند جـار لـە نوسینەکانی هرودوتدا دەرکـەوتوە ـ هەروەها بەو جۆرە ئـەو خۆی هـەستی بـە ماهیـەتی ئەو دەرکـەوتوە نەکردوە ـ ئەمە بەڵگەیەکـە نووسینەکەی ئـەو راستە ، [چونکـە لـەبەر

مەبەستێك نەینوسیوە] ئەڵبەتە هەرگیز لەشکرێك کە لەو پیادە چەك سوكو چەك قورسانە [بە شێوەیەکی ئارێكو پێك لەگەل سوارانا تێکەڵاو بوبن] بەو جۆرە نەبوە • بەڵام راستی ئەمەیە کە بەر لە کیاکسار مادەکانو ئەو هۆزانەی کە سەر بەوان بون لە شەڕدا وەکو دەستەو تاقمی عەشیرەتگەری تێکەڵاو ئەبونو شەڕیان ئەکرد ، وە کیاکسار وەکو چاولێکەری دراوسێکانی واتا ئاشوریەکان ـ کە ریکخراوێکی لەشکری رێكو پێکیان هەبو ـ بۆ یەکەمین جار سوپایەکی رێكو پێکی پێك هێنا کە کرابون بە چەند بەشێکی لەشکریانەوە ، وە ئەم دابەش کردنە بە پێی هۆزایەتیو عەشیرەتگەری نەبووە بەڵکو بە پێی پێویستی سەربازیو لەشکری دەوڵەت دامەزرا بون ، وە ئەو بە گوێرەی چەك بەشەکانی لەشکری رێك ئەخست [چونکە لە دەستە کاری هۆزایەتیدا ـ شەڕکەرەکان هەر جۆرە چەکێکیان بوایە بە ئارەزوی خۆیان لە بەشەکانی لەشکردا دابەش ئەبون] ئەم جۆرە دوا هەنگاوی دامەزراندنو بەرپا بونی دەوڵەتی ماد بو ـ ئەوە ئەزانین کە کشتریتی بۆ گەمارۆ دانی قەڵاکان سەربازی تایبەتیو چەکی کاریگەری تایبەتی هەبو ، لەو کاتەدا لەشکری ماد لەروی رێك خستنو چەکەوە لە لەشکری ئاشوریەکان دواکەوتو تر نەبو ، وەهەر لە هەمان کاتا گیانی خۆ بەخت کردنو شەڕ کردنیان لە لەشکری ئاشور زۆر تر بو • چونکە لەشکرێك بو لە سەربازی ئازادیخوازی رەعیەتەکان پێك هاتبو ـ کۆمەڵگای ناوبراو لەگەل ئەوەدا بە دەوڵەمەندو خاوەن حەقەکاندا دابەش کرابو بەڵام ئەم کەرت کردنو دابەش کردنە هێشتا نەگەیشتبوە تافی خۆی • کۆمەڵگایەك بو کە هێشتا بەندایەتی ئەوەندە پەرەی تیا نەسەندبو ، وە گێرە شیوێنیو دەستی ناپاکی نەیئەتوانی خۆی دەربخات • ئەم لەشکرە کە بۆ یەکەم جارو لەناو دەوڵەتێکی یەکگرتوودا دروست بوبو ئەبوا بە تەواوی یەکێتی خۆیو لە هەمان کاتا هەست بە بونو پێویستی بونی خۆی بکات •

راستە کە هێشتا تاقی کردنەوەی کەم بو ، بەڵام گومانی بۆ ئەچێ کە شەڕ کردن لەگەل ئەسکیتەکانو سەر دانەواندنی هۆزەکانی دەورو بەری [ لەناو ئەوانەدا هۆزەکانی پارس] لەم روەوە بۆ ئەو زۆر بە کەڵك بووە ، لەشکری ناوبراو بە تەواوی لە تاکتیکی پیادەکانو فێلی گەمارۆدانی قەڵای ئاشوریەکانو هونەری سواریو تیر ئەندازی ئەسکیتەکانیان باش ئەزانی •

لە بارەی دیاریکردنی مێژوی روداوەکانی رۆژگاری سەڵتەنەتی کیاکسارەوە هرودوت ناتوانێ یارمەتیمان بدات[٧] وە ئەبێ لەم راگوزەرەدا پەنا بەرینە بەر سەرچاوەی تر • ئەبێ زوربەی ئەو سەرکەوتنانە کە هرودوت بەهینی کیاکساری دائەنێ وە ئەو سەرکەوتنانەی تر کە لە دەشتەکانی ئێراندا بە هینی ئەو تەواو بووە ، بە سەرەتای رۆژگاری سەڵتەنەتی سەربەخۆیانەی کیاکسار ـ لە دوای دەرکردنی ئەسکیتەکان [واتا لە ساڵەکانی ٦٢٥ تا ٦١٥ی پێش زاینی] دابنێین • بە داخەوە هیچ جۆرە سەرچاوەیەك لە بارەی ئەم رۆژگارەوە رونیان نەکردۆتەوە ، بەڵام ئەوە تەواوە کە لە کۆتایی ئەو سەردەمەدا لەشکری کیاکسار بە هۆی هەندێك لە لەشکریانەوە کە ماد نەبون بەهێز بوبو ، وە کیاکسار بە تەواوی ئامادە بووە کە پەلامار بەرێتە سەر ئاشور[٨] •

چۆنێتی ئەم دەوڵەتە وەکو لای خوارەوە بووە : لە ماوەی دەیەی پینجەمی سەدەی حەوتەمدا بۆ ئاشور بە خۆشی تەواو بوو ، ئاشوریەکان توانیان شورشی شاماشوموکین لە بابل دامرکێننەوە وە زوربەی هاو پەیمانەکانی لەناو بەرن • لە سەرەتای دەیەی سێیەمی ئەو سەدەیە ئاشوربانایال هەمو عیلامی داگیر کرد • بەڵام لە هەمان کاتا رقو تورەیی ئەو خەڵکانەی کە لە مەترسی داگیر کردنا بون روژ بە روژ زۆر تر ئەبو ، وە ئەوان پشتیان بە هێزی خۆیان زیاتر ئەبەست چونکە لە سەدەی حەوتەما چەند جار نوشوستی گەورەو بچوکیان بە ئاشوریەکان دابو ، وە لەو روەوە دەوڵەتی

ئاشور له بارەی ناو خۆوە زۆر لاوازو بێ هێز بوبو •

لەناو قەڵەمڕەوی ئەمپەراتورێتی ئاشوردا ئەو کەسانەی کە حەزیان بە دەوڵەتی ئاشور نەئەکرد ژمارەیان زۆر بو ، تەورات کۆمەڵێك لەو گفتوگۆیانەی تیایە کە بە بۆنەی لەناو چونی نەینەواوە کراوە وە بە هێنی پیاوێك دراوەتە قەڵەم کە ناوی ناحومو خەڵکی ئیسرائیلە ـ کە لەوە ئەچێ بە دیلی کەوتبێتە دەست ئاشوریەکان ـ ئەو گفتوگویانە هەیە • لەو گفتوگویانەدا زۆر باش دیارە کە هۆزەکانی ئاسیای نزیك کێیان بە دوژمنی خوێنە خوێی خویان دائەنا[٩] ئەوانە ئەم دوژمنانەی هۆزەکان ، هەمان پیاو گەورەو دەسەڵاتدارەکانی ئاشور بون کە خاوەنی جێگای بەرزو بازرگانو سەرکردەکانی دەوڵەت بون • ئەو کۆمەڵە بچوکە کە ـ بەراوردی ئاسیای نزیکی کۆنی ئەورۆژە ـ گەلێك سامانیان کۆ کربۆوە ، تەواوی خەڵکی رۆژهەڵاتیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئەخستە کار • خەڵکی سەرانسەری رۆژهەڵات حەزیان لە لەناو چونی ئاشور ئەکرد ـ [کنام شیران]و روخاندنی نەینەوا ـ [شاری خوێن] بون • نوێنەرو ئەندامانی هۆزەکانی سەر سنورو دورەدەست کە هێشتا ملیان بۆ ئاشور دانەنەواندبو ، وە ئەوانەی کە لە جێگای خۆیان دەربەدەر کرابون وە خەڵکی ئازادی کۆمەڵانو نوماینده‌کانی خەڵکی دەرەوەی کیشوەری ئاشور هەمویان ئارەزوی لەناو چونی ئاشوریان ئەکرد • ئەوەش بڵێین کە لەناو خۆی ئاشوردا ناکۆکی لەنێوان بازرگانە خاوەن سامانەکانو سەرکردە سوپاییەکانا هەبو •

تیکڕا هەمو خەڵك سەربەخۆو راستەوخۆ هاو بەش بەربەرەکانێی سیاسیان نەئەکرد بەڵام وەکو هێزو کەرەسەیەکی تەقینەوە بون کە هەمویان ئامادەی کار بون کە بۆ لەناوبردنی حکومەتی ئاشور هەمیشە لەسەر پێ بون •

هۆی بنەڕەتی گیان سەختی ئاشوریەکان نەبونی یەکێتیو نەبونی

لەشکرێکی رێكو پێكو خاوەن باوەڕ لە بەرامبەر ناحەزەکانیەوە بو •

بەڵام سەرکەوتنەکانی ئاشور بو بە هۆی ئەوە کە چینی فەرمانڕەوای ئەو کیشوەرە مەترسی دەرەوە بە بچوك بزانێو گوێ بـە ناکوکیەکانی ناو خۆی دەستەو تاقمە سیاسیەکانی لەشکر نەدەن ، وە ریزەکانی لەشکری ئاشور پڕ بون لە خەڵکی بێگانە کە لە ناو هۆزە جۆربەجۆرەکان بە دیل گرتبونیان، وە لە ئەنجامدا نەیان توانی رقو کینەی ئەو خەڵکە جۆر بەجۆرانە بەر پـەرچ بدەنەوە وە مومکن نەبو ئـەم نیازە نهێنییانەی ناو لەشـکرەکەیان لـە کاتی ئامادە بونی شەڕا دەر نەکەوێو ئەوان بێ هێز نەکات •

## ٢ ـ شەڕی بابلو ماد لە دژی ئاشور
## ـ تا روخاندنی ئاشور ـ

لە کوتایی سەدەی حـەوتەمی پێش زاینیدا دوژمنەکانی ئاشـور هـەمو فێڵو فەنی شەڕی ئاشوریان زانی وە لە گەلێك لاوە بەربەرەکانێیان کرا ، وە هەروەها لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا هەوڵیان دا لە دژی ئاشور بە کۆمەڵ یەك بگرن • لەم یەکگرتنە دا کلدانیەکانی بابل[١٠] وعیلام رابەری خەڵکەکەیان ئەکرد • بـەڵام تا ئەو کاتەی ئێمـە مەبەستمانە ئەم یەکگرتنە وەکو ئەبوا ببوایەو پێویست بو لەشکرێکی رێكو پێكو بەهێزیان نەبو ، وە یەکیەتیەکەشیان دیسان تەواو نەبو وە لـە بەرامبەر هوردوگاکانی ئاشـوردا بنکەیەکی سوپاییان نەبو • بەڵام ئـەم کـەمو کورتیانە وە نـەبێ توانیبێتیان ئارەزوی ئەوان سەر نەخەن بەڵکو چۆنێتی گوزەرانو رێکـەوتی رۆژ لەبار بو ، بەشە جوربەجورەکانی ئاشور سـودی جیاجیان هـەبو ، ئەمپەراتۆرێتی ئاشور بە زۆر سەری بە گەلێك لە بەشەکانی سەربەخۆی دانەواندبو ، بونو لەناو چونی دەوڵـەت بەسترابو بـە رێکـەوتەوە ، بەسترابو بـە شـکستو سەرکەوتنی شەڕەوە ، هەروەکو دوژمنەکانی ئاشور بە جۆرێکی مام ناوەندی

یەکیان گرتو بون بە خاوەنی لەشکرێکی بەهێزو دەوڵەتی ئاشور بەرەو نەمان بوەوە •

لە پادشایی ماددا یەکێتی یەکی تەواو فەرمانڕەوا بو ، چۆنێتی وڵات زۆر لە جاران باشتر بوو ، لەو ماوەیەدا لە دەست زۆرەملیو زورداریو مەینەتی ئاشورو شەڕی ناوخۆیی خۆیان رزگاری بوبو هێزێکی خۆماڵی یان پەیدا کردبو ، باری ئابوری رەعیەتەکان باشتر بوبو ، لە لایەکی ترەوە خاوەن دەسەلاتە کۆنەکان کە لێ کەوتبون بۆ هێنانەوەی دەسەلاتی خۆیان ئەوانیش لەناو خۆیانا کەوتبونە مقۆ مقۆ ــ لە بارەی فراوان کردنی وڵاتو دەوڵەتەوە ــ یارمەتی دەسەلاتی دەوڵەتیان ئەدا ،بناغەی دەوڵەت خۆی گرتبو، بەرەو پێشکەوتن ملی ئەناو بەرەو فراوانیو بەهێزی ئەرۆیشت • لە هەمان کاتا پادشایی ماد هێزێکی پتەوی پەیدا کردبو •

ئاشوربانیپال لە دوای نوشوستیو شکانی شاماشو موکین وە داگیر کردنی بابل لە ساڵی ٦٤٨ی پێش زاینی یەکێك بە ناوی کاندالانو کە ناوبانگێکی نەبو وە هیچ کەسێك کارێکی جوانی لەو نەدیبو کرا بە حوکمڕەوای بابل[١١] • کاروباری شەڕ [بە تایبەتی لە عیلامو عەرەبستان] تاکو سەرەتای دەیەی سێیەم بەردەوام بو • لە ساڵی ٦٣٣ی پێش زاینی ئاشوربانیپال لە دنیا دەرچو ، ئاشور ئاتلی لانی بەلای کەمەوە چوار ساڵ سەڵتەنەتی کردو بەڕای زوربە تا ساڵی ٦٢٦ی پێش زاینی پادشا بو • وە لەو ماوەیەدا [کاندالانو] ئەویش لە بابلدا حوکمڕەوا بو • دوایی دەرئەکەوێ کە ئاشور ئاتلی لانی بەهۆی سەردارێکی خۆشەویستی خۆیەوە [رەنگ بێ یەکێك لە خزمانی خۆی بوبێ] کە ناوی [سینشوم لی شیر] بو ــ وە بابلی دیسان داگیر کرد ــ لەسەر تەخت لابرا[١٢] • بەڵام زۆری پێ نەچو کە ئەویش بە دەستی کوڕێکی تری ئاشور بانیپال کەناوی [سین شاریش کون] بو [سارالئ][١٣] دوا پادشای ئاشور گیرۆدە بوو وەشکا ، وە سین شاریش کون خۆی لەسەر تەختی

سەڵتەنەتی ئاشور دانیشت • ساراك توانی تا ماوەیەك دەسەڵاتی ئاشور لە بابلدا بهێڵێتەوە[١٤] ئوروك كە لە كۆنەوە سەر بە ئاشور بو لە خواروی بابل مایەوە • بەڵام لە كاتی مردنی كاندالانو و شورش [سین شوم لی‌شیر] پادشایی تازە لە بابل دامەزرا كە [نابو پالاسار] ـ نابو ئاپالوسور ـ بوو بە سەرۆكی[١٥] • بە وتەی [بروس] مێژونوسی بابل ئەو لە لایەن ساراكەوە بۆ قەلاچۆ كردنی دوژمنانی ئاشور لە بابل دانرابو ، وە بە مەبەستی سەرنیگون كردنو لەناو بردنی ساراك دەسەڵاتی لەوێدا گرتە دەست[١٦] • بە پێی زانیاری تر كە بە دەسمانەوەیە ئەو خوی ساراكی لە جێگای كاندا لانو لەسەر سەڵتەنەتی بابل دانابو ؟[١٧] •

نابوپالاسار لەگەل ئەوەدا لە سەرەتاوە لە خزمەتی ئاشوریەكانا بو بەڵام كدانی بو لە پاشماوەی ئەو دوژمنە كۆنانەی ئاشور بو كە لە كۆتایی سەدەی هەشتەمی پیش زاینی دا شەرێكی زۆریان لەگەل ئاشوریەكانا كردبو • ئیتر نازانین كە ئەو نەوەی شازادەی كلدانیەكان بووە یان لە تیرەی بۆرە پیاوانی ئەو سەرزەمینە بووە • ئەو لە نوسراوەكانی خۆیا[١٨] ئەوە باس ئەكات كە لە رەسەنی گەورەپیاوان نیە •

لە رابوردودا عیلام هەمیشە لەگەل ئەو بابلیو كلدانیانەدا بووە كە لە دژی ئاشور بون وە لێیان یاخی ئەبونو لێیان رائەپەرین • بەڵام عیلام ئیتر قەوارەی نەما وە نابوپالاسار چاوی هیوای بڕیبوە ماد كە شاماشومو كین دیسان دەستی یەكیتی بۆ درێژ كردبو وە تازە بەهێز بو بو • بەوتەی [بروس] نابو پالاسار لە سەرەتای كاردا وە بەر لەوەی لە دژی ئاشور راپەرێ لەگەل كیاكسار[١٩] پەیمانێكی بەست وە [ئامئی‌تیدا]ی كچی بۆ [نابوخودنوسور]ی كوری خواست[٢٠] • رەنگ بێ پەیمانی یەكێتی‌یەكەیان لە دوای ئەوە بەستبێ وە لە سەرەتاوە رێكەوتنێكی سەرپێیی یان لە نێوانا بوبێ •

له سه‌ره‌تای پادشایه‌تی نابو پالاسار [هه‌روه‌کو پادشایه‌تی شاماشومو کین که به‌ر له‌و بوه] بابل ته‌نیا مه‌رکه‌زی پایته‌ختو ده‌وروبه‌ری بوه ، وه شاره‌کانی خواروو سه‌ره‌وه راسته‌وخۆ سه‌ر به ساراك پادشای ئاشور بون • بەم هۆیەوه سه‌ره‌تای ساڵه‌کانی سه‌ڵته‌نه‌تی نابو پالاسار ته‌نیا ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر خاکی ماد که‌وته ژێر ده‌ستی حکومه‌تی ئه‌سکیته‌کانه‌وه] له‌و کاته‌دا بو • به‌ڵام بوه[٢١] • ئه‌وه ئاشکرا نیه که له‌و سه‌رده‌مه‌دا ماده‌کان به چ پێشکه‌وتنێکه‌وه خه‌ریك بون • هه‌ندێك له لێکۆڵه‌ره‌وه‌کان له‌و باوه‌ڕه‌دان که یه‌که‌مین گه‌مارۆ دانی نه‌ینه‌وا له لایه‌ن کیاکساره‌وه [که هرودوت نوسیویتی وه دوای ئه‌وه خاکی بابل دا بو • ئه‌م کاره له ساڵی ٦١٦ی پێش زاینیدا یان نه‌ختێك زووتر – هه‌روه‌کو باسمان کرد – ئه‌م رونکردنه‌وه‌یه ئێمه رائه‌کێشێته ناو کۆمه‌ڵه ناکۆکیو زیادو که‌میه‌کی سه‌یره‌وه که له رونکردنه‌وه‌ی مێژووه‌کانا په‌یدا ئه‌بێ • وه به تایبه‌تی ئه‌و بیروڕایه‌یه که ئه‌ڵێ ماده‌کان گه‌وره‌ترین پێشکه‌وتنی مێژوویی خۆیان واتا له‌ناو بردنی ده‌وڵه‌تی ئاشوریان له کاتێکدا کردوه که خۆیان له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی حکومه‌تی ئه‌سکیته‌کانا ئه‌ژیان • به‌ڵام ئه‌م بیروڕایه دیسان جێگای باوه‌ڕ نیه وه له‌گه‌ل سه‌رچاوه‌و به‌ڵگه‌ی رووداوه‌کانی ساڵی ٦١٦ی پێش زاینیداو ساڵه‌کانی دوای ئه‌ویش – واتا [مێژوی گد]و ئه‌و زانیاریانه‌ی که [بروس]و کتسیاس‌و ته‌نانه‌ت هرودوت خۆی ئه‌یان ده‌ن به ده‌سته‌وه ناگونجێ • مێژو نووسه ناوبراوه‌کان له باره‌ی هاوکاری کردنی ئه‌سکیته‌کانه‌وه له‌و رووداوانه‌دا که بووه هۆی له‌ناوبردنی ئاشور هیچ جۆره زانیاریه‌کیان نیه[٢٢] به‌رای زوربه ماده‌کان له چه‌ند ساڵی سه‌ره‌تاییدا به‌شیان له‌و رووداوانه‌دا نه‌بووه ، وه نابوپالاسار خۆی هێشتا وێران کردن‌و له‌ناو بردنی یه‌کجاری ئاشوری له‌به‌رچاو نه‌بوه ، وه هه‌ر ته‌قه‌للای داوه بابل داگیر بکات • به‌ڵام له دواییدا چۆنێتی‌و باری ئه‌وتۆ هاته پێشه‌وه که به سه‌ختی له ئاشوری‌دا •

ئەسکیتەکان تەنانەت لـە سەردەمی دەسەڵاتیانا واتا لـە کاتی پادشایی ئەسکیتەکانا لەژێر دەسەڵاتی ئاشور دەرچونو دەستیان کرد بە تاڵان کردنی ناوچەکانی سەر سنورو دورە دەستی ئـەو کیشوەرەوە ٠٠ وە لـەو ناوانەدا رەنگ بێ زۆر کەسی زۆر لێکراوو ئازار دراو لە لایەن ئاشورەکانەوە لـە گەلیانا رێ کەوتن لەوە ئـەچێ هەندێ شتی وردو بچوك بـە کەموکورتی لەبارەی پـەلاماردانی ئەسکیتەکانەوە بۆ سوریەو فەلەستین لـە نوسینەکانـی [پیغەمبەران]و تەورات دا مابێتەوە[٢٣] • هرودوت I ، ١٠٥] لـە بارەی پەلاماری ئەوانەوە بۆ سەر کـەنارەکانی فەلەستین ـ تا سـەر سنوری میسر قسە ئەکات • شاری بیت شئان [بیسانی ئیستا] لـە فەلەستین لـە سـەردەمی دەسەڵاتی فەرهەنگی یۆنانی ئاسکیتوپول بە [شاری ئاسکیت] ناو ئەبرا ،وە ئەمە شتێکی رێکەوت نەبووە • سەرچاوە کۆنـە شوناسیەکان ئەوەندەی کـە بـە دەستەوەیە هاتنی ئەسکیتەکان بۆ سوریە ئەسەلمێنێ •

لە ئەنجامی ئەم پەلامارادانانە کـە لەگەڵ راپەڕینی خەڵکەکانا یـەکیان گرتبو لە سەرەتای دەیەی سێیەمی سەدەی حەوتەم‌و بەدواوەش ، دەسەڵاتی ئاشور لـە سـەر ناوچەکانی بەری رۆژئاوا بەرە بەرە کەم بووەوە ، فیرعەون [پسامتیخ]ی شاری فەلەستین [ئاشدود]ی[٢٤] ـ کە زوتر وەکو سـەرزەمینی یەهود خـەرج‌و باجی بـە ئاشور ئەدا ـ ماوەیـەکی زۆر گـەمارۆی دا وە [یوشیا]ی پادشـای یـەهودی [٦٠٧-٦٣٧ی پیش زاینی] بـێ ئـەوەی هیچ مەترسـیەك روو بدات وڵاتـەکانی ئاشـوری لـە دەوروبـەری مڵـکی خۆی داگیر کرد[٢٥] • لە فنیقیە شانشینی صیدون زیندو بووەوە[٢٦] • راستە ئێمە ناتوانین بە وردی میژوی ئەم روداوانە رون بکەینەوە بەڵام ئەوەندەی ئەڵێین کە بەر لـە ساڵی ٦٢٠ی پیش زاینی‌دا رویان داوە • شەڕە ناو خۆییـەکانی ئاشور بەر لەو دەوڵەتە توانای سەربازی لاواز بوبو • وە لە شەڕێکدا کە لە نێوان ئاشورو بابل‌و [ماد]دا رویدا دەوڵەتی ئاشور بە تەنیا بمێنێتەوەو خۆی

راگرێ وە ناچار دەستی کرد بـە یەکگرتن • یـەکێك لـەو هاوپـەیمانانەی دەوڵەتی ماننا بو کە پادشایانی مانا لـە سەردەمی ئائولی دا لە گەل ئاشـوردا هاوکار بون • پادشای ئورارتو ئەویش بە رەسمی هاوپەیمانی ساراك[٢٧] بو، بەلام گۆیا لـە کاروباری شـەڕدا هـاوکاری نەئـەکرد • بـەلام لـە بارەی ئەسکیتەکانەوە بە پێی ئەو سەرچاوانەی کە لە بارەی ئـەو سەردەمەوە بـە دەستمانەوەیە ، ناوی ئەوان هیچ نەبراوە ، وە ئەو نوشوستی‌یەی کە ماوەیەکی کەم بەر لەو مێژووە بەهوی کیاکسارەوە بە سەریانا هات لەو کاتەدا ئـەوانی لەناو گێژاوەکە دەر کردبوە دەرەوە ، میسریش هەروەکو هاوپەیمانی ئاشور تێکەلاوی شەڕەکە بوو • ئەم نوسراوانەی سەرەوە نەك تەنیا لاوازی ئاشور نیشان ئەدەن بەڵکو ئـەوە ئەگەیەنن کە چۆنێتی ئـەو دەوڵەتە زۆر شپرزە بووە ، ئەگەرنا لەوانە نەبوە رێگای کیشوەری خۆیانیان بدەن‌و وە لـەگـەل ئەوانەدا وەکو هوپەیمان‌و هاوکارێك بجوڵێنەوە •

چ شتێك تا ئـەم رادەیـە بوە هۆی ئاڵۆزی‌و شپرزەیی باری ناوخـۆی ئاشور ؟ گومان لەوەدا نیە کە یاخی بونی بابل هۆیەکی بنچینەیی ئـەم کارە بو ، چونکە لـە مێژووی ئاشوردا ئـەم جۆرە شورشانە زۆر فراوان بون وە ئەو دەوڵەتە بە ئاسانی یان بە زەحمەت توانیویتی خامۆشیان بکاتەوە • بونی ماد لەو شەڕانەدا دیسان نەیئـەتوانی ئاشور نیگەران بکات چونکـە کیاکسار هێشتا لە ساڵی ٦١٦ی پیش زایینی‌دا تێکەلاوی شەڕو شۆر نەبوبو ، ئەگەرنا هەرگیز لەشکری مانا نە ئەگەیشتنە کەناری فورات ـ بەڕای زوربـە باری ناوخۆی ئاشور تا ئەو رادەیە ئاڵۆزو ناخۆش بوو کە هەمو خەڵکی لە دژی ئاشور پشتیوانی شورشگیرەکانیان ئەکرد[٢٨] •

لەو سەردەمەدا کە لێکۆڵینەوەی روداوەکانی بابل یان بڵێین [مێژووی گد] روداوەی ساڵەکانی دەیەم تا حەڤدەیەمی حکومەتی نابوپالاسار دەس پێ ئـەکا [ ٦٠٩ـ٦١٦ی پیش زاینی ] چـۆنێتی ناوخۆ وەکـو لای سـەرەوە بوە[٢٩] •

له بەهاری ساڵی ٦١٦ی پێش زاینیدا نابوپالاسار ویستی ئەو هۆزانەی ئارامین له ناوچەکانی ژوروی فوراتدا کـه لـه ژێر دەسـەڵاتی ئاشوردا بون رزگاریان بکات • وە لـەوانەوە هەواڵی پێ گـەیشت کـه ئاشوریەکان لـه کابلین ـ کە رەنگ بێ کەمێك کەوتبێته خوار بـه یـەك گەیشتنی فوراتو روباری هابورەوە ـ خۆیان داوە له مەکۆ ، وە لەشکری ماناش لـه سەریان ئەکەنەوە • رۆژی ١٢ی ئاب [له نزیکەی سەرەتای مانگی ئاوت] شەڕ بـه تەواوی دەستی پێ کرد کە بوو بـه هۆی نوشوستی ئاشوریەکانو سەرکردە لەشکریەکانی ئاشورو مانـاش دەستگیر کران • نابوپالاسار کۆمـەڵێك لـه پشکینەرانی لەشکری خۆی نارد بۆ سەرچاوەی فورات ، کـه تاکو روباری بالیخ بڕون ، وە دوایی بۆ لای خواروی روبارەکەوە بگەڕێنەوە وە له بارەی لەشکرەکانی میسرو ئاشورەوە کە له سوریەوە بۆ لای ئـەو هاتبون ئاگادار بن • له بەهاری سـاڵی ٦١٥ی پێش زاینیدا [ له ئازەر واتا فوریەو مارس ] شەڕێکی تر لـه نێوان بابلیەکانو ئاشوریەکانا روی دا • ئـەمجارە شـوێنی شەڕەکـه لـه ولایـەتی [ ئاراپخا ] رۆژ هەلاتی دجلەوە بوو ، بابلیـەکان ئاشوریەکانیان بەرەو زێی بچوك راونا ، وە بنکەکانیان داگیر کردن •

له بەهاری ساڵی ٦١٥ی پیش زاینی دا سنوری نێوان بابلو ئاشور لـه نزیك کەرکوکی ئیستاوە ـ ئەو بەری دجله ـ دەستی پێ ئەکرد وە نەختێك بەلای خواروەدا له ئاشور [پایتەختی کۆنی ئـەو دەوڵەتە] تاکو عانەی ئیستا ـ له سەر فورات ـ درێژ ئەبوەوە[٣٠] • قەلاچۆ کردنی لەشکری مانا لـه کابلین ـ دور له ولاتی ئەوانەوە ـ سنورەکانی منای بێ بەرگری هێشتەوە وە رەنگ بێ خـاکی مانا لـه ساڵەکانی ٦١٥ـ٦١٦ی پیش زاینی لـه لایـەن کیاکسارەوە داگیر کراوەو بووە بە بەشێك له ئەمپەراتورێتی ماد • بەم هۆیەوە کیاکسـار بە ناوی لایەنگری بابلەوە تێکەڵاوی شەڕی نێوان بابلو ئاشور بو ، وە زۆری پێ نەچو کە لەو بگرەو بەردەیەدا بوو بە ڕابەری هەموو •

لەم بێنەو بەرەیەدا نابوپالاسار لە مانگی ئاوریل ـ بە مەبەستی سەرکەوتنی خۆی بەلای رۆژهەلاتەوە لەژێر رکێفی ئاشور هاتە دەرەوەو دەرکەوت ، وە لە دوای گەمارۆ دانێکی کەم ویستی شارەکە داگیر بکات بەلام سەر نەکەوت وە ناچار بەرەو ناوچەی خوارو کشایەوە ، وە لە قەلای [تاکری تاین] خۆی قایم کرد [تکریتی ئیستا] • بەلام ئاشوریەکان کە قەلای [تاکری تاین یان] گەمارۆ دا هیچ سەرکەوتنێکیان بە دەست نەهێنا وە ناچار بون دەست لەو گەمارۆ دانە بکێشنەوە •

لەو کاتانەدا کە هەر جارەی یەکێك لەم دوو کۆمەلە سەر ئەکەوتن ، مادەکان لە گەردەنەکانی زاگروس تێپەریبون ، وە بۆ یەکەمین جار لە دامێنەی رۆژئاوای ئەو چیایانەوە دەر کەوتن : لە مانگی ئاراخسامن [ ئوکتوبەر ـ نوامبەر ] چونە ناو خاکی [ ئاراپخا ]وە • ئەمە سەرەتای جموجولی ئەوان بو • لە مانگی ئاب [ژویە ـ ئاوت] سالی دوایی ٦١٤ی پیش زاینی لەشکری ماد بە فەرمانی کیاکسار[31] لە رێگای تەپۆلکەکانی ئاراپخاوە لە ژورو نەینەواوە چونە سەر دجلە وە شاری [طربیس] یان داگیر کرد ، دوای ئەوە لە دجلە پەرینەوە وە لە لای راستی ئەو روبارە تا ئاشور رویشتن ، بەم هۆیەوە لەشکری [سین شاری شکون]و خاکی ئاشوریان لە یارمەتی دەرەوە دابڕ کرد • ئەم لەشکرکەشیە زۆر بە گورجی سەری گرت، وە شاری پیروزی ئاشوریەکان واتا ئاشور کە کەلاوەکانی ئەو ئیستەش نمونەی قودرەتو بە دەستەلاتی ئاشوریەکان نیشان ئەدات داگیریان کرد • پیاو گەورەکانی ئاشوریان لە شارەکە دا کوشت ، پەرستگاکانی ئاشوریان تالان کرد ، سامانێکی زۆرو زەبەندەیان بە تالانی دەسکەوت ، ئەو سامانانەی کە بە درێژایی سالانی شەڕو شۆری رابوردو ئاشوریەکان لە خەلکیان سەندبو هەمویان بە تالانی برد •

بەلام نابوپالاسار کە هاوپەیمانێکی تازەی گرتبو ویستی ئەو بکات بە



**شورا قایمەکەی شاری ئاشور لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا ، لە روی نەقشێکی دۆزراوەوە وێنەی گیراوە ..**

ئالەتی دەستیو مار بە دەستی ئەو بگرێ • بە پێی [ مێژووی گد ] پادشای ئاکاد [واتە بابل] وە لەشکرەکەی کە ئەچون بە کۆمەکی مادەوە فریای شەرەکە نەکەوتن [ئاشور وێران بوبو] بە تەواوی دواکەوتنی نابوپالاسار بە ئارەزوو بوو ، پیاو گەورەکانی شاری ئاشوریش کاهنەکان وایان دائەنا کە دەستی لەگەل بابلیەکانا تێکەڵە ، تەنانەت لە سەردەمی سالماناساری پێنجەمداو دوای ئەوەش ئەوانە بە پێی رێکەوتن دەستیان کرد بە بەربەکانێی کۆمەڵێک لە لەشکری ئاشور • نابوپالاسار لە نوسینەکانی خۆیا بە ئاشکرا ئەڵێ : ئەو نەچوو بەهاوار پە رستگای ئاشورەوە ، وە تەنانەت لەبەر دڵی ئەوان زویر بوبو وە لە سەر روی خاك خەوت • لەگەل ئەوەشدا چووە کەلاوەکانی ئاشورەوە وە لە وێدا ـ لە هوردوگای مادەکان دا ـ نابوپالاسارو کیاکسار [لەگەل یەکتر پەیمانی دۆستیو یەکێتییان بەست] وە ئەم دۆستیە رەنگ بێ لەو سەردەمەدا بە سیاسەتی دوولانە دانراو ژنو ژن خوازی سیاسی مەحکەم وبەتین بو[٣٢] •

## ٣ ـ روخاندنی نەینەواو کۆتایی ئەمپەراتورێتی ئاشور

لە شارە گەورەکان جگە لە نەینەواو کالخو [ئەگەر ئەو ناوچانەی سنور کە هێشتا لەگەل ئاشوردا مابونەوە باس نەکەین] شتێکی ئەو تۆ بۆ ساراك نەمابوەوە ، بەڵام ئەو هیوا بڕاو نەبوبوو ، لە ساڵی ٦١٣ی پێش زاینی دا توانی کە ئارامیەکان ولایەتی [سوخو] ـ لە سەر فورات ـ لە نابوپالاسار وەرگێڕێتەوە ، وە بەم جۆرە جارێ هێزەکانی بابل لەوبەر بهێڵێتەوەو لە ئاشوری ببڕێ •

رون نیەو نازانرێ کە مادەکان لەو سەردەمەدا چ پێشکەوتنێکیان بە دەست هێناوە ، کتسیاس ئەڵی(٣٣) کە ئەوان لەو سەردەمەدا [تەنانەت ساڵێك بەر لەوەش] خەریکی گەمارۆدانی نەینەوا بون • بەڵام [مێژووی گد] هیچ باسی ئەوانە ناکات • ئەوەش بڵێین کە نووسەری مێژووی ناوبراو باسی مادەکانی نەکردوە کە مادەکان پەیوەندی یەکی راستەو خۆیان بە مێژووی بابلەوە نەبوە •

ساراك و لەشکری ئاشورەکان لە ساڵی ٦١٣ی پێش زاینیدا هیچ جۆرە جوڵانەوەیەکیان بەدەست نەهێنا ، قسەی لێ ئەکرێ کە رەنگ بێ لە نەینەوا گەمارۆ درابوبن ، لەگەل ئەوەشدا [ مێژووی گد ] وشە بە وشە تا ئەو جێگایەی باسی ساڵی ٦١٢ی پێش زاینی ئەکات [بەو شێوەیەی کە ماوەتەوە ـ چونکە لەم بەشەدا زۆر ناخۆشی دیوە وتێك چوە] وە ئەوەی لە کتێبی [ناحوم] ئەتوانین وەری بگرین ، هەموی لە کۆتایی گەمارۆ دانی نەینەواو ئەوەی کە لەناکاو داگیر کراوە باسی ئەکەین • بەم هۆیەوە زۆر لەوە ئەچێ کە مادەکان لە ساڵی ٦١٣ی پێش زاینیدا لە ناوچەیەکی تردا خەریك بون(٣٤) •

[مێژووی گد](٣٥) بچڕ بچڕە ، وە تاکو رادەیەك بە تەواوی لە نوسینەکانی ناگەین ئەوە رونە کە لەو کاتەدا بابلیەکان و مادەکان پێشکەوتنی

خۆیان یەك خستبو(٣٦) • وە لەشکرەکەی نابوپالاسارو شەڕکەرەکانی کیاکسار لە دەراوی دیالە بە یەکتر گەیشتن وە لە روباری رادان [ئادەمی ئیستا] عظیم [عزێم]ی لە جێگای بەیەك گەیشتنی ئەو روبارەو دجلە تیپەڕین وە ڕوەو حەساری نەینەوا رۆیشتن • لە مانگی سیمان تا ئاب [واتا لە ژوئن تاکو ئاوت] سێ شەڕی گەورە لەژێر حەساری پایتەختی ئاشوردا رویدا ••



**دیمەنی شوراکەی ئاشور لە روکاری دجلەوە ، لە روی نەقشێکی دۆزراوە وێنەی گیراوە ••**

لە ئەنجامدا لە مانگی ئابدا [بە داخەوە بەرواری رۆژەکە رون نیە] لە دوای پەلامارێکی سەختی هاوپەیمانەکان چونە ناو شاری نەینەواوە ، شەڕ لە شەقامەکانا دەستی پێ کرد ، هەمو سەرچاوەکان [جگە لە مێژووی گد] ـ کە ناتوانێ شتێك لەم بارەیەوە باس بکات ـ هەمویان بیروڕایان یەك ئەگرێتەوە ، کە پەلامار دانی نەینەوا بەهۆی لافاوی ئاوەوە ـ کە بە شێوەیەکی دەستکرد دروستیان کردبو ـ وە رەنگ بێ ئەو حەسارە گڵینەی شارەکەشی روخاندبێ، سەرکەوتن(٣٧) • هەر لەو رۆژانەدا کە دوژمنان چونە ناو شاری نەینەواوە [ سین شاریشکون ـ ساراك ] پادشای ئاشور خۆی فڕێ دایە ناو ئاگری

کۆشکەکەیە وەو خۆی سوتاند[٣٨] [کتیبی نائوم]ـ ناحوم ـ وێنەی ڕوناکی شاری نەینەوای گرتووە[٣٩] وە زۆر بە باشی باسی ئەو روداوانەی مانگی [ئاوت]ی ساڵی ٦١٢ی پێش زاینی ئەگێڕێتەوە ، وە باسی هەستی ئەو هۆزانە ئەکات کە ئاشوریەکان داگیریان کردبون •



**دیمەنی کەلاوە وێرانەکانی شاری نەینەوا**

[خواوەند لە بارەی تۆوە فەرمانی داوە کە جارێکی تر هیچ نەوەیەك بە ناوی تۆوە نابێت وە لە خانەی خواکانت بتە تاشراوەکان فرێ ئەدەمە دەرەوە ، وە گۆڕی تۆ دروست ئەکەم ، چونکە لار بویت •••••

سەرکردەکانی ئەو[٤٠] سور بوبونەوە ، پیاوە شەڕکەرەکانی شێوە سور هەڵگەڕاو بون و عەرەبانەکان ئەدرەخشانەوەو نێزەکان کەوتبونە جموجوڵ[٤١] • عەرەبانەکان وەکو دیوانە شێتوکە بە شەقامەکانا ئەسوڕانەوەو لە مەیدانەکانا لێکیان ئەداو وەکو تیسکە دەرئەچون ، بەرەو حەساری قەڵاکە

رایان ئەکرد[٤٢] مەنجەنیقیان ئامادە کرد[٤٣] دەرگای شارەکان ئـەکرانەوەو کۆشکەکان ئەبون بە ئاو[٤٤] • ئارەزوو یەزدان یەکی گرت : حصیب بە دیلی ئەگیرێ[٤٥] ئەیبەن بۆ چیاکان ، کەنیزەکەکان دەست ئەکـەن بـە شیوەن‌و گریان ، زیڕو زیوەکان تالان ئەکرێ ، [ئای لەو شاری خوێنە کە هەموی پڕە لـە درۆو دەلەسـەو تالان کـردن ، دەنگی قامچی‌و هـاڕە هـاڕی چـەرخی عەرەبانەکان‌و دەنگی سمی ئەسپەکان‌و ئەو عەرەبانانەی رائەکەن ، سوارەکان پـەلامار دێنن‌و شمشێرەکان بریقـەیان دێ ، نێزەکان ئەدرەوشێنەوە[٤٦] ، کوژراوو بریندارێکی زۆر بەسەر یەکا کەوتون ، لاشەی کوژراو ئەو سەری دیار نیە •

ئەمە هەموی لەبەر ئارەزوی خۆیی‌و خۆرازاندنەوەیی واتە نەینەوا[٤٧] • یهوە صبایوت ئـەلێ : ئیسـتە دژی تۆم ![٤٨] وەدامێنـەت ئـەدڕم ، روتـی‌و ریسوایت نیشان ئەدەم ، زەبونت ئەکەم ، لەم جیهانەدا ریسوات ئەکەم •

[•••• لـە کوێ سـەبوریت بـۆ بێنـم ؟ مـەگـەر تۆ لـە عامونەکان باشتری ••• مەگەر ئەوانیش رێگای دیلی‌و دور خراوەییان لە پێش نەگرتووەو منالەکانیان لە سەر کۆلانەکانا بریندار ئەبون‌و گەورەکانیان زنجیرەیان کرابوە مل ••• [تۆیش وەکو ئەوانە بـە بێ هۆ هـەوڵ ئەدەیت تاکو بەرامبەر بـە دوژمنەکانت هێزو تواناو قەوارە پـەیدا بکەی !•••] • [هۆزی خۆت بینـە ـ جگە لـە ژنـەکان هیچ نەماونەتـەوە ! دەروازەی ولاتـەکـەت لـە روی دوژمنەکانتا کراوەتەوە ، هەمو سامانت سوتاوە ، بۆ ئەوەی خۆت قایم بکـەی ئاو بێنەو خۆت مەحکەم بکە[٥٠] قالبی خشتەکانت پڕ بکە ، لەوێدا ئاگر ئەت سوتێنێت‌و شمشیر لەناوت ئەبات ، هەروەکو کوللە ئەبی بە خۆراکی خۆت ـ ئەگەرچی وەکو کوللەش ژمارەتان زۆر بێ !••] •

[ ئەی پادشای ئاشور شوانەکانت خەوتوون جەنگاوەرەکانت دەوڵـەمەند بون خەڵکەکەت هەژارو پەردەوازەی سەرکێوەکان بون ، کەسێکت نیە ئەوانە

کۆ بکاتەوە •• هەر کەسێ ئاوازەی ـ ناهەمواره‌یی گیرو گرفتی ـ تۆ ئەبیستێ لێت ئەدات ـ چونکە کەسێك نیە لە خراپەی تۆ نەترسێ] •

ئەو وێنەیەی کە نووسەر لـە [ ئاشور ] یان [ نەینەوا ] کێشابوی وە چارەنوسی خـەڵکی ئاشوری تیـا دەرخستبو ـ ئەوەی کـە ئاشـوریەکان بـە میسریەکانیان کرد ئەوە هەر بە کاری باس کردن نایەت ـ وە هیچ گومـانی نیا نیە ئەوانەی نەینەوایان داگیر کرد هـەر بەم جۆرە لـەگـەل دانیشتوانیانا جوڵانەوەو ئەمانەیان هەمو پێ کردن • ئەوانەی کە توانای چەك هەڵگرتنیان هەبو هەمویان کوژران ، ئـەوانی تریان بە دیلی بردن ، ئـەو کەسانەش کـە هاوکاری جەنگاوەرەکانیان کردبو پشکیان ئەخستن • منداڵە وردەکان کە نەیان ئەتوانی بە رێگادا بڕۆن هەر لە جێگادا ئـەیان کوشتن وە ژنی گـەورەکانیان ناچار ئەکرد [هەر بۆ سوك کردنیان] بە دامێن دڕاوی بڕۆن بە ڕێگاداو بیان بەن • ئایا چاوەڕوانی شتی تر ئەکرا ؟ پوختەو ناوەڕۆکی جەنگی تالانکەری و دیل گرتن بەم جۆرە بووە • ئەو هۆزانەی کـە چەند ساڵە بـە دیلی ژیابون حەزیان ئەکرد ئەو رۆژە رو بداتو لەگەل زۆردارەکانا بەم جۆرە بجوڵێنەوە کە خۆیان لەوانەوە دیویانە • مەگـەر ئاشوریەکان داریان هـەمو نەکردوەو ئاگریان نەکردۆتەوەو منـداڵە وردەکانیان نـە ئەسوتاند ، مەگـەر کۆشـكو پەرستگاکانیان تێك نەئەداو وێنەو پەیکەرەکانیان نە ئەشکاندو ئافرەتەکانیان بە دامەن بڕاوی نە ئەبرد ؟(٥١) •

ئایا ئاشوریەکان مافی ئەوەیان هەبو کردەوەیەکی وەکو هینی خۆیان لـە رق لە دڵەکانیان چاوەڕوانی بکەن ؟ لـەگـەل ئەوەشدا دەر ئـەکـەوێ کـە کردەوەی مادەکانو هاوپەیمانەکانی لەگـەل ئاشوریەکانا زۆر هێمنانە تر بووە لە هینی ئاشوریەکان [مێژووی گد] ئەوە نیشان ئـەدات کـە گەورە پیاوەکان زوربـەیان کوژران ، کتسیاس ئـەڵێ(٥٢) ئەوانـەی نەینـەوایان داگیر کرد شوێنەواری نەینەوایان لە سـەر زەوی سڕیەوە(٥٣) ، وە هـەمو سامانی ئـەو



ئاشوریەکان دیلەکان ئەکوژن ـ لەروی نەخشی دەروازەی (بالاوات) ی سالماناساری سێیەم گیراوە ٠٠ لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا ٠٠

شارەیان بە تالآنی برد بۆ ئەکباتان پایتەختی‌ماد ، بـەلآم دانیشتوانی نەینەوا یان لە شوێنی خـۆیان هێشتەوەو لـە لادێکانی دەوروپشتی نەینـەوا دا نیشتەجێ یان کردن •

ئەو لێکۆڵینەوەیە کە کتسیاس لە بارەی روخاندنی ئاشورەوە باسی ئەکات لەگەل ئەوەدا کە لە هەمو رویەکـەوە زۆر سـەیرە وە پڕە لـە شتی سەیرو سەمەرە لەگەل ئەمانەدا ، وتەی ئەم نوسەرە پشتی پێ نابە ستریٚ – وە لـەم کاتەشدا – زۆر لە راستی لای نەداوە • هۆزی ئاشـور لـە واقیع دا لـە ناو نەچو ، ژیان لە ئاشوردا وێران بوبو ، لە شارەکانی ترا هەبوو ، وە تاکو چەند سالێك لە دوای ئەوە خواکانی ئاشوریان ئەپەرست •

راستە لـە دوای ماوەیەکی کـەم زمـانی ئارامی لـە سەدەی هـەشتەم و حەوتەمی پێش زاینی دا – وەکو دەرکەوتوە – [زمانی رەسەنی خەڵکی ئاشور بووە] وجێگای شێوەی زمانی ئاشوری‌و زمانی ئاکدی گرتەوە •

هەرچۆن بێ ئەو سەرچاوانەی هەن ، ئەوە ئەسەلمێنن کە مادەکان هۆزی ئاشورو خەڵکە زۆر لێکراوەکانیان لە ناو نەبردوە بە هیوای ئەوەش نەبون کە لە ناویان بەرن ، وە ئەگەر لـە کاتی شەڕدا گەلێك دیلیان لێ گرتبن بـەلآم لەگەل هەمو خـەڵکی ئاشوردا کردەوەی زۆردارانەیان نەبوە ، ئەمـەش دوو هۆی هەبو : یەکەم مادەکان هێزەکانی خۆیان زۆر تر لە خەڵکی ئەو هۆزانە بون کـە ئاشور بـە دیلی گرتبونیان ، وە هـەمو خـەڵکی ئاشـور لـە روی کۆمەلآیـەتی‌و باری ژیـان‌و گوزەرانـەوە بـــە هیچ جۆرێك لـەگـەل زۆر لێکراوەکانی ئەو سەرزەمینانەدا کە ئاشور داگیریان کردبون جیاوازی یان نە ئەنواند(٥٤) • وە هەندێك لەوان لەو کەسانە بون کە لـە زەوی‌و زارە داگیر کراوەکانەوە بۆ ئاشوریان ناردبون(٥٥) • دوەم نەریتی بەندایەتی‌و تالآنگەری لە خاکی مادا لە پلەیەکدا بوو کـە نـەیان ئـەتوانی دیلێکی زۆر بـە تالآنی‌و دیلی بێنن •



بردنی دیلەکان ـ لە روی نەخشی دەروازەی (بالاوات) ی
سالماناساری سێیەم گیراوە ـ لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا ..



ئاشوریەکان بە زۆر کۆچ بە خەڵکی ئەو ناوچانە ئەکەن کە کەوتونەتە ژێر
دەستیانەوە لەروی نەخشێکی هەڵکەندراو لە نەینەوا گیراوە ـ سەدەی حەوتەمی
پێش زاینی

بەم جۆرە زۆر لە وانەی کە بە دیلی گیرابون وە رەنگ بێ زوربەی ئەوانە بەکار بەرهەم هێنان نەهاتبن لەوانەیە لە بنەماڵە گەورەکانا خزمەتکاری‌یان پێ ئەکردن(٥٦) •

ف• ئی• لنین بەم جۆرەی نوسیوە [لە مێژوودا چەند جار شەڕوشۆر رویداوە کە پڕ بووە لەبێ بەزەیی‌و کردەوەی جانەوەرانە ، وە سەرکەوتنی پێشکەوتوانەی گەورەشیان تیا بە دەست هێناوە کە سودی خەڵکی تیا بوە ، وە بونەتە هۆی تێکدانی گەلێك دەزگاو ریژیمی کۆنەپەرستانە [وەکو سەڵتەنەتی تەواویان ریژیمی چەندەها حکومەتی ناهەموارو زورداری ئەوروپا](٥٧) بێگومان تا ئەو کاتە شەڕی مادەکانو هاوپەیمانە کانیان لە دژی [وەحشی ترین دەوڵەتی زۆردار]ی جیهانی ئەو سەردەمە واتا ئەمپەراتوری ئاشور ئەمە شەڕێکی پێشکەوتن خوازی بووە • ئەگەرچی ئەو شەڕە لە بناغەدا بۆ لەناو بردنی دەستەلاتی ریژیمی کویلەیی نەبوە وە تاکو دوای ساڵی ٦١٢ی پێش زاینی دیسان شەڕی ناوبراو ئەهمیەتی مێژوویی سەرکەوتنخوازی خۆی پاراستوە •

بەلام لایەنی پێشکەوتوخوازانەو شەڕ لە لایەن مادەکانەوە چەند جارێك دو چاری گیرو گرفتو گیرۆدەی سەختی بووە • جگە لە شێوەی دیموکراتی ئاسای کۆمەڵگای ماد ــ ئەم قسەیەش تەواوە کە ئەو دەوڵەتە لەسەر بناغەی یاسای کویلەیی دامەزراوە ، لە لایەکی ترەوە ماد لەگەل بابل‌دا هاو پەیمان بوو ، وە ئەو شەڕەی کە بابلیەکان ئەیانکرد لەوەو بەر مەبەستیان تالان کردنو دابەش کردنی سامانو تالانی بو ،کەمتر مەبەستیان ئازادیو رزگار بون بووە•• چونکە لە رابوردودا دیسان بابل لە کەناری ئاشور هاوبەشی ئەم جۆرە شەڕانەی ئەکرد •

ف• ئی• لینین بەم جۆرەی نوسیوە :(٥٨) [وای دابنێین یەکێك سەد تالانی هەیەو یەکێ تر کە دو سەدی هەیە لە بەر دابەشکردنی دادپەروەرانەی

تالانیەکان ئەبێتە شەڕ ..

ئاشکرایە کە لەم جۆرە کاتانەدا ئەگەر شەڕ بە مانای [داکوکی] یان [داکوکی لەسەر نیشتمان] لێک بدرێتەوە ئەمە درۆیەکی گەورەی مێژوویی یە] . لەگەل ئەم هەمو نوسراوانەدا لەم شەڕەدا ماد مەبەستی سەرکەوتن‌و ئازاد بون بووە . ئەم راستیە لەمەوە روونە کە وەها کەوتنو لەناوچوونی ئاشور ماوەی خوش‌و شادی هەمو ئاسیای رۆژئاوا بوو .

لە واقیعدا زۆر لەوە ئەچێ گەلێك لە هۆزەکانی ئاسیای نزیك وە بە تایبەتی ئەوانەی لە سنورەکانی ئاشوردا نیشتەجێ بون راستەو خۆ بە قازانجی ماد تێکەلاوی شەڕ بون ، هەروەکو ب. ب. پیوطروسکی جاروبار باس‌و بەسەرهاتێك بە بەلگە دێنێتەوە کە لەناو خەلکدا بایەخی هەیەو وە لە شوێن موسی خورنی ماوەتەوە ، بە شێوەی گشتی نووسەری ناوبراو باسی لەناو چوونی ئاشوری لە نوسەرەکانی دوایی یۆنان وەرگرتوە .. کە ئەوانیش دیسان داستانەکانی کتسیاس یان نەختێك گۆڕیودو نووسیویانەتەوە بەم هۆیەوە ئەمەندە راست نیە . بەلام موسی خورنی لە بارەی لێکدانەوەی ئەو باسانەوە کە راست نین [کە قارەمانەکەی لە جیاتی کیاکسار یەکێکە ناوی « وارباك » یان «ئارباك» ــ بە وتەی کتسیاس ــ] ئەم ئەفسانەیە ئەلێ کە یەکێك لە سەرکردە ئەرمەنیەکان کە ناوی [پاروئیر] کوڕی [سکایوردی] بوە کە مانای [کوڕی سکایی] ئەگرێتەوە ، ئەویش دەستی لە وێرانکردنی ئاشوردا هەبوە . هەندێك جاروبار تێکۆشاون ناوی [پاروئیر] لەگەل ناوی [پارتاتوا] بکەن بە یەك .. وە لەو باوەڕەدان کە ئەم داستانەی موسی خورنی لە باس‌و بەسەرهاتێکی ئەرمەنیەکانەوە وەرگیراوە ، وە لە شوێنەواری زنجیرەیەك [کە رەنگ بێ لە رەسەن دا ئەسکیت بو بێت] وە لە ناوچەی ئەرمەنی نشینەکانی سنوری نورارتوو ئاشوردا بوبن هەیە وە لە وانەوە بەجێماوە . [هەروەکو لە «شوبریا ــ ئارما» واتا ساسونی ئیستا ــ لە رۆژئاوای دەریاچەی وانەوە] . رەنگ بێ

چەند دەستەیەکی شەڕ کەری تری هۆزەکانی تر ـ وەکو مانناییەکانو ئەسکیتەکانو هینی تر ، ئەوانیش دیسان لەساڵی ٦١٢ی پێش زاینی دا لەناو لەشکری سەرکەوتوی ماددا بوبن ، وە بەم هۆیەوە سەرکەوتنی ماد بە سەرکەوتنی تەواوی خەڵكو هۆزەکانی ئاسیای نزیك دابنێین لە دژی زۆرو ستەمی ئاشوریەکان •

بیستی ئەیلول [سەرەتای سپتامبر]ی ساڵی ٦١٢ی پێش زاینی کیاکسار گەڕایەوە بۆ ماد • نابو پالاسار لە کەلاوە وێرانەکانی نەینەوادا مایەوە و لەشکرەکەی هەروەکو جاران پەلاماری ئاواییەکانی ناوچە دانیشتوەکانی ئاشوریان ئەدا و تالآنیان ئەکردن •

هێشتا شەڕ کۆتایی پێ نەهاتبو هەندێك لە لەشکری ئاشور بە سەرکردایەتی [ئاشورو بالیت] [برا بچوکی ئاشور باناپال(٥٩) مامەی ساراك] توانی لە کاتیکدا پەلاماری نەینەوا درا لەو شارە بچێتە دەرەوە • ئاشورو بالیت لە شاری [حرپان] کە لەو سەردەمەدا گەورەترین شاری ژوروی بین‌النهرین بو خۆی شاردەوە ، ئەم خود موختاری لە پادشایانی ئاشور وەرگرتبو(٦٠) وە لە بەر ئەمە لایەنگری ئاشور بون • ئاشورو بالیت لە سەردەمی ژیانی ئاشور باناپالی برایا کاهن خوای [سین] حرانی بو(٦١) ـ خوایەك کە لە سوریەو بین النهرین‌دا زۆر رێزیان لێ ئەگرت ـ بەم هۆیەوە پەیوەندی یەکی دۆستانەی بەهێزی لەگەل ئەو شارەدا هەبو • ئەو لە پایزی ساڵی ٦١٢ی پێش زاینی‌دا لە حرپان چووە سەر تەختی پادشایی ئاشور • وە لەوێدا پاشماوەی لەشکری ئاشورو ئەو دەستەو کۆمەڵانەی یەکیان گرتبو بەهۆی ئەوەوە کە چاوەروانی چاکە نەبون لە لایەن مادەکانو بابلیەکانەوە ، وە ئەیانویست درێژە بە شەڕو شۆر بدەن وە پادشایی ئاشور ـ تەنانەت لە بەشێك لە خاکی پێشوودا کە بوو ـ بپارێزن وە لە دەوری ئاشورو بالیتی دووەم کۆ بونەوە • هیوای گەورەی ئەوانو مەبەستی بنەڕەتیان بە میسرو فیرعەون

[نخو]ی دووەم بو • ئورارتو کە ئەسکیتەکان بێ هێزیان کردبو وە زۆر لـە مەترسی ماد ئەترسا دیسان ـ وەکو ئەبینین ـ لەگەل ئاشوردا بـە دۆستایـەتی مایەوە •

روداوەکانی سالی ٦١١ی پێش زاینی بۆ ئێمە رون نیە • [میژووی گد] لە بارەی پێشکەوتنەکانی کیاکسارەوە بێ دەنگە • لەوە ئەچێ مادەکان خەریکی مەحکەم کردنی پشتی بەرەی شەڕی خویان بوبن • وەکو ئەیانویست پادشایی ئەسکیت بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە •••هتد • ئەوە ئاشکرا نیە کە لـەو سەردەمەدا هێزی بابلیەکان بـە چیەوە خەریك بون ـ میژووی ناوبراو ئـەو شوێنەی کە ئەم باسەی تیایە لەناو چووە •

لـــە سالی ٦١٠ی پێش زاینـی شـەڕو شـۆری هاوینـەی نابوپلاسار سەقامگیری لە ولاتی ئاشور لەناو برد ، لە مانگی ئوکتوبەرو نوامبەر مادەکان لەگـەل لەشـکری بابل یـەکیان گرت(٦٢) وە لـەشـکری یەکگرتوو بەرەو [حران] کەوتە رێ • ئاشورو بالیتی دوەم و لـەشکری میسر کـە پشتیوانیان ئەکرد(٦٣) بە نزیك بونەوەی لەشکری یەکگرتو حرانیان چۆل کرد وە لەو بەری فورات ـ وەکو دەر ئەکەوێ ـ پەنایان بردە قەلای [کارکمیش] •حران بە ئاسانی داگیر کرا وە نابوپالاسار وەکو دەر ئەکەوێ شـوێنە ئاینیەکانی تێك دا •• وە لەو شارەدا خەلکی سوریەو بین‌النهرین تالانیەکی زۆریان دەسکەوت، لە دوای ئەوە لەشکری مادەکان گەڕانەوە بۆ خاکی خۆیان •

ئەگەر ئەو بەشەی میژوی گد کە لە ناو چوە بمانزانیایە ـ لە حران تەنیا بابلیەکان دەستیان کرد بە تالانی کردن ، وە ئەمە نیشانی ئـەدات کـە شاری حران کەوتە بەر مادەکانەوە • چونکە لـە رۆژ هەلاتی کۆنا ، لەسـەر دەمی هیتیەکانا جۆری دابەشکردنی تالان لە نێو دو یەکگرتودا بەو جۆرە بووە : واتا یەکێکیان تالانیو دیلەکانی بـەر ئەکـەوت ئـەوی تریان شارەکەو حـەسارو سەرزەمینەکە •• لە سەردەمی ئاشوریەکانیشا دیسان ـ وەکو ئـەبینین ـ لـە

کاتی شەڕدا لەگەل ئورارتو ئەم ڕێکەوتنە لە نێوان ئاشورو ماننادا هەبو • وە لە سەردەمی ئاسار خادون دیسان وەکو ئەم ڕێکەوتنە لە نێوان ئاشورو تیر [صور] هەبو • بەم مانایەو بەم پێیە کە هەر کەشتییەکی دوژمنیان داگیر بکردابایە کەشتیەکە بۆ [صور] بو وە کەلوپەلو شتەکانیشی بۆ ئاشور • وە لە کاتی دابەش کردنی ئەمپەراتوریتی ئاشوردا حڕان بەر مادەکان کەوت ، لە نوسراوەکانی [نابوئید] پادشای بابل [کە لە دواییدا باسی لێوە ئەکەین] دیسان ئەمە دەر ئەکەوێ •

ڕێی تێ ئەچێ کە شەڕو بگرەو بەردە بەبێ بچڕان تاکو بەهاری سالی ٦٠٩ی پێش زاینی بەردەوام بوە • چونکە دوای ئەوە میژوو لە بارەی روداوی مانگی دو عوز [ژوئنو ژوییە]ی سالی ٦٠٩ی پێش زاینی ئەدوێ وە بەسەرهاتی کۆن [لە سالی حەفدەیەم ــ نابو پالاسار پادشا ــ ••••رویدا ،باسی ناکات • ئەمانە ئەوە ئەگەیەنن کە روداوی سالی تازە شەڕو شۆر بووە ،وەکو رونە روداوەکانی پیشین لە سالی شازدەیەم سەلتەنەتی پادشای ناوبراو تیپەڕیوە ، وە لە سالی دواییدا واتا حەفدەیەم [٦٠٩] دیسان هەر بوە •

ئاشورو بالیتی دوەم لە ژوئنو ژوییە هێزی کلانی هات بە هاواریەوەو لەشکری فیرعەون [نخو]یش ئەوانیش بە هاواریا گەیشتن وە پەلاماری حڕانیان دا ، ئاشوریەکانو میسریەکان هوردوگا بچوکەکانی بابلیەکانیان تێكو تاراج داو حڕانیان گەمارۆ دا • بەلام لە مانگی سپتامبەر هێزەکانی نابوپالاسار گەیشتە هاواری بابلیە گەمارۆ دراوەکانی ناو حڕان • ئاشورو بالیت زۆر هەولیدا خۆی بگەیەنێتە ئورارتو ، چونکە مەیدانی شەڕ لە ژێر حەساری حڕانەوە گوێزرایەوە بۆ خاکی [ئیسال] لە ژوروی حڕانەوە •لەوێدا ڕێگای کێوەکانی ئورارتو لە ڕێگای بەشی رۆژ ئاوای [تاور] ئەرمەنستانەوە کرابۆوە • بەلام لە هەمان کاتا مادەکان بە سەخت لە ئورارتویان دا وە گەیشتنە [توشپا] پایتەختی کیشوەرەکەیان کە لە کەناری دەریاچەی وان بو(٦٤) وە

دەوڵەتی ئورارتویان داگیر کرد • سەرکەوتنی دوایی ئاشوریەکان دیار نیە • بە ڕای زوربە ئەڵێن لە [گوماگن] لە فورات تیپەڕین وە پەنایان بردە قـەڵای [کارکمیش] ، ئەوەی لە مێژوی گەدەوە دەسـت ئـەکـەوێو ماوەتەوە لێرەدا فەوتاوە وە ئێمە نازانین دوای ئەوە چی رویداوە •

لە رۆژئاوای فورات کاروبار کەوتە دەست میسریەکانو ئەوان بون بـە حوکمداری سەرانسەری سەرزەمینی سوریەو فەلەستین • لەشکری ئاشـور تا ڕادەیەك دیار بوو ، وە قەڵای کارکمیش بو بە جێگای هۆردوی میسر لە سەر روباری فورات • لەبەر ئەوەی ئەو قەڵایە گرنگترین گوزەر گای ئەو روبارەو رێگای کاروانی نێوان سوریەو بین‌النهرین بو بابلیەکانو مادەکان نەیان ئەتوانی واز لــەو قەڵایـە بێنو دەسـت بـەرداری بنو بـە دەست دوژمنەکانیانەوە بمێنێتەوە •

میراتی ئاشور لەو سەردەمەدا لـە نێوان مادو بابلدا دابەش کرابو ، وە کارکمیش بەر بابل کەوتبو ، بەم هۆیەوە زۆر رێی تێ ئەچێ کـە مادەکان هاوبەشی ئەو شەڕانەیان نەکردبێ کە لەگەل میسریەکانا رویداوە ، لـە ساڵی ٦٠٥ی پیش زاینی دا لەشکری بابل بـە سەرکردایەتی شازادە نابوخودنوسور [بخت النصر] گەمارۆی کارکمیشی‌یان داو داگیریان کرد • میسریەکان ناچار بون رایان کـرد ، بابلیـەکان بێ ئـەوەی دوچـاری ناخۆشیو گیروگرفت بن سوریەو فەلـەستین‌یان داگیر کرد(٦٥) ، ئەمپەراتورێتی ئاشـور روخا • نابو پالاسار لە هەمان ساڵدا لە دنیا دەرچو • بەڵام کیاکسار ••• چالاکی‌یەکانی ئەو هێشتا تەواو نەبوبو •

×

# ٤ ـ ماد لە دوای دابەشکردنی ئەمپەراتوریتی ئاشوریەکان

لـە سـاڵەکانی ٦١٠ تا ٥٩٠ی پێش زاینـی پادشایی مـاد نـەك تـەنیا ئەمپەراتوریتی ئاشوری لـەناو برد بـەڵـکو پادشایەکانی مـاناو ئـەسـکیتو ئورارتوشی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی • ئەمە خۆی سەرکەوتنیکی گەورەبو ، هەروەکو لە سەرەوە باسمان کرد لە هەندێك شوێندا لـە بارەی سەرکەوتنو زاڵ بون بەسەر دەوڵەتەکانی ترا ئاگاداریـەکی تەواومان بـە دەستەوە نیە • لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانین ئەم وتەیە بسەلمێنین کە مانا لە ماوەی ساڵەکانی ٦١٥و ٦١٠ی پێش زاینیدا [بەر لە لەشکرکەشی کیاکسار بۆ سەر ئورارتو] وە زۆر لەوە ئەچێ تەنانەت لە ساڵی ٦١٥ی پێش زاینی دا سـەری دانەواندبێ • وە ئورارتو لەو ماوەیەدا کە لە ٦٠٩ی پێش زاینیەوە دەست پێ ئەکات ، سـەری بۆ دانەواندوون • وە پادشایی ئەسکیت ـ کـە یەکـەمجار لێدانێکی سـەختی بەرکەوت [٦٢٥ ؟] ـ وە رەنگ بێ لە ٦١٣ یا ٦١٢ سەریان پێ دانەواندبێ ، وە هەروەها لەوە ئەچێ لە دوای ساڵی ٦٠٩ هاتبێتە ژێر فەرمانەوە •

لە ساڵی ٥٩٣ی پێش زاینی ـ سەرچاوەیەکی رۆژهەڵاتی کۆن لەبارەی ئەم سێ پادشاییەوە ـ بۆ دوا هەمین جار ـ باس ئەکاتو ئەوانە بە وڵاتی سەر بە مادو خاوەن خود موختاری دائەنێ(٦٦) • بەڵام زۆری پێ نەچو کـە ئیوە سەربەخۆیی ئەوانە کۆتایی پێ هات • دیاری کردنی بـەرواری ئـەم روداوە زۆر گرانە • بەڵام هەرچۆن بێ لەو سەرچاوەیەی کە هرودوت زانیاری لـە بارەی ئەمپەراتوریتی داریوشی یـەکەمـەوە لێ وەرگرتوە [٤٨٦-٥٢٢ی پێش زاینـی •• ئـەم سـەرچـاوەیـە رەنگ بـێ هکـانی میلتـــی بوبێت] [ئورتو کوریبانتی]یەکان [واتا دانیشتوانی پادشایی کۆنی ئەسکیتەکان] بون بە بەشێك لە ساتراب نشینەکانی ماد • لەناو سەنەدو بەڵگە ساختومانیەکانی داریوش لـە

شوش[٦٧]ماننایبەکان بە ماد ناو ئەبران • وە لەو سەردەمەدا لەگەلَ مادەکانا تێکەڵ بوبون[٦٨] لێرەدا ئەتوانین ئـەوە دەست نیشـان کـەین کـە پادشایی ئەسکیتو مانا بەشێکی ولاتی ماد بون کە لە ساڵی ٥٥٠ی پێش زایینیدا بـە دەست هەخامەنشیەکانەوە بووە • بـەلاّم ئەتوانین بلێین کـە پەیوەندی ماناو پادشایی ئەسکیت بە دەولەتی مادەوە زۆر بەر لەو بەرواره بووە ، واتا بەر لە ساڵی ٥٩٠ی پێش زاینیدا بووە • لە واقیعدا لـەوە نەچوە کیاکسار لەگـەل پادشایی نیوە دۆستانەی لەپشتی سەری خۆیەوە لە ئاسیای بچوکدا بکەوێتـە شەڕەوە ، ئەگەر وای دابنێین ئەمە شتێکی زۆر ستەمە • وە هەروەها هرودوت بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ ئەم باسە باس ئەکات •

ئەو ئەلیت [ I ، ٧٣] «ژمارەیەکی زۆر لە ئەسکیتە بیابان نشینەکان لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆیی چونە خاکی مادەوە ، لـەو سەردەمەدا کیاکسار کوڕی فرائورت کوڕی دیوك حوکمی مادەکانی ئەکرد ئـەو لـە سەرەتاوە داخوازی ئـەسکیتەکانی قبوڵ کرد کـە داوای یارمـەتیان لـێ کـردبو وە تەنانەت کوڕەکانی بۆ فێربونی زمـانو پیلانی تیر ئـەندازی نارد بو بۆ لای ئەوان» ئەو کاتە کیاکسار لە خۆیەوە پادشایانی ئـەسکیتی رەنجانو ئەوانیش تۆڵەی خۆیان لێ سەندو لە جیاتی گوشتی راو گوشتی یەکێ لەو لاوانەی کە بۆ فێر بونی هونەر هاتبون بۆ لایان پێیان داوە لـە دواییدا [بە پەلە چون بۆ لای ئالیات کوڕی سادیات لە ساردیس] •

پادشایانی لیدی وە بە تایبەتی ئالیات [لـە نزیکەی ساڵی ٦١٧ تا ٥٦١ی پێش زاینی] لـە کۆنەوە لەگـەل ئەسکیتەکانا پەیوەندی دۆستانەیان هـەبوو چونکـە دوژمنـــی کیمریـەکان بون • بـــۆ نمونـە ئالیـــات بـە وتـەی هرودوت [ I ، ١٦] کیمریەکانی لە رۆژئاوای ئاسیای بچوك دەرکرد • بەم هۆیەوە چونکـە کیاکسار داوای خۆ بەدەستەوە دانی ئـەسکیتەکانی لێ کردو ئەویش دایە دواوە لەبەر ئەوە شەڕ لە نێوان مادو لیدیەکانا دەستی پێ

کرد ، وه زیاتر له پینج ساڵ درێژه‌ی کێشا •

مانای ئه‌م وته‌یه‌ی هرودوت له باره‌ی ئه‌سکیته‌کانه‌وه ئه‌بێ چۆن لێك بدرێته‌وه ؟ ئاشکرایه که ئه‌م روداوه له دوای رزگار بونی ماد له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئه‌سکیته‌کان رویداوه • ئه‌ڵبه‌ته یه‌کالا کردنه‌وه‌ی ئه‌م‌و ته‌یه‌ی هرودوت به وردی زۆر گرانه • به‌ڵام ئه‌توانین دیسان وه‌کو لای خواره‌وه‌ی لێك بده‌ینه‌وه : له دوای ساڵی **٦٢٥**ی پێش زاینی ئه‌شی ئه‌سڵی **ئه‌سکیته‌کان** ـ به‌رای زوربه ـ هه‌روه‌کو له به‌شی پێشودا باسمان کرد له **قه‌فقازه‌وه هاتبن** بۆ که‌ناره‌کانی ده‌ریای ره‌ش • به‌ڵام به‌شێك له‌وانه به **هۆی ناکوکی** ناوخۆیانه‌وه له قه‌فقاز مانه‌وه ، وه له سه‌ر ئاره‌زوی خۆیان سه‌ریان بۆ کیاکسار دانه‌واند • [ره‌نگ بێ له سه‌ره‌تاوه نه‌بوبێ به‌ڵکو له دوای ئه‌وه که مانا چوه پاڵ ئه‌مپه‌راتورێتی ماد له ماوه‌ی **٦١٥** تا **٦١٠**ی پێش زاینی ـ وه‌کو له **٦١١** ـ واتا ئه‌و ماوه‌یه‌ی که رێکه‌وتی له‌شکرکه‌شی ماد بۆ سه‌ر ئاشور ناکات] • له دوایيدا له دوای ساڵی **٥٩٣**ی پێش زاینی ناکۆکیه‌ك که‌وته نێوان پێشه‌وایانی ئه‌سکیت‌و کیاکساره‌وه که له ئه‌نجامدا بوو به هۆی له‌ناوبردنی ته‌واوی پادشایی ئه‌سکیت [که سه‌ر به ماد بوو] وه شه‌ڕی لیدی‌و ماد له **٥٩٠ـ٥٨٥**ی پێش زاینی دابو •

ره‌نگ بێ هه‌ر له هه‌مان کاتا مانا به ته‌واوی چوبێته پاڵ پادشایی ماده‌وه • وه له‌وه ئه‌چێ ئورارتوش هه‌روای لێ هاتبێ • ئه‌گه‌ر مێژووی تێکدانی [تیشن بائینی] «کارمیربلور» راست بێ‌و له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی شه‌شه‌می پێش زاینی‌دا بووبێت [ب• ب پیوطروسکی(٦٩) خۆی که سه‌رپه‌رشتی هه‌ڵکه‌ندراوه‌کانی گرتبوه ئه‌ستۆی خۆی ئه‌ویش لایه‌نگری ئه‌م بیروڕایه‌یه] • مه‌رکه‌زی ناوبراو [ئورارتوی قه‌نقاز] زۆر له‌وه ئه‌چێ له ماوه‌ی ئه‌و شه‌ڕانه‌دا که له ژوروی ئاسیای نزیك به‌رپا بوبو ـ واتا له ساڵه‌کانی **٥٩٣** تا **٥٩٠**ی پێش زاینی به ده‌ستی ماده‌کان وێران بووه • وه نه‌ختێك له‌وه‌ش ئه‌چێ که

تیش بائینی لەو ناکوکی‌یەی دواییدا کە لە نێوان ئەسکیتەکان‌و مادەکانا رویدا چونکە سەر بە ئورارتو ـ هاریکاری ماد ـ بوو تێکیان دابێت • هەرچۆن بێت لە بارەی ئەوەوە لەوەئەچێ لـە سەردەمی ئەسکیتەکاندا شـاری ناوبراو داگیر کرابێ ، بۆ سەلماندنی ئەم وتەیە هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نیە وە زۆر لەوە ئەچێ ئەوانە هونەرو پیلانی گەمارۆ دانیان نەزانیبێ(۷۰) •

کزنفون لە [کورش نامە]دا ئەرمەنستان لە سەدەی شەشەمی پێش زاینی‌دا بە [پادشاییەك کە سنوری بە ئورارتووە لکاوە بەڵام نەك لە روی ناوەوە] وە بە دەوڵەتێکی سەر بەماد بەڵام بە خودموختار ناوی ئەبات • لەگەل ئەوەشدا کـە قسەکانی کزنفون لە [کورش نامە]دا جێگای باوەڕ نیە ، بەڵام لەم کاتەدا ـ بە ئاشکرا ـ وتـەکانی ئـەو بـەسەرهـاتە ئەرمـەنیەکان ـ کـە موسی خورنی گێراویتیەوە ـ لایەنگری ئەکات ، وە ئەتوانین تاڕادەیەك پشتی پێ ببەستین • لەوە ئەچێ کە لەژێر دەسـەڵاتی مادەکانا لـە جیاتی ئورارتو پادشایەکی تازەی ئەرمەنی دامەزرابێ • جارێکی تر لەم بارەیەوە قسە ئەکەین •

ئەم وتەیە راستە کە لە کۆتایی سـەدەی حـەوتەم سـەرەتای سـەدەی شەشەمی پێش زاینی لە سەرزەمینەکانی نێوان دەریای رەش‌و دەریای کاسپی [خزر] سەردەمێکی هـەمـە جۆرەی سیاسی گرنگ ، وە رەنگ بێ نژادی‌و هۆزایەتی لە دژی ماد بەرپا بوبن • مانناییەکان‌و ئەسکیتەکان‌و ئورارتوییەکان‌و ئەرمەنیەکان‌و پاشماوەی هوری‌و نیاکان‌و ئیبریان‌و دانیشتوانی ئاسیای بچـوك‌و هینی‌تر ئەم گۆڕانەیان تیادا رویدا بێت • ئێمە لە بارەی ئـەم روداوانەوە بـە تەواوی بێ ئاگاین وە ئەمانە لە ساڵەکانی [۵۸۵ـ۵۹۰ی پێش زاینی] بوە •

بەر لـەو شەڕەو لـە دوای دابەشکردنی میراتی ئاشور پەیوەندی نێوان بابل‌و ماد ماوەیەك سارد بوو ، وە هەروەکو لـە قسەکانی ئارمیای پێغەمبەردا دەر ئەکەوی لە ۵۹۳ی پێش زاینیدا دەرئەکەوێ(۷۱) •ئەو هۆزانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی بابل‌دا بون هیوایان بـەم ناکۆکیانە هەبو • ئـەو لـەبارەی مـادو

پادشاییەکانی سەر بە مادەوە لەم سەردەمەدا بەم جۆرە ئەڵێ : [خواوەند ئەڵێ(٧٢) من هەمو هۆزە گەورەکانی کیشوەری ژورووم لە دژی بابل بەرپا کردوە ، ئەوانە کۆمەڵە شەڕ کەرێکن کە زۆر چالاکن و تیرە کانیان بە بێ هودە ناڕوات(٧٣) • کلدە ئەگیرێت وە ئەوانەی ئەوان بە دیل ئەگرن تێر ئەبن •

[هۆزێك لە لای ژورووەوە دێت ، خەڵکیان زۆرە ، وە پادشایانی زۆر لە سەرزەوی بەرپا ئەبن ، کەمان و زوبینی [کیدون – kidun ] یان هەیە ، بێ بەزەیین ــ لێ بوردنیان نیە ــ دەنگیان وەکو ئەوانە وایە دەریا ئەخرۆشێنێ• بەسەر ئەسپەوە غار غارێن ئەکەن ، هەروەکو یەك لاشە بن ئاوان ، لەشەڕدا دژی تۆ ، ئەی کچی بابل ! پادشای بابل دەنگی ئەوانی بیست و دەستەکانی هاتن بە یەکا ، زۆر خەمی لێ هات هەروەکو ژنێك ژان بیگرێ پێچی لە خۆی ئەدا ] ••••

[ ئالاکان بخەنە زەوی ، لە نێوان هۆزەکانا فوو بکەن بە کەڕەناکانا با دەنگیان بەرز بێتەوە ! لە دژی ئەو [لە دژی بابل] خەڵك ئامادە بکە(٧٤) پادشایی ئورارتو ماننـاو ئەسکیت [ئاشکناز](٧٥) لە دژیان راپەڕێنن • سەردارەکان لە دژی ئەو خۆیان گورج بکەنەوە(٧٦) وە ئەسپەکان هەروەکو کوللە ئامادە بکەن و بیانخەنە ڕەوە ، هۆزەکان لە دژی ئەو ئامادە کەن ، پادشایانی مادو سەرۆکی ولایەتەکانیان(٧٧) وە هەمو حاکم و جێ نشینەکانیان وە هەمو سەرزەمینەکانیان(٧٨) • ئەم قسانە بێ هودەو بێ پایە نەبوە ، لەو سەردەمەدا لە بابل زۆر بە نەخشەو نوسراوەکانی ماد نیگەران ئەبون • وە لە هەمان سەردەما نابوخود نوسوری دووەم [بخت النصر] بە پەلە حەسارێکی قایمی بە دەوری بابلدا دروست کرد ــ قایم کردنێکی ئاوا تا ئەو کاتە رۆژگار شتی وای نەدیبو ، وە لە سەرانسەری ولاتی بابل [دیواری مادی] بەرپا بو(٧٩) •

له واقیعدا هەردو ئەمپەراتوری گەورە لـە دوای ئەوە خاکی ئاشوریان لە نێوان خۆیانا دابەش کرد ، کەوتنە رقەبەری کردنی یەکترەوە ، وە لێدان لە نێوانیانا دەستی پێ کرد ــ درەنگ یان زوو ئەمەیان شتێکی چاوەڕێ کراو بوو ــ ماد زیاد لـە ئـەندازە بـە روداوەکانی ژورو لـە دوایدا بـە ئاسیای بچوکەوە خەریك بوو • ئەوەمان لـەیاد نـەچێ کـە تاکو دەیەی حـەوتەمی سەدەی حەوتەم لە ئاسیای بچوك فریجیە دەوڵەتێکی بە دەسەڵات بووە ، وە لە رۆژ هەڵاتیەوە نیمچە دورگەی گەلێك شانشینی بچوك هەبو کە [تابال] ــ لە کێوی تاور ــ لەناو ئەوانا لە هەمویان گرنگتر بووە •



**سوارەی لیدی‌یەکان ، لە روی نەقشێکی هەڵکەندراوی (بین تەپە) گیراوە •• سەدەی شەشەمی (؟) پێش زاینی ••**

کیمریـەکان فریجیـەیان وێـران کردبو • وە زوربـەی وڵاتـەکانـی رۆژهەڵاتی ئاسیای بچوك [جگە لە ناوچەکانی خواروی وڵایەتی ناوبراو] ــ لە سەردەمی روسای دووەم ــ لە لایەن ئورارتووە داگیر کرابو • بەڵام لە بارەی خواروی رۆژهەڵاتی ئاسیای بچوکەوە ••• لە کۆتایی سەدەی حەوتەم وە یان سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی لـەوێدا دەوڵەتە شێوە گرنگەکـەی کیلیکیە ــ کە بە جێ نشینی تابال دائەنرا ــ دامەزرابو • [بە زمـانی ئاشوری «خیلاکو» لە سەرەتاوە ناوچەی «کیلیکیەی گەورە»ی لـە خواروی قسەریەی

ئیستاوه بەم جۆرەیان ناو ئەبرد](٨٠) • لە کیشوەری ناوبراوا ئەو پادشایانەی کـە بـە نازناویان ناوی عەشیرەتی [ سیەنسی ] بـە یـۆنانی [ سوئەنسیس suennesis ] یان پێ ئەوتن ، ئەوانە حوکمیان ئەکرد • ئەم دەوڵەتە تاکو سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی بەردەوام بو [لە دوایدا هەروەکو شانشینێکی سەر بە هەخامەنشینەکان مایەوە] •

[یزکی ئیل] [حزقیال پیغەمەر] نوسراوەی سەرەتای سەدەی شەشەم(٨١) لە بارەی [توبال و مشك]ەوە واتا [تابال و فریجیە] بەرامبەر بـە میسر و ئاشور و ئادوم [لەوبەری خواروی ئوردن و فەلەستینی ئیستاوە] وە شارەکانی فنیقیە وە باس ئەکات کە لە ساڵە سەختەکانی پێشوودا لـەناو چوون • لیدی جێگەدار و میراتگری ئـەوان بو ، بـەم هۆیـەوە [ یزکی ئیل ] [ حزقیال ] پادشـای ئەوانی(٨٢) [گوك – جوج] بە شازادەو سەروکی توبال و مشك ناو ئەبرد • بەڵام لیدی لە تابال [کێوەکانی تاور] حوکمی ئـەکرد ، وە دەستی خستە ناو زەوی‌وزاری ئورارتووە ، وە لەوێدا لە نێوان بەرژەوەندی نێوان ئەو دەوڵەتەو دەوڵەتی ماد لێکدان پەیدا بوو • لەبەر ئەوە بو کـە ئالیات پادشای لیدی لـە هاوکارەکانی خۆی – واتا ئەسکیتەکان – کە دژی ماد پشتگیری‌یان ئەکردن وە لە نێوان ئەوو کیاکساردا شەڕ بەرپا بو • لەو شەڕەو بگرەو بەردەیەدا هـەر جارەی یەکێکیان سەر ئەکەوتن(٨٣) • وە هەندێك جار وا رووی ئـەدا کـە لەشکریەکانی ئاسیای بچوك ئەچونە ناو خاکی ئاسیای نزیکەوە • رەنگ بێ وتەکانی [یزکی ئیل] – حزقیال پیغەمەر – لەبارەی پـەلامار دانی فەلەستینەوە هی ئەو سەردەمەیە • ئەو دیمەنێك نیشان ئـەدات کـە لـە پـەلامار بردنی ئەسکیتەکان لە سەدەی حەوتەم ئیلهامی وەر گرتوە ، وە ئەوە نیشان ئەدات کە کە دەسەڵاتدارەکانی لیدی بـــە شێوەی کاتی تاکــو بـەشی زۆروی فورات دەسەڵاتیان بووە(٨٤) •

بەم جۆرە مادەکان توانیان لـەشـکری ئالیات بـەرەو رۆژ ئاوا بشکێننە



**نەقشێکی هەڵکەندراوی گۆڕە بەردینەکەی (قزقاپان) رەنگ بێ کیاکسار بێ..**

دواوە • لەگەل ئەوەشدا چونکە شەڕکەرەکانی ماد لەو شەڕانەی ساڵانی دوایدا زۆر ماندوو بوبون • نەیان توانی بە تەواوی سەرکەوون وە لە **۲۸**ی مانگی [؟] ساڵی **٥٨٥**ی پێش زاینی دا لە کاتی شەڕ کردنا لەگەل لیدیەکانا رۆژ گیرا[٨٥] هەردولا رێکەوتن کە ئەم روداوە نیشانکردێکی جیهانی سەرەوەیە کە ئەبێ سولْح بکەن‌و ئاشت بنەوە • بە هۆی ناوبژی کردنی بابل‌و کیلیکیە پەیمانی ئاشت بوونەوەیان بەست وە سنوری نێوان لیدی‌و ئەمپەراتوریتی ماد بە درێژایی روباری گالیس [قزل ئیرماکی ئیستا] دیاری کرا • ئەم پەیمانە بەوەی کە ئاستیاگ کوڕی کیاکسار ئاریانیای کچی ئالیاتی خواست مەحکەم تر بوو • وە هەمو ناکوکیەکان لەبیر چونەوەو لەناوا لابران[٨٦] • رەنگ بێ کە پەیمانی ئاشتی بەهۆی کیاکسار خۆیەوە [هەروەکو لە وتەکانی هرودوت‌دا دەر ئەکەوێ] نەبەستراوە بەڵکو بەهۆی کوڕەکەیەوە ئاستیاگ [ هەروەکو ئاسکیل ئاشیل - باسی کردوە ][٨٧] ، بەستراوە • کیاکسار سنوری ئەمپەراتورێتی مادی تا ئەو جێگایەی فرەوان کردەوە کە هەرگیز لەوە بەو لاوە تێ نەپەڕیوە ، خستیە ژێر دەستی خۆیەوە ، وە هەر لە هەمان ساڵدا لە دنیا دەرچو •

# کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیمپەراتۆری
# «مــاد»

## ١ ـ کۆمەڵگا

مانای پێشو [ ئازربایجانی ئێران ] مـەرکـەزی ئابوری‌و فـەرهـەنگی ئەمپەراتوریتی ماد بو ، ئەم ناوچەیە [بین‌النهرینی ژورو کـە ویران‌و هـەژار بوبو وە هەندێك لە ناوچەکانی ئەرمەنستان کە سـەر بەماد نەبون ئەوانە باس ناکەین] لە روی ئابوریەوە لە ناوچەکانی تر باشتر بوو ، وە گەلێك کێلگەی باش‌و باخ‌و باخات‌و بێشەی هەبو[١] •

بۆ ئەوەی بە باشی هەمو روەکانی دەوڵەتی ماد بناسین پیویستە لە پێشا لە بارەی باری کۆمەلایـەتی مـادەوە ئشنا بین وە جۆری کۆمـەلایـەتی ئـەو سەردەمەیان شارەزا بین ، بە داخەوە هیچ سەرچاوەیەك لەم رودوە کە یارمەتی ئیمە بدات بە دەستەوە نیە • وە نامانەوێ پشت بەو سەرچاوانـە ببەستین کـە بەڵگەی سەلماندنی بەسەکەیان نیە ، وەیان باوەڕ بەو قـسە سەر زارەکیانە بکەین کە هەر یەکەیان بە جۆرێکی لێ ئەدەنەوە •

نوسراوەکەی داریوشی یەکەم لە بێستون [لە کۆتایی سەدەی شەشەمی

پێش زاینیدا] ئەوە نیشان ئەدات کـە سروشتی کۆمەڵگای مادو جۆری پێک هاتنی زۆر لـە هێنی کۆمـەڵگای پارس ئـەچێ ، بـە تایبەتی لەمادا دیسان ـ هەروەکو پارس ـ « کارا ـ kara » یان [ خەڵك ـ لەشکری ] واتـا خەڵکە ئازادە چەکدارەکان هەبوو ، کە ئەمانە بـەشی هـەرە گرنگی کۆمەڵ بون ، گومانی تیا نیە کە نەك تەنیا ڕێکخراوەی دەوڵـەتی بـەڵکو ڕێکخراوەی کۆمەڵگای پارس گەلێك شتی چاولێکـەری لـە مادەوە وەرگرتوە • جۆری ڕیکخستنی سەردەمی مادو ئەو ڕێکخستنانەی کـە لە دواییدا لـە پارس پێك هاتون لە بارەی ئابوریەوە کە بە هێنی سەدەی شەشەمی پێش زاینی زانراوەو لە شوش دەست کـەوتوە[2] [ هێنی مادەکان وەیان سـەرەتای پـەیدا بونی هەخامەنشیەکان بووە ] • بە پێی ئەو بەڵگەو سەنەدانەی کە دۆزراونەتەوەو هێنی نیوەی یەکەمی سەدەی پینجەمی پێش زاینی‌یە ـ ئەمانە بەدەستەوەدن • بەم هۆیـەوە ئـەو سـەرچاوانەی لـەم دواییەدا باسمان کردن ـ کە بـە هـۆی کامرۆنەوە[3] بڵاو بۆتەوەو [و • ئا • تیورین] ئەوانەی لێك داوەتەوە ـ ئەوانە ئەتوانن تاڕادەیـەك چـۆنێتی کۆمـەڵـگای مـاد لـە بـەرچـاو ئێمـەدا رون بکەنەوە[4] •

بەداخەوە ئەو بەڵگانەی خەزینەی ئەستێلك بە زمانی عیلامی کـە لـە فارس [وە رەنگە بێ لەمادیشدا ؟] بەو زمانـە نوسراوەی نامـەی بازرگانی نوسرا بێت نوسراوەتەوە ، وە ئێمـە هێشتا بـە رونی لـە مـانای نوسراوە عیلامیەکان ناگەین • لەگەل ئەوەشدا ئیستاش ئەتوانین زنجیرەیەك زانیاری بە کەڵك لەو سەنەدو بەڵگانە وەر بگرین • وە • ئا • تیورین کە ئەم سەرچاوانەی بەوردی لێك داوەتەوە بەو ئەنجامـەی خوارەوە گەیشتووە : ئـەم سـەنەدو بەڵگانە هێنی کۆمەڵە جۆربەجۆرە کار کـەرەکانە کـە بـە ناوی هـاوبەشی [ کـورتش kurtas ] ناو براوون • ئەوانـە زوربـەیان کـرێکاری ساختومان سازی بون کـە بـە ناوی [کورتش کینوشکی • پ] [کارگەرانی

تایبەتی ؟][٥] ناوبراوون • وە یان پیشەی ئەوانە دیاری کراوە [وەکو بەردتاشەکان ، مسگەرو هینی تر] ئەمانە خەریکی ئیش‌و کاری ساختومان سازی پایتەختی هەخەمەنشیەکان بون ، وە بە چەند دەستەیەکی گەورە [لە سەدەوە تا هەزار] دابەش بون • وە زۆر جار ئەو دابەشکردنانەیان تازە ئەکرایەوە و گۆڕانێکیان تیا بەکار ئەهێنان ، وە لە کارگەیەکەوە بۆ کارگەیەکی تر ئەیان گوێزانەوە • لەناو ئەوانەدا دیسان باسی کورتشیەکانی تریش کراوە کە لە دەرەوەی ئەستێلك ـ لە ناوچەیەکی دیاریکراوا ـ کاریان ئەکرد ، وە جاروبار بۆ تەواو کردنی کارێك ئەبران بۆ ئەستێلك •••هتد • لە ناو ئەوانەدا شوان‌و خاوەن پیشەی جۆربەجۆر هەبوە •

کورتشیەکان ژن‌و پیاوو منالان ـ کوڕو کچ ـ دیاربون • [پوهوپتی مانیش]ین [یانەی جوانان] [یانەی شاگردان] جیا بون • موچەیان وەر ئەگرت بەلام زۆرتری [شەراب‌و مەڕیان] پێ ئەدان • ئەوەی موچەکەی وەر ئەگرت ئەبوا لە دوایدا بی فرۆشتایە ، موچەی مانگانە لە ٤ تا ٦٠ دانگ نان لە نیو تا ٨ سیکل ی پارەی بابلی [یان زۆرتر] بووە[٦] •

لەوە ئەچێ کورتش مری •پ وە جۆرەکانی تری کورتش هەمو ساڵ لە دەسگا ئابوریەکانی سەڵتەنەتدا کاریان کردوە ، هەرچۆن بێ چەند مانگێك لەسەر یەك بێ ئەوەی بیان گۆڕن خەریکی کار کردن بون • بە وتەی [وە ئاە تیورین] [لە هەر کاتێکدا کە ویستویانە دەستەکانی کورتش لە ڕوی تەمەن‌و رەگەزەوە لێك بدەنەوە توانیویانە بگەنە ئەنجامێکی بەکەڵك] ژمارەی ئافرەتان دوو ئەوەندەی پیاوان بون • لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك دەستەی تایبەتی کورتش هەر لە پیاوان پێك هاتبون •

وە ئاە تیورین لە دوای لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی بەڵگەکان گەیشتۆتە ئەم ئەنجامەی کە کورتشەکان بە دیل نەگیراون بەڵکو خەڵکی ئازادی کۆمەڵگای پارس بون کە لە دەستگای ئابوری سەڵتەنەتیدا سودیان لێ وەر

ئەگرتن ، ئەو بۆ ئەوەی ئەم بیروڕایەی خۆی بسەلمێنێ لە هەمو ژمارەو چۆنێتیو سەرچاوەی زمانو .... [کە لە دوایيدا قسەی لێوە ئەکەین] سودی وەرگرتوە .

چونکە لە بەرامبەر هەر پیاوێکی کورتش دوو ژن هەبوە ، و. ئا. تیورین بەم جۆرە ئەنجام ئەگەیەنێ کە نیوەی پیاوانی پارس [پرسید] رویشتون ، وە هۆی نەبونی ئەوان جگە لە خزمەتی سەربازی بە هیچ شتێکی تر دانانرێت[7] . لەبەر ئەمە کورتشەکان لە بنەمڵە ئازادەکانی کۆمەڵگای پارس بون [واتا کاربەدەستان] . بەڵام بەم جۆرە پادشا لە سەرانسەری ساڵدا باجو باری ئەخستە پێیان . و. ئا. تیورین کە ئەڵێ ژمارەی ئافرەتی کورتش دوو بەرابەری پیاوان بووە ئەمەی لە ئەنجامی لێکدانەوەی سەنەدو نوسراوەکان وەرگرتوە ..

**و. ئا. تیورین[8] ژمارەی پیاوانو ئافرەتو منالان بەم جۆرە باس ئەکات :**

١٠٠، ١٨٣، ٨٥ ،٧٧ [کورتش کێنوشکی .پ]

١٠٠، ٤٠٠، ١٣١، ١٣٢ [کورتش کێنوشکی .پ]

١١٣، ٢٥٦، ١٤٣ ، ١٢٦ [دەستە جوربەجۆرەکانی ئەستیلك]

١٠٠، ٧٦ ، ٩٦ ، ٥١ [کورتش مڕی .پ]

١٢٧، ٩١ ، ٧٦ ، ٧٦ [شوانەکانی دەرەوەی ئەستێلك]

١٢ ، ١٤ ، ١٨ ، ١١ [شەراب سازەکان][9]

**خشتەی ژمارە - ٣ -**

| کارگەران | پیاوان | منالان | هەموی | ژنان | کچان | هەموی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کینوشکی. ب | ٢٢/٥٠٪ | ١٩/١٠٪ | ٤١/٦٠٪ | ٤١/١٠٪ | ١٧/٣٠٪ | ٥٨/٤٠٪ |
| کینوشکی. ب | ١٢/٣ | ١٦/١ | ٢٨/٤ | ٤٩/٢ | ٢٢/٤ | ٧١/٦ |
| کینوشکی. پ و... | ١٦/٨ | ٢٠/٢ | ٣٧/ـ | ٤٣/٩ | ١٩/٧ | ٦٣/ـ |
| مری . پ | ٣٠/٩ | ٢٩/٧ | ٦٠/٧ | ٢٣/٥ | ١٥/٨ | ٣٩/٣ |
| شوانەکان | ٣٤/٣ | ٢٠/٥٥ | ٥٤/٨٥ | ٢٤/٦ | ٢٠/٥٥ | ٤٥/١٥ |
| شەراب سازەکان | ٢١/٨ | ٣٢/٧ | ٥٤/٥ | ٢٥/٥ | ٢٠/ـ | ٤٥/٥ |

ئەبێ ئەوە بزانین ئەو دەستانەی کە تەنیا لە پاوان پێک هاتوون لە جەدوەلە کەدا نیە • لە نەخشەی ژمارە سێدا وا دەرئەکەوێ کە ئەتوانین دەسەو کۆمەڵەکانی کورتش بکەین بە سێ بەشەوە بەم جۆرە :

١ـ کومەڵە پیشەگەرەکانو ئەو بێگانانەی کە لە نەخشەکەدا دەرنەکەوتون [سوریە کانو میسریەکان و یۆنانیەکانو هینی تر] ، وە تەمەنو رەگەزی ئەوانە دیار نیە وە هەروەکو وە ئاە تیورین نیشانی داوە(١٠) لەوە ئەچێ کە زوربەیان پیاو بوبن • پلەی ناوەراستی ئەوانە لە هینی تر بەرەو خوارتربوە •

٢ ـ کۆمەڵە کارگەرەکان ئەو دەسگا ئابوریە سەڵتەنەتیانە بون کە خەریکی ئیشو کاری ساختومانی بون وە تەمەنو رەگەزی ئەمانە دیاریە • ژنان ٪ ٥٠ ـ ٤٠ [ لەگەل کچەکاندا ٪ ٧٠ـ٦٠ ] • پیاوان ٪ ٢٢ ـ ١٣ [لەگەل مناڵەکانا ٪ ٤٠ ـ ٣٠] •

٣ ـ کۆمەڵە کارگەرە کشتوکاڵیەکانی دەرەوەی ئەستێڵك هەروەکو کورتش مرِی پ : ژنان ٪ ٢٥ ـ ٢٠ [ لەگەل کچەکانا ٪ ٤٥ ـ ٤٠ ] • پیاوان ٪ ٣٥ ـ ٢٠ [لەگەل مناڵاندا ٪ ٦٠ ـ ٥٥] • پلەی ناوەراستی ئەم کۆمەڵە نەختێك لەوانی تر زیاتر بوو •

بەم پێیە وە لەبەر ئەوەی کە ژمارەی ئافرەتی کورتشەکان دو ئەوەندەی پیاوان بوە لەیەك ناچن • ئەگەر لە کۆمەڵی دووەمدا ژمارەی ئافرەتەکان نەختێك زیاتر بێ رەنگە بێ کەمی ژمارەی پیاوانی کۆمەڵی یەکەم بو بێتە هۆی ئەم ژمارەیە •

بە پێی نەخشەی سەرەوە کورتشە کشتوکالیەکان ژمارەی پیاوانو ئافرەتان بەرامبەر بون •• بەلام کارگەرە ساختومانیەکانی ئەستێڵك ـهەروەکو کارگەرە پیاوە تایبەتیەکان بە شیوە دەستەی بچوکی جیا جیایان لێ هاتبو ،وە لە ناو دەستەو کۆمەڵەکانی ترا ژمارەی ژنان یەكو نیو تا دوو ئەوەندەی پیاوان ئەبون •

جگە لەوە هرودوت بە ئاشکرا ئەڵێ کە ئازادیخوازە پارسیەکان لە بارەی هەمو خەرجو باجێکی شاوە عەفو بون[١١] ئەبێ ئەوەمان لەیاد بێ کە کۆمەڵگای پارس ئەوەندە کامل نەبوبو وە تازە پێی نابوە سەرەتای کامڵ بونی چینایەتیەوە • نەریتی کۆمەلایەتی بەندەداری یان بلێین خاوەن کۆیلەکان ماوەی ئەوەی نەئەدا کە بلێین کورتشەکان [کە ژمارەیانی زیاتر لە ٣٠٠٠ بو] ئیشیان بۆ پادشا ئەکردو رۆژانەیان وەر ئەگرت •

ئەگەر وا بلێین لە نرخی دواکەوتنی کۆمەڵگاکانی ئەو رۆژەمان [کە لەوە ئەچۆ] کەم کردۆتەوە ، تەنانەت لە بابل کە هەزار ساڵ بو سەردەمی کامڵ بونی چینایەتی بەجێ هێشتبو وە هیچ شتێکی بەو جۆرەی تیادا نەبو • ئەوەش بلێین کە بەرهەمی ژنە ئازادەکان لە دەسگا ئابوریەکانی ولاتا تاڕادەیەك کە ئەزانین لە ئاسیای نزیکی کۆن سودی نەبوە • بە درێژی

ماوەی کارەکان [ئەگەر ئەو کارانە بە بێگار دابنێین] بێ هاوشان ئەبن •

وە ئاە تیورین لە دوایدا ئەڵێ کە زاراوەی کورتش و تشو • پ [= پارسی کون : کار kara ] وە کورتش وایرو هیدك [= بە فارسی کۆنی مرتیا «پیاو» ] وە هەروەها کورتش‌و مانیە maniya (١٢) لە فارسی کۆندا بەرامبەر بون •

**ئیستە ئەم لەیەك چونانە ماناکانیان لێك ئەدەینەوە :**

وە ئاە تیورین(١٣) ئەوە دەست نیشان ئەکات کە لە سەنەدی ژمارە ٢٧ کۆمەڵێك لە پیشەگەرەکان تشو – پ یان پێ وتون – نەکورتش – بەڵام ئایا لەو کاتەدا نە ئەتوانرا بوترێ کە ئەم دەستە پیشەگەرانە بە تایبەتی – وە لە ئازادیخوازەکان پێك هاتبون ؟(١٤) دیسان پیشەگەری ئازاد لە پارسدا هەبوە(١٥) • هەرچۆن بێ ئەمە ئەوە ناسەلمێنێ کە کورتش لەمانادا لەگەل تشو • پ بووەو ئەم دوو زاراوەیە بەرامبەر بن •

لەبەر ئەوە لە چەند شوێنێکدا کورتش بەناوی ئادەمیەکان [پیاوەکان] [ئیروهی دگ ، مرتیا] ناوبراوە ، هیچ بەڵگەیەك لە بارەی چۆنێتی کۆمەڵایەتی ئەوانەوە بە دەستەوە نیە • زاراوەی [ئادەم ومەرد] [پیاو] نابێتە بەڵگەی چۆنێتی کۆمەڵایەتی ، وە ئەگەر مانایەکی بەم جۆرەی بۆ لێك درابێتەوە ، ئەوا لە هەمو شوێنێکدا ئەو مانایە وەکو یەکی نەگرتۆتەوە ، بۆ نمونە لە کۆمەڵگای بابلی کۆندا [ئادەم] بە مانای [یەك کەسی ئازاد بوە] بەڵام بە پێچەوانەوە لە سەردەمی بابلی تازەدا بە دیلەکانیان ئەوت [ئادەم] چونکە نوسەرەکەی ئەستێلك هەندێ جار لە جێگای [ فلان کۆمەڵ کورتش ]ی نوسیوە ، وە هەندێك جار [فلان کۆمەڵی ئادەم]ی نوسیوە •• وە هەروەکو داریوش لە نوسینەکەی خۆیا نوسیویتی کە بۆ ساختومانی کاخی ئەو [ئادەمە پیشەگەرەکان] کاریان ئەکرد – ناتوانین ئەوە رون بکەینەوە کە ئەو [ئادەمانە] لە دیلەکان بوبن وە یان لەوە ناچێ هەرگیز بە دیلەکانیان وتبێ

[ئادەم] • بەڵام گومانی بۆ ئـەچێ کـە نوسەرەکانی داریوش یان خشایارشا [دیلەکازان] بە [کەرەسەیەکی دەنگدار] ناو بردبێ •• وە رەنگ بێ هەندێ جاریش دیلیان بــە ئادەم ناو بردوە •• نوسراوەکەی بێستون لێك چوونی مانای کورتش‌و مانیە [خانەگی] یــە ، هەروەکو وشەی یۆنانی کــە ماناکەی [براوەی ناوماڵە] مانای [بردە] ،وە فامولوس Famulus [17] ئەگرێتەوە• ئەوەشمان لە یاد نەچێ[18] کە مرِی ـ پ• مانای [ زیندانی ] و [ دیل ] ئەگرێتەوە •• وە ئەوەش بڵێین کە یەکێك لــە کورتشیەکان بــەم جۆرە ناو براوە [کورتش مری ـ پ] •

وە ئاە تیورین بەم جۆرە لێکدانەوەی مانای کورتش قایل نابێ‌و ئەڵێ ئێمە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە مانای زاراوەی کورتش لەگەل [بندك] وە یان مریکەی پارسی کۆن [ Bandaka,marika ] وەیــان لیپــامــەی ئاکدی کە بە مانا تالاَنکەرەکان ئەگرێتەوە یەك بێت •

بەڵام بندك وە لیپا مانای تریان هەیە کــە لەگەل دلوس Doulos ی یۆنانی مانای یەك ئەگرێتەوە • واتا [کەسێك کە پەیوەندی بــە کەسێکی ترەوە بێت] ، بەو جۆرە داریوش لــە نوسراوەکەی بێستون بەم جۆرە باسی ساتراپەکانی خۆی ئەکات • زاراوەی لوگالامش ئەمــە لــە شومەریەکانەوە وەرگیراوە بەمانا [خزمەتکار] ئەگرێتەوە[20] وە زاراوەی مریکــە ئــەویش دیسان مانایەکی تایبەتی هەیە[21] •

ئەبێ ئــەوە بزانین کــە پوهو ـ پاتی مانیش puhupatimanis کــە [لەگەل مانیە maniya یەك سەرچاوەیان هەیە] ـ وە ئاە تیورین ئەوانە بە تالاَنکەر لێك ئەداتەوە ـ بێ گومان کورتش ئــەگرێتەوە ، کەوابو هەرچۆن بێ ئەبوا تالاَنکەرەکان ئەوانیش بەشێك بوبن لــە کورتش • ئەگەر [تشو ـ پ]یەکان بیان توانیایە ببن بــە کورتش [کــە ئەمــە شتێکی گــومان

لێکراوە] کەوابو ئەم بەڵگەیە بە هەر جۆر لەوە بەهێز تر نیە کە تاڵانکەرەکان بە کورتش دائەنێ •

لەوە ناچێ ئەوە ئینکار بکرێ کە ئەو کورتشە دیلانەی سوریەو میسرو یۆنان ئەو دیلانە بوبن کە لە دوای لەشکر کەشیەکان هاتونەتە ئەو جێگایەوە• لە ئەنجامدا ئەبێ بووترێ هەروەکو لە نوسینەکانی [گرشویچ] دا[٢٢] هەیەو دەر ئـەکەوێ وشـەی عیـلامی کورتش بـەرامبـەر بـە وشـەی گردی grda ی ئێرانی ئەبێ • وە هەروەکو لـە سەنەدو بـەڵگە ئابوریەکانی ئارشام ساتراپی بابل و میسردا دەر ئەکەوێ [گرد]ەکان [ GRD ئـارامی] لەناو دەستو پێوەندەکانی ئەوا کۆمەڵە کارگەرێکی رەسەن بون •[گرد]ەکان لە هۆزەکانی [ویس پزن vispazana ] بون[٢٣] چەند جار لـە بارەی گردەکانی سەڵتەنەتەوە ناو براوە • بێ گومان ئەوانە هەمان کۆمەڵە بون کە لە ئەستیلێك بەزمانی عیلامی کورتش ناوبرابون وە ئەوانە بە دیل گیرابون •

بەم پێیە ئەگەرچی لـەوە ئەچێ لـە نێوان کورتشەکانا ژمارەیەك لـە ئەندامانی بنەماڵە ئازادەکان [تشو ـ پ، کار] کە بە بێگار هێنرابون هەبوە • بەڵام بە پێی بیروڕای ئێمـە گومـانی تیـا نیـە کـە کورتشەکان لـە دیلـە گیراوەکان بون[٢٤] •

دیتە یادمان کە باری ئابوری بنەماڵەی سەڵتەنەتی هەخامـەنشینەکان لـە سەدەی پێنجەمدا زۆر لەوە ئەچو کـە ئێمە لە کاتی خۆیا لـە بارەی چۆنێتی بنەماڵەی سەڵتەنەتی ئورارتووە دامان نابو[٢٥] • بەشێك لەو خەڵکەی کە لە سەر زەمینە داگیرکراوەکانا هێنابونیانە ژێر فەرمانەوە ئەبون بـە بەشێك لـە لەشکرە سەرکەوتوەکە[٢٦] وە بەشێکی تریش دیسـان لـە شـوێنی خۆیان دەریان ئەکردن وە هەروەکو تاڵانواڕەیی دەوڵەتی لـە شوێنێکدا دایان ئەنان بۆ ئەوەی سەربەخۆ کار بکەن[٢٧] •

بەڵام ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە لـە سـەردەمی ئورارتو لـە سـەدەکانی

حەوتەم و هەشتەمی پێش زاینیدا وە پارس لە سەدەی پێنجەمدا لـە راستیەوە نزیك بن ، ئەوە لە بارەی مادەوە لـە سەدەکانی حـەوتەم و شەشەمی پێش زاینیدا دیسان ئەوەش راست دەرئەچێ[٢٨] • بەڵام ئەبێ دەسگای ئابوری بنەماڵەی کیاکسارو ئستیاگ لە حاستی دەسگای داریوشی یەکەم و خشایارشا بە بچوکتر دابنێین • جگە لەمانە لە بارەی کۆشك و قەڵاو شکۆی ئەکباتانەوە کە پولی بی لەو بارەیەوە هەندێك زانیاریمان ئەداتە دەست • ئەوە هیچ گومانی تیا نیە کە ئەو کۆشکانە وەکو کۆشـکەکانی ئەستیلك [مانیە ـ کورتشەکن] دروستیان کردوە • بە کورتی لە سەردەمی پیشوودا [مرۆڤە سنعەتکارەکان] لە دەسەو دایـەرەی پێشـووی ئاشورو ماننا بون • ئەمـەش ئـەو جوانی و رازاوەیی و هونەرانەی لە بەرد تاشینی کۆشکی هـەخامەنشیەکان و ئاشوردا هەیە ئەم وتەیـەمان ئەسـەلمێنێ • وە کۆشـــکی مادەکانیش ئـەو وەستایانە دروستیان کردوە کە لەوەبەر لە ئاشورو ماننا کاریان کردوە • وە لە واقیع دا ئەو کۆشکانە لە بارەی شێوەو جۆری ساختومان سازییەوە لە نێوان هونەری ئاشورو هەخا مەنشیەکانا بووە •

گومانی تیا نیە کە لە دەسگا ئابوریەکانی گەورە پیاوان و پەرستگاکان[٢٩] دیسان دیلە تالانیەکان کاریان تیا ئەکرد • بەڵام لـە بارەی ئەو دەسگایانەوە هیچ جۆرە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە •• لەگەل ئەمەشدا رێی تێ ئەچێ کە زۆرتریان بە تالانی هاتبن[٣٠] • هەرچۆن بێ لە ئەنجامی قەلاچۆ کردنی ئاشوردا سامانی گەورە پیاوانی ماد زۆر پەرەی سەند •

پێویستە ئەو باسەی کە لە بارەی مەرجی مڵکداریەوە گرنگە بیخەینـە روو • زەوی و زاری [سوریە ـ ماد] کـە ئاشوریەکان خـەڵکی رەسـەنی زایندەی ئەوێ یان بۆ شوێنەکانی تر دور خستبۆوە بوو بـە مڵکی پادشایی ئاشور • وە ئەو کانەی کە زەوی و زاری ناوبراو کەوتە دەست دەوڵەتی ماد ئەبوا ببوایە بە مڵکی پادشایانی ماد • هـەروەها گـەلێك زەوی و زار کـە

مادەکان لـە شوێنەکانی تر داگیریان کردبو بـەم جۆرەی لێ هـاتبو • بـەم هۆیەوە بەشێکی زۆری خـەڵکی ئـەو ناوچانـە وەکو [کشتوکاڵ پیشەکانی سەڵتەنەتی] کە لە خۆیانا ئازاد بون‌و کشتوکاڵیان بۆ پادشا ئەکرد لە زەوی‌و زارەکانی پادشادا نیشتەجێ بون •



**دو سەرکردەی مادەکان •• لە ئەستێلك نەخش کراوە •• هینی سەدەی پێنجەمی پێش زاینی یە ••**

ئەوەمان دی کە بە [پێی بیروڕای و• ئاە تیورین کە بە هۆی کامرونەوە گەلێك لێکۆڵینەوەو بەراوردی سەنەدو بەڵگەکانی کردوە ، وە یەکەمین جار بۆ ئەوەی شتی بەکەڵکیان تیا بەدەست بێنێ زۆر تەقەللای داوە ، وە ئێمە لەم کاتەدا باوەڕی پێ ئەکەین] • سەنەدو بەڵگەکانی ئەستێلك لە بارەی کورتشەوە تەنیا دەسگا ئابوریەکانی سەڵتەنەتی هەخامەنشیەکانی بۆ ئێمە باس کردوە •

بەڵام لە بارەی چۆنێتی خەڵکە شورشگێڕە ئازادەکانەوە ناتوانین راستەو خۆ سودی لێ وەر بگرین •

لەبارەی ئەم کۆمەڵە خەڵکەوە [خەڵکە شورشگێڕەکان] ئەبێ سود لـە نوسراوەکـەی بێستونو تا ڕادەیـەك نوسینەکانی نووسەرە یۆنانیـەکان وەر بگرین • نوسراوەکـەی بێستون هینی نیـوەی دووەمی سـەدەی شەشـەمو شوێنەواری یۆنانیەکان هینی سەدەی پینجـەمی پێش زاینی‌یە • بـەڵام هیچ گومانی تیا نیە ئەو مەرجو چۆنێتی یانەی کـە لـەو باسـەدا هەیە لەگـەل چۆنێتی نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەم کـە لـەم بەشەدا باسی لێوە ئەکەین تاڕادەیەك لە یەك ئەچن •

هەروەکو لە سەرەوە باسمان کرد لە ماددا هەروەکو پارس لە سەدەی شەشەم مانای [خەڵکی شورشگێر] لەشکرێك بوو کـە هـەمو ئەندامی ئازادی ئەو سەرزەمینە هاوبەشیان تیا کردبێ ، لە پارسو ماددا لەشکرێکی هەمیشەیی لە لای پادشا [هەروەکو ـ دە هەزار کەسی خۆ بەخت کەر ـ لە پارس] وە لە هۆردو گاکانا هەبوە •

لە ئێران لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا بـەلای هـەموانەوە مەسـەلەی جەنگو مەسەلەی کشتوکاڵ شان بـە شانی یەکـەوە بونو ئامرازی یەکتر بون • وە پیاوێکی ئازاد هەردو پیشەکەی هەبوە ـ ئەگەرچی لـە سـەدەی پینجەمدا ئەم بیروڕایە زیادی نەکرد(۳۱) ، بەڵام لە مادی کۆن ئەبوا هـەمو کەسێك لە کۆمەڵی کیشاوەرزانو کشتوکاڵ کەر بوایە(۳۲) •

بەڵام هەمو پیاو گەورەیەك شورشگێڕ بووە ، بەم هۆیەوە ـ رەنگە بێ گەورە پیاوەکانیش خەریکی کار کردن بوبن ، ئەگـەرچی شـوێنو پلـەی کۆمەڵایەتیشیان زۆر بەرز بو بێت • ئەبوا گەورە رەسەنەکان واتا جێ نشینی پادشایانو پێشەوایان سەرکردەکانی لـەشکر ئەوانیش هـەر بەشێك لـەو کۆمەڵە بونایە •

سەرکردەکان زوربەیان لە پاوە گەورە رەسەنەکان بون [بۆ نمونە سەرۆکی تیپی گەورەکانی هارپاك سەرداری سولتان بووە] ، بەلام هەندێك لە شەرکەرەکان ئەوانیش بەشێك بون لە سەرکردەکانی لەشکر .



**جوتیارێکی مادی لەروی مۆرێکی ئەستونی نەخش کراوە .. سەدەی پێنجەمی (؟) پێش زاینی**

داریوشی یەکەم لە نوسراوەکەی بێستون دا لە نێوان [خەلکی ـ شورشگێر کە لە لای من بون][٣٣] وە [خەلکی شورشگێری ماد کە لە کۆمەلەکانا بون] جیاوازی ئەکات[٣٤] .

بۆ ئەوەی هەست بە ماهیەتی مەسەلەکە بکەین ئەبێ مانای ئەم زاراوەیانە بزانین . کلید لێکدانەوەی ئەم باسەی [زاراوەی ویشاپتی یە کە لە وشەی دیت پێك هاتوە] وە ئێمە زۆرتر لە بارەی ئەم وشەیەوە قسەمان کردوە . نەك تەنیا تێ گەیشتن لەم زاراوانە بەلکو هەست کردن بە ماهیەتی کۆمەلگای ماد سەردەمی سەرەتایی پارس [ئێران] لەگەل مانای وشەی ویثدا[٣٥] .

ویسباخ وشەی [ویث]ی بە خانە لێکداوەتەوە[٣٦] وە بەم هۆیەوە [ویث پتی] ئەوانەن کە لە کۆشکدان[٣٧] • [تولمان][٣٨] زیاد لە ویسباخ چوە بەو لاوە ترەوە خۆی وشەی [ویث]ی بە بارەگای سەڵتەنەتی لێکداوەتەوە ، وە [کنت ویث][٣٩]ی بە بنەماڵەی پادشایان ناو بردوە •

وەرگێڕەکانی [مترجم] تر[٤٠] ویث [ویس] یان بە عەشیرەت و خانەدان زانیوەو گەلێك لە دانشمەندانی رۆژ ئاوا ئەوانیش هەر بەو جۆرە لە مانای ئەم وشەیە گەیشتوون ، لەبەر ئەوە کە پارسی کۆن کۆمەڵگایەکی فئودالی بووە[٤١] • بەڵام لەم کاتەدا ئەوەی بۆ سەلماندنی ئەم وشەیە بشێ بە بەڵگە هێنراوەتەوە • ئەگەر بڵێین کۆمەڵگایەکی فیئودالی بوە ـ ئەوا ئەبێ هەمو تەل و پەل و شتومەکی عەشیرەتی بە ملکی فئودال دابنێین ، بەڵام لە واقیعدا بەم جۆرە نیە •

بە پێی بیروڕای ئێمە ـ هەروەکو لە مەوبەر باسمان کردوە ـ ویث ـ ویس بە مانای کۆمەڵە ، کۆمەڵێك کە لە سەرەتای عەشیرەتیدا بووە ، وە لە دواییدا بە شێوەی کۆمەڵی خەڵك دروست بوە ، ئەگەر چاو پۆشی لە ملك و ماڵی فیئودالی بکەین لە سەر زەمینەکانی مادو پارسدا ئەبێ پێ لەوە بنێین کە [کار] ـ ئی **kara** کە لە [ویث] بون ـ بەر لە هەر شتێك ئەگەرچی بە ئەندامێکی ئازاد سەیر کراون وە [کار ـ ئی kara کە لە لای پادشایان بون] ئەو کۆمەڵە شەڕ کەرانە بون کە سەر بە سەرکردە جەنگیەکان و خزمەتکارە ناسراوەکان بون • لە واقیعدا کام کەسی مادی ئەیتوانی لە دەرباری پادشایی پارس بمێنێتەوەو سەقامگیر بێ وە هاوبەشی کوژانەوەی ئاگری شۆڕشی ماد بکات • ئەوانەی خیانەتیان بە کیشوەری خۆیان کردوەو پشتی کورشیان گرت وە یان ئەوانەی کە داکۆکیان لە سەر سەربەخۆیی ماد کردوە ؟ بە رونی ئاشکرایە کە ئەوانە کۆمەڵی یەکەم بون• وەکو هرودوت و بەسەرهاتە مێژوویەکەی [نابونید] دەری ئەخات پیاو

گەوران‌و لەشکریەکان خزانەتیان بە ماد کرد • ئەمەش دیسان بەڵگەیەکی تره کە بۆچی ئێمە باوەڕمان وایە زۆر تر لە ئەندامانی بۆرە پیاوانی کۆمەڵ بون • [وە هەر بەو جۆرە بەشێك لە گەورە پیاوانی رەسەنی ناوچەکە] وە شەڕکەرە خاوەن پیشەکان‌و پیاو گەورە رەسەنەکان‌و سەربازیەکان پێك هاتبوون(٤٢) •

بە شێوەی گشتی لەوە ئەچێ کە لە سەدەی شەشەم مانای هاوبەشی [خەڵکی ـ شورشگیر «بە فارس کون = کار] بە هەمو دانیشتوانی ئازادی سەرزەمینی مادیان وتوە کە لە روی رەسمی‌و ماف‌و پیشەوە ئازاد بون • وە کۆمەڵانی خەڵك[خەڵکە ـ شورشگیرەکان] هێشتا لەو سەردەمەدا ـ بەرای زوربە ـ لە ئەندامە کشتوکاڵیە ئازادەکان بون واتا ئەو کەسانەی کە راستەو خۆ بەرهەمی نیعمەتیان بە دەست ئەهێنا • ئاشور بە دەستی ئەوانە لە ناو چوو وە ئەمپەراتوری بە هێزی ماد بە هاوکاری ئەوان دامەزرا ، ئیتر نەزانراوە کە ئایا ئەوانە ـ جگە لە خزمەتی جەنگی ـ بێگاریان بۆ پادشا ئەکرد وە خەرج‌و باجیان پێ ئەدا یان نە؟ •لە باسەکانی هرودوت [ I ، ١٢٦] بەم جۆریە کە بێگارو ماڵیاتە کانیان تەنیا خستبوە پێی ئەو هۆزانەوە کە سەرین پێ دانەواندبون ، بەڵام لەم روەوە دڵنیایی تەواو نەبوە ، بەڵام لە بارەی خزمەتی جەنگی‌و سەربازی‌یەوە •••وەکو زانراوە کە کۆمەڵانی خەڵك بە پێی پێویستی رۆژگار کۆ ئەکرانەوە ، وە بەم هۆیەوە لە نوسراوەکەی داریوش‌دا بە ناوو نیشانی [خەڵکی شورشگیر کە لە خانوەکانیانا ئەمانەوە] ناو براوون •

بەڵام هەرچۆن بێ ئەوەندەی روناکە کە مەبەست لە وشەی [کارا ـ kara ] تەنیا لەشکری هەمیشەیی نەبووە ، [وە بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هرتسفلدو ئەوانی تریش باسیان کردوە] تەنیا [پیاو گەورەکانی دەرباریش] نەبوە ، بەڵکو بە کۆمەڵە خەڵکە ئازادەکانیان وتووە(٤٣) •

لەگەل ئەوەدا کە لە مادو پارس ئەم کۆمەڵە یان بە [خەڵکی ـشورشگیر] ناو ئەبرد ناکوکی دارایی لە نێوانیانا زۆر بو •

ئەبێ بۆ ئەم مەبەستە ئـەو نوسینەی کە نیکولای دمشقی لـە وتەکانی کتسیاسەوە وەری گرتوە بیخەینە روو • تەنانەت ئـەگـەر کتسیاس – لـەم بارەیەوە – چۆنێتی سـەردەمی خۆی لە جێـگای چـۆنێتی مادی کۆن لێك دابێتەوە ، هەروەها شتێك لە گرنگی باسەکە لانادات ، چونکە باسەکـە زۆر کۆنو سەردەمی تێپەڕیوە •

بە پێی وتەی کتسیاس(٤٤) لـە مادا یاسـای رەسـمی Nomos هەبووە ، کە خەڵکی بە دەسەڵات ئەیتوانی ئـەرکی خۆی بخاتە پێی ئـەو کەسانەی کە بەخێو کردنی ئەگرنە ئەستۆ ، وە ئەگەر لە خۆراكو خواردنی خۆی رازی نەبوایە ئەیتوانی بە جێیان بێڵێ •

[خەڵکە بەدەستەڵاتەکان] لەم رووەوە هەمان خەڵکی ئازادی کۆمەڵگای ماد بون کە هۆی ژیانیان لـەو سەرزەمینەدا لـە دەست دابو • تا ئیستە لـە زانستی شورەوی دا لـەم رووەوە سەرچاوەیەکی رونیان دەست نەکەوتووەو زانیاریەکی تەواویان بە دەستەوە نیە • وە لەگەل ئەمەشدا ئەمە هەر بووە – چونکە ئەم عادەتە لە رۆژگاری سەرەتایی هەموو کۆمەڵگایەکدا باو بوە(٤٥)، لە دواییدا مـاوەی نێوانی تالانیـەکانو ئازادەکان زۆر تر بوو وە سنورێکی ئاشکرا لە نێوانیانا پێك هات وە ئابوری تالانکەرەکان بوبو بـە جێگـەداری ئابوری [نێروەجاخی – پدرشاهی]و لە کومەڵگاکەیانا مابووەوە •

بەڵام لەوە ئەچێ ئەو پیاو گەورانەی کە زوتر باسمان لێوە کردن ـواتا جێ نشینی پێشەوایانو پادشایانی کیشوەرەکانی پێشووی مادو سەرکردەکانی لەشکرو شەرکەرە پیشەییەکان ئەمانە بە رەسمی بەشێك بون لە [خەڵکی – شورشگیری] ماد • ئەم کۆمەڵە خەڵکە ئازادە لەروی ئابوریو کۆمەڵایەتیو چینایەتیەوە بە تەواوی لەگەل دەستەی یەکدا جیاواز بون وە بـەشی زۆری

ئەوانە لە چینی [بردەداران ـ تالآنكەرەكان] بون وەسامانی گەورە پیاوانی ماد بوبو بە پەندی رۆژانەی سەرزمانی هۆزەكانی سەردەمی كۆن •

ئەمە خۆی ئاشكرایە ، بە جۆرێك كە نوسەری رۆمی نوسیویە •• لە كۆتایی سەردەمی كۆمەڵگای سەرەتاییدا تالآنیو كەلو پەلو پلەی سوپایی لە نێوان شورشگێرەكانا [ئەوەی كە شایانی بوبێ] دابەش ئەكرا • ئەم بارە بە شێوەی یەكەم لە كۆمەڵگایەكی وەكو ماددا ـ كۆمەڵگایەك كە دیموكراسی عەشیرەتیو خانەدانیو وەكو پاشماوەی سەردەمی كۆنی لێ هاتبو تیایا ـ قەلاچۆ كردنی ئاشور بە شێوەی گشتی كیشوەری مادی دەوڵەمەند نەكرد بەڵكو تەنیا سەركردە سوپاییەكانو گەورەی خانەدانەكانو عەشیرەتەكان سودیان لێ وەرگرت • وە هەر كەسێ پلەی كۆمەڵیلە سوپادا بەرز بوایە وە یان لە كاروباری دەوڵەتیدا بە دەسەڵات تر بوایە تالآنی زۆر تر بۆ ئەمایەوە • بەم هۆیەوە ئەبێ سەردەمی حكومەتی كیاكسار بە سەردەمی دەوڵەمەند بونی پیاو گەورانی مادو بە هۆی پەیدا بوونی ناكۆكی سەختی دارایی لەناو ئەو كۆمەڵگایەداو بنچینەی هاتنە رِوی لێكدان دابنێین • بنچینەی ئەم ناكۆكیانە لە سەر بناغەی تالآنیو تالآنكەرەكان بوو • بەلآم [هەروەكو بە كۆمەڵگای كوێلەداریدا باو بوە ـ كە لەم جۆرە قۆناغانەدا لە كامڵ بوندا بون ئەهاتە پێشەوە] • لێكدانە دژوارەكان زۆر تر بە شێوەی ناكۆكیو بە زیانی هەژارو كشتوكاڵیەكانو ئازادە دەستكورتەكان لە لایەكو لە لایەكی ترەوە بە سودو قازانجی گەورە پیاوان ئەهاتە دی • رەنگ بێ لەم جۆرە زەمینەیەدا دژواری لە نێوان گەورە پیاوانی سوپاییو عەشیرەتەكانا [ كە خەریكی سامان كۆ كردنەوە بون ] وە حكومەتی پادشایی ـ كە لەو رۆژگارەدا داوای سیاسەتی سەربەستیانەی تەواوی كیشوەری ئەكرد ـ پەیدا بوو •

ئەم ناكۆكیانە كە رۆژ بە رۆژ بەهێز تر ئەبو لە سەردەمی پادشاییدا لە دوایدا بوو بە هۆی لەناوبردنی ئەمپەراتوری ماد •

## ٢ ـ دەوڵەتو دابەشکردنی ئیداری

لەبەر ئەوەی دامەزراندنی کۆمەڵایەتی ماد هێشتا خۆی نەگرتبو ، ریکخراوی قەوارەی دەوڵەتیشی ـ بە نیسبەت چۆنێتی دەوڵەتی ئاشور لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا ـ تارادەیەك خاوو نامەحکەم بو ،ئەمپەراتوریتی ماد یەکێك بو لە پادشایە کۆنەکان کە ناوی ریکخستنی نابەکامی سەربازیو ئیداری ـ بەر لە ئاشور ـ بەسترابو بە سەرکەوتنو ژێر کەوتنەکانیەوە •

هرودوت بەم جۆرە باسی ریکخستنی ئەمپەراتوریتی ماد ئەکات : [لە سەردەمی فەرمانفەرمایی ماددا هۆزێك حوکمی بەسەر هۆزێکی ترا ئەکردو مادەکانیش حوکمیان بەسەر هەمویانا ئەکردو « بەر لە هەموو » بەسەر ئەو هۆزانەدا کە لەوانەوە نزیکتر بون وە ئەوان بە سەر دراوسێکانیاناو دراوسێکانیشیان بەسەر هەتو سنورەکانیانا] [ ١ ، ١٣٤] • سەرچاوە عیبریە کۆنەکان دیسان لە بارەی [پادشای] مادەوە قسەیان کردوە(٤٦) وە نوسراوە بابلیەکەی [نابونید] ئەویش باسی پادشایانی مادو ئەو پادشایانەی کە سەر بەوان بون باسی کردون(٤٧) •

بنکەو جغزی ئەمپەراتورێتی ناوبراو لە سەرزەمینی ماددا [بە واتای تایبەتی دیاریکراو] بوو ، وە هەمان قەڵەمرەو بوە کە لە دواییدا لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا [بو بە ساتراپ نشینی ماد] • ئەو سەرزەمینە راستەوخۆ لە ئەکباتانەوە بەرێوە ئەبرا ، وە دانیشتوانی لە هەمو فەرمانداریو مافێکی مادەکان و دەست وپێوەندەکانی پادشایی ماددا ئیشیان ئەکرد ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا دابەشکردنی هۆزایەتی هەروەکو لەوەبەر هەبو(٤٨) • بەڵام دنیای دەرەوە بە هەمو دانیشتوانی ئەو سەرزەمینەیان ئەوت [ماد] • وە رەنگە بێ ئەوان خۆێشیان خۆیان بەو جۆرە ناو بردبێ ، هەروەکو س• ت• یرمیان ئەڵێ : سەرچاوە ئەرمەنیەکان دانیشتوانی ئەو چەند ناوچەیەی ئەرمەنستانی

رۆژ هەڵاتو ئاتروپاتینی رۆژ ئاوایان بە [مادی] [مار ـ ك mar-k ] نـــاو بردوە ، وە لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی مێژوویەوە ئەوانە هۆزەکانی هوریان ماتیانی بون(٤٩) • بەڵام لەو سەردەمەدا لەگەڵ مادەکان بوبون بەیەك • نابێ ئەم سەرچاوە ئەرمەنیە بە رێکەوت بزانین •

---

**ئەبوا لێرەدا نەخشەی ئیمپەراتۆری مـاد لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پێش زاینی دا دابنریە ، بەڵام بە داخەوە نەخشە کەمان بە دەستەوە لەناو چو ••**

---

ماد ـ یان پادشایی ماد ، لە پادشاییە کۆنەکانی ماد [مادی مەرکـەزیو رۆژ هەڵات]و ماناو ئـەسـکیت یێك هـاتبو • بـەم هۆیـەوە سـەرچاوەی هرودوت ـ جگـە لـە [مـاد] [پاریکانیەکان] و [ئورتوکوریبانتیەکان] یشیان دیسان بـە بەشێك لە ساتراپ نشینەکانی ماد ئەداتـە قـەڵەم(٥٠) • هەروەکو لەمەوبـەر باسـمان کرد [ئورتوکوریبانتیەکان] هـەمان دانیشتوانی پادشـایی پێشووی ئەسکیت بون • بەڵام سەرچاوەی ناوبراو مەبەستی لە [پاریکانیەکان] بەشێك لە دانیشتوانی پادشایی مانا بووە [کە هێشتا لەگەڵ مادەکاندا تێکەڵاو نەبوبونو یەکانگیر نەبوبون](٥١) لە دوای ئـەو مێژووەوە ئەو نامانە دووبارە نەبونەتەوە ، وە ئەو سەرچاوانەی هەنو هەدو دانیشتوانی مادیان تەنیا بە مادی ناو بردوە بـەڵام خاکی ماد بـە زەویو زاری سـێ پادشایی ناوبراوە [لـە سەدەی پێشوودا] فراوانتر بووە • لـە نوسراوەکەی بێستون دا ئەڵێ : کـە شاری ئاشوری [ئاربل] ئەویش بەشێك بووە لە خاکی ماد(٥٢) • لە وتەکانی [کزنفون] [ئاناباسیس III ، ٤،٧ـ١٠] ئەتوانین ئەم ئەنجامە وەر بگرین

که به شێوەی گشتی زەوی‌و زاری ئەسڵی ئاشور بوبو به بەشێك لـه خاكی ماد وه دوایی خەڵكی به بەشێك له سەرزەمینی مادیان ناو ئەبرد • ئاشكرایه كه [سوریه ـ ماد] یان [سیرومدی] ـ واتا وڵاتی پێشووی ئاشور كی دوری‌و زامواو پارسواو بیت هامبان‌و كیشەسوو خارخار ـ ئەمانەش بوبون به بەشێكی وڵاتی ماد •

ماد لەبەری زوروی رۆژئاواوه تا رادەیەك دەستەڵانی پەیدا كردبو ،وه هەندێك له زەوی‌و زارەكانی ـ كـه دانیشتوانەكانیان لـه هۆزەكانی هوری‌و ئورارتویی‌و [ماتیانی] بون [وه زۆر لـەوه ئەچێ لـه رۆژئاوای دەریاچـەی ورمێ وه لـه دەراوی ئاراس نیشته جێ بوبن] ـ هێنابونیه ژێر دەسـەڵاتی خۆیانەوه • هەرچۆن بێ هرودوت ئەمه دوو جار دوبارە ئەكاتەوه[٥٣] كـه خاكی ماد [بەمانای تایبەتی شانشینی ماد ؟] لەگەل سەرزەمینی ساسپیریان ـواتا هوزەكانی ئیبری‌و گرجی ـ هاو سنور بووه ، وه سنوری ئەوان لـه نزیك دەراوی فسیس [ كولخید ]ه واتا دەراوی روباری [ ریون ]ی ئیستا [ وه هەندیكیش به دەراوی روباری چوروخ]ی دائەنێن •

هەروەكو به بیروراى ئێمـه زەوی‌وزاری شانشینی پێشووی ئـەسكیت دیسان بەشێك بووه له ماد • لـه دواییدا ئەو پـەڕی ژوروی ناوچەكه بـه ژورووی روباری [ئاراس] دا تێ پەڕیوه [ناوچەی دووەمی نەخشەكەمان] وه دوایی ناوچـەكانی ئاوەڕێژگەی [ قزل ئوزون ] كـه هۆزەكانی كـادوسی‌و كاسپی[٥٤] تیا نیشتەجێ بون هێشتا نەهاتبونه ژێر دەسەڵاتی مادەوه • وه بـه بەشێكی ئەو سەرزەمینه نه ئەژمێردرا • بەشی خواروی ئاراس‌و كورا [كر] دیسان ـ هەروەكو له خوارەوه دەر ئەكەوێ ـ راستەو خۆ ئەویش بەشێكی ماد نەبوه[٥٥] • دیاریكردنی سنورەكانی رۆژ هەڵاتی ماد گرانه • ئێمـه وا ئەزانین كه ئەو سنورانه بـه جۆرێك بووه كـه بەشێك بوه له سەرزەمینی ئایندەی پارت ئەویش پارچەیەك بووه له خاكی ماد[٥٦] •

سەرزەمینی هۆزی [ساگارتیەکان] ئەویش بەشێك بووە لـە خاکی ماد بەڵام ئیتر نازانین کـە نوسراوەکەی بێستون کـە لـەم کاتـەدا سەرچاوەی زانیاری ئێمـەیە باسی کام [ساگارتی] ئەکات(٥٧) • جگـە لـە ساگارتیەکانی رۆژئاوا [ زیکرتو ؟ ] کـە رەنگ بـێ بووبن ـ دیسـان ساگارتیـەکانی رۆژهەڵاتیش هەبون ـ • سەرچاوەی زانیاری هرودوت [لە بارەی ساتراپ نشینەکانی ئەمپەراتوری هەخامەنشیەوە] ئەوانە بە ساتراپ نشینی درنگیەکان [خواروی رۆژ ئاوای ئەفغانستانو بەشەکانی خواروی رۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیای ئیران] دائەنین • بەڵام هرودوت لە جێگایەکی تر [لـە سـەر وتـەی زوپیر ؟] ئەوان بە بەشێکی فارس [پرسید] دائـەنێ • «هۆزی ساگارتیەکان» کە بە مانا [بەرد تاش] ئەگرێتەوە لە کێوو بیابانەکانی مەرکەزی دەشتەکانی ئێران دا [رۆژهەڵاتی ئێرانی ئێستا] ئەژیان • دوایی ئـەم ناوچەیـە کـەوتە سەر وڵاتی پارت •

لە دەوروبەری ماددا چـەند سـەرزەمینێکی خود موختاریو شانشینیو هۆزو حاکم نشین بووە کە بەریوە بەرەکانیان ماد بون ، بەڵام ئەمانە بەشێك نەبون لـە خـاکی مـاد • دەوڵـەتی مـاد سـنوری زەویو زاری خـۆی تاڕادەیەك ئاشکرا نەبوە •

یەکێك لەو سەرچاوانەی کە ئێمە لەم بارەیەوە بۆ نمونە ئەی هێنینەوە ناوەڕۆکی نامـەکانی بـەشەکانی ئەمپەراتوری پارسی [ئێرانی]و هـەخامەنشی داریوشی یەکەمە کـە هرودوت نوسیویەتیەوە [ III ، ٩٧ ، ٨٩] وە بـە بیروڕای زوربەی لێکۆڵەرەوان لە هکاتی میژوو نوسی یۆنانیو هاو چـەرخی داریوشی وەرگرتوە •

ئەم ناوەڕۆکە باسی ناوی هۆزو تیرەکان ئەکات لە هەر بەشێکدا بوو بن هەروەکو باسی جۆری خەرجو باجو دەرامەتەکانیان ئەکات •

لە بارەی ئەوەوە کە ئەم ناوەڕۆکـە تا چ ڕادەیـەك جێگای پشـت پێ

بەستنە دو بیروڕای بنەڕەتی هەیە :

بیرورا بەکەڵکەکەیان ئەوەیە کـــە ناوەروکی مستخر جیسـت لـەناو کۆمەڵی خەراج بەخشەکانا ، وە هەروەها رەنگ بێ لـە ئەنجامی گۆڕینو [تەرجومە] زیادو کەمی هەندێك گومانی تیا پەیدا بوبێت کـە لێکۆڵەرەوەکان لە حاستی ئەو گومانیان پەیدا کردوە ، وە ئەمـە تەنیا بیروڕایـەکی راستە • بیروڕایەکی تر کە [ یو • یونگە ] بە گەرم لایەنگری ئـەکات ئـەوەیە کـە ناوەڕۆکی هرودوت جگە لە زنجیرەیەك نامەی هۆزەکان کە ئەو بە [یاهکاتی] زانیوە وە بە بێ رێو شوێن هـەر لـە خۆوە کەوتۆتە کـەنارەوە شتێکی تر نیە(٥٨) ئەم بیرورایە جێگای سەرنج لێدان نیە ، وە بێ پەروا ئـەم پرسیارە دروست ئەبێ کە بۆچی وە بـە چ مەبەستێك هـەر لـە خۆوە نامەکانی ریز کردوەو وە لـە جێگای ناوەڕۆکی رەسـمی ئـەمپـەراتوری پارسی [ئێرانی] داناوە ؟(٥٩) وەیان ئەمە چ پێویستیەکی بۆ هرودوت هەبوە کە هەرجارەو لە هەر بارەیەکەوە ژمارەی بەشەکان باس بکات ؟ یاخود ژمارەکەشی هـەر لـە خۆوە داناوە ؟ بەڵام ناتوانین بڵێین کە لەم روەوە بە قەسدی ئەمەی کردبێ • هەمو ئەو بیروڕایانەی کە لە بارەی [مەبەستی خۆی] هرودوتـەوە هەیـە تا ئیستە چـەند جـار دراونەتـە دواوە وە نوسینە راستەکانو بیرورای ئـەویان سەلماندوە ، هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد •• نابێ لە راستی ئەوا بکەوینە گومانەوە ، بە شێوەی گشتی ژمارەی نسبی خەلاتی ولاتـە جۆربەجۆرەکان وە بە تایبەتی ئەو ولاتانەی کـــە هرودوتو [ هکاتی ] بـە هیچ جۆرێك زانیاریەکی راستو دروستی لـە بارەیەوە نـەبووە ، لـــە راستیەوە نزیك ئەبنەوە • وە ئەمـە خۆی بەڵگەیەکی تری راستی باسەکەی ئەوە • ئـەبێ ئەوەمان لە بـەرچاو بێ کـە [هکاتی]و هرودوت هـەر دوکیان لـە دەستو پێوەندەکانی ئەمپەراتوریتی پارسی [ئێرانی] بون • وە لە بەشێك لە ناوچەکانی ئەو کیشوەرەدا ئەژیان ـ وە بە لای کەمەوە چۆنێتی ئەوان لە بەشێك لـە

ماوەی ئەمەنیان بەم جۆرە بوە ــ بەم هۆیەوە گومانی لێ ناکرێ کە لە بارەی رادەی خەراجی بەشەکانی ئەو ئەمپەراتورێتەوە توشی ناخۆشیو گرانی بووبن • لەبەر ئەمە ئەتوانین ئازایانە بڵێین کە ناوەڕۆکی خەراجی بەشەکان [ nomoi ]ی کیشوەری داریوشی یەکەم ــ هەروەکو هرودوت باسی ئەکات ــ لەیەك سەرچاوەی رەسمیەوە هاتوە • بەڵام لە بارەی ئەوەوە کە چ سەرچاوەیەك بووە •••••دو جۆر بیرورا هەیە : هەندێك لە لێکۆڵەرەوان لەو باوەڕەدان کە ناوەڕۆکی ناوبراو نامەی تیبە ئیداری‌یە رەسەنەکانی کیشوەر ــ واتا ساتراپ نشینەکان ــ ئەگرێتەوە ، وە هەندێکی تر ئەڵێن کە ئەو ناوەڕۆکە هینی بەشە بەرو بومیەکانە وە لەگەل ساتراپ نشینەکانا ناگونجێ • لێکۆڵەرەوەکانی دوایی باسکراو زوربەیان پەنجەیان بۆ زیادو کەمیەکانی ناوەڕۆکی هرودوت لەگەل ناوەڕۆکی [کیشوەرەکان] دا کە لە بەردە نوسراوەکانی پادشایانی هەخامەنشیدا وە بە تایبەتی نوسراوەکەی داریوشی یەکەم درێژ کردوە • وە ئەم زیادو کەمیە ئەدەنە پاڵ ئارەزوی خۆی •

ئەگەر وا تێ بگەین کە بەشەماڵیاتەکانی ئەمپەراتوری [پارس] لەگەل دابەشکردنی ئیداری ئەوانا ناگونجێ ، ستەمە • چونکە ئەگەر وابوایە گیرو گرفتێکی زۆرو بێ هودە لە کۆ کردنەوەی ماڵیاتەکانا پەیدا ئەبو • لە لایەکی ترەوە ئەزانین کە ساتراپەکان خاوەنی دیاریکردنی ماڵی بون [هەروەکو پارەیان لە زێڕ دروست ئەکردو بۆ پێویستی ساتراپ نشینەکان بەکاریان ئەهێنان](٦٠) بەم هۆیەوە بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراو لە بارەی ئەوەوە کە ساتراپەکان لە حاستی ماڵیاتی شاهانەدا بەر پرسیار بون بەدەستەوە نیە •

لە واقیع دا لە بارەی جیاوازی نێوان ناوەڕۆکەکەی هرودوتو ناوەڕۆکی بەردە نوسراوەکانەوە ئاڵۆزاوە • رەنگە بێ هەندێك لە ساتراپ

بشینەکانی دابەش کردبێو هەندێکی تریشی پێکەوە بەستوون [ئەم باسە لــە سەرچاوە سەربەخۆکانا] هەیە(٦١) • ئەبێ ئــەوە بزانین کــە لــە نووسراوە بنچینەییەکانا لــە یــەکتر ئــەچن ، بەڵام لــە بارەی باسکردنی ناوەکانەوە جیاوازیان هەیە(٦٢) • وە دانانی ناوەکان لە ناوەڕۆکەکەی هرودوتدا وەکو مەتەڵی لێ هـــاتووە ، چونکــە لــــە بــەردە نوسراوەکاندا دانانی بــەشــە جوگرافاییەکان زۆرو کەم بە تەنگیەوە هاتون ، بەڵام وەکو بەرچاو ئەکەوێ کە ناوەڕۆکەکــەی هرودوت ــ بــە تایبــەتی لــە بــەشی ساتراپ نشینەکانی ڕۆژهەڵاتدا ــ بە ئارەزوو نوسراوەتەوە •

لەگەل ئەوەشدا لە سەرەتای ناوەڕۆکەکەی هرودوتەوە [یونیە] ــ واتا وڵاتی ئەو ــ هەیە بەڵام لە هیچ نوسراوەیەکی بەردەکانا بەم جۆرە نیە • ئەمە خۆی گومان پەیدا ئەکات • بەڵام نابێ ئەم باسە ڕاڕامان بکاتو سەرمان لێ بشێوێنی • وە ئەتوانین چەند بەڵگەیەك بۆ ئەمە بهێنینەوە •

زۆر لەوە ئەچێ کە لە ناوەڕۆکە رەسمیەکانی ساتراپ نشینەکان ــ لە هەر رویەکەوە ــ ناوی ساتراپ نشینەکە لە سەرەتای باسەکەوە نوسراوە • یان وەکو تر ناوی هــەندێك لــە ســاتراپ نشینەکانی لــەگــەڵ ناوی ئــەو کۆمەڵانــەی کــە ناویان لــە روی ئــەهمیــەتی جوگرافیاییەوە ڕێکخراوە ، گونجاندویەتی وەریزی ناوەکانی بەم هۆیەوە گۆڕیوە(٦٣) •

لە هەمو گرنگتر جۆری ژمارەی ساتراپ نشینەکانە ، بەڵام وەکو دەر ئەکەوێ کە لەم رووەوە ئەتوانین رونی بکەینەوە کە هەریەك لەو کیشوەرانە کێ داگیری کردوە •

لە خوارەوە بەرنامەی ریزی ناوی ســاتراپ نشینەکانی ئەمپــەراتوری ئێرانی [پارس] هــەخامەنشیەکان لــەگــەل ناوی داگیرکــەرانی کیشوەرەکانا [ هەرچۆن کــە بزانین وە بــە پێی باسە رسمیەکانی هەخامەنشی ] ئــەیان نوسینەوە ، وە ئەمپەراتوریتی ئێران [پارس] بــە پاشکۆی مادەوە دائــەنێن • [خشتەی ژمارە ــ٤ــ](٦٤) •

له سەرەتاوە ناوی ١٢ ساتراپ نشین باس کراوە کە لەو سەرزەمینەدا بون کە پارسەکان [کورش‌و کمبوجیە] بەر لە داریوش داگیریان کردبو ،وە لە دوایدا ئەو ساتراپ نشینانەی کــە لــە سەردەمی مادەکانا داگیر کرابون نوسراوەتەوە ، وە لە دوای ئەو ناوچەو ولاتانەوە کە داریوشی یەکەم بەر لە ساڵی ٥٠٠ی پێش زاینی داگیری کردبون ناویان باس کراوە •

بەم جۆرە لە ساتراپ نشینی سیازدەیەم بە دواوە ئەگرێتەوە ، وە بــە بەشێك لە کیشوەری ماد دائەنرێت ، لەو سەردەمەدا کە کوڕش داگیری کرد، بەڵام ئەگەر بمانەوێ لەو بەشە ناوبراوانە شتێك تێ بگەین ئەبێ بــە وردتر لێ‌ی بکۆڵینەوە •

ناوەڕۆکە کەی هرودوت [هکاتی] لە بارەی ناواخن‌و شێوەی نوسینەوە وە رەنگ بێ لە بارەی مێژووی نوسینەکەشیەوە [کە وەکو دەرئەکەوێ لــە مێژووی ساڵی ٥٠٠ی پێــش زاینی دا نوسراوە](٦٥) زۆرتر لــە ناوەڕۆکی نوسراوەکــەی بێســتون ئــەچێ(٦٦) • ناوەڕۆکــەکانی دوایی ناوی چــەند ساتراپ نشینێکی تازەیان هێناوە کە هەندێك لەوانە لەلایەن داریوشەوە داگیر کراون • لە بەرامبەری کردنی ناوەڕۆکەکــەی هرودوت لــەگــەڵ بــەردە نوسراوەکەی بێستوندا وەکو لای خوارەوە جیاوازیەکانیان دەر ئەکەوێ :

١ ـ ناوی کیلیکیە [ساتراپ نشینی چوارەم] لە نوسراوەکەی بێستوندا ، بەردە نوسراوەکانی ترا باس نەکراوە ، وە ئەم لەیاد چونە هۆی ئەوەیە کە خود موختار بووە پادشایەك لە بنەماڵەی [سیەنسیان] حوکمی تیا کردوە •

٢ ـ لە بەردە نوسراوەکەی بێستون‌و [بەردە نوسراوەکانی ترا] ساتراپ نشینی یازدەیەم [کاسپیانا]و ساتراپ نشینی نۆزدەیەم [کەناری دەریای رەش] هــەیــە •

٣ ـ ناوی هیندستانیش بەرچاو ناکەوێ •

٤ ـ لە بەردە نوسراوەکــەی بێستون دو ســـاتراپ نشینی ئــەرمــەنی

[۱۳و۱۸] باس نەکراوە بەڵکو تەنیا یەك ساتراپ نشین لە ئەرمەنستاندا هەیە •

٥ ـ هەروەها لە نوسراوەکەی بێستون دا ساتراپ نشینی حەوتەم ـ دو ساتراپ نشینە : ساتاگیدیە [ «گاندار» یان «پاروپانی سادە» ] وە [ئاراخو زیا] یە • لە بەردە نوسراوەکانی دواییدا ساتراپ نشینی حەوتەم تەنانەت سێ کیشوەر بووە •

٦ ـ ساتراپ نشینی یەکەم ، لە بەردە نوسراوەکەی بێستون دو ساتراپ نشینی بووە [یونیە]و [ئەوانەی لەو بەردەریاوەن][٦٧] •

٧ ـ لەو نوسینەدا ساتراپ نشینی شازدەیەم چوار ساتراپ نشینی بووە ـ واتا پارتو ئارەیاو خوارزمو سگد ـ •

٨ ـ ناوی عەرەبستانیش براوە ، بەلام ناوەرۆکەکەی هرودوت ناوی نەبردوە چونکە مالیاتیان نەداوە • ئیستە ناوەرۆکەکەی هرودوت لەگەل بەردە نوسراوەکەی بێستون بەرامبەر ئەکەین •

| به پێی نوسینی هرودوت | به پێی بەردە نوسراوەکەی بێستون |
|---|---|
| یونیه [١] | یونیە [٩] ئەوانەی لەوبەری دەریاوەن [٧] |
| سارد [٢] | سارد [٨] |
| داسکیکیه [٣] | کاپادوکیه [١٢] |
| کیلیکیه [٤] | |
| سوریه [٥] یان ئاشور | ئاشور [٤] |
| میسر [٦] | میسر [٦] |
| ساتاگیدیه [٧] | ساتاگیدیه [٢١][٦٨] |
| | ئاراخوزیه [٢٢] |
| عیلام [٨] | عیلام [٢] |
| ئاشور [٩] یان بابل | بابل [٣] |
| ماد [١٠] | ماد [١٠] |
| کاسپیانا [١١] | |
| باکتریا [١٢] | باکتریا [١٧] |
| ئەرمەنستانی رۆژئاوا [١٣] | ئەرمەنستان [١١] |
| ماتینا [١٨] | |
| درنگیانا [١٤] | درنگیانا [١٤] |
| سکاییەکان [١٥] | سکا [٢٠] |
| پارت [١٦] | پارت [١٣] |
| ئارەیا | ئارەیا [١٥] |
| خوراسمیا | خوارزم [١٦] |
| سگدیانا | سگدیانا [١٨] |
| ئاتیوپی کاسپیایی [ حەبەشەکانی ئاسیا ] [١٧] | ملث [٢٣] |

| | |
|---|---|
| کەنارەکانی خواروی دەریای رەش [١٩] | هیندستان ـ(٦٩)ـ |
| هیندستان [٢٠] | عەرەبستان |

بە واتەیەکی تر لە نوسراوەکەی بێستون دا کە لە ساڵەکانی **٥١٩ ـ ٥٢١**ی پێش زایینی دا نوسراوە ناوی کیشوەری خودموختاری کیلیکیەو هۆزەکانی قەفقاز [ساتراپ نشینەکانی یازدەم و نوزدەیەم]و هیندستان کە لە دوایدا تێکەڵ بون لەگەل [ساتراپ نشینی بیستەمدا] ناویان نەبراوە ٠رەنگ بێ ساتراپ نشینی کەناری خواروی دەریای رەش [١٩] لە دواییدا تێکەڵ بە کیشوەری پارس بو بێو چوبێتە پاڵی(٧٠) ٠ وە ساتراپ نشینەکانی سیازدەیەم‌و هەژدەیەم هەروەکو وڵاتێکی سەربەخۆ ـ واتا ئەرمەنستان ـ بوبێت ٠

**خشتەی ژمارە ـ ٤ ـ**

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ـ خەراجو باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | یونیە ـ [دورگەکانی یونیە] | أ ـ ئائولیدا ، یونیە<br>ب ـ کاریە، لیکیة ، پافصیلیة ٤٠٠ | کورشی دووەم | |
| ٢ | سارد | میسیاو لیدی ٥٠٠٠ | کورشی دووەم | |
| ٣ | کاپادوکیە داسکیلیە | ترِوادا ، فریجیە ، ویفینیة ، پافلاگونیە ، کاپادوکیە [٣٦٠] | کورشی دووەم | کاپادوکیە کە لە رۆژهەڵاتی روباری هالیس [قزل ئیرماق] بووە کیاکسار داگیری کردبو ، |
| ٤ | کیلیکیە [شانشینی خودموختار] [١] | کیلیکیەو زەویو زاری دورگەی ئەسکەندەرونو کیوەکانی تاور[٣٦٠] | کورشی دووەم | جگە لە خەراجی پارە ـ٣٦٠ـ ئەسپی سپیو [١٤٠] تاڵانت نوقرە بو مەخارجی سوارانی کیلیکیە |

**(١) لە نوسراوەی بەردەکانا باسی نەکراوە .**

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ـ خەراج و باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | ئەو بەری [روباری ئاشور] سوریە | فەلەستین ، فنیقیة ، سور[illegible] ، قبرص ، بین النهرین زورو [٣٥٠] | کورشی دووەم | |
| ٦ | میسر | میسر ، لیبی ، کیرنا ، برکە ٧٠٠ | کمبوجیە [کامبیس] | جگە لە خەراجی پارە ١٢ر٠٠٠ مدیمن گەنم بۆ هوردوگاکان و بەرو بومی شیلات دەریاچەی [مریدو] |
| ٧ | ساتاگیدیە ، گندار ، [ قندهار ][ روژهەلات ؟ ]ی ئیستا [ ساتا ئاراخوزیا ؟ [٢] | ئەفغانستانی زوروی روژهەلات و گیدیان و گنداریان قندهارو ئاپارتیەکان [ [١٧٠] | [ ؟ ] | ناوێکی تر : [ هندی سپی ] وەیان [ هندی کوێستانی ] |

(٢) لە نوسینی بەردەکانا دوو تا سێ ساتراپ نشینە ٠

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ــ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ــ خەراجو باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ٨ | عیلام [ سوزیانا وە کیسیس ] | عیلام ٣٠٠ | کورشی دووەم | تا ناوەراستی سەدەی شەشەمی پێش زاینی شوش لە ژێر دەسەڵاتی بابل دا بوە • |
| ٩ | بابل [ هرودوت ناوی ئەم کیشوەری بە ئاشور بردوە کە پایتەختی ئەو بابلە | دوروباری خوارو ١٠٠٠ | کورشی دووەم | جگە لە خەراجی پارە ٥٠٠ خواجەی حەرەمسەرا |
| ١٠ | ماد | مادو پاریکانیەکانو ئورتوکوریبانتیە کان [تیز خودان] | کورشی دووەم | |

| زمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە ب ـ خەراج و باجی زێر | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | [کاسپیانا] ؟ | بەش خواروی ئازربایجانی ئیستای شورەوی و کەناری خواروی دەریای خزر [کاسپیەکان ، پاوسیکیان ، پانتی ماتیان ، داریتیان ] [٢٠٠] | کورشی دوەم [ ١ ] | هەرچۆن بێ بەشێك لە دانیشتوانی ئەم سەرزەمینە [کادوسیەکان] ـ بە وتەی کتسیاس ـ یەکەمجار سەریان بو کۆرش دانەواند |
| ١٢ | باکتریا | [لە باکتریان تا ئاگلیان] ٣٦٠ | کورشی دوەم | |
| ١٣ | ئەرمەنستان . | [ لـــە پـاکتیکیـە ، سـەرزەمینـی کیاکسار ئەرمەنیەکان ] تاکو دەریـای رەش کە بەشێك بووە لە کاپادوکیە ـ لە روژهەڵاتی روباری هالیس ـ[٤٠٠] | | ئەم ناوچەیە کیاکسار کە لە روباری هـالیس و سـنوری لیـدی و مـــاد پەریەوە داگیری کرد • |

(١) هرمان لەو باوەڕەدایە کـە ئەم ساتراپ نشینە داریوشی یەکـەم لـە ٥١٥ی پێش زاینی دا داگیری کردوە •
[Pavly - wissowa,s.v.kospioi]

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ـ خەراجو باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٤ | درنگیاناو [ بەشێك لەساگارتیان ، ساریگنان ، تا مانائیان ، کارمانیا ] | ئوتیـان ، میکیـان ، و دانیشتوانـی دورگەکانی دورگەی فارس [٦٠٠] | کیاکسار ؟ | سەرچۆن بزانین ساگارتیەکان وابون کە بە زنجیرەی کیاکسارەوە بەندن• نوسراوەکەی بێستون I ، ٣٣ • ئوتیـەکان یـان [ ئوتیا ] ی پارسی کۆن کە بەشێکە لە پارس [پرسید] بووە بـەشی دوایی هـرودوت بـە بەشێك لە کارمانیانی دائەنێ • |
| ١٥ | سکایەکان [؟] | سکاییەکانو کاسپیەکان [٢٥٠] | ؟ | نازانین مەبەست لە ناوچەی قەفقازە یان ئاسیای ناوەڕاست • |

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ـ خەراج و باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١٦ | ١ ـ پارت [هیرکانیە]<br>٢ ـ ئارەیا [یامرغیانا] لەگەل ئەوەدا سەرزەمینی دوایی بەشێك بووە لە باکتریا<br>٣ ـ خوارزمیا<br>٤ ـ سگدیانا | پارتەکانو [ هیرکانیەکان ] خورزمیەکانو سگدیانو ئارەیان Hareiva لەگەل ئاریاییان arya تێك نەچن ؟<br>[٣٠٠] | کیاکسار ؟ | بە پێی بەردە نوسراوەکان چوار ساتراپ نشین بووە • بەم جۆرە<br>١ ـ پارت [لەگەل هیرکانیەکان]<br>٢ ـ خوارزم<br>٣ ـ سگد<br>٤ ـ ئارەیا ، بەلای کەمەوە پارتو ئارەیا بەر لە کورشی دوەم داگیر کراوە ، ئەگەرنا ئەو باکتریای بۆ داگیر نەئەکرا • |
| ١٧ | [هدرو سیارملك] | مکرانو بلوجستانی ئیستا [ پاریکانیەکانو حەبەشیە ئاسیاییەکان ] [٤٠٠] | ؟ | |

| ژمارەی ساتراپ نشینەکان | ناوەکانیان | أ ـ سەر بە کام بەش بووە<br>ب ـ خەراجو باجی زێڕ | ناوی ئەو کەسەی داگیری کردوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | مـێـتینـا [ ژوروی ماتـایـەکـان ، سـاپیریـەکـان ، ئالارودیـان [ واتـا هوریتـەکان ] رۆژهـەلاتـی ئەرمەنستان ] [١] | ئیبریانو ئورارتوییەکان [٢٠٠] | کیاکسار | ئـەم ساتراپ نشینە لـە سـەردەمی داریوشی یەکەمدا لە ساتراپ نشینی سیازدەیەم جیا بۆتەوە • |
| ١٩ | پونت | کەناری دەریای رەش ، بەلای رۆژ هەلاتا لە ساتراپ نشینی سیازدەیەم تـا سـنورەکـانی کـولخیدی [٢] موسخیەکان ، تیبارنیان ، ماکردنیان ، موی ئویکیان و ماریان [٣٠٠] | | |
| ٢٠ | هند | دەراوی روبـاری سـندو پنجـاب [٣٠٠] تالانتی زێڕ | داریوشی یەکەم | |
| ٢١ | عەرەبستان | خەراجی نەئەدا | | پەیوەندی عەرەبستانی زورو لەگەل [پارس] بە پێی چەندپەیمانێك بووە • |

١ ـ FGH,I,Z,Fragm 288

٢ ـ (هر • III ، ٩٧) •••

بــه پێچەوانــەی ســاتراپ نشینەکانی [ساتاگیدیە] و [ئاراخوزیە][٧١]و ساتراپ نشینەکانی یونیەو ئەوبەری دەریاو ساتراپ نشینەکانی پارتو ئارەیاو خورسمیاو سگدیانا کە لە بەردە نوسراوەکەی بێستوندا نوسراوە لە جەدوەلی بەشەکانی ماڵیات دەرەکانا کــــە هی ســاڵی ٥٠٠ی پێش زاینیـیـە لــە ژێر ژمارەکانی ١ و٧ و١٦ دا وەکو سێ ساتراپ نوسراون • لەوە ئـەچی لـەو سەردەمەدا ئەوانە بە یەك دانرابن وە هەریەك لەم سێ کۆمەڵە ناوبراوە بــە دەست پیاوێکی ئازاو لێ هاتوەوە براوە بە رێوە[٧٢] •

زۆر لەوە ئەچێ ئەو ساتراپ نشینانەی کــە ناویان لە یەکەم جەدوەلی داریوشدا نوسراوە [رەنگ بێ لە کتێی ژیانی ئەوا] بریتی بوبن لە ژمارەکانی ١٨ و١٩ و٢٠ وە ژمــارەی ١٨ یان لــە ســاتراپ نشـینی [ ئــەرمــەنستان ] دەرهێناوە • سەد ساڵ دوای ئەوە کزنفون [کسنوفونت] ئەویش دیسان باسی ئەم کەرت بونەی کردوە[٧٣] ، بەڵام لە بەردە نوسراوەکانا لەبارەی ئەمانەوە هیچ نەنوسراوە چونکە لەو نوسراوانەدا جۆری دابەشکردنی بـەرێوە بردن [ئیداری] بە شێوەیەکی رون دیار نەکراوە ، وە زوربەی ساتراپ نشینەکانی تری باس نەکردوە بەڵکو لە بارەی ئەو کیشوەرانەوە کـــە ناویان لــە سەر زمان بووە باسی کردون ، هەروەکو ئەرمەنستان [یان بە پێی باسە بابلیەکانو بەردە نوسراوە ئیرانیەکان • «ئوراشتو» ـ تەنانەت دوای ئەوەش لــە بارەی ئیداریەوە کرابو بە دوو بەشەوە ـ کیشوەریان پێ ئەوتن •

. ناتوانین ئەوە بڵێین کە سنوری ساتراپ نشینەکانی سەر بە ئەمپەراتوری ئیران [پارس] لــەگــەل وڵاتــەکانی ســەردەمی ئەمپــەراتوری سنورەکانــی دەرەوەیدا دەقاو دەقە • کورشو داریوش لــە هــەندێك بواردا سنورەکانیان دەسکاری کردوەو گۆڕیویانە • وە ئەمە بــە تەواوی لــە کتێی کاپادوکیەدا بووە • ساتراپ نشینی ناوبراو یان وەك تر بڵێین [داسکیلیە] بە تەواوی لــە سەردەمی کورش دا دامەزراوە ، وە بەشێك لە زەوی‌و زاری رۆژ هەڵاتی

روباری هالیس [قزل ئیرماق] کە سەر بە ماد بووە بـەشێك بووە لـەو ساتراپ نشینە ، وە بە ناوی ئەو پارچە زەویەی کاپادوکیە [بە پارسی کۆن : کتپتوك katpatufla ] یان پێ وتوە • [لەوە ئەچێ لەوەبەر یەکێك بو بێت لـە ناوچەکانی سەر بە ئەرمەنستان] • ئەوەی باسمان کرد لە بارەی ساتراپ نشینی چوارەمیشەوە راستە • وە بەشێك لەویش واتا بین النهرینی ژورو پەیوەندی بە مادەوە بووەو ساتراپ نشینی تازەی کورش بە ناوی ئەو بەشەوە بـە رەسمی [ئاشور] یان پێ وتوە • [بە پارسی کۆن = ئاشورا] یان پێ وتوە ، یۆنانیەکان بە بابل یان ئەوت ئاشور • وە لە ئاسیای نزیك ساتراپ نشینی چوارەم [ئەوبەری روبار] یان پێ ئەوت ـ ماوراء النهر ـ کە بە زمانی ئاکدی [ئابر ـ ناری] وە بە ئارامی عبر ـ نهارا ـ یان پێ ئەوت •

هەرچۆن بێ بە شێوەی گشتی تارادەیەك ئەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە لە سەردەمی حوکمڕانی ئاستیاگ دا ئەمپەراتوری ماد جگە لە سەرزەمینی مـاد [ساتراپ نشینی دەیەم] و پارس [کە بە وتەی هەمو سەرچاوە کان لەوەبەر سەر بە ماد بوە](٧٤) وە لـە سـەردەمی هەخا مەنشیەکانا خەراجیان نەئەدا ، لـە ناوەڕۆکـە کـەی هرودوت دا نەنوسراوە ـ لـە ریزی سـاتراپ نشینەکانی خوارودا بوە : ژمارەی ١٣ بـە تێکـەڵ بونی ژمارە ١٨ [ئەرمەنستان] و ١٤ [درنگیانا وە رەنگ بێ ـ لەو سەردەمەشدا ـ کەنارەکانی کرمانو دەوروبەری دورگەی فارس] و ١٥ [ناوچەی سـکاییەکان] وە لـەوە ئـەچێ ژمـارە ١٧ [ناوچەی پاریکانیو حەبەشیە ئاسیاییەکان وە یان مکرانو بلوجستانی ئیستا کە لەو سەردەمەدا پاوانی رەش تاڵـەو دراویدی زمانی تیـا ئەژیان] وە بـەلای کەمەوە بەشێك لە ساتراپ نشینی ژمـارە ١٦ [پارتو هیرکانیەو بـە تـەواوی ئارەیاو سگدیانا و رەنگ بێ ـ هەرچەن تەواو گومانی بۆ ناچێ ـ خوارزم ـ ئەویش بە بیروڕایەکی کـەم ـ ئەبێ بـەشێك لـە سـاتراپ نشینی چـوارەم [بین النهرینی ژوروی] گرتبووەوە •

## لە بارەی ئەم کیشوەرانەی سەر بە مادەوە چی ئەزانین ؟

### ١ - پارس [ پرسید ]

بە پێی نوسینەکانی بێستون[٧٥] کە هرودوتیش لایەنگری ئـەکات[٧٦] لە سەدەی حەوتـەمی پێش زاینی دا لـە پارس دا بنـەماڵەی خانـەدانـەکانی هەخامەنشی حوکمیان ئەکرد [لە دوای ئەوە ئەو زەوی‌و زارەی کە سەر بـە عیلام بو هۆزە ئێرانیەکان - واتا پارسەکانی داهاتو - بە دەستیانەوە بوو] ، وە لە دوای دامەزراندنی خانەدانێ کـە ناوی [هەخامەنشی] بوو ، وە کوڕەکەی ناوی [ئشی‌سپ] [چیش پیش] بو - ئەم خانەدانە بوو بـە دوو بەشـەوە کـە هەردو بەشـە کـەیان لەو سەرزەمینەدا سەڵتەنەتیان هـەبو • کورشی یەکەم ، پادشای پارسوماش کە کوڕەکەی ناوی ئاروکو - Arukku بو[٧٧] ، وە لە دەورو بەری ساڵی ٦٣٩ی پێش زاینی دا ناردی بۆ لای ئاشور باناپال[٧٨] وە کمبوجیەی یەکـەم - kambujiya - کامبیس - باوکـی کـورشی دووەم دامەزرێنەری ئەمپەراتورێتی پارس [ئێران] لە بەشی یەکـەم بون • بـە قسەی هرودوت[٧٩] کامبیسی یەکەم ماندانێی کچی ئاستیاگی پادشـای مـادی خواسـتبو • [ئاریارامنا Ariyaramna ] کوڕێکی تری چیـش پیـش‌و کوڕی ئەو [ئارشاما - Arsama ] وە نەوەی ئەو هیستاسب - ویشتاسب - ئەمانە لە بەرەی بەشی دووەمن • لە ساڵی ٥٢٢ی پێش زاینی دا کە داریوشی یەکەم چوە سـەر تـەختی سەڵتەنەتی هێشتا ئارشاماد هیشتاسب زیندوو بو[٨٠] هیشتاسب لە سەردەمی حکومـەتی کورش[٨١]و کامبوجیە[٨٢] ساترایی پارت بو • بەڵام ئەوە نازانرێ کە ئەم دوو کەسە - ئارشامادو هیشتاسب - لە پارس وە یان لە بەشێکی تریا حوکمڕەوا بون یان نەء ؟[٨٣] زوربەی خـەڵك ئەڵێن کـە دوو شانشین بون ، یەکێکیان [ئانشان][٨٤] وە ئـەوی تـریان [پارس] - یەکێکیان لە لقی گەورەو ئەوی تریان لە لقی بچوکی هەخامەنشیەکانا حوکمیان ئەکرد ، بەڵام ئەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە [ئانشان] لە هەزارەی یەکەمی

پێش زاینی لەو ناوانە بوە کــە تێپەڕیون ، وە لەوە ئەچێ لەژێر ئــەم ناوەدا شوێنی سیاسیو جوگرافیــایی بوبن • وە بــەم هۆیــەوە لــەوە ئــەچێ لـــە نوسراوەیەکدا ناوی [ئانشان]و [پارس] بۆ یەك ماناو مەبەست بەکار هــاتبن • هەروەکو بۆ نمونە [ئوممان ــ ماندا] وە [مادای] بە یەك مانا بەکار هێنراون •

هەروەکو وتمان پارس لە سەردەمی کیاکساردا لــە ژێر دەسەلاتی ماددا بوو ، بەلام پادشایانیان هەروا مابونەوە ، وە لە ژمارەی [پادشایانی ماددا] [واتا سەر بە ماد] یان پادشایانی دۆستی ماد کــە لــە سەرچاوە کۆنەکانی رۆژهەلاتا باسیان کراوە ــ ناو براون • پارس کیشوەرێکی هەژار بوو لە روی ئابوریو کۆمەلایەتیەوە زۆر دواکەوتو بو ، وە بــە وتەی هرودوت ــ پادشای ئــەوان شازادە خانمی مادی خواستبو ، ئەمە ئەهمیەتێکی ئەوتۆی لەسەر سیاسەتی ماد نەبو ، شانشینی پارس لە ولاتی ئیستای فارس ــ ئیران ــ بچوکتر بو ، لەو دە هۆزەی پارس سێ هۆزیان سەر بە شانشینەکە بون ، [هەندێك لەو هۆزانە لە سەر خاکی فارس نیشتەجێ نەبوبون ، بەلکو لە کرمانو بەشێکیان لە زەویو زاری مەرکەزی دەشتەکانی ئێراندا بون رەنگ بێ ســەر بــە ساتراپ نشینی چواردەیەم بو بن] •

**٢ ـ ئەرمە نستان :**

لەمەربەر باسمان کرد کە مادەکان دەشتەکانی ئەرمەنستانیان لە سالەکانی دوایی سەدەی حەوتەم ــ لە کاتی شــەڕەکانی مــادو ئاشوردا داگیر کردبو • بەلام لە سالی ٥٩٣ی پێش زاینیدا ئەو سەرچاوانەی کە ئیستە هەن بــە ناوی شانشینی [ئورارتو] یان [ئارارات] ــ کە سەر بەماد بون ناو ئەبەن ــ لە لایەکی ترەوە کزنفون لە [کورشنامە] دا نوسیویە : ئەرمەنستان لە سەردەمی مادەکانا شانشینێکی سەربەخۆی سەر بــە ماد بووە • ئەرمــەنستان یــەکێك بووە لــە ولاتــەکانی ئەمپەراتورێتی هــەخامــەنشیەکان کــە کزنفون زۆرباش ناسیونیو زانیاری جۆر بە جۆری لێ یانەوە دەسکەوتوە [ئاناباسیس IV و٤و٢٢ـ٦ ،

٥ ، ٣٥–٢٨] •

بەم جۆرە کزنفون ئەیتوانی لەو کاتەدا کە لەوێ ژیاوە گەلێك زانیاری لە بارەی مێژووی ئـەو کیشوەرەوە پەیدا بکات • کزنفون لـە [کورشنامە]دا شازادەی ئەرمەنستانی بە [تیگران] ناو بردوە •

بە پێی وتەی کزنفون لە کۆرشنامەدا [ II و٤و١٢و III و٣و٥] پادشای ئەرمەنستان [ناوی نابات] لە پادشای ماد یاخی بوو ، خەرجو باجی بۆ نەئەنارد ، [پادشای ماد بە کیاکسار ناوئەبات ، لە گەل ئەوەشـدا کـە لـەو سەردەمەدا ئاستیاگ بوو] • کورش کە یەکێك بوو لە سەردارەکانی پادشای ماد بەڵێنی دا کـە ئەو پادشایە بگرێتە ژێر دەستی خۆی ، دوایی بـە بیانوی راوەوە چو بۆ خـاکی ئـەرمەنستان وە تەتەرێکی [پەیك] بۆ لای پادشا نارد داوای دەغالەتو دۆستایەتی بۆ تازە کردنەوەی لێ کرد ، ئەو زۆر تەقەللای دا کە لە کێوەکانا بمێنێتەوە بەڵام بنەماڵەو کەلوپەلەکانی هەموی کەوتە دەست لەشکریەکانی کۆرشەوە • لە ئەنجامدا پادشایی ئەرمەنستان چونکە لـە هـەر چوار لاوە رێگای لەسەر بەسترابو خۆی دا بە دەستەوە • کورش گـەلێك پرسیاری لێ کرد پێی لەوە نا کـە لەوە بـەر کاتێك کـە بـە دەست باوکی پادشای ئیستای ماد گیرا بەڵێنی داوە کـە خەرجو باجو شەرکەر بـە مادەکان بدات • بەڵام بەهۆی ناوبژی کردنی تیگران – کوڕی پادشای ئەرمەنستان – دۆستی کۆرش بوو – سوڵح یان کردو رێک کەوتن ، وە کورش بە گرتنی ئـەو چـەند قـەڵایەی ئـەرمـەنستان کـە کردبوی بـە هوردوگای خـۆی وازی هێنا •

دوایی کورش لە شەڕێکدا کە لە نێوان کلدانیەکانو(٨٥) ئەرمەنیەکان رویدا یارمەتی ئەرمەنیەکانی داو هـەردولایان سوڵحیان کرد ، بـەم هۆیەوە یارمەتی جەنگییان لـە هـەردوو وەر ئەگرت •• لـە دواییدا شازادە تیگران جەنگاوەرە ئەرمەنیەکانی لەو لەشکرکەشیانەدا کە کورش بۆ سودی مادەکان

وێکی ئەخست ئەوانیش هاوکاری یان ئەکرد ، تاکو لە ئەنجامدا پادشای ماد کە کوڕی نەبو کیشوەرەکەی خۆی بە شازادە کورش بەخشی •

سەرانسەری ئەم داستانە پڕە لە باسی تێکەڵو پێکەڵو دور لە یەکتر لـە بەر ئەوە لەمە زیاتر لە سەری نەرۆیشتین •

موسی خورنی بـە وتەی [مارئاباس کاتینا] بـە پێی مێژوزی کـۆنی ئەرمەنستان هەوڵی داوە کە ئەفسانەکانی تەورات‌و هەواڵی مێژوو نوسـەکانی سەردەتای رۆژگاری رومیەی بچوك‌و ئەرمەنستان‌و تاڕادەیەك باس‌و بەسەرهاتە زەدەشتی‌و ساسانیەکان لەگەل یەکتردا رێك بخات • لەم روەوە قسەکانی ئەو وەکو قسەی نوسەرەکانی سەردەمی رومیەی بچوك دەرئەچێ •

موسی خورنی لە بارەی ئورارتووە هیچی نەزانیوە ، جارێك بـە وتـەی ئەو مێژوی کۆنی ئەرمەنستان بە کورتی بەم جۆرە باس ئەکات : لە سەردەمی سەڵتەنەتی [بل][٨٦] لە بابل ـ هایك ـ [ناوی هۆزی ئەرمەنی یان هایك ـ ناوی پیاوی ساڵ] کە گۆیا کوڕی ـ تورهوم ـ [توهارما] کە لە تەورات وەرگیراوە لەو جیا بووەوە • هایك بە پێی رێکەوتن لەگەل کەسوکاری خۆیا [چوو بۆ سەرزەمینی ئارارات] • ئەو وەختە ناوی گـەلێك لـە نەوەی هایك ـ کە لـە هەمان کاتا ناوی هـەندێك جێگـاو بنەماڵەی ئـەرمەنستانی کۆن بووە ـ باس ئەکات • لەبارەی قارەمـانێتی [ئارام]ی ئەفسانـەییەوە ـ کە گۆیا بـە سـەر پیاوێکدا زاڵ بوە کە ناوی [نیوکار ـ مادس] [؟] بووەو[٨٧] ئاشوری داگیر کردوە ـ زور قسە ئەکات • ئارای کوڕی ئارام لـە شەڕدا لەگەل سمیرامید [شامیرام] کوژراوە • موسی خورنی هەرچی تا ئەو کاتە لە ئورارتودا مابووەوە بە هی سمیرامیدی ناو ئەبات • بە وتەی ئەو گۆیا سمیرامید خۆی بە هۆی پیاوێکی مـادەوە کـە ناوی [ زراداشت مغ ] بووە لـە کیشـوەری خۆی دەرکراوە[٨٨] [ئەمە دیسان کتسیاس لە بارەی شـەڕی نەینەواو سمیرامیدەوە لـەگـەل [ئوکسیازت] دا ، [زائورت] یان ـ زورو ئاستر = زەرتشت[٨٩]

پادشـاى باكتريا باسى كردوه] • دواى ئـەوە موسى خورنى رەگـەز نامـەى [شجرةالنسب] عبرانى تەورات لـە ئيبراهيـم بـەدواوە ، وە پادشايانى كلده [ئاشور] لە كوڕى [نين] وە سميراميد بە دواوە [لە روى نوسينەكەى يوسوى كـە لـەم روەوە ئـەو خۆى لـە كتسياس وەرى گرتوە] وە زنجيرەى باوكى [شايان]ى ئەرمەنى لە [ئاراى زيبا] كوڕى [ئارا] بە دواوە ـ ئەگێڕێتەوە • لـە ناوەڕۆكى زنجيرەى دواييدا ـ واتا ناوى پادشايانى ئاشـورو باوكـى پادشايان [شيوخ]ى ئەرمەنى بە ناوى [سارداناپال] و [سكايوردى] « پرسكا » كۆتايى پێ دێنێت • موسى خورنى لە بارەى [پاروێرە] كوڕى سكايوردى يەوە ئەڵێ : [كە لە لايەن ـ وارباك ـ ى مادەوە زۆر كۆمەكى پێ كراوە كە بەو هۆيەوە توانيويتى شانشينى ساردانا پال بگرێ] • [ I ، ٢١] • بەڵام موسى خورنى لە بارەى [وارباك]ەوە [ئارباك] هەمان باسى كتسياس ئەگێڕێتەوە ، بەڵام ئەوە دەرئەخا كە ئەو [پاروێر]ى هێناوەتـە لاى خۆى وە بـەڵێنى پێ داوە نازناوى پادشايى كە پێشوونانى ئەو ـ واتا شازادەكانى ئەرمەنى ـ كە لە هايك بە دواوە نەيان مابو • بەڵێنى پێدا ئەو ناز ناوەى پێ بداتەوە • لەمەوبـەر باسمان كرد كە گ• ئا• كاپانتسيان وە ب• ب پيوطروسكى وە چەند لێكۆڵەرەوەيەكى تر لەو بيروڕايەدان كـە [پاروێر]و [پارتاتوئا] [پروتوتى] پادشـاى ئـەسكيتەكان يەكن وە هەروەها ئەزانن كە لە ناوچەيەكى دەشتەكانى ئەرمەنستان شانشينێكى بچوكى ئەرمەنىو ئەسكيتى دامەزراو بووە •

لـە دواييدا موسى خورنى دوو ناوەڕۆكـى زنجيرەى پادشايانى مـادو ئەرمەنستان باس ئەكات • زنجيرەى يەكەم تێكەڵەو لـە [ يوسوى ]وە دوو نووسينى كتسياسو هرودوت بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە :

واربا كيس [بە وتەى كتسياس = ئارباكس Arbakes]
موداكيس [بە وتەى كتسياس = ماندائوكس mandaukes]
ئارتيكبس [بە وتەى كتسياس = ئارتوكاس Artnkas]

| | |
|---|---|
| دوکیس [بە وتەی هرودوت = دیوکس | [Deiokes |
| پراورتیس [بە وتەی هرودوت = فرائورتس | [Phraortes |
| کواکس [بە وتەی هرودوت = کوئکسارس | [Kueksares |
| ئاژداهاك [بە وتەی هرودوت = ئاستواگس | [Astuages |

موسی خورنی ویستویەتی لە نێوان دوو سەرچاوەی لـە یەکتر نەچوودا [متناقض] واتا [نوسینەکانی هرودوت‌و کتسیاس] خاڵێکی یـەکانگیر دروسـت کات‌و ئەو ناوانەی کە لە نوسینەکانی هرودوت‌دا هەیە ـ واتا دیوك‌و فرائورت‌و کیاکسارو ئاستیاگ ـ لە جێگای ئەوپادشایانە دابنێ کە کتسیاس لە دوای ئارتیك ناوی هێناون •

**ناوەرۆکی زنجیرەی ئەرمەنیەکان بەم جۆرەیە :**

| | |
|---|---|
| راچیان ـ هراچیای | پاوس |
| پارنوئاس | هایکاك دووەم |
| پاچویچ | یروئاند ـ تەمەن کورت |
| کورناك | تیگران [ I ] |

هەندێك لەم ناوانە ، وەکو پار نوئاس [فرنواز Farnauaza ]و یروئاند [ئاروانت ـ یان هاروانتا Harvanta ]وتیگران [لە تیگرا Tigra ][90] ئێرانین • وە ناوە ئێرانیەکان لـە زمانی ئەرمەنی دا بـەم زوانە دەسـت پێ ئەکات[91] •

مێژو نوسی ئەرمـەنی زۆر بایەخ بـە داستانی تیگـران کوڕی [یرواند] ئەدات وە لەو بارەیەوە گەلێك قسە ئەکات •• بە وتەی ئەو تیگران هاوکاری [ ئاژدەهاك ] پادشای ماد بووە ، وە لـە هەمان کاتا لەگـەل کورشی پارسی دۆستایەتی بووە • ئاژدهاك کـە ئـەیویست تیگران لـە خۆی نزیك بکاتـەوە تیگرانوئی خوشکی تیگرانی مارەکرد • دوایی تیگرانی بۆ راوێژ کردن بردە لای خۆی وە ویستی بیکـوژێ • بـەلام تیگران لە گـەل کۆمـەلێك لـە

جەنگاوەرانی ئەرمەنیو ئیبریو ئالبانی یەوە چوو بەگژ ئاژدهاکدا وە لە دوای پێنج مانگ شەڕو بگرەو بەردە بە دەستی خۆی لـە شەڕدا کوشتیو ئەو جار تیگرانوئی بردەوە بۆ لای خۆیو ژنەکەی تری ئژداهاك کە ناوی [ئانویش] بو لەگەل زیاتر لە دە هەزار دیلی مادی بۆ ئەو بەری کێوەکانی رۆژ هەلاتی کێوی گەورەی [ئارارات] دور خستنەوە ، وە لـە قـەلای نەخچەوان [ناخی چوانی] داینان[٩٢] بە پێی وتەی موسی خورنی بەسەرهاتی [مادـەکان] لـەو ناوچەیەدا بە گورانی ئەوترا وە ئەو ئەمـە بـە بەلگەی راستی داستانەکەی خۆی دائەنێ •

موسی خورنی ئەلێ : کە تیگران بە پێی رێکەوتنی شورش ئەجولایەوە، لە دواییدا جی گرەکانی تیگرانی ــ تا سەرکەوتنی مەقدونیەکان ــ یەکە یەکە ناو بردوە • وە ناوی ئەوانـەش بـەم جۆرەیە : باب ، تیران ، واهاگی[٩٣] ئاراوان ، نرسە [خ] ، زارە [خ] ، ئرموك ، باگام ، وان ، واخە • هەندێك لەم ناوانە ئێرانین وە لەوە ئەچی هینی سەردەمی سـەدەکانی سەرەتای دوای زاینی بن وە لەوە کۆنتر نەبن •

لەبەر ئـەوە ئـەم داستانە ئەفسانەیـەو ناوی [ئاژدهاك] واتا [ئاژدها] لـە نوسراوە زەردەشتیەکانەوە وەرگیراوە ناتوانرێ بوترێ کە لـە سەرچاوە رۆژ ئاواییەکانەوە وەرگیراوە • ئەوەی کە داستانی موسی خورنی بـە نوسراوەکانی [کورش نامە]ی کزنفون دائەنێ تـەنیا ناوی تیگـرانو دۆستی ئـەو لەگـەل کورشدایە •• مێژوو نووسی ئەرمەنی ئەم بەشـەی لـە نوسـەرێکی رومیـەی بچوکەوە وەرگرتوە • لە دوای لابردنی هـەمو ئەو باسانەی لـە داستانەکەی موسی خورنی دا کە دەست هەلبەستە ، لەگەل ئەوەدا ئەتوانین بلێین ئەوەی کە لە کورش نامەکەی کزنفون ئەچێت لە خۆوە رێکەوت نیە • وە رەنگ بێ لە سەردەمی مـوسی خورنیدا هێشـتا لـە باسو بەسـەرهـاتە ئەفسانەیـەکانی ئەرمەنیەکانا چەند باسێك لە بارەی : یەکـەم یەکێتی پادشایانی ئەرمەنی [لـە

سەردەمی دامەزراندنی یەکەمین شانشینی ئەرمەنستان] دا ، لەگـەل بێگانەکان [کە موسی خورنی وە یان ئـەو سەرچاوانەی ئـەو شتی لێوەر گرتوون کـە ئەوانە بە مادی ناو ئەبەن][٩٤] وە دووەم : لە بارەی شەڕی تیگرانەوە لەگەل ئازداهاك[٩٥] وە سێیەم لـە بارەی ئۆاییـە کۆنـەکانی مـادەوە لـە دەراوی ئارس ــ هەروا مابۆوە •

بەم هۆیەوە ئـەوە دەرئەکەوێ کـە رەنگ بێ لـە سـەردەمی مـاددا ئەرمەنستان واقیعەن ساتراپ نشین نەبوە ، وەخۆی شانشینێکی بووە کـە سەر بە دەوڵەتی ماد بووە • وە لـەوە ئەچێ دامەزراندنی شانشینی ئەرمـەنی لـە جێگای ئورارتو بەستوە بە کیاکسارو مادەکانەوە[٩٦] کە لەو سەردەمەدا [لەوە ئەچێ] پیشەوای ئەرمەنیەکان یان ئەرمەنو ئەسکیت ــ کە موسی خورنی ئەوی بە [پاروئیر] کوڕی [سکایوردی] داناوە ــ لەگەل ئەواندا [کیاکسارو مادەکان] پەیمانی یەکێتی یان بەستبو چون بۆ شەڕی ئاشورو ئورارتو • بـەم بۆنەیەوە ئەتوانین ئەم پرسیارە بکەین کە ئایا ئارمیای پێغەمبەر لە [تەورات] دا کـە لـە بارەی رووداوی سـاڵی ٥٩٣ی پێش زاینییەوە باسی شانشینی [ئارارات] لـە کەناری شانشینەکانی ماناو ئەسکیتدا ئەکات • ئەوە مـەبەستی لـە شانشینی ئورارتوە لەگەل ئەرمەن •• ئەوەمان لەیاد نەچێ کە بابلیەکانیش هـەر وەکو بوو ساتراپ نشینی ئەرمەنستانیان بە [ئورارتو] یان رەواتر بڵێین [ئورالت] یان پێ ئەوت • وە لەگـەل ئەوەشدا پارسیەکان [ئیرانیەکان] خـۆیان [ئارمینا] شیان پێ ئەوت • رەنگ بێ لـە بارەی مادەکانەوە [لەگەل ئەوەدا کـە شانشینێکی سەربەخۆیان لە پشتی سەرەوە هەبوە] شەڕ کردن لەگەل لیدیەکانا سامناك بووە • بەلام ئەگەر شانشینێکی ئاوا یەکگرتوویان هەبوایە لـە کاتی شـەڕی نێوان ئاشورو ماددا بونی خۆیان ئەسەلماند •

چارەنوسی دوایی ئەم شانشینە زۆر کۆنەی ئەرمەنستان چۆن بو ؟ لەگەل ئەوەدا بە وتەی کزنفون کە ئەڵێ تیگرانی یەکەم ئەویش وەکو گـەورەکانی

ماد لایەنی کورشی گرت ، بەلام لەگەل ئەوەشدا گومانی بۆ ناچی کە شانشینی ئەو [ئەگەر لە بنەڕەتەوە ئەفسانە بێ] لە سەردەمی کۆرش‌دا هەروەکو جاران پایەدار ئەبو • کزنفون لە [کورش نامە]دا ئەلێ کە کورش [تاناۆکسار = بردیا : کزنفون ـ کورش نامە ـ VIII ، ۷ ، ۱۱ ]ی کوڕی کرد بە ساتراپی ئەرمەنستان‌و مادو کیشوەری کادوسیەکان • بەلام بە وتەی هرودوت [ III ، ۹۹-۹۳ ، VII ، ۷۳] لە سەردەمی داریوشدا ئەرمەنستان کرابو بە دوو بەشەوە(۹۷) • لە کاتی لەشکر کەشی خشایارشادا بۆ سەر یۆنان [ئارتوخم] زاوای خشایارشا فەرماندەیی ئەرمەنیەکانی رۆژئاواو فەریجیەکانی بە دەستەوە بو • دوو سەدەی پێنجەم‌و چوارەمی پێش زاینی هەروەها دوو ساتراپ نشینی لە ئەرمەنستانا هەبوە ، کە [تی زیباز] لە [ئەرمەنستانی رۆژئاوا]و [ئارونت] زاوای پادشای پارسەکان [لە ئەرمەنستانی رۆژهەلات] حکومەتیان تیا ئەکرد(۹۸) • لە سەردەمی داریوشی سێیەمدا دوا هەمین پادشای هەخامەنشیەکان کە [میتراسوت]و [ئارونت](۹۹) ساتراپی هەردو بەشەکەی ئەرمەنستان بون ئەوانیش هەروەکو خۆیان مابونەوە •

بەم جۆرە لە سەردەمی کورش‌دا هیچ شانشینێك لە ئەرمەنستاندا نەبووە، ئەگەرچی لەوانەیە بنەمالەی ساتراپەکانی ئەرمەنستانی رۆژهەلات لەگەل ئەو خانەدانەی کە لە سەردەمی مادەکانا لە ئەرمەنستانا حوکمڕەوا بون پێکەوە بوبن • گەلێك لە ساتراپەکانی ئەرمەنستان خوێشایەتی دور و نزیکیان لەگەل پادشایانی هەخامەنشیدا بووە ، بە وتەی ئاسترابون دواهەمین [ئارونت] لە نەوەی ویدرنا بووە • وە ویدرنا یەکێك بووە لەو حەوت کەسە پارسەی کە لەگەل داریوشی یەکەمدا هاو پەیمان بون ـ رەنگ بێ [ئارونت]ی ناوبراو ـ لە پاشماوەکانی ئەو بووە ، واتا نەوەی کچەکانی بووە •

بەم پێیە ئەگەر دیسان لە سەردەمی مادەکانا لە ئەنجامی تەقەلای هاوبەشی ئەوان‌و ئەرمەنیەکان لە بارەی لەناوبردنی شانشینی ئورارتووە ئەگەر

شانشینیی سەر بە خۆی ئەرمەنستانی دابمەزرابایە ـ هەرچۆن بێ ـ پارسەکان [ئێرانیەکان] لە ناویان ئەبردن • بەڵام رەنگ بێ لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا چەند نومایندەیەکی ئەو بنەماڵە ئەرمەنیانەی بو بونە ئێرانی کرابن بە ساترابی ئەو ناوچانە ، وە هەروەها لەوە ئەچێ ئەوانە لەگەڵ فەرمانفەرما پێشووەکانی ئەرمەنستان [ لە سەردەمی مادەکانا ] وە بنەماڵە بەرزەکانی پارس دا خوێشایەتیان بوە •

زنجیرەی ساتراپەکانی [ ئارونت ]ی لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا لە ئەرمەنستانی رۆژ هەڵات بون [لە ساتراپ نشینی هەژدەیەم ـ واتا ناوچەی ماتینیەکان ـ هوریتیو ساپیری ـ ئیبریو ئالارودیو ئورارتویی • هەروەها ناوی ئەم سەرزەمینە خۆی نیشانەی راستی ئەوەیە کە ئەرمەنیەکان لەویدا ژیاوون] • ئەرمەنستانی رۆژ ئاوا نیشتەجێی [ ئەرمەنیەکانو دراوسێکانیان ] بوە [هرودوت III ، ٩٣] وە لەو دراوسێیانە خالیبیو خلدیو تائوخیو گسپیریتی ـ ساپیریو فاسیانی [کزنفون : ئاناباسیس IV ، ٤، ١٨ ، VII ٨ ، ٢٥ بە دواوە «هەمو ئەم دراوسێیانەی ئەرمەنستان» لە هۆزەکانی کارتول بون] ئەناسین • وە لەم سەرزەمینەدا ساتراپەکان لە بنەماڵەی تربون • بەڵام شانشینی ئەرمەن ـ هەروەکو کزنفون لە [کورش نامە]دا باسی ئەکات ـ ئەبوا سەرانسەر وەیان تا رادەیەك هەمو ئەرمەنستانی بگرتابایەتەوە ـ نەك تەنیا نیوەیەکیان ـ چونکە لە لای رۆژهەڵاتەوە لەگەل ماد وە لە لای رۆژ ئاواوە لەگەل ئەو کلدانیانەی کە لە کێوەکانی پونتی نیشتەجێ بون ـ هاو سنور بون[١٠٠]• ساتراپ نشینی هەژدەیەم کە یەکەمین جار لە سەردەمی داریوش‌دا لە ئەرمەنستان جیا بوەوە ـ لە نوسینەکانی هرودوت دا لە بارەی شوێنو جێگاوە لەگەل ساتراپ نشینەکانی هەژدەیەمی [پونتی]و بیستەمی [هندی] داریوش پێکەوە بون وە لە ساتراپ نشینی سیازدەیەم جیابوە • وە ئەمە خۆی بیروراکەی سەرەوەمان ئەسەلمێنێ • پادشایانی ماد راستەوخۆ حوکمی

کاپادوکیەو تا روباری [هالیس] یان نە ئەکرد ، بەڵگو فەرمانفەرمایانی ئەرمەنی لەو سەر زەمینەدا جێگە داری ئـەوان بون • وە بـە هۆی ئەوەوە کاپادوکیە [ساتراپ نشینی سێـیەم] کە لە ناوچەکانی سەر بە ئەرمەنی نشینەکان جیـا بو بۆوەو کەوتبوە سەر ناوچەکانی مەرکەزی ئاسیای بچوك لـە بارەی شـوێن‌و جێگاوە بە ساتراپ نشینەکانی کورش ناو ئەبرا [نەك بە قەڵەمڕەوی کیاکسارو ئاستیاگ ] •

**٣ ـ ئاشـور :**

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد بـەشێك لـە خاکی ئاشور راستەوخۆ کەوتبوە سەر وڵاتی ماد • لە ساڵی ٥٥٦ی پێش زاینی [لە کاتی چونە سـەر تەختی نابونید کە چوە سەر تەختی بابل] حڕان‌و بین‌النهرینی ژورو بە دەستی مادەکانەوە بووە ، هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان وە بە تایبەتی [ب• ئا• تورایف و•ئی• علیوف] ئەڵێ : کە مادەکان ئەو ناوچە ناوبراوە یان لـە دوای مردنی [نابوخود نوسوری دووەم] ـ بخت النصر داگیر کردوە • ئەمە لە سەرچاوەکانی ماددا بە سەرپێ ییەکەوە باسی کراوە کەلە سەردەمی پادشایەتی [نریك لیسار] [ نرگال شاروسـور ] ٥٥٦ / ٥٦١ی پێـش زاینـی لـە نێـوان مـادو بابـل دا شـەڕێکی بچـوکی تیـا روداوە[١٠١] ، بەڵام زۆرتر لەوە ئەچێ کـە مادەکان لـە کاتی دابـەشکردنی میراتی ئاشوردا حڕان‌و بین النهرینی ژورویان دەست کـەوتبێ • هـەواڵێك هەیە[١٠٢] کە ئەوان ئەو ناوچانەیان ٥٤ ساڵ لەژێر دەستدا بووە • [واتا لـە ٦٠٧/٠٦ تا ٥٥٣/٥٢ یان ٦١٠/٠٩ تا ٥٥٦/٥٥ ی پێش زاینی] بـەم هۆیەوە کۆرشی دووەم توانی لە دوای تەواو بونی کاری سەردانەواندنی لیدی لەشکری لە بین النهرینەوە کردە سەر ئاسیای بچوك • خاکی بابلی ـ تەنانەت دوای ئەوە کیشوەری حڕانی لە دوایدا گرت ـ دور بخاتەوە • بەڵام ئەوە دەر ئەکەوێ کە ژوروی بین النهرین بە گشتی لەو مادە بووە[١٠٣] • ئەگەرنا دابەشکردنی میراتی ئاشور بە زیانی ماد تەواو ئەبو ـ چونکە بە پێی ئەم بیروڕایە ماد لـە

زەوی‌وزاری ئەمپەراتوریتی ئاشـور تـەنیا ناوچـە کوێستانیەکانی رۆژ ئاوای خۆی‌و خاکی وێران بوی ئاشوری دەست ئەکەوت • وە ئەم جۆرە دابەشکردنە کە بە نیسبەت مادەکانەوە سودمەند بووە ، بە هیچ جۆرێك نە ئەگونجا ، لەبەر ئەوە تەنیا بابلیـەکان حەرانیان تالان کرد نـەك مادەکان[١٠٤] • [لـەم روەوە لەمەوبەر قـەمان لێوە کردوە] ئەمە خۆی ئـەوە ئەسەلمێنێ کـە شارو زەوی‌و زاری ناوبراو بوو بە بەشێکی یەکگرتووی تر ـ چونکە لە رۆژ هەلاتی کۆن بەم جۆرە باو بوو کە دوو هاوپەیمان لە کاتی داگیر کردن‌و تالان کردنا بـەم جۆرە بکەن •

**٤ ـ عیـلام :**

چۆنیەتی عیلام لە دوای قەلاچۆ کردنی ئاشور دیاری نیـە • هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ولاتەکـەیان رەنگ بێ لـە لایـەن پادشایانی پارسـەوە بەرێوە برابێ • پادشایانی بابل ـ بەر لە نابونیە ـ شوشیان بە دەستەوە بووە ، وە لەوێ چەند ساختومانێکی گەورەیان دروست کردبو • بەرای زوربە عیلام یەکەم جار لە سەردەمی کورشی دووەمدا بوو بە ساتراپ نشین[١٠٥] •

**٥ ـ لەنگیاناو هی تر :**

بە وتەی هرودوت بەشەکانی خوارەوە بەشێك بون لـە ساتراپ نشینی [چواردەیەم] : هۆزە نیوە پارسەکان ، نیوە مادی ، ساراگتیەکان لە سەرکەزی ئێراندا ، سارانگی [یان باشتر بلێین زرنگی یان درنگی] کـە بـە زمانی مادی کۆن [زرنکا Zranka ] یان پێ ئەووت • کـە لـە زەوی‌و زاری سیستانی ئیستادا لە سنوری ئێران‌و ئەفغانستان‌و لە کەناری دەریاچەی هامون ئەژیان •تا مانتایەکان کە بە قسەی هرودوت [ III ، ١١٧] بـە تەنیشت پارتـەکان‌و سارانگیەکانەوە بوە • ئوتیەکان [لەوە ئەچێ نیشتەجێی رۆژ هەلاتی ئێران وەیان رەواتر بلێین ناوچەی کرمان ـ کرمان یان ئوتیا yautya ؟بوبن]وە

میکیـەکان [میکوی mukoi رەنگ بێ ـ مك ـ maka که لـه بـەردە بوسراودەکانی ئێرانی کۆن دا ناوی براوە ، لە موکریانی ئیستا؟] بو بێت • بەم پێیـە ساتراپ نشینی ناوبراو زەوی‌و زاری ئیستای خـواروی رۆژ هـەلاتی ئێران [ناوچەکانی سیستان‌و کـرمان‌و بـەشێك لـه موکـریان]و رۆژ ئاوای ئەفغانستان [تا خەتی هەراتی قەندەهار]ی ئەگرتەوە •

ئەم ناوچانە لە ناوچەکانی تر هـەژار ترو خەڵکـە کانیشی دواکەوتو تر بون ، هێشتا نەگەیشتبونە پلـەی دامـەزراندن‌و دروستبوونی چینـایـەتی • ئەتوانین بڵێین کـە لەم ناوچانەدا چەند هۆردوگایەکی جیا جیـای مادەکان وە ـ پارس ـ زور بە ناخۆشی لەناو هۆزە کۆچەرەکانی سـەردەمی کۆمـەڵگای سەرەتاییدا ئەژیان • هەروەها سەر بەخۆ بون‌و خەرج‌و باجیان وەر ئەگرت ، چونیەتی باری ئەوانە زۆر لە ناوچە مەرکەزیەکانی ماد ئەچون لـه سـەدەی هەشتەم‌و سەرەتای سـەدەی حـەوتـەمی پێش زاینیدا • لـەوە ئـەچێ ئـەم سەردانەواندنەی هۆزەکان لە سەرەتای سەڵتەنەتی کیاکسارەوە بو بێت، نـەك درەنگ تر •

### ٦ ـ پارت‌و هیرکانیەکان :

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد سەرزەمینی پارت لە سەرەتاوە [ناوچەی سنوری] ماد بووە زۆر لەو ناوچانەی کە لە دواییدا کەوتنە سەر پارت [وەکو خوئارن‌و کومیسن] ئەمانە لـه سـەر زەمینە تایبەتیەکانی ماد بون • پادشایانی ئاشور زۆر تەقەلایان دا دەسەلاتی خۆیان بە سەر پارتا بسەپێنن ، وە گومانی تیا نیە کە پادشایانی ماد لە سەردەمەکانی کۆن دا تـەنانەت لـه سـەردەمی [خشتریت] ئەو ناوچەیانە لە ژێر دەستا بوە • بەلام هێرکانیەکان واتا کەناری خواروی رۆژهەلاتی دەریای کاسپی [خزر] وە دەراوەکانی روباری گورگان‌و ئەترك ، لە سەردەمی یەکەمین پادشای هەخامەنشیەکانا بەشێك بوە لە ولاتی پارت • کزنفون لە کورشنامەدا نوسیویە ئەلێ : کە هیرکانیەکان لە سەردەمی

مادەکانا سەر بەخۆ بون [ وە گومان لە دیاریکردنی شوێنەکەیا هەیە ] بەڵام بە وتەی کتسیاس بەم جۆرە نەبوە • [ئەوەی کتسیاس پێی ئەڵێ – بارکانی– وەلە – وارکانا – ی پارسی کۆنەوە هاتوە ، ئەو جێگایەیە • وە هرکانا vahrkana – ی ئاویستایی یان «سەرزەمینی گورگ» • رەنگ بێ لەم بارەیەوە وتەکەی کتسیاس راست تر بێت • بە وتەی نیکولای دمشقی [کە گویا لە کتسیاسی وەر گرتوە] یەکێك بەناوی [ئارتسیر][١٠٦] لە سەردەمی ئاستیاگدا ، ساتراپێ هیرکانیە بووە ، وە لە دوایدا سەر بە کەمبوجیەی دووەم دەرچو • بە پێی وتەکانی هرودوت [ III ، ١١٧] هیرکانیەکانو تامانیو پارتیو ئارەییو خورزمیەکان ، بەر لە فەرمانفەرمایی پارسیەکان – پەیمانێکیان بەستبوو لە ئاوی روداك – کە ئەبێ [تجن] هریرود – بێت سودیان وەر ئەگرت[١٠٧] •

**٧ – ئارەیا ، خوارزم ، سگدیانا :**

لەبەر ئەوە ئارەیا [هاریوا – Haraiua ] دەراوی تجن – هریرود] سەر بە ماد بوو ئەمە بەلگەی ئەوەیە ئەگەر وا نەبوایە کورشی دووەم نەیئەتوانی لەگەل باکتریا [کە بە وتەی هرودوت – I ، ١٥٣ ] – وە کتسیاس باسی ئەکەن] شەڕی بکردایە[١٠٨] •مادەکان سەرکەوتن بە سەر یەکیتی ئەو هۆزانەدا کە لە ئاوی تجن سودیان وەر ئەگرت •• ئەم کارە بەر لە سەردەمی سەلتەنەتی کیاکسار روی نەدابو • [ فەرمانڕەوایی ] ماد لە خوارزم[١٠٩] [کە بە رای زوربە تەنیا ناو بوە – چونکە تەنانەت لە سەردەمی بە دەسەلاتدار ترین پادشای هەخامەنشی هێشتا خوارزم سەر بەخۆ بوە] بەم جۆرە بوە • ئەو سەرچاوانەی هەن لە بارەی داگیرکردنی سگدیاناوە لە لایەن کورشەوە هیچ باسی ناکەن ، لەبەر ئەمە لەوە ئەچێ کە مادەکان لە سەردەمادا لەوێ دەسەلاتیان بو بێت • بەلام لە بارەی ئەوەوە ئەم دەسەلاتە لە رێگای خوارزمەوە گونجاوە یان بە هۆی مرغیەکانەوە [کە هەموی سەر بە باکتریا

بووه] ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گرانە • بــە وتەی کتسیاس باکتریا لــە سەردەمی شــەڕەکانی ئاشورو مــاد لــەگــەل کیشــوەری دواییدا یەکگرتوو هاوپەیمان بووە • وە لەگەل ئەوەدا کــە لــە پێشا پادشای ئەوان کــە ناوی ناکسـیارت [یان زائوت ـ زەردەشــت ؟] گــۆیا ســەر بــە سـمیرامید شــاژنی ئاشور بوە •

ئەو شتە دوزراوانەو هەڵگەندراوانەی کە ئێستە دانشمەندانی سوڤیەت لــە ســەرزەمینی پارتو مرغیو باکتریاو سگدیاناو خوارزم دۆزیویانەتەوە ، وەڵامی ئەم پرسیارانە رون ئەکەنەوە •

هــەندێك لــەم ناوچانە [بــە تایبــەتی باکتریا ـ واتا تاجیکستانی ئێستاو ئەفغانستانی ژورو] لە روی کامڵ بونی کۆمەڵایەتیەوە ئەوەندە لەماد دواکەوتوتر نەبون ، [یان بە هیچ شێوەیەك دواکەوتو نەبون](١١٠) •

## ٨ ـ سکاییو کاسپییەکان :

لە بارەی شوێنی ئــەو ساتراپ نشینەوە کــە هرودوت لــەژێر ژمــارەی پازدەدا باسی کردوە چەند بیروڕایەکی جیاجیا پەیدا بووە ، ئەتوانین ئەو شوێنە بە قەفقاز دابنێین وە سکایەکانیش بــە ناوچــەی سکاسنا [ کــە بــە وتــەی ئاسترابون ـ XI ، ٨ ، ٤ ـ هــۆزە بیــابان نشینە ســکاییــەکان لــەوێدا نیشتەجێ بون] کــە لــە دەراوی کورا [کر] ـ لــە نزیك کــی روف ئاباد [گنجە]ی ئێستادا بوە ـ بەڵام وەکو دەر ئەکەوێ ناوی کاسپیەکان کە شوێنی نیشتەجێ یان لە کەناری دەریای کاسپی [خزر] ـ لە خواروی نیمچە دورگەی ئاو شوران ـەوە بووە ، ئەم باسە بــە وردی دەر ئەخات • ئەوە ئەزانین کــە ئاکاد میسینو و • ئاستەروەوە سکایەکانو سکاسنیەکان کە دژ بە داریوشی یەکەم بون وە بە پێی نوسراوەکەی بێستون لە ئەرمەنستان لە دژی ئەوا راپەڕیونو یاخی بون(١١١) ئەمانە بەیەك ئەزانێ • ئاکاد میسینو و • ئاستەروەوە باسی لــە

ناوچونی راپەڕیوەکان ئەکەن ، وە داریوش لـە نوسراوەی ناوبراوا باسی پێشەڕایی ئەوانە ناکات • ئاستروەوە باسی جموجوڵی ئەوانە ئەکات • چونکـە نەك تەنیا لە ئەرمەنستان بەڵکو لـە بین‌النهرین دا دیسان لەگـەل پارسەکانا کەوتونەتە شەڕەوە • ئەوەمان لە یاد بێ کە هیچ سەرچاوەیەك ئەمانەی بـە ئەرمەنی دانەناوە ،وە خەڵکی ناوچەکە دوژمنایەتیان لەگەلا کردوون چونکە پارسەکان توانیان بەشێکی زۆریان لیٚ بگرن • لە هەمو ئەم نوسراوانەدا بـەم جـۆرە دێتـە ئـەنجام کـە راپەڕیوەکانی نیشـتەجێی ناوچـەکـە ــ واتا ئورارتویی‌و ئەرمەنی ــ نەبون بەڵکو سکاییەکان بون •

بەڵام ئەتوانین بە پێی بەڵگەو سەنەدی تر باوەڕ بـەم بیروڕایەی ئاکاد میسین‌و وە ئستروەوە نەکەین • ون کردنی ناوی پێشەوایەکی راپەڕیوەکان نابێ بە بەڵگەی نەبونی واقیعەتی روداوەکە[١١٢] •

پەلاماربردنی راپەڕیوەکان بۆ سەر بین‌النهرین ئەبێ ــبە پێی رای ئێمەــ بە ئەنجامی سەرکەوتنی ئەوانی بزانین نەك جموجوڵی تایبەتی • بە تایبـەتی کە لە نێوانی ئەرمەنستان تا [ئیسالا] لە بین‌النهرین کە مەیدانی لێدان‌و بگرەو بەردە بووە ئەوەندە نیە • بەڵام لەبەر ئەوە ئەوان لـەو سەرچاوانەدا کـە هەن‌و بە ناوی ئەرمەنی ناو نەبراوون ، ئەمەش دیسان جێگای سەرنجدانە • چونکە بە پێی وتەکانی هرودوت ئاشکرایـە کـە لـە ئـەرمەنستانی ئـەو رۆژگارەدا بەلای کەمەوە چوار کۆمەڵ نژادی تیا ژیاوە • وە لـە ئەنجامدا ئەبێ بڵێین کە زۆری بە دیل گیراوەکان نابنە بەڵگەی ئـەوە کـە خـەڵکی ناوچەکە دوژمنایەتی راپەڕیوەکانیان کردوە • ئەتوانین ئازایانە بڵێین کە بـە رای زوربە خەڵکی ناوچەکە توانیویانە لەگەل ئەو هەمو شەڕو شۆرو بگرەو بەردەیەدا لـە کیشوەرەکەیانا لـە بەرامبەر بێگانـەکانا رابوەستن‌و داکوکـی لەسەر خۆیان‌و خاکەکەیان بکەن نەك بیابان نشمینە تازە پێ گەیشتووەکان • بەڵام ئەگەر تەنانەت ئەوانە بیابان نشینیش بووبن ــ نابێ بە سکاییان دابنێین•

وه لەوانەیە ئەسکیتەکانی ـ ئاشکیدا وه یان [ئورتو کوریبانتیان] [تیز خودان]ی ژوروی ئازربایجـان بوبن • بـەڵام لەبـەر ئـەوەی پارسەکان ئەشکیداکانو [ ئورتو کوریبانتیان ] ـ تیز خودان ـەکانیان بە [ سکای ] ناو ئەبرد ئەمە شتێکی ترە •

بـەڵام ئـەسکیتەکانی قـەفقـاز ـ وەکو دەرکـەوتوە ـ لە نوسینەکەی هرودوت دا ـ کە بـە ساتراپ نشین ژمـارە [١٠] ناوی بردوە پێی وتوە [ئورتوکو ریبانتیان] • بەم هۆیەوە ، بە بیروڕای ئێمـەو بـەرای زوربـەش سکایەکانی ساتراپ نشینی پازدەیەم هەمان سکایەکانی ئاسیای ناوەراست ـواتا ساتراپ نشینی [سکا saka ] کە لە نوسراوەکەی بێستوندا باسی کراوە ، ئەوانـەن کـە شـوێنەکانیان لە نوسینەکاندا بـە بین گاندار [قـەندەهار]و ساتاگیدیە ناو براوە ، وە ئەمە خۆی بـە ئاشکرا شوێنی ئـەوانە لە ئاسیای ناوەڕاست دا نیشان ئەدات •

لە ئاسیای ناوەڕاست هـۆزە بیابان نشینەکان کە [سکا]یان پێ ئـەوتن زۆر بون ، ئەگەر بمانەوێ رونی بکەینەوە کە لەو کاتەدا مەبەست لە وشەی [سکایی] چی بووە ، لە پێشا ئەبێ ئەوە بزانین کـە زاراوەی [کاسپی]یەکان چ مانایەکی بووە • سـەرچاوەکانی سـەردەمی کۆن(١١٣) لـە بارەی بونی کیشوەرێکەوە کە پێیان وتوە [ کاسپیا ] زانیویانە کـە لـە نێـوان باکتریاو [سـریکا] [چین] دا بووە • [کاسپی یەکانی رۆژ هەڵات] یشیان بـە هـەمان نیاکـان دانیشتوانی ئیسـتای کافرستانو چیتراڵ ـ لە خواروی کێوەکانـی هندوکش ـ سنوری ئەفغانستانو هیندستان ـ کە هێشتا زمانی بێجگە لە هیندو ئەوروپایی لـەوێدا ماوەتەوە ـ ئەزانی(١١٤) • لەبـەر ئـەوە زەحمەتە ئـەو کوێستان نشینانە کەوتبنە ژێر دەستی مادەکانەوە ، تەنانەت ئەوانە لە بەرامبەر پارسەکانا ئەوەندە فەرمان بـەردار نەبون ـ هەروەها ئەوانـەش لـە دوایـدا داگیریان کردن نەیانتوانیوە ئەوانە بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە • ئینجا بۆچی

ئەوانەیان بە تایبەتی لەگەل سکاییە ـ بیابان نشینەکان لەیەك ولاتی یەکگرتودا بەیەك داونەتە قەلەم ، ئەمەش دیسان رون نابێتەوە • چونکە مانای نیە کە لە نێوان هەمو سکاییەکانا تەنیا چەند هۆزێك کە لەو پەری ناوچەکانی رۆژهەلاتو زەویو زارەکانی دەورو بەری پامیرو هیندوکش دا ژیاوون ـ ئەوانە فەرمانبەرداری هەخامەنشیەکان بوبن • لە هەمان کاتا ئەوەندە بەلگەو سەرچاوە هەیە کە ئەوە دەرئەخات سکاییەکانی کەناری دەریای خزر سەریان بۆ پارسەکان دائەنەواند • دانیشتوانی کەنارەکانی رۆژ هەلاتی دەریای کاسپی [خزر] ئەوانیش دیسان [کاسپی] یان پێ ئەوتن ، وە لەم بارەیەوە بەرونی دەست نیشان کراوە(١١٥) •

ئەگەر ئەوە بێنینە بەرچاو کە گەلێك لەو هۆزانەی سەر بە ماد بون ـ رەنگە بێ ـ لە کاتی قەلاچۆ کردنی ئاشوردا لە سەر ئارەزوی خۆیان هاتنە ناو مادەکانەوە ـ زۆر لەوە ئەچێ ئەو هۆزانەی کە شوێنیان زۆر دور بوە هاوکاری ئەم کارەیان کردبێ •

هەرچۆن بێ مەسەلەی ساتراپ نشینی پازدەیەم بە رونی لێك نەدراوەتەوە •

**٩ ـ حەبەشیە ئاسیاییەکانو پاریکانیەکان :**

مانای ئەم ناوونیشانە خەلکە غیرە ئێرانیەکانن کە زوربەیان دراویدی بون هەندێکیان لە دارستانەکانو هەندێکیان لە ناوچەکانی پای دەشتو گەرمەسێرو بیابانەکانی کەناری ئوقیانوسی هیند ـ واتا موکران و بلوجستان [پاکستان] ی ئیستا دا ئەژیان • ئەو هەلکەندراوە تازانەی لەم ناوچانەدا دەست کەوتووە ئەوە نیشان ئەدەن کە دانیشتوانی کەنار خاوەنی فەرهەنگی کۆن بون ، کە لەوە ئەچێ لەگەل فەرهەنگی [موهنجودارو]و [هاراپی] بلە سەرەتاییە شارستانیتیەکانی تری هیندا لە یەك ئەچون • ئێمە لە بارەی

فەرمانبەرداریو سەردانەواندنی ئەم کیشوەرەوە لە لایەن مادەکانەوەو حکومەتی یانەوە ناتوانین هیچ بڵێین •

بە شێوەی گشتی سەرنجی ئەوە ئەدەین کە لەو بەر سنورەکانی شانشینی مادەوە [بەو فراوانیەی کە لە دەماو دەمی کۆتایی سەڵتەنەتی کیاکساردا بویەتی – وە مانناو شانشینی ئەسکیتو «سوریەو ماد» – سیرومدی – مەبەست بابلو مادە –م • – بە تەواوی ئەگرتەوە] بە شێوەی گشتی شانشینە خود موختاریەکانو هۆزە نیوە سەربەخۆکان هەبون • بەڕای زوربە بە بێ وچان لە دوای لەناو چونی ئەمپەراتورێتی ماد لە سەردەمی کورشدا دیسان دەستگای ئیداری بەم جۆرە بووە ،وە هەروەکو هرودوت ئەڵێ [ III ،٨٩]– داریوش رێکخستنو ئیدارە رازاندنەوەیەکی رێكو پێکی دانا وە چەند ساتراپ نشینێکی دیاریکراوی دامەزران •

بەڵام جێگاو کاری ساتراپ لە مادا هەر هەبو ، وە ئەم زاراوەیە خۆی ئەوە ئەسەلمێنێ • چونکە هەمو زمانە کۆنەکان – جگە لە عیلامی – ئەم وشەیانە لە مادەوە وەر گرتوە ، نەك لە پارسەوە • [شکشمەپمانە –ی عیلامی کە لە [خشتە چاپوان] وەر گیراوە ئەمە پارسی کۆنە] ، لە یۆنان پێیان ئەوت [ساتراپس satrapes ]وە بە ئارامی [ئاها شدار پانا] یان پێ ئەوتو ، لیکیە کانیش پێیان ئەوت [ئی کسادراپا kssadrapa ] کە لە وشەی مادی خشاترا پانەوە وەرگیراوە[١١٦] • بە تەواوی لەوە ئەچێ ساتراپەکان لە هەندێ وڵاتا کە راستەو خۆ سەربە ماد بون حکومەتیان کردبێ وە هەروەها رەنگە بێ لە هەندێك کاتا ئەو ناوچانەی کە حوکمی ناوچەیی خۆیان پاراستوە لەژێر دەسەڵاتی ئەوانا بوبن – هەروەکو لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینیدا – لە ئاشورو ئورارتودا بەو جۆرە بوە •

دەسگای ئیداری ئەمپەراتورێتی ماد – رەنگە بێ – هەمان دەسگای ئاشورو ئورارتو بوبێت – بەڵام نەختێك رێكو پێك تر • وە لە دواییدا

پارسیش هەر لە سەر ئەو رێکخستنە رۆیشتوە • دەسەڵاتی ساتراپەکانی پارس کە لە سەروی دەسگای ئیداریو دادو کاروباری داراییەوە بونو لە قەڵەمڕەوی خۆیانا خەریکی کۆ کردنەوەی لەشکر بون ، لەگەل سەرۆکی وڵاتی ئاشور لە یەکتر ئەچۆن(١١٧) • ئەوانەیان بە ئاشوری [بل پهاتە ، پهـاتو ـ Belpehate,pehatu ] یان پێ ئەوتن ، وە بە زمانی ئارامی هەمان زاراوەی [پهاتا ـ Pehata ] یان پێ ئەوتن • تەنیا جیاوازی لەوە دا بووە کە ساتراپ نشینەکان لە وڵاتە ئاشوریەکانا فراوانتر بون ، وە ساتراپەکان ئەیان توانی بە دەسەڵات ترو سەربەخۆ تر بن • هێڵی نێوان [سەروکی ولات]ی ئاشوریو ساتراپە ئیرانیەکان ـ ساتراپەکانی ماد بون •

# باوەڕو فەرهەنگی ئیمپەراتۆری "مـــاد"

له میژوی دەوڵەتی ماددا دوو سەر دەمی جیاواز هەیە ـ یەکەم بەر لە دامەزراندنی ئەمپەراتوریتی گەورەی ماد ، دووەم لە دوای ئەو ـ هـەروەها ئەتوانین میژووی فەرهەنگی ماد بکەین بە دوو بەشەوە .

ئەوەی کـە لە بارەی میژووی فەرهەنگی مادەوە ئـەیزانین دو بەشە : یەکێکیان هینی سـەردەمی پیشووی مادو بـەر لـە سەقامگیر بوونی یاسـای موغەکانە . بەشی دووەمیان هینی سەردەمی موغەکانە . سنووری نێوان ئـەم دوو سەردەمە کۆتایی سەدەی حەوتەمی پیش زایینی‌یە .

میژووی فەرهەنگی دانیشتوانی سەرزەمینی ماد [بە مانای فراوان] لـە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پیش زایینی دوا بە دوای سەردەمی کۆندا بووە ـ ئێمە سەردەمی دوایی باسکراو لە بارەی فەرهەنگەوە لە بەشی یەکەما باسمان کرد . ئەو زانیاریەی کە لە بارەی فەرهەنگی مادەوە لـە سـەدەی حەوتەمو شەشەمی پێش زایینی‌دا بە دەستمانەوەیە زۆر کەمە .



**دیوی ناوەوەی خانویەکی ئورارتوییەکان (تئی شە بائینی)**
**بەهۆی و٠ س٠ ساروکینەوە لە روی نەقشێك گیراوەتەوە ٠٠٠**

**١ ـ چەند زانیاریەك لە بارەی فەرهەنگی مادی مادەوە :**

لەوەبەر لـە لاپـەڕەکانی پێشوودا چۆنێتی لادێکانو شـوێنە نیشتەجێ کانمان لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی‌یەوە [ئاوایە عەشیرەتیەکانو ئاوایەکانی دەورو بەری ـ قەلاکانو پاشکەوانەکانیان] مان باس کرد ٠تەنانەت یەك مالی مادی کە لە خشتی کال دروستکرا بێ ـ هێشتا لە هەلکەندراوەکانا نە دۆزراوەتەوە ٠ بـەلام رەنگ بێ ئەو ساختومانانەی کـە لـە سەردەمی دوایدا لە مادا بون لەو سەردەمەشدا هەر بوبن ٠ وە ئەو نووسینانە کـە لـە گۆڕە دۆزراوەکانا دەست کەوتوون ئەوە نیشان ئەدەن ، وەبریتین لە خانوی یەك نهومو مەحکـەم وە لـە زوربەی کاتا بانێکی پانو بانیجـەو هـەیوانو کۆلەکەی داریان بووە ، ئەم جۆرە نیشتەجێ یانە لـە ناوچە کوێستانیەکانی ئاسیای کۆندا زۆر بوە[١] ٠

بەلام ژیانی خـەلکی ناوچـە دور دەستەکانی رۆژئاوای [کێوەکانـی

زاگروس] لە ژێر نەریتو رەووشتی بابلیەکانا هەڵ ئەسان • بۆ نمونە لە بارەی جلو بەرگەوە بەم جۆرە بوە [؟] : بەلای رۆژهەڵاتی کێوە ئاوبراوەکانەوە ئەو جلو بەرگەی کە لولو بیەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینی لە بەریان کردوە [وە ئاگاداری هەین] بەم جۆرە بوە : نیوەی رووی داپۆشیوە ، [کراسێکی دامان کورت ـ تا ئەژنو] ئەیان دا بە سەر شانیانا هەندێك جار ئەیانکرد بەژێر پشتێنەوە ، دەوڵەمەندەکان پێستی پلنگو دەست کورتەکان پێستی مەڕیان لەبەر ئەکرد ، جلوبەگی مانناییەکانو هۆزەکانی تری یەکێتی مادو مادەکان خۆیان بەم جۆرە بون ، ئەم نەریتە ـ واتا کەووڵ کردنی پێستی مەڕو لەبەر کردنی تا ئیستە لەناو شوانە کوێستان نشینەکانی ئازربایجاندا هەر ماوەتەوە • مووەکانیان بە بەنی سور ئەبەستو ریشەکانیان دائەهێنا[٣] • لە وێنەی ئاشوریە کڵاو بڵندەکانا کڵاوی لباد ـ کە بە زمانی



**ماڵە جوتیارێکی ئیستا لە ناوچەی ئازربایجاندا ••**

لاتینی یونانی [تیار] یان پێ ئەووت ـ ئەوە بە تایبەتی هی دانیشتوانی ماد بووە ـ ئەم جۆرە کڵاوە لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیو سەردەمی

هەخامەنشیەکانا دیسان [لە سەدەکانی ٤-٦ی پێش زاینی] ئەمە باو بووە(٤) بێ گومان لەو سەردەمەدا کە باسی ئەکەین ئەمە باو بووە ، پاپۆشی تایبەتی ئەوانە [کەوش] لە چەرمێکی نەرم دروستیان ئەکردو لوتەکەی بەرز بوو •

یۆنانیەکان لە بارەی ئەم جلو بەرگەی مادەکانەوە هیچ ئاگادار نەبون ، وە ئەمەیان تەنیا بە هینی [کاسپی]یەکان ئەزانی ، وە هەر شتێکی تر کە لەگەل وێنەی ئاشوریدا لە یەك بچونایە پێیان ئەووت [جلو بەرگی ماد] کە ئەویش بریتی بووە لە کراسێکی درێژ [ساراپیس] دوو قۆلی بەرزو شەڵوارێکی فراوان لۆچ دار [چین دار] • کە لە واقیع دا دامێنی درێژ بووە(٥) وە باڵا پۆشێکی کورت لە پارچە یەکی رەنگاو رەنگ یان لە پەشم دروستکراو(٦) • ئەم جۆرە جلو بەرگەیان لەگەل سەر کڵاوێکدا لەبەر ئەکرد(٧) ئەمە جلو بەرگی سوارەی ئاریزانتی بوە [وە ئەمە بەرێکەوت لە بەرگی ئەسکیتەکان ئەچۆ] وە دانیشتوانی مادی رۆژ ئاواو مەرکەزی لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاینی سودیان لەوە وەر ئەگرت • بەڵام لە رۆژهەڵاتی کێشوەرەوە لە کۆنەوە بو بوو بە باوو بە کاریان ئەهێنا ، وە ئەمە لە مۆرێکی کۆنی مادەکانا کە لە گۆڕی [ B ] تەپەی سیلك دۆزراوەتەوە ، وە لەوەدا



**هەندێك نەخشی روی دەفرە حەوجۆشیەکانیماننا ، یان گیلزانیەکانە لە گەنجینەی زیویە دۆزراوەتەوە (سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی) ••**

سوارێك بە شەڵواری مادی‌یەوە لەسەر ئەسپەکەی وێنەی گیراوە لە وێنە [٢٦] دا دەر ئەکەوێ[٨] •

ئەم جل‌و بەرگە لە سەدەی حەوتەم لەگەڵ دۆخی یاسای هۆزەکانی رۆژ هەڵاتی مادو زمانی رەسمی لە سەرانسەری خاکی مادا باو بووە[٩] • لە سەدەی شەشەم پارسیەکان ئەوانیش دیسان ئەم بەرگەیان ئەپۆشی •



**جل‌وبەرگی دانیشتوانی ماد ، لە چەپەوە بۆ راست سەری دیلیك ، یەکیك لە گەورە پیاوانی ماد ، کابرایەکی لولویی ، کابرایەکی ماد •• (تا ئەگاتە سەدەکانی هەشتەم‌و شەشەم‌و پێنجەمی پیش زاینی) لە روی نەقشی ئانوبانی‌نی گیراوە**

لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی یەوە نیزەو سوپەری چوار گۆشە چەکی ئاسایی مادەکان بووە • لە دوایدا جۆری چەکەکانیان تاڕادیەك گۆڕا وە شمشیری کورتی ئەسکیتەکان کە پێیان ئەووت [ ئاکیناك ] وەکو چەکە تازەکانیان گۆڕا[١٠] •

هەروەکو ئەزانین لەو سەردەمەدا ئەسپ سامانی زوربەی هۆزەکانی ماد بووە ، هێشتا ئاگایان لە زینو لەغاو نەبو ، وە سوار بە پشتی روتی سەر بەرەڵلایی سواری ئەسپ ئەبوو • زینو بەرگی کاسیەکانو مادەکان چەند پارچەیەك بووە[11] •

لە بەشی پیشەگەری ـ هونەری پیشەگەری لەسەر مفرغو ئاسن زۆر پێشکەوتبو [ بە تایبەتی دەستکردی هونەری مفرغیو زیو زۆر جوان بو ] بەردتاشیو سنعەتی هەورگەری [سواڵەت سازی] هەروەها رەنگ بێ تەنین ئەوانیش پیشکەوتوو بون ـ هەرچۆن بەراوردی بکەین لە دواییدا پارچە تەونی مادی زۆر بایەخی پەیدا کرد ، شێوەی رازاوەی جۆر بەجۆر کە لە سەر کەرەسەی سواڵەتینی ئەو رۆژگارە نەخش ئەکرا ئەوە ئەگەیەنێ کە لە تەونگەرییو تەنیندا دیسان نەخشو نیگاری جوان هەبوە [لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پیش زایینیدا] •

**٢ ـ شێوەی خەتو نوسینی ماد :**

لە بارەی فەرهەنگی مەعنەویەوە •• ئەبێ بڵێین کە لەم بارەیەوە ئەوەی کە هینی سەدەی حەوتەمە زانیاریمان لە هی پلەی فەرهەنگی مادی کەمترە • لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینی خەتو نوسین لە سەرزەمینی ماد هەبوە • فەرمانێك لە بارەی فرۆشتنی کەلو پەلو پێدانەوە کە لە سەدەی نۆیەم تا هەشتەمی پێش زایینی لە لایەن پادشای ئابداداناوە بە زمانی ئاکدییو بە ناوی پیاوێکی ئاشوریەوە نوسراوە بە دەستەوەیە[12] • بەلام بە شێوەیەکی ناڕاستەو خۆ لە هەندێك سەرچاوەی ترا ئەم شتە دێتە روو کە مانناییەکان خۆیان خەتو نوسینێکیان هەبوە ، کە بەرای زوربە لە خەتو نوسینی ئورارتویی وەر گیراوە[13] •

گومانی بۆ ئەچێ کە ئەو خەتە جۆرێك بووە لە خەتە بزماریەکان ، لە هەمان کاتا لە ناوچەکانی دەورو بەری دەریاچەی ورمێ هیرو گلیفیەکانیش دیسان لەگەل هیرو گلیفیەکانی ئورارتودا لە یەك ئەچون • بو نمونە لەسەر

پارچـه زێڕێك [؟] كـه لـه زیویـه دۆزراوەتەوه بەو جۆره هیرو گلیفیانه نوسراوه •

له بارەی دانیشتوانی مادی مەركەزیو رۆژ هەلاتەوه باسەكه ئالۆز ترە، تا ئیسته هیچ سەرچاوەیەك راستەوخۆ كه دانی بەوددا نابێ ئەوانـه لەگـەل خەتو نوسین دا ئاشنایەتیان هەبوه ، به دەستەوه نیـه • بـەلام بـه بیروڕای ئیمه ـ هەرچۆن بەراورد بكرێ ئەوانه لـه سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا خەتو نوسینیان هەبوه ، وه ئەمه هەمان خەتو نوسینه كه ئەمڕۆ به [ خەتی كۆنی پارسی ] یان [ خەتی هەخامەنشی ریزی یەكەم ]ی دائەنێین ، بەلام له واقیع دا ئەمه رەگەزی مادییه •

**بەلگەكانی خوارەوه ئەم باسەی سەرەوه ئەسەلمێنن :**

ئیسته زانراوه كه خەتی بزماری [پارسی كۆن] لـه سەردەمی كورشی دووەمو ناوەراستی سەدەی شـەشەمی پێش زاینی زۆر باو بوه[١٤] • ئـەم وتەیه كەمتر ڕێی تێ ئـەچێ كــه ئەمپەراتوریتی گـەورەی ماد رێنوس و [رێنوس] یانوسینی تایبەتی خۆیان نەبوبێت و پارسەكان خەتیـان بووبێت • جگه لەوه خەتی بزماری [پارسی كون] لەگەل خـەتی بزماری بابلی و عیلامی جیاوازیەكی زۆریان هەبووەوه رەنگ بێ لەگەل خـەته بزماریەكانی تری ئاسیای نزیكدا یەك سەرچاوەیان بوبێت،بەلام ناتوانین بلێین راستەو خۆ لەوانەوه وەرگیراوه • مانای ئەم وتەیه ئەوەیه كه چەند حەلقەیەكمان لەو نێوانەدا بـه دەست نەگەیشتووه ، وه زۆر گومانی بۆ ئەچێ كـه خەتی بزماری مانا لەو بەشه ون بوانەدا رێكەوتبێ •

لــه دوای ئـەوه ساختومانو نووسراوەكانی پـارسی كـۆن [ بـــه تایبەتی دابەشـكردنی نوسراوەكان بــه چـەند بەشێكـەوه ]وه دەسـت پێ كردنی هــەر بەشێك به وشەی : [ فلان پادشا بەم جۆره ئەلێ ] له بابل و عیلام وەرنەگیراوه بەلكو له ئورارتو وەرگیراوه[١٥] • وه ئەمه خۆی ئـەوه

ئەگەیەنێت کە ئەو حەڵقەی نێوانانە لەوێدا بون • وە ئیتر چونکـە حەڵقەکان ئەبوا نوسراوەی پادشایانی مانەو مادی بوایەو بەس • ئەمانەی سەرەوە ئەوە نیشان ئەدەن پارسەکان خەتی بزماری یان لە مادەکانەوە وەر گرتوە •



**شێوەیەکی نوسینی هیروگلیفی (؟) لە روی دەفرێکی زێر کێشراوەو لە زێویە دۆزراوەتەوە (هینی سەدەی هەشتەمی ـ ؟ ـ پیش زاینی یە) ••**

بەڵام ئەم بەڵگانە کەلەبـەری پێویستی پڕ ناکـەنەوە ، زمـانی نوسراوە هەخامەنشیەکان ـ واتا نوسراوەی پادشـایانی هـەخامـەنشی ـ هەروەکو لـە کۆنەوە جـی گیر بووە ـ[١٦] شێوەی زمـانی مادی تیایا فراوانە[١٧] بـەڵام ژمارەی وشەی مادی ئەبێ زۆرتر بێ لەوەی چاوەڕێ ئەکرێ • ئەو وشانەی کە بە مادی یان بە شێوەیەك لە شێوەکانی ژوروی رۆژئاوای دائەنێن ئـەبێ شێوەی فونەتیك و بەکار هێنانی لەگەل زمانەکانی ژوروی رۆژ ئاوادا بگونجێ نەکو لەگەل خوارەوی رۆژ ئاوای ئێراندا • بەڵام گومانی بۆ ئەچێت کە لە فەرهەنگی زمانەوانیدا نوسراوە هەخامەنشی یەکان چـەند وشەیەکی تایبـەتی مادی تیا بێت کە لە پارسی کۆندا بەکار نەهێنراوون •• زمانی ناوبراو گەلێك وشەی رەسەنی ئێرانی بەخۆیەوە گرتوە ، زوربەی ئـەم وشانە لـە زمانی پارسی وەرگیراوون[١٨] وە ئـەوە دەرکەوتوە لـە زوربەی کاتا بەسەرهاتی عیلامی نوسینە هەخامەنشی یـەکان بۆ بـەکار هێنـانی مانایـەك وشـەیـەکی پارسی یان بـەکار هێنـاوە •• بـەڵام وشـەی ناوبراو لـەگـەل وشەیەك لە نوسراوەکانی [ پارسی کۆن ]دا لە هەمان کاتا کە بەکار هێنراوە یەك نین[١٩] •

رەنگ بێ لە هەندێك كاتا شێوەی پارسی لە دەست دەرچووبێ‌و تێكەڵ بە زمانی عیلامی بوبن وە ئەمە بوبێتە هۆی لە یەك نەچونی نێوان شێوەی







**نموونەیەك لە نوسراوەی كۆن سەردەمی هەخامەنشیەكان ، بە سێ زمان : پارسی كۆن ، عیلامی ، بابلی •• كە لە سەر بەردێك نوسراوەو لە مۆزەخانەی ئەرمیتاج دا ماوەتەوە •**

زمانی قسە پێ كردنی پارسی كۆن و زمانی ئەدەبی [ پارسی كون ] ، [ بەو شێوەیەی كە لە نوسراوە هەخامەنشی یەكانا دەر ئەكەوێ ] • هەر چون بێ ئەم كاتە زۆر جێگای سەرنج بووە • وە بە هۆی چەند سەرچاوەیەكی تردوە ئەم واقعیەتەیان سەلماندوە • وەكو ئاستیگ [ویكاندر] ئێران شوناسی سویدی سەلماندویەتی(٢٠) كە هەخامەنشیەكان خوای میترایان بەناوی پارسی [میشا] [كە لە عیلامی‌دا بە وشەی میشا] بەكار هێنراوە ، ناویان ئەبرد • لەگەل

ئەوەشدا لە نوسراوەکانا تەنیا وشەی مادی [میترا] ــ کە بە هیچ جۆرێك پارسی نیە ــ بەکار هاتوە • هەروەها گەلێك وشە هەبوە کە لە زمانی مادە ئێرانیەکانو زمانی کۆنی پارسی دا تێکەڵ بوون • ژمارەی شێوەی زمانی نوسراوە هەخامەنشیەکان ــ کە لە نوسراوە مادیەکانیشا بەکار هێنراوون ــ ئەمانە پێکەوە تێکەڵ بوون •

رێنووسو رێزمانی دەستوری نوسراوەکانی هەخامەنشی [ریزی یەکەم] ــ پارسی کۆن ــ ئەوە ئەسەلمێنێت کە زمانی ئەدەبی کۆن بەر لە نووسینی نوسراوەکانی کورشی دووەمو داریوشی یەکەم ــ کە دەست ئێمە کەوتوە دروست بووەو پێی نوسراوە[٢١] • بۆ نمونە دەنگی ئەی Ai و ئەو Au وە رەنگ بێ ئەهو Ahu ــ لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاینی دا بەم جۆرە [ئی] و [ئو] بەکار هاتبێ[٢٢] • بەم جۆرە نوسینی وشەکان نمونەی چۆنێتی زمانی سەردەمی کۆنترن • وە لە بەر ئەوە زوتر دروست بووە • نوسراوەکانی کۆتایی سەدەی پێنجەمو سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زاینی بەڵگەی لەناو چوونی ناوو سیفەتەکانێتی Flexion[٢٣] بەڵام رەنگ بێ لە نوسراوە کۆنەکانی ترا دیسان دەنگی [ ئە ] ــ a ــ لە دوای زۆر وشەوە بەکار نەهێنراوەو بەڵام نوسراویشە[٢٤] •

رێنوسی سادەی نوسراوەکانی داریوش ئەویش بەڵگەی ئەوەیە کە لەوەبەر ئەدەبیاتێك بووەو کامڵ بووە تا گەیشتۆتە ئەو پایەیە[٢٥] •

بە شێوەی گشتی ئەبێ بیر لەوە بکرێتەوە کە زمانی ئەدەبی نووسینەکانی هەخامەنشی [رەنگ بێ لە لایەن ئارامیەکانەوە وە یان نوسەرانێکەوە کە لە قوتابخانە ئارامیەکانا پێ گەیشتوون][٢٦] وە زمانی مادی زۆر کاری تێ کردبن ــ کە لەوە بەر وەکو زمانی ئەدەبی بەکار ئەهێنرا ــ نوسرابنەوە ، لەم راگوزەرەدا پارچە نووسراوەکانی پادشایانی ئاشوریش تارادەیەك لەگەل

ئەو نوسراوانەدا لەیەك ئەچن •

ئاشکرایە کە ئەم دەرکەوتەیە تەنیا لە ناو زمانێکی فراواندا هەبوە کە لە دوو زمان تێکەڵ بو بێت ، بەڵام لە ئەنجامدا زمانی نوسراوەکانی هەخامەنشی لە بارەی شێوەی زمانەوە بە مادی زۆرتر نزیك بووە تا زمانی قسە پێ کردنی پارسی کۆن • وە لێرەدا ئەتوانین لەوە بگەین کە بۆچی نووسراوەی داریوشی یەکەم لە بێستون – کە لە سنوری مادو [ علیمائید ] نەسەر بەردێك هەڵکەندراوە – وشەی مادی تیا نیە • بێ گومان مادەکان بە سەرهاتەکانی [ریزی یەکەم]ی ئەم نووسراوە واتا بە سەرهاتی [پارسی کۆن] وە تا ڕادەیەك [ریزی دووەم]ی واتا بەسەرهاتی [ عیلامی ] یان لێ تێ ئەگەیشتن •

گومانی بۆ ناچێ کە لە سەرزەمینی ماد هەر بە هەمان خەتی ناوبراو جگە لە نوسراوەی پادشایان [کە هێشتا نەدۆزراونەتەوە وە هیوای ئەوە هەیە لە ئایندەدا پەیدا بێت] شوێنەوارێکی تری نوسین هەبێت • چۆنێتی ئەو کاتە بارمەتی پێشکەوتنی ئەدەبیاتی نەداوە ، وە زۆر لەوە ئەچێ یەك جۆرە نوسینی یەکگرتو لە قوتابخانە گەورەکانا هێشتا نەنوسرابێتەوە ، وە لە هەر شوێنێو ناوچەیەك زمانو خەتی ناوچەیی‌یان بەکار هێناوە[٢٧] •

## ٣ – دینی مادەکان – موغەکان

دین ! کارگەرێکی گەورە بووە لە ئایدیولۆژیەتو بیرو باوەڕی ڕۆژهەڵاتی کۆندا لەو زەمینەیەدا دیسان مێژووی ماد ئەکرێت بە دوو بەشی جیا جیاوە :

یەکەمیان بەر لە سەدەی حەوتەمو ئەوی تریان لە سەرەتای ئەو سەدەیە بە دواوە •

ئێمە لەڕوی نوسراوە ئاشوریەکانەوەو وێنەو نامە تایبەتیەکانەوە لە بارەی جۆری ئاینی هەزارەی یەکەمی پێش زاینیەوە ئەدوێین •

لەم بارەیەوە سەرچاوە ئاشوریەکان چەند جار باسی خواکانی مانناو هینی تر ئەکەن(٢٨) وە بە تایبەتی باسی بتەکان ئەکەن(٢٩) • لە بارەی وێنەی بتەکانەوە تا ڕادەیەك بە هۆی پارچە مفرغوزیوینە [ لوڕستان ] یەکانەوەو ئەو وێنانەی کە لە سەر پارچە دروستکراوە جۆر بە جۆرەکان لە زیویە ـ لەماننا ـ دۆزراوەتەوە ئەتوانین زانیاری وەر بگرین • وە رەنگ بێ باسە نوسراوە [ لوڕستانیەکان ] پەیوەندی‌یەکی هەر جۆری لەگەل ئاویستادا بوبێت • بەلاّم بە شێوەی گشتی ئەو سەرچاوانەی کە ئیستە بە دەستەوەن ئەوە نیشان ئەدەن کە یاسای سەرزەمینەکانی رۆژ ئاوای مادی کۆن زۆر تر لەگەل ئاینی هوریەکانو تا ڕادەیەك ئاشوریەکان یەك جۆر بون •

ئەگەر هەندێك وێنەو پەیکەری باسو بەسەرهاتە لوڕستانیەکان بە شێوەی ناوەڕۆکی باسەکانی ئاویستای بزانین ـ ئەبێ ئەمە بە شتێکی دور نەزانین کە یاسای ئاویستا لەگەل ئاینو بیروڕای دانیشتوانی پێشووی ئەوانەی ئێرانی نەبونو بەر لە ئێرانیەکان دا گونجاوە • هەروەکو ڕێز گرتنی سەگ کە ئاویستا بایەخی پێ داوە ، ئەمە لەناو هۆزەکانی کاسپیو(٣٠) ئالبانی دا باو بووە(٣١) ، وە ئەو نەریتەی کە دارە مەیت لە بەردەم باڵندەکانا دائەنێن ـ ئەوەش لە دوایدا بوو بە یاسایەك لە یاساکانی زەڕدەشت ، وە لە ناو هۆزە ئێرانیەکانا باوی پەیدا کرد ، لە سەردەمی کۆن دا کاسپیەکانیش ئەمەیان بەلاوە باو بووە(٣٢) ، بەلاّم هیچ گومانی تیا نیە ئەو نوسراوو پەیکەرە ئاینیانەی کە لە پاشماوەی ماناو لوڕستانەوە بەجێ ماون بەشێوەی گشتی هیچ جۆرە پەیوەندی یەکی بە یاسای ئاهورامزداو ئامۆژگاریەکانی زەڕدەشتەوە نیە • ئاینی کۆنی گۆتیەکانو لولوبیەکانو کاسپیەکان ـ کە لە بەشی یەکەمدا هەندێك باسمان لێوە کردوون ـ هەروەکو خۆیان مابونەوە ، وە بە بێ گۆڕینو دەسکاری کردن لەناو هەندێك لە دانیشتوانی مادا لە سەدەکانی نویەمو هەشتەمی پێش زاینیدا باویان بووە • یاسای کاسپیەکانو نەنانەت ئاینی تایبەتی بابلیەکان تا ڕادەیەك لەناو مادەکانا رەگی داکوتابو ،

ئەوە بیّ‌نینە یاد کە یەکێك لە کیشوەرەکانی رۆژ ئاوا وەیان مەرکەزی مـاد [ بیت ئیشتار ] ـ خانوی ئیشتار [ خوای خۆشـەویستیو بەهرەی بابلی ] ناونراوە ـ هەروەکو لە وتەکانی هرودوت دا دەر ئەکەوێ کـە لە دوایيدا ئەوەیان بە [ئانا هیتا ـ ی ئاویستا] زانیوە[٣٣] • لە مەرکەزی ماد ـ لە نزیك ئەو جێگایەوە کە لە دوایدا ناویان نا ئەکباتانا ـ ئاشوریەکان لـە ئـەنجامی پێشکەوتنو پێش رویشتنی خۆیان نەك تەنیا گەیشتنەقەلاّی بابلیەکان یان [کوچ نشین ـ کلتی] ـ کاسیەکان ـ بەڵکو خوای بابلیەکانیشیان ئەپەرست ••• لـە مـادی رۆژ ئاوادا فەرمانفەرماکان لـە زۆر کاتا ناوی ئاکادی وە ین نـاوی خواکانیان لە خۆیان ئەنا •

لە بارەی یاسای مادە ئێرانیەکانی نیشتەجێی ئەو پەڕی ناوچـەی رۆژ هەلاّتی ئەو کیشوەرەوە جگە لە چەند نامەیەکی تایبەتی کـە لـە سـەرچاوە ئاشوریەکانا ماوەتەوە هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی ترمان بە دەستەوە نیە[٣٤] ، وە چونکە مانای نامە ئێرانیەکان ـ بـە پێچەوانەی ناوی ئـەوانەوە بووە کـە ئێرانی نەبون ـ [بەلای کەمەوە هەندێکیان] بۆ ئێمـە ئاشکرایە • وە هـەر ناوێکی کۆن پەیوەندی بە بیروڕایـەکی دیاریکراوی ئاینـەوە هەبوە ـ لـە ئەنجامـی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی ئـەو ناوانەوە ئەتوانین لـە بارەی خاوەنی ناوەکانەوە هەندێك زانیاری وەر بگرین• ئاە میر E.meyer بەم جۆرەی لێك داوەتەوە[٣٥] وە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامە کە یاسای مزدایان زەردەشتی لە نێوان خاوەن ناوە ناوبراوەکانا بە نرخ بووە •

ئەو ناوانەی کە لەم بارەیەوە باسی لێوە ئەکەین ئاشکرا بون بریتین لە چەند وشەیەك وەکو : ئاهورا ahura ـ مانای [چاك] ، [خواوەند] لـە دوایيدا [نیك ـ رەوان] ـ لـە نوسراوەی ئاشوریەکانا ئائودر ـ ئائور ـ وە مزاد ـ [بە خیرەد] ـ لە نوسراوەی ئاشوریەکانا مشدا ـ ئەم دوو وشەیە لـە ئاویستاشدا هەیە • لە جێگایەك [ئاهورا مزدا ahuramazda ] هەروەهـا [بەگ] ـلە نوسراوەی ئاشوریەکانا بەگ ـبەمانا [بەگ ـخووایە][٣٦] • لە

یزت [یەزتا] وە خواکانی هیندو ئەوروپایی ئیتر لە ئاویستای بچوکدا نوسراوە یان نەء ؟ هەروەها لە بارەی خوای مەعنەوی‌و چاکەی زەردەشتی [وەکو میترو ئاناهیت‌و تیشتری‌و ورترگن‌و وهو - منووسپنت - ئارمتی‌و هینی تر] ناویان نەبراوە • ئەو ناوانەی کە بە ناوی ئاگری پیرۆزی [ئازور - ئازر - ئاتور - ئاتر] و پاڵەوانانی ئاویستاوە ناو نرابن دیسان نیە •

ئەو ناوانەی کە لە ناوی گیان لەبەرە ماڵیەکانەوە وەرگیراون ئەوانە کەمتریان لە ناوە ئاویستاییەکان ئەچن بەڵکو بە شێوەی گشتی لەو جۆرە ناوانە لە ئاویستادا نیە[٣٧] • دیسان زۆر لە ناوەکانی سەردەمی هەخامەنشیەکانیش ناچن •

جیاوازی لە نێوان ناوە ئێرانیەکانی مادی سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زایینی ناوەکانی دوایی مادی سەردەمی هەخامەنشی [سەدەی شەشەم تاکو چوارەمی پێش زایینی] وە لەوە بە دواوە بەم جۆرەیە : لە دەورەی دووەمدا ئەو ناوانەی کە بە ئارتاو فرنەو خشاترا [خشاشای پارسی] ناو نرابون گەلێك جێگای سەرنج بون بەڵام لە دوای ئەوەوە ، وە بە تایبەتی لە دوای سەردەمی هەخامەنشیەکان ناوەکانی وەکو وهو - منو mano - vohu کە بە مرۆڤی ئاتور- atur وە بە تایبەتی لە مرۆڤی یزتە [یزت yazata ]ناو نراوە، یان ناوی فلان یان هەمان پاڵەوانی ئاویستایی بەشێکە لەوانە - وە بە واتەیەکی تر بە ناوی تایبەتی زەردەشتی - پەیدا بون • لەگەڵ ئەوەشدا ناوی وەکو فرورتیش ، وە سفند داتس ، وە سپیتامس ، لە دوای سەدەی شەشەمی پێش زایینی بینراوە کە لەگەل بیروڕاو نمونەو بەڵگەی ئاویستا دا[٣٨] ئەگونجێن • وە ئەوە نیشان ئەدەن کە ئەو بیروڕایانە لەو سەردەمەدا بون •

بەم پێیە ناوە ئیرانیە مادیەکانی سەدەکانی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زایینی نیشانەی باوەڕ کردنی خەڵك بە مزدا - ئاهورا بووە ، وەئەوە ئەسەلمێنێ کە تا رادەیەك هۆشیاری ئاینی لەنێوان هۆزە ئێرانیەکانا بایەخی

بووه[٣٩] • لەم نامانـە دا پەیوەندییەکی ئاشـکرا لـەگـەل بیرو باوەڕی ئاویستادا نیە[٤٠] ، بەلام ئەو هۆیانەی کە بونی ئەم پەیوەندییە ئەدەنە دواوە دیسان ئەوەش نیە • بەلام لە سەدەی شەشەمی پێش زاینی جۆرە ناوێك پەیدا بون کـە ئەتوانین ئـەوانـە راستەوخۆ بـە ئامۆژگاریو بیروڕای زەردەشت دابنێین •

پێویستە ئەوە بزانین کە سەرزەمینی ماد لە سەدەکانی حەوتەمو شەشەمی پێش زاینی دا سەرچاوەیەك بووە کە هۆشیاری ئاینیو فەلسەفە لەوێوە بلاوەی کردوە • مەبەست وشەی [فرن – Farna ] ئەگرێتەوە •

ئەم وشەیە [کە لەگەل وشەی ئێرانی دا « هور huar » رۆژ لە یەك ریشەن] • لە روی سەرنجدانەوە لە زمانە جۆربەجۆرە ئێرانیەکانا گیرۆدەی گۆڕین بووە – گۆڕینێکی ئـەوتو کـە بـە شێوەی گشـتی جولانـەوەی دەنگی hu , xV لەناویا سەقامگیرە •

بۆ نمونە لە پارسیدا بە شێوەی xu , xw وە لە پارتی دا بـە شـێوەی vx وە لە ئەسکیتیو ئاستی بە شێوەی xo , xw رویداوە • بەلام بە زمانی سیوندی کـە هـەندێك لـە پاشماوەکانی مـادی تیاماوە – hv بە شێوەی F [ hv - F ] لێ هاتوە • بـەلام ئەمە سەرنجمان رائەکێشێ کە لـە هەمو زمانە ئێرانیەکانا مانای [درخشش] ، افتخـار ، بـە شێوەیـەك کـە لـە هورن – ی Hvarna ئێرانی وەیان خورن ـی [ h ] xvrena ئاویستایی وەر گیرابێ ، [وە ئاشوریەکان لە سـەدەی هـەشتەمی پێـش زاینـی دا ئـەوەیان بـە شـێوەی پرنوو پرن – Parnu,Parna – وەریان گرتبێ ، رەنگ بێ ئـەوە بو بێت] • واتا بـە شێوەی وشەی فرن Farna نوسراوەتەوە[٤١] • ئەم روداوە نەك تەنیا لـە پارسی کۆن دا – کە ناوی جۆر بەجۆری مادی تێدا بووە – ئەبینرێت بـەلکو تەنانەت لە زمانی ئەسکیتەکانی کەناری دەریای رەش – کە ناوی دروستکراوی [ فرن ] لـە ناویا زۆر بووە – ئـەمـە ئەبینرێ وە ئـەمـە خۆی جێـگای

سەرنجدانە(٤٢) • بەم جۆرە لەوە ئەچێ کە مانای [فرن – Farna] وهەروەها مانای ئارت arta و چەندەهای تر لە سەردەمێکدا کە ئەسکیتەکان لە سەر زەمینی مادا ژیاوون لە زمانی مادەوە کەوتۆتە ناو زمانی ئەوانەوە •بە وتەی و• ئی• ئابایف(٤٣) مانای [فرن – Farn ] ئارد – ard ئەخسار exsar (خسارت xsart ) بەمانا (سولح) و (سویند) و (نیروی بەربەیان] و [نیرو] و [دلیری] و [سەرکەوتن] تا ئیستە لە ناو ئەسکیتەکانا ماوەتەوە ، وە ئەمە خۆی میراتی ئەسکیتەکانە ، ئەو سەرچاوانەی بە دەستەوەیە باسی هونەری ئەسکیتەکان ئەکەن کە لە مادەکانەوە وەریان گرتوە •

بەم پێیە لە سەدەکانی حەوتەمو شەشەمی پێش زاینی دا سەرزەمینی ماد بنکەی پێشکەوتوی فەرهەنگیو ئاینی بووە ، بەلام نابێ لێرەدا بەم جۆرەی لێك بدەینەوە کە ماد زەمینەی پەیدا بوونی نەریتی ئاویستا بووە ، ئەوەی شایانی باسە ئەو وشانەی سەرەوە بە شێوەی تایبەتی بە ناوی مادەوە بلاو بۆنەوە ، وە لە گەل شێوەی ئاویستادا جیاوازی هەیە • ئەگەر مادیش بایەخی بە ئامۆژگاریەکانی ئاویستا دابێت – بە شێوەی سەرەتایی ئەوە نەبووە بەلکو بە شێوەیەك بووە کە لەگەل زەمینەی ئەو رۆژگارەی ناوچەکەدا گونجابێت • وە بە زمانێك بەیانی کردوە کە – ئەگەرچی ریشەی ئیرانی بووە بەلام – ناوچەیی بووە • بەم رێگایە زوربەی مەسەلە فەرهەنگیەکان مێژووی ماد هینی یاسا جۆربەجۆرەکانی سەردەمی ئەمپەراتورێتی مادی گەورەو بەرامبەر بە یاساکانی ئاویستایە •

هرودوت لە بارەی یاسای مادەکانەوە زانیاریەکی تایبەتی بە دەستەوە نادات وە زۆر بەکورتی موغەکانی – وەکو غەیب زانەکانو کاهنەکانی ماد – ناو ئەبات • لە سەردەمی ئەودا لە یۆنان هەمو ئەیان زانی کە موغەکان یان کاهنەمەجوسەکان مادی بون ، وە ئەم راستیە لەوە راست تر بوە کە هرودوت بۆ خوێنەرانی سەردەمی خۆی رونی کردۆتەوە • هرودوت لە بارەی

موغەکانەوە [مەجوسەکان] وە بیرو باوەڕو ئاینی ئەوان ، لە جێگایەکی تر بە بۆنەی گیرانەوەی چۆنێتی پارسەکانەوە ئەدوێ ، بەڵام ئەڵێت یاسای ئاینیو نەریتی موغەکان لەگەڵ پارسەکانا جیاوازی هەیە •

لە لایەکی ترەوە ـ هەروەکو ئەزانین ـ ئەو ،موغەکان ـ مەجوسەکانی ـ بە تیرەیەك وە یان چینێك وەیان کۆمەڵێکی پیشەیی دا نەناوە بەڵکو بە تیرەیەك لە مادەکانی داوەتە قەڵەم •

تا ڕادەیەك کە من ئاگادارم تا ئیستە ئەم باسە بە تەواوی زون نەکراوەتەوە ، لە نوسراوەکەی بێستون دا داریوشی یەکەم وشەی [موغەکان] بە مانای خاوەن پیشە وەیان کۆمەڵێك لەو خەڵکە نەبووە بەڵکو مانای نژادو هۆزێك ئەگرێتەوە(٤٤) •

لەوە بەدواوە لە سەردەمی ئەسکەندەری مەقدونی وە لە دوای ئەو هۆزە کۆنەکان بە شێوەی گشتی بە کاهنەکانی هۆزە ئێرانی زمانەکانو پیاوە ئاینیەکان [موغ] یان [مەجوس] یان پێ ئەوتن •

لە کۆتایی سەردەمی پارتەکاناو سەردەمی ساسانیەکاندا ، رومیو یۆنانیەکان بەو کەسانەی کە خزمەتی یاسای زەردەشتییان ئەکرد کە لەو کاتەدا ئاینی دەوڵەتی ئێران بوودو خزمەتی مەزهەبی زروانیو مەزهەبەکانی تریان کردوە(٤٥) وە لەگەڵ زەردەشتیەکانا پەیوەندیەکی بەهێزیان بووە ، بەوانەیان ئەوت [موغ] یان [مەجوس] •

ئەوەش بڵێین کە بە لای کەمەوە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زایینییەوە موغەکانیان بە زەرە دەشتی ناو ئەبرد • هرودوت باسی ئەمە ناکات • یەکەمین جار کە ناوی زەردەشت [مەجوس] یان [موغ] برابێ لە نووسینەکانی کسانت لیدئی بوە ـ کە سەردەمی زیندەگانی نازانرێ ـ هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان کە لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمدا ژیاوە ، وە هەندێکی تر ئەڵێن لە سەدەی چوارەمی پێش زایینی دا ژیاوە](٤٦) ئەرەستوو

شاگردەکانی تری ئەفلاتون [بە رواڵەت ئەو یەکەمین کەسێك بووە لە یۆنان کە بە تەواوی پەیوەندی یان لەگەڵ نەریتی موغەکان ـ مەجوسەکان ـ دا پەیدا کرد] • ئەبوا کتسیاس ئەویشی بە ناوی زەردەشتی ناو بردایە(٤٧) • بەسەرهاتە کۆنەکانو ئامۆژگاریو راسپاردەکانی فیثاگورث وا دائەنێن کە لە زەردەشتەوە وەرگیراوە • بەڵام ئەمە راست نیە •

لە کۆتایی سەردەمی فەرهەنگو شارستانێتی یۆنانیە کانا گەلێك نوسراوەی جۆر بەجۆری مەزهەبیو فەلسەفیو زانیاری ـ کە لە ئامۆژگاریو راسپاردەکانی گنوستیکەکانو نەوەی ئەفلاتونیەکانو هینی تر بون ، ئەمانە لە زەردەشتیەکانەوە زۆر دور بون ، وە یان بە هیچ جۆرێك پەیوەندی یان نەبوە [بە ناوی ئامۆژگاریو راسپاردەی موغەکانەوە ـ مەجوسەکان] [ئامۆژگاریو یاسای مەجوسەکانو کلدانیەکان] وە [یاساو ئامۆژگاریەکانی زەردەشت] بایەخیان پەیدا کردبو • لە ئاویستادا [بەو شێوەیەی کە بە دەست ئێمە گەیشتوە ـ واتا بەشێك لە کتێبی پیرۆزی زەردەشتیەکان] ـ کە بە پێی بەسەرهاتو زەردەشتیەکان گۆیا لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەهۆی زەردەشت پێغەمبەرەوە [ زورو ئاستری یۆنانیو زەردەشت نوسەرە موسڵمانەکانی سەدەکانی ناوەراست ] کە لە لایەن خواوەندەوە نێررا بو نوسراوەتەوە ، لە بارەی وشەی [موغ ـ مەجوس]ەوە هیچ ناوێك نەبراوە • وە لە کتێبی ناوبراو دا ، کاهنەکان پێیان وتراوە [ئاترون](٤٩) •

لە رۆژگاری ئیسلامیدا بەم جۆرە وشەی [ موغ ] لە ئەدەبیاتی رۆژهەڵاتا بە مانا [ئاگر پەرست] [پەیرەو کەرانی زەردەشتی] هاتوە • وشەی [موغەکان] ـ بە مانا [ئاگر پەرستان] ـ هاتوە(٥٠) •

لێکدانەوەیەکی تر کە لە مانای رەسەنو سەرەتایی ئەم وشەیە نزیکتر بێ ئەوەیە کە هرودوت ناوی بردوە [ I ، ١٠١، ١٠٧ ، ١٣٢ •••••هتد]: موغەکان هۆزێکن کە نەریتو یاسایەکی ئاینی تایبەتیان هەیە ،پارسو مادەکان

کاهنەکانی خۆیان لە ناو ئەو هۆزەدا هەڵ ئەبژارد •

لەوە ئەچێ سەرزەمینی هۆزی موغەکان ناوچەی رغە [کە لە سەدەکانی ناوەراست دا ــ رەی ــ یان پێ وتوە بو بێت]وە بە یەکێك لە شارە گەورەکانی ماد ناسرابێت(٥١) •

ئاویستا ئەڵێ(٥٢) زەردەشت لە رغە سەرۆکی وڵات بوە ، [لە تەرجومەی پەهلەوی ــ زراتوشترا ــ زرتوشتوم ــ بە باشی تەرجومە کراوە ، واتا ــ لە هەمویان زیاتر لە زرتوشترا یان کاهنی گەورەی زرتشتیەکان](٥٣) بەم جۆرە کاهنی گەورە لەوێدا حکومەتی ئاینی بووە واتا سەرۆکی موغەکان ــ کاهنەکان بووە(٥٤) • وە سەرۆکایەتی هۆزی موغەکانی بە دەستەوە بوە •رەنگ بێ بەم هۆیەوە ماوەیەك لە دوای ئەوە جێگەداری دەسەڵاتی غەیرە ئاینی ئەو لە ناوچەی ناوبراوا [سەرۆکی موغەکان] یان مس موغان وە بە عەرەبی [مسمغان] گەورەی مەجوسیان پێ وتوە • لە سەردەمی ساسانیەکانو تەنانەت لە رۆژگاری عەرەبەکانیشدا دیسان فوداڵە خاوەن ملکەکانی ناوچەی دەماوەند ــ لە ژورووی تاران ــ [کە رەنگ بێ لەوەبەر زەویو زارێکی فراوانتریان بە دەستەوە بووە] ئەم نازناوەیان پێ وتراوە • ئەوانە بە پاشماوەی خانەدانەکانی پارتی قارن دائەنران(٥٥) •

سەرزەمینی سەرەتایی هۆزی موغەکان ئەبێ لە هەمان [رغە] ــ رەی ــ بو بێت • بەڵام لە دواییدا چونکە زەویو زارەکان بون بە هێنی پەرستگاکانی زەردەشت ، لە شوێنەکانی تر وەکو ئازربایجانی کۆن مەڵبەندی موغەکان دامەزرا(٥٦) •

بەو پێیەی کە باسمان کرد بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە بڵێین لە ئێرانی کۆندا دوو جۆر کاهن کە نوێنەری دوو یاسای لە یەك چووی دژ بە یەك بون بووە ، کە ئەندامانی یەك جۆری موغەکانو ئەوی تریان [ئاثروانیان] پێ ئەوتن • [هرتل] ئێران شوناسی ئەڵەمانی زۆر بە توندی داکوکی لەسەر

ئەم بیروڕایە ئەکات •

بـە وتـەی هرتل موغەکانو کاهنـەکانی یاسای کـۆن خـوا پـەرستە سروشتیەکان ـ واتا [دیوانە] بون کـە زەردەشت سەرزەنشتی ئـەو ئاینـەی ئەکرد ـ بەڵام چونکە سەرکەوتنی زەردەشتیان بینی چونە ناو ئەو ئاینەوە • بەڵام ئەم گۆڕانـە لـە رووی مێژووییەوە ئـەبێ چۆن بو بێت ؟ هرتل لـەم بارەیەوە بێ دەنگـە وە هیچ نانوسێت • ئـەو هـەرچی لـە ئاینی زەردەشتدا دواوەتە دواوە بە هینی [موغەکانی] دائەنێ • وە بەم رێگەیە گۆیا بە ئارەزوی خۆی بناغەی ئاینیو فەلسەفەی زەردەشتی بۆ نومایندەو بنچینەی ئەوە دائەنێ بە پێی ئامۆژگاری تەوراتو ئەنجیل کـە سـەرچاوەی سـامی هـەیە ئەمە ئەسەلمێنێ •

چەند بیروڕایەکی گومان لێکراوی هرتل کاری کردۆتە هـەندێك لـە دانشمەندانی رۆژ ئاوا هەروەکو ئەم کار تێکردنە لـە نوسینەکانی هرتسفلدو هەندێکی ترا دیارە[٥٧] •

لەوە ئەچێ موغەکان هۆزێك بوبن کـە ئامۆژگاریو یاسای زەردەشتیان بەر لە خەڵك تیا بڵاو بووبێتەوەو بایەخی بوبیت [جگە لەوە کە یاسای ناوبراو لە کوێ پەیدا بووە] • وە لە دوای ئـەوە بوبێت بـە زنجیرەی یاسای ئاینیو دنیایی • ئاترون ناوو نیشانێکی رەسمی بووە کـە کاهنەکانو هۆزی موغەکان خۆیان بۆ خۆیان داناوە ، دنیای دەرەوە لە بارەی ئەو هۆزە بچکولەیەوە هیچ زانیاری نەبوە ، وە یان بێ ئاگا بوە • وە هـەر کاهنی کـە پیرو سـەر بـە ئامۆژگاری زەردەشت بووە ئەوە موغ بووە [بەڵام هەمو موغێك کاهنی نەبوە]• بەم جۆرە موغ وشەیەکە بەرامبەر بە کاهنی زەردەشتیەکان •

بەڵام لـە بارەی ئاویستاوە ـ لە کتێبی ناوبراوا بـە دوو جۆر زاراوەی [موغ] بەکار نەهێنراوە • لە کۆنترین بەشی ئەو کتێبەدا واتا [گاتاکان] هەر بەو هۆیە وە کەناوی کیشوەرو ناوچـەی چالاکی زەردەشتی نەبردوە ، لـە

بارەی وشەی [موغ]ەوە دیسان هیچ قسەیەك نیە • وە چونکە کیشوەرو هۆزی ناوبراویان بە بەستن ئەناسی وە پەندو ئامۆژگاریە ئاینیو فەلسەفیەکانیان بەسەر زارەکی بەکار ئەهێنا ، ئەمە بووە هۆی لە یاد کردنی ناوەکان(٥٨) •

بەلاٚم لە سەردەمی ئاویستای بچوك دا دیسان باسی [موغەکان] نەکراوە ، یەکەم بەو هۆیەوە کە ئەم وشەیە ناوی رەسمی ئەوان نەبوە • دووەم لەوە ئەچێ چونکە بەربەرەکانێی سەختی کۆمەلاٚیەتیو مەزهەبیو ناوخۆیی تیرەگەری - بە پێی کتێبە نوسراوەکان - کە لە دوایدا ئاویستا باسی کردوە زۆر هەبوە • [وەکو باس کراوە لە سەدەی چوارەم تا سەدەی یەکەمی پێش زاینی] لەو ناوچەیەدا ئالۆزی وشەی [موغەکان] زۆر تر بۆ دوژمنایەتیو بە سووکی تەماشا کردن بوە(٥٩) • بەلاٚم کاتێك کە یاسای زەردەشتی بە تەواوی سەرکەوت [واتا لە سەردەمی ساسانیەکانا] ئەو کاتە بەگشتی کاهنەکانیان بە [موغەکان]وە [سەروکی موغەکان] [مگوپتی - magnpati ] موبدیان پێ ئەوتنو بە رەسمی ناسران •

بەم پێیە ئێمە وای دائەنێین کە زاراوەی [موغەکان] لە سەرەتاوە بەو کەسانەیان ئەووت کە یاسای زەردەشتی یان پەیرەو ئەکردو کاهنی زەردەشتی بون •

راستە کە جارو بار بە پێچەوانەوە لە نێوان یاسای مەزهەبی زەردەشتیەکانو ئەو یاسایەی کە هرودوت بە هی موغەکانی داناوە [ I ، ١٣٢] ئیشارەی کردوە • ئەڵێن هرودوت لە رشتنی نوشابەی پیرۆز [هئوم] بەر لە قوربانی هیچ قسەیەك ناکات(٦٠) وە لە بارەی ئەهمیەتی ئاگری پیرۆزەوە راستی نەدرکاندوە(٦١)وە پارسەکان لە کاتی قوربانیدا تاجێکان لە گەلاٚی مۆرد ئەکردە سەریان •• لە دوایدا هرودوت لەو بارەیەوە کە زەردەشت لە سەرەتاوە فەرمانی دابو قوربانی گاوو گۆتاڵی قەدەغە کردبو ئەوە باس ناکات • یەکەم هیچ دیار نیە کە هەمو ئەم یاسایانە زەردەشتیەکانی

سەردەمی ساسانیەکان ، لە سەرەتاوە بەکاریان هێنابێ‌و بایەخی بووبێ •دووەم بە پێی ئەو بەڵگانەی کە هەمانە هرودوت نەریتی قوربانی موغەکانی بە تەواوی باس نەکردوە ، وە بە تایبەتی هەندێك نەریتی لەو بارەیەوە نوسیوەتەوە(٦٢) •

ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوان نوسینەکانی هرودوت‌و نەریت‌و یاساکانی زەردەشتیەکانا [ئەوەی بۆ ئێمە دەرکەوتوە] هەیە ئەوانە تەنیا جیاوازی کات‌و شوێنەکانە ، تەنانەت لە ئاویستادا هەیە کە ئەڵێ لە سەردەمی پارتەکانا نەریتی مەزهەبی لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئیرانا یەك جۆر نەبوە(٦٣) •

هەندێك جار ئەوە ئەبینین کە موغەکانی هۆزەکانی ماد ، لە سەرەتاوە پەیرەوی یاسا زەردەشتیەکانیان کردوە • بەڵام یەك وتەمان بە تاریکی ئەمێنێتەوە ئەوەیە کە ئەم گۆڕانە چۆن ئەتوانین لەگەل باس‌و بەسەرهاتە کۆنەکانا کە بڵاو بۆتەوە – کە زەردەشت لە باکتریا بووە نەك لە ماد – بگونجێنین(٦٤) • بە پێی ئەم باسەی باسکرا بارەگای ویشتاسب ، پشتیوانی زەردەشت بەلخ [باکترا – باخترا](٦٥) بووە ، وە زەردەشت لە وڵاتی خۆی واتا [ئیران – ویج] ی ئەفسانەیی ، لە دوای تیپەڕ بونی لە روباری گەورە [دایك] – کە لە ئاویستادا پێی وتراوە [دایتیا] – هاتوە بۆ ئەوێ(٦٦) •

بە بیرو رای من تەنانەت لە رۆژگارێکدا کە ئاویستای بچوك [١] نوسراوەتەوە لە بارەی شوێنی چالاکی زەردەشتەوە زانیاریەکی وردیان بە دەستەوە نەبووە ، وە پشتیان بە باس‌و بەسەرهاتی گاتاکان ئەبەست • بەڵام هەروەکو باسمان کرد لەو سەرچاوانە هیچ جۆرە نیازێکی تەواو دەستگیر نابێ • مێژوی ئەمپەراتورێتە گەورەکانی مادو هەخامەنشی باس‌و بەسەرهاتی دەوڵەتە بچوکە کۆنەکانی شاردبۆوە • هەمو مەرکەزە ئاینیە گەورەکان لە

---

**(١) نوسەر ئاویستای بچوك رەنگە بێ مەبەستی ئاویستای دواییێ بێ کە بریتیە لە [یشت]و [ویدودات]ە کان •• – وەرگێر –**

سەدەی شەشەم تا سەدەی یەكەمی پێش زاینی هەوڵیان داوە كە سەردەمی چالاكی ئاویستا ببەستن بە ژیانی شارەكەی خۆیانەوە • گەورە ترین بنكەی ئاینی ئەمانەش بریتی بون لە : باكتریاو ئاترویاتین وە لەوێ دوو جۆر باس لەم بارەیەوە هەیە •



**موغێك دەفرێكی بە دەستەوەیە بۆ هێومە (؟)لە ئەستێلك نەخش كراوە (سەدەی پێنجەمی پێش زاینی)**



**پەیكەری موغێك لە گەنجینەی ئامودەریا سەدەی چوارەمی (؟) پێش زاینی**

ئەبێ ئەوەش بزانین كە زمانی ئێرانی ئاویستاو شێوەی زمانی تایبەتی گاتاكان ـ هەر وەكو لەمەوبەر وتمان ـ زمانی ماد نیە ، وە هەر چۆن بەراورد بكرێ ئەو زمانە ماددی ئێرانیە كە شوێنەواری لە ناوە تایبەتیەكانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی داو سەدەكانی دوایدا هەیە [وە زمانی پارسیو ریشەی ناوەكانی تری تێوە گلاوە] وە پاشماوەكەی لە زمانەكانو شێوەی زمانی تاتەكانو تالشیەكانو(٦٧) گەیلانیو مازەندەرانیو سمنانیو هینی ترا

مابێتەوە ، نیە • یان زمانی هۆزی موغەکان [ مەجوسەکان ] لەگەل زمانی هۆزەکانی تری مادە ئێرانیەکانا جیاوازی بووە • وە یان زمانی ئاویستا زمانی هۆزە موغەکان [مەجوسەکان] نەبوە بەڵکو یەکێك بووە لە ریشەی زمانەکانی ئاسیای ناوەراست • لە کاتێکدا کە زمانی گاتاکان زمانی مادەرزادی زەردەشت خۆی بوە ، ئەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کە ئەو رەنگ بێ لە خەڵکی ئەو کیشوەرە نەبووبێ کە چالاکی تیا نواندوە ، وە ئەمە دیسان باسە کۆنەکانی تر ئەسەلمێنی وە لەوە ئەچێ لە بارەی دیاریکردنی قەڵەمرەوی زمانی ئاویستاو شێوەی گاتاکانەوە گەلێك گرنگ بێ •

## ٤ ـ گیروگرفتی ئاویستاو ماد ••

ئەگەر بمانەوێ ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەین کە ئایا ئامۆژگاریەکانی زەردەشت ـ بەو شێوەی کە لە گاتاکان دا باس کراوە وە لە ئاویستای بچوکدا هەیە ـ لە بارەی فەرهەنگ‌و شارستانێتی مادەوە ئەهمیەتی بووە یان نە؟ وە ئایا بۆ سەلماندنی باسەکەمان چۆنی ئەسەلمێنین ئەبێ جارێکی تر سەرنجی بابەتەکانی ئاویستاو ئامۆژگاریەکانی بدەینەوە •

وا لێك ئەدرێتەوەو زانراویشە کە زمانی ئاویستا لەگەل کۆمەڵە زمانەکانی [رۆژهەڵاتی ئێران] [ئەسکیتەکان] تێکەڵە • ئەمە راستە ، بۆ نمونە ئاە ژ• فریمان(٦٨) ئەوە ئاشکرا ئەکا کە هەرچەند بچینە ناو سەدەکانی پیشوەوە جیاوازی لە نێوان زمانەکانی [رۆژهەڵاتی ئێران] ـ ئەسکیتەکان ـ و رۆژ ئاوای ئێران] کەمتر ئەبێتەوە • شوێنەواری زمانەکانی [رۆژهەڵاتی ئێران] لە ئاویستادا ئەوەندە رون نیە • بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەوەمان لە یاد نەچێ کە ئاویستای بچوك ـ بەهەر جۆر ـ وەکو دەر ئەکەوێ لە ئاسیای ناوەراست‌و رۆژهەڵاتی ئیران تێپەر ناکات • نەك تەنیا ناوەرۆکی فرگردی یەکەمی ویدودات ـ کە لە پارس‌و ئاتروپاتین دا ناوی نیە ـ بەڵکو سەرچاوەکانی تر ئەم راستیە ئەسەلمێنن • بۆ نمونە هۆزە بیابان نشینەکان کە

له ئاویستادا ناویان براوه ئەوانە خەڵکی ئاسیای ناوەراستو رۆژ هەڵاتی ئێران بون[٦٩] • لەو نووسینانەی سەرەوە وا دەرئەکەوێ کە بە هەز جۆر بێ ئاویستای بچوك لە رۆژ هەڵاتو باکتریا وە یان خود هەروەکو هەندێك ئەڵێن لە سیستان نوسراوەتەوە • بەڵام نوسینەوەی ئاویستاو گاتاکان لە ئەنجامی نووسینەوەی بە شێوەو زمانە جوربەجورەکانو دەسکاری کردنی شێوەی نوسینەکانیان ئەو جیاوازیانەی لە نێوان باسەکانیا پەیدا بووە • وە ناتوانین بە تەواوی بە شێوەی فلان زمانی دابنێین وە بە هینی فلان هۆزی دیاریکراوی دابنێین ، ئەبێ ئەوەشمان لەیاد نەچێ کە لە سەردەمی سەرەتای کۆمەڵگای چینایەتیدا چەند شێوەیەکی تایبەتی بۆ بەکار هێنانی – وشەی سووکی جوربەجور – هەبوە ، بۆ نمونە لە یۆنانی کۆندا نوسینی سادەی دڵداری زۆرتر بە شێوەی [ئائولی] و نوسینی شورشگێریانە بە شێوەی [یونی] کنە وتنەی [ئائولی] تێکەڵ بووە ئەنوسرایەوە • لە سەرەتاوە ئەمانە هەمویان شێوەی هۆزایەتی بون ، بەڵام کە بون بە شێوەی ئەدەبی وە خەڵکی سودیان لێ وەرگرتن – گۆڕانیان بە سەرا هات وە بە شێوەی [زمانی ئەدەبی دیاریکراو] یان لێ هات کە لە سەرزەمینی زادەگای خۆی بە تەواوی گۆڕابوو • شێوەی سرودە ئاینیەکانو شورشگێریەکانی زمانی ئاکدی ئەوانیش بەم جۆرە بون[٧١] • یەکەمین جار شێوەی کۆنی ئاکدیو شێوەی کۆنی بابلی بون کە لە دواییدا بابلیەکانو ئاشوریەکان بەکاریان هێناوەو زۆر جیاوازی یان تیا بووە • لەوە ئەچێ کە لە زمانی ئاویستادا ئەویش هەربەم جۆرە بووبێت • رەنگ بێ لە سەردەمی بڵاو بوونەوەی ئەو ئاموزگاریە باسکراوانەدا – لەو ناوچانەی کە خەڵك زمانی هۆزایەتی ئێرانیان بەکار ئەهێنا نوسراوەکانیان بەو زمانەی [ئاویستا] ئەنوسیەوە • وە بەم جۆرە زیادو کەمی تیایدا رویداوە ، وە بە نیسبەت زمانی هۆزایەتیەوە کە بنچینەیان بوود بە شێوەیەکی تری لێ هاتوە • وە ئەمەش بەم دوو جۆرە بووە : یەکەم زمانی ئەدەبی ئەبێ هەرچۆن بێ لێی تێ بگەن •• دووەم ئەبێ بە شێوەیەکی ئەدەبی رەسەنو خۆڕاگر

بنووسرابایه ، وه تاكو زمانێكی تری ئـهدهبی دێتـه كایـهوه خـهڵكی ئهمه بهكار بێنن •

به پێی ئهم نوسراوانهی سهرهوه تا ڕادهیهك ئهتوانین مێژووی پـهیدا بوونی شێوهی ئهدهبیاتی نوسراوهی ئاویستا و زمانی ئاویستا دیاری بكهین • ئهو خهته كۆنهی كـه ئاویستای پێ نووسراوهتهوه [واتا خهتی ئارامی كـه زمانه ئێرانیهكان پێیان نوسیوه] لـه سهردهمی داریوشی یهكـهم واتا كۆتایی سهدهی شهشهمی پێش زاینی ، پهیدا بووه[٧٢] • ههروهكو لهمهوبهر باسمان كرد گومانی بۆ ناچێ كه لـه هیچ چهرخێكدا ئاویستا بـه خـهتی بزماری نوسرابێتهوه • تهنانهت خـهتی بزماری لـه ئێرانی كۆندا [ئهگهر عیلامی لێ دهركهین] ههرچۆن بهراوردی بكهین له دوای سهدهی نۆیهمو بهرای زوربه تهنانهت له سـهدهكانی هـهشتهمو حـهوتهمی پێش زاینـیدا پـهیدا بووه • ئهگهرچی زۆر تر لهوه ئهچێ كه كۆنترین بهشهكانی ئاویستا له سهرهتادا به زارهكی لهمهوه بۆ ئهوو لهم نهوه بۆ ئهو نهوه گهیشتوه • [بهڵگهی تهواو بۆ سهلماندنی ئهمه به دهستهوهیه كه له سهردهمی نووسینهوهی كتێبی ویدودات، زهردهشتیهكان گاتا كانیان رهوان ئهكرد][٧٣] بهڵام ئهمه بۆ دیاری كردنی رهوتی ئهدهبی زمانی ئاویستا كارێكی تهواو نهبو ، چونكه یهكهم زخیرهی زمانهوانی گاتاكان ئهوهنده نیه ــ ئهگهرچی به ئاویستای بچوك نزیكه ــ لهگهل ئـهودا یهك نیهو جیاوازی لهگهل زمانی باسكراودا تهنیا بـه زۆری وشهكان دیاری ناكرێ • له لایهكی ترهوه لهوه ئهچێ وه ئهبێ بخرێته روو كه ئهگهر لـه سهردهمی پارتهكانا ئهدهبیاتی نوسین به زمانی ئاویستا بنوسرابایه وهیان خود تهنانهت سهر لهنوێ بنوسرایهتهوه[٧٤] ئهبوایه كه چهند ماوهیهك بـهر لـهو سهردهمه بهو زمانهی [ئاویستا] ئهدهبیاتی نوسین ههبایه • هـهرچۆن بێ لـه سـهردهمی پارتـهكانا زمانـهكانی [رۆژ ئاوای ئێران] [پارسیو پارتی] ــ وه رهنگ بێ له ریشهی زمـانی ئێرانیش ــ به شێوهی گشتی رێزمانی خۆیـان

تێك دابێت وە لە شێوەی [ئێرانی کۆن بە دەر بوبێت] وە بە شێوەی ئێرانی ناوەراستی لێ هاتبێ • لەو سەردەمەدا ئەگەر باس‌و روداوە ئەدەبیە نوسراوەکان نەبوبێت هیچ کەس توانای نەبوە شێوەی مردوی پاشگرەکانی ناوو کردارو شێوەی دەنگەکان [ دیفتونگ ]ەکان وشەی لە یەك چوی بەرامبەر بە یەك کە لە ئەدەبیاتی زمانی ئاویستادا بووە زیندوی بکاتەوە ••وە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زانیاری فراوان لە زەمینەی دەستوری جێ بەجێ کردن‌و مێژووی رەگەزی هیندو ئەوروپا پیدازۆر هەیە ، وە ئەم مەبەستەش تەنیا لە سەدەی رابوردودا بەدی‌هاتوە •

بەم جۆرە ئەنجامی هەمو ئەو نوسینانەی سەرەوە وەر ئەگرین [وە ئەم ئەنجام وەرگرتنانەش لەگەل باس‌و بەسەرهاتەکانی زەردەشت دا بەرامبەرن] نوسینی ئەدەبیاتی ئاویستا وە سەلماندنی بە هۆی نووسینەوە ئەبێ بەر لە تەشەنە کردنی فەرهەنگ‌و شارستانێتی یۆنان ــ واتا لە نێوان کۆتایی سەدەی شەشەم‌و دوایی سەدەی چوارەمی پێش زاینی ــ دەستی پێ کردبێ • [چونکە لە نووسینەکانی پادشایانی هەخامەنشی ئەو سەدەیە بە سەرەتای کۆتایی رێزمانی ناوبراو دیارە] • ئەم باسە ئەدەبی‌و ئاینیانەو زمانی ئەدەبی نوسراوی ئەو سەردەمە لە سەردەمی پارتەکانا وە تا رادەیەك رەنگ بێ لە سەردەمەکانی دواییدا دروست بوبن •

بەڵام لە بارەی مەسەلەی پەیدا بونی کۆنترین بەشەکانی ئاویستاوە بە شێوەی گشتی ئەبێ ــ بەر لە هەمو شتێك ــ بە پێی ناوەرۆکی باسەکانی گاتاکان‌و واقعیەتی بونی مێژوی زەردەشت ــ کە خۆی لەگەل مەسەلەی یەکەم دا پەیوەندی دارە ــ بیگرین بەدەستەوە ••بە شێوەی گشتی بۆ سەلماندنی ئەم باسەمان هیچ بەڵگەیەکمان نیە کە ئاویستای بچوك زەردەشت وەکو پیاوێکی ئەفسانەیی نیشان ئەدات کە لەگەل خەڵکی ترا بەسەر سوڕ هێنانەوە باسی ئەکات • بەڵام لە گاتا کانا مەسەلەکە بە شێوەی گشتی بە جۆرێکی ترە • گاتاکان دوعاو ئامۆژگارین کە لە زمانی زەردەشت ــ ئەو زەردەشتەی کە

واقعیەتی هەیە ـ ئەیگێڕنەوە .. زوربەری گاتاکان باسی بوونی ئەویان لـە زۆر شوێنا کردوە ......

بێینە سەر باسێکی ترمان ناوی ئەوانەی کە لە زەڕدەشتەوە نزیك بون بیان دەینە بەر سەرنج ماناکانیان لێك بدەینەوە [: ویشتاسب بـە مانا خـاوەن ئەسپی جـەنگی [یان کێوی] وە [فرشئوشتر] واتا خاوەن وشترانی ئازا ، وە ناوی گەلێك لە پیاوە ناسراوە مێژوییەکان بەم جۆرە بون . وەکو :ئەسپچن [بـە پێی نووسینەکانی هـرودوت : ئـەسـپ تینس Aspathines لە دەستو پێوەندەکانی داریوشی یـەکـەم کـە بە مانا [ئەسپ دۆستەکان] ئەگرێتەوە ، وە یان کوڕەکـەی پرکـس پس Preksaspes Prksaspa [؟] واتا خاوەن ئەسپی جوان . ناوی گئوماتای موغ کـە لـە دژی پارسـەکان یاخی بوو مـانای شـوانی ژیرە ، نـاوی [ هوگئو Hugau ] کە لە ئاویستادا هەیە [یشت xIII ، ١١٨] بە مانا خاوەن گای باش ، هەروەها چەند نمونەیەکی تر(٧٥) .

بەم پێیە ناوی زەڕدەشت ناوێکی ئاسایی ئێرانی ئەو سەردەمە بووە ، ئەمە خۆی ئەوە ئەگەیەنێ کە خاوەن ناو خۆی لە مێژوودا بووە . ئەگـەر ناوی ئەوو بونی ئەو شتێکی خەیاڵی بووبێت ناوەکەشی لە نێوان ناوە ئاینیەکان وەیان ئەو وشانەی کە ئاینی بون هەڵیان ئەبژارد .

بەڵام لـە بارەی ماناو ناوەڕۆکی گاتاوە ناتوانین بـە شێوەی تایبـەتیو دیاریکراو باسی لێوە بکەین ، چونکە لە بارەی لێکدانەوەی مانای گاتاکانەوە هێشتا گەلێك دورین . لە هەر زانایەکی ئاینی سەردەمی ساسانیەکان بگرین تاکو دانشمەندانی زمان شوناسیو زانستی زمانی سەردەمی خۆمان گاتاکان بە ئارەزووی خۆیان تەرجومە ئەکەن ، وە هەر مانایەك خۆی حەزی لێ بکات بۆی دائەنێ ، بەڵام تا ئیستە هیچ کامێك لەوانە بەراستی نەیانتوانیوە ماناکانیان لێك بدەنەوە . کریستیان بارتولومە کـە دانشمەندێکی گـەورەی رۆژ ئاواو

شارەزای زمـانی ئێرانی بووە بـەم جۆرەی نوسیوە : [ئەتوانین بلێین کـە گاتاکان ناڕەحـەت ترین شـێوەی زمـانی هینـدو ئـەوروپایـە][٧٦] ئـەو تەرجومەیەی کە خۆی هێنی گاتاکانی کردوە کەموکورتی تیایە ، بەم مانایە کە موتەرجم ویستویێتی ئەو ئامۆژگاری‌و دوعایانەی سەردەمی زۆر کۆنی بەشێوەی شوێنەواری فەلسەفەی تاریکی ئایدیالیستی ئالمانی لێك بداتەوە[٧٧] •

ئەتوانین بە ئاشکرا بلێین کـە ئیستەش بـە گەلێك شێوە گاتاکان لێك دراونەتەوە • لێکۆڵەردوەیەکی تازە نزیکەی لە ٢٠٪ لـە بەشی گاتاکان تێ گەیشتووە •

بەم جۆرە تێ ئەکۆشین تاکو لە بارەی گاتاکانەوە ئەوەی کە زۆرتر لـە ناسینەوە نزیکە باسی بکەین • گاتاکان بیسـت‌و دوو بەشن یان باشتر بلێین بیست‌و دوو باسە • کـە لـە کتێبێ [یسنا]دا وەکو بـەشێك لـە ئاویستا بـە دەستمان گەیشتووە ، وە لە ئاویستای تەواوی سەردەمی ساسانیەکان ، رەنگ بێ بەشێك لە [نسك] [ستوت یشت] بووە ، گاتاکان لە سەر کێشن وە لـە رووی بەحری کێشەکانـەوە پێنج دەستەیە • بـەم جۆرە : گاتا ئاهونوتی [یسنای xxvIII,xxxIV ]گاتای ئوشتوتی[یسنای xLvIxLIII گـاتـای سپنت مئینـو [یسنای xlvII-L ] ، گـاتـای وهو ـ خشـترە [ یسنای LI ] وە گاتای وهشتوایشتیش [یسنای LIII ]• هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد گاتاکان لە بارەی زمان‌و شێوەی تایـەتیەوە لـەگەل بەشەکانی تری ئاویستادا جیاوازن ، [جگـە لە ـ یسنای حەوت بەش ـ وە یسـنای xxxv - xLII هەندێ جێگای یشت]ەکان •

زوربەی سرودی گاتاکان شتێکە لـە نێوان دوعاو ئامۆژگاریدا • وەکو گفتوگۆ کردن لەگەل خوای گەورەدا کە هەندێك جار [ئاهورا ahura [واتا خواوەندو خـاوەن وەگیان] وەمزدا mazde [بـە مانا خیردمـەندو هوشمەند] وە هەندێك جار ئاهورامزدا ـ ahuramazda وەیـان مـزدا

ئـاهورا mazda ahure یان پێ وتوه • هەندێك لـە سرودەكان شـوێنی تایبەتیان هەیە وە بە شێوەی گفتوگۆو قسە كردنن ،بەم جۆرە چینەجۆربەجۆرە كاهنەكان ـ وەكو كویانو ئوسیجیانو كرپنیان(٧٩) دیسان دوژمنایەتی باوەڕ هێنەرەكانو گیـانی گا] یان ئـەكرد ، وە زەردەشت كـە قسـەی بۆ باوەڕ هێنەرەكان ئەكرد ـ مەزهەبی ئەو كاهنانەی ئەدایە دواوە •وە زاراوەی [دێو Daiva ] كە بە زمانی هیندی و ئـەوروپایی بـە [خوا] یان ئـەوت لـە فەرهـەنگی ئـەودا بـە خوای درۆو ئیبلیس و دیویان ئـەوت(٨٠) • هـەمو دوعاكانی زەردەشت هەموی روی كردۆتە ئاهورا مزداو ئارتای [راستی] كە مەبەست لە هێزی باوەڕی راستەقینەیە • جگـە لـە مانەش گاتاكان تـەنانەت لەحنەت گۆیی هەندێك لەو پاڵەوانانەی چیرۆكە ئەفسانەییەكان ئـەكات كـە هندیو ئێرانیـەكان رێزیان لێ ئـەگرتنو وە لـە دوایشدا زەردەشتیەكان رێزیان لێ ئەگرتن(٨١) •

ئامۆژگاری ئاینی زەردەشت زوربەی لە بەشی xxx [ سی یەم ]دا هەیە ، وە بریتییـە لـەوە كـە جیهان مـەیدانی بەربەرەكانێی دوو هێزی هاومافی وەكو یەكن • یەكەمیان چاكـە ، كـە ئاهورامزدا رابەری ئـەكاتو هێناویەتیە كایەوە [خوا ، یان گیانی ئازا] ئەوی تریان خراپەیە ، كە روحی پیس [ئانگهرو ـ مێنو] [بیر كردنەوەی پیس] رابەری ئەكات •

گیانی پیس هەمیشە لەگەل گیانی پاكدا لە بەربەرەكانێدا یە(٨٢) ئیتر لە گاتاكان دا زۆر رون نـەكراوەتەوە(٨٣) هـەروەهـا گاتاكان زۆر باسی ئاگر پەرستن ناكەن •

بەرای زوربە زوزبەی پەندو ئامۆژگاری و دوعای گاتاكان هەریەكەیان بە بۆنەیەكی تایبەتیەوە دانراوە • لە نوسراوەكانی سەرەوەدا ئـەم باسە بـە ئاشكرا دەر ئەكەوێ(٨٤) •

بەلام لەبەر ئەوە زەردەشت داكوكی لە سەر قازانجی ئەندامانی كۆمەڵ

ەکردو لە بارەیانەوە ئەدوا ، لەبەر ئەوە ناتوانین ئامۆژگاریەکانی گاتاکان بە [ئاینی هەژارەکان] یان [ئاینی کار] دابنێین • وە لەگەڵ ئەوەی گەورەی عەشیرەتەکان کە دژی زەردەشت بون ژمارەیەك لەوان دیسان بە بەشێك لە لایەنگرانی ئەو ناو ئەبران • وە لەو ناوەدا ئەتوانرێ بە [کۆی ویشتاسپ] ناو ببرێ • هەروەکو لە نازناوەکەیا دەر ئەکەوێ بە [ خواوەندی وڵات ] ناوی بردوە(٨٥) •

ئامۆژگاریەکانی زەردەشت هەروەکو بیروباوەڕەکانی تر ـ لەگەڵ ئەوەدا تا ڕادەیەك ئارەزوو ئاواتی خەڵکی تیا دابو [وە هێزو هۆی سەرکەوتنی ئەو هەر ئەوە بوە] •• زەردەشتیەکان رقەبەری ئەو هۆزانەیان ئەکرد کە ئاری نەبون(٨٦) • وە ئاهورامزدا گۆیا حەز بەبونیان ناکات ، ئەمە لە گاتاکانا نەختێك دیارییە(٨٧) • [یاسنا o.xxxIv ، ٥] بەڵام لە ئاویستای بچوکدا بە تەواوی دەر ئەکەوێ(٨٨) •

هەرچۆنی بێ ئامۆژگاریەکانی زەردەشت رەنگ بێ لە سەرەتاوە تا ڕادەیەك ئارەزوو ویستی تەواوی خەڵکی لەو سەردەمەدا کە زۆر هەستیان بە چەوساندنەوە نەئەکرد تیا خستۆتە روو •

ئایا لەوە ئەچێ لە سەردەمی سەڵتەنەتی هەخامەنشیەکاندا ئەم گاتایانە نوسرابیت ؟ هەرچۆن بێ بە پێی نووسینی گاتاکان دەوڵەتی کویو یشتاسب دەوڵەتێکی سەربەخۆو ئازاد بووە • وە بە پێی وتەی گاتاکان لە گەل دراوسێکانی خۆیا شەڕو شۆری کردوە • بەڵام باسی دەستگای دەوڵەتی ئەمپەراتوری گەورە ناکات • دیسان لە زخیرەی زمانەوانی گاتاکان دا بچوکترین شوێنەواری زمانی ئێرانی کۆن وزمانەکانی ئاسیای نزیك دەرناکەوێ وە لە ئەمپەراتورێتێکی وەکو کیشوەری هەخامەنشیەکان ئەبوا شتێکی بەم جۆرە هەبایە •• بەڵام وەکو دیمان [تەماشای لاپەرە ٧٠ بە دواوە بکە] مێژوی نووسینی گاتاکان ئەگەر لە دوای کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاینی دابنێین شتێکی دەستکردە • وە ئەبێ ئەوە بڵێین کە گاتاکان بەر

لــە سەردەمی هەخامەنشیەکان پەیدا بوون • وە ئەگەر لــە مادی رۆژهەلاتا نوسرابێ ــ ئەوە بەر لە دامەزراندنی ئەمپەراتوری ماد [لە سەدەی حەوتــەمی پێــش زاینی] دا بووە • وتمــان [پــەیدا بووە] وە نــەمان وت نوسراوە ! چونکە گومان ناکرێ لەو سەردەمەدا بۆ نوسینی ئەم شتەو بەم جۆرە خەتێك هەبوبێت • بەلام نابێت لەم روەوە بئالۆزێین ، گاتاکان رێکخراوە [هونراوە] بون وە بە ئاسان رەوان ئــەکران ، تەنانەت چــەندەها کات لــەدوای دانانی گاتاکان ، لەو رۆژگارەدا کە زمانی ئــەو هەموکەس لێی تێ نەئەگەیشتن ، باوەڕ هێنەرەکانو کاهنــەکان ناچار بون کــە گاتاکان لەبــەر کــەن ، بــەم هۆیەوەلەوە ئــەچێ گاتاکان لــە سەرەتاوە لــەبەر کرابن وە بــەم رێگایەوە ماونەتەوە وە بەم پێیەو لەبەر ئەمە مێژووی دانانی بەر لە پەیدا بوونی ئەلف بای ناوبراو بوبێت • نزیکترین مێژوو کــە بۆ پــەیدابونو دانانی گاتاکانی دابنێین ــ ئەگەر بــە هێنی ئاسیای ناوەڕاستی دابنێین ــ لە نیوەی یەکــەمی سەدەی شەشەمی پێش زاینی‌یە ،وە ئەگەر بە هێنی سەر زەمینی مادی دابنێین سەدەی هەشتەم وەیان سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ئەگرێتەوە •

لــە لایــەکی ترەوە ئــەو کۆمــەلایەتیەی لـــە گاتاکانا باسی کراوە ــ کۆمەلایەتیەکی ئەوتۆیە کەتا رادەیەك بە پێی رەوتی چینایەتی بووە • لــەو کاتەدا کۆمەڵ ئەوەندە پێ گەیشتو بووە کە تاڕادەیەك لــە ناوەڕۆکی پێچاو پێچی گاتاکان تێ بگەن • وەکو مادەکانی ئێران لە سەدەکانی دەیەمو نۆیەمی پێش زاینی رەنگ بێ لە جموجوڵدا بووبن ، وە بەم هۆیەوە نــەیان توانیبێ بگەنە ئەو رادە کاملەی پلەی کۆمەلایەتی • ئەبێ ئەوەش بلێین کە مێژووی پەیدا بوونی گاتاکان لە کۆتایی سەدەی نۆیەمو سەرەتای سەدەی هــەشتەمی پێش زاینی کۆنتر نەبووە ــ [لە کاتێکدا کە گاتاکان بە هێنی مادی رۆژهەلات بزانین] • بــەلام هــەروەکو نوسینەوەی گاتاکان بــەهێنی ئاسیای ناوەڕاســت بزانین ــ ئەبێت ــ ناچار مێژووی ناوبراوی ئــەم دوایــە نەختێك بگۆڕین •

بەم پێیە گاتاکان لە مادی ڕۆژهەڵاتو نێوان کۆتایی سەدەی نۆیەمو سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاینی نوسراوە • [وە ئەمە زۆر تر ڕێی تێ ئەچێ] وەیان لە ئاسیای ناوەڕاست [لە ناوچەکانی دەسەڵاتداریتی خوارزمو باکتریا ؟] بەر لە سەرەتای سەدەی شەشەم بووە • ئەو مێژووەی کە بە پێی بیروڕای ئێمە لە هەمو نزیکترە بەراست ٧٠٠ ساڵ بەر لە زاینییە •

ڕێگایەکی تر دیسان بۆ دیاریکردنی مێژووی پەیدا بوونی ئامۆژگاریە ئاینیەکانی زەردەشت هەیە وە ئەوە لێکدانەوەی گاهنامەو مێژوودانانی زەردەشتیە • چەندەها لێکۆڵەرەوە لەم بارەیەوە خۆیان خەریك کردوەو بیروڕای خۆیان دەربڕیوە[٨٩] • یەکی لەو مێژوو دانانە گرانەی زەردەشتی ئەمەیە : بە پێی وتەی [هنینگ][٩٠] زەردەشتیەکانی سەردەمی ساسانیەکان [سەرەتای مێژووی جیهان] کە بە پەیدا بوونی زەردەشت دەست پێ ئەکات لەگەل سەرەتای ساڵی ژمارەی سلوکیە [ساڵی ٣١٢ی پێش زاینی] کە لە بارەی پەیدا بونیەوە هیچ زانیاریەکیان نەبووە – بە یەکیان ئەزانین وە لە هەمان کاتا هاتنە دنیای زەردەشت بە ٢٥٨ ساڵ پێش لە ئەسکەندەری مەقدونی داناوە • لە ئەنجامدا لە مێژوو دانانی سەردەمی هاتنەدی شارستانێتیو فەرهەنگی یونانو ڕۆژگاری پارتەکان گەلێك لادانی هەیەو [بەم مانایە کە ئەم دوو سەردەمەیان بە کورت داناوە] ، هەروەها [هنینگ] تا ڕادەیەك لەو بیروڕایەدا بووە کە ئەم باسە کە زەردەشت ٢٥٨ ساڵ پێش لە ئەسکەندەر زیاوە ئەمە زۆر ڕاستە ، وە بەم هۆیەوە ئەویش شوێن نوسەرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کەوتوە ، سەردەمی ژیانی زەردەشت یان بە کۆتایی سەدەی حەوتەمو سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی داناوە[٩١] • [هنینگ سێ مێژوو بۆ سەردەمی ژیانی زەردەشت باس ئەکات ـ ٥٥٣ ـ ٦٣٠ ، ٥٥١ ـ ٦٢٨ ، ٥٤١ ـ ٦١٨ی پێش زاینی ، وە ئەم سێ مێژووە بەو پێیەیە کە ئایا ساڵی ٢٥٨ بەر لە ئەسکەندەری مەقدونی سەرەتای کام پلەی چالاکی

زەردەشت ئەکات • سەرەتای بانگەوازەکانی یان سەرەتای سەرکەوتنەکانی یان ئەو سەردەمەی کە ویشتاسب باوەڕی بە ئاویستا کرد ؟] • بە بیروڕای ئێمە لەوە ئەچێ کە کیاکسار وە رەنگە بێ ئەوانی بەر لەویش پەیڕەوی ئامۆژگاریەکانی زەردەشتیان کردبێ •

بەو جۆرە ئەو مێژووانەی کە هێنێک نوسیوێتی لە راستیەوە نزیکترە ، جگە لەوەش هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نیە کە مێژووی سەردەمی ژیانی زەردەشت [واتا ٢٥٨ ساڵ بەر لە ئەسکەندەر] بسەلمێنێ • وە رەنگە بێ وەکو مێژووەکانی تر سەری حیسابیان راست کردۆتەوە و کەرتەکانیان لابرد بێ ، وە لە ئەنجامدا گوایا ویشتاسب ٢٥٨ ساڵ پێش ئەسکەندەر ئاینی زەردەشتی پەسەند کردوە • ئەگەر بە پێی ئەو باسانە زەردەشت لەو سەردەمەدا تەمەنی ٤٢ ساڵان بو بێت ئەوە وا ئەگەیەنێ کەوا سێ سەد ساڵ بەر لە ئەسکەندەر لە دایك بووە • ئەمە مێژوو یەکە کەرتەکانیان لابردوەو حیسابەکەیان پێ راست کردۆتەوە • بە وتەیەکی تر هەڵبژاردنی ژمارەی سێ سەد ساڵ بەر لە ئەسکەندەر کە گوایا زەردەشت لەو کاتەدا لە دایك بووە ، بۆ ئەوە نیە کە ژمارەی ٢٥٨ ساڵ کە لەبەری نێوان مێژووی پەسەند کردنی ئاینی زەردەشتە کە ویشتاسبو ئەسکەندەر پەسەندیان کردوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ماوەی ٢٥٨ ساڵ لە نێوان یاسای ویشتاسبو ئەسکەندەر ئەوە ئەگەیەنێ کە زەردەشت ٣٠٠ ساڵ بەر لە ئەسکەندەر لە دایك بووە • ئێمە تەنیا ئەتوانین ئەوە بڵێین کە زەردەشت بە پێی ئەو باسو سەرچاوانەی کە هەیە نزیکەی سێ سەد ساڵ بەر لە ئەسکەندەر واتا لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا ژیاوە • وە ئەگەر ئاسیای ناوەراست بە شوێنی نیشتەجێو ژیانی زەردەشت بزانین ئەمە هەمان مێژووە کە ئێمە لە رێگایەکی ترەوە بە دەستمان هێناوە •

هەرچۆن بێ ئەبێ ماوەی سەردەمی دیاریکراو لە بارەی بایەخی بلاو

بونەوەی ئامۆژگاریەکانی زەردەشتەوە بخەینە بەرچاو .

لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی[٩٢] ئەبینین کە موغەکان لە دەرباری پادشایانی ماد وەکو نوماینده‌یەکی ئاینی بایەخیان پەیدا کردبو[٩٣].

بەڵام ئایا ئەتوانین بڵێین کە ئاینی زەردەشت بەو شێوەیەی کە لە گاتاکانا باسی کراوە لە لایەن دەوڵەتێکی وەکو دەوڵەتی مادەوە بە رەسمی ناسراو بێت ؟ وە ئایا موغەکان یان کاهنە رەسمیەکانی شانشینی ماد ئەم جۆرە ئامۆژگاریانەیان گەیاندوە ؟ وە تەنانەت لەوەش بەولا تردوە دەوڵەت لەو کاتەدا گەلێك پێویستی بە ئاینێکی ئاوا هەبوە .

چۆنێتی لە گەلێك روەوە لەگەل باری ناوخۆی شانشینی یەهودەکانا لە سەدەکانی دەیەمەوە تاکو هەشتەمی پێش زاینی وەکو یەك بوون . بەو مانایە کە رێکخستنی کۆمەلایەتی لاواز بوبو ، گەورەو سەرەك عەشیرەتەکان ئاینە ناوچەییەکانیان ئەکرد بە ئالەتی دەستیانو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان ئەهێنا . ئەندامانی کۆمەڵیان هەژار خستبوو ، ئەو چۆنیەتیە لەوێدا [لە سەرزەمینی یەهودا] بوو بە هۆی ئەوە کە پێغەمبەرەکان لە دژی دەسەلاتی عەشیرەتگەری سەرەك عەشیرەتەکانو ئاینە ناوچەییەکان راپەڕنو ئاینێکی یەکگرتو لە لایەن هەمو دانیشتوانەوە بپەرستن ، لە لایەکی ترەوە دەسەلاتو توانای شانشینی کە دەسەلاتی پیاو گەورەکانی عەشیرەتی تیا حوکمڕەوا نەبو حەزیان لێ نە ئەکردن .

بەم جۆرە ئەو پادشایانەی کە لە لایەن سەرەك عەشیرەتەکانەوە دیاری نەکرابون بوونە هاو پەیمانی راپەڕینی پیغەمبەرەکان .

ئەم هاوپەیمانیەتیە ئاینە ناوچەییەکانو پەرستگاکانیانی لەناو برد وە ئاینێکی یەکگرتوو هاتە کایەوە .. بە تایبەتی کاهنەکانی ئورشلیم کە رێکخراوێکی خێڵەکیانەیان هەبو لە ساڵی ٦٢٢ی پێش زاینی دا لە دوای گەڕانەوەی یەهودیە دیلەکانی بابل کە لە بابل گیرابون لە سەردەمی

هەخامەنشیەکانا هەموویان پەیڕەوی ئەم ئاینەیان کرد •

ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە لە پلەی سەرەتایی کۆمەڵگای چینایەتیدا ، هەمیشە پیاو گەورەکانی عەشیرەت ـ واتا پێشەوایانو کاهنەکانو هینی تر ـ کە لەناو ڕێکخراوی کۆمەڵگای سەرەتاییدا پێ گەیشتبوون ـ لەناو قەوارەی چینی دەسەڵاتداری تازەدا بوبون بە لێ پرسراوو کاربەدەستو قسە ڕەوا • لە بەشی خواروو [لە بین النهرین] ئەم بارە چەند سەدەیەکی بردە سەر تاکو گیروگرفتی دامەزراندنی ئەمپەراتوریێتی گەورە چارەسەر بوو ، وە ئەمەش بوو بە هۆی بەربەرەکانی گەورە پیاوانی سەرەك عەشیرەتە ناوچەییەکانو خوێن ڕێژیەکی زۆری تیا کرا • لەمیسر سەرەك عەشیرەتە ناوچەییەکان لە سەردەمی شانشینی ناوەڕاستدا ـ واتا هەزار ساڵ سەرەتای کۆمەڵگای چینایەتی ـ لەناو بران • لە فەلەستین ئەم کارە لە ساڵەکانی ٣٠٠ ـ ٢٠٠ ساڵ سەری گرت بەڵام لەوێ مەبەست یەکگرتنی زەوی‌و زار بوو لەبەر تەنگەبەری شوێنەکەیان • بەڵام لە سەرزەمینی ماد ـ مەرجی پێویست پاراستنی ئەو ئەمپەراتوریێتە گەورەیە ئەوە بوو کە لە کورت ترین ڕۆژگاردا یەك بگرن ـ ئەوەی لە سەردەمی [شار ـ دەوڵەتە] بچوکەکانا گونجا [ئەو شارو ـ دەوڵەتانە] بوو کە لە ناوەڕاستی وڵاتەکەدا نیشتەجێ بونو چوار دەوریان خەڵکی کۆمەڵگای سەرەتایی بوون • [هەروەکو لە ڕۆژگاری زوودا لە ـ بین‌النهرین ـ و میسردا وا بوون] لە سەدەی حەوتەمو شەشەمی پێش زاینی سەری نەگرت • لەو کاتەدا دەوڵەت ئەبوا لەگەل ئەمپەراتوریتیەکی گەورەدا بوایە وەیان هەمیشە لە شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەدا بوایە • ئەمپەراتوریێتی ئاشور بە شێوەی یەکێتی سەربازی‌و ئیداری هۆزە جۆربەجۆرەکان بە شێوەی گشتی تەنیا لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی‌و دوای ئەوە هەزار ساڵ بە شێوەی کۆمەڵگای چینایەتی ژیابوو ـ ئینجا دامەزرا • دەوڵەتی بابل ئەویش هەروا مێژوویەکی کۆنی هەبو • بەڵام ماد ئەگەر بی ویستبایە لە کەناری ئەم جۆرە دەوڵەتانەوە بە مافێکی هاو شانی بژیابایە ئەبوا

لەو سەردەمەدا کە تازە پێی نابووە کۆمەڵگای چینایەتیەوە ببوایە بە ئەمپەراتۆرێتێکی گەورەی رێك و پێك وە سیاسەتی قەلاچۆ کردنی گەورە پیاوە ناوچەییەکانی بگرتایەتە پێش •

ئەوەی لەگاتاکانا باسکراوە بە بەشترین دروشمی ئاینی دائەنرێ ، وە بێ گومان لە دەرباری پادشایانی مادا موغەکان ئەم جۆرە بیروباوەڕانەیان بە خەڵکی ئەگەیاند •• ئەگەر ئامۆژگاری گاتاکان سودی گشتی خەڵکە ئازادەکانی تیا بوایە ، ئەبێ ئەوەمان لە یاد بێ کە چۆنێتی کۆمەڵگای ناوبراو وەها بووە کە حکومەتی پادشایی ئەیتوانی لەگەڵیا بگونجێ • نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە خەڵکی ئازادی کۆمەڵگای ئەو سەردەمە لەگەڵ رەعیەتەکانی سەردەمی فیوداڵەکان جیاوازی زۆریان بووە ، وە بەلای کەمەوە لە سەرەتای کۆمەڵگای کوێلە داری دا بە هاوکاری کوێلەدارەکان کۆمەڵێکی ئازادانیان دروست کردوە •

بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین کە موغەکان ــ یان وردتر بڵێین ــ کاهنەکان [ئاترون] هۆزی موغەکان ئامۆژگاری گاتاکانیان هێنایە دەرباری مادەوە ، وە دەرباری ناوبراو ئەو یاسایەی کرد بە رەسمی •

بەلام ئەو یاسایە لە گەڵ ئەو ئامۆژگاریانەدا کە لە گاتاکانا ئەی خوێنینەوە جیاوازن •• جگە لەوە ئەو شتانەی کە سودیان بۆ خەڵك هەیە وەکو : خاك و ئاو و ئاگر گەلێك بایەخیان پەیدا کرد[٩٤] • وە لە ئەنجامدا ئامۆژگاری ئاینی ناوبراو لە وێدا جێگاو ناوێکی تایبەتی بۆ خۆی پەیدا کرد[٩٥] •

پەرستنی خوای تر ــ جگە لە ئاهورامزداو [شتە پیرۆزە جاویدانیەکان] وە بە تایبەتی پەرستنی میتراو ئاناهیتا لە سەردەمەکانی دوای زەردەشتیەکان پەیدا بووە ، وە هێشتا لەو کاتەدا لەوێ باوی نەبوبوو •

بە پێی وتەی هرودوت ــ موغەکان لەسەردەمی ئەوا [وەرەنگ بێ

هەندێك بەرلەو] بایەخیان بە ئامۆژگاری [مزدیسنی] زورتر ئەدا •

هرودوت [ I ، ١٣١] لـەبارەی پارسەکانەوە کـە لەبارەی ئاینەوە گوێ رایەڵێ موغەکان بون بەم جۆرە ئەڵێ : [دروست کردنی بت و کردنەوەی پەرستگاو قوربانی گاکان بەلای ئەوانەوە رەوا نیە •• بەڕای من ئەوان خوای خۆیان وەکو ئادەمزاد نیگار ناکێشن ، بەپێچەوانەی یۆنانیەکانەوە ، نەریتی ئەوان بەم جۆرە بووە کە لەسـەر چیا بـەرزەکان قوربانیان بۆ زئوس [واتا خوای خواکان] ئەکرد • وە هەروەها قوربانیان بۆرۆژو مانگ و خاك و ئاگرو ئاوو هەوا ئەکرد • وە هەمیشە لە رۆژگاری کۆندا قوربانیان بۆ ئەم خوایانە ئەکرد](٩٦) • پارسەکان مردویان نەئەخستە ناو گۆڕەوە مەگەر کاتێك باڵندە یان سەگ لەتی بکردایە • بەلاّم من دڵنیام کە پارسەکان مردوەکانیان مومیایی ئەکردو ئینجا بەخاکیان ئەسپارد(٩٧) • موغەکان بەدەستی خۆیان هەمو گیان لەبەرێکیان جگـە لەسـەگ و ئادەمیزاد ئـەکوشت وە کوشتنی مـارو میروو گیان لەبەرە وردە زیانە خرۆکانیان بە کارێکی باش ئەزانی • هرودوت ئەڵێ پارسەکان رێزی گیانی باب و باپیرانی خۆیانیان ئـەگرت • ئەوانـەی [خوای شایانیان] پێ ئەووت [ III ، ٦٧] هەمان فرورتی یەکانن کە لە [ یسنای حەوت بەشدا] باسیان کراوە •

ئەو باسانەی کـە لـە نوسینەکانی هرودوت گێڕامانەوە لـەزۆر روەوە ـ ئەگەر چاوپۆشی لە هەندێك بابەتی سەرپێیی بکەین ـ لەگەڵ نووسینەکانی [یسنای حەوت بەشدا] لەیەك ئەچن • وە هەندێك جێگاشی لەگەڵ بەشەکانی دوایی تری ئاویستادا لەیەکەوە نزیکن • ئەو باسـەی کـە لـە هیردۆتەوە بەجێماوە کونترین سەرچاوەیە کـە لـە بارەی رۆژگاری زەردەشتیەکانەوە گرنگ بێ • بـەو مانایە کـە مردوەکانیان بـەدارەمەیتەکانەوە دائـەنا تاکو پەڕەندەو سـەگ بیان خواردنایـە وەتەنیا ئیسقانەکانیان ئـەخستە گۆڕەوە • ئەمە نیشانەی رێزگرتنی ئادەمیزادی ئەو کاتە بووە(٩٨) • لەگـەل ئەوەشدا

ئـەگـەر لـەكاتی نووسینەوەی کتێبی [ویدودات](٩٩) ئاویستا مردو ناشـتن وەیان سووتاندن بەگوناهێکی گەورە بزانرابایە ـ لەسەردەمی هەخامەنشیەکانا ئەم نەریتی زەردەشتیانە هێشتا زۆر باوی نەبوە تەنیا هـەندێك لە موغەکانو پارسیەکان نەبێ ئەوانیش بە دزیەوە ئەم نەریتەیان بەجێ ئەهێنا • هەروەکو سەرچاوە کۆنـە شـوناسیەکان نیشانی ئـەدەن مردویان لـەناو تابوتی تایبەتیا کە لە کان [مەعدەن] دروست ئەکران ئەنایە خاکەوە(١٠٠) •

کوشتنی جانەوەری زیانبەخش [خرافسترا xrafstra ] بـەپێی نوسینی ئاویستای بچوك بەبەربەرەکانێی خراپە ناونراوە ، وە ئەمەیان بە پیشەی پیاوچاکان داوەتە قەڵەم(١٠١) •

لەنوسینەکانی هرودوتدا دیسان هەندێك نووسراوەی تازەبابەت هەیـە کە ئەوانە لە [یسنای حەوت بەش] دا نیە ، بەڵام لە ئاویستای بچوکدا هەیە • راستە کە لە [یسنای حەوت بەش]دا دیسان لەبارەی رێزگرتنی رۆژەوە هیچ باسێك نیە [بەڵکو ئەو خوایەی کە لەسەرەتاوە بەرۆژ ناوبراوە ـ واتا میترا ـ رێزی لێ گیراوە] ، بەڵام ئەڵێت کە رۆژ ـ چاوی ئاهورا مزدایە [وە ئـەمە خۆی قسەکانی هرودوت ئەسەلمێنێ کـە خوای خوایانو رەواقی ئاسـمانیان بەیـەك زانیوە] • جگـە لـەمـانـە روژو مـانگیان بـەلایـەنی چاکـەو بەربەرەکانی کەری خراپە داناوە وە با یان هەوا [ڤیو vaya ] لە ئاویستای بچوکدا بەگرنگ باس کراوەو بایەخی پێدراوە •

بەوتەی هرودوت پارسیەکان قوربانیان بو موغەکان ئـەکرد وەسرودی تایبـەتیان پیـا ئـەخوێندنەوە(١٠٢) گاوگۆتاڵیان ئـەکرد بـە قوربانی [هرودوت I ، ١٣٢] •

جگە لەمانەش لە هەندێك کاتو شوێنی ترا لەبارەی قوربانی یەوە دواوە، ئەڵێ : خشایارشا هەزار گای کرد بە قوربانی بۆ ئاتەتروا[ vII ، ٤٣] وە موغەکان ئەسپی سپییان ئـەکرد بـە قوربانی بۆ روباری [ئاستریمون] لـە فراکیە [ vII ، ١١٣] •

[وێنەی یەکێك لە موغەکان کە کارژۆ لەیەکی بەباوەشەوەیەو ئەیبات بیکات بەقوربانی لەناو نەخشە هەڵکەندراوەکانی ئەستێلكدا دۆزراوەتەوە •• وێنەی ژمارە -٦٩- وە -٦٧- هەم تەماشاکە](١٠٣) •



**موغێك کارژۆلەیەك ئەبات بیکلت بە قوربانی ، لە روی نەقشێکی هەڵکەندراوی ئەستێلك گیراوە ـ سەدەی پێنجەمی پێش زاینی ـ**

هەندێك جار بۆ خوای ژێرزەمین کە پێیان وتوە [ دیوان ] ئادەمزادیان ئەکرد بە قوربانی هرودوت بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەرکی لێپرسینەوەی راستی ئەم باسە نوسیویە ئەڵێ : [بیستم کە ئامستریدا ژنی خشایارشا لە شوکرانە بژاردنەوەدا فەرمانیدا کە دو حەوت نەفەر لەجوانانی گەورە زادەکانی پارس لە پیناوی خوای ژێرزەمینیدا بخەنە گۆڕەوە] هەرچۆن بێ بە وتەی هرودوت پارسەکان لەفراکیە ٩ کچو ٩ کوڕی لاویان بەناوی قوربانیەوە نایە گۆڕەوە [ vII ، ١١٤] هرودوت موغەکان بە قوربانی کردنی ئادەمیزادەکان تاوانبار ناکات تەنیا پارسەکان بەگوناهبار دائەنێت • پارسەکانی سەردەمی هەخامەنشیەکان هێشتا بە پێی ئامۆژگاری

ئاینی مزدی یسنا نەئەڕۆیشتن ، لەدوایی‌دا لەم رووەوە بەڵگە دێنینەوە •

قوربانی کردنی گاوگۆتاڵ یەکێکە لەمەرجە تایبەتیەکانی ئەم دوایەی سەردەمی زەڕدەشتیەکان • لەگەڵ ئەوەدا گاوگۆتاڵ بەکۆمەڵ کوشتنی لەگاتاکانا قەدەغەکراوە ، بەڵام ئامۆژگاری ناوبراو قوربانی گاوگۆتاڵ ناداتە دواوە • هەروەکو ئەو گاوگۆتاڵەی کە زەڕدەشت لە بەشی XLIV یسنادا باسی لێوەکردوە ، رەنگ بێ ئەوە بۆ قوربانی بووبێت • لەزۆر جێگای بەشە تازەکانی ئاویستادا باسی قوربانی گاوگۆتاڵ کراوە • هەروەکو قوربانی ١٠٠ ئەسپ و ١٠٠٠ گاو سەد هەزار مەڕ باس کراوە• [یشت V ، ٢١ ] ئەمە پێچەوانەی وتەی هرتل و ئەوانی ترە ــ موغەکان کە بە بیروباوەڕی ئەوان ئامۆژگاری رەوشتی سەرەتاییان گۆڕیوە شتێکی تریان لەجێگای دانابێ نەبوە ، بەڵکو رەووشتێك بووە کە لە کۆمەڵگادا باوبووە •

بەداخەوە نوسراوە ئەسڵیەکانی رۆژهەڵاتی سەردەمی هەخامەنشیەکان لەبارەی ئاینی ئەو رۆژگارەی ئێرانەوە هەندێك زانیاری نە سەلمێندراومان ئەخەنە دەست • بەڵام ئەم وتەیە راستە کە لەو نوسینانەدا ئاهورامزدا خوای گەورەیە و لەلای ناوی ئەو ناوی خواکانی تریش براوە • وە ئەمەش ئاشکرایە کە خشایار شا زۆر رێزی ئاهورامزدا وە [ئارتای پیرۆز]ی گرتوە • [ئارتا = عەدالەت] کەمرون(١٠٤) ، نوسەرەوەی نوسراوە ئابوریە عیلامیەکانی ئەستیلك [کە بە ئەندازەی پێویست رۆشن نین] لەو باوەڕەدایە کە بەپێی ئەو نوسراوانە موغەکان لەپارس [پرسید] شەرابیان بەپیروزی و شانازی خواکان دائەنا • [دیسان هرودوت لەم بارەیەوە ئەڵێ VII ، ٤٣] ئەم نەریتە پێ یان ئەووت زئوثر وەئاویستای بچوك زۆر رێزی لێ گرتوە • ئەمە خۆی شتێکی تایبەتی یە لەناو کۆمەڵی زەڕدەشتیەکانا باوبووە(١٠٥) •

ئەتوانین بڵێین کە پارسیەکانی سەردەمی هەخامەنشیەکان زۆر پەیڕەوی ئامۆژگاری موغەکانیان ئەکرد • بەڵام وەکو پێویست هێشتا بەپێی یاسای

ناوبراو نەیان ئەتوانی بجولێنەوە • وە ئامۆژگاری موغەکان لەو سەردەمەدا بریتی بووە لەناوبەناوی گاتاکان و بەتایبەتی [ یسنای حەوت بەش ]و ئامۆژگاریەکانی ئاویستای بچوك •

بەم هەمو شێوەیەوە ئەگەرچی بوونی میژوویی زەردەشت[١٠٦] مان سەلماند بەلام هێشتا ناتوانین ئامۆژگاری موغەکان لەسەردەمی دیوکی یەکانی ماد وەیان ئێرانی سەردەمی هەخامەنشیەکان کە رەواجی بووە بە هینی زەردەشتیەکانی دابنێین •

ئامۆژگاریەکانی موغەکان لە سەدەی هەشتەمەوە تا سەدەی شەشەمی پێش زاینی رێبازێکی دیاریکراوی ئاینی بووە بەلام جیاوازی لە نێوان ئایندارێك و بێ ئاینێکدا وەیان لەگەل یەکێکی ترا نەبوە • وە بەلگەش بۆ ئەم وتەیە ئەوەیە کە پارسەکان لەگەل ئەوەشدا کە بە رابەری ئاینی موغەکانیان قایل بون و لە سەری ئەرۆیشتن [پارسەکان بە بێ ئامادەبونی موغەکان قوربانیان نەئەکرد] ـ هەروەکو لەمەوبەر دیمان ـ لە زۆر شوێن و کاتدا گوێ یان بە ئامۆژگاری موغەکان نەئەدا[١٠٧] •

ف• ئینگلز بەم جۆرەی نوسیوە : [ئاینە کۆنەکانی هۆزەکان[١٠٨] کە بە شێوەیەکی سروشتی پەیدا بوون لەسەر رێبازێکی رێکخراوو راگەیاندن نەبون ، وە ئەو تیرەو هۆزانەی کە پەیرەوی ئەو ئاینەیان ئەکرد لەگەل نەمانی سەربەخۆیی یانا ئاینەکەشیان لەناو ئەچوا[١٠٩] لە شوێنێکی ترا ئەم نوسیویە [هەمو ئاینەکانی سەردەمی کۆن سەرەتایی و هۆزایەتی بون و دوای ئەوە ئاینە میللی یەکان بەپێی مەرجی کۆمەلایەتی و سیاسی هەر میللەتێك پەیدا بوون ، وە لەگەل ئەو میللەتەدا جۆشیان خواردوە • وە هەر کاتێك دەسەلات و پایەی ئەو میللەتە لە ناو ئەچو شێوەی کۆمەلایەتی و میرات و رێبازی سیاسیان ئەروخاو سەربەخۆیی میللی یان لەناو ئەچو ، ئاشکرایە ئەو ئاینەی کە پەیوەندی بە بنچینەی کۆمەلایەتی ئەو میللەتەوە هەبوە ئەویش لەناو ئەچو[١١٠] •

ئامۆژگاریەکانی زەردەشت‌و موغەکان هێڵێکی ناوبەینی بوو لە نێوان ئاینە کۆنەکانی هۆزو تیرەکاندا ، کە لە خۆوە بە شێوەیەکی سروشتی پەیدا بوبون ، وە لە نێوان ئاینەکانی دوایی تردا • کۆمەڵگای مادو باکتریاو پارس لەو سەردەمەدا تازە لە رێگای کامڵ بونی چینایەتیەوە هەنگاویان نابو،هۆزەکان هێشتا لە قۆناغی گورین‌و خۆ کامڵ کردنابون •

بەم جۆرە ئاینی زەردەشت هێشتا نەی ئەتوانی وەکو ئەو ئاینە بێ کە لە سەردەمی کۆمەڵگای خاوەن کوێلەکانا هەبو • بەڵام لە هەمان کاتا ئەو ئاینەی [کە بە شێوەی سروشتی پەیدا بووبێت] نەبو بەڵکو بە ئامۆژگاری ناو ئەبرا کە ئامۆژکارە ئاینیەکان بڵاوین ئەکردەوە وە پەیرەویان ئەکرد •

بۆ ئەوەی ئەم ئاینە ببێتە ئاینێکی رەسمی ئەبوا دەوڵەت کۆششی زۆری بکردایە •• ئەو بیروراریانەی گئوماتای موغ‌و خشایارشا کە لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا پەرستگا ناوچەییەکانی خواکانی هۆزەکانیان وێران کرد ، هەمان بیرورا لە کاتی پادشایی مادەکانیشا هەبو(١١١) •

بەم جۆرە ، لەبەر ئەوە موغەکان لە بارەی بیروڕاوە لەگەل ئاینەکانی ترا نەئەگونجان وە زۆر هەوڵیان ئەدا ئەو ئاینانە سنور بەند بکەن [ئاینی مزدیسنا] لەو سەردەمەدا بە تەواوی پێچەوانەی ئاینەکانی تر نەبووەو نەی ئەتوانی بێ • وە هێشتا هیچ بایەخێکی لە ناوچەکانی ئەو دیوی دەشتەکانی ئێران [وەکو ئازربایجان‌و ئەرمەنستان‌و کاپادوکیە ـ کە لە بارەی پێشکەوتنەوە تاڕادەیەك لێ یانەوە نزیك بو] بایەخی نەبو ، بەڵام لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا لەو ناوچانەدا بایەخی بووە • ئەگەر گیروگرفتێك بهاتایەتە رێگای ئەو ئاینانەی کەلە [مزدیسنا] جیاواز بون لەناو سنوری کیشوەرەکەی خۆیانا ـ وە لە واقیع دا ـ روبەروی ئایندارە سیاسیەکان ئەبووەوە ـ ئەوانەی کە هەوڵی بەربەرەکانی‌و سەرکەوتنیان ئەدا • بەم جۆرە ئاینە جۆربەجۆرەکان لە بنەڕەتەوە بەربەرەکانی‌ی یەکتریان نەئەکرد •

خەڵك‌و هۆزەکانی بەر لە زەرپدەشت بەرە بەرە ئاینی زەرپدەشتیان پەسەند کرد ، چونکە ئاینی زەرپدەشت لەگەل رەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەدا ئەگونجا •

ئەوانەی باسمان کرد هەموی لە بارەی ئاینی سەرزەمینی مادەوە راستە • لەو سەردەمانەدا بە پیت‌و بەرەکەت ترین زەوی‌و زاریان بۆ پەرستگاکان‌و موغەکان تەرخان ئەکرد[١١٢] ، بەم جۆرە پەناگایەك بۆ ئاین‌و ئامۆژگاریە ئاینیەکان هاتە دی‌و بوو بە بنچینەش بۆ دوارۆژ •

دیسان چەند قسەیەك لە بارەی مێژووی ـ ئاویستا ـ وە بەو جۆرەی کە لەگەل بیروڕای ئێمەدا ئەگونجێ باس ئەکەین‌و ئەم باسەش کۆتایی پێ دێنین •

پیشکەوتنی ئامۆژگاری‌و یاسای [ مزدیسنا ][١١٣] لە سەردەمی هەخامەنشینەکانا لە دولاوە هاتە دی •• لە لایەکەوە ئەم ئاینە لەناو زوربەی خەڵکەکەدا بلاو بۆوە بیروباوەڕو ئاینە کۆنەکان کە زوربەیان لە [گاتا] کان کۆن تر بون ، خۆیان لە خۆیانا توانەوە •• لە دوای داگیر کردنی ئەمپەراتوریتی هەخامەنشیەکان لە لایەن ئەسکەندەرەوەو هاتنی ئاینە یۆنانیەکان بۆ ناو خاکی ئێران وە کۆتایی شیرازەی سەرزەمینی پێشووی هەخامەنشیەکان‌و دابەشکردنیان بەچەند دەوڵەتێکی بچوك [ بت پەرستی ] شان بەشانی ئامۆژگاریەکانی زەرپدەشت بە توندی مایەوە[١١٤] • ئەو شوێنەوارەی کە لەو سەردەمەوە ماوەتەوە هەمان سرودو چیرۆکە ئەفسانەییەکانی ئاویستای بچوك یان [یشتەکانە] کە ئەمانەش باسەکانیان زۆر کۆنن •

لە لایەکی ترەوە لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا ئامۆژگاریەکانی زەرپدەشت تێکەڵ بە بیروڕای فەلسەفی بوو ، بەتایبەتی بوبە بنچینەی بەریەرەکانی نێوان چاکەو خرایە وە بە شێوەی ئامۆژگاری [زروان]یان [ئاکران][١١٥]ی •• [ Zrvan akarana ] بوو • هەردو هێزی وەکو یەکن ، وە هەریەکەیان

سێ هەزار ساڵ لەناو خەڵکا فەرمانیان کردوە[١١٦] وەسێ هەزار ساڵ ئەبێ بەرامبەر بە یەك بەربەرەکانی یەکتر بکەن • هەر راست خوایەك ئەبێ هاوکاری لەگەل چاکەدا بکات[١١٧] • هەروەکو [ بنونیست ][١١٨] سەلماندوویەتی پلوتارك بە شوێن رێچکەی نووسینەکانی [تئوپومپ] نوسەری سەدەی چوارەمی پێش زاینی کەوتووەو لە بارەی ئەم ئامۆژگاریانەوە نوسیویەو ئەوانەی بە ئامۆژگاری [موغەکان] داناوە[١١٩] •

لە کۆتایی سەردەمی پارتو سەرەتای سەردەمی ساسانیەکانا یاساکانی ئاویستا[١٢٠]و ئامۆژگاریەکانی زەردەشت زۆر بە رێزەوە بلاو بۆوە ، ئامۆژگاریە فەلسەفیو ئاینیەکانی [زروانی] لەناو برا •• ئاینی زەردەشتی بە گەرم پێشوازی لێ کراو بە وردی رێکخرا ، بە پێی ئەو یاسایە چاكو خراپ لە یەك جیا ئەکرایەوە ، کتێبی ویدودات [ یاسای دژی دێوان ] باسی ئەم مەسەلەیە ئەکات • بیروڕای زروانی ـ یەکان تەنیا لەناو مانیو ئەو ئامۆژگاریانەی ترا مایەوە کە بە کوفرو بەد ئاینی ناو ئەبران •

ناچار بوین بە دورو درێژی باسی مێژووی ئاویستاو ئامۆژگاریەکانی بکەین لە مەبەست دور کەوتینەوە ، بەلام ئەمەش پێویست بوو ، چونکە رون کردنەوەی فەرهەنگی تایبەتی رەسمی پادشایی ماد پێویست بو •• بە تایبەتی کە ئەم باسەش سەری گلۆلەکەیە • لە کۆتایدا ئەتوانین ئەم پوختەی خوارەوە بەدەس بێنین • لە دەورو بەری سەردەمی دامەزراندنی پادشایی مادداو پەیدابونی ئەو ئەمپەراتۆرێتە گەورەیە ـ ئامۆژگاریەکانی [مزدیسنا] کە لە گاتاکان دەر هێنرابون وە بە هێنی زەردەشتیان دائەنا ـ لەو سەرزەمینەدا گەلێك بایەخی بووە • ئامۆژگاری ناوبراو بەزمانی ئێرانیو بە هۆی کاهنەکانەوە ئەو ئامۆژگارانەی کە لە هۆزە ئێرانیەکانو رۆژهەلاتی ماددا هەبون بلاو بۆوە • ئەو ئامۆژگاریانە هەر هەمان ئامۆژگارین کە لە یسنای XXX [لاپەڕە ٤٧٤ بە دواوە]وە یسنای حەوت بەش [لە لاپەڕە

٤٨٢-٤٨٣] دا هەیە ، هەروەکو [لە یەسنای XLVI دا هاتوە] • بەلام هەندێك لە بەشەکانی کە تەنیا لە ئاویستای بچوکدا هەیە لە [یشت]ەکان و تەنانەت لە [ویدودات] لەو سەردەمەدا هەبوە • ئامۆژگاری موغەکان زۆر پشتیوانی پادشایانی مادی ئەکرد ، ئەو ئامۆژگاریانە زوربەیان بەزۆر بەسەر خەڵکا دائەسەپاندن • هەرچۆن بێ لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایینی‌دا ئەو ئامۆژگاریانە لە سەرزەمینی مادا بوبو بە رەسمی • وە گەلێك لەو ئامۆژگاریانە هەر پەیڕەویان نەئەکرا •

بەتایبەتی لە سەدەکانی حەوتەم و شەشەمی پێش زایینی‌دا بێ‌گومان ئەمە لە سەرزەمینی ماد باو نەبوە کە تەرمی مردوەکان لە بورجەکانا دابنێن تاکو مەل و مۆر ئەیان خوات ، گەلێك گۆڕستانیان هەبوە کە لە هەندێك لەوانە وێنەی موغ دۆزراوەتەوە کە لە سەر بەرد هەڵکەندراوە ، وە ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ کە پادشایانی مادو پیاوە گەورەکان بەریزەوە نێژراوون(١٢١) • موغەکان خۆیان نەریتی ناشتنی مردوەکانیان ئەگرتە ئەستۆی خۆیان ، وە ئەم نەریتەیان لە وڵاتی خۆیانەوە ـ لە دامێنەکانی دەماوەند ـەوە هێناوە ، وە رەنگە ئەوانیش لە کاسپی‌یەکان ـ دراوسێکانی خۆیان ـ وەیان هەندێك لە هۆزەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە وەرگرتبێ •

## ٥ ـ هونەری مادەکان

بەداخەوە لە بارەی ئەدەبیات و زانستی و هەندێك نەریتی ناوخۆی مادەکانەوە هیچ جۆرە زانیاریەکمان بە دەستەوە نیە • بەلام هەندێك زانیاریمان لە بارەی هونەری ئەو سەرزەمینەوە هەیە وە ئەمانەش ئەگەڕێنەوە بۆ رۆژگاری پێشوو ، واتا بەر لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینی •

ئەگەر ورد بینەوە [مفرغی لوڕستان] هینی هونەری مادەکان نیە(١٢٢) ئەوانەی کە ئێمە بە بەلگە ئەیان هێنینەوە ئەو پارچە قاپ و قاچاخە

هونەریانەیە کە لە تەپۆلکەی گیانو گۆڕستانی [ B ] لە تەپۆلکەی سیلكو گەنجینەی زیویە دۆزراوەتەوەو کە زۆرتر لە هینی مانایەکان ئەچێ(١٢٣) •

**ئەم شوێنەوارە بە جێماوانە ئەکرێن بە دوو بەشەوە** : یەکەمیان هینی هونەری لورستانە ، کە بریتی‌یە لە چەند جۆرێکی نایاب وە بە تایبەتی وێنەی گیان لەبەرە چەماوەکانیان تیا نەخش کراوە ، کەلوپەلی سوالەتینی نەخشێزاوی



**دەفرێکی نەخشێنراو لە تەپۆلکەی سیلك دۆزراوەتەوە - سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی -**

گۆڕی [ B ] لە تەپۆلکەی سیلك(١٢٤) ئەوە هینی ئەم شوێنەوارەیە • بەشی دووەم بریتی‌یە لە گەنجینەی زیویە لە نزیك شاری سەقز(١٢٥) وە کەلوپەلی مانناییەکان کە پەیوەندی بە هونەرسازی ئاشوریەکانو ئورارتووە هەیە ،ئەمانە تاڕادەیەك لەوان کۆنتر بون • [ سەدەکانی نۆیەمو هەشتەمی پێش زاینی ] دروشمو کەلوپەلە ئاینیەکان [داری ژیان] جلو بەرگو نیگارو •••• ئەمانە هەمویان لەگەڵ هونەری ئاشوریو ئورارتویی‌دا پێکەوە هی هەمان سەردەمو رۆژگارن ، بەڵام ئەم لەیەك چونەیان نابێتە جێگای سەرسوڕمان • چونکە

ئاشوریەکان‌و ئورارتوییەکان وە رەنگ بێ مانناییەکانیش لە کاتی شەڕو بگرەو بەردەدا یەکتری یان تالآن کردوە ،وە کارگە هونەریەکانیان بەم بۆنەیەوە لە خەڵکی هەمە جۆرەی هۆزەکان تێکەڵ ئەبوو ، وە بەم هۆیەوە بیان ویستایەو نەیان ویستبایە شێوەی هونەری پیشەگەری هەرسێ کیشوەرەکان تێکەڵ ئەبون • وە چینی فەرمانڕەوای هەر سێ کیشوەرەکە شوێن رێچکەی چێژو زەوقی ئاشوریەکان ئەکەوتن •



پەرداخێکی گڵینی شێوە سەلك ، بۆ شەراب خواردنەوە ، دەسکردی مانناییەکان ، لە سەدەی هەشتەی (؟) پێش زاینی دا ••



دەفرێکی نەخشێنراوی مانناییەکان ( سیتول ) سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی

بەلآم بەم جۆرە کەل‌وپەل‌و شتومەکی مانایەکان لە بارەی نەخش‌و نیگارەوە لەگەل ئەوانی ترا جیاوازی‌یان هەیە •

ئا• گودار نووسەری کتێبی گەنجینەی زیویە ــ هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ــ سەرزەمینی مادی بە زادەگای [شێوەی ددی] کە لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاینی دا بوە ،وە لە دەشتەکانی ئەسکیت بایەخدار بووە، دائەنێ • وە لە هەندێك لە کەلوپەلەکانی زیویە [وەکو سینە بەندی زێڕ] بە

نەخش‌و نیگاری گیان لەبەرەکان نەخشاوە کە لە نەخش‌و نیگاری ئەسکیتی‌یەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی ئەچن [کە لە دامێنی کوبان‌و کەنارەکانی ژوروی دەریای رەشەوە] دۆزراوەتەوە • لە هەمان کاتا وێنەو



**قاوە سینیەکی زیوین (؟) یان زێڕن ، دەسکردیماننایییەکان ، لە سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی دا ••**

نیگاری ئەو گیان لەبەرانە لەگەل نیگارە کۆنەکانی ترا [ مفرغ لورستان ] دا بەرامبەر ئەکرێن‌و لە یەکتر ئەچن • ئینجا بێینە سەر پارچە کەلوپەلەکانی

ئاشوریەکان‌و ئورارتو ـ کە زوربەیان لـە گـەنجینەی زیویە دۆزراوەتەوە ـ ناتوانین مێژووی ئەمانـە کۆنتر لـە ناوەڕاستی سـەدەی هەشـتەمی پێـش زاینی دابنێین •



**گەردن بەندێکی زێڕین ، دەسکردی مانناو ماد ، سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی ••**

بە واتەیەکی تر ئەم کەلوپەلانە بـەر لـە پـەیدا بوونی ئـەسکیتەکان‌و تەنانەت بەر لـە هاتنی کیمریەکان بۆ ئاسیای کۆن دروست کـراوە ، بـەڵام لەوانەیە هەندێك لەو کەلوپەلانە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمدا بوبێت •

**دەسەڵاتی ئاینی موغەکان لە سەرزەمینی ماددا چ کارێکی کردۆتە سەر هونەر ؟**

وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرانە ، چونکە هیچ شتێك بە دەستەوە نیە کە

بتوانین بیکه‌ین به به‌ڵگه‌و پشتی پێوه ببه‌ستین‌و بڵێین هینی سه‌ده‌ی حه‌وته‌م‌و سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی شه‌شه‌می پێش زاینیه ، ئه‌و گۆڕه به‌ردینانه که هینی سه‌رده‌می ناوبراوون ، زۆر که‌م زانیاری هونه‌ری‌و خانوسازی ئه‌گه‌یه‌نن • هرتسفلد کامڵ ترین ناوه‌رۆکی گۆڕستانه‌کانی بۆ ئێمه رون کردۆته‌وه[١٢٦] •



**پارچه خشڵێکی عاره‌بانه ، که له گه‌نجینه‌ی زیویه‌دا دۆزراوه‌ته‌وه ، سه‌ده‌ی هه‌شته‌می (؟) پێش زاینی ••**

ئه‌و جگه له گۆڕه‌کانی سه‌رزه‌مینی [پارس] ـ پرسید ـ شه‌ش گۆڕستانی تر باس ئه‌کات • به رای ئێمه کۆنترین گۆڕستان ئه‌وه‌یه که هرتسفلد به دوا که‌وتوی ئه‌زانی[١٢٧] واتا ئه‌و سه‌کۆیه بۆ دانانی داره‌مه‌یت له نزیك سکوند له خوارووی کرماشانه‌وه‌یه •

له ژوروی ئـەو تاقەوە [سەکۆ] پەیکەرێکی گـەورەو دوو پەیکـەری بچوکی مرۆڤ لە دامێنی ئ‍ژگردانەکەوە نـەخش کراوە • ئـەم نیگارانە بێ سەرو پێن • شێوەی دروست کردنو جۆری نەخشەکانی هێشتا لەگەل نەخشە هەڵکەندراوەکانی لولوییو عیلامیدا ئەوەندە جیاوازی نیە •



**پارچە خشڵێکی زێرین ، کە لە گەنجینەی زیویەدا دۆزراوەتەوە ، سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی ••**

گۆڕە بەردینەکانی تر لـە خانووی نیشـتەجێ ئـەچن زۆر تری ئـــەم گۆڕانە لە یەك یا چەند ژورێك ئەچن کە لە ناوەوە هەیوانو ڕێڕەوی تیا بێو کۆڵەکەی گەورە گەورەی تیا دروست کرابێ ، ژوروترین گۆڕی گۆڕستانی [فخریکا]یە لە ماناای کۆن لە نزیك میاندواو کە بەرهەیوانی نیەو بن میچێکی ساکاری بەردینی هەیە ، ئەمە شوێنێك بووە کە دارەمەیتو مردوەکانیان تیـا دانـەنا ، دیاریکردنی مێژووی ئـەم گۆڕستانـە زەحمـەتە ، بـەڵام جۆری مردوناشتنی لەگەل ئـەو نەریتەی کـە لـەوەبـەر لـەوناوچـەو دەوروبەری دەریاچەی ورمێدا باو بووە جیاوازە [لەگەل نەریتی ناشتنی تەپوڵکەی ــ گی ــ بەرامبەرە](١٢٨) وە هەروەها لە ئەنجامدا ناتوانین مێژووی ئەمە لـە سـەدەی حەوتەم بە کۆنتر بزانین •

گۆڕە بەردینەکەی نزیکی ناوچەی [نێوان کرماشانو هەمەدان] کە لـە بارەی ساختومانی ناوەودی پێچاو پێچە ئەمــە بـە ئاشکرا لەوە ئـەچێ ، بـە

پێچـەوانە گۆڕەکـەی نزیك فخـریکاوە بێ •• ئـەم گۆڕە بریتییـە لـە نیشتەجێیەکی چوار دیواری ، لـە ناوەوە وێنەیەکی ڕۆژی باڵدار نـەخش کراوە ، کە نیشانەی خوای روناکییە ، وە لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا زۆر بە نرخ بووە •• پارسەکان پەیکەری ئادەمیزادیان لەو جۆرە شوێنانەدا نەخش ئەکرد کە نەزەرگەی ئاهورا مزدا بووە •

لەوە ئەچێ تازە ترین گۆڕستانی بەردین هینەکەی [دوکان داود] بێ لە ڕێگای نێوان هەمەدانو بابل ، وە دوو گۆڕستان بە ناوی [قیزقاپان] و [کورخو کیچ] لە دەراوی شارەزورو کـە ناری ئاوایی سـورداش کـە لـــە نزیك سلیمانیەوەیە ، دوو گۆڕی یەکەم بێ گومان بە تەواوی هینی پادشایانە بـەڵام هەردوکیان کەوتونە ناوچەی سەرزەمینی پێشووی ئاشوریەکانەوە ، وە لەوە ناچێ بەر لە ساڵی ٦١٢ی پێش زاینیەوە هـەڵکەندرابن • وەکو وتراوە کـە [قیزقاپان] گۆڕی کیاکسارە وە [دوکان داود] گوری ئاستیاگ بێت •



**پارچە خشڵێکی ماناو مادەکان کە لە گەنجینەی زیویەدا دۆزراوەتەوە •• سەدەی هەشتەمی (؟) پێش زاینی ••**

قیزقاپان گۆڕێکە بریتییە لە خانویەك کـە بن میچێکی فراوانی هەیەو چەند ئەستونێکی تیا نەخش کراوە ، وە بن میچەکەی وەکو داری دارەڕا لـە

بەردەکە هەڵکەندراوە لە نێوان ئەستونەکانا وێنەی خواکان هەڵکەندراوە • بەم جۆرە نوسینێکی بازنگەیی لەگەڵ پەیکەرێکی چواربال دا وە نوسینێکی بازنگەیی تر کە پەیکەری ئادەمیزادێکی لەسەر نەخش کراوە وە تاقێکی چەمۆوەی لەژێر دا دروست کراوە ، وە پارچە بازنگەیەکی تر ئەستێرەیەکی بە سەردوە نەخش کراوە •

رواڵەتی دوایی لە رۆژ هەڵاتی کۆندا بە پێی نەریتی تایبەتی ئەستێرەی زوهرەیە وە ئەمە لەوە ئەچێ رواڵەتی ئاناهیتا بو بێت • دو تاکەی تر بەمانای رۆژو مانگ وەیان ــ بە بیروڕای هرتسفلد ــ ئاهورامزداو میترانە •

بەلای سەرەوە وێنە هەڵکەندراوەکە بەرامبەر بە پەرستگای ئاگرە • کاهن لە لای چەپەوە وەستاوەو جلو بەرگی تایبەتی موغەکنی لە بەرایە ، بە سەر جلو بەرگەکەدا بەدەستوری مادی رۆژهەڵات جبەیەکی کردۆتە بەرو قۆڵەکنی بە خاڵی لێك هەڵپێکاوە • جلو بەرگێ پادشا کە لەلای راستەوە وەستاوە وەکو جلو بەرگی موغەکە ئاشکرا نیە • هەردوو کەسەکە [کەمان] کە نیشانەی سەرکەوتنە بە دەستیانەوەیە •

گۆرستانی [دوکان داود] ئەویش خانویەکە بەم جۆرە ، لە دەرگای گۆڕەکەدا تەنیا وێنەی موغ هەیە ، کراسێکی درێژی عیلامی کە تاکو قولاپەی داپۆشیوە لەبەری کردوە وە چەپکێك گوڵی پیرۆزی بە دەستەوە یە •• ئەم نیگارە ــ ئەگەر جلو بەرگی عیلامی حیساب نەکەین ــ لەوە ئەچێ وەکو وێنەی موغەکان کە لە سەر روی پارچە زێرەکن نەخش کراوون وە وەکو پەیکەری بچوك دروست کراوون وە لە گەنجی [ئامودریا] دا دۆزراوەتەوە ، لەگەڵ هێنی سەردەمی هەخامەنشیەکان زۆر لە یەك ئەچن •

پەیکەری ئەو ئادەمیزادانەی کە لەم دوو نەخشەدا هەڵکەندراون لە روی هونەری تەکنیکی نەقش و نیگار کێشانەوە لەگەڵ نەقشە هەڵکەندراوە بەناوبانگەکانی هەخامەنشی ئەوەندە جیاوازیان نیە • لەوە ئەچێ نەقشەکانی

هەخامەنشی وەستاو شاگردانی ناوبراو لەگەل وەستایانی تر کە پادشایانی هەخامەنشی لە کیشوەرە داگیرکراوەکانەوە هێنابویان دروستیان کردبێ[۱۲۹] •



**ناواخنی گۆڕێکی بەر لە سەردەمی ئاویستا لە تەپولکەی سیلك دۆزراوەتەوە••**

لەباردی [کومپوزیسیون]و هەلکەندنی نەقشی بەردەکانی بێستون‌و وێنە هەلکەندراوەکەی ئانوبانینا پادشای لولوبی کە وەستایانی ماد زۆرباش شارەزایی بون ، دوبارەی ئەکاتەوە وە ئەمە شتێکی رێکەوت نیە • لە نەقشە هەلکەندراوەکەی ئەستخر [ئەستیلك] پەیکەرەکان تا ڕادەیەك کورتە بالآن وە لەناو نەقشی مادەکانیشا ئەم جۆرە پەیکەرانە هەیە[۱۳۰] •

بەشێوەی گشتی هونەری وێنە کێشانی ماد کە لە روی بەردەکان هەلکەندراوون ئەوە نیشان ئەدەن کە وەستایانی ئەو هونەرانە لەگەل هونەری

ئاشورو عیلام دا ئاشنایەتیان بووە • وە رەنگ بێ لەو وڵاتانەی کە لە دوایيدا باس کران مامۆستایانیان بۆ خـاکی ماد هێنابێت • بـەڵام هـەروەکو شێوەی خانوسازی گۆڕە بەردینەکن وەکو نمونەی خانوی مادو ناوچـەکانی دامێنی ئەو سەرزەمینە وایە • ئەو نەقشــە هەڵکەندراوانــە دیسان ئـەچنەوە ســەر رەسەنی هونەری اولوییو گوتی[١٣١] •



**گۆڕە بەردینەکەی**
**فخریکا لە نزیك میاندواو**







ئەبێ ئەوەشمان لەیاد نەچێ کـە نـەقشی هـەڵکەندراوی سەربـەردەکان هەمیشــە لـەو بـەردە نیگاریانــە ئەستورترو ســەردتایی ترن کـە کۆشكو پەرستگاکانیان پێ رازاندونەتەوە و لـە کارگەکانا تاشراوون • ئەگەر بمــان توانیبایە کۆشکەکانی ئەکباتانا لەژێر خاکەوە دەربێنین گـەلێك زانیاری ترمان

لەبارەی هونەری سەرزەمینی مادەوە بۆ رون تر ئەبوەوە ، بەلام ئیستا ناچارین تەنیا بەو نوسینانەی کە نوسەرە یونانیەکان نوسیویانە دەس بەردار بین • وە زانیاری ئەوانیش لەم روەوە ناتەواوە • هرودوت [ I ، ۹۸] ئەلێ : کە قەلای مەرکەزی ئەکباتانا حەوت دیوارو شورای بەدەورا کێشرابوو کە هەر




گۆڕە بەردینەکەی نزیك صحنه ••

بەکەیان لەوی تریان بەرزترو بە رەنگی جۆراو جۆر رەنگ کرابون • [سپیو رەشو سورو ئاویو زەردو قاوەییو پایەکانیان لە زێرو زیو گیرابون] • دانیشتوانی شار لە دەرەوەی ئەم شورایانە نیشتەجێ بون • هەندێك لە لێکۆلەرەوەکان بیروڕای خۆیان وا دەربڕیوە کە گوایا هەوال گێڕەرەوەکان ئەفسانەی شارێکی کۆنیان بۆ هرودوت گێڕاوەتەوە ، وە ئەویش ئەم

ئەفسانەیەی بە ناوی شاری **ئەکباتاناوە** داناوە(١٣٢) • بەلاّم نەقشی **ئاشوریەکان** ئەوە نیشان ئەدات کە قەلاّکانی سەر دیوارەکانی دەوروبەری **قەلاّ گەورەکە** لە خاکی مادا بووە • [تەماشای وێنەی ژمارە ٤٨ بکە] •

وە هەروەها ئەو رەنگانەی کە باس کراوون دیسان لە قەلاّو پەرستگای ئاشوریەکانا ـ ئەو قەلاّیانەی کە یەك لەیەك کورت تر بون ـ [ زیکورات ] دەر ئەکەوێ •

ئەو زانیاری‌یەی کە یەکێك لە نوسەرەکانی سەدەی دووەمی پێش زاینی بەناوی [ پولی‌بی ] لە بارەی ئەکباتاناوە نیشانی ئەدا دیسان لەگەل ماهیەتی دەرونی داستانی هرودوت‌دا جیاوازی نیە • نوسەری ناوبراو لە یادداشتەکانیا سوودی لە هاوچەرخانی خۆیو هاو چەرخانی ئەسکەندەر وەر گرتووە • بە وتەی ئەو ئەکباتانا لە روی جوانیو رازاوەیەوە پیا هەڵ نراو نەبوە ، وە لەناو ئەو شارەدا کۆشکێك هەبوە کە چێوەکەی حەوت استاد [ واتا زیاد لە کیلو مەترێك ] بوە • هەموو بەشە دارینەکانی خانوو بەرەکان لە داری سەرو یان سەدر بووە ، کۆڵەکەو دەستەكو رایەڵی سەر دەرگاکانو ژورو دالاّنەکان تەلاّ رێژ کرابونو لە زێری تایبەتی گیرابون(١٣٣) • ئەوە دەر ئەکەوێ کە ئەو کۆشکە دووبارە سەر دەرگایان بووە کە پشکۆڵەکانیان لە زێرو زیو گیرا بوون • ساختومانی پەرستگای [ئاناهیتا] ش بەم جۆرە بوە(١٣٤) • وە هەرچەندە لە سەردەمی ئەسکەندەردا دزو تالاّنگەرو جەردە ئەوانەیان دزیوە ـ هێشتا لە کۆتایی سەدەی سێیەمی پێش زاینی گەلێك شوشەو پارچە زێرو زیوی تیا مابووەوە •

پادشایانی هەخامەنشی دیسان لە ئەکباتانا ـ کە پایتەختێکی ئەوان بوە ـ جۆرە کۆشکێکیان دروست کردوە(١٣٥) ، بەلاّم ئاشکرایە ئەوەی کە لە رۆژگاری کیاکسارو ئاستیاگ دا دروست کرابون پارێزراوەو فراوانیان کردوون ، وە لەبەر ئەمەیە [پولی‌بی] کە ئەڵێ : کۆشکی رازاوەی ئەکباتانا



گۆڕە بەردینەکەی (قز قاپان) وەکو ئەڵێن ڕەنگە بێ گۆڕی کیاکسار بێت ..





گۆڕە بەردینە کەی (دوکان داود)و نــەخشە هەڵکەندراوەکــەی ، ڕەنگە بێ ئەمە گۆڕی ئاستیاگ بێت ..

نمونەو بەڵگەی دەسەڵاتداریو دەوڵەمەندی پادشایانی مادە ، لەمەدا قسەیەکی بەجێو هەقی کردوە ، لە واقیع دا لافاوی دەوڵەمەندی لەناکاو ڕوی کیشوەری مادی داگرت • وە ئەمــە خۆی بوو هــۆی بــەهێز کردنی ناکۆکی ناوخۆی کۆمەڵگای خاوەن کۆیلــەکانی مادو بــە پەلــە ئەمپەراتۆریەتی مــادی بــەرەو نەمان برد •

# بەشی حەوتەم

### ماد لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئەمپەراتوری هەخامەنشیەکانا

## دامەزراندنی مادی ئاترۆپاتین

# دامەزراندنی مادی ئاتروپاتین

## داگیر کردنی پادشایی ماد لە لایەن کورشی دوەمی پارسەوە

لە روداوەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی ئاستیاگ [ ٥٨٥/٨٤تا ٥٥٠/٤٩ی پێش زاینی ] هیچ جۆرە زانیاریەکی ئەوتۆ بـە دەستەوە نیـە • راست ترین بەڵگەی ئێمە کە پشتی پێ ئەبەستین ـ واتا هرودوت ـ لەم روەوە بە داستانی لە دایك بون و منالی کورش و شەرەکانی لـەگـەل ئاستیاگ دا دەس بـەردار ئەبێ ، وە لەبارەی باسکردنی ئەورووداوانەوە کە بە رای ئەو ئەهمیەتێکی ئەو تۆی نەبووە ، وە ئەبوا سەرنجی خوێنەر بۆ سـەر مـەبەستی نووسـەر واتا مەسەلەی سەرچاوەی پەیدا بوونی ئەمپەراتوری گـەورەی پارس [ ئێرانی ] لابدات • نـەیویستوە باسی بکـات • لـەم روەوە داسـتانی هرودوت وەکـو فەرهەنگی گشتیو فولکلور ئامێزەو راستی مێژویی بەگران تێ ئەدۆزرێتەوە ، ئەوەش بە پێی ئەو باس و خواسانەی کە لە دژی ئاستیاگ ئەیان گێرنەوە •• [واتا داستانی هارپاگ و ئەوەی کـە کورشیان دا بـە شوانێك] ـ وە [باوکی مێژو] باس و بەسەرهاتەکانی ماد لە ناوەراستی سەدەی شەشەمی پێش زاینی دا لە دەروازەی ئەو باس و رووداوانەوە بەدی ئەکات •

بەڵام ئەوانەی کە کتسیاس نوسیویەو کورتەکـەی [دیودور] و نیکولای

دمشقیو فوتیوس[1] نوسیویانەتەوە هەروەکو رەووشتی ئەو نوسەرە چۆن بووە بەو جۆرە کیانی داستان نوسیەوە نوسراوەتەوە ، وە کتسیاس لە بارەی روداوەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی ئاستیاگەوە تا رادەیەك ستەمە راستی تیا بێت • بەرای زوربەی لێکۆڵەرەوەکان[2] کتسیاس روداوو باسی مادی تری کە لە دژی کورش نوسراوە باس ئەکات کە هرودوت باسی نەکردوە ، بەڵام بەر لە هرودوت ئەفسانەیی فەرهەنگی گشتیو فولکلوری تێکەڵاو کردوە ، ئەگەرچی لەوە ئەچێ کە ئەو روداوانە هەرچەند لە سەردەمی ژیانی نوسەرەوە نزیکتر بن زورتر لە راست تر ئەچن • بەم هۆیەوە ئەتوانین پشت بە مێژووی سەدەی پێنجەمی پێش‌زایینی ئەو زیاتر بەستین تاکو مێژووی سەدەی شەشەمی پێش‌زایینی • وە مێژووی سەدەی دوایی کە باسکرا دیسان راست ترە لەو نوسراوانەی کە لە بارەی مێژووی رۆژگاری کۆنەوە نووسراوون • هەندێك لە وتەکانی کتسیاس سەرچاوەکانی رۆژ هەڵات بە درۆ ئەخەنەوە ، بۆ نمونە : گوایە کورش شازادە نەبووە یەکێك بووە لە بۆرە پیاوان ، جگە لەمە گەلێك باسی تری کتسیاس‌و نامەکانی سەرچاوە رۆژ هەڵاتیەکان ئەسەلمێنێ[3] • هەروەها هرودوت بگرەو بەردەی شەڕەکانی مادو پارسی‌نەنوسیوە وە کتسیاس لەم روەوە هەوەجەی نەکەوتۆتە ئەو • بەم هۆیەوە ئەتوانین بڵێین کە کتسیاس لەگەل بێ بناغەیی وتەکانی — لەم بارەیەوە بە تایبەتی شتێکی نوسیوە کە لە خۆوە دای نەنوە وە لە هەر شوێنێکدا کە لە یادی چوبێتەوە لە خۆیەوە شتی تیا داناوە •• لەبەر ئەمە ئەبێ ئاگاداری ئەو جۆرە شتانە بین لەناو نوسینەکانی کتسیاس دا •

[کورش نامە]ی کزنفون [کسنفونت] ئەویش هیچ جۆرە مەبەستێك نادات بە دەستەوە ، روداوەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی ئاستیاگ تەنانەت ئەگەر نوسەر ئاگای لێ یان بو بێت [جگە لەو باسانەی کە لەوە ئەچێ لە نوسینەکانی کتسیاس‌و هرودوت وەرگیرابێ] ئەوەندە لای داوە کە بە ئاستەم لە کورش

نامە ئەچێ • بەڵام ڕەنگ بێ ـ هەروەکو لە مەوبەر باسمان کرد ـ ئەو باسانەی پەیوەندی‌یان بە تێکەڵی ئەرمەنستان‌و مادەوە هەیە لێك جیا کراونەتەوە(٤) •

سەرچاوە بابلیەکان بە شێوەی گشتی ڕاستن بەڵام لە بارەی ڕوداوی کۆتایی سەڵتەنەتی ئاستیاگەوە زۆر شپرزەو ناڕاستن(٥) •

ئەبێ بڵێین لە بارەی ڕوداوەکانی سەڵتەنەتی ناوبراوەوە [وە هەر چۆن بێ تا سەرەتای جەنگ لەگەل پارسەکانا] زۆر ستەمە ، بەڵام ئەو سەرچاوانە بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ وە تا ڕادەیەك شتێك ئەدەن بە دەستەوە کە بە هۆی ئەوەوە ئەتوانین باری ناوخۆو کۆمەڵایەتی‌و سیاسی سەرزەمینی ماد لە سەدەی شەشەمی پێش زایینی‌دا بێنینە بەرچاومان • وە لەم ڕووەوە سەر چاوەکان جیاوازیان لەناوا نیە • هرودوت I ١٢٣] ئەڵێ : کە [ئاستیاگ سەبارەت بە مادەکان بێ بەزەیی بوە] بەڵام دەمودەس هەر لە هەمان جێگادا باسەکە ڕون ئەبێتەوە کە مەبەستی ئەو پیاو گەورەکانی ماد وەیان [یەکەمین کەسانی نێوان مادەکان] وە پاشەڕۆوەکانی پادشایانی دهیوپتی Dahyupati بووە • لەمەو بەر وتمان کە لەو سەردەمەدا حکومەتێکی بە دەسەڵات‌و خاوەن پادشا لە ماد تەنیا بە مەرجی بەربەرەکانێی گەورەکان پشت بەستن بە خەڵکە ئازادەکان ـ ئەیتوانی بێتە دی • ئاستیاگ لە سیاسەتی خۆیا لە ئامۆژگاری‌و ئایینی موغەکان(٦) سودی وەرئەگرت ، وە ئەو ئامۆژگاریانە بە پێی وتەی ئێمە(٧) لەو سەردەمەدا هێشتا لەگەل نەریتی سەرەتایی کە بە ناوی زراتوشترا ناو ئەبرا زۆر جیاواز نەبون ، وە زۆر جێگای سەرنجی خەڵکی بون • کتسیاس بە پێچەوانەی هرودوت بە ئاشکرا لە بارەی پەیوەندی ئاستیاگەوە لەگەل موغەکانا هیچ ناڵێت بەڵام باسی ئەو نیسانە ئەکات کە ئەمە ئەسەلمێنێ • بە وتەی کتسیاس پیاوێك بە ناوی ئاسپیتام spitamas مێردی ئامی تیدا amuti کچی ئاستیاگ ـ بۆ جێگەداری ئەو دانرابو(٨) • بەڵام ئاسپیتام ناوی خانەدان‌و بنەماڵەی

زرتوشترایە ! دوای ئەوە دیسان لە داستانی کتسیاس‌دا ناوێك کە لەگەل زرتوشتراو دەوروبەریا پەیوەندی هەیە بەرچاو ئەکەوێ ، بەم پێیە ئەو موغەی کە لە ٥٢٢ی پێش زاینی حکومەتی گرتە دەست [ سفندادات ] – sphendadates –یان پێ ئەووت • بەلام ئەم ناوە لەناوی سپنت دات [ئەسفندیار] کوڕی کۆی ویشتاسب پشتیوانی زەرتوشترا ئەچێ[9] • ئەگێڕنەوە کە سپنت‌دات لە لاویا بە دەستی ناحەزانی ئاینی زەڕدەشت کوژراوە • بەلام لە نووسراوەکەی بێستونو نوسراوەی [یوستین] ئەوە ئەزانین کە ناوی موغی یاخی گئوماتا بووە ، وە خۆی بە [بردیە] کوڕی کورش دائەنا • بەلام بردیە لەوە ناچێ کوڕی ئامی‌تیدا کچی ئاستیاگ بوبێت – کە بە وتەی کتسیاس کورش ئاسپیتامی مێردی کوشتبێو مارەی کردبێ • بەم پێیە لەوە ئەچێ بە مادەکانیان وتبێ کە بردیە کوڕی ئاسپیتامو ئامی تیدایە نەك کورش [وەیان ئەگەر کوڕی کورشە لە دایکەوە بە نەوەی ئاستیاگ دائەنرێ[10] بەم جۆرە لە باسەکانی مادا [ باسەکانی کتسیاس لە باسەکانی ماد وەرگیراوە ] پیاوە یاخی‌یەکە بە ناوی سپندات – کە وەکو [ ئاسپیتام ] بە کوڕی زراتوشتر دانراوە[11] هەمان ناوبراوە • –بە پێی بیروڕای ئێمە ئاستیاگ لەگەل بنەماڵەی زراتوشترا – کە موغەکانی ئەو سەردەمە لە دەوری کۆ بوبونەوە – خزمایەتیان بووە[12] ، وە موغەکان لەو سەردەمەدا دوژمنی ئەوانە بون کە حەزیان لە ئاشتی نەکردوەو رابەری ناوچە ئاینیەکانیان ئەکرد ، کە ئەمانە یەکیەتیان تێك ئەداو سەرپێچیان لە ئامۆژگاریەکانی زەڕدەشت ئەکرد • ئەگەر سەرنجی بەشە کۆنەکانی ئاویستا بدەین وە ئەوە بخەینە بەر چاومان کە ئەگەر باسی چۆینەتی ماد ناکەن ، هەرچۆن بێ چۆنێتی هاو شانی ئەو هەرباس ئەکەن – ئەوەمان لەیاد نەچێ کە بەر لە زەڕدەشت پادشاکان خۆیان کاهن بون ، وە لە ئەنجامدا قودرەتو دەسەلاتو ناویان لە پلەیەکی ئاینی دابوە • بەم جۆرە ئەو تاکە ئاینەی کە موغەکان نوێنەری بون – هەر چۆنێك کە بوو – گەلێك بایەخی بۆ پادشایانی ماد هەبو • هەڵبژاردنی ئاسپیتام بۆ

جیٚ‌نشینی بوو به هۆی بەربەرەکانیێو ناکۆکی یەکی زۆر لە نێوان خەڵك‌و خاوەن کۆیلەکان کـە لایـەنگری ئاستیاگ بون لەلایەك وە گـەورە پیاوان‌و سەرپێچی کەرەکان لە لایەکی ترەوە • ئەوە بو لـە سـەردەمی سـەڵتەنەتی ئاستیاگ دا هیچ جۆرە شەڕێکی گەورە نەکراو هیچ شوێنێك داگیر نەکرا ،لە ئەنجامدا گەورەکان‌و کاربـەدەستانی لەشـکر هیچ جۆرە تالانیـەکیان لـەم رێگایەوە دەست نەکەوت وە بە توندی بەر هەڵستی پادشا وەستان • هەرچۆن بێ لە کیشوەری ئاشوریشدا هەر بەم جۆرە بوو[١٣] • هرودوت خۆی ئەڵێ: کە ئاستیاگ [هارپاگ]ی کرد بە فەرماندەی لەشکری مادەکان وە بەم پێیـە وتەکەی خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە • ئەمە خۆی یەکێکە لە راستی میژوویی[١٤]، داری رەگەزی رەسمی هەخامەنشیەکان‌و شوێنەوارەکانی تر ئەمانیش وتەکەی کتسیاس کە گۆیا کورش لە خانەدانی سەڵتەنەتی نەبوە[١٥] بـە تەواوی بـە درۆ ئەخاتەوە ، وە ئەوە ئەسەلمێنێ کە یەکەمین کەسی خانەدانی هەخامەنشی وە هەروەها باوکی کورش کمبوجیەی یەکـەم باپیری ئـەو کورشی یەکەم لـە زنجیرەی پادشایان بون •

بە پێی وتەی [کتسیاس][١٦] کورش لە سەردەمێکدا کـە لـە لایەن ئاستیاگەوە بە نوماینەدەیی چوبو بۆ لای پێشەوای کادوسیەکان[١٧] [ ئیبار ] ـ مەیتەر ـ کە لەوەبەر وەکو کۆیلە دەسگیر کرابوو لـەگـەل خۆیا بردی ، ئیبار کورشی هەڵداشت بۆ ئەوەی دەسـەلات لـە دەست مادەکان دەر بێنێت‌و بکەوێتە دەست پارسەکان[١٨] ، ئەمە هەمان [ئوهبار]ە کـە لـە میژووی بابلی نابونیدا ناوی هەیەو یەکێك بووە لە سەردارەکانی کورش ، وە بـە فـەرمانی ئەو سـاڵی ٥٣٨ی پێش زاینی‌دا بابلی داگیر کردوە ، وە ماوەیـەك لـە دوای ئەوەش کۆچی دوایی کردوە[١٩] • چاوەڕوان ناکرێ کـە ئـەم هـەواڵەی کتسیاس لە لایەن هیچ سەرچاوەیەکەوە لایەنگیری بکرێ •

هەروەها بەوتەی کتسیاس رووداوەکانی دواتر بەم جۆرەیە : کورش لە

سەرزەمینی کادوسیەکان[20] گەڕایەوە بۆ ئەکباتانا دوایی گۆیا مۆڵەتی لە ئاستیاگ وەر گرتووە کە بچێت بۆ لای باوکی [هرودوت ئەویش لەم بارەیەوە نوسیویە][21] بەلام لە واقیعدا ئەیویست رابەری شورشگێرەکان کە [ئاترادات] پیشەوای مەردان [بە وتەی کتسیاس ئەوە باوکی کورش بوە] • بەلام چونکە ئەمە ناوی چیرۆکی ئەفسانەییە ـ ئەگەر لە واقیع دا لەو رۆژگارەدا شورش بەرپا بوبو پیشەوا کەی پیاوێکی تر ـ وەکو ئیبار ـ کە شوێن دەستی لە شورشدا دیار نیە ـ بوە] بەرپای کردبوو بیگرێتە ئەستۆی خۆی ، لەم کاتەدا بە رێکەوت ژنێك پیلانەکەی دۆزیەوەو ئاستیاگ پێی زانی[22] • ئاستیاگ دەستو برد کەوتە خۆو لە دژی یاخی بوەکان لەشکری کێشا •

هرودوت لەختێك ئەم داستانە بە جۆرێکی تر باس ئەکات [ هەروەکو باسمان کرد وتەی دەستو پێوەندەکانی ـ هارپاگ ـ ی نوسیوەتەوە ] بە وتەی ئەو بەر لە شۆرشی پارسەکان لە لایەن گەورەکانی مادەوە کۆبونەوەو جموجوڵ دەستی پێ کرد کە هارپاگ دای مەزراندبو ، وە هارپاگ زۆر لە ئاستیاگ رەنجابوو • ئەو کاتە هارپاگ نوسراوێکی بۆ کورش نارد کە لە فارس نیشتەجێ بو[23] لەو نامەیەدا کورشی هەڵدا تا پارسەکان بێنێتە شۆرشەوە وە بەڵێنی پێدا کە گەورە پیاوانی لەشکری ماد کە لە لایەن ئاستیاگەوە کراوون بە فەرماندەی سوپا هەمویان لایەنگیری ئەو ئەکەن •

ئاستیاگ کە بەم خۆ رێك خستنە سوپایەی کورشی زانی ئەوی بانگ کرد بۆ لای خۆی ، کورش لە وەلاما شەڕ کردنی ئاشکرا کرد ، هارپاگ کە فەرماندەی لەشکری مادەکان بوو لەگەل گەورە پیاوانی سوپاو سەرکردە لەشکریەکانا چون بۆ لای کورش‌و چونە ناو ریزی لەشکرەکەیەوە •

ئەتوانین لەم دوو داستانە ئەنجامێك وەر بگرین کە کورش ئەو کاتەی لە دەرباری ئاستیاگدا بووە ، بەلام لە کاتی شورش دا لە پارس بوە • لەم

دوو داستانە ئەوە بەرهەم دێت کە لەو سەردەمەدا کورش هێشتا پادشای پارس نەبوو ، بەڵام ئەم وتەیە راست نیە • وە بە پێی سەرچاوە سەربەخۆکانی هاوچەرخی رووداوەکان[٢٤] شەڕ لە نێوان مادو پارس‌دا لە ٥٥٣ تا ٥٥٠ی پێش زاینی درێژەی کێشاوە ، وە کورش لە ساڵی ٥٢٩ی پێش زاینی لە دوای ٢٨ ساڵ [بە وتەی هرودوت] یان ٣٠ ساڵ سەڵتەنەت [بە وتەی کتسیاس‌و دنیون][٢٥] لە دنیا دەرچووە • ئەوە راستە کە لە سەرەتای شەڕدا چەند ساڵ بووە کە لە سەر سەڵتەنەتی پارس یان جێ نشینی کمبوجیەی یەکەم بووە ، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لەوە ئەچێ کە بەر لە نەخۆشی‌و مردنی باوکی ماوەیەك لە دەرباری ماد ژیاوە وە بەشداری لەشکر کەشیەکانی مادەکانی کردوە •

هەروەکو باسمان کرد سەرچاوە بابلیەکان بەم جۆرە ئەڵێن کە شەر لە نێوان کورش‌و ئاستیاگ سێ ساڵ درێژەی کێشا ، بەم هۆیەوە هرودوت – کە تەنیا باسی دوو شەڕو شۆڕی دوایی مادەکان – باس ئەکات – لە واقیع دا بە ئاشکرا بگرەو بەردەو رووداوەکان بە کورتی باس ئەکات [ لە شەڕێکدا هارپاگ فەرماندە بووەو لە شەرێکی ترا ئاستیاگ خۆی ] • هەواڵەکانی هرودوت راستە • چونکە مێژووی رووداوەکانی بابل لایەنگیری ئەم نووسینەی هرودوت ئەکەن • مێژووی ناوبراو ئەو رووداوانە لە ساڵی ٥٥٠ی پێش زاینی دا ئەگێڕێتەوە ، واتا کۆتایی شەرەکە باس ئەکات • بەڵام ئەبێ زانیاریەکانی کتسیاس لە بارەی قۆناغی سەرەتایی شەڕەکەوە بخرێتە سەر هەواڵەکانی هرودوت[٢٦] •

بە وتەی کتسیاس : ئاستیاگ لە هەوەڵەوە کە لەگەڵ لەشکری کورش‌دا کەوتە شەڕەوە[٢٧] شکاندنی ، ئاترادات پێشەوای مەردەکان لە شەڕدا کوژرا، ئەو جار ئاستیاگ کەوتە شوێن پارسەکان وە لە سەرزەمینی پارس [پرسید] لە بەرامبەر گەردنەیەك کە لە بارەگای پادشایانی پارس واتا – پسارگاد – کۆتایی پێ دێت ، جارێکی تر شکاندنیەوە • چونێتی پارسەکان زۆر ناهەموار بوو وە

شکستەیان بە ئاڵۆزی شکا کە ژنان لە حەساری قەڵاکان ئەهاتنە دەرەوەو هانی شەڕ کەرەکانیان ئەدا[٢٨] شەڕێك کـە لـە ژێر دیواری حـەساری قـەڵای پاسارگاد دا رویدا بوو بە نوختەی گۆڕینی چارەنووسی شەڕەکە ، لـە دوای ئەوە هۆزەکانی سەر بە ماد وەکو هیرکانیەکان وە لـە دواییدا پارتەکان رویان کردە ناو پارسـەکانـەوە[٢٩] • دوای ئـەوە کتسیاس بـە روونی بـاسی رووداوەکە ناگێڕێتەوە ، هەروەکو وترا شەڕ دورو درێژ بوو ، سەرکەوتن هەر تاوەی بە دەست لایەکـەوە بووە • هـەروەکو کتسیاس باسی شـەڕەکان ئەگێڕێتەوە هۆی بنەڕەتی سەرکەوتنەکەی کورش هەمان خیانـەتی گـەورە پیاوە سوپاییەکانی مادە کە هارپاگ سەرکردەی هەمویان بوو ، هرودوت باسی ئەوە ئەکات بەڵام کتسیاس لەم بارەیەوە بێ دەنگـە ، لـەوە ئـەچێ پارچـە پارچەبونی هۆزەکانی سەر بەماد ئەوانیشی بـەو خیانەتە دابێتە قەڵەم • وەکو سەرنج دراوە بڵێین کە لەو روەوە لەناو نووسینەکانی کتسیاس‌دا شتی راست هەیە • مێژوی بابلی نابونیدو کتسیاس‌و هرودوت ئەتوانین کۆ بکەینەوەو لـە نێوان هەمویانا وێنەیەکی راستی روداوەکە بخەینە روو •

**بە پێی ئەو سەرچاوانە ئەتوانین ئەو شەڕو شۆڕو بگرمو بەردانە بکەین بە چوار بەشەوە :**

**بەشی یەکەم –** پێك هێنانی پێشەکی کارەکان : کۆبونەوەو جموجوڵی چینەکانی ناوەوەی گەورەکانی ماد بە دەستی هارپاگ وە لە لایەکی تریشەوە هاندانی هۆزە جۆربـەجۆرەکان بۆ ناو شۆڕش – بەرای زوربە – بە هۆی نیبارەوە بووە •

**بەشی دووەم –** هاتنە مەیدانی کورش‌و لەشکری پارسی : شـکاندنی پارسەکان‌و هێرش‌و پێشڕەوی مادەکان تا پاسارگاد • ئـەم کاتە لەگـەل ساڵی **٥٥٣**ی پێش زایینی‌دا ئەگونجێ • ئەو شەڕە ئەوەندە بە راستی‌و گەرم بووە کە مادەکان لە ناکاو لەشکرەکانی خۆیان لـە سنورەکانا ئاگادار کردەوە ، وە ماوەیان بـە نابونید پادشای بابـل دا تاکو لـە ساڵی **٥٥٣** شاری حران کـە

هێنی مادەکان بو لە ژوروی بین النهرین بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٣٠] •

**بەشی سێیەم :** ئەم چۆنێتی‌یە دو ساڵ درێژەی کێشا شەڕ بەردەوام بووەوە ، جاروبار هەر جارەی لایەکیان سەر ئەکەوتن ، پارسەکان توانیان بە تەواوی‌و یەکجاری سەرکەوون •

**بەشی چوارەم :** کە لە ساڵی ٥٥٠ی پێش زاینی لەگەڵ خیانەتی هارپاگ‌و شەڕی سەرو ماڵی دەست پێ ئەکات‌و هیرکانیەکان‌و پارتەکان رویان کردە پارسەکان وە ئاستیاگ هەوڵی دا تاکو پەلاماری پارسەکان رابوەستێنێ ، وە دوایی رای کرد بۆ ئەکباتاناو پارسەکان پایتەختی مادیان داگیر کرد •

لەم نووسینانەی سەرەوەدا بە تەواوی درئەکەوێ کە مادەکان بە درێژایی رۆژگاری شەڕ بەهێزەوە راوەستاوون ، وە ئەگەر گەورەکانی ماد لەناو خۆی کیشوەرەکەدا دەستیان بە خیانەت نەکردابایە [ لەمەوبەر هۆی خیانەتەکەیان باس کراوە ] حکومەت نەئەکەوتە دەست پارسەکان •

هرودوت لە بارەی دوا دەسەڵاتدارێتی ئاستیاگەوە بەم جۆرە ئەڵێ [ I ، ١٢٨] ئاستیاگ موغەکانی ـ لەگەڵ ئەوەدا تا ئەو سەردەمە باشترین پەیوەندی لە گەڵیانا بوو ـ خنکان •چونکە ئامۆژگاری یان کردبو کە ماوەی کورش بدات بڕوات ، وەکو وتراوە بەشێك لە کاهنەکان ـ ـ موغەکان لەگەل پارسە یاخیەکانا پەیوەندی یەکیان دروست کردبو ـ لە واقیع دا ئەبینین کە لە دوای ئەو روداوانە موغەکانی دەرباری کورش‌و کوڕەکەی کمبوجیەی دووەم گەلێك رێزیان لێ گیراوە • سروشتی بیروباوەری ئاینی‌و چۆنێتی باری کۆمەڵایەتی کاهنەکان وا بووە کە ماوەی نەئەدا ئەوانە ماوەیەکی درێژ خاوەنی سودو خێرو بێری گشتی خەڵك بن •

لە دواییدا ئاستیاگ هەمو دانیشتوانی ئەکباتانای پرچەك کرد ، وە لە حەساری شار هاتنە دەرەوە بەلام دەرەقەتی پارسەکان نەهاتن‌و دیسانەوە

نکانو ئاستیاگ بە دیل گیرا(٣١) پارسەکان ئەکباتانایان داگیر کرد وە بە پێی مێژووی نابونید(٣٢) ئەکباتانایان تالان کرد وە ژمارەیەك لە خەڵکەکانیان بە تالانی دەسگیر کردو بردیانن(٣٣) •

بە وتەی [کتسیاس](٣٤) ئاستیاگ دەمودەس دوابەدوای شکستەکەیا بە دیل نەگیرا بەڵکو یەکەم جار رای کرد بۆ ئەکباتانا وە لەوێ خۆی شاردەوە، کورش دوای ئەوە کەیشتە ئەکباتانا فەرمانی دا ئامیتید کچی ئستیاگو مێردەکەی [ئاسپیتام]و کورەکانیان ـ ئەسپیتاكو مەهبرن ـ ئازار بدەن ، دوای ئەوە ئاستیاگ خۆی دا بەدەستەوە تاکو ئەوانەی لە دەوروبەری ئەوون ئازار نەدرێن •

سەرکەوتنی کورش بەسەر ئاستیاگ دا ـ ئەو سەرکەوتنەی کە بە هۆی گەورەکانی مادەوە دەستی کەوتبو دەستەبەری ئەوە بوو کە یاسای تازەی حکومەتی کورش بەرواڵەت لە گەل مادەکانا بگونجێ ، بەم هۆیەوە لەگەل ئەوەدا کە ئەکباتانا تالان کرا وە هەندێك لە مادەکان بە دیلیو بە تالانی دەسگیر کرانو بران ، بەڵام هەروەکو وڵاتێکی داگیر کراو خەراجو باجیان خستنە پێ(٣٥) لەگەل ئەمەشدا لەگەل گەورەکانی مادا زنجیرە دەسەڵاتێکی گونجاویان پێ درا ، بۆ نمونە کورش پادشایی مادی نەگۆڕی و لەناوی نەبرد بەڵکو خۆی کرد بە پادشای ماد وە خۆی هەر بە ناوی پێشوەوە ناونا پادشای پارس •• تەنانەت لە زوربەی نوسراوەکانی سەردەمی داریوشی یەکەم مادو پارس لە روی کیشوەرەکانی ترا یەك بون • لە نوسراوەی نوسەرە یۆنانیەکانا، ماوەیەك لە دواییدا لەکاتی زنجیرەی ناوی پیاو گەورەکانی ئەمپەراتوریتی هەخامەنشی ، ناوی نومایندەکانی ماد ئەبینین • یۆنانیەکانو هۆزەکانی رۆژ هەلات پادشای ئەمپەراتوریتی هەخامەنشیان بە پادشای ماد ناو ئەبرد(٣٥) • لەگەل ئەوەدا کورش لە بابل دا پادشایی مادی هێشتەوەو ساتراپێکی تیا دروست کردو یەکەمین ساتراپی ماد ئویبار بو(٣٦) •

به وتەی کتسیاس کورش لەگەل کچی ئاستیاگ کە ناوی ئامی تیدا بوو زەماوەندی کرد[٣٧] بەلام لەوەبەر – مێردەکەی ئەو – [ئاسپیتام] کە حەقداری تاجو تەختو دوژمنی ئەو بو ، کوشتی .. مەبەستی ئەوە بوە کە بۆ داواکاری خۆی واتا حکومەتی [قانونی] بەسەر ئەمپەراتوری ئاستیاگدا بکا بە بەلگە .. لە نێوان مادەکانو پارسەکانا – وەکو میسریەکان[٣٨] نەریتی وابو کە کچە زادەیان راوا [مێردی کچ]ی پادشای پێشو بە پێی یاسا حوکمی ولات بکات[٣٩] . بەم هۆیەوە پادشاکان زوربەیان لەگەل خوشکە کانیانا زەماوەندین ئەکردو خوشکی خۆیان مارە ئەکرد . وە ئەم نەریتە جگە لە خانەدانی سەلتەنەتی لە ئێرانی کۆنو ئاسیای ناوەراست دا زۆر باو بووە ، لەبەر مانەوەی مالو میراتو نەوە لەناو خنەدانەکانا ئەمە زۆر بایەخی پێ دراوە .

سیاسەتی هەمیشەیی‌و نەگۆڕاوی کورش ئەوە بو کە لە کیشوەرە داگیرکراوەکانا لەگەل گەورە پیاوانیانا بگونجێو سەرنجیان بۆ لای خۆی رابکێشێ . وە بەم هۆیەوە ئەو پادشایانەی کە بە دیل ئەگیران نەی ئەکوشتن[٤٠] ئاستیاگ لە کوشتن رزگاری بوو[٤١] بە وتەی کتسیاس بە ناوی جێنشینی حاکمی هیرکانیەوە زۆر بە ریزەوە نێررا بۆ ئەو سەرزەمینەو[؟] دور خرایەوە[٤٢] بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو خواجەیەك کە ناوی [پتساکت] بو [ئیبار] هانی دابو بە بیانوی دیدەنی کچەکەیەوە بردی بۆ بیابانێكو لەوێ بەرەللای کرد تاکو بە سەرگەردانی لەبرسانا بمرێ[٤٣] .

ژمارەیەك لە گەورەکانی ماد چونە لای کورش ، وەکو هارپاگ کە یەکێك لە سەردارانی سوپای ماد بو[٤٤] وە سێیەمین حاکمی کیشوەری لیدی بوو [لە دوای مردنی مازار مادی] ، هارپاگ [یونیە]ی بو کورش داگیر کرد، وە حەزی نەئەکرد بگەرێتەوە بۆ سەرزەمینی ماد وە یان نەی ئەویست بگەرێتەوە لە ئاسیای بچوك سەقامگیر بوو ، ملكو زەویو زارێکی زۆری

خستە ژێر دەست خۆیەوە ، لە لیکیە نوسراوەیەك بە زمانی لیکیەیی‌و یۆنانی ماوەتەوە کە لەو نوسراوەیەدا یەکێك لە نەوەی ئەوە[؟][٤٥] کتسیاس ئەڵێ : کە کوڕەکانی ئامی تید [لە ئاسپیتام] یەکەم میردەکەی ناویان ـ ئاسپیتاگ‌و مهابرن ـ بوو لە لایەن کورشەوە کرا بە ساتراپ[٤٦] وە براکەی [پارمیس] ـ کوڕی ناشەرعی ئاستیاگ وەیان کوڕی دایکی ئامی تید لە مێردێکی ترەوە ـ ؟ یەکێك لە سەردارانی سوپایی پارس بوە • بە شێوەی گشتی باسەکانی کتسیاس بەلای ماددا دائەتاشێ‌و رقەبەری کورش ئەکات • لە نوسراوەی بێستوندا داریوشی یەکەم ناوی هەندێك لە سەردارانی پارس ئەبات کە مادی بون • تەنانەت تا سەردەمی خشایارشا[٤٧] [بە رێکەوت لە دوای ئەو] ناوی هەندێك لە گەورەپیاوانی مادی بردوە کە لە دەرباری ئیداری هەخامەنشیەکانا پلەو پایەیەکی بەرزیان بە دەستەوە بوو • بەلام بە شێوەی گشتی تەنانەت گەورەکانی ماد لە بارەی داگیر کردنی ئەو کیشوەردوە لە لایەن پارسەکانەوە بێ لایەن بون ، وە هەروەها لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا گەلێك شوێن‌و پلەو پایەی گرنگیان بەدەستەوە بووە بە تایبەتی نەوەی ئەو حەوت خانەدانەی کە لە کودتاکەی داریوش‌دا بەشداریان کردوە • ژمارەیەکی کەم لە بنەماڵەو خانەدانەکانی ماد لەگەل گەورەکانی پارس دا تێکەڵ بون‌و زوربەی ئیش‌و کاری سادەیان گرتە دەست ، وەیان لە رۆژگاری پڕ لە ئاژاوەو سەرەتای سەڵتەنەتی داریوشی یەکەمدا [٥٢١ ـ ٥٢٢ی پێش زاینی] وە رەنگ بێ لە سەردەمی خشایارشادا دیسان لە [٤٨٤ـ٤٨٦ی پێش زاینی] دا لەناو چون •

## ٢ ـ یاخی بون (کودتای) گئوماتا

باری چۆنێتی خەڵکی ماد ، یان [کارماداهی ویتاپتی ئاهە ـ kara mada hya vitapatiy aha بە پێی نوسراوە بەرزەکەی بێستون :

لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا بە سەختی دوچاری گیرو گرفت‌و نیگەرانی

بوبونێ ، ڕەنگە بێ ئەو ڕوداوەی لـە دوای گرتنی ئاسیای بچوك‌و بابـل‌و میسر ـ لە کۆتایی سەڵتەنەتی کمبوجیەی دووەم کوڕی کورش [٥٢٢ـ٥٢٧ی پێش زاینی] وە سەرەتای سەڵتەنەتی داریوشی یـەکـەم ڕویدا ، لـەو کات‌و زەمینەیەدا دروست بووبێ •

ئەم داستانە لەگەل کودتای دەرباری گۆماتای موغ لـە مانگی مـارسی سالی ٥٢٢ی پێش زاینـی‌دا دەستی پـێ کرد(٤٨) • لـــەم ڕووەوە چـوار بەسەرهاتمان لە چوار سەرچاوەوە بە دەستەوەیە : لە نوسراوەی بێستون دا لە هرودوت‌و ژوستین [کـە لـە تروگ پومپە ـ وە دینون وەرگیراوە ؟] وە کتسیاس(٤٩) ، هەر چوار سەرچاوەکە لـەم باسەدا یەکن کـە کمبوجیە لە کاتی لەشکر کەشی‌دا بۆ سەر میسر ، بە شێوەی نهێنی بردیەی برای خۆی کوشتووە(٥٠) • چونکە لەوە ترساوە کە پایەی سەڵتەنەتی لێ دا گیربکات • وە بە وتەی هرودوت بردیە لە سەفەری میسردا لەگەل کمبوجیە دا بووە ، وە لەوێوە گەڕاونەتەوە بۆ پارس وە بە فەرمانی پادشا بە دەستی پیاوێك کە ناوی [پرکساپس] بووە کوژراوە(٥١) •

بەلاَم چونکە ئەم کوشتنە بە نهێنی بوو پیاوێك بە درۆی خۆی خۆی ناو نابوو بردیە ، بە وتەی هرودوت ئەم کارە دو برا سازیان داوە کە هەردوکیان موغ بون • یەکێ لەو دوانە کە لە بردیە چودو هاوناوی ئەو بووە(٥٢) خۆی بە ناوی شازادەی پارسەوە ناو ناوەو ئەوی تریان کـە بـە وتـەی هرودوت [پارتیـزدیتس Patizdeiths ](٥٣)ی ناو بوە • بـەلاَم نوسراوەکەی بێستون تەنیا ناوی یەك گۆماتای موغ ئەبات کـە تروك پومپە [ دینون ؟ ] ئاگای لێی هەیەوە [گومتا] یشی پێ ئەووت(٥٤) • بـە پێی نوسراوەکەی بێستون بردیەی درۆ [لە قەلاَی پێ شیا ئوواد ـ لە سەر کێوی ئاراکادریش] دەرکەوتوە • لە بارەی ئەو کێوەو ئەو قەلاَیەوە هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی لێوە نەکردوون • بەلاَم لەوە ئەچێ کـــە لـە ســەرزەمینی مادا بوبێت • گۆماتاش دیسان لە کۆتایی دەسەلاَتداریتی خۆیا لە ماد بووە ، ئەگەر پشت

بە قسەکانی کرنفون [کسنفونت] بەسێتین ـ بردیە لە سەردەمی ژیانی خۆیا ساتراپی ئەوێ بووە(٥٥) • هەروەها لە نوسراوەکەی بێستوندا ئەڵێ : کە گئوماتا پارس [پرسید]ی تێ خرۆشاندوە نەك ماد •

بردیەی درۆ زۆر بە ئاسانی سەرکەوتو هەمو خەڵکی ئەمپەراتورێتەکەی بە پادشا یانزانیو سەریان بۆ دانەواند وە لە مانگی ژوئیەی ٥٢٢ حاکمی بێ شەریکی ئەمپەراتوری بو •بە وتەی هرودوت [ III ، ٦١] ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەمو ناوچەکانی کیشوەرەکەی خۆیا کێشاو لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت [ئەو چارەسەر کردنە جۆر بە جۆرانەی کە پێکی هێناوە لە دوایدا قسەی لێوە ئەکەین ، دیسان بەهۆی ئەوانەوە بلاوی کردەوە] • کمبوجیە لەو کاتەدا خۆی لە میسر بووە • کمبوجیە بە پەلە گەڕایەوە بۆ فارس [ ئیران ـ پرسید ] بەڵام لە ڕێگادا لە دنیا دەرچوو(٥٦) •

هۆی چیبو گئوماتا بە ئاسانی هەموو هۆزەکانی هێنایە ژێر ركێفی پارسو خۆی پارسەکانی قایل کرد کە پەیوەندی لە گەلا بکەن وە پەیوەندی یان لەگەل کمبوجیەدا ببرن ؟ بێ گومان بەد ناویو زوزداریو لێ نەهاتویی کوڕی کورشو تێك چونی شیرازەی لە ئەثیوپی [حەبەشە] لەو کاتەدا دەسەبەری بووە • وە هەروەها لەبەر ئەوە پارسەکان هێزەکانیانو بەشێکی زۆری دەستگا ئیداریەکانی مەرکەزی کیشوەر لە لەشکر کەشیدا بون لەگەل پادشا دا ، ئەمانە کاری یاخی گەرییان ئاسان کرد • بەڵام بەم جۆرە ئەبێ هۆی بنەڕەتی بە شتێکی تر دابنێین • گئوماتا لەگەل خەڵکی دانیشتوی ئەمپەراتوری هەندێك بەڵێنی دابو کە لە سەردەمی سەڵتەنەتی کورشو کمبوجیەدا لەوە نەئەچو بۆیان بکرێ ، وە ئەمە بەزویی خەڵکەکەی خستە سەر ئارەزووی پێك هێنانی حکومەتی تازەی ئەو • لە نوسراوەکەی بێستوندا بە ئاشکرا باس کراوە ، کە هەمو ئازادەکان بون بە دەستەی گئوماتا • [هەمو

خەڵکە شورشگێڕەکان یاخی بون پارس‌و مادو کیشوەرە کانی تر لە کمبوجیە جیا بونەوەو کەوتنــە دەستی ئـەو] • هــەروەها فارسی ، ومیدیاو وولاتانی تردانیان بە دەسەڵاتی ئەمدانا •

Kardharuva ramiciya abava, haca kanbuyiya abiyavam (a) siyava,utaparsa,uta mada,uta aniya dahyava. (٥٧)

بەڵام بە پێچەوانەوە هەمان ئازاد خواهان پشتگیری ئەو شورشگیرانەیان ئەکرد کە لە دوایدا ئاڵای راپەڕینیان بەرز کردەوە ـ هەروەکو لە دوایدا ئەی بینین ـ تەنیا دەستەیــەکی دیاریکراو لــە [ خــەڵکی شورشگیری ماد ] پشتیوانی فرورتیش یان کرد • کەوابو بۆچی هەمو خــەڵکی پشتیوانیان لــە گئوماتا ئەکرد ahmaxam tauhnaya ؟ پیــویســـتە ئەمەمان لە یاد نەچێ لە نێوان ئەو وڵاتانەدا(٥٨) کــە کــەم‌و زۆر لــە سەر ئارەزوی خۆیان سەر بەو بون ، لەو سەرزەمینانەدا بون کە لە بارەی ئابوری‌و فەرهەنگەوە وەکو یەك نــەبوون وە هیچ پــەیوەندی‌یــەکی ئابوری یان بــە یەکەوە نەبووە ، وە هۆی رێکەوتنی ئەمانــە هــەمان پــەیوەندی‌و بــەڵێنی گئوماتا بو کە پێی دابون •

سەرچاوەکانی ئێمە لە بارەی روی کۆمەڵایەتی کودتای گئوماتاوە چەند شێوەیەکی زیادو کەمی‌و لەیەك نەچوویان هەیە • هرودوت [ III ، ٦٧] ئەڵێ : مغ ••• بە ئاسودەگی لە ماوەی حەوت مانگی کە تا کۆتایی هــەشت ساڵ سەڵتەنەتی کمبوجیە مابوەوە ـ سەڵتەنەتی کرد • وە لــەم ماوەیــەدا گەلێك کاروباری چاکی فراوانی بۆ ئەو خــەڵکانەی کــە ســەر بــەو بون فەراهەم هێنا • بە جۆرێك کــە کاتێ کوژرا هەمویان لە ئاسیا دلگیر بون ـ جگە لە پارسەکان خۆیان •

مغ بە هەمو هۆزەکانی قەڵەمڕەوی پادشایی خۆی فــەرمانێکی دەرکرد کە عەفوبن لەو سێ ساڵە خزمەتە سەربازی‌یەی کەوتۆتە پێیان‌و ئــەو مەڕو

مالاٌتەی کراوە بە باج بە سەریانەوە • ئەم فەرمانەی بە بۆنەی چونە سەر تەختیەوە دەرکرد ، بەلاٌم لە مانگی هەشتەم دا ئاگاداری ئەوە بون •

لە نووسینەکانی کتسیاس‌و ژوستن لەم بارەیەوە ناتوانین شتێك وەر بگرین ، بەلاٌم نوسراوەکەی بێستون بەم جۆرە ئەڵێ : [کە کمبوجیە چووە میسر ئەو کاتە « خەڵکی شورشگێر » بون بە دوژمن ، وە ئەو کاتە درۆو دەلەسە لە کیشوەرەکانا ، لە پارس‌و لە مادو کیشوەرەکانی ترا زۆر بوو ، موغێك بە ناوی گئوماتا لە پێ شیائوا دا لەسەر کێوی ئارا کادریش راپەڕی ، رۆژی چواردەیەمی مانگی ویخن بوو کە یاخی بوو ، بەدرۆ بە خەڵکی شورشگێری وت « من بردیەی کوری کورش‌و برای کمبوجیە »م ، ئەو کاتە هەمو خەڵکی شورشگێر یاخی بون پارس‌و مادو کیشوەرەکانی تر لە کمبوجیە جیابونەوە کەوتنە دەستی ئەو • ئەویش حکومەتی بە دەست هێنا ، نۆیەمی مانگی گرمپد بو کە حکومەتی کەوتە دەست ، ئەو کاتە کمبوجیە خۆی لە خۆیەوە مرد •••] •



**وێنەی گئوماتا کە لە روی بەردەکەی بێستون نەخش کراوە ••**

[ ئەو حکومەتەی کە گئوماتای مغ لە کەمبوجیەی داگیر کرد لە سەردەمی کۆندا پەیوەندی بە خانەدانی ئێمە بووە ، ئەو کاتە گئوماتای موغ پارس‌و مادو کیشوەرەکانی تری لە کەمبوجیە وەر گرت • ئەو بە ئارەزوی خۆی

کاری ئەکرد ، بوو بە پادشا ، یەك کـەس نەبو ـ نە پارس‌و نە مادی‌و نـە خانەدانی ئێمـە [ ahmaxam tauhmaya · ] کە حکومەتی لە دەس ئـەم گئوماتایە هەربێنێ ، خەڵکی شورشگێر زۆر لەو ئەترسان ، ئەو ئەیویست زۆر لەو کەسانەی کە بردیەی پێشوویان ئەناسی لەناو بەرێ ، ئەو پیاو کوژ بوو ، « بۆچی منیـان نەناسی کـە بردیـەی کوڕی کورشم » ••• [ دوایی باسی کوشتنی گئوماتا بە دەستی داریوش‌و حەوت کەس لە هاوکارەکانی کراوە] •

ئەو دەسەڵاتەی کە لە خانەدانی ئێمە داگیر کرابو من دوبارە گرتمەوە ژێر دەستی خۆم‌و خستمەوە جێگای خۆی ، ئەو پەرستگایانەی کـە گئوماتا وێرانی کردبون هەروەکو چۆن بون کردمنەوە(٥٩) ئەوەی کە گئوماتای موغ گرتبوی گێڕامەوە ، خـەڵـکی شورشگێرم لــە جێگـای خۆیان نیشتەجێ کردەوە ، لە پارس‌و مادو کیشوەرەکانی تر(٦٠) لەوەبـەر چۆن بوو هـەمو شتێکم وەك خۆی لێ کردەوە ، ئەمەم بـە پشتیوانی ئاهورامزداوە کرد ، من تاکو خانــەدانی خۆمـانم لــە جێـگای خۆی دانایـەوە زۆر مـاندوو بوم vitam hyam ahmaxam ، من بـە هاوکاری ئاهورامزدا رەنجـم دا تاکو وەکو پێشوو تر ، ئەو کاتەی کە گئوماتای موغ دەسەڵاتی لە خانەدانی ماد وەرنەگرتبو وام لێ کردەوە(٦١) •

بەم پێیە بە وتەی هرودوت وا دەر ئـەکـەوێ کـە موغ لـە سـەر سیاسەتی قازانجی زوربەی خەڵك ئەڕۆیشت ، بەڵام نووسراوەکەی بێستون ئەڵێ : کە ئەو خەڵکی لە هەندێك مافی دارایی بێ بەش ئەکردو خەڵك لەو ئەترسان ، بەڵام لە واقیع دا لە یـەك کاتا ئـەم دووباسە ناتوانین بــە دژی یەکتریان دابنێین • نووسراوەکەی بێستون بە فەرمانی یەکێك نووسراوە کە بە دەستی خۆی گئوماتای کوشتوە ، بۆیـە دوژمنایـەتی لـە نێوان گئوماتاو خەلکیدا دروست ئـەکات ، لـەگـەل ئـەمـەشدا نووسراوەی بێستون زۆر بایەخدارە چونکـە بەرنامەی کرداری گئوماتا ئەخاتە روو • هرودوت باسی

گئومـاتا زۆر بە بێ لایەنی باس ئـەکات هـەروەکو ئـەڵێ : پارسەکان ناقایل بون .. لەگەل ئەوەشدا لـە دوای مردنی گئوماتا یەك بردیـە درۆزنی تازە دەرکەوت وە تێکۆشا کە بە رێبازگـەی گئوماتا دا بڕوات ، وە ئـەم بردیـە درۆزنە لە وڵاتی پارس ئاڵای یاخی گەری بەرز کردەوە[٦٢] وە بـەشێك لە وڵاتەکانی رۆژهـەڵاتی ئـەو ئەمپەراتوریەی داگیر کرد ، بـەم جـۆرە کۆمەڵێك لە پارس هاوکاری سیاسەتی بردیەی درۆیان ئـەکرد[٦٣] دیسـان هرودوت ئەڵێ : [خـەڵکی لـە ئاسیا زۆر بۆ گئوماتا دلـگیر بوون] لێرەدا دەرئەکەوێ کە گئوماتا بە ئاسانی هەمو دانیشتوانی ئەمپەراتوریەکەی کردبوە خۆی بەلام داریوش بەو نیازەی کـە گئوماتای هەڵدا روبەروی بەربەرەکانێ یەکی سەخت بوو لە وڵاتا .

دوو کەس لە دانشمەندەکانی سوڤیەت[٦٤] ـ ئاکاد میسین « و. وە ئاستروۆە » وە « و. ئاە تیورین »[٦٥] لـەو باوەڕەدان کـە گئوماتای موغ لەگەل گەورەکانو داریوش لەگـەل زوربەی خـەڵکە ئازادەکانی پارس دا تێکەڵ بون ، وە داریوش لە دواییدا سیاسەتی گەورەکانی گرت بە دەستەوە. ئاکاد میسین « و. و. ئاستروۆە» بۆ سـەلماندنی بیروڕای خۆی بـەم جۆرە بەڵگە دێنێتەوە : گئوماتا کە موغ واتا کاهن بوو ئەبوا لایەنگری گەورەکان بوایە وە ئەو کردەوە چارەسەریانەی کـە لـە پێناوی خێرو خۆشی زوربەی خەڵکدا کردی لە روی ساویلکە هەڵ خڵەتاندنەوە بوو ، « و. ئاە تیورین » ئەویش وەکو ئەم بیروڕایەی هـەیە وەزاراوەی [ مانیا – maniya ] ی [نووسراوەکەی بێستون ١٤ لە لاپەڕە ٢٢٩ – ٢٢٨ وە لاپـەڕەکانی دوایی وە هەروەها ٤٠٣ بە دواوە سەرنج بدە] بە مانای خەڵکی خانوو واتا بە [خانە خوێ]ی ناو بردوە . ئەو لەو باوەڕەدایە کە گئوماتا ژنو منـاڵی ئازادەکانی لێ ئەگرتن وە لە ئیشو کاری ئابوری سەڵتەنەتی خۆیا کاری پێ ئەکردن . پێویست بە باس کردن ناکات کە ئەم بیروڕایە لەگـەل باسـەکانی هرودوت

[وه به شێوەیەکی ناراستەو خۆ لەگەل باسەکانی نووسراوەی بێستون دا] له بارەی چۆنێتی حکومەتی گئوماتاوه جیاوازیەکی زۆریان هەیه •

لەمەوبەر باسی بیروباوەڕمان کرد [له لاپەڕه ٤١١ به دواوه] که زاراوەی کار kara یان [خەڵك - شورشگێر] ئەتوانێ هەمو کۆمەڵانی خەلکیئازاد بگرێتەوه • بەم هۆیەوه ئەبێ به ورد بینانه تر له بەندی چواردەیەمی نوسراوەکەی بێستون ورد بینەوه تاکو بزانین که گئوماتا چی گرتووە وه له کێی گرتووه(٦٦) •

١ - « گئوماتای موغ پەرستگاکانی وێران کرد » له نووسراوەی پارسی کۆن دا - مانای ئایادان - ayadana - بە هۆی ون بوونی سەرچاوەی ترەوه ناتوانین ورد تر لێکی بدەینەوه • به زمانی عیلامی - « سیان ناپ • پانا » siyannappana - به مانا [پەرستگای خواکان] ئەگرێتەوه ، وه به زمانی ئاکدی [بیتانه شائیلانی - Bitate se ilani به مانا [خانەی خواکان] ه • هەردو زاراوەی دوایی له بارەی پەرستگاوه بەکار هاتوه ، ئەگەرچی وشەی عیلامی [سیان - siyan ] لەوه ئەچێ شوێنێکی پیرۆزی سەرەوالاً بێ • بەلاًم بیروڕای ئێمه له سەر ئەوەیه که گئوماتای موغ پەرستگای خوا کۆنه ناوچەییەکانی وێران کردوه(٦٧) •

ئەم وتەی ئێمه به پێی ئەو بیرورایەی [ هرتلو هرتسفلد ](٦٨) که موغەکان به نوماینده‌ی کاهنه کۆنەکانیان [ ئاینه سروشتی ]یەکان که دوژمنایەتی ئاینی زەردەشتیان ئەکرد ، دائەنا جیاوازه ، چونکه ئەوەنده بەلگەو سەرچاوەمان به دەستەوه نیه که موغەکان به دژی ئامۆژگاریو یاسای زەردەشت دابنێین •

هرودوت ئەلێ : که له ناو پارسەکانا لەو سەردەمەدا مەزهەبی موغەکان رۆژ بەرۆژ زۆر تر بایەخی ئەسەند • لەگەل ئەوەدا که بیرو باوەڕی مەزهەبی پارسەکان لەگەلً ئامۆژگاریو یاسای ئاینی موغەکان زۆر جاواز

بون‌و پارسه‌كان له‌گه‌لیك كاتا به‌ نهینی په‌یره‌وی مه‌زهه‌به‌ كه‌یان كردوه‌ •
وه‌ ئه‌گه‌ر وه‌كو هه‌مو نوسه‌ره‌كانی سه‌رده‌می كۆن بلێین كه‌ موغه‌كان راگه‌یه‌نه‌ری ئامۆژگاری و یاسای زه‌رده‌شت بون ئه‌وه‌ یان راست تره‌ •

ئه‌وه‌نده‌ ئه‌زانین كه‌ له‌وه‌ دوا له‌ سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی پێنجه‌می پیش زاینی‌دا خشایار شا پادشای تازه‌ی پارس — هه‌روه‌كو خۆی له‌ نوسینه‌كانی خۆیا یادی كردوه‌(٦٩) — جارێكی تر په‌رستگای [دیودان Daivadana] واتا جێگای خوا كونه‌ ناوچه‌یه‌كان یان «دیوان» -Daiva -ی تێك دا(٧٠) •

له‌ نوسینه‌كانی خشایار شادا ئه‌وه‌ ده‌ر ئه‌كه‌وێ كه‌ سیاسه‌تی ئه‌و له‌گه‌ل سیاسه‌تی داریوشی یه‌كه‌می باوكی جیاوازه‌ • «وه‌ • وه‌ • ئاستروه‌وه‌»(٧١) وتویه‌ كه‌ ره‌نگ بێ خشایار شا خۆی به‌ [سئوشیانت] — واتا منجی [ئامۆژگاری زه‌رده‌شت] ناو بردوه‌ •

له‌وه‌ ئه‌چێ موغه‌كان له‌ خشایار شاوه‌ نزیك بوبن وه‌ له‌ له‌شكر كه‌شی دا بۆسه‌ر یۆنان به‌ره‌سمی به‌ شداری‌یان كردوه‌ هه‌روه‌كو كاهن وغه‌یب زانه‌كان(٧٢) له‌گه‌ل ئه‌م هه‌موو به‌لگه‌و سه‌رچاوانه‌دا — هه‌موو زاراوه‌كانی نوسراوه‌ی هه‌خامه‌نشی‌و نه‌ریتی ئه‌وان [به‌ پێی به‌لگه‌ی كۆنه‌ شوناس] وه‌ باسه‌كانی هیرودوت له‌ باره‌ی بیرو باوه‌ری ئاین‌و نه‌ریتی پارسه‌كانه‌وه‌(٧٣) ئه‌مانه‌ هه‌موو ئه‌وه‌ ئه‌سه‌لمێنن كه‌ ئه‌گه‌رچی ئاینی پادشاكانی پارس له‌ زه‌رده‌شتیه‌وه‌ نزیكتر بوون به‌لام له‌گه‌ل یاسای زه‌رده‌شتیدا به‌ ته‌واوی یه‌ك نه‌بون •

به‌لام له‌ باره‌ی ئامۆژگاری‌و یاسای موغه‌كانه‌وه‌ كه‌ له‌گه‌ل یاسای زه‌رده‌شتی ئه‌م دواییه‌دا زۆر له‌ یه‌كتره‌وه‌ نزیك بون به‌ ته‌واوی له‌ یه‌ك نه‌چون •

هه‌موو ئه‌م سه‌رچاوانه‌ ئه‌وه‌مان ئه‌ده‌نه‌ ده‌ست كه‌ موغه‌كان به‌ نوێنه‌ری ئاموزگاری و یاسای زه‌رده‌شت بزانین(٧٤) •

ئێمــــه ناتوانین ئامۆژگاریەكانی زەرەدەشت ــ تــەنانــەت بـــە شــیوه سەرەتاییەكەی ئاینداری پێ بلێین ،وه بە تایبەتی بەو شێوەی كە لە دەربارەكانی مادو پارس پەیدا بوبو دای بنێین •

بــەلاّم ئــەو ئامۆژگاریانه تا رادەیــەك لــەناو خــەڵـكە ئازادەكـانو زەحمەتكیشەكانا رێزی ئــەگیراو ئــارەزو خــوای زۆر بـــو ، [ هـــەمو لێكۆڵەرەوەكان لەم بارەیەوه بیرو رایان وایە] •

ئینجا لە بەر ئەوه گئوماتای موغ پەرستگای خوا ناوچەیە كۆنەكان كــە جێگای نازو سەرچاوەی دەسەلاتی پیاو گەورەكانی خانەدانە ناوچەیەكان بوو تێكی دان •

هەروەها ئاكاد میـین « وه • وه • ئاستروەوه » كە ئەمەی بــە ســاوێلكە فریودانی ناو ئەبا به تەواوی راستە •

ئێمه نابێ گئوماتا به تەواوی به خەڵك دوستی دابنێین ، ئەو رەنگە بێ له نێوان هەموو خەڵكدا هاوكاری بۆ خۆی پــەیدا كردبێ بــەلاّم ماهیەتی كاروباری ئەو رۆژگاره بەربەرەكانێ نێوان چینه جۆر بەجۆرەكانی كاهنەكان بوه كــــه لــه ســەر دەسەلاتی سیاسیو ئابــوری لــەگـەل یــەكتریدا لـــە زورانبازیدا بون •

له لایەكی ترەوه نابێ گئوماتا به پاڵەوانی كودتا دابنێین كــه بۆ ئازاد كردنی مــاد تێكوشابێ ، كودتای گئوماتا راپــەڕینی خــەڵكی نەبو ، بــەڵكو گۆڕانێك بو له دەرباردا ، گئوماتا خۆی بــه پارسیو هــەخامەنشی دائــەنا ، لەبەر ئەوه بە هیچ شێوەیەك باسی گەرانەوەی دەسەلاّتی پیشوی ماد له ئارادا نەبوه ــ ئەگەرچی بانگاشەی ئەوه كه شای تازه ماده [هەروەكو له وتەكانی كتسیاس دا دەرئەكەوێ] لــه ناو خــەڵكی مادا بلاو بوبوەوه وه رەنگە بــێ ئەویش لــه سەر زەمینی مادا بارەگای خۆی هەڵدابێ لــه دواییدا هاوكارو لایەنگرەكانی داریوش تێكوشان كه هەموو خــەڵكی پارس قایل بكــەن كــه

گئوماتای سەرنیگون بوو گۆیا ئەیویست دەسەڵات لە پارسەکان وەربگرێ چونکە ئەو لە سەر زمینی ماد بوە وە ئەیویست حکومەتی مادەکان سەر لەنوێ دروست بکاتەوە •

ئەم باسە لە نوسراوەکانی داریوشی یەکەمو[٧٥] نوسراوەکانی هرودوت دا [ III ، ٦٥ ، ١٢٦] دیسان هەیە •

بەڵام بە راستی لەگەل ئەوەدا کە گئوماتا هەوڵو تەقەللای زۆری دا لەگەڵ هەموو خەڵکە ئازادەکانا بەشێوەی گشتیو بە تایبەتی لەگەڵ مادەکانا پشتیوانی بکەن ئەوە نە دیموکرات خواز بوو وە نە ئارەزوی لەسەر زیندوکردنەوەی ئەمپەراتوری مادبو •

٢ ـ وەکو لە مەوبەر وتمان کە لە باشترین لیکدانەوەی نوسراوەکان دا دەرکەوتوە گئوماتا کەلوپەلی ناو ماڵو خەڵک بە تایبەتی لادێیەکانی لە شورشگێرەکان زەوت کردوە ، ئەو باسەی ئەم بەسەرهاتە باس ئەکات[٧٦] ئەبێ لەگەل نوسراوەکانی سەرەوەدا لیکیان بدەینەوە ، لەوە ئەچێ نوسەری نوسراوەکانی بێستون لێرەدا [لەو خەڵکە شورشگێرانە بوبێ کە لە ناو کومەڵەکانا بون] [kara hya vitapatiy ] [ •

لە نوسراوەکەی بێستوندا ئەوەمان دی کە مانای ئەم رستەیە بەشێك لە ئازادەکان ئەگرێتەوە کە نەهاتبونە ناو لەشکری هەمیشەییو کۆڕو دەستگای ئیداریەوە •

لەبەر ئەمە بەشێوەی گشتی ئازادە سادەکان بون بەلام گەورەکانی عەشیرەتە ناوچەییەکان کە لەوانی تر دواکەوتو تر بون ئەوانیش لەناو لەشکرو دەسگا ئیداریەکانا نەبون •

وە ئەمە ماوەی نوسەرەکانی نوسراوەی بێستونی داوە کە لە بارەی گئوماتاوە شتی سوك بنووسن •

بەلام بچوکترین بەلگەی راستی ئەم بیروڕایە بە دەستەوە نیە

که لەمەوبەر نوسیمان •

ئەگەر وابوایە نوسەرە یونانیەکان لەم بارەیەوە شتیکیان باس ئەکرد •

لەو نوسینانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە لە کاتی ئەو بگرەو بەردانە دا گەلیك تالانیو خەڵك بە دیل گیراون بەڵام ئایا کێ ئەو تالانیو دیلانەی گرتوە ؟ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە لە [گاتا] کانیشدا دیسان ئەم جۆرە باسانە کراون(٧٧) •

بەم جۆرە گەورەی عەشیرەتە ناوچەییەکان زیانیان لە گئوماتا دیو خەڵکە ئازادەکانیش سودیان لێ وەرگرت •

ئەم وتەیە لەگەل نوسینەکانی هرودوتدا ئەگونجێ کە ئەڵێ : گئوماتا خەڵکی سێ ساڵ لە باج وخەراجی ئاژەڵو خزمەتی لەشکر عەفو کرد،وە ئەمە زۆر سودی خەڵکە ئازادە سادەکانی تیا بو •

هەمو پیشکەوتنەکانی گئوماتا پەیوەندی بە شورشگیرەکانەوە بووە کە لە خانوو کۆمەڵەکانا ئەژیان •

ئەوانەی زیانیان لێ کەوتو ئەوانەی سودیان وەرگرت هەر لەم کۆمەڵانە بون •

لەوە ئەچێ گئوماتا دەستی لە گەورەکانی دەربارو سەرکردەکانی لەشکر نەدابێ چونکە یەکەم ئەوانە بنکەی هێزو سیاسەتی راگرتنی کیشوەرەکە بونو گئوماتا لە کیاکسارو کورش کەمتر نیازی بەخۆ قایم کردن نەبو ، دووەم زۆر بەهێز بو لەگەل ئەو بارو هێزەی کە گئوماتا بویەتی جموجوڵی ئەوانە هەر سامناك بوە •

لەگەل ئەوەدا کە دوژمنەکانی گئوماتا بەشێکی دیاری لە گەورەکان [وە بە تایبەتی گەورەی عەشیرەتەکان] بون چونکە گەورەی عەشیرەتەکان لایەنگیری داریوشیان ئەکرد •

گئوماتا کە بە یەك کودتای دەرباری دەستەلاتی کەوتبوە دەست لە

ئەنجامی کودتایەکی تری دەرباریدا لەناو چو ، بە پێی وتەکانی هرودوت یەکیك لە ژنەکانی خێزانی خۆی ـ ئەو ئافرەتەی کـە لـە کەمبوجیەوە پێ گەیشتبو رازونیازی گئوماتای لـەلای باوکی خۆی کـە یـەکیك بوو لـە گەورەکانی پارس درکاندیو ئاشکرای کرد •

داریوش کـە لـە لقێکی تردوە شـازادە بووە لـە خانـەدانێکی تری هەخامەنشیەکان بو بە هاوکاری لەگەل شەش کەس لـە دوستو برادەرانی کە ئەوانیش لە گەورەکانی پارس بون[٧٩] بە نهێنی یەوە چونە نیشتەجێ کەی لە قەلای [سیکایائوواتیش] ـ لە ناوچـەی [نیسای] ماد [کـە بـە ئاشوری : نیشای ، نیششا]ی پێ ئەلێن •

وە لە رۆژی دەیەمی مانگی ـ گایادیش ـ [٢٩ سیپتامبری سالی ٥٢٢ ی پێش زاینی کوشتیان] •

بە پێی وتەی هرودوت چەند کەسێك لـە لایـەنگرانی داریوش لـە دوای کوشتنی گئوماتا پێشنیازیان کرد کە لە جێگای حکومەتی سەلتەنەت ، حکومەتێکی خانەدانەکان یان [ئولیگارش] وە یان تەنانـەت دەولەتێکی گشتی دیمکراسی دا بمەزریت •

هرودوت هەر باسێکی لـە هـەر کـەسێکەوە وەر گرتبێ تەنیا بـەوەوە نەوەستاوە کە چۆن باسی دەولەتو رێکخراوو ریژیمەکەی بۆ کردوەو ئەمە ئاسلوبی هـەموو مێژو نوسێکی سەر دەمی کۆن بووە کـە هەمیشە ویستویانە بیروڕای خۆیان بە زمانی ئـەو کـەسەوە دەربڕن کـە باسـەکە ئەگێرێتەوە ••

ئەمە جێگای سەرنجدانە کە هرودوت لـە شوێنێکی ترا سورە لـەسەر ئەوە کە ئەم وتەیەی ئەو راستەو لە دوایدا داخ هەل ئەکێشی کە یۆنانیەکان باوەڕی پێ ناکەن •

بەلام لە واقیع دا لەم باسەدا هیچ شتێکی ئەوتوێ تیـا نیـە کـە شایانی

ئەوەبێ باوەڕی پێ نەکرێ(٨٠) •

لە سەرەتای کۆمەڵگای چینایەتیدا هەر پایەو پلەیەك بە شێوەی کۆمەڵو کۆمەڵ کاری بەڕێوە ئەبرا وە ئەمانە پاشماوەی ڕێکخستنی عەشیرەتی بونو(٨١) لە ژێر دەسەلاتی گەورەکانی عەشیرەتەکانا بەڕێوە ئەبران •

ئاشکرایە ئەندامەکانیان تێ ئەکۆشان کە دەستگایەك پێك بێنن تاکو قودرەتی سەڵتەنەتو دەستەلات لە ناو سنوری وزەو دەسەلاتی زەحمەتکێشەکانا بو بێت ـ بەلام سەلتەنەتی شاه سەرکەوتو بوو •

## ٣ ـ ڕاپەڕینی فرەوەرتیشو ڕاپەڕینەکانی تری دژی هەخامەنشیەکان

لە دوای ئەوە کە داریوش گئوماتای کوشت وە لە مادو پارس‌دا بو بە خاوەنی حکومەت ، هەوالی پێ گەیشت کە عیلام [لە وێدا یەکێك بە ناوی ئاشین ڕاپەڕی بو] و بابل [لە ویدا نی دین تو ـ بل یاخی بووە خۆی بە کوڕی نابونید دوا پادشای بابل ناو نابو] ئەمە لە قەڵەمڕەوەکەی ئەو جیا بۆتەوەو ئالای سەربەخۆیی‌یان هەڵکردوە •

ئەمە هێشتا سەرەتای ڕاپەڕینی گشتی نەبو ، بەڵکو ئەو ناوچەو وولاتانەی کە لە روی ئابوری‌یەوە بە هیچ جۆریك پەیوەندی‌یان لەگەل پارس دا نەبوەو لەوان جیا بون وە ئەمە بە نیسبەت ئەمپەراتوری هەخامەنشیەوە بە بەشێکی ئاسایی ئەزانرا •

ڕاپەڕینی گشتی نەختێك درنگ تر لە کۆتایی مانگی نوامبەر ـ وە لە سەرەتای دیسامبەری ساڵی ٥٢٢ی پیش زاینی ـ لە کاتێکدا کە داریوش لە بابل دا سەرگەرمی شەڕ بوو دەستی پێ کرد •

وه له واقیع دا راپەرینێك نەبوه ، بەڵكو هەر لەو كاتەدا له چوار لاوه له چوار شوینی جۆربەجۆرەوه راپەڕین بەرپا بوو •

پیاوێكی ماد كــه ناوی فرورتیش [ فرائورت ] بو كــه خــۆی بــه خشتریتای دووەمی خانەدانی كیاكسار ناو ئــەبرد سەركردەی یــەكێ لــەو شورشانه بوو •

دانیشتوانی مادو پارتو هیركانیه پاڵیان پێوه داو لەگەلی كەوتن •

خەڵكی ئەرمەنستانیش كه لەوەبەر دەستیان به شورش كردبو ئەوانیش پشتیوانیان كرد •

سەركردەی راپەڕینی دووەم ناوی وهیزداته [ vahyazdata ] بوو•

ئەویش وەكو گئوماتا خۆی به بردیەی كوری كورش دانابو •

جگه له بەشێكی گرنگی پارس [بەشی رۆژهــەڵاتی ؟][٨٢] ناوچــەكانی رۆژهەڵات ـ واتا [ساتاگیدیه] لەگەل [ئاراخوسیا] ، [ساتراپ نشینی حەوتەم، به وتەی هرودوت • ئــەم بەشه لــه قەڵەمرەوی پادشایی كیاكسار نــەبو وه كورش داگیری كردبو•خەڵكەكەی لەگەل وهیزداته بون نەك فرورتیش][٨٣] •

لێرەدا مەبەست له هەردو راپەرینەكه زیندو كردنەوەی یاسای سەردەمی بردیەی دروزن [ئەو یاساو ریژیمەی كه داریوش تێكی دابو] مەبەست بو •

بەڵام لەوه ئەچێ كه راپەریوەكانی لــەو سنورەش بــەولاوه رویشتبن چونكه هەردو شۆرشەكه وەكو راپەرینی گشتی خەڵكی لێ هاتبو •

لــه نوسراوەكــەی بێستون دا داریوشی یــەكــەم وتویــەتی «خــەڵكی شۆرشگێری ماد كه له كومەڵه كۆبون چونه لای فرورتیش •

هەروەكو لەمەوبەر باسمان كرد ئەمانه ئەو بەشه خەڵكەی كیشودەرەكه بون كه راستەوخۆ پەیوەندیان به كاروباری گئوماتاوه بووه •

گومانی تیا نیه كه خەڵكی ئازادی ماد له ناو یاخی گەری هاو كاردكانی فروتیشدا بون ، به شێوەی گشتی ئەم راپەرینه گشتییەی خەڵك بەری لێ نەئەگیرا[٨٣] دوباره •

راپەرینی سێیەم کە لە مرغیانا [ بەشێك لە ولاتی باکتریا ] کـە فرادا ناوێك رابەری ئەکرد[٨٤] دەستی پێ کرد ئەویش لەگەل ئەمانی تر بوو •

چونکە راپەرینی دووەم عیلام و پارسی رۆژ ئاوا [ کـە لـە سەردەمی پیشودا سەر بەو بوە ] لەژێر سەرکردایەتی مرتیا ـ کە خۆی بە هومپانیکاشی چوارەم [ئومانیش] پادشای عیلام ناو ئەبرد رویەکی تری بووە •

ئەم راپەرینە زۆر بە گورجی بە هۆی هێزە ناوچەییەکانەوە تێك شکا • ئەرمەنستان بەر لە چونە سەر تەختی داریوشی یەکەم لە شورشدا بوە نوسراوەی بێستونی سوریە ـ ئاشـورو میسرو سکایـیـەکان بـە بەشێك لـەو ناوچەو هۆزانە ناو ئەبات کـە لـە کۆتایی سالی [٥٢٢]ی پێش زاینیدا ئالای یاخی گەریان بەرز کردبۆەوە •

وەکو بەرچاو ئەکەوێ کـە شۆرشی سوریە [ئاشور] لەگەل راپەرینی ئەرمەنستانا پێکەوە بەند بوون •

بەلام راپەرینەکانی میسرو سکایيەکان بـە پارچە پارچـە ناو ئەبرا نکە کەوتبونە سنورە دور دەستەکانەوە •

ئەوانە لە روی ئابوریەوە سەر بە خۆ بون وە ئەتوانین ئەوانە لەم باسەدا ناویان نەبەین •

ئەگەر مەسەلەی راپەرینی ئەرمەنستان بخەینە لاوە سێ راپـەرینی تر ئەمێنێتەوەو ئەبێتە جێگای سـەرنج ایدانی ئێمـە ، ئەو سێ راپەرینەی کـە داریوش لە دیسامبری سالی [٥٢٢]ی پێش زاینی روبەرویان بوەوە •

ئەم سێ راپەرینە فرورتیش‌و هێزداتەو فرادا رابەرییان ئەکرد •

دادرشیشی پارس ، ساترابی باکتریا راستەوخۆ لـە دژی فرادا دەستی کرد بە شەڕ ، ئەو مرغیانیەکانی لـە سەرەتای دیسامبری سالی ٥٢٢ی پێش زاینی دا راو ناو زۆری لێ کوشتن[٨٥] •

بـەلام پارسەکان ماوەیەکی زۆر نـەیانتوانی فرادا دەستگیر بکـەن •

ویوانا ساترایی ولاتی حەوتەم ئەویش لە دژی لایەنگرانی وهێزداتە [بردیەی درۆ] لە ئاراخۆسیا کەوتە شەرەوە ، لەم کاتەدا شەڕەکە لە دیسامبرەوە تاکو فوریە درێژەی کێشا .



**وێنەی فرورتیش لەڕوی نەخشەکەی بێستون وەرگیراوە**

لە ۲۱ی فوریەی ساڵی [۵۲۱]ی پێش زاینی ویوانا توانی ئەو سەردارەی کە وهێزداتە ناردویەتی دەستگیری بکا .

بەڵام وهێزداتە خۆی تا مانگی ژویە لە پارس [پرسید] خۆی نەدا یە دەستەوەو مایەوە .

هەروەکو وتمان لەدیسامبری ساڵی ۵۲۲ ی پێش زاینی داریوش لە بابل بووە .

وە لەوێ دو لەشکری کۆ کردەوە ، یەکێکیان کە داد رشیش ئەرمەنی سوپا سالاری بو ناردی بۆ سەر ئەرمەنستان وە رای سپارد کە یارمەتی لەشکری واخومیسارا بدات کە لەوە بەر لە بین‌النهرینی ژورووی لە دژی لەشکری ئەرمەنیەکان لە جەنگا بوو .

ئەوی تریان نزیکترین هاورێی خۆی ویدارنای کرد بە سەرکردەی‌و ناردی بۆ شەری فرورتیش .

تا ئەو کاتەی ماد داگیر نەکرابو واخومیساو دادرشیش ـ لەگەل ئەوەدا چەند جار لەگەل ئەرمەنیەکانا کەوتبونە شەرەوە ـ لە ناو ئەوان هاتبونە دەرەوە •

لەوە ئەچێ ئەرمەنیەکان لەگەل فرورتیش دا پەیوەندیان هەبوبێت •

بەلام لە بەرەی ویدارناوە ••• ئەو لە ١٢ی ژانویــەی ســالی ٥٢١ی پیش زاینی(٨٦) لەگەل یەکێك لــە ســەرکردە سوپاییەکانی فرورتیش لــە سنوری خواروی رۆژ ئاوای مادەوە کەوتە شەڕەوە بەلام ســەر نەکەوت وە لە کامپاندا [هەمان ناوچەی پیشوی بێت ـ هامبان ـ ئالی پی](٨٧) چاوەڕوانی هاتنی داریوش‌و لەشکرەکەی ئەکرد •

فرورتیش ناچار بو لە دو [جەبهە] بەرەگەی شەڕەوە شەڕی ئەکرد • لەو سەردەمــەدا کــە لــە رۆژ ئاوا [بەرامبەر ویدارنا وهێزەکانی تری داریوش راوەستا بو] داکۆکی لە سەر خۆی ئەکرد •

لە لای رۆژ هەلاتەوە هیستاسپ [ویشتاسپا] باوکی داریوش کە ساترایی پارت بو(٨٨) لە دژی ئەو دەستی کرد بە جموجول ، لەگــەل ئەوەدا ـ بــە پێی نوسراوەکەی بیستون ـ بەشی زۆری [خەلکی ـ شۆرشگێڕ] لە پارت‌و هیرکانیە پشتیوانی فرورتیش یان ئەکرد •

بەلام بەم جۆرە ئەوە ویشتاسپ بە هاوکاری بەشێك لــە لەشکرەکەی خۆی لە مانگی مارسی ســالی ٥٢١ ی پێش زایینی‌دا لــەگــەل شۆرشگێڕەکانا کەوتە شەڕەوە ، وە هەروەکو پێشو لە سەرزەمینی پارت دا مایەوە •

لە مانگی ئاوریل داریوش لە بگرەو بەردەی شورشی بابل رزگاری بوو روی کردە ماد وە لە هەمان کاتا بەشێك لــە لەشکرەکەی خۆی ـ کە لــە پارس‌و ئەو مادانەی لەگــەلیا بون پێك هاتبو ـ لەژێر سەرکردایەتی [مارت وردیە] ناردی بۆ سەر وهیزداتە •

زۆربەی هێزەکانی داریوش لــە [ ٢٦ی مانگی ئادوکانیش ] لــەگەل

هێزەکانی فرورتیش لە کوندورو [ kunduru ] ـ لە خاکی ماد ـ روبەرو بونەوە •

فرورتیش شکا وە لەگەل ژمارەیەکی کەم لە سوارەکانیا رایان کرد بۆ ناوچەی رغە [ری] ئەو پەڕی سنوری رۆژ هەلاتی کیشوەرەکەی وە زۆر هیوای بە کۆمەکی پارتو هیرکانیەکان بوو •

لە ژوئیەی سالی [٥٢١]ی پێش زاینی داریوش هێشتا نەیتوانیبو ئاگری شەڕو شۆڕی ماد خامۆش بکات •

چونکە لە ١٢ و٢١ ژوئین کەوا خومیساو دادرشیش ئەرمەنی لەگەل ئەرمەنیەکانا شەڕیان ئەکرد ، ماد هێشتا نەکەوتبوە ژێر دەست داریوشەوە ، وە یان هەرچۆن بێ تواناى نەبو لەوێدا لەشکرێکی گەورە بۆ بەهێز کردنی سەردارەکانی خۆی کۆ بکاتەوە ، بەلام لە کۆتایی مانگی ژوین کومەلێك لە جەنگاوەرەکان کە داریوش ناردبونی بۆ رغە [ری] فرورتیش یان دەستگیر کرد •

داریوش کومەلێکی نارد بۆ رغە [ری] بە هاواری ویشتاسپەوە ، وە لە شەڕی پاتیگربان ـ لە خاکی پارت رۆژی ١٢ی ژوئیەی سالی ٥٢١ پێش زاینی دوا دەستەی هاوکاری کەرانو هاو پەیمانەکانی فرورتیشی لەناو برد(٨٩) •

لەبەر ئەوە فرورتیش حەوت مانگ زیاد لە گئوماتا خۆی ڕاگرت وە ماوەیەکی زۆر لە قەلەمرەوی شانشینەکەی خۆیا بەرامبەر بە لەشکری داریوش راوەستا ، بەلام لە دوایدا هەر ژێر کەوت •

داریوش لە نوسراوەکەی بێستون لە بارەی سەرەنجامی فرورتیشەوە بەم جۆرەی نوسیوە : [فرورتیش یان دەستگیر کردو هێنایان بۆ لای من ، من لوتو گوێو زمانی ئەوم بڕی ، هەردو چاوەکانم دەرهێنا لە دەرباری منیا بە زنجیر بەستیانەوە وە هەموو خەلکی شۆرشگێر بە چاوی خۆیان چاویان

پێ کەوت •

ئەو جار فەرمانم دا کە لە ئەکباتانا نایانەوە بە نیشانەی نێزە ، ئەوانەی کە لە سەرەتاوە لایەنگری ئەو بون لە ئەکباتانا لە ناو قەلاکەدا لە دارم دان] کردەوەی هەخامەنشیەکان لەگەڵ کەسانێك دا کە داوای فەر مانفەرمایی سەربەخۆییان ئەکرد بەم جۆرە بووە[٩٠] •

لەگەل ئەوەشدا شۆڕشی ماد بەمە کۆتایی پێ نەهات ، هۆزی ساگارتیەکان خۆیان نەدا بە دەستەوە[٩١] وە پیاوێك کە ناوی [چیتران تخمە] بوو خۆی کرد بە پادشا ووتی من لە خانەدانی کیاکسارم •

داریوش بۆ ئەوەی ئەم شۆڕشە بکوژێنیتەوە ــ لە سەر زمینی ماد چەند کەسێکی وەفاداری هەبوو کە پەیمانی هاریکاری یان پێدابوو وە هاوکاریان کردبو ، وە ئەوانەش لە گەورەکان بون •

لەشکری پارس و ماد بە سەرکردەی [تهماسپا دای] مادی بە هەڵبە دوا ئاگری شۆڕشەکەی فرورتیش یان کوژاندەوە چیتران تخمەیان لە ئاربل ــ سەرزەمینی پیشوی ئاشور ــ نایەوە بە نیشانەی نێزەو کوشتیان ، ئاژاوەو بگرەو بەردە بەمە کۆتایی پێ نەهات •

وردە شۆڕش لەم لاو لەو لادا هەر هەبو ، بەلام لە دوای قەلاچۆ کردنی یاخی بووەکان و بە تایبەتی لە دوای کوژانەوەی شوڕشی فرورتیش و وهێزاداتە ، داریوشی یەکەم توانی ئەمپەراتوری هەخامەنشیەکان بە رزگارکراو دابنێت •

هۆی تێك شکاندنی ئەم شۆڕشانە چی بوو ؟ بەڕای ئێمە نەبونی یەکیەتیەکی ناوخۆو دەرەوە بوو ، چونکە وهێزداتە و فرورتیش وەکو شۆڕشگیرەکانی تر کە یەك ئامانج و یەك ڕێبازگە بن ، نەبون بەڵکو بەرەبەرەکانێ یەکتریان ئەکردو هەر یەکە بۆ خۆی کاری ئەکرد •

ڕەنگ بێ هۆی ئەم بارە ئاڵۆزە ئەوە بوبێ کە هەندێك ناوچە لە ڕوی

ئابوریەوە بە شێوەی گشتی هێشتا لە پلەی ئابوری سروشتی دا ئەژیان •

لە لایەکی تریشەوە داریوشی یەکەم لە پارس وماد ژمارەیەکی زۆر لایەنگری یان ئەکرد ، ئەوانە لە سەرەتاوە بریتی بون لە سەرەك عەشیرەتەکان•

لە دواییدا سەرکردەو کاربەدەستەکانی دەولەت ، هەروەکو گوبریا پشتیوانیان ئەکرد •

هیچ گومانی تیا نیە کە داریوش توانی بەشێك لە زەحمەتکێشە ئازادەکان بە تایبەتی بێنێت بۆ لای خۆی •

هەروەها نەك هەر گەورەکان بەڵکو هەموو خەڵکی پارس راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ، لەو دەرامەتانەی کە لە ئەنجامی دەسەڵاتدارێتی ئەمپەراتوری هەخامەنشیدا دەس ئەکەوت بەشدار ئەبون(٩٢) •



**وێنەی چیتران تخمە کە لەروی نەخشی بەردەکەی بێستون گیراوە**

بۆ ئەوەی هۆی بنەڕەتی تێك شکانی راپەڕینەکانی خەڵکی لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا تێ بگەین ئەبێ بزانین کە لە کاتی گۆرینی باری مێژویی ئەو سەر دەمەدا چ شتێك سەرکەوتوانە بووە •

لەو کاتو سەردەمەدا کەلوپەلی ئاسن زۆر باو بوە وە لەشکرەکان بە چەکی ئاسنین پر چەك ئەکران(٩٣) •

ماد لە دوای را پەرینی فرورتیش‌و لە ئەنجامی ئەو راپەرینەدا پلەی رسمی خۆی ـ واتا یەکەمین ولاتی ئەمپەراتوریەکەی [ بەرامبەر بە پارس ] لە

دەست چوو •

لە نوسراوەکەی بێستون ناوی ئـەو سەرزەمینە بە دوابەشی ســاتراپ نشینەکانی رۆژ ئاوا ناو براوە •

راستە کە هەندیك دوای ئەوە سەر لـە نوێ ناوی ماد لـە ناوەڕۆکی ناوی ولاتەکانا جێگای هەبو ، بـەڵام لە واقیعدا بـەرە بـەرە وەکو ساتراپ شینێکی هەخامەنشیەکانی لێ هات •

بێزاری خەڵکی ماد هـەندێك جـار دوای داریوش وەکو راپـەڕینو یاخی گەری لێ هات ، بۆ نمونـە دانیشتوانی ئـەو ناوچەیە لە سالی ٤٠٨ی پێش زاینیدا راپەڕین[٩٤] •

وەکو دەر کەوتوە سەرزەمینی ماد لە یەك روەوە لـە ناو ئەمپەراتوری هەخامەنشیەکانا بارێکی تایبەتی بووە وەکو ساترا پەکانی - بە لای کـەمەوە هەندیك جار - پارس نەبوە بەڵکو دانیشتوانی خودی ئەو کیشوەرە هەمویان مادی بون[٩٥] •

هەروەکو ئارپاك ساترابی ماد لە سەردەمی ئاردەشیری دووەمدا[٩٦] کە ئەمە خۆی مادی بوە •

هەروەها [ئاترویات][٩٧] دوا ساترابی ئـەو سەرزەمینە لـە سەردەمی هەخامەنشیەکانا ئەویش مادی بوە •

لەشکرەکانی ماد بە پێی نەریتو یاسای ئـەو رۆژە لـەناو لەشـکر کەشیەکانی هەخامەنشیەکانا بەشداریان ئەکرد •

لە شەری ئێرانیەکانا لەگەل ئاتینەکانا لە ماراتون [سالی ٤٠٩]ی پێش زاینی یەکێ لە سەردارەکانی ئێران کـە ناوی داتیس [ Datis ]بـووە مادی بووە •

وە گرم میتر وە تی‌تی کورەکانی ئـەم داتیسە فەرماندەی سـوارەکانی خشایارشا لە کاتی لەشکر کەشیە گەورەکەدا بۆسەر یونان ئەمانە سەرکردەو

لێ پرسراو بون •

مادەکان بە هاوکاری پارسەکانو سکاییەکان بە جەنگاوەری بوەڕ پێکراوو پشت پێ بەستراو ناو ئەبران وە ئەمانە هێزی سەرەکی چەکداری لەشکرەکەی خشایارشا بون •

لە دەراوی ترموفیل مادەکان بون کە لە کەناری عیلامیەکان [کیسی یەکان]و پارسەکان سەخت ترین شەریان ، لەگەل دەستەی لئونیداس دا کرد •

جگە لە شەڕکەرە پارسیەکان مادیو سکاییو باکتریایو هێندی لە ناو لەشکردا هەبون •

بەم جۆرە لە سەردەمی خشایار شادا مادەکان بە بەشی لە هێزی لەشکری ئەمپەراتوری هەخامەنشی دائەنران •

رەنگ بێ هەخامەنشیەکان هەولی ئەوەیان دابێ کە خەلکی ماد لە تالانیو دەسکەوتی شەڕی دا بەشدار بن •

لە هەمان کاتا گەورەکانی ماد لەگەل گەورەکانی پارس دا تێکەلیو دۆستایەتی پەیوەندییان هەبو ، هەروەها مادەکان لە لەشکری ئاردەشێری دووەمدا جێگایەکی بەرزیان هەبوە •

ئارپاك ساتراپی ماد ـ کە یەکێك بوو لە سەردارە گەورەکانی ئاردەشێری دووەم ـ لە شەڕی کوناکس دا کە لە نێوان ئاردەشێرو کورشی بچوکی برایا رویدا لە سەر دو پەت یاری کرد •

یەکەمجار چوە لای کورش وە لە دواییدا گەڕایەوە بۆ لای شا •

وە بە پێی وتەی [پلوتارك] لە ئەنجامدا ناچار بو قسەی سوكو گالتە پێ کردن لە ئەنجامی ئەو یاری کردنەیا قبول بکات •

لە کۆتایی سەدەی پێنجەمو سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا کەمتر ناوی مادەکانمان لەناو ئەمپراتوری هەخامەنشیدا بەرچاو ئەکەوێ •

هەروەها هەندێك لە گەورەکانی ماد لەگەل گەورەکانی پارسدا بونە

یەك وە هەندیکیان پارسەکانیان دایە لاوەو جێگاکانیان گرتەوە •

بەلام لە بارەی گشتی کۆمەڵگای مادەوە ئەبێ بلێین کە ئەمپەراتوریتی هەخامەنشیەکان بارێکی گران بوو بۆ ئەوان ، تەنانەت ئەو بەشە تالانیەی کە هەخامەنیشەکان ئەیان دا بە لەشکری یە مادیەکان ئەوانە شیان بڕی •

چونکە شەڕو شۆر روی کردە کزیو سنوری ئەمپەراتورێتەکەیان راوەستاو سەرکەوتنی کەم بوەوە •

## ٤ ـ لەناو چونی ئەمپەراتۆری هەخامەنشیو دامەزراندنی مادی ئاتروپاتین

لە سێیەکی دوای سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا ئەو شەڕەی کە لە نێوان داریوشی سێیەم پادشای پارس [ئێران]و ئەسکەندەر پادشای مەقدونیدا بەرپا بو ، بو بە هۆی لەناو چونی ئەمپەراتۆرێتی هەخامەنشی ، لەناو چونی ئەو ئەمپەراتۆرێتە هۆی دەرەوەو ناوەوەی هەبو ، هۆی دەرەوەی ئەوە بو کە ئەمپەراتوری ئێران [پارس] لەو شەڕانەدا کە لەگەل یۆنانا ئەی کرد لەو کاتەدا دو چاری کۆمەڵگای خاوەن کویلەیی بوبو ، یۆنان لە ماوەی سەدەکانی حەوتەم تا چوارەمی پێش زاینی لە بارەی پیك هێنانی خاوەن کویلەییەوە کە لە رۆژ هەلاتی کۆنا حوکمفەرما بوو هەنگاوی زۆر تر نابووە لە روی کامل بونی ئابوریەوە بە کیشوەرێکی پێشکەوتو ناو ئەبرا •

جگە لەمانە ریکخراوە سیاسیەیە دەولەتیەکانی یۆنان یەك جۆر دیموکراسی خاوەن کویلەوە یان بە لای کەمەوە ئولیگارشییان حکومەتی خانەدانە بە دەستەلاتەکان بوو ، وە ئەمە خۆی هانی خەلکی ئەدا کە لە ژیانی کۆمەلایەتیدا هاوبەش بن وە شەرکەرەکانیان هەمیشە بە ئاگاو زیرەكو وریاتر بن لە لەشکری پارسەکان [کە زۆر بەیان هەخامەنیشەکان بە زۆر ئەیان هێنانە مەیدانی جەنگەوە](٩٨) •

لە لایەکی ترەوە بەشێك لە ولاتەکانی ئەمپەراتۆریەتی پارس کە لـە بارەی ئابوری یەوە لە هەندێك بـەشی تر پێشکەوتو تر بون لـەو سەردەمەدا کۆمەڵگایەکی پێشکەوتو تریان هەبوو •

ریکخراوێك کە پێویستی کومەڵگای خاوەن کویلەی مسۆگەر بکردایە بریتی بو لە شارێکی خود موختاری خاوەن کۆیلەکان •

ئەم جورە شارانە[٩٩] لە هەندێك ناوچەی ئەمپەراتوری پارس دا هەبو، [سارەکانی یۆنیـە لـە ئاسیای بچوك ، وصورو سیپارو بابـلو ئوردكو ••• هی تر] •

بەڵام ئەمانە ژمارەیان زۆر نەبووە لە ریگای پێشکەوتنیانا توشی گەلێك گیرو گرفت ئەهاتن کە لە لایەن دەستگای بەرێوە بردنی پادشایەوە دوچاری ئەبون[١٠٠] •

باری ژیانی خەڵکی ئازادی ئەمپەراتۆری پارس لە ئەنجامی باری گرانی ژیانو زۆری بێگاری لەشکری و ئەمو ئەو سەرانەو باجو خەراجی ئاژەڵەوە ـکە بە تایبەتی لە ناوچە کۆنەکشتوکاڵیەکانی کیشوەری پادشاییدا بایە خدار بوـ لە سەدەی شەشەم تا چوارەمی پێش زاینی زۆر نارەحەتی کردبون وە ئەمـە گەلێك کاری کردە سەر سستی دامەزراندنی لەشکر[١٠١] وە هونەری شەڕ کردنو ئامادە بونی لەشکری خاو کردبوەوە •

لە ماوەی سەدەی پێنجەمو چوارەم دا جەنگاوەر ترین بەشی لـەشکری ئێران بریتی بوو لە چەکدارە بە کرێ گیراوە یۆنانیەکان •

ئەم هویانە بونە هۆی لەناو چونی ئەمپەراتۆری هەخامەنشی [بەو جورە بەپەلە لەناو چون ، تەنانەت ئەسکەندەر بەو جۆرەی بە بیردا نە ئەهات] •

خـەڵکی ئـەمپەراتۆری هـەخامـەنشی زۆر بـەگورجی رویان کـردە دەسەڵاتی تازە •

بەڵام هەندێك ناوچـەی دورە دەسـت بـە توندی بـەرە بـەرەکانێی

بێگانه‌كانیان كردو له رویانا وه‌ستان •

كه هه‌موو ئاسیای رۆژ ئاوا كه‌وته ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئه‌سكه‌نده‌ره‌وه ، وه له دوای ئه‌و دیسان وه‌كو كیشوه‌ره‌كانی تری [یۆنانی - مه‌قدونی] كه له سه‌ر وێرانه‌ی ولاتی ئه‌سكه‌نده‌ر په‌یدا بوبون خۆی گرت •

له قوناغی تازه‌ی كۆمه‌ڵگای خاوه‌ن كوێله‌كانا [كه یه‌كێك له رواڵه‌ته تایبه‌تیه‌كانی جیهانی شاره خود موختاری یه‌كانی خاوه‌ن كوێله‌كان بوه له‌م قوناغه‌دا فه‌رهه‌نگی یۆنانی وه‌یا هلینزم گه‌لێك كاری كردۆته ئه‌م كاره] وه هه‌نگاوی به‌خێرایی ناوه •

به‌ڵام هه‌ندێك له شاره‌كانی تر توانیان به هۆی دوری‌یان له بێگانه‌كان‌و تێكه‌ڵ نه‌بونیان بچنه پله‌یه‌كی تازه‌ی كۆمه‌ڵگای خاوه‌ن كوێله‌ییه‌وه •

یه‌كیك له‌و ولاتانه مادی رۆژئاوا بو كه له‌و كاته‌دا پیاوی مێژوویی وه‌كو ئاتروپات سه‌رۆكی ولاته كه بو(١٠١) دوباره ئتروپات له سه‌رده‌می داریوشی سێیه‌مدا [كودومان] دوا پادشای هه‌خامه‌نیشه‌كان ساترایی ماد بو • ناوی ئه‌و پیاوه له روداوه‌كانی ساڵی ٣٣١ی پێش زاینیدا براوه •

كه ئه‌سكه‌نده‌ر ئاسیای بچوكی داگیر كرد وه له‌شكره‌كه‌ی داریوشی له نیسوس راونا(١٠٢) سوریه‌و فنیقیه‌و فه‌له‌ستین‌و میسری هێنایه ژێر ركێفی خۆیه‌وه ، داریوشی سێیه‌م له‌شكرێكی گه‌وره‌ی كۆ كرده‌وه ، وه به هیوا بوو كه به هاوكاری ئه‌و به‌ر له له‌شكری ئه‌سكه‌نده‌ر بگرێ كه نه‌چن بۆ ناوچه‌كانی رۆژ هه‌لات تری كیشوه‌ره‌كه‌ی •

به‌ڵام به‌ر له‌وه‌ی داریوش له دجله بپه‌رێته‌وه ئه‌سكه‌نده‌ر له فورات‌و دجله تێپه‌ری ، یه‌كه‌مین رۆژی ئوكتوبه‌ری ساڵی ٣٣١ی پێش زاینی له رۆژ هه‌ڵاتی دجله له نزیك شاری پێشووی ئاشوری ئاربل - له كه‌نار ئاوای گائوگامل شه‌ر له نێوان ئه‌و دوو سوپایه‌دا ده‌ستی پێ كرد •

له‌و شه‌ره‌دا ئاتروپات فه‌رمانده‌ی ماده‌كان بو كادوسی‌و ئه‌لبانی‌و

سکسیتی [دانیشتوانی سکسن sakasen ] ی نیوه سەربەخۆ[١٠٣] بە هاوکاری مادەکانەوە شەڕیان ئەکرد •
بەر لەوە ئاتروپات فەرماندەی ئەو سوارانە بو کە داریوش بۆ زانیاری وەرگرتن ناردبونی[١٠٤] ، هەروەکو ئەزانن لە شەڕی گائو گامل دا داریوشی سێیەم شکا •

پادشای پارس رای کرد بۆ ئەکباتانا وە هەولێ دا کە لەشکرێکی تازە کۆ بکاتەوە بەڵام ئاشکرا بوو کە گەلێك لە ساتراپ نشینەکانو ناوچەکانی لە ژێر دەسەڵاتی ئەو چونەتە دەرەوە ، لەم کەینو بەینەدا ئەسکەندەر بەرەو خوار کشاو بابلو عیلامو پارس [پرسید]ی داگیر کرد ، وە لەوێوە لە رێگای پارتاکناوە پەلاماری مادی دا[١٠٥] داریوش زانی ئەو یارمەتیەی کە لە لایەن کادوسیو ئەسکیتەکانەوە چاوەڕوانیە تی پێی ناگات ، لە ئەکباتانا دەرچو بەرەو رۆژ هەڵات رای کرد ،بەڵام لە ناوەندی رێگای [بس Bess ] ساتراپێ باکتریا ئەوی لە پادشایی خست وە نەختێك دوای ئەوە داریوش کوژرا لە [٣٣٠ی پێش زاینی]دا •

پارمینون سەرداری ئەسکەندەر بە فەرمانی ئەو خەزینەی پارس کە دەسیتان بە سەرا گرتبو بردی بۆ ئەکباتانا وە لە دوایدا لەشکرە تازە پێ راگەیشتووەکان لە رێگای سەر زەمینی کادوسیەکانەوە چون بە هانای هیرکانیەوە [ واتا لە کەناری خواروی دەریای کاسپی - خزر ][١٠٦] وە ئەسکەندەر خۆی لە رێگایەکەوە کە لە پارت کۆتایی پێ ئەهات چوو بە شوێن داریوشدا، وە لە رغە[ری] پیاوێك کە ناوی ئوکسودات oksodat بو وە داریوش خستبویە ناو سیاچاڵەوە [ لەبەر ئەوە کە بە باوەڕ پێکراوی ئەسکەندەر ناو ئەبرا ] کردی بە ساتراپی ماد[١٠٧] •

بەڵام لە مادی بچوك وە لە ریگای هاتوچۆدا لەشکری ئەسکەندەر - ئەو رێگایەی کە لە شکرەکەی ئەگەیاندە بابلو دەریای ناوەڕاست [مەدیترانە] -

پارمینون حوکمی تیا ئەکرد کە لە دوای ئەسکەندەر بە دووەم سەرداری مەقدونی ناو ئەبرا •

ئەرکی کاروباری ئەو پاراستنی ئارامی پشت جەبهەی شەڕ بوو ، دوای ماوەیەك قومیتەیەك بۆ کوشتنی ئەسکەندەر ساز کرا میلوت کوڕی پارمینون یەکێك بو لەو قومیتەیە •

ئەسکەندەر فیلونی کوشت وە ناچار بو فەرمانی کوشتنی پارمینون دەر بکا ، وە ئەرکی مەسئولیەتی ئەوی لە کیشوەری مادا بەسێ سەرکردەی لەشکرەکەی سپارد [کلئاندرو منیدو سیتالك] لە بارەی دانانی ئاتروپاتەوە بە ساتراپی ماد لەو سەردەمەدا هیچ باسێك لە ئارادا نەبو •

وەکو بەرچاو ئەکەوێ کە ئاتروپات نەچو بۆ لای ئەسکەندەر ، ئەگەرچی پشتیوانی داریوشیشی نەئەکرد بەڵگەی ئەم وتەیە ئەوەیە کە شاری ئەکباتانا داکۆکی لەسەر خۆی نەکردوە ئەو کادوسیانەی کە هاو پەیمانی ئاتروپات بون کۆمەکیان بە داریوش نەکرد •

بەڵام ئوکسادات چاوەڕوانیەکانی ئەسکەندەری جێ بەجێ نەکرد و زۆری پێ نەچو کە ئەسکەندەر لە کاتی لەشکرەکەشی بۆ سەر ئاسیای ناوەڕاست ئەوەی لە کار خست وە لەسەر لە نوێ ئاتروپاتی کردەوە بە ساتراپی ماد(١٠٨) [٣٢٨ی پێش زاینی] بەم ڕێگایە ئەو دۆخەی کە لە واقیعدا حوکمڕەوا بو چەسپایەوە •

ئاتروپات ئەسکەندەری دڵنیا کرد کە لە ئوکسادات دڵسۆز تر بێ و باشتر فەرمانەکانی جێبەجێ بکات •

لە واقیعدا رەنگ بێ لە سەرەتاوە ویستبێتی بەرە بەرەکانی ئەسکەندەر بکات بەڵام لەو کاتەدا نەی ئەتوانی وە لەبەر ئەوەی ئارەزوی خۆی بێنێتە دی نە هێزی بوونە داخوازی و تواناى نیشان دا •

ئاتروپات بەمە دەس بەردار نەبو دۆستایەتی و هاوکاری خۆی لەگەل

ئەسکەندەردا بـە شێوەیەکی تر گونجان وە پیـاوێك کـە ناوی بـاریاکس Bariaks بو وە نازناوی پادشـای پارس‌و مادی لـەخۆی نابو چوە ژێر فەرمانیەوە(١١٠) • ئەم زوداوە لە سالّی ٣٢٤ی پێش زاینیدا بو •

ئەسکەندەر لە لەشکرکەشی هیندستان گـەڕابۆوە بۆ پارس ، خەریکی قەلاچۆ کردن‌و لەناو بردن‌و سزادانی سەرداران‌و ساتراپـەکانی خۆی بو ، کلئاندرومتیدو سیتالك کـە لە خاکی مادا هـەر خۆیان حیساب بون لەگـەل کۆمەلانی ترا کوشتنی •

ئەسکەندەر لەم بگرەو بەردەیەدا لە ئاتروپات قایل بو وە بۆ ماوەیەك لە لای خۆی هێشتیەوە(١١١) •

ئاتروپات یەکێك بوو لە کارگێڕەکانی ئەمپەراتۆری هەخامەنشی کـە لەگەل ئەسـکەندەر دا خۆی ڕێکخست‌و هاتو چۆی ئەکردو ڕێزو حورمـەتی ئەگیرا(١١٢) •

ئاتروپات لە هەلبژاردنا دوربینی زۆر ئـەکرد کچەکـەی خۆی دا بـە پردیکا [ Perdika ] کە پیاوێکی ئزاو لێ هاتوو کار گوزار بووە رەنگ بێ لە سەردارەکانی تری ئەسـکەندەر کـەمتر هەلپـەرست‌و خۆ پـەرست بو بێت •

دوای ئەوە ئەسکەندەر چو بۆ مادو سەری لـە دەشتە بـەناوبانگەکانی نیستای کە لەوەڕگای پەنجا هەزار ئەسپی لەشکری پادشا بوو دا •

وە دەرکەوت کـە هـەندێك لـەو ئەسپانە لەشکریە مەقدونیەکان بـە تالان بردویانە •

لەو سەردەمەدا سەرکەوتنە سیاسیە جۆربەجۆرەکانی ئەسکەندەر ئەکران بە جەژن‌و ئاهەنگ یان بۆ ئەگێردرا •

ئاتروپات لـە هەندێك لـە جەژنەکانا بەشداری ئەکرد وە بۆ ئـەوەی ئەسکەندەر دلخوش بێ کۆمەلێکی سەد کەسی ژنی سوار چاکی بەدیاری بۆ

ئەسکەندەر هێنا •

[ئاریان] کە وتەکانی لە بارەی شەڕەکانی ئەسکەندەرەوە لە زۆربەی مێژو نوسەکان راست ترە لەم بارەیەوە ئەڵی ، لێرەدا ئەڵێت کە ئاتروپات ساترابی ماد سەد ژنی پێشکەش بە ئەسکەندەر کرد کە وایان ئەزانی [ئامازون]ن[*] •

ئەمانە بەرگی پیاوانەیان لەبەردا بو بۆ سواری ، وە لە جیاتی نێزە تەورزین‌و لە جیاتی سوپەری گران سوپەری سوکیان پێ بوو(١١٣) •

ئاریان لەو باوەڕەدایە کە ئەو ژنانە ئامازون نەبون وە لەوە ئەچێ ئەم بیروڕایەی ئەو راست بێ •

ئیتر باسی ئەوە ناکات لە کام تیرەو هۆز بون ، هەر وەکو دیمان ئەم باسە - واتا رەگەزو چونێتی ئەم ژنانە - جێگای سەرنجدانە •

ئاریان لەو باوەڕەدایە کە ئاتروپات کومەڵە ژنێکی تایبەتی فێری مەشق کردوەو بەرگی تایبەتی لەبەر کردوون‌و بە ناوی ژنی ئامازونەوە پێشکەشی کردون •

بەڵام رێی تێ ناچێ بەم جۆرە بوبێت ، وە تەنانەت بڕوا ناکرێ کە ئاتروپات لە داستانە یۆنانیەکانا لە بارەی ئامازۆنەوە ئاگادار بو بێ •

هۆزێك ئەناسین کە لەو سەردەمەدا ئەتوانین ئەم جۆرە سوارانە بەهینی ئەوان دابنێین : ئەو هوزە [ساورومات] بو کە [ژنەکانیان حوکمیان ئەکرد] وە کاهن‌و جەنگاوەرەکانیان ژن بون •

ئەم ژنە شورشگیرانەی ساورومات ، هرودوت [ IV ، ١١٠بە

---

(*) ئامازون - بە پێی داستانە ئەفسانەییەکانی یۆنان ئەڵێن ئەو ژنانەن کە فێری مەشقی جەنگاوەری ئەکران‌و مەمکی راستی خۆیان ئەسوتان بۆ ئەوەی رێگای تیر ئەندازی یان لێ نەگرێ • وەرگیر

دواوه] بە پاشماوەی ئامازونەکانی دائەنێ و ئیستە جۆری ناشتنی تەرمەکانیان کە لە هەڵکەندراوەکانی ناوچەی خواروی ولگاو ناوچەکانی دەوروبەری ئورال(١١٤) دورزاوەتەوە شارەزا بوین •

فەرهەنگی ئەم هوزە شارستانیەتی بووە کە لە لای خواروی رۆژئاوای هەمو ناوچەکانی حاجی طرخانی ئیستاوە(١١٥) تاکو ماینجو کومای دا ئەگرتەوە •

راستە کە چەکی ئەسڵی ساوروماتیکانی کەناری ولگاو دەوروبەری نورال ــ جگە لە تیروکەوان ــ شمشیر بووە نەك تەور [ Pelekus ] کە لە داستانی ئاریان دا باسی کراوە(١١٦) •

بەڵام نیزە دیسان لە سەدەی چوارەمی پیش زاینیدا کەمتر باو بوە لە ناویانا •

بەڵام لە بارەی سوپەرەوە [ Pelte ] ئەبێ ئەوە بزانین کە چۆن لە چەرمو دار دروست کراوە هیچ شوینەوارێك لەمە بەجێ نەماوە [ کە لە شوینە هەڵکەندراوەکانا دۆزرابێتەوە ] •

زۆر تر لەوە ئەچێ کە ئاترویات کومەڵێك لەو ژنە ساوروماتانەی دەسگیر کردبێ ، وە لەبەر ئەوە ئەو سەد ژنەی فێری مەشق کردوە تاکو بەناوی ژنی ئامازونەوە پێشکەشیان بکات •

بەڵام ئەگەر ئەو ژنانە بە تیرەی ساورومات دابنێین ئەبێ وای دابنێین کە ئاترویات تا رادەیەك دەسەڵاتی بەسەر قەفقازی رۆژهەڵات [ ئازربایجانی ئیستای سوفیەت ] دا بوە ، چونکە ئەگەر وانەبێ نەی ئەتوانی لەگەل ساوروماتەکاندا کە لەوپەڕی چیاکانی قەفقازەوە ئەژیان پەیوەندی ببەستێ •

ئاریان بە ئاشکرا ئەلێ ئەو ناوچەیە ــ واتا کادوسیو ئەلبانیو ساکسیتی ــ هەروەکو هاو پەیمانانی ماد لە شەڕی گائوگامل دا بەشدار بون •

ئەلبەتە ئەم هاوپەیمانەتیە هەروەکو هاو پەیمانەتە کۆنەکان وابوە •

ئەگەرنا چۆن ئەگونجێ ئەو هۆزانە لە شەڕێکدا بەشداری بکەن کە هیچ سودێکی بۆ خۆیانی تیا نەبێ ؟ بەرامبەر بە چی وەچی یان لە ساتراپی ماد دەسکەوت ئەبو ؟ جگە لەوە ئەوان بەرامبەر بە بیابان نشینەکانی ژورو بەرگری بکەن ؟ وە ئەمە خۆی بوە هۆی فەرزکردنی کاروباری سوپایی ماد وە سەپاندنی بەسەر هۆزەکانی رۆژهەلاتی قەفقازدا !•

رەنگە بێ [ساکسینەکان] [سکاسنیەکان] هەمان [تورتوکوریانتیەکان] بن کە مێژوی هرودوت باسی کردون •

ئەوانە لە سەردەمی کۆندا بەشێك بون لە ساتراپ نشینی ماد بەلام زۆر لەوە ئەچێ چونکە لە ناوچە دور دەستەکانی سنوری ئەو کشیوەردا بون زۆر جار داوای جیابونەوەیان کردوە بە تایبەتی کە پەیوەندی نێوان سکاسنیەکانو خاکی ماد بەهۆی چیا پڕ لە دارستانەکانی قەرەداخەوە کە شوێنی هۆزە کوێستانیەکانی کادوسیەکان بوە زۆر بە زەحمەت ئەکرا •



**جل‌و بەرگی هۆزە ئالبانیەکان ـ سکاییەکان ـ سەدەی ٣ ـ ٥ی پێش زاینی ـ لە روی مۆرێك وەرگیراوە کە لە مینگە چائور دۆزراوەتەوە**

کادوسیەکان هێشتا لە سەردەمی کۆمەڵگای سەرەتاییدا ئەژیان وە زۆربەیان بەڕاو کردن و ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون(١١٧) رەنگ بێ باخداری شیان کردبێ(١١٨) دو پێشەوا کاروباری ئەوانەیان بەرێوە ئەبرد(١١٩) •

هەروەکو لەمەوبەر وتمان پادشای ماد نەیتوانی ئەوانە بە باشی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە ، یەکەمین جار سەریان بۆ کورش دانەواند [رەنگ بێ لەو سەردەمەدا بو بێ کە هێشتا سەرداری ئاستیاگ بووە] •

لە زنجیرەی ناوەڕۆکی ساتراپ نشینەکانی هرودوتدا هیچ باسێکی ئەوانە نەکراوە ، ئەمانە بەشێك بون لە ساتراپ نشینی یازدەهەم •
رەنگ بێ پاوسیکەکان Pavsik وە پانتیماتیەکان Pantimat وە داریتیەکان Dareiti (١٢٠) کە ناویان لەوێدا براوە چەند هۆزێکی کادوسیەکان وەیان [ئەن ئاریاکیان] [ئان ئاریائیان] Anariak بو بن کە لە ناری دەریای کاسپی [خزر] لە نێوان خاکی تویەکان و ئالبانیەکان لە سەرەوە وە لە رۆژ هەڵاتەوە هیرکانیەکان تیایا نیشتەجێ بوون •

هیچ یەکێك لە نوسراوە رەسمیەکانی پادشایانی پارس سەر زەمینی کادوسی و کاسپی یەکانی بە بەشێك لە زەوی و زاری ناوچەی سەر بە ئەوان دانانێت ، وەکو بەرچاو ئەکەوێ ئەو هۆزە ناوبراوانە لە سەرەتاوە لە قەڵەمڕەوی ئەمپەراتوری پارس جیا بونەوە ، وە لەو رۆژگارەدا کە کیتسیاس لە دەرباری پارسەکانا بووە ، ئاردەشێری دووەم لەشکری کردۆتە سەر کادوسیەکان بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەست نەهێنا(١٢٢) •

رەنگ بێ ئەوەی کە کتسیاس باسی ئەکات هەر ئەوە بوبێت ، بە بیروڕای [تروگاپومپە](١٢٣) ئاردەشێری سێیەم [٣٥٨ـ٣٣٨ی پێش زاینی]

سەر لە نوێ لەشکری کردەوە سەر کادۆسیەکان وە [ کودومان ] کە لە دواییدا بە ناوی داریوشی سێیەمەوە چوە سەر تەخت لەو شەڕەدا دەسەویەخەی کادوسیەکان ئەجەنگا •

بەڵام لەگەڵ ئەمەدا کادوسیەکان دوای ئەو لەشکر کێشیە دیسان سەرین بۆ ئەمپەراتوریتی پارسەکان دانەنەواند ، وە بەم هۆیەوە لە شەڕی گائو گاملی ئەوە ئەبینین کە کادوسیەکان تەنەت سەر بە هاوپەیمانیەکانی پادشای پارس نەبون ، بەڵکو هاوپەیمانی مادەکانو ئاتروپاتو ساتراپەکانی ئەوان بون •

ئەمە جێگای سەر سوڕمان نیە ، چونکە لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا [وە بە تایبەتی لە سەدەی چوارەم] دا هەندێك لە ساتراپەکان بە تەواوی سەر بەخۆ بون ، تەنانەت گەلێك جار دۆستەکانیان بە پادشا ناویان ئەبردن(١٢٤) وە زۆر جاریش لەگەڵ یەکتردا ئەکەوتنە شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەوە(١٢٥) قەفقازی رۆژهەڵاتی لەسەر دەمی کۆندا – بە شێوەی گشتی – لەژێر دەسەڵاتی مادەکاندا بوو ، وە بەم هۆیەوە ئاتروپات باشتر ئەیتوانی کادوسیو ئەلبانیو ساکسینیەکان بێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە(١٢٦) ئەو زۆر بە وردی ئیشو کاری ئەکردو نەیتوانی ئەو هۆزانە راستەوخو بێنێتە ژێر دەسەڵاتی مادەوە بەڵام تێکوشاو تەقەللای دا کە خۆیان بە هاوپەیمانی ماد ناو ببەن •

بەڕای زۆربە ئەو لە پێناوی ئەم بیرو رایەیدا پەیوندی لەگەڵ کۆمەڵەو سەرەك هۆزەکانا درێژە پێ دا بوو •

ئەگەر ئەمە بەم جۆرە دانەنێن کە لە نێوان ساڵەکانی **٣٢٨** و**٣٢٤**ی پێش زاینی ، ئاتروپات لە ناوچەکانی ژوروتر لەگەڵ ساورو ماتەکانا کەوتۆتە شەڕەوە – ئەوە ئاشکرا ئەبێ کە دەسەڵاتی ئەو بەسەر قەفقازی رۆژ هەڵاتی دا هەر وەکو بوە بەهێز بوە •

ئەم دۆخە لە دواییدا ئەم کەڵکی لێ وەر گرتوە •



**جەنگاوەرێك بە بەرگی مادەكانەوە ، شەڕكەرێكی یۆنانی بەزاندوە لە روی مۆرێكی سەدەی ٤ـ٥ی پێش زاینی گیراوە ..**

ئاتروپات لە ئەنجومەنی راوێژكاری ساتراپو سەردارەكانا كە لە دوای مردنی ئەسكەندەر لە بابل بەسترا [ لە ساڵی ٣٢٣ی پێش زاینیدا ] بەشدار نەبوو •

لەو ئەنجومەنەدا ساتراپ نشینی ماد درا بە پیونی مەكدونی •
پردیكا كە لە دەوڵەتی تازەدا پلەی نائب السلطنەی هەبو پتونی كرد بە لێ پرسراوو سەركردەی ئەو یۆنانیە نیشتەجێیانەی [كولۆنەكان] رۆژ هەڵاتی ئێرانو ئاسیای ناوەراست •

وەكو بەرچاو ئەكەوێ ، ساتراپ نشینی دەوڵەمەندی ماد كە سوپایەكی گەورەو بەهێزی هەبو لە پاداشی ئەنجامی ئەم كاردا بەگرنگ ئەژمێردرا •
جگە لەوەش رەنگ بێ كە پیتون بەر لەو كاتەو دیسان لە دوای كوشتنی [كلئاندر]و ئەوانی تر ، خەریكی لەشكری مادی خوارو بوە •
لە واقیع دا دوستایەتی ماد بۆ مەقدونیەكان زۆر گرنگو بایەخدار بووە

چونکە ئەگەر ئەو سەرزەمینەیان لە دەست بدابایـە پەیوەندی ئەوان لەگـەل ساتراپ نشینەکانی رۆژهەلاتیشدا بە تەواوەتی ئەبچڕا •

جێگای سەرنجە کە هیچ یەکێك لە ساتراپەکانی ناوچەکانی رۆژهەلاتی لەو رۆژگارەدا لە جێگاو پلەی خۆی نەبچڕا •

وە بە تایبەتی نەیان ئەویست ئەو بارە ئالۆزەی کـە ئالا بوە بەشێك لـە کیشوەرەکانی رۆژ هەلاتیەوە نەیان ئەویست ئالۆزاو تری بکەن •



**جەنگاوەرێکی مادەکان بە چەکی سووکەوە لە گەل پیاوێکی یۆنانی دا ئەجەنگی لە روی مۆرێکی سەدەی پێنجەمی (؟) پێش زاینی گیراوە ••**

ئایا ئەیانویست ئاتروپات لە خاکی ماد دەر بکەن ؟ گومانی بۆ ناچێ کـە ئەو باوکی ژنەکەی [خەزور] پردیکاو فەرمانفەر مایەکی بە دەستەلاتی ئـەو سەردەمە بووە [جێگای سەرنجدانـە کـە تەنیـا ئەوو ئاکسپارت خـەزوری ئەسکەندەر لە سالی **٣٢٣**ی پێش زینیدا « جگە لە یۆنانیو مەقدونیەکان » بە شێوەی ساتراپ مابونەوە] •

مادی رۆژ ئاوای بـەدەستەوە مـابو ، زۆر لـەوە ئـەچێ پیتون لـە ئەنجومەنەکەی بابل دا تەنیا کرا بە حکومەتی وەکو ئـەلێن مادی گـەورەیان [مادی بچوك] نەك بە فەرمانفەرمای سەرانسەری سەرزەمینی ماد ، وە لـەوە

بەریش ئاترۆپات دەسەڵاتی بەسەر ئەو بەشەدا نەبوو •

لە واقیع دا لە ساڵەکانی ۳۲۸ تا ۳۲۵ی پێش زایینی کە ئەسکەندەر لـە ناوچەی رۆژهەڵاتی نەبو ، [هارپال]ی خەزینەدار لە ئەکباتانا بێ ئەوەی کەس بەرپەرچی بداتەوە فەرمانڕەوایی ئەکرد [وە لـە دوایشیدا خەزینەکەی تاڵان کردو رای کرد بۆ یۆنان] وە ژمارەیەکی زۆر لـە لـەشکریەکانی مـەقدونی ئەوانیش لەوێدا بون وزۆرو ستەمێکی زۆر یان لە خەلك ئەکرد[١٢٧] •

ئەسکەندەر دوای ئەوە لە هیندستان گەڕایەوە بە بێ بەزەییانە ساتراپـە خۆویستەکانی دەر کردو لە ناوی بردن •

ئەگەر ئاترۆپات بچوکترین مەسئولیەتی لـەو روداوانـەی مادا بهاتایەتە سەر ئەسکەندەر داڵدەی نەئەدا و وازی لێ نەئەهێنا •

چونکە هیچی بەرامبەر بەو نەکرد ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئاترۆبات لـە ئەکباتانا هیچی بە دەست نەبوە ، کۆمەڵـە لـەشکریەکانی مەقدونی لـە مادی بچوك بە تەواوی حوکم رەوا بون وە ئەسکەندەر لەوێدا شارەکانی [یۆنانی و مەقدونی]و کۆمەڵە لەشکریەکانی پێك هێنابو ، بۆ ئـەوەی [ بەربەر ]ەکان نەتوانن پـەیوەندی شیرازەی دەسـەڵاتی بپچڕێنن[١٢٨]وە لـە پـەلاماردانی [بەربەر]ەکان دڵنیا بێ •

کاروباری سەربازیو لەشکری کە بەو ناوچەیەدا تێ ئەپەڕی زۆر تر بە دەست سەرکردە لەشکریەکانی مەقدونی‌یەوە بوە نەك ئاترۆپات •

ئەوەمان بەرچاو ئەکەوێ کە ئاترۆپات تەنانەت یەك جار [هەروەکو لـە دواییدا دیسان وە های کرد] تێکەڵاوی ئەو ئاژاوەو گێژاوو بگرەو بەردەیەی مادی بچوك نەبو کـە لـە لەشکریەکانی پیتونو ئانتیگونو ئویمن و نیکانوره سلوکوس و ئەوانی تر بەر پایان کردبو ، وە هـەروەکو جاران مادی بچوك و مەقدونیەکانی وەکو خۆیان هێشتەوە • ئەو لە سـەردەمی ژیانی ئەسکەندەردا خۆی بە ساتراپێکی بە نمەك و بە وەفا دانا ، بەڵام بەشداری بگرەو بـەردەی

مەقدونیەکانی نەکرد •

لە دوای مردنی ئەسکەندەریش تێکەڵاوی شەڕی میراتگری نێوان سەرکردە لەشکریەکان نەبوو وەسەربەخۆیی خۆی پاراست •

لە دوای مردنی پردیکا ، سەردارەکانی ئەسکەندەر لە ساڵی ۳۲۱ی پێش زایینی دا لە [تری پارادیس] کۆبونەوە سەر لەنوێ ساتراپ نشینەکانیان دابەش کردەوە • مادی بچوك ـ واتا ساتراپ نشینی ئاتروپات ـ ئەو بەر ئەم دابەشکردنە نەکەوت ، ئەتوانین ئەو ساتراپ نشینە بە دەوڵەتی سەربەخۆ دابنێین لەو کاتەدا • مادی رۆژئاوا یەکەمین کیشوەری رۆژهەڵاتی بوو کە سەربەخۆیی بەرامبەر بە یۆنانیو مەقدونیە داگیر کەرەکانو پارس پاراست • ئاتروپات چۆن توانی لە سەرەتای ئەو رۆژگارە پڕ لە ئاژاوەیەدا لەناو ئەو شەڕانەی کە لە نێوان میراتگرەکانو جێ نشینەکانی ئەسکەندەردا بەرپا بوو بو دەوڵەتێکی تازەی سەربەخۆی ماد پێك بێنێت ؟ هیچ گومانی تیا نیە کە ئاتروپات پیاوێکی ئازاو لێ هاتوو بووە ، بەڵام ئەگەر رۆژگارو باری ناوخۆی هۆزەکانی مادو توانای لەشکرەکەی نەبوایە هەرچەند لێهاتوش بوایە نەیئەتوانی لەو کاتەدا دەوڵەتێکی تازەی سەربەخۆ دابمەزرێنێو بی پارێزێ !•

چەند جار باسمان کردوە کە بەشی ژووری رۆژئاوای ماد [وەکو ئەڵێن مادی بچوك] ومادی خوارو یان مادی گەورە لە روی ئابوریەوە [وە تەنانەت جوگرافیایش] تەنیا رادەیەك لە یەکتر ئەچون • ئابوری مادی بچوك لە روی بەروبومی کشتوکاڵیو پیشەگەریەوە باش بو ، بەشی پێویستیەکانی ناوخۆی دابین ئەکرد •

کۆمەڵگای مادی بچوك بەتەواوی خاوەنی ئابوریەکی تایبەتی خۆی بوو ، وە لەو رۆژگارەدا ـ کە ئابوری سروشت زۆرتر بەهێز بو ـ ئاواتی پەیوەندی داری لەگەڵ ناوچەکانی ترا نەبوو • راستە کە لە رابوردودا جۆرە یەکێتیەك بووەو مادی بچوکیش بەشدار بوە تیایا • بەڵام بونی ئەو یەکیەتیە

هۆیەکی تایبەتی هەبوە وە زوربەی لەبەر بەرەنگار بونی ئاشور بووە •

مادی بچوك بە پێچەوانەی بابلەوە پێویستی بە هێنانی کەرەسەی خاوی پیشەسازی نەبوو ، وە بەم هۆیەوە پێویست نەبوە لەگەل ئەو ناوچانەی کە بە سەرچاوەی کەرەسەی خاو ناو ئەبران یەکێتی ببەسێت •

نمونەیەکی تر : مادی بچوك پێچەوانەی مادی خوارو نەکەوتبوە چەقی رێگای بازرگانی‌و رێبازگەی لەشکری نێوان ناوچە گرنگەکانی ئاسیای نزیك‌و ئاسیای ناوەراست ، بەم هۆیەوە دیسان ئەیتوانی لەگەل کێشوەرەکانی ترا پەیوەندی دار بێ ، جگە لەمانەش لە مادی بچوك چەند هۆزێکی تیا بوو کە بە شێوەی کۆمەلگای سەرەتایی‌و کۆچەری بون ، ئاتروپات ئەوانەی هێنایە ژێر دەستی خۆیەوە ، وە ئەمە بوو بە هۆی پێك هێنانی هێزێکی گرنگ لە مادی بچوکدا کە گیانی لەشکرێتی ئەوانە گەلێك لە گیانی جەنگاوەرانەی لەشکریەکانی ئەمپەراتوری پارس وە یان سوپاییەکانی جێ نشینی ئەسکەندەر بەهێزتر بون [ئەگەرچی لە بارەی هونەری جەنگیەوە وەکو ئەوان شارەزا نەبون] • ئەو لەشکریانەی لەم دواییەدا باسمان کردن یان لە سوپاییە گیراوەکان وە یان لە جەنگاوەرە بە کرێگیراوەکان بون کە لە تالان‌و سود بەو لاوە شتێکی تریان لە شەردا رەچاو نەئەکرد •

داریوشی سێیەم لە دوای ئەوە هەموو لەشکریەکانی لەناوچوو وەیان بە جێیان هێشت دوا هیوای خۆی بە کادوسیەکان مایەوە •ئەگەرچی کادوسیەکان سەرپێچیان لە هاریکاری دەسگای زۆردارانەی هەخامەنشیەکان کرد ، بەلام وا بە هیوا بو کە یارمەتی بدەن • ئێمە لەو باوەرەداین کە نەیروی ئاتروپات توانی دەسەلاتی حوکمرەوای خۆی لە دەست جێ نشینەکانی ئەسکەندەر بپارێزێ هەروەکو لە سەردەمی داریوشی سێیەم وەیان رۆژگاری ئاردە شیری سێیەم پاراستبووی • ئەگەر ئەم هۆزانەی ژوروی ئازربایجان کە لە لەشکر کەشیەکانی ئاتروپات دا بەشداریان کردوەو لە ئەنجامدا سودیان لە سەرکەوتنەکانی وەرگرتوە نەبونایە ـ ئەویش وەکو ساتراپەکانی تری

داریوشی سێیەم بەرامبەر بە لەشکری یۆنانیو مەقدونی دەسەپاچە ئەبوو - چونکە مەقدونیەکان بەرە بەرە هەمو کۆمەڵو دەستە جەنگییە ناوچەییەکانیان هێنایە ژیر دەستی خۆیان •

بەو جۆرە ئاتروپات نەك تەنیا نەی ئەتوانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ بەڵکو هیچ گومانی تیا نیە کە لەو رۆژگارە پڕ لە ئاژاوەیەدا نەی ئەتوانی تەنانەت گیانی خۆیشی بپارێزێ •

ئەو دەوڵەتە تازەیە کە بە رەسمی پێیان ئەوت [ماد] خەڵکی پێیان ئەوت [مادی ئتروپات] یان هەر بە ناوی خۆیەوە پێیان ئەت [ئاتروپاتاکان](١٢٩) •

دانیشتوانی ئەو سەر زەمینە لە روی نژادەوە جۆربەجۆر بون •

بەڵام لە سەدەی چوارەمی پێش زاینی دا کادوسیو ماتنیەکان - وە رەنگ بێ - پاشماوەی مانایەکانو لولوییو هۆزەکانی تری « کاسپی » کە لە ناو یەکێتی هۆزەکانی ماددا نەبون وە یان ئەوانەی - کە لەوە ئەچێ - بەشدار بوون ••• هەمو ئەوانە لەگەڵ ئەوەدا کە خۆیان بە [ماد] ئەزانی نەریتو عادەتی خۆیان هەر پاراست •

زمانی ئێرانی کە زمانی ئاینیو موغەکان بوو [موغەکان لەو دەوڵەتە تازەیەدا دەسەڵاتدار بون] لەناو ئەو ناوو نوسراوانەدا کە بە دەستی ئێمە گەیشود لەگەڵ زمانو شێوە زمانەکانی ترا دەر ئەکەوێو تێکەڵ بون •

بەڵام دەوڵەتی تازە خاوەنی ئابوریەکی تایبەتیو سیاسەتی سەربەخۆ بوو ، وە بەم هۆیەوە زەمینەیەکی لەبار بۆ پەیدا بونی هۆزی - ئاتروپاتن - هاتە کایەوە •

دەوڵەتی تازە رێبازی سیاسیو فەرهەنگی مادی سەردەمی [ دیوك ]و رۆژگاری پێشووی ئەپاراست •

بەڵام دروست بونو پێك هاتنی رواڵەتی کۆمەلایەتی ئەو کاتە لە دەرەوەی مەبەستو سنوری ئامانجی ئەم کتێبەودیە •

- تەواو -

# پەراوێزی پێشەکی

١ ـ لە بەشی یەکەمدا ناورۆکە نوسراوەکان کە لەم بارەیەوە دواون و زۆر بایەخدارن ئەنوسرێنەوە ·

٢ ـ the. Jacobson, the sumerian king-Llist, the oriental Institute of chicago, Assyriological studies, No 11, chicago, 1939.

لە لاپەرە ١٤٧ بە دواوە ، ئەمانەوێ کتێبێکی تایبەتی لە بارەی سەرچاوەکانی ئەم ناوەرۆکەوە رێک بخەین ··

٣ ـ F. thureau-Dangin. La Findela domination gutienne, RA,XXII,1947.

لە لاپەرە ١١١ بە دواوە ·

٤ ـ A. Goetze. Historical Allusions in old Babylonian Omen texts, Jcs. 1,3,1947.

لە لاپەرە ٢٥٣ بە دواوە ·

٥ ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

RLA.S.V. Datenlisten

٦ ـ زوربەی سەرچاوە عیلامیەکان لە بوارە جۆربەجۆرەکانا ، کە بلاّو کراوەتەوە وەکو :

"Memoires, Delegation en Perse"

F.W. konig,corpus Inscrip tionum Elamicarum,Hannover

وە لە بارەی ئەستێلگە وە چەند سەرچاوەیەکی ترهەیە وەکو :

G.G. cameron, Persepolis treasury tablees, chicago, 1948.

٧ ـ E. Ebeling, B. meissner, E.F. weidner, Die Insch riften der altassyrichen konige, I. Leipzig, 1926,

KAH 11.

چەندان سەرچاوەی تر ..

٨ ـ ئەم سەرچاوەیە لە سەدەی نوزدەهەمدا دوزراوەتەوە و بلاّو بۆتەوە، گرنگترین ئەم سەرچاوە نوسراوانە کە لە KB,I,II چاپ کراوە . لە سەدەی بیستەمدا تەنیا ژمارەیەکی کەم لەو نوسراوە تازانە کە لەوە بەر دۆزرابونەوە بە دەست گەیشتوون ، وە ئەوانیشە زوربەیان نوسخەی دووەمی دوزراوەکانی پیشو بون ، کە لە هەندێک شوێندا بە ساخی تر مابونەوە ، وە بەم هۆیەوە هەندێک شتی ئالۆز رۆشن بۆتەوە .

٩ ـ لە بارەی نوسراوە میژوییە ئاشوریەکانەوە تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

D.D. Luchenbill, Ancient Recordh of Assyria and Babylonia, 1-11. Chicago, 1926-27.

گەلێك نوسراوەی لە بارەی مادەوە ئی. م. دیاکونوف تەرجەمەی کردوە و بلاّوی کردۆتەوە ، بەم پێیە : سەرچاوە لێ وەرگیراوە ئاشوریو بابلیەکان

لـه میژوی (ئورارتو) دا ـ گۆڤاری « پیك میژوی کۆن » ژمارەکانی ٢ـ٤ وە ئەم سەرچاوانەی تریش :

E.A.M. Budge and L.W. king, Annals of the kinges of Assyria, 1, London. 1902.

P. Rost, Die keilschrifttexte tiglatpileser III, 1-11. Leipzig, 1893.

H winckler. Die keilschrifttexte sargons, 1-11. Leipzig, 1889.

M. streck, Assurbanipal und die tetzton assyrischen Konige. Leipzig, 1913.

F. thurean-Dangin, Une relationdes, huitieme campagne de sargon 11, Paris, 1912.

چەندان سەرچاوەو نوسراوەی تریش هەیە ٠

١٠ ـ ئەمانە چاپو بلاو کراونەتەوە :

R.F. Harper, Assyrian and Babylonian Letters IXII London, 1892.

L. waterman, Royal Correspondence of the Assyrian Empire, I-IV, Ann Arbor 1903.

هەروەها تەماشای ئەو سەرچاوانەی ئی٠ م٠ دیاکونوف بکە کە لـە نوسـراوە بابلیو ئاشوریەکانەوە وەرگیراون ٠٠

١١ ـ نوسینەکانی ئی٠ م٠ دیاکونوف (سەرچاوە ئاشوریو بابلیەکان) وەکو :

J. A. knudtzon, Assyrische Gebetean den sonnengott, Leipzig, 1893.

E. G. klauber, Politisch-religiose texte aus der sargonidenzeit, Leipzig, 1913.

١٢ ـ لێرەدا بە زاراوەی (ناوەڕۆکی ناوی دێکان) یان ئەو کەسانەی کە ناوەکانیان لەسەر ساڵەکان دائەنا ، گرنگ بوە · ئـەوانە چـەند کـەسێکی دەوڵەتی ئاشور بون کە بە نۆرە ساڵێکی تەواو کاروباری (لیما) کە پەیوەندی بە بوارە ئاینیەکانەوە بوە بەڕێوە یان ئەبرد ·کاروباری مێژوو بە ناوی ئەوانەوە ئەنوسرا ، لە یەکێک لەو ناوەڕۆکە مێژوییانەدا باسی رۆژ گیرانێك کراوە کە لە سەردەمی کارکردنی یەکێك لەو پیاوە ناودارانە بوە ، کـە ساڵەکەی بـە ناوەوە ناو نراوە ، وە مێژوی ئەم رۆژ گیرانە لـە رێگای ئـەستێرە ژماریەوە دەست ئەکەوێ ، بەم هۆیەوە مێژوەکانی تر ئەو روداوەی کە لە ناوەڕۆکە کەدا باس کراوە و دەست کەوتوە لە (٩١١ تا ٦٤٨ ی پێش زاینی یە) ، وەکو ئەم سەرچاوەیە باسی ئەکات :

Reallezikon der Assyriologie, Herausg, Von E. Ebeling und B. Meissner, Berlin-Leipzig. 1932-1933.

تەماشای وشەی Eponymen بکە ·

مێژو دانانی روداوەکانی هـەزارەی سێیەم و دووەمی پێش زاینـی بـە شێوەیەکی پێچاو پێچ ئاڵۆزە ، کە سودیان لـە سەرچاوە ئەستێرە گەریەکانی بابلی کۆن و میسر وەرگرتوە کە ناونیشانەیان وەك یەك نیـە · لـەم روەوە نوسینەکانی ئاکادمیسین و·و· ئاسترووە بە ناونیشانی (مێژو دانانی یەکەمین زنجیرەی بابلیـەکان) گۆڤاری « پیك مێژوی کۆن » ژمارە ١ سـاڵی ١٩٤٧ لاپەڕە ٩ بە دواوە ··

١٣ ـ نوسراوەی تەواوو گۆڕینی پیتەکانی transliteration تەرجەمە کردنی نوسـراوە ئورارتوییـەکانی پادشـایان بـە هـۆی گ· ئا· ملیکیشویلی لە گۆڤاری « پیك مێژوی کۆن » لـە ژمارە ١ی ساڵی ١٩٥٢ تا

ژمارەی ۱ ی ساڵی ۱۹٥٤ بـە ناونیشانی (نوسراوە بزماریو ئورارتوییەکان)
بڵاو کراوەتەوە ، تەماشای ئەم سەرچاوەی لای خوارەوەش بکە :

F. M. konig, Handbuch der chaldischen Inschriften, I. Graz, 1955.

١٤ _ L. W. king chronicles Concerning Early Babylonian kings, I-II, London. 1907.

C.J. Gadd, the Fallof Nineveh, London. 1923.

S. smith, Babylonian Historical texte Relating to the capture and Downfall of Babylon, London, 1924,

B. Landsberger und the. Bauer, Zu nepveroffent-lichten, Geschichtsquellen der Zeit von Asarhaddon bis Nabonid, ZA, N, F, III, 1926.

F.H. weissbach, Die keilin-schriften der Achameniden. Vorderasiatische Bibliothek, 3, Lepzig. 1911.

لە لاپەڕە ۱ بە دواوە •

١٥ _

لە لاپەڕە ٤ بە دواوە ••

١٦ ـ بە زمانەکانی پارسی کۆنو عیلامیو بابلی •

١٧ _ L. W. King and R. C. thompson, the Rock sculpturesa and Inscriptions of Darius The Great on the Rock of Behistun, L. 1901.

— R. Kent. Old, Persinan Grammar, tezt, lexicon. New Haven, 1950.

چاپی دووەمی کتێبەکەی کنت Kent هێشتا بە دەست من نەگەیشتبوو •

١٨ ـ ڕەنگ بێ کسانت لە دوای هرودوت نوسیبێتیو سـودی لـە

نووسینەکانی ئـەو وەرگرتبێ تەنانـەت هـەندێك لـە لێکۆلەرەوەکان لـەو باوەڕەدان کە نوسینەکانی (کسانت) لە دواییدا نوسراونەتەوە ، هەندێك لەو نوسراوانە کە بە هینی کسانت دائەنرێن بەبێ هیچ لێکدانەوەیەك و دو دڵیەك هینی ئەو نیە ، وە لە سەدەی دوەمی پێش زاینی دا نوسراونەتەوە ، تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

L. Pearson, Early Ionian Historians, Oxford, 1939.

لە لاپەڕە ١٩٠ بە دواوە ٠

١٩ ـ ئەو شێوەی کـە هلانیك بـە کاری هێناوە ، لێکچونی ناوەکانو شێوەی زمانە جۆربەجۆرەکان بەبێ ئەوەی رەگەزەکانیان شی بکاتەوەو لێکیان بداتەوە تەنیا بە لەیەك چۆنی شێوەی زمانەکان بڕیاری لە سەر داون ٠٠ بـە داخەوە تەنانەت لەم رۆژگارەشدا هەندێك لە نوسەرەکان ئـەم شێوەیە لـە نوسینەکانیانا بە کار دێنن ٠

١٩ ـ **دوبارە ـ لە بارەی** نوسینەکانی هرودوتـەوە تـەماشای کتێبـی (هردوت) نوسینی «س٠ یا٠ لوریە » ساڵی ١٩٤٧ .M. L بکە ٠

٢٠ ـ زاراوەی « ماد » و « مادی » لـە بارەی هـۆزی مـادو خـاكو دەوڵەتەکەیانەوە بەکار دێنین ٠

٢١ ـ لاپەڕە ٥٢١ ـ ٥١٢ ی نوسینەکە ٠

٢٢ ـ نوسراوەی بـەردی گۆڕەکـانی دوای هـارپاك (؟) بـە زمانەکانی یۆنانیو لیدی دەست کەوتوە ٠

J. Friedrich, Kleinasiatische Sprachden Kmaler, Berlin. 1932.

لاپـەڕەی ٦٢ ژمـارەی [ (a) ] ٤٤ دێرەکانی ٣ـ لاپـەڕە ٦٣ دێڕی ٣٠ ، ژمـارە [ (c) ] ٤٤ لاپـەڕە ٦٦ دێـڕی ٢٤ ، لاپـەڕە ٧٦ ژمـارەی ٧٧ دێڕی ٢٦ ٠

٢٣ ـ هرودوت (جگە لە داریوش) ناوی ئەوانەی موغەکەیان کوشتوە بەم جۆرە باسیان ئەکا : ئینتافرن ، ئوتان ، گوبریا ، هیدارن ، مهابیزو ئاسپاتین ٠٠ لە نوسراوەکەی بێستوندا ناوەکانیان بەم جۆرەیە : ویندافرن ، ئوتان ، گئوبرووا ، ویدرن ، بگ بوخشو ئاردو مانیش ٠٠ ئەو جیاوازیەی کە لە نوسینەوەی ناوەکانا هەیە هۆی بەکار هێنانی فونەتیکی دەنگی شێوەی زمانی یۆنانی یە ٠

٢٤ ـ هەندێک هەمان ڕۆژ گیران بە ڕۆژ گیرانی ٣٠ی سپتامبتری سالی ٦١٠ی پێش زاینی دائەنێن ٠ بەلام ئەمەیان کەمتر لە ڕاستەوە نزیکە ٠ نەك تەنیا مێژوی ئەو ئەداتە دواوە بەلکو ڕۆژ گیرانی ناوبراو لە ئاسیای بچوکدا بە تەواوی نەگیراوە و٠ ت نولد کە ئەستێرە ژمێرێکی وردەو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا لێکی داوەتەوە ئەمەی باس کردوە ٠ مێژوی ٥٨٥ بەر لە زاینی (بەرامبەر بە حیساب کردنی مێژوی ئیستای) پلین هێناوەتەوە ٠

Nat. Hist. II. 9 (12) — Littre, Paris, 1865.

٢٥ ـ Pareks ، بە چەندان جۆر لێك دراوەتەوە ٠

٢٦ ـ بۆ ئەم ژمارەیە چەندان لێکدانەوەی تر هەیە ، وەکو ئەوە نلد لەو باوەڕەدایە کە هرودوت بە هەلە سالەکانی سەلتەنەتی (دیوك)ی لەگەل (فرائورت)و کیاکسارو ئاستیاگ دا کۆ کردۆتەوە (١٢٨ = ٣٥ + ٤٠ + ٣٥) بەلام چونکە بیستبوی کە مادەکان نزیکەی سەد سال لە ئاسیادا حوکمڕەوایی یان کردوە ، (٢٨) سالی لەماوەی ڕۆژگاری سەلتەنەتی ئەوانی کەم کردۆتەوە، وە ئەو ماوەیە بە حیسابی ئەسکیتەکان کە لە ماوەی حوکمڕەواییان بێ ئاگا بوە داینــاوە ٠ ج٠ راولینسون بە جۆرێکی تری لێك ئەداتەوە و ئەلێ : هرودوت دو هەلەی کردوە کە سالەکانی حوکمڕەوایی (دیوك)ی بە حیسابی فرائورتو سالەکانی سەلتەنەتی فرائورتی بە حیسابی دیوك داناوە ٠ ژمارە ١٢٨ ئەوەیە کە هەوالدەری هرودوت پێی گەیاندوە ، بەلام لە بارەی ٢٨ سال

حوكمرانی ئەسكیتەكانەوە (سكاییەگان) ئەبێ ئەم ژمارەیە بە ١٢٨ دابنرێ · جگە لـە مانەش بیروڕای تریش هـەیە تەماشای لاپـەڕە ٢٢٥ ی نوسینەكە بە دواوە بكە ·

٢٧ – هرودوت خۆی (لابنیت – نابونید) (١٨٨/١) ی لەگەل (لابنیت) هاوچەرخی كیاكسار بە جیا زانیوە · لەو سەردەمەدا (نابوخود نوسوری دووەم) « بخت النصر » پادشای بابل بوە ·

٢٨ – لەگەل حیسابی نەریتی بڕیار دراوی سەردەمی كۆن بـەرامبەرە لەگەل تەمەنی پێنج پشت ، هـەر پشتەی ٣٠ سـاڵ ، بـە پێی بەڵگەی تر هـەندێك وای دائەنێن كـە پادشایـەكی تر لـە نێوان دیوكو فرائورت دا لە یاد چوە ·

٢٨ – دوبارە – مێژوەكانی كتسیاس لاپەڕەی ٣٦_٣٥ تەماشا بكە ·

٢٩ – یان شەش پشت ، هەر پشتەی ٣٣ ساڵو نیو ؟

٣٠ – ئەگەر كۆتایی حوكمڕەواییەكـەی دیوك ، بـە پێی سـەرچاوە ئاشوریەكان ، سـاڵی ٧١٥ی پێش زاینی دابنێین ( تەماشـای لاپەڕە ٢٤ی نوسینەكە بكەرەوە ) ئەگەر وای دانێین چـل سـاڵ حوكمڕەوایی كیـاكسار بەسەر ئەسكیتەكانا (سكاییەكان) بوە ، ئەوا ئـەبێ سەرەتای حوكمڕەوایی دیوك بە پێی وتەكانی هرودوت بە ساڵی ٦٩٩ی پێش زاینی دابنێین ·

٣١ – ف· گ· میشچنكو بێ ئەندازە داكۆكی لەسەر هرودوت ئەكات· لە كتیبی (هرودوت) دا « مێژو لە نۆبەرگا » تەرجەمەی ف·گ میشچنكو ، بەرگی دوەم ، موسكو چاپی ساڵی ١٨٨٨ ·

٣٢ – A. Delattre. Le Peupleet 1, Empiredes Medes — jusqu, ala Fin duregne de cyaxare. Memoires Couronnes et Memoires des savants etrangers Publies Par, 1. Academie

Royale des sciences. des Lettes et des Beaux—Arts de Belgique, XIV, Bruxelles, 1883.

٣٣ ـ ئەو زنجیرە وتارانەی لە بارەی میژوی مادەوە لەم گۆڤارە دا لە سالی ١٩١٥ی زاینی دا بلاو کراوەتەوە :

Orientalistische Literaturzeitung.

٣٤ ـ لە هەمو گرنگتر ـ لە نوسینەکانی « دیودور » میژو نوسی کۆنی یۆنان کە نوسینی میژو نوسەکانی پێشتری نوسیوەتەوە ، وە نوسینی « فوتیا » نوسەری رۆمی رۆژهەلات ۰ نیکولای دیمشقی میژو نووسی سەدەی یەکەم ( نوسەری میژوی روداوەکانی « ئیرودی گەورە »ی بە ناوبانگ ) هەروەها گەلێک نوسینی تری گرنگی نوسیوەتەوە ، لەوە ئەچێ نیکولای ناوبراو دیسان دەسیشی بو نوسینەکانی کتسیاس‌و ئەمو ئەوی تر برد بێ۰۰ نوسینەکانی نیکولای دیمشقی بە شیوەی تەواو بە دەستمان نەگەیشتوە بەلام هەندێک شتمان لێ وەرگرتوە ۰وەکو

FGH, II A, Berlin 1926

٣٥ ـ « دیودور » ( (Diod, II, 32, 4) ) ئەلێ ، کە کتسیاس لە سەردەمی جەنگی کورشی بچوکدا لەگەل ئاردەشیری دووەم خەریکی خزمەت کردن بوو بە دیل گیرا ، وە بە هۆی ئەوەوە کە لە کاروباری هونەری پزیشکیدا چالاك بوو لە شای ئیران نزیک بۆوە ، بەلام وانیە کە کتسیاس لە لەشکر کەشی کورشی بچوکدا دژی ئاردەشیری دوەم شەڕی کردبێ ۰ کسنفونت (کزنفون) کە زانیاری تەواوی لە بارەی ئەو لەشکرکەشی‌یەوە هەیە و خۆی بەشداری تیا کردوە ئەوە باس ئەکات کە کتسیاس لەو رۆژگارەدا لە دەرباری ئاردەشیری دووەم بووە ، (کزنفون Anab ‘ I ‘ 8 ‘ 26) بە رای زوربە رەنگ بێ کتسیاس بەهۆی تیسافرن ساتراپی هەخامەنشیەکان لە کاتی شەڕدا لەگەل (کاریا) کە درایەسێی کیند بوە دژی ئامۆرگ کوڕی

پیسوتن ـ کە لـە لایەن سـەربازە بـەکرێ گیراوە یۆنانیەکانەوە پشتیوانی ئەکرا ـ گیرا ـ بێ ( توسیدید VIII ،٤،٢٨،٥،٥) .

٣٦ ـ بە وتەی پلوتارك ، کتسیاس لە یادداشتەکانی ئاردەشێردا لەگەل (کونون) فـەرماندەی « ئاتن » لـە ناو ئـەو شـەڕانەدا کـە نوشـوشتی یۆنانیەکانی تیا بەدی هات وە بـە تایبـەتی ئاسپارتیەکان ، دەوری گرنگی هەبوە .

٣٧ ـ لە کتێب دا هەیە کە ئەم بەردە بـە خوای میترا بەخشراوە ، وە ئەم وتەیە ئەوەیە کە لە ئاویستادا وشەی « بگ » Baga بە خوای ناوبراو وتراوە .. بەڵام لە پارسی کۆندا « بگ » Baga بە مانا خوای گشتیyە نەك میترا ، (وە لە ناو مادەکانیشا دیسان ئەم وشەیە بە مانا خوا بووە) .. وە لە سەر بەردەکەش نیگاری ئاهورامزدا کێشراوە نەك میترا .

٣٨ ـ رەنگ بێ کتسیاس نەقشە هەڵکەندراوەکەی بێستونی بە نەقشی (کوران گون) لە پارس (سەردەمی عیلامیەکان) زانیبێ ، لە نەقشەکەی دواییدا نیگاری چەند کەسێکی جەنگ جۆ کێشراوە (؟) وە لە ناو ئەوانەدا پەیکەری ژنێکی تیایە بەڵام شاژن نیە بەڵکو خواوەندە .

٣٩ ـ لەم رووەوە نوسـراوەکـەی بێسـتون خـۆی ئـەڵـێ : (BEH, L) وە جگـە لەوە نوسراوەکانی تری بەردەکـە بـە زمـانی ئارامی نوسراوە تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

E. Sachau, Aramaische Papyrus und Ostraka aus Elephantine. Leipzig 1911.

لاپەڕەکانی ٢٠٩ـ١٨٧ و ٥٧ و ٥٢ تەماشا بکە

A. Ungnad, Aramaische Papyrus aus Elephantine, Kleine Ausgabe, Leipzig, 1911. ژمارەکانی 65—70a لە لاپەڕە ٨٣ بە دواوە

٤٠ ـ هردوت لێرەدا هەڵە ئەکات ، ئەو ناوی کاری ئەو بە ناوی خودی ئەو ئەزانێ ، وە کتسیاس ناوی « سفندات »ی باس کردوە ، ئەمە شتێکی رێکەوت نیە ، وە شێوەیەکی تایبەتی هەیە کە لە کاتی خۆیا باسی لێوە ئەکەین ٠

٤١ ـ کزنفون Asab, I, 7, 11, VII, 8, 25, I, 4, 10.

سەرچاوەیەکی زۆر لە بارەی ناوی خەڵکەوە کە کتسیاس لە مێژوی مادا باسی کردوە بەم جۆرەیە ، (بۆ نمونە ئارتاسیرا ، پارمیسا) ، ئەم ناوانە هینی هاو چەرخەکانی ئەوون ، تەماشای پەراوێزی ١٧٣ بکە ٠

٤٢ ـ Ael. De nat, anim, IV, 21.

٤٣ ـ Ver, hist, 3 ئاشکرایە کە ئەم سەرنجە تەنیا بە کتێبی (ئیندیکا)ی ئەو کە لە لایەن زوربەی نوسەرانی سەردەمی کۆنەوە بە هەڵە دانراوە نەدراوە ، بەڵکو بۆ هەمو نوسینە مێژوییەکانێتی ٠٠ پلوتارك ئەویش لەگەڵ ئەوەدا کە بە رەقەبەرایەتی کتسیاس ـ واتا هرودوت ـ هاوکاری نەکردوە ، بە باشی دا ئەنێ ٠

٤٤ ـ نزیکەی سێ کتێب ، یەکەم شوێنەواری ئەو (لە ٢٣ «کتیب» ) داستانی کاری ئەفسانە ئامیز لە بارەی سمیرامید (سمیرامیس)ەوە هەیە ،بەڵام ناوی سمیرامید ناوێکی مێژوییەو تا ئیستاش لە ناو داستانە ئەفسانەییەکانا زۆربەی هۆزەکانی رۆژهەڵات زەمیندا ماوەتەوە ٠

٤٥ ـ لەگەڵ ئەوەشدا تا ئیستا ئەو تۆششانەی بۆ ئینکار کردنی راستی هرودوت کراوە ئەبوا تا رادەیەك نرخی نوسینەکانی کەم بکردایەتەوە ٠

٤٦ ـ ئەو مێژوە بێ بناغەو بنچینەیەی کە کتسیاس لە بارەی ئاشورەوە نوسیویەتەوە و لەناو نوسەرە کۆنەکانا بۆیە بەهادارو بەنرخ بووە، لەبەر ئەوە بوە کە نوسەرەکان سەرچاوەیەکی تریان لەم بارەیەوە بە دەستەوە نەبوە ٠٠ ئەو مێژوی ئاشورەی کە هرودوت نوسیویەتیەوە (هرودوت I ، ١٠٦ )

بە دەستیان نەگەیشتبوو ، وە رەنگە بێ هێشتا نەنوسرابێتیشەوە ٠٠

٤٧ ـ C. F. de Volney, Recherches nouvelles sur 1, histoire ancienne, Paris, 1814.

٤٨ ـ واتا ترياكونتا triakonta ـ « سی » لە جیاتی triakonta Leipontaton dusi ـ « دو تاك کەمتر لە سی » کە لە جاری یەکەمدا وتراوە ( (Diod, II, 32. 6) ) ٠

٤٩ ـ لەم شوێنەدا ژمارە ٥٣ کە هرودوت دایناوە حیسابەکەی راست کردۆتەوە ، وە رەنگە بێ لە نوسینە خەتی‌یە کۆنەکەی هرودوت دا هەمان ژمارە ٥٠ بوبێت ؟

٥٠ ـ ژمارەی ساڵەکانی ئاسپاندا ـ ئاستیاگ ، لە هەندێك شوێنی نوسراوەکانی کتسیاس دا کە ماوەتەوە ، تیا نیە ٠

٥١ ـ هەرچۆن بێ ناوی کیاکسارو فرائورت ـ ئەمانە هیندو ئەوروپایی‌ین ، بە ئاسانی ئەتوانرێ ئەم سەرنجە بخرێتە روو ٠٠ بەلاَم هەندێك ناوی تر کە کتسیاس باسی لێوە کردون ئەوانیش دیسان هیندو ئەوروپایین وەکو :

arstibara = astibaras « نێزەدار » artaja = artaios « راستکار ـ عادل » وە هینی تر ٠

٥٢ ـ یەکەمین پادشای ماد کە لە نوسینەکانی کتسیاس‌دا هەیە ئارباك و « لایەنگری » ئەو (بلسیس) پادشای بابلە ، بە شێوەیەکی گومان لێکراو ـ ناوی ساتراپەکانی مادو بین النهرین کە هاوچەرخی کتسیاس بون ـ ئەبن ٠ ئەمە بەسە بۆ ئەوە کە هەر تەقەللایەك بۆ زیندو کردنەوەی مێژوی مادی کتسیاس بدرێ کوێرانەو بێ سودە ٠

٥٣ ـ ئەمانە لە راستی دا ناوی مادی‌یەکانن ، لە ناو پارسەکانا ئەم جۆرە ناوانە نین ٠ ٠

٥٤ ـ هرودوت باسی ئەم شەڕە بەم جۆرە بە کورتی ئەگێڕێتەوە کـە کتسیاس نەی ویستوە لێرەدا وتەکەی هرودوت بە درۆ بخاتەوە ٠

٥٥ ـ بەڵام کزنفون لە کۆتایی ژیانی خۆیا ـ لەو کاتەدا ئاتن‌و ئاسپارت یەکیان گرت ـ لێی بوردن ٠

٥٦ ـ بەم پێیە نوسینەکانی ئەو (ڕاگوزاری ئەو لە بارەی سوقراتەوە) و « ولیمە »و (ئاینی کیشوەرداری) پەوەیە ٠

٥٧ ـ لە واقیعدا کورشی گەورە لە کاتی شەڕو شۆردا لەگەل هۆزەکانی « ماساگت » ئاسیای ناوەڕاست ـ کـە ئەیویست بیـان هێنێتە ژێر رکێفی خۆیەوە ـ کوژراوە ٠ **ـ دانەر ـ**

٥٨ ـ وە کورشی بچوکیشی **(دانەر)**

٥٩ ـ ئی٠ م٠ ترونسکی ، مێژوی ئەدەبیاتی کۆن ، لاپەڕە ١٧٥ ساڵی ١٩٤٦ ٠

٦٠ ـ کزنفون Anab, 1, 7, 11

٦١ ـ وەکو ئەوە وایە ناوەکانی کمبوجیە (باوکی کورش ، هردوت بـە نەوەی پرسـە قارەمـان یۆنانی دائـەنێ) ٠٠ وە ئاستیاگ و ماندانا (دایکی کورش)و کیاکسارو هیستاسپو کوبریاو ئارتابازو ئارتابات‌و ئارتاباو مهابیزو ئارسام‌و هینی تر ٠٠ بەڵام کزنفون ئەم ناوانە بەو کەسانە نادات کـە لـە نوسینەکانی هرودوتدا پێیان دراوە ٠

٦٢ ـ هەروەکو ناوی تاناٶکسار (کوری کـورش ، لـە کتێبـەکەی کتسیاس دا : تانیوکسارك) و رەنگە بێ ناوی «ئابرادات» یش بوبێ ٠

٦٣ ـ وەکو ئەوە ناوەکانی ئارتاگرس‌و ئارتابات (ئارتاپات)و ئارتوخ‌و مهابیزو میتریدات‌و تیگران (تەماشای لاپەڕە ٢١ و٨ Hell ‘ IV بکـەـە) وە هەروەها گادات (ناوی ساتراپی ئاسیای بچوك‌و یەکێ لەو کەسانەی بەر لـە کورشی بچوك لەوێدا فەرمانڕەواییان کردوە) ٠

٦٤ ـ وەکو ئەوە وایە ناوی ـ مرقد ـ «گۆیا عەرەبی یەو» ئاگلائیتادو خریسانتو سامباولو فراول (کە گۆیا پارسین)و پانتی (شاژنی شوش)و ئاندرامی (کە گۆیا مادی بێ)و ئالکئون٠وەیان ناوەکانی (شێوە ئێرانی)) ئاراسپو دائیفرنو ٠٠ بە تایبەتی ئەو ناوانەی کە گومانیان لێ ئەکرێ وەکو تمبرادو رامبكو ئامبو ئادوسیو هینی تر ٠٠ ئەبێ ئەوە بزانین کە زوربەی ئەم ناوانە لە شوێنی بێ مناسبدا بە کاری هێناون ،وەکو لە «ئاشوری» (یان بابلی) مومکن نیە ناوی (گوبریا) بوبێ ٠

٦٥ ـ وەکو ئەڵێن کزنفون لە بەرهەمی میژو نوسەکانی پیشو تری هەروەها (دیونیس میلتی ؟) لە بارەی قەوارەی ئیداری ئەمپەراتوری کورشەوە سودی لێ وەر گرتبێ ٠ بەڵام نوسینەکانی میژو نوسە کۆنەکان لە بارەی روداوەکانی کیشوەرەکانی رۆژ هەڵاتەوە بە تایبەتی روداوە میژوییەکانی پادشایی ماد زۆر بە کورتیو بێ بایەخ شتیان نوسیوە ٠ وە گومانی لێ ناکرێ کە کزنفون لەبەر داستانەکەی خۆی شتێکی بە نرخی لەو سەرچاوانەوە دەست کەوتبێ ٠ وە رێی تێ ناچێ کە نوسینەکانی کزنفون ـ لە کاتێکدا کە لە گەل هرودوت زیادو کەمی هەیە ـ لە میژو نوسە کۆنە یۆنانیەکانی وەر گرتبێ ، چونکە هرودوت خۆی دیسان لەو میژونوسە کۆنانە وە بە تایبەتی دیونیس سودی وەرگرتوە ٠

٦٦ ـ کزنفون Anab, III, 5, 13—17

٦٧ ـ رەنگ بێ کزنفون (لەم کاتەدا شوێن هرودوت کەوتبێ)و پادشایی تازەی بابلی بە ئاشور دانابێ ٠٠ کورشنامە ، کتێبی دووەم ـ١ ٠

٦٨ ـ کورشنامە V ، ١ ، ٣

٦٩ ـ کورشنامە IV ، ٢ ، ١

٧٠ ـ کورشنامە V ، ٢ ، ٢٥ بە دواوە

٧١ ـ کورشنامە III ، ٢ ، ٢٥

٧٢ ـ هرودوت I ، ١٣٤ تەماشا بکە

٧٣ ـ چونکە لە ماوەی بونی کتسیاس‌دا لە دەرباری پارسەکان شەڕ لە نێوان پارس‌و کادوسیەکاندا رویدا کە پارسەکان تیایا سەر نەکەوتن ٠

٧٤ ـ بە بیروڕای سیدنی ئاسمیت لاپەڕە ٣٥ لەم سەرچاوەیە :

S. smith Babyl, Hist. texts)

٧٥ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاستروە زادەگای زەردەشت (CB, V, 1945)

لاپەڕە ٢٦ لەگەل نوسینێکی لمان هائوپت

(Pauly—Wissowa, S. V. satrap)

٧٦ ـ لە بارەی چاپی هەندێك کتێبی (بروس)ەوە و لێکۆڵینەوە لە نوسینەکانی تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

P. Schnabel, Berossos und die babylonisch—hellenistische Literatur, Leipzig—Berlin, 1923.

شنابل گەلیك شتی لە بارەی نوسین‌و ژیانی بروس‌و زیندو کردنەوەی نوسینە تاریکەکانیەوە نوسیوە ٠٠ وە ئەوەی رون کردۆتەوە کە بروس لە نێوان ساڵەکانی ٣٥٠ و٣٤٠ی پێش زاینی‌دا لە دایك بوەو کتێبەکەی خۆی لە دەوروبەری ساڵی ٢٩٠ی پێش زاینی‌دا نوسیوە ٠ بەڵام ئەڵێ بروس لە دوای نوسینەکەی چوە بۆ دورگەی کوس ٠ شنابل لەم نوسینەدا پشت بە ویترووی ئەبەستێ ٠٠ لە نوسینەکانی (پوسیدون)دا ئەوە دەر ئەکەوێ کە بروس بەر لە نوسینی (میژوی بابل) لە دەوروبەری ساڵەکانی ٢٨٠ـ٢٩٠ی پێش زاینی رۆیشتوە ٠

٧٧ ـ Fr. Spiegel, Evanische Altertums Kunde, I, Leipzig, 1873

لە لاپەڕە ٦٨٢ بە دواوە ٠

٧٨ ـ مەسەلەی شوێن‌و کاتی پەیدا بونی زەردەشت کە تا ئیستا هەروا بە ئاڵۆزی‌و نەزانراوی ماوەتەوە ، ئیستا بە شێوەی گشتی و ئەو

بەڵگانەی کە هەردولا باسی ئەکەن جۆرێکی ترە ·· تەماشای لاپەڕە ٦١ـ٦٢ بە دواوە بکە ·

٧٩ – (شجرة النسب) «داری ڕەگەز» بە پێی نوسینەکەی بروس (وە بە پێی وتەی شنابل) ئەخەینە بەرچاو :

**پروس (سەدەی سێیەمی زاینی)**

**ئەسکەندەر پولی هیستور (سەدەی یەکەمی زاینی)**

**یوسف فلاوی (سەدەی یەکەمی زاینی)**

**فئوفیل (سەدەی دووەمی زاینی)** — **نوسەرێکی نادیار کە پەراویزی بۆ پولی هیستور نوسیوە** — **ئابیدن (سەدەی دووەمی زاینی)**

**ئافریکان (سەدەی سێیەمی زاینی)**

**یوسوی قەیسەری (سەدەی چوارەمی زاینی)**

**پانودور (سەدەی پێنجەمی زاینی)**

**سینکل (سەدەی هەشتەم و نۆیەمی زاینی)** — **مارمیخائیل (سەدەی دوازدەیەمی زاینی)** — **نوسینی ئەرمەنی یوسوی**

٨٠ – P. schnabel – هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٥٤ و ١٨٥ بە دواوە ·

٨١ – سنیکل یان ئانیان لێرەدا دوچاری هەڵە بووە لە جیاتی « هەشت مادی » نوسینی یوسوی (٨٦ کلدانی) ناو بردوە · وە (دو کەس لەو کەسانە کە یوسوی ناوی بردون لەم هەڵەیەدا هاتون) ·· سەرچاوەو ژمارەکانی تری تێکەڵاو کردون ·

٨٢ – بە بیروڕای گوتشمیدو تیودور نلد کە گەورەترین ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپایی سەدەی رابوردون بەم جۆرەیە ·· تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

th. Noldeke Aufsatze Zur Perisichen Geschichte, Leipzig, 1887

(لاپەڕە ١٣و پەراوێزی ٢) ئاتنــەش دیسان چــەند شتێکی لە نوسینەکانی (پرسیکا)ی دینون وەر گرتوە ٠

٨٣ ــ هەندێك لە بەشەکانی ئەو تەنیا بە شێوەی نوسینی یۆنانی بــە دەستمان گەیشتووە ٠

٨٤ ــ ئیستا هــەندێک باس و بابــەتی عیبری کۆن ( کتێبی تەویت ) دۆزراوەتەوە کە هینی سەدەی یەکەمی پێش زاینی یە ، هەر سێ کتێبەکە لــە نوسینە یونانیەکەی تەوراتدا هەیە ٠

٨٥ ــ پەیدابونی تەورات X ، ٢٤ــ٢٢

٨٦ ــ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

B. Meissner, Das Marchen Vom Weisen Achiqar. Der A. O. XVI, 2.

ئی٠ یو کراچکوسکی ، پیشەکی کتێبەکــەی ( حکمت حکــارو ئەفسانەکانی لوکمان ) پ٠ چاپی (وسمیرنایا لیترا سالی) سالی ١٩٢٠ ٠

٨٧ ــ لەم بارەیەوە بیروڕاکانی ئەو ئەوەندە بایەخدار نین ، بۆ نمونــە سیناخریب پادشای ئاشوری بــە کوڕی (ئانماسار) ( =سالماناساری پێنجەم) داناوە ، وە ئەمە هۆی ئەوەیە کە لە (کتێبی پادشایان) دا ناوی سیناخریب بە گورجی لە دوای سەلماناساری پێنجەمەوە هاتوە ، وە ناوی سارگونی دووەم کە لە نێوان ئەو دوەدا پادشایی کردوە باسی لێوە نەکراوە ٠ میژوی تێك روخانی ئاشوری تا ڕادەیەك راست هێناوە ، (لە روی سەرچاوەکانی تەوراتەوە) دانەر ئەم دابەشکردنە بە هینی نابوخود نوســور ( بخت النصر ) و ( ئاسوئر ) Asueros واتــا Ahasweros بە زمانی عیبری کۆن دا ئــەنێ ٠ ناوی هەردو پادشاکە لە تەوراتدا هەیە وە ئاحاش وروش ــ و « ئاسوئر »

هەمان خشایارشای پارسی کۆنن • بەڵام دانەر ئەم باسە بە هینی ئاستیاگ (Astiages) دائەنێ •

٨٨ ـ لەم داستانەدا ناوی ئاسمۆدی (Asmodaios) کە یەکێك لە گیانە پیسەکانی زەردەشتیەکان وە هەمان ئائیشما ـی دێو Aisma (رق) بە گیانی ناکۆکی‌و دوبەرەکایەتی ناوی براوە •

٨٩ ـ لێرەدا مەبەستی دانەر لە ئاشور ـی ، پادشایی سلوکیەیە •

٩٠ ـ چونکە لەم داستانەدا باسی کتێبی ( یونس پێغەمبەر ) کە بە بیرورای رەخنە گران تەورات لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاینـی‌دا نوسراوەتەوە ، تیا کراوە ، بە شێوەی گشتی‌و بێ گومان کردن ( کتێبی توویت ) لە بارەی ناوەڕۆکەوە بە کتێبی یۆنس پێغەمبەر نزیکە ، وە هەروەکو ئەو شێوە داستانەو لە بارەی نەینەواوەیە •

٩١ ـ لە دوای ئەوەی کە بین النهرین یان داگیر کرد •

٩٢ـ ٩٣ـ وڵاتی ئاژی ـ دهاك کە لە دواییدا لە دوای سەردەمی پارتەکان بە بابل یان دائەنا ، وە وشەی باوری Bawri کە لە ئاویستای بچوك دا (یشت V ، ٣٠ ، ٢٩) هەیە رەنگە بێ ئەمە بسەلمێنێ •

٩٤ ـ ناوی ئاستیاك بە ئاکادی بە شێوەی «ئیشتومگو» بەکار هێنراوە ، وە ئەم شێوەیە دیسان وەکو Astuages یۆنانی مومکن نیە لە Azi (s) dakaka وەر گیرابێ ، وە لەم روەوە تەنانەت دلاتر باسی کردوە ، چونکە AZi (s) dahake بە ئاکادی بە شێوەی A—si—da—a—Ku, A—si—is—da—a—a—Ka یان شتێکی بەم جۆرە دەرهاتوە •

٩٥ ـ نیبور و• ج• راولینسون‌و چەندانی تر هاکا Dahaka بە هەمان دوکسی Deiokes هرودوت یان زانیوە •• و• ج• راولینسون لەو باوەڕەدا بوە کە ئاستیاگ لە جیاتی ئاژی ـ دهاك ، دانراوە ••

G. Rawlinson the History of Herodotus, 4th ed. London. 1880.

لاپەڕەی ٣٩٥ پەراوێزی ٧

٩٦ ـ ناو بردنی ئەم باسە پێویستە کـە ( مارەکان ) (Mar—k)
لە نوسینی نوسەرە ئەرمەنیەکانا هەمان « ماد » ن وە نابێ بـە هـەڵە بـە (مەردان) یان بزانین • (مار) ـ mar ـ لە ئەرمەنی کـۆندا بـە هـەمان ( ماد ) ـ mad ی پارتی یان وتوە ، وە ئەمە لەگـەڵ مادای mada کۆندا بەرامبەرن • لـە لایەکی ترەوە مد ـ ئاسـی med—aci هـەمـان زاراوەی مدوی medoi یۆنانی یـە کـە بـە زمـانی ئـەرمەنی بـەکار هێنراوە •• وە medoi لـە شێوەی ئەدەبی madoi بـە شـێوەی یۆنانی هەمان زاراوەی ماد ئـەگرێتەوە • وشـەی (میدیانە)ی روسـی کـە یۆنانیەکان لـەم دواییەدا بەکاریان ئـەهێنا کـە ( مدوی ) یان medoi وەك میدی ئەوت وەرگیراوە •

٩٧ ـ ئەبوا وامان دابنایە کە گاتاکان لـە سەرەتاوە بە خـەتی بزماری نوسرابنەوە ، بەڵام هیچ جۆرە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە خەتی بزماری لەو ناوچەیەداو بەو زوییە بایەخی بو بێت •• وە دیسان بەڵگەی ئەوەشمان بە دەستەوە نیە کە ئاویستا هەموی یان هەندێکی لە سەردەمی کۆندا سـەر لەنوێ بە خەتی بزمارییەوە کرابێتە خەتی ئەلفبایی •

٩٨ ـ ئەبێ بڵێین کە هەندێك لە بەشەکانی ئەم نامەیە وەکو (فروردین یشت) کە لە باس کردنی گیانی راستان دەرچوە رەنگە بێ لـە روی زمانەوە بە گاتاکان نزیکتر بێ •

٩٩ ـ بلین لە Nat, hist, XXX, 2, Z دا باسی کردوە •

١٠٠ ـ هرتل ئەڵێ : کـە ئاویستا هەخامەنشیەکان بـە پێچـەوانەی زەردەشتو ئامۆژگاریەکانی دائەنێ بە ئەنقەست فەرامۆشی کردون ، پارچـە نوسینێکی و• و• ئاستروە بـە ناونیشان ( زادەگای زەردەشتیەکان ) لـە

لاپەڕە ٢٠ بە دواوە) . بـەڵام وە نەبێ ئاویستا تەنیا پادشایانی هەخامەنشی فەرامۆش کردبێ بەڵکو هەمو ئەو باس و بەسەرهاتانەی کە پەیوەندی یان بـە هەخامەنشیەکانەوە هەیە لە بیری کردوون ، هەروەکو : مالیات ، پارە ،ڕێگاو بان ، قەوارەی ئیداری ، (ساتراپ نشینەکانو هینی تر) .. هۆزە بێگانەکانو دەزگاو دامەزراوەکانیان ، هرتسفلد زۆر هەوڵی داوە کـە ئـەم باسانە لـە ئاویستادا بدۆزێتەوە ،تەماشای بەشەکانی (٢٦ ١١، ١٤، ٣٥، ٣٦، ٦٣) بکە لە

E. Herzfeld, Zoroaster and His world, II, Princeton, 1947

بەڵام هەوڵدانەکەی ئەو ناتوانین بـە سەرکەوتو ترین هەوڵدان دابنێین ، وە لێکۆڵەرەوەکان ئەو هەوڵدانەیان داوەتە دواوە تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

W. B. Henning, Zoroaster, Politician or witch—Doxtor?. London 1951

١٠١ ـ ڕەنگە باوری Bawri ناوبراو لە ئەفسانەی ئاژی دـەهاك ـ هەمان بابل بێت (یشت ٥ ـلاپەڕە ٢٩ ،٢٨) بەڵام بەڕای زوربە نوسراوەکانی یشت لەوە ئەچی لـە دواییدا نوسرابێتـەوە وە گۆڕینی (ب) بـە (و) ئـەوە ئەیسەلمێنێ ..

١٠٢ ـ بۆ نمونە لە سەدەی پێنجەمدا سـەرنجی خوارەزمیەك ئـەدەین کە لە میسردا ژیابێ

A. H. say ce and A. E. Cowley, Aranaic Popyri Discovered ar Assu London, 1906 pap. B.

وە (ئی. م. والکوف) پشت بە ئارامی کلنی ئەبەستێ لـە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا ١٩١٥ لاپەرە ٢٠

کۆمەڵە خەڵکێکی ئەمپـەراتورێتی هـەخامەنشیەکان ، لـە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زاینی‌دا لە کاتی شەڕەکانی نێوان ئێرانو یۆنان‌دا ،بۆ

ئاسیای بچوك ویۆنان رۆیشتون ، ئەگـەر ئاویستا هـەمو رواڵەتەکانی ژیانی ئەمپەراتوریتی هەخامەنشیەکانی نیشان بدابایە لەوە نەئەچو ئەم باسەی بەیادا نەهاتبایە ۰

۱۰۳ ـ تەماشای لاپەڕە ۷۲ـ۷۱ بکە ، میژوی (فرگرد) یەکـەم سـاڵ ۱۵۵ـ۱٦۰ی پێش زاینی لـە دوایی‌دا کوشتارو برینـی پادشایانی یۆنـانو باکتریا بە دەست میتریداتی یەکەم پادشای پارتەکان بوە ۰

۱۰٤ ـ باشترین سەرنج لـەم کاتەدا پەیوەندی بە ئاکاد میسین و۰و۰ ئاسترووە هەیە ، بەڵام ئەویش وەکو پێویستە جێگـای باوەڕ نیـە ، بیروڕای ئاکاد میسین و۰و۰ ئاسترووە ، (ڕاپـەڕین لـە مرغیـانا دا لـە سـەردەمی داریوشی یەکەمدا) BDI گۆڤـاری پـەیکی میژوی کۆن ، سـاڵی ۱۹٤۹ ژمـارە ۲ لـە لاپەڕە ۲۱ بـەدواوە بـەم جۆرەیـە : ویشتاسپەکان ، کـوڕی ئارواتاسپەکان لـە بنـەماڵـەی نائـوترا ، پشتـیوانی زەردەشت ، (هرتلو هرتسفلد کە بە پێی ئەم بیروڕایەیە Nautara بـە بچوك ناوبردوە بەڵام ئیران شوناسە کانی تر لە سەر ئەم بیرورایە نین ۰۰۰۰

۱۰۵ ـ ئەو کتێبانەی کە لە دواییدا بون بـە بەشێك لـە تەورات لـە سەردەمە جۆربەجۆرەکانا ،لە سەدەی سیازدەیەم تا سەدەی سێیەمی پێش زاینی نوسرابونەوە ، واتا بەر لەوەی کە ئاینی یەهود لە سەدەی شەشەم وپێنجەمی پێش زاینی‌دا بێتە کایەوە ئەوان نوسراونەتەوە ۰۰ یاساکانی تەورات لەوانە هەڵبژێردراون ۰

۱۰٦ ـ کتیبـە زەردەشتیەکانی دوایی (سەردەمـی ساسانیەکانو دوای ئەوان) ئـەوانیش لـەبارەی میژوی زەردەشتەوە زۆر بایـەخدارن ۰۰ وەکو (بوندهشن) و (دینگرت)و (منوكفرت)و هینی تر کـە بـە زمـانی پارسـی ناوەڕاست نوسراونەتەوە ۰

۱۰۷ ـ زمانی ئاویستا پەیوەندی بە زمانە کۆنەکانی ئێرانەوە هەیە ،

زاراوەی زمانە گانی ئیرانی ئاوەڕاست لە نوسراوەگانی دوایی هەخامەنشیەکانا ئەبینرێ ۰۰ (سەدەی چوارەمی پێشی زاینی) زمانی پارتی کە سەدەیەك بەر لە زاینی بە دواوە هەندێك شوێنەواری دەسکەوتوە لەگەل زمانی مادەکانا زۆر لە یەك نزیکن ـ ئەوە بە بەشێك لە زمانە ئیرانیەکانی ناوەڕاست دائەنرێ ۰

١٠٨ ـ و۰ ب هنینگ کـە لە سەردەمی ئێمەدا یەکێکە لـە باشترین ئاشناو زانای زمانە کۆنەکانی ئێرانی ناوەڕاست ، لە نوسراوەیەکی بچوکدا لە بارەی بیروڕای هرتسفلدو نوبرگ سەبارەت بە زادەگای زەردەشت نوسیویە دەری خستوە کـە زمـانی گاتاکان هیلێکی ناوەندیە لـە نێوان زمانـەکانی رۆژئاوای ئیران‌و رۆژهەلاتیا ، وە ئەلێ کە ئاویستا لـە قەلەمڕەوی دەولەتی کۆنی خوارەزم کە بەر لە هەخامەنشیەکان بووە لە دەراوەکانی تجن یا مرورود هاتۆتە دی ۰۰ دیسان باسی پەیوەندی نزیکی نێوان زمانی خوارزمی‌و ئاویستا ئەکات تەماشای

W. B. Henning, Zoroastar, Politician or witch—
Doktor, London, 1951 لە لاپەڕە ٤٣ بە داوە بکە ۰

١٠٩ ـ تەرجەمە کراوەکانی ئاویستا کە دەست کەوتوە ئەمانەن :

J. Darmesteter (VV. I-II), L. Mills (V. III), the Zend—Avesta, Oxfrd, 1895, 1883, 1887, (the sacred Books of The East, ed. by F. Max Muller, V, IV 2, XXIII, XXXI), F. Wolc Avesta, Dieheiligen Schriften der Parsen, ubersetzt auf der Grundlage Von Chr. Bartholomae,s Altranischem worterbouch, Strasburg, 1910, chr. Bartholomae. Die Gatha,s des Awesta, Zarathustra,s vers Predigten, ctrassburg, 1990.

ئا۰ ئا برتلس ئەویش چەند پارچەیەك لە نوسراوەکانی ئاویستای لـە گۆڤاری

١٦٨ ـ هەروەکو ف٠ ئا٠ لـەناو یۆنانیەکانی سەردەمی هومـەردا ٠٠ ئەڵێ : کە باس کراوە لـە کۆمـەڵگای یۆنانی بازیلوس‌دا پادشایان هــەڵ ئەبژارد ٠٠٠٠٠٠٠

١٧٠ ـ ویسپرد XVI ،٣ Soitrya a pasca Zemascaurdarausca نە لێکدانەوەی بە پارسی ناوەڕاست Soitra (نەك بە وردی) بـە شێوەی «روستاك» بەکار هاتوە ٠بە زاراوەی ئاکادی ناوەڕاست پێی ئەوترا ugaru.

١٧١ ـ بێستون ، I ،٩٢ وە چـەندانی تر ٠٠ هرتسـفلد زاراوە کۆنەکانی بە شێوەی مەفاهیمی تازە بەکار هێناوە ٠٠ وە Vardana ی بــە مەڵبەندی ئیداری ناوچەی یەك ئوستان داناوە ٠ وە لەگەل « شارستان »ی سەردەمی ساسانیەکانی بە یەك زانیوە ٠ بەلاّم لەو سەر چاوانەدا کـە بـە دەستەوەن لەمە زیاتر زانیاری نادەن بە دەستەوە ٠

E. Herzfeld, Alter Peersische Inschriften, Berlsn, 1938.

لاپەڕە ١٢٣ ٠٠ و٠ ئا٠ تیورین لە کۆتایی نامـەی خۆی دا نوسیویێتی کـە vardana «لادێکان»و "Vit" ە گەورەکان بون و خەڵکی دانیشتوانیان زۆر بوەو خەریکی کشتوکاڵو ئاژەڵداری بون ٠

١٧٢ ـ لـە یـەك کـاتـا ( dida [Dar. sus, F, 42, 54] بــە ئاکـادی [Usitrtu sa ekalli تەرجەمە کراوەو هرتسفلد بە حەساری داناوە ،وە ئەم لێکدانەوەیە راستە ٠

لاپەڕە ١٢٣ ٠ [Altpersische Inschriften, Berlin, 1938.

١٧٣ ـ بەڕای زوربە Vara کە لە ئاویستای بچوك دا (ویدودات ، II ، ٤٣ـ٢١) باسی ئەکا قەلاّیەك بوە ، وە رەنگ بێ ئەم وشە بەرامبەر وشەی dida ی ئاویستایی یان پارسی کۆن بێ ٠

١٧٤ ـ سەرچاوەکـانی پارســی کۆن دوجـار زاراوەی avahan- «دێ» (لەگەل avan ی ئەرمەنی بەراورد ئەکەن) یان بۆ شوێنی نیشتەجێ

بەکاریان هێناوە ٠٠ [ Beh, I - 26, 33, Der, Sus, 46 ]

بە بیروڕای و٠ ئا٠ تیوزین ، ئەم وشەیە بە مانای شاری سنعەتکاری داناوە٠٠

١٧٥ – ئەوانە بە رێکەوت بەم جۆرە حاکمانەیان ئەووت (پادشا) وە زۆربەی ئەوانە ناویان بە بێ نازناو هێناوە ٠

١٧٦ – لێرەدا (لە رێگای زمانی پارتی یا مادەوە) shar- « شار » وە یان «دەوڵەت» لە زمانی فارسی تازەدا هەیە ٠٠ لە زمانی پارسی کۆن دا ئەو وشەیە وەکو xcaca بووە ٠ گۆڕینی مانا لەم کاتەدا بە medinta «ناوچە – وڵایەت»ی ئارامی لەگەڵ madinatun ی عەرەبیدا وەك یەکن ٠

١٧٧ – هەروەکو Ktp ، سالنامەکان ، دێرەکانی ٤٢ ، ١٧٢ ، Ks سالنامەکان ، دێرەکانی ٦٦ ، ١١٠ ، ١٥٨ ، ١٦٠ وە چەندان شوێنی تر ٠

١٧٨ هەروەکو لە یشت XIIV ، ٣٧ ، وە لە « فرودرین یشت » (یشت XIII ، ١٨) کە زۆر کۆنە ، وە بە بیروڕای ئێمە لە بارەی رۆژگارەوە نەختێك لە « یسنای حەوت بەش » دواتر ئەبێ ٠ ئەو ئامۆژگاریانەی لەو دایە لە ئامۆژگاریەکانی موغەکانی سەردەمی کیاکسارو ئاستیاگ ئەچن ٠ هەروەها لە ( گاتای ئوشتاداتی )دا بەو جۆرەیە ٠٠ ( یسنای XLVI ، ١) ٠

١٧٩ – لەگەڵ Her, I, 96 - 98 ؛ بەراورد بکرێ ٠٠ یسنای XVI ، ٥ ٠٠٠٠٠

١٨٠ – هەروەکو ساگارتیەکانو هۆزەکانی ماناو هینی تر ٠

١٨١ – لە باسو بەسەرهاتە کۆنە زەردەشتیەکان دا لە لێکدانەوەی سانسکریتی یسنای XIII ، ١ ، دەرکەوتوە کە لە Zantu ٣٠ بنەماڵەو لە VIS ١٥ بنەماڵە بوون ٠

١٨٢ – هەروەکو لە نوسراوەکەی شمشی – ئادادی پێنجەمدا باسی

میسـانو سونبیانو ترلوئیانی کـردوه ( KB ' I لاپـەڕە ۱۷۸ ، II '
۳۹ـ٤۲ = ARAB ' I ـ ۷۱۸) لـە نوسراوەکانی سـارگون دا باسی
دالیان کراوه ( 8CS ' ، دێری ۱۸۹) ·
۱۸۳ ـ یشت XIII ،۶۹، XV ، ۳۱، ویدودات XIX ' ، ٦ وه
هینی تر ·
۱۸٤ ـ یشـت V ، ۸۵ ، X ، ۸ ،۱۳ ـ XIII ' ، ٦۹
به دواوه ·
۱۸۵ ، له باسو بەسەرهاتی پارسیەکانا dahyuma بـه ئاشـکرا
مەفهومی (داوەر) ئەگەیەنێ ·
۱۸۶ ـ یشت V ' ، ٤۹ ، IV ' ،۲۱، XV ' ، ۳۲ ·
۱۸۷ ـ لەگەل یشت V ' ، ۲۲ ، ۲٦ ، ٤٦ ، بەراورد بکرێ ·
۱۸۸ ـ Beh ' I - 6 وه هینی تر··،
وەهینی تر · Dar, Pers e ' 2 ' Dar ' NRa ' 3
۱۸۹ ـ هەروەکو مرغیانا ، بەشێك لـه ساتراپ نشینی باکتریا بـەم
جۆره بوه (Beh, III-38)
۱۹۰ ـ هەروەکو رغـه یان نیسایـا ( نیشا ـ نیشای ) یان کامپاندا
(بیت ـ همبان) له ماد : Beh, I - 13, II-25, 32
۱۹۱ ـ پارچەیەك له «مۆری یشت» ، (یشت X ' ۸۷) لـەگـەل
فرگرد I ویدودات ، « مۆری یشت » لـه یـەکێتی کیشـوەرەکانا یان
dans husasti باس کراوه · به شێوەی گشتی هەمو ئەو ناوچانەی که
هۆزه شارستانیەکانی تیا بون و پەیوەندی شارستانییان لەگـەل یـەکتردا
هەبوه وه یان ئاینێکی هاوبەشیان هـەبوه : بـه شێوەی کۆ ناوبراون وەکو
« سەرزەمینه ئارياييەکان » ·······

١٩٢ ـ زاراوەی dahyn لـە زمانی زیندوی خـەلکدا بوە ، وە بێ گومان لە دواییشدا هەر ئەو زاراوەیە ماوەتەوە ، وە لەگەل «دێ»ی فارسـی تازەدا بەراورد بکرێ .

١٩٣ ـ نازناوی دەسەلاتدارەکانی ناوچەکانی ماد کە لە سەرچاوەکانا هاتوون زۆر بەگران لێك ئەدرێنەوە ، چونکە زوربەی سەرچاوە ئاشوریەکان بـە ( قزل بوندا ) وە یان ( خار مشاندی )و هینی تر ناویان ئـەبـەن . دەسەلاتدارەکانی دەورو بەری یەکێتی هۆزەکانی ماد هەمیشە بە bel ali ناو ئەبران ، وە هـەندێک جـار هاوکارە کانیشیان بەو ناوە ناو بردوە ، هەروەکو لە سالنامەکانا دیارە ( Ktp ، دێری ٥٢ KS دێرەکانـی ٦٦ ، ٧٠ ، ٧٤ ، ١٠٢ ، ١٦٦ .. نوسراوەی رەسمی دێری ٦١و چەندان شوێنی تر).. بەلام حاکمی ماناو بە دەگمەن حاکمەکانی ئالیپی ( KS ،سالنامەکان، دێری ٤٠٢ ، نوسـراوەی رەسـمی دێری ١١٧) گیلـزانو قزل بوندا .. نازناوی پادشایان بوە ..

١٩٤ ـ دەسەلاتی زۆرداری پادشایی لە رۆژ هەلاتدا بـە بیروڕای م. (شێوەکانی بەر لـە دروست بونی سەرمایەداری ، پولیت ئیزدات ، ١٩٤٩ لاپەڕە ٦) یەکێتی کۆمەلەکانی فراوان کرد . بەلام لە مادا هێشتا یـەکێتی یەکی بەو جۆرە پەیدا نەبوبو ......

١٩٥ ـ ویدودات II ، ٢١ بە دواوەو هینی تر .

١٩٦ ـ لەگەل یشت XIII ، ٥٢،١٦ ، یسنای VII ، ١٢ ، XII ، ٥ ، بەراورد بکرێ .

١٩٧ ـ یسنای XIX ، ١٧ ، ویسـپرد ، III ، ٢ ، ویدودات ، ٢٨ ، هەروەها لەگەل یسنای XI ، V ، ٦ ، XIII ،٢ وهینی ترا بە راورد بکرێ .

١٩٨ ـ یسنای XIX ، ١٧ .

١٩٩ ــ له بارەی لێکدانەوەو مانای (ورن)ەوە ، وە بە تایبەتی لە بارەی مەفهومی (شودرا)وە تەماشای گ‌ك. ف. ئیلین ، شودران‌و کۆیلەکان لە ناو کۆمەڵە یاساکانی هیندستانا ، VDI ، ١٩٥٠ ژمارە ٢ لاپەڕە ٩٤ بە دواوە بکە .

٢٠٠ ــ KB ، I ، لاپەڕە ١٨٠ ، III ، ٣٣ ، لەگەل ئەوەشدا مادەکان ئاگاداری عارەبانە بوون ، هەروەکو لە هەزارەی دووەمی پێش زایینی دا کاسیەکانیش زانیاری‌یان لە بارەیەوە هەبوە .. وە پادشایانی ئێران سواری عارەبانە ئەبون ، بێ‌گومان لە رۆژگارێکدا کە عارەبانە دەوری ئەگێڕا لە شەڕ کردنا .. سەرنجی ئەو پەیکەرە بەردینەو نەقشە هەڵکەندراوانە بدرێ کە لە ئەستێلك هەڵکەندراون ، وە هەروەها لەگەل SPA ، IV ، A ، ٩٢) بەراورد بکرێ ، جموجوڵی هۆزە هیندۆ ئەوروپاییەکان لە ئاسیای ناوەڕاستدا بە هۆی بەکار هێنانی عارەبانەوە فراوانتر بوو .. نیگاری (بەر لە سکاییەکان) ئەو عارەبانانەی کە لە گێوەکانی قرقیز ستان دا کێشراون هینی ئەم هۆزە سەرەتایی‌یە هیندۆ ئەوروپاییانەن .. ئا. ن. برنشتام ، نیگاری روی بەردەکانی سای‌مالی تاش .. گۆڤاری ئەتنوگرافی سوڤییەت ، ١٩٥٢ ژمارە ٣ ، لاپەڕە پەنجا بە دواوە لەگەل نیگاری ٤ دا .

٢٠١ ــ تەنیا پادشا سواری عارەبانە ئەبوو ، Her. ' VII ' 84 - 88 VII, 40, XIII, 115. Xen, Anab, 1, 8, 3.

٢٠٢ ــ کزنفون باسی ئەوانە ئەکات "Xen, Anab. 1, 8, 10" لەویادا کە لە شەڕی ئارتاکزرکس ( ئاردەشیر )ی دوەم لەگەل کورشی بچوکدا ئەدوێ .. ئەوانە دیسان لەناو لەشکری داریوشی سێیەمیشدا بوون.

٢٠٣ ــ دانشمەندانی رۆژئاوا بە تەواوی فیودالەکان بە بنچینەی پێك هاتنی کۆمەڵگای مادی کۆن‌و پارس ئەزانن ، وە ئەم رایە بە رایەکی سەلمێندراو

دائەنێن ‥ (وە بە بیروڕای ئەوان گۆیا یۆنانیەکانو مەکدونیەکان لـە پلەی بەرامبەری کردنا لەگەل سەرمایەداری دا کۆمەلگایەکی پێشکەو تو ترو بەرز تریان بووە) ‥ هرتسفلدو کنیگو تارنو هینیتر ئەوانیش لـە سەر ئەم بیروڕایەن ‥ وە لە سەر بناغەی ئـەم بیروڕایـە Vit بـە «خانـەدانی فیودالەکان» لێك ئـەدرێتـەوە ‥ تـەماشای ( Air WB لاپـەڕە ١٤٥٥ بکە) ‥ وە Kara بەلای ئەوانەوە (ئەو ئازادانەیە کە خزمەتی ئیجباری لەشکریان ئەکرد) ‥ کە گوایا خۆیان دەستەو تاقمی شەڕکەریان هەبوە ‥ [ Gefolgsleute ] ‥ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

E. Herzfild Altpersische Inschriften.

لاپـەڕە ٥٤ـ٥١ ٠ ئـەم وتانـە بنچینەیەکی زانستیانەیان نیە ، رۆژگاری جۆربەجۆری مێژو لەم رووەوە ئالۆزاوە ‥

٢٠٤ ـ زۆر جێگای سەرنجە کـە لـە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا وشـتری دو کۆپـان (Camelus bactrianus) بـەلای ئاشوریەکانـەوە شـتێکـی تـازە بوە ، وە پـێیـان وتوە وشـتری دو پشـت (Gammale sa sunnaserisia) بـەشی لای سـەرەوەی ئەستونەکەی سالمالناساری سێیەم : ( I ‘ KB ، لاپەڕە ١٥٠ ، I ‘ ARAB ‘ I - ٥٨٩ ) لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینی دا ئەم جۆرە وشترە گەیشتنە ئورارتو (٨ ‘ CS, ، دێـری ٢١٠ـ٢٠٩ ـ AVIU ژمـارە ٤٩ لاپـەڕە ٣٢٧) وە ئاشوریەکان ئاگاداری ئەمە بون ، وە پێیان ئەوتن Udru ، رەنگ بێ ئەم وشەیە زوتر یەکێك بو بێت لە ناوەکانی وشتر بەلام لە دواییدا بە تایبەتی بە وشتری دو کۆپانیان وتوە ‥ لە سەردەمی کۆنا (باکتریا) یان بە زادەگای ئەم جۆرە وشترە دائەنا ‥ وە بەڕای زوربە لەوێوە بـەرەو ئاسیای نزیك بلاو بۆتەوە ‥

٢٠٥ ـ بەردی لاجوەرد کە هەندێك جار ئاشوریەکان لە جیاتی باج لە

مادەکانیان وەر ئەگرت ، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە سەرەتاوە ئاشوریەکان وایان ئەزانی ئەمە لە خاکی مادا نەبوە ، بەو شێوەی کە مەعدەن شوناسان نیشانیان داوە کە گوایە ئەم جۆرە بەردە لە ئاسیای نزیکدا بوە بەلام لە ئاسیای ناوەڕاست دا بوە · یان وردتر بڵێین لە باکتریا واتا ناوچەی بەدەخشانی ئیستا بوە ·· بەلام مادەکان نوختەی پەیوەندی بازرگانی نێوان باکتریاو ئاسیای نزیک بون ·

٢٠٦ ـ تەنانەت کتسیاس لە سەدەی شەشەمی پێش زایینیدا لە بارەی ئەم جۆرە بەهرە کێشیەی نێروەجاخی یەوە لە مادا هەندێک باسی بیستوە · بە پێی ئەو نوسینەی کە لە نیکولای دیمشقی بە جێماوە :
FGH. II, A, Berlin, 1928. No. 90 Fragn 66, 2

تەماشای دوای لاپەرە ٤١٠ ی نوسراوەکە بکە ·

٢٠٧ ـ لە بارەی باسی ساختومانی ئەو قەلایانەوە کە بارەگای لەشکر بون ·· (سالنامەکان دێری ٢١ · لە سەرپارچە تەختەیەکی گلین نوسراوە ، دێری ٤٠ Ktp لاپەرە ٧) ·

٢٠٨ ـ رەنگە بێ Bit-tassaki یشیان پێ وتبێ ( S = بە «تس» و «چ» ) ·

٢٠٩ ـ شوێنە نیشتەجێکانی نیکور یان ( نیککور ) ، ساسیاشو ، توتاشدی ، کوشیاناشی ، خارشو ، ـ کە رەنگە بێ «عارستیا»ی ئورارتو بوبێت ـ شاناشتیکو ،کیش کی تارا ، خارشای ئابوباکو چەندانی تر ·· کە سەر بە توناکی پادشای پارسوا بون (؟) نوسراوە ·· ئەو قەلای کیت پاتیای لە چیای قافلانکو زقزل بوندا ، کە لە نوسراوەکانی سارگونی دوەمدا بەناوی «کیت پات» نوسراوە) لە زنجیرەی پیت ـ ئابدادان دابڕیو داگیری کرد · سالنامە کانی تیگلا تپالاسار لە بارەی هەمو ئەو شتانەوە کە بە دەستیان هێناوە وەکو ئەسپو قاترو گای شاخدارو ئاژەلی وردو درشت و وشتری

دوکۆپانو ...... باس ئەکات .

٢١٠ ـ E. Forrer, Die provinzenstellung des Assyrischen Reiches, Leipzig, 1921.
لاپەڕە ٩٠ .

٢١١ ـ Ktp - ـ لاپـەڕە VIII ، V ، هـەمان سەرچاوە ، هـەمو نوسینەکانی تیگلا تپالاساری سێیەم باس ئەکات .

٢١٢ ـ ڕەنگە بێ هـەمان ئارازیاش وە یان ئالنزاش بێ ، لـە بیت ـ باروئا ؟ ، تەماشای پەراوێزی ٣١٧ی هەمان بەش بکە .

٢١٣ ـ لە نوسراوەی Kisisa دا هـەیە وە روست بـە هـەڵە بـە Kisir ی نوسیوە .. لـە بارەی شـوێنەکـەیەوە تـەماشـای کۆتایـی نوسینەکە بکە ..

٢١٤ ـ هەروەکو لەمەوبەر وتمان ئەم ناوچـەیە ڕەنگە بێ لـە نزیک هەمەدانەوە بو بێت (تەماشای لاپەڕە ٢٠٧ی نوسراوەکە بکە) .

٢١٥ ـ E. Forrer هـەمان سەرچاوە ، لاپـەڕە ٩٠ ، بیت ـ باروئا بـەشـێک بوە لـەو ناوچـەیـە .. ( واتـا بـارو ئاتـای ، نوسـراوە ئورارتوییەکان ) .

٢١٦ ـ بە وتەی ئا. علیوف (لە بارەی کۆمەڵگای مادەوە ، لاپەڕە ٩٢) کە ئەڵێ تەنیا خاوەنی بیت ـئابدادانو توناکی Bit-Abdadanu tunaki ٣٠٠ تالان بـەردی لاجوەردو ٥٠٠ تالان مسی داوە بـە پادشـای ئاشـور .. تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە ..
"Die alteste Geschichte der Meder und Perser" ...

٢١٧ ـ هەروەکو ئەوە حاکمی ئابدادان بە ناوی ئاشوری وە یان بابلی «مانوکیماسابە» یان پێ وتوە .. ئەمە ئەوە ئەسەلمێنی کە هەندێک عونسوری زمانی بابلی کاری کردۆتە سەر زمانو فەرهەنگی مادی رۆژئاوا ..

٢١٨ ـ بەڵام بە پێچەوانەی بیرورای (روست)ەوە ( Ktp ] لاپـەڕە

VII] ) گومانی بۆ ناچێ کـه دێرەکانی ٥٧ـ٥٦ بـه پێی ژماره گوزاری ئەو ، پەیوەندی بەم ناوەڕۆکەوە بێ ·· وە ئەبێ ئەمانە بە هینی لەشکرکەشی ساڵی ٧٣٧ی پێش زاینی بزانرێ ·

٢١٩ ــ بە پێی نەریت بریتی بوە لە : ١ـ چاك کردنی کۆمەلآیەتیانەی سوپا «هەنگی شاهی»و هەنگەکانی سەرۆك ناوچەکان کە خواروباریان لـە لایەن دەولەتەوە پێ ئەدرا ····، ٢ـ چاك کردنی کاروباری تەکنیکی لە سوپادا، جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانی چەکی لـەشکر ··· ، ٣ـ چاك کردنی باری سیاسی لەشکر ، نیشتەجێ کردنو خۆش گوزەرانی هـەمو دەرەجـە دارانی لەشکر ···· ، ٤ـ چاك کردنی باری ئیداری ،گەورە کردنی ناوچەکان، جێ‌گۆڕکێی لێ پرسراوەکانو جێ نشینەکانیان (saknu) بە سەرۆکانی ناوچەکان ( belpehate ) وە دیاریکردنی موچەکانیان ، لەم بارەیەوە لـە RZOA لاپەڕە ٩٠ـ٨٥ دا بە درێژی باس کراوە ·

٢٢٠ ــ لە سەردەمی سارگونی دوەمدا شوێنی سەرۆك ناوچەی پارسەوا (پارسواشا) لە ئاشوز بووە ، (ساڵنامەکان ، دێرەکانی ٦٧ـ٦٦ ، نوسراوەی رەسـمی : دێری ٥٨ ، KS ، لاپـەڕە ٩٠ ، ١٠٨) ·· لـە نوسراوەیەکدا لە (١٦٥ ، HABL ] ) کە فورر ئیشارەتی بۆ کردوە وا دەرئەکەوێ کـە پارسوا لە دواییدا کەوتۆتە سەر ئاشور (لە سەردەمی ئاشور باناپال ؟) دا ، ADD ، ژمارە ٩٥٢ دێری ٣ ،تەنانـەت ناوچـەکانی کیشـەسو (کر ــ ئوریگانی) کە کەوتبوە لای رۆژ هەلآتی پارسواوە ، ئەویش لـە سەردەمی ئاشور باناپال دا بە بەشێك لە ئاشور دائەنرا E. Forrer هـەمان سەرچاوە لاپەڕە ٥٢ ــ AVIU ژمـارە ٧١ لاپەڕە ٢٣٤ ، رەنگ بـێ پارسوا لەم خشتەیەدا دو دێر خوار تر بە ناوی (ناوچە)ی شاری نی (کور؟) نوسرا بێ ·

٢٢١ ــ بە پێی بیروڕای هیوزنیگ کە ئەڵێ :

[G Husing, Vorgeschichte und Wanderungen den parsawa Mitteilungen der Anthrop. Gesellechaft in wien, LX ]. لاپەڕە ٢٤٦ بە دواوە تەماشای بکە ·

٢٢٢ ـ [ E. F. weidner, Die alteste Nachricht uber das persische konigshaus. Afo, VII, 1/2 (لاپەڕە ٦

٢٢٣ ـ فورر باسی ئەوەی کردوە کـە نابوریماننی سەرۆکی ناوچـەی پارسوا ، بە پێی وتەی HABL ' ، ١٦٥ هەمان بابوریماننی (سەرۆکی سەرۆکەکانە) کـە سـەرۆکی ناوچـەی پارسـوا وەکو Ex officio ئـەبـێ (بە پێی کاروباری رەسمی) سەرۆکی سەرۆکەکان بوە ، ئەم پلەیە لە سوپای ئاشوردا لە دوای (ئورتانا) لە هەمو پلەکانی تر بە گرنگتر زانراوە ·

٢٢٤ ـ سالنامەکان بیت ـ ئیشتار ، کین کی ،کین دی گیا سو ،کین گیا لکاسیبی ، کوبو شخا تیدیش ، ئوپوشو ، ئاخسیپونا ، گیر گیراو کیخ باخزاتی ی یان پێ وتراوە ·

٢٢٥ ـ لە دێری ١٦٨ی سالنامەکان دا بـە پێی نوسینی خشتەکەی نەمرودو نوسراوەی دوەمی نەمرود (·······) بە Matp / Bul ئـەبێ بخوێندرێتەوە ·

٢٢٦ ـ لە فەرمانڕەوایانی تانوس (····) وە یـان عوتارشیو کێوی دانو (····) وە نازچەکانی بو (شتو) واماتە «لە سەرەتای کێوەکانی روئا»وە باس کراوە ·

٢٢٧ ـ هەروەکو لەمەوبەر وتمان لـە زمانی ئاکادی دا ئـەو سەردەمە دەنگی « و » نـەبوە وە بـە شێوەی دەنگـی « م » بەکار هێنراوە وەکو : ‎-Arya-Urva‏ـی ئیرانی = Ariaima پێشنیهاد کراوە ، ئـەم وشەیە بە شێوەی ناوی شوێن لە فرگردی یەکەم ویدودات دا هەیە ··

٢٢٨ ـ بەم پێیە نە بە شێوەی (بیت ـ سان گی‌بوتو) کـە لوکن بیل

باسی کردوه ٠٠ "ARAB, I, - 774"

٢٢٩ ـ ڕەنگە بێ سیلخازیو تیل ئاشوری دو ناوی یەك قەڵا بوبن٠٠ وشـەی til-as-su-ri دەری ئەخات کە ئاشوریەکان ئەم زاراوەیانە بـە (تەپۆلکەی ئاشوری) وتوه ، بەڵام بەڕای زوربـە ئەمە ناوێکی گشتی بوەو تێکڕای خەڵك بەکاریان هێناوە ٠

٢٣٠ ـ دیاریکردنی ڕێڕەوو شوێنی لەشکر کەشیەکانی تیگلا تپالاسار بۆ سەر خاکی ماد زۆر گرانە ٠٠ ئێمە لەم ڕوەوە چوار باسمان بە دەستەوەیە، لە ساڵنامەکانا ئەڵێ کە لەشکر کەشی یەکەم لە ساڵی (٧٤٤ی پێش زاینـی دا) ٠٠٠٠ لەشکر کەشی دوەم لـە سـاڵی ٧٣٧ی پێش زاینی دا) بوە ٠٠٠ نوسراوێك لەسەر تەختەیەکی گڵێن کە لە نەمرود بە جێماوە لە ساڵی ٧٢٨ی پێش زاینیدا هەندێك زانیاری وردی لەسەرە ٠٠٠٠تاد ٠

٢٣١ ـ تەختەی دوەمی نوسراوەکانی نەمرود ٠٠٠

٢٣٢ ـ ڕەنگە بێ ناوچەی بیت ـ ئیشتار کە سەر بە ناوچەی پارسوا بوە لێی دەر کرابێ ٠٠٠

٢٣٣ ـ ئاشترك ، (لاپـەڕە ٣٣٢ ، Streck, ZA, XV] ) گیزیـن (ی) ـ کیسیو کانزاکای کە لە سەردەمی دوایی کویلەێتیو ڕۆژگاری بـەر لە سەدەکانی ناوەڕاست بوە بە یەکیان ئەزانێ ٠٠ ناتوانین لە گەڵ ئـەم بیروڕایەی ئەوا بین ٠٠ بە پێی زوربەی سـەرچاوە ڕۆژئاواییەکان کانزاکا لە نزیك دەریاچەی ورمێ لـە خاکی پێشماننا ـ لە بـەشی ژوروی ئـەو سەرزەمینەدا بوە ، واتا لە کەناری ڕێڕەوی لەشکر کەشی تیگلاتپالاسارەوە بۆ سەر سیبور ٠٠٠٠ تاد ٠

٢٣٤ ـ لە نوسراوەکانی سارگون دا (٨ CS ، لاپەڕە ١٢ دێڕی ٦٢) باسی چاو پێ کەوتنی ئیرانزو پادشای ماننا (کە نـە دەوروبەری سـاڵی ٧١٧ی پێش زاینی دا لە دنیا دەرچوە) لەگەڵ پادشای ئاشور (سارگون وە

یان ، ڕەنگە بێ ، تیگلاتپیا لاسار بوبێ) کردوە ..

٢٣٥ ـ ساڵنامەکان . دێری ٥٢ : Ktp ، لاپەڕە ١٠

٢٣٦ ـ ئاریارما ، نیشا (ی) کە ناوی شوێنێکەو زۆر بەکار هێنراوە ، ئوریمزان ،. یان لەگەڵ واتای «هۆز» دا بەراورد بکرێ ، ئورننا ، ئاراکوتتو، ...کنیگ لە نوسراوەکانی هرودوت دا (١٠١ ، I ) ... ئاراکوتتو بە ناوێ لە هۆزەکانی ماد ئەزانێ :

F. W. Konig, Die alteste Geschichte der Meder und Perser

. لاپەڕە ٦ .

٢٣٧ ـ بەم جۆرە Ramatea ، Jantarsi ڕەنگە بێ Yavaitarsa - Ramatavya - ـی (؟) بێ .

٢٣٨ ـ بە داخەوە فقە اللغەی عیلامی تا ئیستا ئەوەندەی کە پێویستە ڕێک نەخراوەو نەنوسراوەتەوە ، لەبەر ئەوە لێکدانەوە لەم بوارەدا کارێکی گرانە .. ڕەنگە بێ Gukinnana هـەمان kuk. kanna-na - ـی عیلامی بێ ، (لەگەڵ Kugarka و Kukkannakan ـی پارسی کۆن بەراورد بکرێ Bh. 11-22 ] ) زۆری تر لە ناوەکان ڕواڵەتی عیلامییان هەیە .

٢٣٩ ـ ئەتوانین بڵێین کە ناوچەی دیوك بە ناوی « (قەڵای) زاکروتـی مادە بەهێزەکان» لەشکر کـەشی ئاشور لـە ساڵی ٧٤٤ی پێش زاینی دا لەوێدا کۆتایی پێ هاتوە . لەو کاتەدا ناوچەی زیکرتو لەگەڵ ناوچەی دیوك دراوسێ بون . بەڵام لە بارەی ناوچەی هەمەدانەوە ئـەبێ بڵێین کـە تیگلا تپالاسار ڕەنگە بێ لە کاتی گەڕانەوەدا لەوێ دا ڕاوەستابێ ...

٢٤٠ ـ پارچە نوسراوی دووەمی نەمرود ، دێری ٢٩ـ٢٧ ، تەختـەی گڵین ، دێری ٤٢ و Ktp لاپەڕە ٥٠ و ٦٦ .

٢٤١ ـ هەمو ئەوانـە بـە شێوەی ڕەسمی (حاکم یان بەجێ نشین) ـ saknu ـ ی ماننا ناو ئەبران .. بەڵام تاڕادەیـەك سـەر بـەخۆ بون ،

ئەگەرچی لە واقیعدا پادشاکانیان سەر بە ماننا بون ·

٢٤٢ ـ ئەم وشەیە لە نوسراوەکانی ترا بـە شێوەی زور زوکاو سیر داکاو زیردیاکا هاتوە ، ئەو گۆڕینەی کە لە نوسینی ئەم وشەیەدا رویداوە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئاکادیەکان لە بواری دەنگدا لە کاتی بەکار هێنانی وشەدا دوچاری گیرو گرفت بون ·

٢٤٣ ـ Aza یـان Asa خوێندنەوەی a ـ ی ئاکادی بە شێوەی O ' کە س· ن· جاناشیای پێشنیاری کردوە زۆر بـە دەگمەن رێی تـێ ئـەچێ ·· وە لـە ئەنجـامدا ئەبێ ( ئازا ) و ( ئاتسا ) یان (ئاچا) لەگەل «ئا»ی دوایی دا بخوێندرێتەوە ·

٢٤٤ ـ زیگرتوی لەگەل هۆزی ساگارتیەکانی مادی ـ asagarta بە یەك زانیوە ، بەلام ئەگەر وابێ ئەم زاراوەیە وە نەبێ بە هۆی ئیرانیەکانەوە لەناو ئاشوریەکانا بلاو بوبێتەوە ·· ئەبێ ئەوە بزانین کە ئاشوریەکان لەگەل کۆمەلە نێردراوەکانی زیگرتودا بە هۆی موتەرجیمی زمان زانی ماننابیەوە ·

[ MGi - ki amel tad-gn-ma-nu sa niatman nu-a-a ]

گفتوگۆیان کردوە ، وە نیرراوەکەشیان ناوی ئیرانیانە نەبوە ·

m sab ( ) - d du - su - pa.

وە تەماشای ADD,II.No 895 بکە ·

٢٤٥ ـ بۆ ناوی telusina گوایە لـە زمـانی هـوری وەرگیراوە ، هەروەکو لەمەوبەر وتمان ئاندیا کەوتبوە بەشی خواروی روباری قزل ئوزون (روباری سپی) ··

٢٤٦ ـ لێکدانەوەو شی کردنەوەی شێوەکانی ناوە ئیرانیەکان لە نوسینی ئاکادیەکانا هیچ گومانی تیا ناهێلێتەوە کە Bagdata (لە حالەتی اضافـە [ Bagdatti هـەمان Bagdata ـ ی (خوادای) ئیرانی یە ·· ئەم ناوە

له سەدەکانی هەشتەم و حەوتەمی پێش زاینیدا هەبوە ٠٠ (عوثیش دیش کەوتبوە نزیك مەراغەی ئیستاوە) ٠

٢٤٧ ـ KS ، ساڵنامەکان لە دێڕی ٥٢ بە دواوە ، ساڵنامەکانی تالار XIV ، دێڕی ٤٧ بە دواوە ، نوسراوەی رەسمی ، دێڕی ٣٧ بە دواوە ٠٠٠٠ تاد ٠ ARAB ، II ، ١٠ـ٥٦ ٠

٢٤٨ ـ KS ، نوسراوەی رەسمی ، دێڕی ٤٤ـ٣٩ ، رەنگ بێ ئوسولونو لە سەرەتادا رێگای دابێ هێزەکانی ئورارتو بچنە ناو قەڵاکانەوە، وە دوایی چوق ئولوسونو خۆی دا بە دەست سارگونەوە ، سەرۆکی قەڵاکان کەوتنە ژێر دەست ئورارتو ٠

٢٤٩ ـ ئەم ناوە ئاشوری‌یانەیە ، لە بارەی ئولوسونو لەگەل ئاشورلع تەماشای نوسراوەی HABL ، ١٠٥٨ بکە ٠٠ لەگەل HABL ، ٨٨٤ دا ٠

٢٥٠ ـ ئیستا ناوچەی زیبیە دۆزراوەتەوە ، وە تەپۆلکەی زیویە کەوتۆتە ١٨ کیلومەتری ناوچەیەك کە ٢٤ کیلومەتر کەوتۆتە خواروی سەقزەوە لە سەر رێگای نێوان سەقزو سنەدا ٠ لە نزیك ئەم شوێنەوە دێیەك هەیە ناوی (صاحب)ە ٠٠ کە گودار ئەوە بە (ئارمایت) ئەزانێ ٠٠ گردی کاپلانتو لە ٥ کیلومەتری خواروی رۆژ هەلاتی زیویە ، بە هەمان ئیزیرتوی دائەنێ بەڵام ئەمە زۆر جێگای باوەڕ نیە ٠ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بۆ بکە :

A. Godard, Le tresor de Ziwiye [ Kourdistan ], Haarlem 1950.

لاپەرە ٦ـ١٢٧ پەراوێزی ٣ ٠

٢٥١ ـ KS وبلاو کراوەی B ، پارچەی D = ARAB II - ٢٠٨ ٠

٢٥٢ ـ alki-se-si-im لە کاتی اضافەی Ktses (s) ıı

ئەبێ ‎٠٠‏ لە نوسراوەکانی ترا Kisassu ‘ Kisisa - Kisesu هاتوە ‎٠‏ لــە سەردەمی تیگلا تپالاساردا بە شێوەی Kisisa بوە ‎٠٠‏ لــەو کاتەدا بــی سیێ خادیر حاکمی ئەوێ بوە ‎٠‏

‎٢٥٣‏ ـ بەم جۆرە بە پێچەوانەی ڕای هەندێک لە لێکۆڵەرەوان (کار ـ نگراد) نیە ، (ئوریگالو) نازناوی خوای نگرالو خوای نینورتا بووە ‎٠‏

‎٢٥٤‏ ـ بە پێی ئەو چاك کردنەی فورر بە دی هێناوە بــەم جۆرەیە : (ئی‎٠‏ فورر ، هەمان شوێنەوار لاپەڕە ‎٩٢‏) هیوزنیكو دوای ئەویشی ئاشترك بە ‘ al Har-bag-mas-tum (!) ــی خوێندۆتەوە ، وە ئەوەی بە (کێوی ـ - Hara- ـ خواوەنــدی خیرەد) لێــك داوەتــەوە ‎٠٠‏ [ baga Mazda. لەگەل خواوەندی «باگ ماشتنا» لە موسی سیر بەراوردیان بکە) ‎٠‏

‎٢٥٥‏ ـ هەرچۆن بێ هەردو ناوەکە هیچیان ئیرانی نین ‎٠٠‏ رەنگ بــێ ناوی تالتا هوری بێت ، تەماشای RA ‘ XXXIII ‘، ‎١١‏ ، ‎٢‏ وەهینی تر بکە‎٠‏

‎٢٥٦‏ ـ نوسراوەی ئەستونی یادگار ( Ks ‘ لاپەڕە ‎١٧٦‏ دێری ‎٣٣‏ بە دواوە) ئەم دیلانەی بە دانیشتوانی (سەرزەمینی خاتی) داناوە ‎٠‏ بەلاّم ئــەم زاراوەیە لە سەرچاوە ئاشوریەکانا لــەو کاتەدا بە فەلەستینیشیان وتوە ‎٠٠‏ سەرچاوە عیبریە کۆنەکان ئەوانیش باسی ئەم کۆچ کردنەیان کردوە ، بــە پێی تەورات کتێبی دووەمــی پادشایان ، بــەشی ‎١٧‏ ، ئایــەتــی شەشــەم (II Reg, XVIL, 6) لــە دوای داگیر کردنی سامەرای پایتەخت لە سالّی ‎٧٢١‏ی پێش زایینی دا دانیشتوانی ناوچەکە بۆ غزان (غوزانو) کە لە ســەر روباری حبرو بین النهرین بو وە بو خالاخ (خو) لە خاکی ئاشورو دیهاتەکانی مــاد ( are Mada ) دور خرانەوە ‎٠‏ ئەم روداوە مومکن نیە بەر لــە سالّی ‎٧١٦‏ی بەر لە زایینی بو بێت ‎٠٠‏ چونکە تا ئەو کاتــە هیچ دێیــەکی مادەکان تەنیا لە ژێر دەسەلاّتی مادەکانا نەبوە ‎٠٠‏ جگە لەوەی کە لەو کاتەدا تەنیا بە مادیان نــەوتوە madai بەلکو بــە هەمو ئەندامەکانی یەکێتی مادەکانیان ئەووت ‎٠‏

٢٥٧ ـ ئەو ناوی کار ـ شـاروکین بوە ٠٠ چـەند نوسـراوێک لـە کە سێکەوە کە ناوی مانوکی ـ نی نوئا بومو لـە بارەی حاکمی خارخـارەوە نوسراوە بە ئێمە گەیشتوە ٠٠ ئەو نامەیە چەند راپورتێکە لە بارەی چۆنێتی ناوچەی ناوبراوەوە کـە بۆ سارگۆن نێردراوە ( HABL ١٢٩ـ١٢٦ ، ٦٤٥ ، ١٦٤٥) ٠

٢٥٨ ـ ئەم ناوچانە ساڵێك دوای لەشکر کـەشیێ ساڵی ٧١٥ی پێش زاینی دامەزراوون ، تەماشای E. Forrer هەمان سەرچاوە لاپەرە ٩٢ بکە ٠

٢٥٩ ـ ساڵی دوایی قـەڵاکان درانـەوە بـە ئولوسونو : KS نوسراوەی رەسمی ، دێری ٥٢ ٠ ARAB ' II ـ ٥٦ ٠

٢٦٠ ـ Amattu ـی ئاشـوری KS ، نوسراوەی رەسـمی ، دێری ٤٩ ، ساڵنامەکان ، دێرەکانی ٧٧ـ٧٥ ٠ لە سەر زەمینی مادا ناوچەی Amate هەبوە (ناوچەی سەرەتای کێوی روئا) ٠٠ ( Ktp ' ،ساڵنامەکان، دێری ١٧٠) بەڵام لێرەدا کەمتر رێی تێ ئەچێ کە مەبەست شوێنی ناوبراو بێ ٠ چونکە زۆر کەوتۆتە بەری رۆژهەڵاتی ئەو ناوچەی دەسەڵاتی سارگونی تیا بوە ٠٠٠٠٠٠ تەماشایRA ' XX IV' ١٩٢٧ لاپەرە ٨٠ـ٧٥ (نوسراوێکی ژانو تورر ـ دانژن) بکە ٠

٢٦١ ـ لە نوسراوەی ساڵنامەکانا دیارە کە لە نێوان دو لەشکر کەشیدا لە دژی دایائوکو تلوسینا لەشکرکەشییەکی تریش هەیە،وە لەو لەشکرکەشیەدا سارگون چوەتە ناو پایتەختی پادشایی خوبوشکیەوە (لـە خواروی ناوچـەی وان) ٠٠٠ بەڵام سارگون لە لەشکرکەشی مادا لە دژی دیوکو تلوسی نا ، یان لەشکر کەشی خوبوشکیە بەشداری کردوە ، وە لەشکر کەشی دوەم بـە سەرکردایەتی یەکێ لە سەردارانی ئاشوری بوە ٠

٢٦٢ ـ لە نوسراوەی رەسمی ، دێری ٣٧ بەم جۆرەیە : ناوچەی مسو وە یان مسی لەماننا (؟) ٠

٢٦٣ ـ لە نوسراوێکدا کە لە گەڵ سارگونی دوەمدا ئەدوێ لـە بارەی گەیشتنی دیاریەکانەوە namurtu ـ ئەسپو هێستر ـ لە لایـەن شازادە ئاندیاوە ، کە بە هۆی نوێنـەری ماننـاوە گەیشتبون هـەندێک ئاگاداریمان هـەیە ( HABL ، ٤٦٦ ،مێژوەکەی رون نیە ،بەڵام نوسراوەی HABL ، ٣٤٢ کە باسی کاروباری جەنگی سەر سنور ئەکات ئەویش هەر هینی هەمان رۆژگارە واتا ٧١٧ ـ ٧١٦ ی پێش زاینی • ئولمستد ئەم نامەیە بـە هینی سەردەمی ئاشور باناپال دائـەنێ • تەماشای HABL ، ٣١٢ ـ ٣١٠ (مێژو ؟) بکە •

٢٦٤ ـ بۆ هەست کردن بە باری چۆنێتی هەمو ، سەبارەت بەو نامەی حاکمی پارسوئا (؟) بۆ سارگونی ناردوە تـەماشای ( HABL ، ٥٥٦ ) بکە •• حاکمی ناوبراو ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو ٢٠٠٠ پیاوی شەڕکەری هەیە، (لە خامبان) یش لەشکری هەیە • چاوەروانی یارمەتیە لـە لایەن ماناو مازا ئوماوە ، ئەڵێت کۆمەڵێك دیل گیراون ، لە نیکور پایتەختی پارسوا نەخۆشی داکەوتوە ، لە ٥٠ کەس کە بە پێی فەرمانی حاکم هاتبون ١٥ کەسیان لەناو چوە •• خەڵکی سەرزەمینی مـاد دوشمنایەتیان ئـەکـەن • نیکورو گوختو (= کین خوختو)و کینراخاسیو خارخارو هینی تر لەگەڵ ئەو شارانەدا کـە لە سەر هێڵی بەرەگای شەڕەکەدا بون ناویان براوە •

٢٦٥ ـ 8 CS ، لاپـەڕە ٨ ، دێڕەکانی ٤٠ـ٣٩ ، تەماشای Ks ، ساڵنامـەکانی تـالا، XIV ، دێڕەکـانی ٢٥ـ٢٣ ، ساڵنـامـەکانی تر دێڕی ٩٠ بکە••

٢٦٦ ـ لە نوسراوەی رەسـمی دا ، دێڕی ٦٤ بـەم جـۆرەیە : لـــە ساڵنامـەکانا بـــە هـەڵە (؟) Bit - Gabaia هـاتوە ، تـەماشـای ئـەم سەرچاوەیە بکە :

F. Justi, Iranisches Namenbuch, Marburg, 1895.

S. V. th. Noldke Persische studien, Sbaw, Bd, 1892.

لاپەڕە ٢٩ ・ شاری Gabai لە پارتاکنە ・

٢٦٧ ـ ناوی ئەم قەڵایانە بە کار ـ نابوو کار ـ سینو کار ـ ئادادو کار ـ ئیشتار گۆڕدران ・

٢٦٧ ـ **دوبارە** ـ لە ساڵەکانی دواییدا زۆر لەو ناوچانە کە دوای ساڵەکانی ٧١٥ـ٧١٦ی پێش زاینی بون بە بەشێك لە قەڵەمڕەوی ئاشوریەکان لەگەل ئەو ناوچە سەربەخۆانەدا ناویان هاتوە کە باجو خەراجیان بە ئاشور ئەدا ・

٢٦٨ ـ فەرمانڕەوایانو جێ نشینەکانی متاتی لەگەل گداتوو تلوسیناو دایاکو ، ئەمانە ئەمیری خودموختاری بون ・ لە ماننائیش ئەم شتانە بووە ・

٢٦٩ ـ ئەم باسە گومانی لێ ئەکرێ ، لە نوسراوەی ساڵنامەکانا کە لێرەدا لە ناو چوون (دێڕی ٨٧ـ٨٦) بەم جۆرەیە : (・・・・・・・)

・・・・ ئەوانە خەلكو (・・・・ ئەوانە هورذوگای من ・・・・ ئەم نوسراوەیە لە بارەی گرتنی دیلەکانەوە مانایەکی ئەوتۆ نادات بە دەستەوە ・・

٢٧٠ ـ ئەمانە لە سەرچاوە جۆر بە جۆرەکانا هەریەکە بە جۆرێك نوسراون ・・ لە ساڵنامەکانا ( دێڕی ٨٩ ) باس کراوە کە باجی لە خاوەن سەرۆکی ٢٢ دێ وەرگرتوە ・

٢٧١ ـ زیادوکەمی لە نێوان ئەم دوزاراوەیەدا بە شێوەی گشتی لە نوسراوەکانی سارگونا هەیەو جێگای سەرنجە ・

٢٧٢ ـ گوایا ئەم ناوچەیە بە مانای ماد (مادای) ناو نراوە بەم هۆیەوە نیە ؟

٢٧٣ ـ لەم بارەیەوە تەماشای لاپەڕە ٣١٨ی نوسراوەکە بە دواوە بکە・

٢٧٤ـ ٨ CS لەگەل لەسەر زیاد کردنی ب・میسنر XXIV ' ZA لاپەڕە ١٠٥) وا・ ف・ وایدنر ( XII,AFO ، لاپەڕە ١٤٤ بە دواوە)

تەرجەمەکانی : ARAB ‘ II ـ ١٢٩ـ١٧٨ ، AVIU ، ژمارە ٤٩
لاپەڕە ٣٢١ بە دواوە ٠

٢٧٥ ـ بەلأم لەوە ئەچێ کە ڕوسای یەکەم لە سالی ٧١٥ی پێش زاینی دا ناوچەی (ئوئیش دیش) ی لە ماننا دابڕی بێو داگیری کردبێ ٠

٢٧٦ ـ ئەم ناوە ئاکادی یە ٠٠

٢٧٧ ـ نوسراوێك لە بارەی نامارەوە باسی سانگی بوتو (واتا بیت ـ سانگی بوتو) ، بیت ئابادانیو کیشوەری مادەکان ٠٠ ئەکات ٠٠ ڕەنگ بێ لە بارەی ئالی پی شەوە باس بکات ٠

٢٧٨ ـ ئەم ناوەڕۆکە سەرتاپا هەولی تیا ئەدەین هەریەك لەو ناوانەی تیا باس بکەین (بەرامبەر بەو وشانەی کە بە ئێزانی ئەزانین ئـەستێرەیەکی بۆ دائەنێین) ٠٠

| | | |
|---|---|---|
| تالتا | ئالی پی | لە نزیك کرماشانەوە |
| × ئوکسانا | ٠٠٠ | ٠٠٠٠٠٠٠ |
| دوری سی | ناوچەی | لە نزیك هەمەدانەوە |
| × ساتا ـ رە ـ شو | روبارەکان | لە ناوچەی خار خار بوە |
| ئانزی | خالخو بارا | لـە ولاتی کێشەسو ، خەر واری ئیستا ؟ |
| پایوکێ | کیلامباتە | لە ولاتی کیشەسو |
| ئوزی | مالی | ؟ |
| × ئوئا کیرتو | ناتی | ؟ |
| × ماکیر تو | بیت ـ ساگبات | لـــە نێـوان قزوینو هەمەدانو کیشەسو |
| کیتاکی | ئوریانکو (ئوریاکو) | لە ولاتی خارخار |
| ماش دایائو کو | کین گارا کو | ؟ |
| ئوزیتار | کانتا ئو | ؟ |
| پائوکو | بیت ـ کاپسی | لە ولالاتی پارسوا (؟) |
| حومبە | بیت ـ زوئالزاش | لە ولاتی بیت عمبان(؟) |
| ئوزو ماندا | بیت ـ ئیمتار | لە ولاتی پارسوا (؟) |
| × باکپارنا (؟) | زاکروتی | ژوروتر لە هەمەدان (؟) |

له نوسراوەی :
-Ba-ag-par-ar-na گومانی تیایە

| | | |
|---|---|---|
| داری | ساپاردا | له ولاتی خارخار |
| × ئوشرا | کانزا باکانی | ؟ |
| شاروتی | کار ــ زینو | ؟ |
| ماشداکو | × ئاندیر پاتیانو | ؟ (ئەم ناوە لەگەل ئاتروپاتنا «ئازربایجان» بەراورد ئەکرێ |
| ئوکوسو | ئوسی (۰۰۰۰) | |
| بیرتاتو | سیبور | له نزیك زەنجانەوە (sibur) |
| × زاردوکو | خارزیانو | ؟ (خاردوکو ؟) |
| × ماشداکو | ئارات پاتو ئی | ؟ |
| × ساتارپانو | باریکا نو | ؟ |
| کاراکو | ئوریکا (تو) | له ولاتی خارخار |

وەکو دەرئەکەوێ شوێنی ناوچەکان له دەورو بەری سالی ۷۱۵ــ۷۱٦ تا رادەیەك له ۸۱٤ دا بەشێك بون له ولاتو قەلەمرەوی ئاشور ۰۰۰۰۰

۲۷۹ ــ نوسراوەی راپۆرتەکان ، دێرەکانی ۵۰ــ٦ ۰

۲۸۰ ــ نوسراوەی راپۆرتەکان ، دێری ۷٤ بە دواوە ۰

۲۸۱ ــ ئەم ناوە رودخانەیە ، هەروەکو له شێوەی نوسینی بزماریدا دەر ئەکەوێ هیچ پەیوەندی‌یەکی بە ناوی خواوەندەوە نیە ۰۰۰۰

۲۸۲ ــ نوسراوەی راپۆرتەکان ، دێرەکانی ۱۱۱ــ۹۲ وە نوسراوەی HABL ، ۵۱۵ کە لە AVIU ژمارە ۱۷۰۵۰ ، لاپەرە ۳٤۵ وەرگیراوە ۰

۲۸۳ ــ ئیشتائی‌پا ، ساکتاتوش ، نانزو ، ئائوکانە ، کابانی ، گوروسوپا ، راکسی ، گیم داکریکا ، بارووناکا ، سی تەرا ، تاشتامی‌و تسامیا ۰۰ له نوسراوەکەدا (۱۲ دێ) نوسراوە بەلام ۱۳ دێیە ۰

٢٨٤ ـ AVIU ، ژماره ١٧٠٥٠ ، پەراوێزەکەی ٠

٢٨٥ـ لە راپۆرتی سارگونی دووەمدا ئەڵێ سوبی بە زمانی ئورارتو بە مانا (کیشوەری ماننە) ئەگرێتەوە ٠ بەم بۆنەیەوە رەنگە بێ هەندێک لەو لەشکر کەشیانەی کە لە نوسراوە ئورارتوییەکانا بەماننا نوسراوە پەیوەندی بە سوبی یەوە هەبێ ٠

٢٨٦ ـ نوسراوەی راپورتەکان ، دێری ١٦٧ بە دواوە ٠

٢٨٧ ـ بەڵام سارگون لە کەنارەکە تێ پەڕی نەکردوە ، بەڵکو لە ناوچەی مرند ـ خۆی تێپەڕیوە ٠٠٠

٢٨٨ ـ ٠٠٠ نوسراوەکە ئەڵێ ، روسا بۆ یەکەمین جار وشتری دو کۆپانی بۆ خۆڵ رێژ کردنی بەستەکە لەو ناوچەیە بەکار هێناوە ٠

٢٨٩ ـ گ٠ک٠ ئا٠ ملیکیشویلی : (هەندێک باسی مێژوییو کۆمەڵایەتی و ئابوری نائیرو ـ ئورارتو) VDI ، ١٩٥١ ، ژمارەی ٤ ، لاپەڕە ٢٢ بە دواوە ٠ ئی٠ م٠ دیاکونوف ٠٠ لە بارەی دوارۆژی دیلەکانەوە لە ئاشورو ئورارتو ، VDI ، ١٩٥٢ ، ژمارە ١ لاپەڕە ٩٦ بە دواوە ٠٠ گ٠ک٠ ئا٠ ملیکیشویلی ، لە بارەی دەزگا ئابوریەکانی شاییو کۆیلەکانەوە ـ دیلەکانی ئورارتو ـ VDI ، ١٩٥٣ ، ژمارە ١ ، لاپەڕە ٢٢ بە دواوە ، بە تایبەتی لاپەڕە ٢٥ بە دواوە ٠

٢٩٠ ـ لە راپۆرتێکدا (لە دێری ٢٣٣ بە دواوە) ئەم ناوانەی خوارەوەی تیایە : خورنوکو ، خاردانیا ، گیزو ئارزو ، شاش زیسا ، خوندورنای سەروو خوارو ، ئوئادنا ئونزا ، ئارازو ، شادیشی سی‌نیا ، سی توئارزو ، زیرما ، سورزی ، ئالیادی نیا ، سورزیالدیو ، ئارمونا ، کی ناشتانیا ، و سێ دێی تر کە ناوەکانیان کوژاوەتەوە ٠

٢٩١ ـ لە نێوان کێوەکانی ئارسابیاو ئارتیا دابوە ٠

٢٩٢ ـ لە سالی ٧١٣ ئولوسونو جارێکی تر لە گەل (باج) یان باشتر

بلێین – بە دیاری‌یەوە چو بۆ لای سارگون ، وە لەو کاتەدا وڵاتی مانناا یەکگرتوبو ، نۆ پارچە جلو بەرگی رەنگاو رەنگو خەنجەرو ئەڵقە وکەلوپەلی تری پێ بەخشی • (بلاو کراوەی B ، KS ، TAF ٤٤_٤٦ ، پارچەی ARAB - F ، II ٢١١_٢١٠) •

٢٩٣ – ئی• م• دیاکونوف ، لە بارەی دوارۆژی دیلەکانەوە لە ئاشورو ئورارتو لاپەڕە ٩٧ •

٢٩٤ – KS سالنامەکان ، دێرەکانی ١٤٤_١٤٠ ئەڵێن : کە سارگون ٢٢٠٠ کەسی لە Zimpani لە هوردوگای خۆیدا جێ کردەوە •

٢٩٥ – KS بلاو کراوەی B پارچەی ARAB ، II – ٢١٢ ناوەڕۆکی ناوی مێژودارەکان (ئەپونیمەکان) : AVIU ، ژمارە ٣٩ پاشکۆی سالی ٧١٣ •

٢٩٦ – وشەی نابراو بە پیتی تایبەتی بەکار هاتوە •

٢٩٧ – رەنگە بێ لە روی جوگرافیاییەوە لەگەل بێستونی ئیستادا یەکێک بن •

٢٩٨ – شێوەیەك لە « ئالیپی » •

٢٩٩ – وشە بە وشە « ئاری بی هەڵ هاتنی رۆژ » •

Mat A-ri-bi sa ni-pi-ih a samsisi

٣٠٠ – Mat na-gi-i (لە **جیاتی** **matna-gi-ra** لە چاپدا !) •

٣٠١ – لە نوسراوەی Mat ma-da-a-a dan-nu-ti بە ئانقەست بە شێوەی رابوردو نوسراوە ،وە بە یەك چونی زاراوەی کۆن**Umman-Manda** لە جیاتی Mat Ma-da-a-a-dan-un-ti نوسراوە •

٣٠٢ – akukati

٣٠٣ Ks – سالنامەکان ، دێرەکانی ١٦٥_١٥٨ •

٣٠٤ – Ks – نوسراوەی رەسمی (تەشریفات) دێری ٦٦ •

٣٠٥ ـ بەڕای وینکلر ( Ks لاپــەڕە XXVII )و ئــاشــترك
(لاپەڕە ٣٥٤ Streck ' ZA ' XV ) وە ماسپرو ..

G. Maspero, Histoire Ancienne des Peuples d'oriest Classique, III, Les Empires, Paris 1908. لاپەڕە ٢٥٠ ....

٣٠٦ ـ ئەم رایە لە لایەن ئاندرئاس و هیوزینگەوە ئاشکرا بوە .

P. Rost, Das sogenannte Mederreich und Das Emporkommen der Perser, Untersuchungen zur altorientalischen Geschichte Mitt. der Vorderasiatisch. Gesellech. Leipzig, Heft 2.

لاپەڕە ٨٤ .. و. ئی. گ. علیوف ئەویش لەو رایە دایە (لــە بارەی کۆمەڵگای مادەوە . هەواڵی کۆڕی زانیاری ئازربایجان ، ١٩٤٨ ژمــارە ١٠ ، لاپەڕە ٨٦ و٩٠ .

٣٠٧ ـ KS بڵاو کراوەی ARAB - A ' II ١٩٢ .

٣٠٨ ـ ناوەڕۆکی ناوبراو وەکو لای خوارەوەیە :

× پارئوئا ـ سپگریس

× سنی تیرنا ـ (....) سانا

ئوپاما ـ (.....) نا

× ماشداکو ـ ئاماکی

ئیشتە سوکو ـ ئیشتە ئوبو (یا ئیشتە ئوپو)

× ئوئارزان ـ ئوکوتی

× ئاشپا بارا ـ کاکام (وە یان ئوشکاکان ؟)

× ساتارشو ، سیبراسو ـ خاوەن ئــاواییــە گــەورەکانی بیت بــاری و پیت ـ ماشباری

× ساتارپائو ـ ئوپوریا

× پارتوکو ـ * ئاندیر پاتیا نو ( mpa-arakuku - ـ رەنگ بێ هــەمان

نـاوی mmas/par-tuk/Ku-Ku واتا ماشدوکویـه کـه لـه کـاتی نوسینەوەی خەتەکەدا بە خەتی دەنگدار (زترا نسکریپسیون) بە هەڵە نوسراوە ٠

× ئاریا ـ بوشتو (ش ؟)

× ئوشرا (یا) کانزا باکانو

× ماشدوکو (؟) * ئاراتپاتی (بەم جۆرە !)

خاردوکا ـ * خارزیانو

ئیشتیلیکو * ئائو ئاریسارئو ـ خاوەن ئاواییـەکانی کیشموەر (٠٠٠٠)

ئیتانو (ئائو ـ ئاری سارنو) رەنگك بێ لـە جیـاتی « ئائوشار ـ (ی) پارئو » کە لە شوێنی ترا هەیە بە هەڵە نوسرا بێ ٠

× ئارباکو ـ ئارناسیا

شاروتی ـ کارزیئو

× (ساتارپ) مانو ـ باریکانو

(٠٠٠٠٠٠) ، ـ زازکنو

(٠٠٠٠٠٠) کارکاسیا (یان گارکاسیا ٠ لەگەل « کار ـ کاشتی » بـە یەك نەزانرێ ٠

(٠٠٠٠٠٠) ـ * (پ) مارتاکانو ٠٠٠

ئەمانەو چـەندان ناوی تری جێگاکان کـە پـەیوەندییان بـە زمـانە رەسەنەکانی سەرزەمینی مادەوەیە ٠٠٠٠٠٠ تاد ٠

٣٠٩ ـ لە ساڵنامەکانا ، دێری ١٦٦ بـەم جۆرەیە ٠٠ نوسراوەکانی تر کەمتریان باس کردوە ٠٠

٣١٠ ـ لەم ناوەرۆکانەدا Arbaku و ئەو ناوانەی تر کە بـە ناوی پادشایانی مادەوە بەهوی کتسیاسەوە نوسراونەتەوە ٠٠ ئەبینرێ ٠٠ بـەڵام نابێ وای دابنێین کە کتسیاس ناوی پادشایانی زنجیرەی تری ـ بەرامبەر بە

دیوکیەکان ـ ناو بردبێ ۰۰۰۰۰۰۰ تاد ۰

٣١١ ـ ناوەڕۆکی نادی (ئەپونیمەکان) AVIU ، ژمارە ٣٩ پاشکۆی سالی ٧٠٦ Ks سالنامەکان ، دێری ٤٠٢ بە دواوە ، ئەم لەشکرکەشیە دژی کارالا بوە ۰۰۰۰

٣١٢ ـ Aspabara ـ ی مادی « سوار » لە نوسینەوەی دەنگی دا ( ترانسکر یپسیون ) بە ئاشوری ( Ispabara ئەگرێتەوە ، ( S - ی ئاشوری وەکو S بەکار هێنراوە وە پیتی دەنگداری a لە سەرەتاوە ئاشوریەکان وەکو پیتێکی جیاوازیان داناوە ۰۰ وەکو asguzai - Iskuza ـ بە مانا «ئەسکیت»ە ۰۰ لە نوسراوەی HABL ١٧٤ ئەم وشەیە بە شێوەی Aspabaru بەکار هێنراوە ، وە لە نوسراوەی ئاوبراودا ، ٦٤٥ بە شێوەی Aspabara نوسراوە ۰

٣١٣ ـ بە رای زوربە ئەوانە سەرۆکی ناوچەکانی خارخار ، کیشەسو، پاسوا ،بیت ـ همبانو رەنگە بێ ئارانچیو هەروەها سێ ناوچەی تری سەر بە ئاشور (لە خاکی مادا) بوو بن ۰۰ کە لە دواییدا لە سەردەمی ئاسار خادوندا ئەکەوێ ۰۰ واتا ، ساپاردا ، بیت کاریو مالای ۰۰۰۰۰۰

٣١٤ ـ لە نوسراوەی KS ، سالنامەکان ، دێری ٤١٢ دا دیارە :

al Mar-u-bis-tu a-na-es-su-ti as-bat ‘ amel mare mes KA, A, DI (....) u - se - li ..

زاراوەی ana essutisabatu بە مانا شوێنی نیشتەجێ یە ۰۰۰۰۰۰ رەنگە بێ لە چاپی وینکلردا هەندێك لە نوسراوەکە بە دروستی نەنوسرابێتەوە ۰

٣١٥ ـ ئەستونەکەی راسام AL 5 لاپەڕە ٦٤ بە دواوە ‘ II ‘ ٨ بە دواوە ، وەکو ئەلێن سارگونی دووەم لە لەشکر کەشی سالی ٧٠٥ دا لە ئاسیای بچوك کوژراوە ۰ بەلام ئاشترك «کولومیان» لەو باوەڕەدایە کە بە

دەستی دانیشتوانی قەڵای مادەکان لە کیلمان وەیان کولومان کوژراوە ٠

٣١٦ ـ بەم هەواڵە ئەوە ئەگەیەنێ کە بەر لەو میژووە دو ناوچەی ئامارو ئاراپخا چوبونە ناو یەکترەوە ٠٠ چونکە ناوچەی ئاراپخا وەکو ئەم رۆژگارە ، کەرکوکی ئیستا بوە ٠٠ لەگەل ئالیپی‌و ناوچەی کاسیەکان سنورێکی هاو بەشیان نەبووە ٠

٣١٧ ـ بیت ـ کیلمازاخ ـ خاردیشی‌و بیت کوباتی

٣١٨ ـ لەگەل قەڵاکانی

Elenzas. Sissirtu, Kummahlum, Elenzas

بارەگاو نیشتەجێی هوردوگای ئاشـور بووە ٠ وە دوایی ناوی نراوە کار ـ سینا خرتپ ٠٠ رەنگە بێ ئالتراش هـەمان ئارن زیاش‌و (و) بێ ، کـە لـە سالنامەکانی تیگلا تپالاسماری سێیەمدا لە کۆتایی روداوەکانی سالی ٧٤٤ دا باسی کراوە ٠ هـەرچۆن بێ لـەوە ئـەچێ ئالنزاش هـەمان ئال نیزا ـ ی بطلیموس ( VI ، ٢ ، ١٣) کرماشانی ئیستا بێ ٠

٣١٩ ـ ئەستونەکەی راسام ، V ، ٥ ، VI ، ٢٤ ، AL 5 لاپەرە ٧٢ بە دواوە ٠ نوسراوەی HABL ، ١٣١٥ ٠

٣٢٠ ـ پارسواش بەرای زوربە هەمان (پرسید)ە کە ٥٠ سـال دوای ئەوە لە نوسراوە ئاشوریەکانا بـەم ناوە وەیان ناوێکی بـەم جۆرە نوسراوە Parsumas وە ئەبێ بە Parsuvas بخوێندرێتەوە ٠٠٠

٣٢١ ـ تەماشای لاپەرە ٣٥١ ی نوسراوەکە بکە ٠٠

٣٢٢ ـ بەم جۆرە ، ئالی پی لـە راپورتی لەشکر کـەشی هـەشتەمی سارگون دا (تەماشای بەر لاپەرە ٢٧٨ی نوسراوەکە بکەرەوە) ٠٠ بە بەشێك لە (مادای) هاتوە ٠٠ لەگـەل ئەوەشدا ئالیپی لـە زۆربەی شوێنەکانا وەکو کیشوەرێکی سەربەخۆ ناو براوە ٠٠ لـە سەردەمی هلنیك دا یان چـەرخی دەسەڵاتدارێتی یۆنانیەکان ئەم ناوچەیەیان بە ناوی علیمائید ناو ئـەبردو لـە

مادو سوزیان (شوش) یان کیسی (عیلام) جیایان ئەکردەوە ٠

٣٢٣ ـ بە وتەیەکی تر ٠٠ ئالارودیان ، ماتیەنیان ، ساسپیریان و ئەرمەنیەکان ٠٠ دانیشتوانی بیابانەکانی تەرمەنستان ، بە پێی وتەکانی هرودوت کە رەنگ بێ لە هکاتی ( نزیکەی ساڵی ٥٠٠ی بەر لە زاینی ) وەرگیرا بێ ، ئەم ناوەیان پێ وتبن ٠٠ هەروەها گ٠ ئا٠ ملیکیشویلی ـ زادەگای هۆزی گورجی ، تفلیس ، ١٩٥٢ ، رەنگ بێ دوسێ سەدە دوای ئەوە جۆری نژادی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بەو جۆرە بو بێت ٠

# پەراوێزی بەشی سێیەم

١ ــ ئی٠ م٠ دیاکونوف ، دوا ساڵــەکانی دەوڵەتی ئورارتو VDI ، ١٩٤١ ، ژمارە ٢ لاپەڕە ٣٨ بە دواوە ، وە تەماشای ب٠ ب٠ پیوطروسکی ، کۆنە شوناسی قەفقاز لینینگراد ١٩٤٩ لاپــەڕە ١٢٤ بــە دواوە بکە ، لــە زنجیرەی ناوی ئەو شوێنانەدا کە نوکە تیری (ئەسکیتی) تیا دۆزراوەتەوە ناوی بابل‌و ئاشورو کارکمیش‌و ئال ــ مینا (سوریە)و ئالی شارو تارس (ئاسیای بچوك)و خارکارد ، کــارمیر ــ بلور (ئورارتو) مینگــە چــائور (ئازربایجان) چەندان شوێنی تر ئەبات ٠٠٠

٢ ــ ڕەنگە بێ Moesia ــ ی رومیەکان لەبــەر چاودا بێ ، ناوچــەی فراکیە ــ بەشێك لە بلگارستانی ئیستا بووە ٠

٣ ــ II ، XIII ، ٥ــ٤ ٠

hippopolon thre i kon ... Muson ta (n) gkhemakhon Kai agauon hippenolgon glaktophagon Abion [ abion- ] te, dikaiotaton anthropon.

٤ ــ لە دواییدا شوێنی (ئی ئی‌یا) لە کولخید دیاری کراوە ٠

٥ ـ لە نوسراوەکانی هومردا ئاقیانوس (ئوقیانوس) بە روبارێك دانراوە کە بە دەوری ناوچەیەکدا بڕوات ٠

٦ـ (یان راست تر ؟

Od. XI. 14 : entha de Kimmerion [ kheimerion
andron demoste Polis te, ecri kai nephele i kekalummenai)
Oude Pot, Autos Eelios Phaethon Kataderketai aktinessin.

ئەو زانیاری یانەی کە هسیود لـە بارەی بیابان نشینەکانەوە ئـەیدات بـە دەستەوە بەم جۆرە گرنگە (ئەسکیتەکان لە Rzach, Fr. 55 بێ گومان بە مەبەستی لێکدانەوەی وشەکە بەشێك بوە ٠

٧ ـ دانشمەندەکان چەند جار خستویانەتە بەر چاو کە زۆر ستەم بوە هێزە چەکدارەکان سود لە رێگای ســەرتا سەری کەنارەکانی دەریای رەش وەر بگـرن ، وە ئـەبوا کیمریــەکان لــە رێــگای داریال وەیان ئـالاگیرەوە بڕۆیشتنایە ٠٠ بەم پێیە ئەبوا یەکەم جار بچوبانایە ناو مەڵبەندی قەفقازەوە وە لەویوە بۆ دەریای رەش ٠

٨ ـ strabo, XI, 1-5 ، «پریەگسیس» کــە نــاوی نوســەرەکەی نازانرێ (ئەسکیمنا ـی خیوسکی) VDI ، ١٩٤٧ ، ژمارە ٣ ، لاپەرە ٣١٣ و پەراوێزەکان ٠٠

٩ ـ strob, VII, 4, 3

١٠ ـ باسی لێوە کراوە کە کۆنترین کولونی یۆنانی لــە سەر کەناری دەریای رەش واتا سینوپ ـ یەکەمین جار لــە کۆتایی ســەدەی نۆیەمی پێش زاینیدا دامەزراوە ٠٠ گومانی تیا نیە کە یەکەمین دەریا بڕی یۆنانیەکان بۆ کەنارەکانی ژورووی دەریای رەش بەر لەو مێژوە بوە ٠

١١ ـ و٠ ئی٠ ئابایف ، زمانو فولکلوری ئاســی ( ئاستی ) I زمانی ئەسکیتی ، موسکو ، ١٩٤٩ لاپەرە ٢٣٧ ، ـ- Panti - ـ بــە مــانا

«ڕێگا» کە لە ناو زمانە ئیرانیەکانا تێکەڵە ، لەگەل وشەی «پوت»ی روسی کە لە وشەی Ponti ئاسلاوی کۆن وەرگیراوە بەراورد بکرێ ٠ kapa لە زمانە ئیرانیەکانا ، گرۆهی (ئەسکیتی ئاسیای ناوەڕاست) بە مانا (ماسی) ئەگرێتەوە ٠

١٢ ـ strabo, VIII, 4, 3, XI, 2, 5

١٣ ـ «ئائولیدا» بەشی ژوروی وایونیا بەشی ناوەڕاستی کەنارەکانی دەریای «ئاژە» لە ئاسیای بچوکدا ٠

١٤ ـ هەمان میژو نوسی ناسراوی دەرباری ئەسکەندەری مەکدونی یە٠

١٥ ـ لیکیەکان هۆزێك بون نزیك لە (هیتیەکان) ـ نسیەکان لە سەردەمی کۆنا لە خواروی رۆژئاوای ئاسیای بچوکدا ژیاون ٠ سارد پایتەختی لیدی ، کیشوەرێك بوە کە کەوتبوە رۆژئاوای ئاسیای بچوکەوە ٠

١٦ ـ سەردەمی ژیانی کالین ئەتوانین لەو پارچە نوسراوەدا دیاری بکەین ، بە پێی سەرچاوە ئاشوریەکان کیمریەکان ساردیان لە دەوروبەری سالی ٦٥٤ی پێش زاینی دا داگیر کردوە ٠

١٧ ـ دانیشتوانی شاری ماگنسیا لە سنوری ئایونیاو لیدی ٠

١٨ ـ لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دا ژیاوە ٠٠ بەلام زوربەی لێکۆلەرەوەکان لەو باوەڕەدان کە ئاسترابون بە هەلەدا چوە سەردەمی ژیانی ئارخیلوخ بە دوای کالین دائەنێ ٠

١٩ ـ هۆزێك لە کەناری دەریا لە خواروی رۆژ ئاوای ئاسیای بچوك بون ٠

٢٠ ـ خەلکی تروئا لە ژوروی رۆژ ئاوای ئاسیای بچوك (؟) ٠٠٠٠ پێیان ئەوت هۆزە دەریاییەکان ٠٠ کە لە رۆژگاری لەناو چونی پادشایی هیتیەکان لە کۆتایی هەزارەی دوەمی پێش زاینی دا لەویدا بون ٠٠

٢١ ـ گالاتەکان ـ سلتەکان ، وە یان ئەو گلانەی کە لە سەدەی سێیەمی

پێش زاینی دا هاتون بۆ ئاسیای بچوکو دەسەڵاتیان پەیدا کردوە ٠

٢٢ ـ فیرعەون تاخارکا ـ کە بە درێژایی چەند سال لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا دژی ئاشوریەکان بووە ٠

٢٣ ـ فیرعەونەکانی میسر کە باسو بەسەرهاتە فولکلوریەکان لە بارەی داگیر کردنی کیشوەرەکانی ئاسیاوە ، ئەدەنە پال سەردەمەکانی ئەوان ٠

٢٤ ـ بەشی ناوەڕاستی کەناری خواروی دەریای رەش ٠

٢٥ ـ ئاسیای بچوکی ناوەندی ٠٠

٢٦ ـ هەڵەیەکی گەورەیە لە نوسینەوەکەدا ، ئەبێ «کیمریەکانو کوب» بێت ٠٠٠٠ (بە دەستی پیشەوای ئەسکیتی مادەکان) ٠٠٠ هرودوت [ I ، ١٠٣) ٠

٢٧ ـ ئەوەی کە فراکیەکان لە ترر بون ، ئەمە لە وتەکانی ئاسترابون دا دیارە [ XIII ، ١ ، ٨ ، لەگەل XII ، ٧ ، ٧) دا بەراورد بکرێ٠٠ دیسان ئەو خۆی ئەمانە بە دراوسێی sunoikoi فراکیەکان دائەنێ ٠٠ نوسەری باوەر پێکراو وەکو توسیدید (thue, 11 ‘ 96 ‘ 4) ترریەکان بە یەکێك لە هۆزەکانی فراکیە ناو ئەبات ٠

٢٨ ـ کیمریەکان بە پێی وتەی ئاستفان بیزنتی [ VDI ، ١٩٤٩ ژمارە ٣ لاپەرە ٣٤٥) نزیکەی سەد سال شاری ئانتاندریان لە کەناری میسی دەریای ئاژە لە ژوروی رۆژئاوای ئاسیای بچوك بە دەستەوە بوە ، تەنانەت شارەکە بە ناوی ئەوانەوە پێیان ئەوت کیمری ٠٠٠٠

[ F. G. H, II, A, 156 ‘ Fragn ‘ 60 (37) = Eustatah. Dion. Per 322.

بە وتەی ئەو چونکە لە لای بالکانەوە هۆزەکانی فراکیو فریجی فینو ویفین لەویدا بە دەسەڵات بون کیمریەکان رویشتن ، وە رەنگە بێ بە نۆرەی خۆیان ئەم روداوە پەیوەندی بە پەلاماردانی تورانەوە هەبێ ٠٠

٢٩ ـ لەم روەوە تەماشای نوسینەکەی (لمان ـهاتوپیت) لاپەرە ٤١٣ بکە:

Pauly - wissowa s. v. Kimmerier

وه بەتایبـەتی هـەندێك نوسینی گ۰ ئا۰ ملیکیشویلی ، هـەندێك بابـەتی میژوویی و كۆمەلایەتی و ئابوری

نائیرو ـ ئورارتو VDI ' ۱۹۵۱ ژمارە ٤ لاپەڕە ۳۹ ۰

۳۰ ـ ئەمە یەكەمین داگیر كردنی ناوچەی ساردە كە ئاسترابون باسی لێوه كردوه ، بە شێوەیەكی ناڕاست ، لە سالنامەی ئاشوری ئاشوربانا پالدا دیسان باسی لێوه كراوه ۰۰

[ Assurbanipal II, لاپەڕە ۲۲ , II, ۱۱۹ = AVIU ' No. 72 ]

هەروەها ئاكاد میسین و۰و۰ ئاستروه ، میژووەكانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی ، لە نوسینەكانی هرودوتدا VDI ' ۱۹۵۲ ژمارە ۲ لاپەڕە ٦۷ ۰

۳۱ ـ لمان ـ هائوپت دووەمین جاری داگیر كردنی ناوچەی سارد بە سالی ٦٤٦/٤٥ی پێش زاینی دائەنێ ۰ Pauly-wissowa. S. V. Kimmerer لاپەڕە ٤١٥ ۰

۳۲ ـ میژوی شكستی لیگدامیس كە لمان ـ هائوپت بـە سالی ٦۳۰ی باسی كردوه لەگەل نوسینەكانی AVIU ' ژمارە ۷۷ دا جیاوازی هەیە ۰

۳۳ ـ Plur. ' Mar ' XI

۳٤ ـ سرودێك لە بارەی شكۆی ئارتمیدەوه ، دێری ۲٤۸ بـە دواوه ، VDI ' ۱۹٤۷ ژمارە ۳ ، لاپەڕە ۲٦۲ ۰

۳۵ ـ Hesych. s. V. Lygramis

۳٦ ـ B. Hrozny, 1 ] Inscriptions hittite hieroglyphiques de Carchemisch. Ar. or. VI. 1934 لاپەڕە ۲۳۳ ۰

2] sur 1, inscription hittite hieroglyphigue de carchemish, I, Ar. or. V, 1933. لە لاپەڕە ۱۱٤ بە دواوه ۰

۳۷ ـ ئەم بەروارەی ب۰ ب۰ پیوطروسكی بـە بەراوردێكی تەواو لـە تەواوی داناوه ، میژوی فەرهەنگی ئورارتو ئیروان ۱۹٤٤ لاپەڕە ۲٦۹ ، وه هەروەها تەماشای AVIU ' ژمارە ۵۰ ، ۱۰ ، لاپەڕە ۳٤۱ و پـەراوێزی

١٣ بكه ٠

٣٨ ـ س٠ ت٠ یرمیان بە دەمی وتویە کە شوێنی کیشوەری گامیرا لەم سەردەمەدا لــە نزیکی لیناکانی ئیستاوە بووە ٠ لــە دواییدا لــە زاراوەی ئەرمەنیدا گــامیر [ K- ] هــەمان کاپادوکیەی بــەشی رۆژ هەلاتی ئاسیای بچوك بووە ٠

٣٩ ـ AVIU ، ژمارە ٥٠ ، ٣٦ ، وە هەروەها AVIU ژمــارەی ٣٩ پاشکۆی ســالی ٧٠٥ ، لــەویدا ئیشارەت کراوە کــە سارگون لــەبــەر (کولومیان) کوژراوە ٠٠ ئاشترك (کولومیان) بە هەمان دانیشتوانی ناو قەلای (کولومیان) وە یان «کیلمان» لەخاکی ماددا ئەزانێ ٠

٤٠ ـ Al 5 لاپەرە ١٣٥ بە دواوە ؛ KB ، II لاپەرە ٢٧٥ بــە دواوە AVIU ، ژمارە ٦٣ ، لاپەرە ٢١٥ ٠

٤١ ـ هەرچی لە بارەی بەراورد کردنی تئوشپا لەگەل تئیسپ نوسراوە هەلەیە ٠٠ ناوی پیشەوای کیمریەکان بە شێوەی یۆنانی کەمێك لــە تئیسپ ئەچێ ٠٠ بەکار هێنانی شێوازی وشەی تئیسپ «چیش پیش» وە بە رایەکی لاواز تر «چائیش پیش»ە ، وە رەنگە بێ ئەم وشەیە لە زمانی ئاکادیدا بــە شێوەی teuspa بەکار هێنرابێ ٠ ئەم رایە یەکەم جار لە لایەن (لمان ـ ها ئوپت)ە وە درکاوە ٠٠ [ Pauly-wissowa, s. v. Kimmerier لاپەرە ٤٣٢) وە ئاشترك (لاپەرە [ Assurbanipal, I , CCCLXII هەندێك نوسەری تر تەنیا ناوە کانیان بەراورد کردوە نــە ئــەو کەسانەی کە مەبەستن ٠٠٠٠

٤٢ ـ « هەوالی ئاسار خادون » کە بە زمانی بابلیە ( کوشخنو ) بە مەیدانی ئەم روداوە دائەنێ ٠٠ وە سالنامەکانی ئاسار خادون « خوبوشنو » دائەنێ ٠٠ شوێنی یەکەم بە تەواوی نا دیارە ٠٠٠

٤٣ ـ AVIU ، ژمارە ٦٦ لاپەرە ٢١٣ ٠

٤٤ ــ میژوەکانی ساڵو مانگ کە ئافریکان دایناوە و لمان ــ هائوپت لێکی داوەتەوە .....

٤٥ ــ گ. ئا. ملیکیشویلی ، هەندێک باسی کۆمەڵایەتی و ئابوری میژوی نائیری ــ ئورارتو لاپەڕە ٣٩ .

٤٦ ــ Kn ، ٤٨ ــ AVIU ، ژمارە ٦٨ a ، لاپەڕە ٢٢٣ــ٢٢٤ .

٤٧ ــ ئاکادمیسین و.و. ئاسترووە ، ساڵو مانگ ، میژوەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی لە نوسینەکانی هرودوتدا ، لاپەڕە ٦٧ .

٤٨ ــ لە کیشوەری ئاشوردا کاربەدەستێك کە ئیشو کاری لەشکری بەدەستەوە بوایە پێیان ئەوت (منای دەولەتی) بەرادبەر بەم کارە ناوچەیەك لە دەراوی زێی گەورەی بە پاداش پێ دراوە ، ئەو ناوچەیە کەتبوە سنوری ژوروی ناوچەکانەوە ، یەکێك بوە لە مەڵبەندی جاسوسی گەری ئاشوریەکان، وە منادی دەولەتی لە هەردو ناوچەکەدا چالاکی خۆی بەڕێوە ئەبرد ، تەماشای نوسراوەی ئاراد ــ سین ، HABL ، ١١٢ AVIU ، ژمارە ٥٠ ، ٨ ، لاپەڕە ٣٣٩ بکە .

٤٩ ــ ئەم زاراوەیە بە پێی بیروڕای پراشكو چەندانی تر لە لێکۆڵەرەوەکان لە روی رەگەزەوە بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە مادەکانەوە نیە ( Madai , Matai تەنیا یەك جار بینراوە ، وە ئەوەش رەنگ بێ کەوتبێتە بەر کاریگەرێتی زاراوەی :

Umman-Manda-Mandai - ــوە یان مانناییەکان بە زمانی ئاشوری mannai و بە زمانی ئورارتو mana [ni] یان پێ وتبێ .. ئەم زاراوەیە لە هەزارەی دووەم وە تەنانەت لەوانەشە لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا هەر بینراوە .. وە بە تایبەتی بە یەکێك لە هۆزە بیابان نشینەکانی ئەرمەنستان وتراوە ، لە بارەی ناوە جوگرافیاییەکانەوە ناوی هۆزە کۆنەکان

که له نوسینی نوسراوه ئاشوری‌و بابلی‌یه‌کانا هاتوه کـه بـه شوێن‌و تیره‌ی تازه‌یان وتوه ، به تایبه‌تی له باره‌ی زاراوه‌ی ئوممان ــ مانداوه ·· ئی· م· دیاکونوف ، دوا ساڵه‌کانی ده‌وڵه‌تی ئورارتو ، لاپه‌ڕه ۳۵ ····

۵۰ ــ ئەم باس‌و بەسەرهاتە بە زمانی ئەدەبی ئاکادی نەنوسراوەتەوە ،بە شێوەی سەرزاری گفتوگۆ کردن نوسراوەتــەوە . بۆ بــەڵگەی راستی ئــەمە ئەوەیە کە شێوەی ئارامی تیا بەکار هاتوە وەکو [ galala ــ بەرد ــ لە جێگای abun ... ( agasu لە جیاتی وشەی amnu بەکار هێنراوە ·

۵۱ ــ مەبەستی من تەنیا قۆناغێك نیە کـە تەنیا لە کاتێکی دیاریکراوا بتوانین بە ئەسکیتی دابنێین ··

······ بەڵام ئەمانەوێ بڵێین کە ئەسکیتەکانی ئاسیای نزیك کـە لـە سەرەتای سەدەی حەوتەم لەوێدا دەرکەوتوون ، هێشتا پـەیوەندی‌یان بـەو فەرهەنگە کۆنەوە نەبوە کە بە فەرهەنگی ئەسکیتی ناو ئەبرا ·· وە لە واقیع دا فەرهە نگێک کە لە کەناری دەریای رەش بەر لـەو ماوەیە و فەرهەنگی وەکو ئەڵێن (ئەسکیتی) ئەگەر هەبوبێ لە بارەی زمان‌و رەگەزەوە رەنگە بێ لە هینی دو سەدە لە دوای کەنارەکانی دەریای رەشەوە چوبێت · ئەمە خۆی ئەوە ئەگەیەنێ کە دیاری کردنی ناوی فەرهەنگە کۆنەکان لە روی یەکبوونی زمان‌و رەگەزەوە تا چ رادەیەك مەترسی‌و گومان ئەنێتەوە · فەرهەنگە کۆنە شوناسیەکان هەندێک جـار زۆر گورجتر لـە زمان‌و رەگەز ( ئاتنوس ) ئەگۆڕران ······

۵۲ ــ ناو نانی پاڵــەوانــانی ئــەفسانــە کۆنەکان بــە نــاوی هــۆزو رەگەزەکانەوە شتێکی ئاسایی بووە · بۆ نمونە لە زۆر کیشوەری رۆژ هەڵاتی نزیک‌و ئاسیای ناوەڕاست دا بــەهادەرانیان بــە پاڵــەوان ناو ئــەبرد ·· یۆنانیەکان ساختەمانە کانیان بەهینی (پلاسگ) یەکان دائەنا ·· وە زۆ لــە هۆزە رۆژهەڵاتیەکان (موغ) یان بە (موغی زەردەشتی ناو ئەبرد) ··

٥٣ ـ لەبەر ئەوەی ئاسترابون کیمریەکانو ترریەکان تێکەڵاو ئەکا ،لە بارەی شێوەی زمانیانەوە هیچ شتێك دیاری ناکات ٠٠ لەگەل ئەوەدا ئەمینیو راستی سەرچاوەکانی جێگای باوەرە بەلام نەیتوانیوە شێوەی زمانەکانی کیمریو ترری‌یەکان دەست نیشان بکات ٠

٥٤ ـ نیشانەی sad/t/، لە نوسراوە بزماری‌یە ئاشوریەکانا لە رۆر شوێنی ترا ئەبینرێ ، وە لەم کاتەدا رەنگ بێ بە Kur یش بخوێندرێتەوە ٠

٥٥ ـ ئاکادمیسین و٠و٠ ئاستروەوە ، باس‌و بابەتە ئاریاییەکان ، گۆڤاری ئەتنوگرافی سوڤییەت VI ، VI ، ١٩٤٧ لاپەرە ١٢٠ ٠٠

٥٦ ـ بە بیروڕای من ئەوەی زۆر تر رێی تێ ئەچێ ئەوە ناوی teuspa (بەو شێوەی کە لە زمانی ئاشوری دا بەکار هێنراوە) tavaspa ە کە لە [tava] ی ئەسکیتەکانەوە بە مانا ـ دەسەلات ـ و “aspa بە مانا ئەسپ واتا ئەسپی بەهێز وەرگیراوە ، کومەلە دەنگی ئێرانی Va وە بە زمانی ئاکادی بە هۆی - u - بەکار هێنراوە وە - s - ئاشوری وەکو باو بوە لەگەل -S- ٠٠٠کە ناتوانین ئەمە بە تەواوی وەر بگرین ٠

٥٧ ـ لە نوسینی mtng-dam-mi-i لەم نیشانەیەدا تەنیا mi ئەتوانین بە me بخوێنینەوە ٠

٥٨ ـ ئەمە بە سێ جۆر لێك ئەدرێتەوە Lugdanis گومانی کۆنە لە نوسیندا وە لە جیاتی Duganis نوسراوە ٠٠ ،بەلام لەم باسەدا بەو جۆرە ئەبێ بلێین کە هەمو ئەو سەرچاوانەی باسی لیگدامیس یان کردوە لە لایەن نوسەرە کۆنەکانەوە هەموی لە یەك سەرچاوەوە وەر گیراوە ، ئەمەش کارێکی ئاسان نیە ٠٠ بە تایبەتی کە گومانی وا لە ئاسترابونو کالی ماخ ناکرێ ٠٠ یان ، Lugdamis ناوێکی نە ناسراوی کیمریەکان بووە ، کە لە زمانی یۆنانی دا بەو جۆرە دەرهاتوە ٠٠ لە واقیع دا چاو بپۆشین لە

لیگدامیسنی کیمری لەناو نوسراوەی نوسەرە کۆنەکانا چەندان کەسی تر ئەم ناوەیان لێ نراوە ·· هەرچۆن بێ ئەم ناوە لە یۆنانیەوە وەر نەگیراوە ، وە رەنگە بێ هینی ئاسیای بچوك بێ ··وە یان پیتی t ' Lugdamis لە tugdammi بە تەنیا پیتێك گۆڕاوە کە ئەویش رەنگە بێ لە هەندێك لە زمانەکانی ئاسیای بچوکدا بەو جۆرە بوبێت ·· ،وە چەند سەرچاوەیەکیش ئەم باسە ئەسەلمێنن ·· وە بە پێی بیروڕای ئاکاد میسین و·و· ئاستروەوە ئەم ناوە سەرچاوەکەی لە ئاسیای بچوکە ····

٥٩ ـ U ئەم پیتە لەم کاتەدا رەنگە بێ پاشگری حالەتی فاعلی ئاشوری بێ ·

٦٠ ـ جگە لە رەگەزی هیندی کە تێکەڵ بە لقی کۆمەڵە هیندو ئیرانیەکانە ··

٦١ ـ یوستی لاپەڕە ٥٠٠ :

F. Justi, Iranisches Namenbuc, Marburg . 1895

کە لە senda-Xsatra - sandaksatru بە مانا ( دەسەڵات ··· ) ئەگرێتەوە ، وەرگیراوە · گەلێك کۆششی تر کراوە تاکو نێوەی یەکەمی ئەم ناوە شێوازێکی تایبەتی بۆ بدۆزرێتەوە بەڵام بە داخەوە شێوازێکی وا کە پێی قایل بین نیە ··

٦٢ ـ بە ڕای زوربە هەندێك لە کۆمەڵە ئەسکیتیەکانی ئاسیای نزیك وە بە تایبەتی قەفقازی مەرکەزی هەروەکو ب· ب· پیوطروسکی لە میژوو فەرهەنگی ئورارتو لاپەڕە ٣١١ـ٣٠٩ دا باسی کردوە لەگەل ئەسکیتەکانی ئاشکوزادا هیچ جۆرە پەیوەندیەکی ئەوتۆیان نەبووە ، بەلکو لەگەل هۆزی (گی‌میرا)ی (کیمریەکان) کە وەکو ئەوانو بەقەدەر ئەوان ئەسکیت بوون پەیوەندیان پێکەوە بووە · (لە روژگاری دوا ترا لە رێڕەوی خۆ پێ گەیاندندا لە ئاسیای نزیكو لە سەدەی حەوتەمو شەشەمدا) رەنگە بێ دراوی

(ئەسکیتی) کە لە رۆژ هەلآتی ئاسیادا بە دەست هاتوە ، هینی کیمریەکان بوبێت • (ب•ب• پیوطروسکی ئەسکیتەکان لە رۆژ هەلآتی کۆن دا) ـ گۆڤاری کۆنە شوناسی سوڤییەت XIX ، ١٩٣٥ لاپەڕە ١٣٢ ، وێنەی سێیەم ، لە سەرەتاوە ئاشکوزاکانو کیمریەکان ( گیمیرا ) کە رەخنەو هێرشیان ئەکردە سەر ئاسیای نزیك رەنگ بێ لە فەرهەنگە نوسراوە ئەسکیتیەکان وەکو یەك بە هرەدار نەبوبن ، بەڵام لە دواییدا فەرهەنگی هەردو هۆزەکە ، بەرای زوربە ، بە یەك رەوتو شان بە شانی ئەسکیتی بووە • لە لایەکی ترەوە هەردو هۆزەکە ئەوەندە کەمو جموجول کەر بون کە چاوەڕوانی بەڵگەی کۆنە شوناسیان لێوە ناکرێ •

٦٣ ـ ئەمە بە پێی بیروڕای ئێمە پەیوەندی شوێنی هۆزە جۆربەجۆرەکانی کەناری دەریای رەشو بە فراکیەو شوێنی سەرچاوەی فراکیو هۆزە ناوبراوەکانەوە نیە ؛ لە رۆژگاری بەر لە ئەسکیتو سەردەمی ئەسکیتە کانیشا ) •

٦٤ ـ لە شێوەی زمانی ئاشوری دا S و (ش) وەکو S خوێندراوەتەوە ، وە لە بابل دا بە پێچەوانەوە بەم هۆیەوە لە رۆژ هەلآتدا زۆرتر (ش) بەکار هێنراوە ، وەکو asguzai ئاشوریو Iikuzai بابلی و askuz ی عیبری کۆن ، وە کەمتر پیتی (س) بەکار هێنراوە وەکو [ asguzai ئاشوری ـ بابلی ؟) بە شێوەی نوسینی عیبری نوسراوەو کەوەکو asgusai ، is Knsai خوێندرابێتەوە • لەم رووەوە بیروڕای هرتسفلد تەماشا بکە :

[ E. Herzfeld, Zoroaster and His World, II Princeton. 1947-

لاپەڕە ٧١٣ •

٦٥ ـ « ش » لە یۆنانی دا نەبوە •

٦٦ ـ هەندێك وشەی زمانی ئەسکیتەکان لە هەندێك کاتا بە هۆی

پیتی سووکی یۆنانیەوە بەکار هێنراوە ·· وەکو tanais- ـ «دن» = بـە Danu ، Dnav ئـەسـکیتی "a" ی کورت وەکو باو بوە لـە زمـانی ئەسلاوی دا بە"O" بەکار هانوە ، بەم هۆیەوە لە زمانی روسی کۆن دا «دن» لەگەل «ن»ی سووك بوە بە Donu. ·

٦٧ ـ و· س· ف· میللر ، نوسراوە ئیرانیەکان لە بارەی ناوچـەکانی خواروی روسیاوە JMNP ، ١٨٨٦ ، ئۆکتوبەر ، لاپەڕە ٢٨١ ·

٦٨ ـ و· ئی· ئابایف ، زمـانو فولکلوری ئاسـی ، I ، ١٩٤٩؟ «ئەسکیت» لاپەڕە ٢٤٣ بە دواوە · بەرای زوربە پێچـەوانەی Skolotoi ی یۆنانی یە (کە بە وتەی هرودوت ئەسکیتەکان خۆیان بەوە ناو بردوە) ···

٦٩ ـ بەکار هێنانی راستەو راستی وشەی (سک) saka یـە وە ئەوەندە لەگەل وشەی skuta دا پەیوەندی دار نین ·· کەمتر لەوە ئەچێ کـە یەکێك لـەم زاراوانە پەیوەندی لەگـەل وشەی sug [u] da پارسی کۆن دا ـ وە یان - supdo - ی ئاویستایی دا واتـا « سگدیانا » هەبوبێت ·

٧٠ ـ ناوی هاوبەشی هەمو ئەسکیتەکان···ئەسکولوتان [skolotoi] بە یۆنانیەکان هولەندەییەکانیان بە ئەسکیت ناو ئەبرد ،هرودوت IV ٦ هەندێك لە هۆزەکانی gonos ی ئەسکیتی بە پێ ئەوتن ·· ساوروماتەکان کەمێك لـەمانە جیـا بون ·· نوسەرەکانی تر هەریەکـە باسی چەند هۆزو رەگەزێکی تری ئەسکیتی ئەکـەن ·· کـە هرودوت ئەوانە بـە ئەسـکیت (ئەسکولوت) دا نانێ ·· وە لە واقیع دا یەکێك لە هۆزە ئەسکیتی‌یەکان ناوی (ئەسکولوت) بوە ········

٧١ ـ Her ، IV، 11 - 12 هەروەکو هرودوت ئەلێ ئەم باسە هینی کابرایەکی شێوە ئەفسانەیی‌یـە واتا ئاریستە پروکونسی شاعیر ـ و جیهان گەڕی یۆنانی لە ئاسیای بچوکدا [ IV ، ١٦ـ١٣) بـەلام چـەند بـاسو

بەسەرهاتێکی تری بەم جۆرە لە لایەن (بەربەرەکانەوە) ـ کە بەرای زوربـە لـە ئاسیای بچـوکدا نیشتەجـێ بون و چـەند باسێکی کـۆن لـە بارەی بەربەرەکانێی ئەسکیتو کیمریەکانەوە بۆ هەردۆت باس کراوە ٠

٧٢ ـ Her ‘ IV ‘ 5 - 7 لە بارەی ئەو ئەفسانەیەوە کە لە ناو یۆنانیەکانی کەناری دەریای رەش دا باو بووە و ئـەو نوسیویەتیەوە تـەماشای ( IV ١٠ـ٨) بکە ٠

٧٣ ـ لەمە بەدواوە هرودوت ’ IV ١١) ئەو داستانەی کە شێوازێکی فولکلوری هەیەو هینی بەر لە رۆژگاری میژووە ٠٠ ئەگێرێتەوە ٠

٧٤ ـ لە نوسینەکانی هرودوت دا ( ئاراکس ) هەیە ، وەکو زاراوەی Razha کـە بەمانا روباری سیمون ئەگرێتەوە ، رەنگە بێ بـە ئارس ـ قەفقازیش وترا بێ ٠٠ بە پێچەوانەی زاراوەی [Raznda] وە ٠

٧٥ ـ لە بارەی میژوەکانەوە تەماشای بەر لە لاپەڕە ٢٥و دوای لاپەڕە ٢٢٥ی نوسراوەکە بکە ٠

٧٦ ـ نـــاوی Ispakai (Ispaka, Ispakaia?) بـــاسیو بەسەرهاتی ئاشوری کە یوستی هەروەکو Aspaka (ناوی ئەسکیتی کە لە تانائیس‌دا بە شێوەی Apsakos - Aspakos بینراوە ، و٠ ئی٠ ئابایف ، زمانو فولکلوری ئاستی - I - لاپەڕە ١٥٧) سوار بـە aspa لـەگـەل پاشکری ka ی تایبەتی ئیرانی دا لێك ئـەداتەوە ٠٠ (لـە زمانـە زۆر کۆنەکانا ئەم پاشگرە تەنیا لەنێوان مادو ئەسکیتەکانا باوی هەبوە) ٠ تەماشای Ispabara وەیـان Aspabara ی ئاشوری بە مانا «سوار» بکە ، کە لە سەرەوە هەروەکو ناوێکی تایبەتی هاتوە ٠٠٠٠٠٠

٧٧ ـ AVIU ژمارە ٦٤ لاپــەڕە ٢١٦ وە بـە دواوە PL ‘ IR ‘ ٤٥ وە ئەستونی ARAB ‘ II ‘ II - ٥١٧ بە دواوە ٠

٧٨ ـ Kn ‘ 35.

٧٩ _ Kn, 30, 15, 18

٨٠ _ تەماشای لاپەڕە ٤٨٤ بە دواوەی ئەم سەرچاوەیە بکە :
H. Winckler, Kimmerier, Skythen, Asguzaer, Aof, I Reihe, Heft, VI.

٨١ _ ئی٠ م٠ دیاکونوف ، دوا ساڵەکانی دەوڵەتی ئورارتو ، لە لاپەڕە ٣٢ بە دواوە ٠

٨٢ _ لەوێدا کە وتراوە ئاشکناز «کوڕی گومر» مەبەستت ئەوەیە : تەماشای نمونە لە یەك چوەکانی تری (خشتەی هۆزەکان) بکرێ (هەروەکو کوڕەکانی کەنعان سوری و فنیقی) هیدون ، هیت ، ئاموزی ، ئاروا داتس (قوبرسی یان کیلیکیە) کی تیم (قوزبرس) ترشیش (ئەسپانیا ؟) دودانیم (یان رودانیم _ رودسیە کان ؟) وهینی تر ٠٠٠٠ وە ئەبێ ئەوەش بزانین کە نزیکیو لە یەکچوون لە (خشتەی هۆزەکان) دا لایەنێکی سیاسیانەی هەیە نەك نژادیو جوگرافیایی ٠

٨٣ _ A. Godard, Le tresor de Ziwiye (Kourdistan) - Haarlem 1950.

٨٤ _ ب٠ ب٠ پیوطروسکی ، کۆنە شوناسی قەفقاز _ لینینگراد ، ١٩٥٩ لاپەڕە ١٢٤ بە دواوە ٠

٨٥ _ تا ئیستا بە لگەیەك بۆ ئەو کۆششانەی کە لە بارەی دیاریکردنی گەنجینەی زیویە لە سەردەمی یەکێك لە پادشایانی ئاشوردا دراوە دەست نەکەوتوە ٠٠ وە لەم رووەوە هیچ شتێك بە تەواوی نە سەلماوە ٠ (ئیزیبیە _ ئوزیبیە) دو جار لە سەرچاوە ئاشوریەکانا لە بواری سەر ژمار کردنی قەلاکانی ماننادا کە داگیر کرابون باسی لێوە کراوە ، یەکێکیان لە سەردەمی سارگونی دوەمدا لە ساڵنامەکانی کۆتایی ساڵی ٧١٦ دا (وە هەروەها لە نوسراوە رەسمیو تەشریفاتیە کانا) وە لە سەردەمی ئاشور باناپال دا

(ئەستونی B ] کۆتایی ساڵی ٦٥٩ ‏٠٠ بە بیروڕای هەندێکیان لە دەسکردی ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زاینی تازە ترە ‏٠٠ بەڵام بێ گومان هەندێک لەو شتومەکانە وە بە تایبەتی سینە بەندی زێڕ ، ئەگەر هەروەکو گودار لەو باوەڕەدایە هینی سەدەی نۆیەمی پێش زاینی نەبێ هینی نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی پێش زاینی یە ، واتا سەردەمێك کە هێشتا نەك ئەسکیتەکان بەڵکو کیمریەکانیش لەوێدا نەبون ٠

٨٦ ـ ئەم زاراوەیە (ئورتوکور بیانتیان) ، یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٠٠ دا کیسلینگ پێشنیاری کردوە و دوای ئەوە هەمو دانشمەندەکان لە سەری ڕۆیشتوون ، هەروەکو لەم نوسینەی یو٠ یونگەدا دەر ئەکەوێ :

Pauly - wissowa S. V. Orthokorybantier.

٨٧ ـ لێرەدا باسی دەفرێك ئەکرێ کە پێی ئەوترێ « پونتی » بە جۆرێك کە خاتو م٠ ئی ماکسیموا ئاگاداری پێ داوین ئیستا دەنگ وا بلاوە کە ئەو دەفرانە خەڵکی ئاتروری دروستیان کردون ٠ هەرچۆن بێ نیگاری دەفرەکان لە نمونەی ئاسیای بچوك ئەچن ٠

٨٨ ـ [ L. w. King and R. C. thompson ] the sculptures and Inscription of Darius the Great on the Rock of Behistun in Persia, London. 1907.

٨٩ ـ هەمان سەرچاوە لاپەڕە XVI ، ژمارە ٥ ، ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسترووە سونخا وتەی هرودوت دراوسێی نزیکی ئەسکیتەکانی ئاشکوزا بون ، (تەماشای ئاکاد میسین و٠و٠ ئاستررووە ١) و (میژوی نوسینەکانی بێستون VDI ، ١٩٥٢ ژمارە ١ لاپەڕە ٢٦ بە دواوە)و لە شکر کەشی داریوشی یەکەم لە دژی ئەسکیتەکانو ماساگتیەکان IAN ، OIF ، III ١٩٤٦ ژمارە ٣ لاپەڕە ٢٣١ بە دواوە بکە ٠

٩٠ ـ Kn ، ٢٤ ـ HAB ، ١٢٥٧ (بە شێوەی بابلی) هەروەها

تـەماشـای AVIU ژمارە ٦٨ ، ب و ژمـارە ٢٦٩ ، ٢ ، لاپـەڕە ٢٢٤ ؤ ٢٣٢ ٠

٩١ ـ لە نوسراوەی HABL ، ٤٣٤ ٠ لاپەڕە ٣٧١ ، لـە نێوان ساڵەکانی ٧٠ ، ٦٠ ی سەدەی حەوتەمدا ئاشور تەنیا لە لای ژوروو ژوروی رۆژ ئاواوە لەگەل ئورارتوو خوبوشکیەو ماناو مادا هاو سنور بوە ٠

٩٢ ـ لە سەردەمی ئاسترابون دا هەندێك لە بەشەکانی ئازربایجانی ئیستا سەر بە ئەرمەنستان بون ٠٠ ـ ٠واتا بەشێك بون لە ئەرمەنستان ـ ٠

٩٣ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسترووە ، چـەند سەرچاوەیەکی تازە لـە بارەی مێژوی ئەرمەنستانەوە کە لە نوسراوەکەی بێستون دا دۆزراوەتەوە ٠٠ هەواڵی کۆڕی زانیاری ئەرمەنستان ، ژمارە ٨ ، ١٩٤٦ لاپەڕە ٣١ بە دواوە ٠

٩٤ ـ زانیاری سەرزارەکی تەماشای نەقشەی (ئەرمەنستان لە سەدەی دوەم و یەکەمی پێش زاینی)دا وە (ئەرمەنستان لە سەدەی یەکەم تا چوارەمی دوای زاینی) وە ئەتلەسی پاشکۆی (مێژوی هۆزی ئەرمەنی) بەشی یەکەم ، چاپی ١٩٥١ ، س٠ ت٠ یرمیان (ئایروان ،١٩٥٢) بکە ٠

٩٥ ـ ئەوانەی ئەم شوێنە یان هەڵکەندوە بـە هینی سەدەی هـەشتەم تا شەشەمی پێش زاینی ئەزانن ( س٠ م٠ قاضی ئوف ) ( هـەڵکەندراوی شوێنەواره کۆنە شوناسیەکانی مینگە چائور DAN خـەڵکی شـورەوی ئازربایجان ، ١٩٤٦ ، گۆڤاری II ، ژمارە ١٠ لاپـەڕە ٤٤٧ و ٢ ) ٠ هەڵکەندراوە کۆنە شوناسیەکانی مینگە چائور ، فەرهەنگی مادی ئازربایجان، "I" ٠ باکۆ ١٩٤٩ لاپەڕە ٣٠ـ٢٠ ، گ٠ ئی٠ یونە هەڵکەندراوە کۆنە شوناسیەکانی مینگە چائور ، چەند سەرچاوەیەکی تر لە بارەی مێژوی ئەوانەوە کەنراونەتە گۆڕەکانەوە ، راپۆرتی DAN ، II ئازربایجانی سـوڤییەت ، ١٩٤٦ ، گۆڤاری II ، ژمارە ٩ ، لاپەڕە ٤٠٦) ٠ لەگـەل ئەوەدا ئـەو شتانەی کە بە هینی سەدەی هەشتەم دا ئەنرێن هێشتا بلاو نەکراونەتەوە٠٠٠

٩٦ ـ گ. ئی. یونه ، هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٧٩ بە دواوە .

٩٧ ـ ب. ب. پیوطروسکی ، کۆنە شوناسی قەفقاز لاپەڕە ١١٤ .

٩٨ ـ تەماشای شتومەکەکانی (ئەسکیتی) قەفقازی مەرکەزیو رۆژ ئاواو ئاسیای بچوك بکە .

٩٩ ـ نوکە تیری (ئەسکیتی) لە سەدەی شەشەمی پێش زاینی دا لە ئاسیای ناوەڕاست دا دروست ئەکرا (لە باکتریای ژورووو ، کۆنە شوناسی سوڤییەت XIX ، ١٩٥٣ لاپەڕە ١٢١) هەروەکو لەمەوبەر باس کراوە ... تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

R. Koldewey, Das wieder erstehende Babylon Leipzig 1913.

لاپەڕە ٢٥٧ـ٢٥٦ ، دۆزراوەتەوە .. بەم هۆیەوە رەنگ بێ ئەم جۆرە نوکە تیرانە لە ئەسلا لە ئاسیای ناوەڕاستو مادا بوبن ، وە ئەسکیتەکان لە مادەکانەوە دەستیان کەوتبێ ، نەك بە پێچەوانەوە . هەرچۆن بێ لەم بارەیەوە ئێمە تەنیا ئەمانەوێ باسەکە رون بکەینەوە و بیخەینە رو .. وە ئەمەش روباری کۆنە شوناسانی ئەکەینەوە کە وایە یان وا نیە .

١٠٠ ـ رەنگ بێ لە سەرزەمینی ماننادا هەرەشەیان لە خوبوشکیە کردبێ کە کەوتبوە لای خواروی دەریاچەی وانەوە ، [ Kn ، ٣٥) وە ئەمەش راستە کە کەناری رۆژ ئاوا ـ وە یان بە لای کەمەوە بەشێك لەو ناوچەیە لەو سەردەمەدا بەشێك بووە لە ماننا .

١٠١ ـ HABL ، ١٢٥٧ .

١٠٢ ـ بە رەسمی کار ـ ئوریگالی پێ وتراوە .

١٠٣ ـ بەشێك لەو زەویو زارەی کە بە دەست (دیوك) ەوە بوە بە شێوەی رەسمی پێ یان ئەوت ماد .

١٠٤ ـ نوسراوەی Kn ، ١١ ب (= V ، Kl ] ) لە گەردەنەی (ساپاردا) ئەڵێ ساپاردا کەوتۆتە ناوچەیەکی کوێستانی‌یەوە .. وە بە پێی

نەخشـەی ناوچـەکان دەر ئـەکـەوێ کـە ئـەو ناوچـەیـە لـە لاژوروی هەمەدانەوە بووە ٠

١٠٥ ـ بە رەسمی کار ـ شاموکین یان پێ وتوە ٠

١٠٦ ـ تەماشای لاپەڕە ٣٢٧ بە دواوەی نوسراوەکە بکە ٠

١٠٧ ـ لەم روەوە نوسراوەکانی مانتوکی ـ نەینەوا سەرۆکی ناوچـەی خارخار وە نابوبلوکین سەرۆکی ناوچەی کیشە سـو (؟) کە لـە ٧٠٦ـ٧١٤ پێ یان ئەوت سارگونی دوەم بارێکی شایانی رەخساندبو ، ئەم نوسراوانـە چالاکی سەرۆك ناوچەکانی لە خاکی ماددا نیشان ئەدا ٠٠٠ (٠٠٠٠٠٠٠) ٠

١٠٨ ـ نوسراوەی "S ' B ' A" بە تەواوی باسی لەشکر کەشی بۆ سەر شوبریە ناکات کە بە پێی نوسراوەی بابل لە ٦٧٣ ی پێش زاینیدا بووە ، بەلام لە بارەی ماناو مادەوە چەن زانیاریەکی تیایە ٠

١٠٩ ـ وشەی gi-mir-r لـە ناو نوسراوەی بابلی ( B ) دا کنودت تسونو کلائوبر (بە هەمو توانایەکیانەوە) بە هەڵە باسیان لێوە کردوە بەڵام لـە دوای بلاو بونەوەی نوسینەکەی ئاسار خادون ئەم وشەیە بە جوانترین شێوە لایەنگیری کرا ٠٠

S. Smith, Babylonian Historical textes, London 1924.

١١٠ ـ لە بارەی زاراوەی (ئوممان ـ ماندا) وە بە درێژی لە نوسینەکانی ئی٠ م٠ دیاکونوف دا بە ناونیشانی (دوا ساڵەکانی دەوڵەتی ئورارتو) لاپەڕە ٢٥ باس کراوە ٠٠ تەماشای بکە ٠

١١١ ـ KB ' II لاپەڕە ٢٧٥ بە دواوە ٠٠ .Al لاپەڕە ١٣٥ بـە دواوە ٠

١١٢ ـ لاپەڕە ١٢ دێری ٩

S. Smith, Babylonian Historicaltextes

١١٣ ـ رەنگ بێ ئەم شوێنە سەرزەمینی هۆزی ماد بو بێت ، واتـا

بەشی رۆژ ئاوای مادی مەرکەزی بەلآم هەمو سەرچاوەکان زۆر تر لە سەر ئەو رایەن کە لێکدانی نێوان ئاشوریەکانو کیمریەکان لـە ئاسیای بچوکدا بووە ٠

١١٤ ـ تەماشای پەراوێزی ٤٢ ی هەمان بەش بکە ٠

١١٥ ـ ADD ‘ I ‘ ژمارە ٣٦٤ AVIU ‘ ژمارە ٦٦ ٠

١١٦ ـ گ٠ ئا٠ ملیکیشویلی ، هـەندێك باسی کۆمەلآیەتی و ئابوری نائیری ـ ئورارتو ، لاپەرە ٣٩ ٠

١١٧ ـ ئەو بو کە لە ٧٢/٦٧٣ی پێش زاینی دا دیلـە ئورارتوییەکانی کە لە کاتی داگیر کردنی شوبریەدا گیرابون دا بە دەست روساوە ٠

١١٨ ـ لەو پرسیارانەی کە کراوە هیچ جۆرە باسێکی ئەو روداوانەی بەر لە سالی ٦٧٥ی پێش زاینی تیا نیە ٠٠ (وەکو شـەڕ لـە دژی صیدونو شەر لە کلدە ، ساختومان لە بابل ، لەشکر کەشی بۆ بازو لە عەرەبستانی مەرکەزیو شوێنە کانی ترا ٠٠٠٠) ٠ تەنانەت باسی یەکەمین لەشکر کەشی ئاسار خادون بۆ سەر میسر نەکراوە لـە سـالی (٦٧٤ ی پێش زاینی دا) زۆر ستەمە بتوانین لەم روەوە باسێکی راست دەست نیشان بکەین ٠ بەلآم لە بارەی حکومەتی (ئاشـور باناپال) ەوە چـەندان پرسیار هـەیـە کـە باسی ئەکەن ٠٠٠٠٠٠

١١٩ ـ واتا لەو نوسراوانەی کە بەر لە کۆتایی یەکەمین لەشکر کەشی ئاسار خادون بۆ سەر میسر نوسراونەتەوە ٠٠ ناوی تیایانا نەبراوە ٠٠

١٢٠ ـ لە هەندێك پرسیاردا لـە بارەی ئاسیای بچوکەوە باسی میتا کراوە ، کنودت تسون ئەم ناوەی بە میداس زانیوە [ Kn ٥١ ، لاپەرە ١٥٣ بە دواوە) ٠ ئەگەر وابێ ئەمە کونترین پارچەیەکە کە ناتوانین لە ٧٥/٦٨٦ کۆنتری بۆ دابنێین ٠٠٠٠٠٠

١٢١ ـ تەماشا Sepharad ی عیبری کۆن 20 .Obad لەم کتیبەدا

هەندێک شوێنی بە هەڵە لە جێگای شوێنی تر داناوە .....

١٢٢ ـ هەروەکو Ks ، ساڵنامەکان ، دێرەکانی ٨٣ ، ٨٤ وە چەندانی تر (لە نوسراوەو نامەکان) ..

١٢٣ ـ هەندێک لەو پرسیارانەی کە لە خوای شاماش کراوە لە بارەی ئەو روداوانەوە لە ( AVIU ، ژمارە ٦٨ ، لاپەرە ٢٧٢ بە دواوە ) نوسیومانەتەوە ، بەڵام نوسینەکانی کلائوبر کە لە چاپی یەکەمی کنودت تسون وەرگیراوە دەستمان نەکەوت :

[ J. A. Knudtzon, Assyrische Gebetean den sonnengott, Leipzig 1893 ]

١٢٤ ـ لە واقیع دا ئەو باجەی کۆ ئەکرایەوە هەمیشە نەئەگەیشت ، هەروەکو ئاشور بلوسوری حاکم ـ کە ئاسار خادون لە بارەی رێکخستنی لەشکرەوە سەبارەت بە باج پرسیاری لێ کردوە ـ لە چەند سەرچاوەیەکی ترا دەر ئەکەوێ کە هێستری کۆ کردۆتەوە بەڵام بە قسمەت نەبون . ئەبوا باجەکانیان لە بابل بگەیاندایە ، وە بە رای زوربە ئاسار خادون لەو سەردەمەدا لە بابل بوە ([ HABL ، ٢٤٢) ..

١٢٥ ـ بە هۆی نوسراوەکانی « " S ' B ' A " » .

١٢٦ ـ تەواو تر لە هەمو ـ نوسراوەی A ' IV ٨ و بە دواوە ( IR ' ٤٥ بە دواوە) .

١٢٧ ـ بەم کێوەیان ئەوت (کێوی لاجیوەرد) چونکە ئاشوریەکان ئەم مادە مەعدەنیەیان لەو مادانە وەر ئەگرت کە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بون . بەڵام هەروەکو لەمەوبەر باسمان کردوە بەردی لاجیوەردی لە خاکی مادا دەر نەئەهێنرا ، وە مادەکان خۆیان ئەم بەردەیان لە ناوچەکانی رۆژ هەڵاتی تر (لە باکتریا) وە ئەهێنا .

١٢٨ –
E. Sachau, Glossen zu den hisorischen Inschriften Assyrischer koinge, ZA, XII. لاپەرە ٥١ .

١٢٩ – Eparti – ی عیلامی ؟ خوێندنەوەی کۆنی ئەم ناوە – واتا Eparna ئەگرێتەوە .

١٣٠ – ئەسپەکان ; sice rukkubi ئەسپی عارەبانەیان سواری ؟ وە یان ئەسپو عارەبانەکان ؟ ناو براوە .. جگە لەوە باسی ئاژەلی گەورەو بچوکو شاخدارو گوێ درێژو وشتری دو کۆپان کراوە .

١٣١ – تەماشای بەر لە بەشی دووەم پەراوێزی ٢٧٨ و ٣٠٨ بکە .

١٣٢ – ئەم ناوە ، بە زاراوەی (ئازربایجان) یەکەمجار کنودت تسون (J. A. Knudtzon) هەمان سەرچاوە ، II لاپەرە ١٢٧) ... ئەو لەو باوەرەدایە کە (ئاتروپات) لە سەرەتاوە ناوی شارێك بووە وە لە دواییدا بوە بە ناوی خەلك (؟) لەگەل ئەوەشدا لەم بەلگە نامەیەدا لە جیاتی (ئاندار پاتی – مانو –) «ئانتار پاتی» خوێندراوەتەوە .. وە باسی ئەوە نەکراوە کە ئەم ناوە لە نوسراوە ئاشوریەکانی ترا هەیە یان نەء ؟ مێژوی زاراوەی «ئازربایجان» و شێوە جۆربەجۆرەکانی ئەتوانین تا قولایی سەدەکان دوای کەوین .. وە لەم بارەیەوە چەندان بیروړای جۆربەجۆر هەیە .....

١٣٣ – ناوی حاکمەکانی دوەم و سێیەم بە تەواوی ئیرانین :–
S Zanaxsana ئاشوری = «ش» ) – بە مانا (خاوەن هۆز) ، خاوەن بنەماڵە ، رەسەن ..

Ramatav (y) a - تەماشای ئەم باسە ئاشورییە بکە Ramatua بە مانا شاد – خاوەن توانا – بەلام ناوی یەکەم – واتا ئوپیس – ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە زمانی ئیرانییەوە نیە .

١٣٤ – ئەم ناوە ئیرانی یە ( Varakasa - Farna ] پشت XIII

۱۱۳ ، یان Varkazan-Farna ? ]. ٠

۱۳٥ ـ لە نوسراوەی ' X - da - a - a کنودت تسون بە id خوێندوتەوە کلائوبر ud, id [ = Par ] بە گومـان بوە لێی ٠٠ وا دێتـە بەرچاو کە تەنیا amelsa - Plar - da - a - a مانای کۆمەڵیان داوە ٠٠

۱۳٦ ـ باس هۆزەکانی تریش کراوە ، بەڵام ناوەکانیان کوژاوەتەوە ٠

۱۳۷ ـ تەماشای لاپەڕە ۳۳۲ بە دواوەی نوسراوەکە بکە ٠

۱۳۸ ـ Kn ' ۱٦، ۱۹، ۲۰، ٤۱، Kl ' ۱۰ ، Kn ' ٤۲،۲٤ ٠

۱۳۹ ـ HABL ' ۱۲٥۷ ، ' AVIU ' ژمـارە ٦۹ ، لاپـەڕە ۲۳۱ بە دواوە ٠

۱٤٠ ـ ئەو کیمریەکان بە هۆزی (فراریان) ناو ئەبات ٠٠ ئەمە رەنگ بێ هەمان ئەفسانەی هرودوت بێ کە لە بارەی راکردنی ئەوانەوە لە شەڕی ئەسکیتەکانا بە شێوەی ئەفسانە یی باسی لێوە کردون ٠

۱٤۱ ـ لە زمانی ئاشـوری دا Ahseri بوە ، وە لێرەدا کـە بـە شێوەی بابلی نوسراوە بەم جۆرە Ahseri خوێندراوەتەوە ٠٠ ئاخسری لە ساڵی ٦٥۹/٥۸ لە دنیا دەرچووە ، رەنگ بێ ئەو جێ نشینی بلخا بو بێ٠٠ (ئەگەر ئەو کەسەی لە دواییدا باسکراوە فەرمانرەوای نانتا بوبێ) ٠

۱٤۲ ـ HABL ' ۱٠۲٦ ، ـ AVIU ' ژمارە ۳،٦۹ ٠

۱٤۳ ـ کلائوبر بەم جۆرەی ئەخوێندەوە (هەمان سـەرچاوە ، لاپـەڕە LIX ] کنودت تسون بە ئانی سوس (کیا)ی خوێندۆتەوە ٠٠ ئانی سو ـ ئاوایيەك بووە لـە ناوچـەی خنـانجو لـە سـنوری خـواروی رۆژهـەڵاتی ئورارتو [ HABL ۱۷۳) لە سەرچاوەکانی ترا بە ناوی ئانی سوسـکیا بەرچاو مان نەکەوتوە ٠ جارانیا ـ رەنگ بێ هـەمان حـارونا وە یان حارانا بێ کە قەڵایەك بووە لـە بـەشی رۆژ ئاوای (زاموای ناوخۆ) وە سـەرچاوە ئاشوریەکانی سەدەی نۆیەم باسیان لێوە کردوە ٠

١٤٤ ــ هەروەها هۆزێکی تر کە ناوی (وەکو ناوی ئەسکیتەکان بــەڵام بە سەرزارەکی ماوەتەوە) لە ئارادا نەماوە ٠

١٤٥ ــ بەڵام لە زوربەی سەرچاوەکانا تە بارەی (شوزش)ەوە (جگە لە Kn. ، ٢٥ ،٣٦) بە هیچ جۆرێك باسی ئــەسکیتەکان نەکراوە ، لەگــەل ئەوەشدا ، هەروەکو باسمان کردوە لەو کاتەدا ئەوانە لــە سەرزەمینی مادا بون ، بەڵام باسی کیمریەکان کراوە ، ئەم باسە ئێمە ئەخاتە ئەندێشەوە کە لە سەرچاوە بابلیەکانا مەبەست کیمریەکانی (ئاشکوزا) بووە ٠

١٤٦ ــ (Kn. ، ٤) لە بارەی کشتریتی یەوە ٠

١٤٧ ــ کۆنترین سەرچاوەیەك لە بارەی (شورش)ەوە ( KI. ٤ Kn. ) لە ٣ ی ئایاری (کۆتایی ئاوریلی ساڵی ٦٧٣) یــە کــە لەویدا دوسانتیو مامی تیارشو هەروەکو هاوپەیمانی کشتریتی چونەتە مەیدانــەوە ٠ لــەبــەر ئەوە ئەبێ KX ٢ و KI ، ١٣) لە هەمو بە کۆنتر دابنرێ ٠٠٠٠

١٤٨ ــ نازناوی مامی تیارشو لە ناو ئەو سەرچاوانەدا ئەبێ بەم جۆرە بزانرێ ، وە نابێ وای تێ بگەین (بە پێچەوانەی ئەوەوە کە زۆر جار گومان ئەکرێ) کە ئەو تەنیا کابرایەکی مادی بووە کــە لــە ناو یەکێتی دا بوە ٠٠ هەرسێ پیشەوایانی شورش مادی بون وە ناوەکانی سێ بنکەی شورش وەکو: کار ــ کاشی (کلنی کاسیەکان)و مادای ( «ماد» واتا ئەو وڵاتەی کە بەراستی ئاشوری بوە و بــەم ناوە خوێندراوەتــەوە)و ســاپاردا ، واتا بیت ــ کاری (خانەی کلین)و مادایو ساپاردا ٠٠٠ نوسراوە ٠

١٤٩ ــ یان (کە ناوەکانی ئەوان) ــ واتا خەڵکی کیشوەری تیلاشوزی٠٠

١٥٠ ــ یان (مهرانو) ــ لە نوسینەکانی S ، B ــ بەو جۆرەیە ٠٠ئەم زاراوەیە بە شار یان کیشوەر لێك دراوەتەوە ، وە لە سەدەی نۆیەم تا حەوتەمی پێش زاینی تەنیا لــەم شوێنەدا نەبێ نەبینراوە ٠ بەڵام ئــەگەر لەگەل نوسراوەی توکولتی ــ نینورتای یەکەم بەراورد بکرێ ئــەبێ تەماشای

(بەشی یەکەم ، پەراوێزی ١٥٨)و نوسىراوەی تیگلاتپا لاساری یەکەم [ AVIU ژمارە ١٣ ـ AKA لاپەڕە ١١٦) بکرێ ٠٠ لەگەل ئادانرازی دووەم ( AVIU ژمارە ٢٠ ، ٢١ ـ KAH ' II ژمارەکانی ٨٣ و٨٤) بەو جۆرە ئەنجام دەستگیر ئەبێ کە « مهری » یان « مهرانو » بە خەلکی ناوچەی مادی رۆژئاوا وتراوە ٠

١٥١ ـ تبلاشوری ، هەروەکو دیمان لە کەناری ( قەلای بابلیەکان ) ـ سیلخازی ـ بووە ، وە یان هەر هەمان قەلا بوە ، کە لە هەزارەی یەکەمدا مەفهومی (کاسیو بابلی) یان پێکەوە نێکەل ئەکرد ، بەرای زوربە قەلای بابلیەکان هەمان ( کلنی کاسیان )ی « کار ـ کاشنی » بوە کە کشتریتی حوکمڕەوای بووە ٠ وە کار ـ کاشی رەنگ بێ مەرکەزی ناوچەی بیت ـکاری بوبێت ٠ کە بە پێی بەلگەی ناوبراو رەنگ بێ هەمان ناوچەی هەمەدان بێ٠ «پێ تانو» ـ بە زمانی مهرانی واتا زمانی خەلکی ناوچەکە رەنگ‌بێ ـ هەمان «ئادان»ی هەزارەی دووەمی بەر لە زاینی بێ ، واتا ئەو ناوچەی کەوتۆتە ژوروی عیلامو لکاوە بە بەشی ژوروی روباری دیالەوە ٠٠ هەندێك لە لێکۆلەرەوەکان بارناکو بە بیت ـ بوناکی ئەزانن کە سیناخریب لە ژوروی عیلام حوکمی تیا ئەکرد ٠٠٠٠٠

١٥٢ ـ Kn ' ١، لە بارەی ئەوە ئایا کشتریتی بە هەر شێوەیەك بێ (؟) ئەتوانێ شاری کیشەسو داگیر بکاتو بچێتە ناویەوە ، وە ئایا کیشەسو ئەبێتە بەشێك لە ولاتی فەرمانڕەوایی ئەوان ٠٠٠٠٠٠٠

١٥٣ ـ رەنگ بێ ئەو نوسراوەی کە یونجیك بە شێوەی بابلی نوسیوێتی پەیوەندی بە باسی سەرەوە بێت ٠٠ [ HABL ٤٥٩ ) سەرەتای نوسراوەکە کوژاوەتەوە ، پاشماوەکەی هەندێکی بەم جۆرەیە ٠ «بچن بۆ نامار» بەلام ئەو بە قسەی نەکرد ، ئەوان رۆیشتن ،٣٠٠ کەس پیرو منالیان لەگەل خۆیانا برد ، خەلکی لە دژی باجو سەرانە (بە پادشا ؟)

سەرپێچیان کرد ·· کەس بە قسەی پاشا ناکات ، رەنگە بێ پاشا بڵێ ، کەوابو تۆ لە کوێی ؟ لەو کاتەدا کە ئازادەکانیان بردوە (؟) ئێمە لە قەڵای کیشەسو وەکو بنکەیەکی هەمیشەیی بوین ·

[ in-a al Ki - si - si - ina - al - bar - ti - su - la - ni]

١٥٤ ـ Karibtu- ی ئاکادی ـ واتا ـ پیرۆز ـ ناوی راستە قینەی ئەم قەڵایەو ناوچەکەی نازانرێ ، تەماشای KI ‘ 1 = Kn ١٢ بکە ·····

١٥٥ ـ KI ‘ ٤ = Kn ‘ ٨ ، پرسیارەکە پەیوەندی بە ماوەی ٣ی ئایار یان سیمانەوەیە ·

١٥٦ ـ رەنگە بێ بەم جۆرە بخوێندرێتەوە :

ni-ribisla al sa-Par(!) - du

لە جیاتی al se an - du کە لە نوسراوەی KI ‘ V = Kn ‘ b ١١ دا ، هاتوە ····

١٥٧ ـ لاپەرە ٣٦٦ ‘ Streck ‘ ZA ‘ XV.

١٥٨ ـ ئەم ئاواییە لە نوسراوە ئاشوریەکانا دو جار بە بۆنەی ئالی پیو ئوریاکووە لە ناوچەی خارخار باسی کراوە [ HABL ١٢٩و١٠٤٦)·

١٥٩ ـ Kn ٨٥ لە بارەی ناوچەی روبارەکانەوە باسی ئەکات ·

١٦٠ ـ Kn ‘ a ١١

١٦١ ـ Kn ‘ ٣٦

١٦٢ ـ Sissirtu [Kn. 72]

١٦٣ ـ HABL ١٦٥

١٦٤ ـ بە پێی بیروڕای فورر ـ ئەو لەو سەردەمەدا ئەرکی گرنگی (سەرۆکی سەرۆکەکانی) پێ سپێردراوە · تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

E. Forrer, Die Provinzeinteilung des assyrischen Reiches, Leipzig 1921. لاپەرە ٨٩ و ٩٤ ········

١٦٥ ـ ڕەنگە بێ ئەم ڕوداوە ساڵێك پێشتر واتا ساڵی ٦٧٤ دا بنرێ٠٠ بەڵام لە نوسراوە کۆنەکانا ئەڵێ مانناییەکان لە ساڵی ٦٧٣ دا دیسان لەگەل ئاشوریەکانا لە شەڕدا بون ، وە نوسراوەی نابورماننی لە سەردەمی هێرشی گشتی دا بۆ سەر سنورەکانی رۆژ هەڵاتی ئاشور بوە ٠٠ وا دێتە بەرچاو کە جموجوڵی شەڕی ساڵی ٦٧٤ لە ناوچەی ژوروتر بو بێت ٠٠ لە لایەکی ترەوە وا دەرکەوتوە کە نابێ ئەم نامەیە بە هیچ شێوەیەك بە هینی سەردەمی ئاسار خادون بزانرێ ٠٠ بەڵکو بە ساڵی ٦٥٩ وە یان ٦٥٢ـ٦٥٣ دا بنرێ ٠

١٦٦ ـ AVIU ، ژمارە ٦٧ ، لاپەڕە ٢١٨ لە گەل ژمارە ٦٣ ، لاپەڕە ٢١٥ مێژوی «ئوکتوبەر ـ نوامبەر ٦٨٢» لە پەراوێزی ٨ی هەمان لاپەڕەدا گومان هەیە ٠٠ ئەبێ «نوامبەر ـ دیسامبەر» بخوێندرێتەوە ٠

١٦٧ ـ هەروەکو کلائوبر باسی کردوە نوسراوەکانی پراشك لە بارەی سەرداری ئاشوری شا ـ نابو ـ شوباکشتریتی لە ژێر شوراکەی شاری ئامولدا هیچ راست نیە ٠٠ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

J. V. Prasek, Geschichte der meder und Perser, I Gotha, 1906.

لاپەڕە ١١٨ ٠٠٠٠٠

١٦٨ ـ KI ٦ Kn ٩ ( Kn ? ٣) و ١٢ ، پەیوەندی بەو رابەرانەوەیە کە پێشتر ئامادە کرابون ٠٠

١٦٩ ـ KI ٦ بە مێژوی ئازر ـ ئاددار ـ (فوریە ـ مارسی) یە وە بریتییە لە سەردەمی کاتێك تا ناوەڕاستی (؟) نیسانی ساڵی دوایی ٠٠ نوسراوەکانی فوریە ـ مارسی ساڵی ٦٧٣ واتا رۆژ گاری شورش بوە ، کە بە رای زوربە لە مانگی نیسان ( مارس ـ ئاوریالی ساڵی ٦٧٣ ) ٠٠٠ باسی لێوە کراوە ٠

١٧٠ ـ Kn ، ٢٥ ئەوەندەی کە لە نوسراوەکەدا ماوەتەوە باسی مامی تیار شو نەکراوە بەڵام وەکو ئەڵێن کە مەبەست لەو بووە بەڵام کاتیك کە

رابەر بۆ ئەوێ ئامادە کراوە کار ـ کاشی باس نەکراوە بەڵکو باسی کیشوەری مادای کراوە ٠

١٧١ ـ KI ، ١٦ = Kn ، ٢٩ (لـە AVIU نوسراوەکـەدا جگە لەو تەواو کردنانەی کلائوبر دۆزیویەتەوە باسی کراوە ٠

١٧٢ ـ هرودوت لە نوسینەکەیا ناوی (مادیا)ی نوسیوە وە ئـەو بـە کوڕی (پروتوتی ـ پارتاتوا) دائـەنێ ٠٠ ئـەوە بزانین کـە هرودوت لـە نوسینەکانیا لە بارەی یۆنانیەکانەوە زۆر جار ناوو ناوی باوکو بنەماڵە کەشی نوسیوە بەڵام لە بارەی ئەوانەوە کەـ یۆنانی نین مەگەر بـە دەگمـەن ناوی باوکی نوسیبێ ٠٠٠٠٠٠

١٧٣ ـ لەم ناوچانە کە (کار ـ ئوریگالی و کار ـ شاروکین ناویان براوە) لە ناوە ڕۆکەکانی ناوچە ئاشوریەکانا سـەردەمی ئاشور باناپال باس کراوە تەماشای E. Forrer لاپەڕە ٥٤ـ٥٣ بکە ٠

١٧٤ ـ بە بیروڕای ئالمستد میژونوسی ئەمەریکایی لە بارەی شەڕەکانی ناوچە ژێر دەستەکانو وڵات داگیر کردنەوە لەو باوەڕەدا نیـە کـە کشتریتی شکا بێ ٠٠

[ A. t. E. Olnstead, History of Assyria, New york-London, 1923]

ئەگەر کەسێك بەرپەرچی ئەو رایە بداتەوە کـە یەکێتی وڵاتەکان لـە دژی ئاشور لە ساڵی ٦٧٣ ی پێش زاینی دا بوو بـە هۆی دامەزراندنی پادشایی ماد ، ئەبێ وای دابنێ کە مادەکان لە ماوەی ساڵەکانی ٦٢٠ـ٦١٠ ی پێش زاینی دا وەکو کێشوەرێکی خاوەن دەسەڵات بوە ٠٠

١٧٥ ـ لە سەرچاوە ئاشوریەکانا ناوی ئەم ناوچانە براوە ٠

١٧٦ ـ HABL ، ٤٣٤ لێرەدا لـە بارەی پاسەوانەکانی سنورەوە لە دژی ئەم کیشوەرانە وە لە بارەی قەڵای تایبەتیانەوە لە سنورەکانا ، وە راکردنی پەنابەرەکان بۆ لای ئاشورباناپال تەماشای ( HABL ، ١٠٢٦)

بکه ٠ یان AVIU ، ژماره ٦٩ ، ١ لاپەڕە ٢٣٠ به دواوه ٠ وه بۆ ئەو بەڵگانەی پەیوەندی بەم میژووەوە هەیە تەماشای AVIU ، ژماره ٦٩ لاپەڕە ٢٣١ به دواوه لەگەل پەراوێزی ٥ــ٣ بکه ٠

١٧٧ ــ ئەمە ناوەڕۆکی پادشاکانه له سەردەمی ئاشوربانابال دا ، بەلام بەر له جیابونەوەی بابل لەساڵی ٦٥٢ دا بەشێك لەو ناوەڕۆکەی کە ئەمانەوی باسی بکەین به پێی ( AVIU ، ژماره ٧١ ، لاپەڕە ٢٣٤) وەکو لای خوارەوەیه :

| | |
|---|---|
| « ٠٠٠٠ **خیلاکو** | ــ (کیلیکیه ، لە سەردەمی لەناو چونی پادشایی ئاشووردا سەربەخۆ بوه) ٠ |
| **یا (مانا) نا** | ــ (یۆنان ، ئەمه دورگەی قوبرسیه) ٠ |
| **ملید** | ــ (ملی تنا له بەشی ژوروی فورات ، له سەردەمی ئاسار خادون و دوای ئەویشی سەربەخۆ بووه) ٠ |
| ( ٠٠٠٠٠ ) | ــ ( ؟ ) |
| **شیبارتو** | ــ ( ؟ ) |
| **ئیسکا لونا** | ــ (ئەسکان لون له فەلەستین ، پەیوەندی بە ئاشورەوە نەبوە) ٠ |
| **ئودومو** | ــ (ئیدوم ، ئیدومیه ، لەودیو ئوردنەوە) ٠ |
| **معابا** | ــ (موئاتو لەو دیو ئوردنەوە) ٠ |
| **ئاما(نا)** | ــ (ئامن لەودیو ئوردنەوە) ٠ |
| **ئاتیوپی** | ــ (هەرگیز له ژێر دەسەلاتی ئاشووردا نەبووه) ٠ |
| ( ٠٠٠٠٠ ) | ــ ( ؟ ) |
| **ماد (مادای)** | ــ (پادشایی ماد ــ به پێی ئەو ناوچەی له ناوەڕۆکەکەدا دیاره سەربەخۆ بووه) ٠ |
| **کیشومری** | ــ (له سەرانسەری سەدەی حەوتەمی پێش زاینی |
| **(ماننایيەکان ؟)** | دا سەربەخۆ بوه) ٠ |
| **کەناری دەریا** ٠٠٠٠ » | ــ (هۆزه کلدانیه سەربەخۆکان) ٠٠٠٠ |

١٧٨ ـ J. V. Prasek هەمان سەرچاوەی پێشو ،لاپەرە ١٢٤ـ١٢١ ٠

١٧٩ ـ کلائوبر ئەڵێ کشتریتی سەرۆکی یەکگرتنەکە نەبوە ، وە ئەوەی کە لە ناو ناوی دوژمنەکانا وشەی (یا) بەکار هێنراوە مانای ئەوەیە کە سەرۆك نەبوە ٠٠٠٠٠٠

١٨٠ ـ Diod ‘ II ‘٣٢ ، ٢ ٠٠ هەندێك لەو باوەڕەدان کە کیاکسار ناوی یەکێك لە پادشاکانی مادە ، کە هرودوت لە نێوان دیوکو فرائورت دا دایناوە ٠٠ وە لە بەر ئەوەی لە کاتی نوسینەوەی نوسراوەکەی هرودوت دا لەیاد چوە ئێمە ئەم ناوەمان پێ نەگەیشتوە ، بەڵام بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە بڵێین ئەو دێرانەی نوسراوەکەی هردوت تا ئەو شوێنە گوژاوەتەوە٠٠ ئەگەر ئاخسیل ( Persia ‘ ٧٦٥ بە دواوە) کیاکسار بە دامەزرێنەری دەسەڵاتدارێتی لەسەر ئاسیا ناو ببات وە خشاتریاتی درۆیی خۆی لە نەوەی بنەماڵەی کیاکسار دابنێ ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە یەکێك بە ناوی کیاکساری یەکەمەوە زنجیرەی مادەکانی دامەزراندبێ ، بەڵکو لە راستیدا هەمان کیاکساری میژویی ئەو پادشایەی مادەکان بووە کە کێشوەرەکەی بە پایەی دەوڵەتێکی گەورە گەیاند ، وە لە کۆتایی سەدەی حەوتەمدا کیاکسار ناوێکمان دێتە بەرچاو کە بە ئاشوری (ئوکساتار ، ئواکساتار)ی پێ ئەڵێن کە یەکێک بووە لە ئەمیرەکانی ناوچە روباریەکان ٠٠ (تەماشای پەراوێزی ٢٧٨ بەشی دووەمو HABL ، ٦٤٥ ، پەراوێزی ٩٩ی ئەم بەشە بکە) ٠٠

١٨١ ـ بە زمانی یۆنانی وەکو باو بوە پیتی F بە شێوەی -VA- , Ph یان بە شێوەی - O - بەکار ئەهێنا ٠٠ بەم شێوەیە Fravartis بە Phraotes ی یۆنانی ئەخوێندرایەوە ٠٠٠٠

١٨٢ ـ لە بابل دا کابرایەك ناوی نابوخودنو سور (بخت النصر)ی لە خۆی نابو ، لە عیلامیش یەکێکی تر خۆی ناو نابو ماریتا ٠٠٠ گۆڕینی ناوی

پڕ له شانازی سه‌ڵته‌نه‌تی فرائورت بـه ناوی غـه‌یره سه‌ڵته‌نه‌تی خشاتریتا کارێکی بێ به‌ها بوه ، وه وه‌کو ده‌رئه‌که‌وێ ناوی دووم سه‌ڵته‌نه‌تی بوه نـه‌ك ناوی یه‌که‌م ٠

١٨٣ ــ بابلیه‌کان ــ -XS- یان به شێوه‌ی -ks- به‌کار هێناوه ، وه که‌متر به شێوه‌ی -hs- . ٠٠٠٠

١٨٤ ــ له باسه بابلیه‌کانی نوسراوه‌کانی بیستوندا Hasatriti دروم باسی یه‌کبونی ئه‌م ناوه‌ی له‌گه‌ل ناوی کشتریتی‌دا کردوه ٠٠

لاپه‌ڕه ٩١ [ P. Dhorme, Confernce dest-Etienne, Paris, 1911 ]

١٨٥ ــ ئه‌گه‌ر ئه‌وه راست بێ که لـه نوسراوه‌کانی هردوت دا ئـه‌ڵێ ناوێکی تر له نێوان دیوکو فرائورت دا له قه‌ڵه‌م دا که‌وتوه ٠٠

١٨٦ ــ یه‌که‌مین جار تیله لـه ١٨٨٨ دا ئه‌م زاراوه‌یه بـه‌م جۆره لێك داوه‌ته‌وه ، به‌ڵام سه‌ری نه‌کرت ٠٠

١٨٧ ــ هه‌روه‌کو چه‌ندان جار باس کراوه ئه‌م نوکته‌یه له باره‌ی تیگلا تپالاساره‌وه‌یه ٠٠ له‌وه‌بـه‌ر باس کراوه کـه لـه کۆتایی هـه‌زاره‌ی دووه‌مو سه‌ره‌تای هــه‌زاره‌ی یه‌که‌می پێش زاینی دا زاراوه‌ی (کاسیه‌کان) زۆر جـار له‌گه‌ل وشه‌ی (بابلیه‌کان) دا به یه‌ك زانراوه ٠٠٠٠٠

١٨٨ ــ له باره‌ی ئه‌م زاراوه‌یه‌وه ته‌ماشای لاپه‌ڕه ٤٥٨ به دواوه بکه ٠

١٨٩ ــ به وته‌ی هرتسفلد ــ هه‌مان Vahmyataris ئیرانی یه ٠

١٩٠ ــ ئه‌مه له نزیکایه‌تی بێ ئـه‌ندازه‌ی ناوه تایبه‌تیه‌کانی سکایی ــ ئه‌سکیتی‌و مادی دا هه‌یه ٠

١٩١ ــ جگه له Dusanni. ته‌ماشای Harpags بکه ٠

١٩٢ ــ ته‌ماشای ده‌وروبه‌ری لاپه‌ڕه ٢٥٤ و دوای لاپه‌ڕه ٤٥٧ بکه ٠

١٩٣ ــ هرودوت به رونی ئه‌وه‌ی له باره‌ی پادشایانی ماده‌وه نوسیویه نیشانی ئه‌دا کـه هه‌واڵده‌ری (ئاریستوکرات)ی ئه‌و باوه‌ڕی بـه رێکو پێکی

ڕێژیمی دیوکیەکان نەبوە ·

١٩٤ ـ هرودوت ( I ١٠٠ـ٩٩) کە دەق گرتنی ڕاپەرینی سیاسی بە بۆنەی دیوکەوە ئەزانێ ·· بەمجۆرە باسی ئەکات : قەلایەکی بەو جۆرە، واتا ئەکباتانا ، دیوك بۆخۆی کردیەوە ، وە ئەو جۆرە شورایانەی بە دەوری نیشتەجێ کەی خۆیا کێشا ، وە فەرمانی بە خەڵك دا لـە دامێنی شوراکانەوە ماڵو مەڵبـەند بکەنـەوە ، دوای کردنـەوەی هـەمو ساختومانـەکان واتـا خانوبەرەکان دیوك بۆ یەکـەمین جار ڕێژیمی دامەزراندو فەرمانی دا کـەس نەیەتە نیشتەجێی پادشاوە ، وە هەمو ئیشو کارێك بە هۆی ڕابەرەکانیە وە پێك بێت ، وە نابێ هیچ کەس پادشا ببینێ · جگە لەوە هەرکەس لەبەردەم ئەوا پێ بکەنێ یان تف بکاتەوە ئەمـە بـە کردارێکی ڕەوشـت خـراپی بۆ دابنرێ ·· هەر کەسێکی داوا بکردایە ڕێگایان ئەدا بگاتە لایو ··· بە پێی گوناه سزای تاوانبارەکانی ئەداو ·· لە هەمو ناوچەکانی ولاتەکەیا جاسوسی دروست کرد کە هەواڵیان بۆ ئەبردەوەو قسەو باسیان بۆ ئەگێڕایەوە ··

١٩٥ ـ ئی· م· دیاکونوف ، قەوارەی دەوڵـەتی شومەر لـە کۆنترین چەرخەکان VDI ١٩٥٢ ، ژمارە ٢ ، لاپەڕە ٣٥ بە دواوە ·

١٩٦ ـ لە سەرزەمینی یەهودا ڕاپەڕینی پێغەمبەرەکان کـە لـە لایەن کۆمەڵانی خەڵکـەوە پشتگیری لـێ ئـەکرا لـە واقیـع دا پـەناو پشتیوانی پادشایان بوو ، وە دژی گەورەکانی ناوخۆ ئەجولانەوە کە پەیوەندی یان بـە ئاینە ناوچەییەکانەوە بوە ··

١٩٧ ـ ئورارتو ، ماننا ، مادو خوبوشکیە

١٩٨ ـ لە ناوچەی کەناری ڕۆژئاوای ورمێ

١٩٩ ـ کورشی یـەکـەم پادشای پرسید ( پارس ) و گـەلێك لـە پادشایانی تر لـە ڕۆژ هەلاتی عیلام ـ هەروەکو لـە دواییـدا بـەرچاومان ئەکەوێ ـ سەربەخۆ پەیوەندی یان بـە ئاشورەوە بوە ، زۆر تر باسی لێوە

ئەکەین کە پارسی تەنیا لە سەردەمی کیاکساردا سەر بە ماد بووە ٠

٢٠٠ ـ زورتر رێ لەوە ئەچێ کـە هەوالی دەوەم راسـت تر بێ ، یـەك پرسیاری ئاشوز باناپال لە بارەی لەشکر کەشیەوە بۆ سەر ئالی پی بەسەر کردایـەتی ( سـەرۆکی سـەرۆکان ) شـا ـ نابو ـ شـو بـە دەسـتمان گەیشتوە ، ئاشترك Assurbainpal, I, CL XXXII.

وەکو دەر ئەکەوێ نازناوی پرسیار کەرەکە لـە نوسینەکەدا وەکو ( ئاشور باناپال کوڕی ئاسار خادون ، پادشای ئاشور ) خوێندراوەتـەوە ، وە ئـەم لەشکر کەشیەیە هی کۆتایی سـەردەمی پادشایی ئاسـار خادونە واتا دوای تەواو بونی شەر لەگەل کشتریتی ، بەلاَم زۆرتر لەوە ئەچێ کە ئەم لەشکر کەشییە هینی سەردەمی شەڕی مادەکان بو بیت ، چونکە ئالی پی یەکان و مادەکان و (کیمریەکان) «ئەسکیتەکان» ؟ ، بـە دوژمنانی ئاشـور درابونـە قەلَەم ، ئێمە ئەمانەوێ کە ئالی پی بەو علیمائیدە Elumais بزانین کـە ناوی لـە نوسراوەی نوسـەرە یۆنانیەکانی دوایی ترا هـاتوە ، نوسـەرەـ ناوبراوەکان ئەمەیان لـە عیلام ( سوزیانا ) جیـا ئـەکردەوە

رەنگە بێ لە زمانی عیلامدا بە شێوەی Ellu-me نوسرا بێ ٠ Elli-Pi

٢٠١ ـ ئەم لەشکر کەشییە لەگەل ئەوەدا بە (ئەستونی B ) نـاو ئەبرێ زیاتر لە شوێنەکانی تر زانیاری داوە بە دەستەوە تەماشای ژمارە ٧٣ لاپەرە ٢٣٨ بکە ٠٠ هەروەها بـە پێی نوسینی «ئەستونی راسام» AVIU ژمارە ٧٢) وە ( Kn ١٥٠) بکە کە مەبەستی لەشکر کەشیەکە بە تەواوی لەوێدا رون کراوەتەوە ٠

٢٠٢ ـ نوسراوەی ئاشوری ئایوسیاش ، پاشا (٠٠٠٠٠) سو ،بوشوتو (= بوشتو لە سنوری پارسوا) ئاشدیاش ، ئوکی یامون ، ئو پیش ، سـی خو ئار نازی نیری ناو بردوە ٠

٢٠٣ ـ لێرەدا ئاشوریـەکان قـەلاَی ئارسیانشیان گرت ، نوسـراوە

ئاشوریەکان ئەڵێن کە ئاشوریەکان قەڵای ئارشتدیان داگیر کردوەو وازیان لە ناوچەکانی دەوروبەری هێناوە ، وە بە تایبەتی پیاوێك بە ناوی (رادیای کوێستانی) یان (رادیای شادی) خەڵکی (؟) کوژراوە ، لەگەل وشەی (کوموردیان) «خوموزتی» زمانی شومەر بەرابەریان بکە (لە نزیك خارشی لە دەورو بەری لاپەڕە ١٥٧ دا تەماشای بکە ٠

٢٠٤ ـ قەلاکانی (بی) روا (؟) شاروایکبی ، گوسونەو (٠٠٠٠٠) روتە کە خرابونەوە سەر وڵاتی ئاشور ، لەو جێگایەدا بون ٠

٢٠٥ ـ هەروەکو لە نوسینەکانی هرودوت دا دەرئەکەوێ ئەم لێکدانە لە ناوچەی ژوروی ئازربایجان رویداوە (لە کاتێکدا کە ئەسکیتەکان لە چیای قەفقازدا تێ ئەپەڕین) بەڵام ئەگەر واش بێ هیچ جۆرە گۆڕینێك لە باسەکەدا روو نادات ٠٠ هەر جۆر بێ ئەم لێکدانە لە نێوان ئەسکیتەکانو مادا ئەوە ئەگەیەنێ کەماننا لە مەیدانا نە بوبێ ٠

٢٠٦ ـ نوسراوە Msar-a-ti یان Msar-a-ti وە لەوە ئەچێ ئەبێ بە sarhati, Sar,ati بخوێندرێتەوە ٠

٢٠٧ ـ بەم شێوەیە paritia خوێندنەوە کەمتر رێی تێ ئەچێ ٠

٢٠٨ ـ لە نوسراوەکانا باسی ئەم هاوشانیە کراوە ، وە ئەم تیوریەیان لە جرج ئاسمیت وەر گرتوە ، یوستیی ئەرمەنی لەگەل ناوچەی سیونیك (لە رۆژ هەلاتی دەریاچەی سول ٠ یان هەروەکو س٠ ت یرمیان بەرونتر دیاری کردوە لە ناوچەی نوخی) بەرامبەری ئەکات ٠

Th. Noldke und E. Shrader, keilinschriften und Geschichts for Schung ZDMG, XXXIII, لاپەڕە ٣٢٨

staech, Z.A, XV لاپەڕە ٣٢١

٢٠٩ ـ چونکە گۆڕینی a بە O لە عیبری کۆندا چەند رۆژگارێك لەوە بەر بووە تەماشای AVIU ژمارە ٨٥ پەراوێزی ١

وژمارەی ٨٦ پەراوێزی ٣و لاپەڕە ٢٥١ بکە،نوسراوەی دلیچ وئاشترك راست نین

F. Delitzch, wo lag das paradis, Leipzig, 1881
streek. ZA VX

لاپەڕە ٢٤٦

٢١٠ – بەم شێوەیە ئاشترك گۆتیەکانی لەکێوی جودی داخ ، بەلای زوروی ئاشورەوەو ج ئاسمیت لە نزیك ئارایخا (کەرکوك ) داناوە ٠٠ تەماشای بەشی یەکەم پەراوێزی ٤٤ بکە ٠

٢١١ – ئاکاد میسینو ٠ و٠ ئاستروەە میژوەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی لە نوسراوەکانی هرودوت دا لاپەڕە ٦٧ ٠

٢١٢ – بە داخەوە نوسینی سرودەکانی قسە لەگەل خواوەندا کردنی مردوك کە ئەم زانیاریە ئەدات بە دەستەوە بە باشی نەماوەتەوە ، لێکۆلەرەوەکان هەر یەکە بە جۆرێکی ئەخوێننەوە ٠ ئاشترك (لاپەڕە ٢٨٠ بە دواوە بەم جۆرە ئەخوێندرێتەوە :

Assurbanipal. II GGXG III J.

(20) u mtug-dam-me-i sar vnman - man-da-tab-nit ti - amat tam- sil d "galle" (21) a-nala e-pes an-ni la ha-ti - emi- sir mati- jani-i "silanimes" (22) i-mis la ik-kud - mazi- kir-ka kab-tu sa digigi "utakku" (23) a-na sur-bi - ibelu - ti- ka u da- na- an i-lu -ti -ka (......) (24) ki-i- sipri ilu -ti -ka -sa tas -pu -raum -ma u-sap- pah- pah il- lat- "su - - ......." il-lat "mtug -dam-me-i ...."
(25) msa- an- maskani ( ? ) m-su is -ku- nu a-s (a-?) kip -?- (26) as-mema at-ta- id dmarduk kar-du

وە هینی تر بەم جۆرە لێك دراوەتەوە :

« وتوگدامه پادشای ئومان ماندا ، نـەوەی تیامات ، نیگاری (ئیبلیس)
ـ شەیتان ـ ی ریسوا کرد ، هیچ گوناهێکی بـەرامبـەر بـە کیشوەری من
نەکردوە ، سوێند بە (خواکان) (؟) وترسان لـە ناوی خاوەن رێزی تۆ کـە
(٠٠٠٠٠٠) ئیگـی گان (خواوەندی ئاسـمانی ئی٠ د) زۆر بـەرێز بوو ،
(خواوەندی مردوك ٠ئی٠ د) فـەرمانڕەوایی و هێزو خواوەندی تۆ (٠٠٠٠٠)
بە پێ نێردراوی خواوەندی تۆ ( دەنگی٠ ئی٠ د ) کە تۆ لەگەل ئەم جۆرە
راسپاردانەدا ناردوتە ، مـن لـێی دەر ئـەچم (هێزی ئەو ( ؟ ) ٠٠٠٠٠٠
سانداکشاترو کە ئەوان لە جێگای ئەو دایان نا (؟) من ئەمەم بیستو ٠٠٠
مردوك و ٠٠٠ پالەوان » ٠٠٠٠ تاد ٠

ئەگەر بەم جۆرە بخوێندرێتەوە یەك دەست مانا دار نابێ ٠

٢١٣ ـ تەماشای نوسراوەی AVIU ژمارە ٧٧ لاپەڕە ٢٤٢ بکە بە
مێژوی ٦٥٥ یان سەرەتای ٦٥٤ ی پێش زاینی یە ٠

٢١٤ ـ I Strabo ' ٣، ٢١، ئاسـترابون سـەرکـەوتن بـەسـەر
پێشەواکانی ترریەکاندا بە هینی مادەکان دائـەنێ ، (کـە لەویدا بە هەڵـە
«کیمری» ناو براوە) وە ئەمە بەڕای زوربە هەڵە کردنێکە چونکـە بێ گومان
ئەبێ باسی سەرکەوتنی ئەسکیتەکان بکرێ بەسـەر کیمریەکانا ٠٠ وە لـە
سەردەمێکدا کـە تەنیـا ترریـەکان هـاو پـەیمـانی کیمریەکان بون (وەکو
نوسینەکانی لمان ـ هائوپت کە بەم جۆرەیە :

Pauly-Wissowa, S. V. kimmerier.

ئەبوا قەلاچۆ کردنی کیمریەکان بە دەستی مادەکان لـە دوای سـالی ٦٤٥
( واتا لە دوای ئەوەی کە جاری دووەم سارديان داگیر کردەوە ) بوایە ،بەلام
رەنگە بێ لەوانە بێ کە بگرەو بەردەکە زوتر بو بێت ٠

٢١٥ ـ بەو شێوەی کە لە AVIU (ژمارە ٧٣ پەراوێزی ١٣) دا
دیاری کراوە بەم جۆرە خوێندنەوەی « ئاندریا » سـەرۆکی ناوچـەی لوبدو

خەتای بە هەڵە خوێندنەوەی چ ئاسمیت بوە ٠

٢١٦ ـ رەنگە بێ یەکێتی نێوان ئەسکیتو لیدیەکان کە لە لایەن کیمریەکانەوە تالان کران لەو سەردەمەدا بوبێت ٠

٢١٧ ـ ئاکاد میسین و٠ و٠ ئاستروەوە میژوەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینی لە نوسینەکانی هرودوت دا ، لاپەڕە ٦٥ ٠

٢١٨ ـ ئەستونەکەی راسام ، III ، ١٠٦ـ٩٦ ٠

٢١٩ ـ باب ـ سالی متی کەوتۆتە ئاوەرێژگەی فوراتەوە ، شوێنی عقبە نازانرێ (لەگەل عقبەی ئیستادا لە کەناری دەریای سور بە هیچ جۆرێك یەك نین) ٠

٢٢٠ ـ لاپەڕە ccxcIII بە دواوە Assurbanipal, 1

٢٢١ ـ هەمان جێگا لاپەڕە cccl xI, ccxcIv بە دواوە ٠

٢٢٢ ـ هەمان جێگا لاپەڕە cclxxIx ئاشکرایە کە لێرەدا مەسەلەکە باسی میسر ئەکات ٠

٢٢٣ ـ ئی٠ م٠ دیاکونوف ،دوا سالەکانی دەولەتی ئورارتو لاپەڕە ٣٥ ٠

٢٢٤ ـ هەروەکو باسکرا چاپاران روسای دوەم لەگەل نامەی ئاشت بونەوەدا لە ٦٥٤ دا چونە ناو ئاشورەوە ، لە بارەی دوژمنایەتی ئاشورەوە لەگەل ئورارتو تا سەردەمی پەیوەندی بەستنی تازەی ساردوری سێیەم لە دەوروبەری ٦٣٩ دا هیچ جۆرە سەرچاوەیەکمان بە دەستەوە نیە AVIU ژمارەکانی ٧٢ ، ٧٩ ، ٢٣٧ ، ٢٤٤ـ٢٤٣ ٠

٢٢٥ ـ بە پێچەوانەی بیروڕای ئولمستد پارس نەء (ئیران)

(A. T. E. Olmstead, History of the per
(sian Empire, Ghicago, 1948 لاپەڕە ٣١

٢٢٦ ـ بۆ جیا کردنەوە لە بابلیەکان کە هرودوت ئەوانی بە (ئاشوری) ناو بردوە ٠

٢٢٧ ـ واتا نەینەوا

Pauly-wissowa, S.V. kimmerier ـ ٢٢٨

لەگەل ئەوەدا نزیکە کە ئێمە لە ئولمستدی هەست پێ ئەکەین ٠

٢٢٩ ـ راستە کە بە پێی نوسینەکەی هرودوت لە نێوان لەشکرکەشیەکانا بە بێ سەرکەوتنی فرائورت‌و یەکەمین شەڕی کیاکسار لەگەل ئاشور زنجیرە روداوێکی تر روی داوە بەلام وەکو بەرچاو ئەکەوێ باسی روداوەکان‌و میژوی سەردەمیان و رۆژگاری دەولەتی کیاکسار لە نووسینەکانی هرودوت‌دا بە تەواوی ئالۆزە ٠

٢٣٠ ـ رەنگە بێ مانای ئەمە بەم جۆرە بێ کە ئەو کوڕی بچوك بووە و برا گەورەکانی بەر لەو کوژرا بن ، وە بە پێی ریکەوتنی باوکیان ٠٠ لە میژوی هەر زنجیرەیەکدا ئەم جۆرە میرات گریە هەیە ، ئەگەر هەمان سەردەم بێنینە بەرچاو هیزکیە لە تەمەنی ٥٤ سالیدا لە دوای ٢٩ سال حوکمڕەوایی کۆچی دوایی کردوە (٦٩٥ـ٧٣٣ی پێش زاینی) وە لە دوای ئەو مناشەی کوڕی کە لە تەمەنی ١٢ سالانەییدا چوەتە سەر تەخت ٥٥ سال حوکمڕەوایی کردوە ( ٦٤٠ـ٦٩٤ی پێش زاینی ) رەنگە بێ کە کیاکسار کوڕی خشاتریتا ـ فرائورت نەبوە (لە نوسینەکانی هرودوت دا بەم جۆرە ناسراوە) بەلام نەوەی ئەو بووە ، لەبەر ئەمە رێی تێ ئەچێ کە زنجیرەی پادشایانی ماد ـکە هرودوت نوسیویەتەوە تا رادەیەك دەسکرد بێ ٠

٢٣١ ـ یوستی II ، ٢) ئەویش بەم جۆرە ئەلێ ،وا دێتە بەرچاو باس‌و بەسەرهاتێک کە بە باس‌و بەسەرهاتی ئەسکیتەکان کۆتایی پێ دێت گێرابێتیەوە ٠

٢٣٢ ـ رەنگە بێ ئورارتو بەم هۆیەوە لە سالانی سیەکانی سەدەی حەوتەمی پێش زاینیدا بە مەبەستی دۆستایەتی‌و یارمەتی ئاشور بۆ بەرابەری پادشایانی ئورارتو ناسرابێ ٠٠ تەماشای AVIU ژمارەکانی ٧٢و

٧٩ بکه ٠

٢٣٣ ـ هرودوت لەم روەوە رای ئەگەیەنێ ( I ، ١٠٥) سەرچاوە کۆنە شوناسیەکانو نامە جوگرافیاییەکان ئەوانیش لایەنگری ئەم وتەیەن٠٠ ب٠ ب٠ پیوطروسکی ، میژوو فەرهەنگی ئورارتو لە لاپەرە ٣٠٢ بە دواوە ٠

٢٣٤ ـ هرودوت I ، ٧٢ ٠

٢٣٥ ـ ب٠ب٠ پیوطروسکی بۆ ئێمەی رون کردۆتەوە ئەو تیرانەی کە نوکە کانیان ئەسکیتی‌یە کە لە ئیسقانی دەشت نشینەکان دروست کراوە لە تیرەکانی کیشوەرەکانی رۆژ هەلاتی کۆن کە نوکدار بون کاریگەر تر بون ٠٠ ئەو نوکە تیرانەی دوایی لە سیلکس دروست ئەکران ٠ بەم هۆیەوە تیری ئەسکیتەکان بە گورجی لە ناو هۆزەکانی ناوچەکانی رۆژهەلاتدا باوی پەیدا کرد ٠

٢٣٦ ـ هرودوت I ، ٧٣

٢٣٧ ـ هرودوت IV ، ٤ـ١ ، ١١٩ـ١١٨ وە هینی تر ٠

٢٣٨ ـ نوسینە گرنگەکەی سولیمینسکی درەنگ بە دەستم گەیشت و نەمتوانی سودی لێ وەربگرم ٠

(T. Sulimirski, Scythian Antiquities in western Asia, Artibus. (Asia XVII, 314 لاپەرە ٢٨٢ بە دواوە ٠

ئەوەی نوسەری ناوبراو بەرهەمی هێناوە لەگەل زوربەی باسەکانی ئێمەدا یەك ئەگرنەوە ، بەلام ئەو میژوی پەیدا بونی ئەسکیتەکان لە ئاسیای نزیكدا زۆر بە کۆن ئەزانێ ٠

# پەراوێزی بەشی چوارەم

١ ــ بەم هۆیەوە زوربەی لێکۆڵەرەوەکان یەکەمین گەمارۆ دانی نەینەواو پەلاماری ئەسکیتەکان لە سالی ٦٢٥ دائەنێن واتا سەردەمێك كە سەرچاوەكان رونیان نەكردۆتەوە ٠

٢ ــ تەماشای

E. F. weidner, Die alteste Nachricht uber das persische-konigshaus, AFO, VII. I

بە دواوە بکە ٠ کە بە پێی ئەو نوسینە کورشی یەکەم پادشای پرسید (پارس) بە پێی رێکەوتن لەگەل پادشای ناوچەی رۆژ هەلاتی عیلام خودیمریو هاورێکانی دیاری بۆ ئاشور باناپال ناردوە بە بۆنەی سەرکەوتنیەوە بەسەر عیلامدا ، ئەوە دەرکەوتوە کە هەندێك لە پادشایانو خانەدانەکانی هەخامەنشیەکان لە ناوچەی رۆژ هەلاتی عیلامدا کە ناوی ئانزان یان ئاتشان بوە دەسەلاتدار بون ٠٠ وە بە شێکی تر لە خودی پارس (پرسید) بون ٠٠ نوسینی ویسباخ ٠

ئەویش گیشوەرێکی بە ناوی (ئانچان) لە بەردەکەی بێستونەوە باسی کردوە ٠٠ بەلام ئەبێ ئەوە بزانین کە زاراوەی (ئانچان بەشێك بووە لە ناوە جوگرافیاییەکان وەکو ئوممان ماندا ، گوتیومو ، خاتی ، ئامورو ، ماگانو ، ملوخە ، سوبارتو ، چەندانی تر ٠٠ لەم روەوە نوسراوە بابلیەکان زاراوەی

(ئانچان) به ناوچەیەکی عیلام دائەنین ٠٠ له زاراوەی عیلامیەکانا تەنانەت له هەزارەی یەکەمی پێشی زاینی دا ناوچەیەك لـه عیلام به ناوی ( ئانچان )ەوه بووه ٠لەو سەردەمەدا کە کورش لە (بیانیه) خۆی بە پادشای (ئانچان) دائەنا٠

٣ ــ بەم هۆیەوه ئاشیل تراجیدی نوسی گەورەی یۆنان کیاکسار بــه دامەزرێنەری دەولـەت دائەنێ کـه حوکمی ئاسیای کردبێ ٠ لێکۆڵینـەوەی کورتی مێژوی مادو پارس ئاشیل لـه زمـانی داریوشی یەکەمەوه ــ له دوای شکستی لەشکرەکەی خشایارشـا لـه یۆنان ــ ئەگێڕێتەوه ، ئەمـه ئـەوه ئەسەلمێنێ کە نزیکەی نیو سـەدەی کۆن تر لـه سەردەمی نوسینی مێژوی هرودوت زۆر بایەخی پێ دراوه ٠٠ وه ئێمه هەروەکو خۆی ئەی نوسینەوه :

( پادشای زوس ئەم شانازیەی بەکەم زانیوه که پیاوێك حوکمی ئاسیا بکات، چونکه پیاوێکی مادی یـــەکەمین سەرداری لـەشکر بوه ، کوڕی ئـەو کـه ئیشەکەی تەواو کرد ٠٠٠ له دوای ئەو کورش دەسەلاتی گرته دەست کـه پیاوێکی بەختیار بوو هـەمو دۆستەکانی ئاشت کردەوه ، هۆزەکانی لیدیو فریجیەی هێنایه ژێر دەست ، هەمو یونیەی بە تالانی برد ، خواوەند لەگەلیا ناڕێك نەبو چونکه پیاوێکی ژیر بوو ، کوڕی کورش چوارەمین کـەسێك بوو که سەرکردەیی لەشکری ئەکرد ، وه پێنجەمین پیاوێك بووه کـه پادشایانی دەوروبەری لەناو بردوه ٠

٥ ــ tele تیپه لەشکرێکه له ریزێکی تایبەتیو دیاریکراوا

٦ ــ

Touste aikhmophorouskai tous toksophorous kaitous hippeas.

مەبەست له aikhmophoros لەشکریه چەك قورسەکانه کە چەکەکانیان بریتی بووه له نێزەی جەنگی نەك نوکه نیزه toksophoros واتا کەماندار ،وه ئاشکرایه کە ئەو پیادەیەکی چەك سـوك بووه ، بـەلام hippes

ئەبێ سوارە بێ هەرچەند لە هەندێک کاتا بە عارەبانە لێخوڕیش ئەوترێ ٠

٧ ـ مێژوەکانی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی کیاکسار کە لە هرودوت بەجیماوە هەموی ناراستە ٠ یەکەم نازانرێ کە ٤٠ سال سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەو لە بەرواری کۆچی دوایی فرائورتەوە حیساب کراوە یان لە سەردەمی دەرکردنی ئەسکیتەکانەوە ٠٠ هرودوت لەو باوەڕەدایە کە کیاکسار لە پێشا لەگەل لیدیەکان کەوتۆتە شەڕەوە دوای ئەوە بۆ یەکەمین جار گەمارۆی نەینەوای داوە ، وە بە هۆی پەلامار بردنی ئەسکیتەکانەوە وازی لە گەمارۆ دانەکە هێنا ٠٠ ئەو هۆی شەڕەکەی لەگەل لیدیەکانا بە لەناو بردنی ئەسکیتەکان دائەنێ لە لایەن کیاکسارەوە ٠ هرودوت ئەم جیاوازیەی دەربڕیوە ، لەبەر ئەوە نازانرێ ئایا ئەوانە هەمان ئەسکیتن کەلە بەشی یەکەمدا قسەیان لە بارەوە کراوە یان ئەو ئەسکیتانەی ترن کە بەر لە پەلامار بردنی ئەسکیتەکان هاتونەتە ناو مادەوە ٠ جگە لەوەش لێکدانی لیدیو ماد لەو رۆژگارەدا (بەر لە لەناو چوونی ئاشور) بە دەگمەن بەرچاو ئەکەوێ ٠٠ بەرواری ئەم لێکدانە وەکو دەرکەوتووە لە سالی ٥٩٠ ی پێش زاینی دا بووە ٠ لەم روەوە نوسینەکانی هرودوت هەڵەی تیایە ٠٠ لە زوربەی روداوەکانا بەرواری ٢٥ سال پێشتر داناوە ٠٠ ئاکادمیسین و٠ و٠ ئاستروو لە مێژوی روداوەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاینیدا نوسینی هرودوت VDI ١٩٥٢ ژمارە ٢ لاپەڕە ٦٠ بە دواوە تەماشا بکە ٠

٨ ـ رەنگە بێ باسکردنی جەنگی کیاکسار کوڕی ئاستیاگ لە دژی ئاشور کە لەشکرەکەی لەژێر دەسەڵاتی کورشی دووەمدا بووە لە سەردەمی کزنفون (کورشنامە) بەشێك بو بێت لە شەڕی کیاکسار دژی ئاشور ٠٠ بەڵام کورشنامە باسی دلێری کورشی یەکەم هاوچەرخی کیاکسار ئەکات ٠

F. W. konig, Alteste Geschichte der perser und meder. Der A. O. XXXIII 3/4.

لاپەڕە ٣٧
ـهیچ پایەو بنچینەیەکی نیە ، ئەوەی کە کزنفون تا چ رادەیەك لـە بـارەی میژوی مادەوە بێ ئاگا بووە ، گەلێك هەوالی هەلە لە بارەی لە ناو بردنی شارەکانی ئاشورەوە (کە ئەو ولاتی ناوبراوی بە ناوچەی ماد ناو بردوە) وە لە ئاناباسیس‌دا xen.onab,III,4,7-12 نوسراوە ٠٠ قسەکانی کزنفون لە بارەی هاوکارەکانی مادەوە لەو شەڕەدا هیچ بایەخێکی نیە ٠ وەکو ئەلێ هیرکانیەکان کە دراوسێی ئاشور بون لەو شەڕەدا لایەنی مادەکانیان گرتوە، ئەمە ئەبێ چ ئەهمیەت‌و بایەخێکی هەبێ ؟ چونکە هیرکانی کیشوەرێک بوە لە کەناری دەریای کاسپی (خزر) لە سنوری ئیستای تورکمانستان‌و ئیران واتا ژوروی رۆژهەلاتی ماد ٠٠ وە لەگەل ئەوەدا ئاشور لـە خواروی رۆژ ئـاوای ئەو ناوچەیەوە بووە ٠ ئەو هەوالەی ئەو لە بارەی بەشداری کردنی ئەرمەنی‌و کادوسی‌و سکاییەکانەوە بە قازانجی کیاکسار نوسیویێتی ئەویش هیچ جۆرە بایەخێکی نیە ٠

٩ ـ کتێبی ناحوم پێغەمبەر 111 ' ١٧ـ١٦ : « تو ـ ئاشـور ـ یاوەرەکانت rokel لـە ئەستێرەکانی ئاسـمان زۆر تر کرد ، وەکو پەپولـە ئـەڕفن ، تاجـدارانی تۆ nozer وەکو کولـە وانـەد کـار گوزارەکانت ، نوسەرەکانت tapsar کە هەمان tupsarru ی ئاکادین وەکو کولە وەهانە کە لە رۆژی ساردا دێنـە روی دیوارەکان‌و لـە گـەرمادا خۆیان ون ئەکەن ٠٠ بیشەی شێران‌و میرغوزاری شێران کوانێ کـە شیری نێرومێ بەچکە شێری تیا بو ٠ شێری نێر بۆ پێویستی سکی بـەچکەکانی خۆی هەل ئەدری‌و لە شێرە مێیەکەی ئەشاردەوەو کون‌و کەلەبەری خۆی پڕ ئـەکرد لـە نێچیر ٠٠ بـەلام ئیسـتا یهوە حبـایوت ئـەلـێ من دژی تۆم وعارەبانەکانیشت بە دوکەل ئەسوتێنم شمشیری شێرەکانی تۆ لە ناو ئەبات ،ئیتر ماوەی راو کردنت ناداتێ ٠٠ ئای لەو شارە خوێن رێژە کـە پڕە لـە

درۆو کوشتار ۰۰ » ۰

۱۰ ــ لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك لــە هۆزە ئارامیەکان یان عەرەبستانی خوارو کە لە کۆتایی هــەزارەی دووەمی پێش زاینی دا لــە سنوری بابــل نیشتەجێ بوبون بە کلدانی (kasdukaldu) یان پێ ئەوتن ۰۰ پیاو گەورانی ئەم کۆمەڵانە لە سەدەکانی نۆیەم‌و هەشتەمی پێش زاینی دا لە روی شارستانیتیەوە وەکو بابلیەکان وابون ۰

۱۱ ــ هەروەکو لەمەوبەر ئەیان وت کە کندلانو هەمان (ئاشورباناپال)ە ئیستا گومانی لێ پەیدا کراوە ۰

۱۲ ــ پارچە نوسراوێك لە نیپسور کە هینی سەردەمی دەسەڵاتی ئەوە بە دەستەوە یە : (A. I. Glay, BE, VII,I, 1908, No. 141).

۱۳ ـ sarakos بە هەڵە لە جێگای (sariskun) sariskos دانراوە

۱٤ ــ نوسراوەی لای خوارەوە کە هینی سەردەمی دەسەڵاتداریتی ئەوە بە دەستەوەیە ۰ بە میژوی یەکەمی ئایاری سالی دووەم لــە سیپار ،۲، ۲٥ سیمان سالی دوەم لە سیپار ،۳، ۱۲ تبت سالی حەوتەم لە ئوروك ،هەروەکو لە سالی ٦۱٦ دا ئاشوری لە بابل دانەبون دوایی سەرەتای دەسەڵاتی سین شاری شکون ناتوانین بە سالی ٦۲۳ دابنێین ــ بەرای زوربــە ســالی ٦۲٥ بووە ۰ وە لەبەر ئەمە ئەو بەروارانەی باســکران هینی ٦۲٤ (٦۲۲) و ٦۱۹ (٦۱۷ بون ۰

۱٥ ــ نابوپالاسار لە سالی ٦۰٥/۰٤ لــە دنیا دەرچوە مــاوەی بیست سال حوکمی کرد ، کۆنترین سەنەدی سەردەمی دەســەڵاتداریتی ئــەو بــە میژوی ئایار (ئاوریل ــ مە) سالی ۲۱ ئەگرێتەوە ، لە (ژوین ــ ژویە) نابو خودو نوسور (بخت النصر) حوکمڕەوا بووە ، بــە پــێی یاســای بطلمیوس نابوپالاسار ۲۱ ســال سەڵتەنــەتی کــردوە وە بــە قســەی یوســوی ۲۰ سال بوە ۰

١٦ ـ نوسینی یوسوی ( I ٣٦ ، ٣٧ ، ٣٨ ، ١٠) بـه قسـەی ئاییدن ـكەلە ئەلكساندەر پولی گیستوری وەرگرتوه ـ ئەویش لە بروسی وەرگرتوه کە لە نوسینی (موسی خورنی) شدا دیسان دەر ئەکەوێ ٠

١٧ ـ نوسینی سینکل ( B ٢١٠ کە لە ئەنجاما بە بروس کۆتایی پێ دێ ـ وە رەنگە بێ وەکو پێویست لێی تێ نەگەیشتبن) ٠

١٨ ـ NBKI لاپەڕە ٦٦ ، ژمارە ٤ ، لاپەڕە ٤

١٩ ـ نوسینی ئەرمـەنی یوسوی لـە روی نوسینەکانی ئـەلکساندەر پولی گیستورو ئاییدن (کە ئەلکساندەریش سودی لێ وەرگرتوە ، لە بروس ئەمەی وەر گرتوە) بەڵام ئەم سەرچاوەیە لە جیاتی کیاکسار (ئاژدەهاکی) بـە پێی باس‌و بەسەرهاتە زەڕدەشتیەکان ناو بردوە ٠ ئەم ناوە بەلای ئەرمەنیە کۆنەکانەوە پیاوێکی گەورەی مادەکان بووە٠٠،لە نوسراوەی کۆنی ئەرمەنیەکانا (ئەژدەهاك) (ئاستیاگ)ی ناسراوە ، وە ئەمە شتێکی رێکەوتە وە بـە پێی بەکار هێنانی شێوەی فۆنەتیکی ناوەکانەوەیە کە لە یەکترەوە نزیکن وە لەگەل واقیع دا ناگونجێن ٠٠ بە تەواوی نازانرێ کە لە نوسینەکانی بروسی دا لەم بارەیەوە بە ئاستیاگ ناوی بردوە یان کیاکسار ٠

٢٠ ـ سینکل ئەوی بـە Amuite کـە لـە نوسینەکانی یوسوی ئەرمەنی دا بە amuhean ناو براوە ، ناو بردوە ٠٠ پاشبەندی ean کە بە تایبەتی هینی ناوی خانەدانەکانە بە هۆی پاشگری یۆنانی itis بەکار هێنراوە ٠ بەم جۆرە ئەبێ ناوی ئـەو بـە Amuitis بـەکـار بهێنرێ ٠٠

٢١ ـ وە نەبێ بەر لە ساڵی ٦١٩ بو بێ ، تەماشای پـەراوێزی ١٤ی هەمان بەش بکە ٠

٢٢ ـ هرودوت لە بارەی دەستێوەردانی ئەسکیتەکانەوە لـەناو شەڕی نێوان ئاشورو مادەکانا لە کاتی دووەمین گـەمارۆ دانی نەینەوا کە کیاکسار

کردی باس ئەکات : (دوای سەرکەوتن بە سەر ئاشوریەکانا کیاکسار شاری نەینەوای گەمارۆ دا ۰۰۰) « لە شکری ئەسکیتەکان پـەیدا بون ، مادەکان لەگەل ئەسکیتەکانا کەوتنە شەڕەوە ، بەلام تێ شکان » ماوەی ۲۸ سـال ئەسکیتەکان حوکمی ئاسیایان کرد ۰۰ بەلام ئەو وێران بونی نەینەوا بـە هینی سەردەمێك ئەزانێ کە دەسەلاتی ئەسکیتەکان سەرەولێژ بو بۆوە ۰۰ کیاکسارو مادەکان (ئەسکیتەکانیان) بـە میوان دائـەناو کوشتنیان ، بـەم جۆرە سەلتەنەتەکەی خۆیان رزگار کرد ، وە ئەوەی لەوەبەر بویان هەمویان هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە ، نەینەوایان داگیر کردو ئاشـوریان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە ۰۰ بروس بە هیچ جۆرێك باسی ئەسکیتەکان ناکات بەلام کتسیاس ئەلێ باکتریاییەکان کـە هاو پەیمانی ئاشور بون وازیان لـە مادەکان هێناو چونە پال ئەوانەوە ئەگەر ئەو باکتریایەی لێرەدا باسکراوە بە ئەسکیت دابنێین ئەمە بە تەواوی پێچەوانەی واقیعی باسەکە ئەبێ ۰۰ ( وە تەنانەت ئەو یەکێتی‌یەی کتسیاس باسی لێوە ئـەکات لـەروی مێژویی‌یەوە بێ بایەخە ) ۰۰

۲۳ ـ وەکو باو بوە چەند بەشێکی وەك Zeph ' I ' ۱۱ـ۱٤ ، ۷ بەهینی ئێرە ئەزانرێ (بەلام ئەم غەیب زانیە رەنگە بێ هینی لەشکر کـەشیە کانـی نابوخود نوسوریش بێ) وە هەروەها بە تایبەتی کتێبەکەی ئـەرمیا پێغەمبەر « خواوەند ئەلێ : ئەی خانەدان من نەوەیەك لە دور بۆ ئێوە دێنم ، کە زۆر کۆنن‌و زۆر دارن ، کـە زمانیان نازانن ، لـە قسـەیان تێ ناگـەن ، نانی منالەکانتان بە زۆر ئەخۆن ، گاو مـەڕو مالاتەکانتان لێ ئـەسێنن ، ترێ‌و هەنجیرەکانتان ئـەخۆن ، ئەو شارانەی کـە شورات بـە دەوریانا کێشـاوەو پشتیان پێ ئەبەستی هەموی بە زەبری شمشیر وێران ئەکەن ، بەلام خواوەند ئەلێ لەو رۆژەدا ئێوە هـەموتان نافـەوتێنم » ئەوانـە هۆزێکی ستەمکارن

کەمانو نێزەیان بە دەستەوەیە هیچ بە زەییان لە دلا نیە ، سـواری ئەسپ ئەبن و لە دژی تۆ خۆیان ڕێک ئەخەن ، تۆیش ڕو ئەکەیتە بیـابانو ترسی شمشێری ئەوانت هـەیـە ، پارچـەی دوەم هـەموی لە کتێبەکـەدا دو پارە کراوەتـەوە ·· بـەلام لێرەدا بـۆ مادەکان بـەکار هێنراوە ، ئـەوانی بـە ئەسکیت زانیوە ·

٢٤ _ Her ‘ II ‘ 127 بە قسەی هرودوت ئەو کەمارۆ دانە ٢٩ سـال درێژەی کێشا ، مانای ئەم قسەی ئەوەیە کە لە سەردەمی ئاشور بانا پال دا دەستی پێ کردوە (پسامتیخ لـە سالی ٦١٠ی پێش زاینی دا کۆچی دوایی کردوە) · بەلام لەوە ئەچێ ئەم ژمارەیە دەسکرد بێ ·

٢٥ ــ بە هۆی ئەو چارە سەر کردنە ئاینیانەوە کە ئەو لە سالی ٦٢٠ دا کردی شوێنە پیرۆزە کۆنەکان وێران کران وە لە ولاتەکانی تری ئاشوردا هەر بەو جۆرەی کرد · وە لە دواییدا (لە سالی ٦٠٧) لەگەل فیرعون نخوی دووەم لە خاکی پێشووی ئاشوردا کەوتە شەڕەوە ·

(II Reg., XXIII 29 E. Forrer, Die provin Zeinteilung des assyrischen Reiches, Leipzig, 1920).

٢٦ ــ قسەکانی ئەرمیا سـالی ٦٠٤ ( کتێبەکـەی ئەرمیـا پێغـەمبەر XXV ٢٢ ) ·

٢٧ ــ ئەتوانین بە هۆی ئـەوەوە کـە ساردوری سێیەم فـەرمانڕەوای پیشوتر ئاشوز باناپالی لە سەرەتای سالی سیەکانی سەدەی حەوتەما ناسیبێ، وە هەروەها لە بارەی ئوزارتوو بەکار هێنرا بێ ·

٢٨ ــ لە بارەی لەناو بردنی ئاشـورەوە کتێبـەکانی زوفونی (صفنیـا پێغەمبەر) ١٥_١٣ (Zeph, II و ناحوم (Nahum, II-111 ) تەماشا بکە ·

٢٩ ــ تەماشای :

O. J. Gadd, The Fall of Nineveh, London ‘ 1923, B. Land-

sbergerund th. Bauer, ZA, NF, § 3

لاپەڕە ٨٠ بە دواوە بکە ٠

ئی٠ م٠ دیاکونوف دوا سالەکانی دەوڵەتی ئورارتو AVIU ژمارە ٨١ لاپەڕە ٢٤٤ بە دواوە ، بەر لە دۆزینەوەی سالنامە نوسراوەکان باس‌و بەسەرهاتی لەناو چونی ئاشور بە پێی باسە نوسراوەکانی نوسەرە یۆنانی‌و عیبری‌یەکان کە ئەوانیشی ئەوەندە جێگای باوەڕ نەبون ئەنوسرانەوە ، لەم بارەیەوە گەلێك نوسراوەی جۆربەجۆرو هەمە رەنگ هەیە ٠

لەم روەوە باشترین و راسترین باسی روداوەکان لەناو کتیبەکەی ئاشترك دایە کە پێی ئەڵێن "Assrbani pal, I" لاپەڕە CDV بە دواوە ٠

٣٠ ـ نابوپالاسار لە سالی ٦١٦ دا دودڵ بو کە ناوچەی هیندانا کە لە سەر فورات بو ، لە خواروی ئاوەرێژگەی روبارە کانەوە بگرێتە ژێر دەستی خۆی یان نەء ، وە چونکە پشتی بە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە نەئەبەست لە کاتی کشانەوەی خۆیا ئەوانی لەگەل خۆیا برد بۆ لای خوارەوە ، بەلام ناوچەی سوخو کە ئانات مەڵبەندەکەی بوو ،وە نەختێك لە خوار ترەوە بو لە ژێر دەستیا هەر مایەوە ٠

٣١ ـ ناوی کیاکسار لەم رستەیەدا نیە ، شێوەی نوسینەوەی ئەم رستەیە لە نوسینێکی ئی٠ م٠ دیاکونوف دا بە ناونیشانی (دوا سالەکانی دەولەتی ئورارتو) وەکو نوسراوە پشتی پێ نابەستریَ ٠٠ لە باسی ئەو روداوەدا کیاکسار بە ناوی umakistar وە یان وەکو چۆن لە بابلی تازەدا ئەخوێندرایەوە uvakhistar یان پێ ئەوت ٠٠

٣٢ ـ ئەگەر کیاکسار کوری (فرائورت) بێ کە لە سالی ٦٥٢ دا کوژراوە ، کەوابو لە سالی ٦١٥ دا پیاوێکی کامل بوبێ ٠٠ بەم هۆیەوە رەنگ بێ نابو پالاسار وەکو لە نوسینەکانی یوسوی دا دەر ئەکەوێ کچە

کەی کیاکساری بۆ کوڕەکەی خۆی نەهێناوە بەڵکو کچی ئاستیاگی بۆ هێناوە ٠٠ کە لە نەوەی کیاکسارە ٠ بە پێی نوسینەکانی بروس کە لە نوسینەکانی یوسف فلاویەشدا هەیە باخچە هەلوسراوەکانی بابل بە فەرمانی نابوخود نوسور وە لە بەر خاتری ژنەکەی کە لە مادەکان بوە دروست کراوە٠٠ چونکە ژنەکەی ئەیویست هەمو دیمەنەکان وەکو ئەو ناوچەیە وابن کە تیایا ژیاوە ٠٠ تەماشای :

A. koldwey, Das wider ersthende Babylon, Leipzig, 1913

لە لاپەڕە ٩٠ بە دواوە بکە ٠

٣٣ ـ Diod., II, 24-28.

٣٣ ـ (دوبارە) ٠٠ کتێبەکەی ناحوم لە بارەی پادشای ئاشورو باری ناوخۆی نەینەوا : (عارەبانەکانیان لە کۆڵانەکانا بە توندی لێ ئەخوڕی ، لە هەر چوار لاوە تێکەڵاو ئەبون ، خۆ نواندنیان ئاگراوی بو ، وەکو پزیسك ئەڕۆیشتن ، ئەمە شەڕی ئوران دێنێتەوە یاد ، لە ڕێگا ڕۆیشتنا ئەلەرزن ، بەرەبەرە روەو شوراکە دێن (واتا بۆ ناو شاری نەینەوا) ٠٠ مەنجەنیقی ئاگر خەرەوەیان ساز ئەکرد) ٠

٣٤ ـ ئەگەر ئەم کارە کە لە سالی ٦١٢ دا لە ( میژوی روداوی گد ) پادشایی ماد لە جیاتی «مادای» بە ناوی «ئوممان ـ ماندا» وە کە مەفهومێکی فراوانی هەبوە بەکار بهێنرابایە ، لەوانە بو کە ئەوان سەرگەرمی داگیر کردنی پادشایەتی ئەسکیتەکان بون ، بەلاّم زۆر تر لەوە ئەچێ کە «مادای»و «ئوممان ـ ماندا» دو ناوی دەوڵەتی یەك حکومەت بووبن ٠

٣٥ ـ بۆ ساغ کردنەوەی ئەوە تەماشای ئی٠ م٠ دیاکونوف دوا سالەکانی دەوڵەتی ئورارتو لاپەڕە ٣٧ـ٣٦ بکە ٠

٣٦ ـ بەراورد کردنی لەگەل ئەسڵەکەدا وا نیشان ئەدا کە بەم جۆرە بخوێندرێتەوە :

Sar Akkadi (ki)ummânatemes - suıd-ke-(e-ma

mu-ma-)ki (s-t) ars Umman-man-daanatar-si sar Akkadiki

« پادشای ئاکاد لەشکریەکانی خۆی کۆ کردەوە ، وە کیاکسار پادشای ئوممان ماندا چو بە پیری پادشای ئاکادەوە ، ... لەبەر ئەمە هیچ گومانی تیا نیە کە پادشای «ئوممان – ماندا» کیاکسارە .. بەلاَم وایزمان ئەمە بە جۆرێکی تر لێك ئەداتەوە .

٣٧ – لە کتێبەکەی ناحوم دا لەم روەوە باس نەکراوە (دەروازەی روبارەکان کراوەیە ، لە واقیع دا روبارە ، کۆشکەکە ئاو بردویەتی ، ئەو ، واتا خواوەند بە لافاوێك شوێنەکەی لە ناو ئەبات ، مەبەست لە نەینەوایە ، ئەبێ بووترێ کە ئەم تەرجەمەیە لێرەدا پشتی پێ نابەسترێ ، کتێبەکەی ئەرمیا پێغەمبەر ، ئەویش کە دوا رۆژی نەینەوای لێك داوەتەوە لەم روەوە ئەلێ : دەریا هاتۆتە سەر بابلو داویەتیە بەر شەپۆل ،.... ئەم لیکچواندنە لە میژوی لە ناو چونی نەینەوا وەرگیراوە ، لە واقیع دا بارو چونیتی لەناو چونی بابل کە لە دوای سەردەمی ئەرمیا پیغەمبەر بوە هەر بەم جۆرە بوە .. کتسیاس بە پێی قسەکانی دیودور ئەمە هەر بەم شێوەیە باس ئەکات ، ئەگەرچی کیاکسار لەگەل کورشدا لێی تێکت ئەچێ .. لەوە ئەچێ گەمارۆ کارەکان بەستی روباری خوشویان کە نەختیك لە خوار تری نەینەواوە بوە وێرانیان کردوە .

٣٨ – بروس لەم روەوە ئەگێرێتەوە (لە نوسینەکانی سینکلو یوسوی دا(وە هەروەها کتسیاس ، پادشای ئاشوریەکان ( ساردا ناپال ) بە ئاشور باناپال دا ئەنێ .. وە رەنگە بێ لە دێری ٤٤ی (میژوی روداوی گد) کە لە ناو چوە باسی ئەم روداوە کرا بێ .

٣٩ ـ كتێبەکەی ناحوم ٦ـ١ ،٧٨ ،١٠ ،١٥ـ١٣ ، ١٩ـ١٨ هیچ بەڵگەیەکمان نیە کە گومان بکەین کتێبی ناوبراو وشەی ( ئاشوری ) بەرەمزێک داناوە کە سەڵتەنەتی سلوکیە بگرێتەوە ٠٠

٤٠ ـ مەبەست پادشای ئاشوریەکانە

٤١ ـ بە گوێرەی بەکار هێنانی (سرودەکان)

٤٢ ـ نەینەوا

٤٣ ـ یان (کار کردنی بەرگری بە پێی رێکخستنی کاروباری جەنگی بنیات نرابێ) ٠

٤٤ ـ بە گوێرەی بەکار هێنانی قسە کردن «ئەتوێتەوە»

٤٥ ـ نەزانراوە kussab چی مانایەکی هەیە ، بەم بۆنەیەوە لەوە ئەچێ ، وەتوس تساب (شاژنی ئاشور) بە دیلی گیرا بێ یان روت کرابێتەوەو بە چیادا هەڵگەڕێندرابێ ٠٠٠٠ تاد ٠

٤٦ ـ kanit « نیزەی درێژی شەڕ کردن »

٤٧ ـ ئەم لێکچواندنە مەبەست نەینەوا بووە

٤٨ ـ نازناوی یهوە (Jahaws gba'ot)

٤٩ ـ فیو (تبس) کۆنە پایتەختی میسر ، کە لە سەردەمی ئاشور باناپال دا ئاشوریەکان وێرانیان کرد ٠

٥٠ ـ بۆ خشت دروست کردن ، بۆ ئەوەی شوراکە بەر لە وەی گەمارۆ بدرێ قایمتر بکرێ ٠

٥١ ـ تەماشای ئەو نیگارە کێشراوە بکە کە سوریاییەکان بە دیل لە خامات ئەبەن ـ بە هۆی لەشکرەکەی سالماناساری سێیەمەوە ـ

٥٢ ـ Diod. 11, 28.

٥٣ ـ هەروەکو شارەکانی ئاشور وەکو مەلبەندی پەلامار دراو وێران کرابون ، بە هۆی سەرچاوە کۆنە شوناسیەکانەوە ئەمە سەلمێندراوە ، وەکو

بەرچاو کە یاسای ئوسیریس لە میسر وەکو ئەمە نەبوە ، چونکە لـە یاسای ناوبراوا کرێی رۆژانە بەرامبەر بە زانیاریو تەڕدەستی جادوگەریانە ٠٠بوە٠

٨٤ ـ بۆ نمونە لە «گاتاکانی وهیشتو ـ ئیش تیش» (یسنای LIII ) کە باسی شو کردنی کچی زەردەشت ئەکات ، نوسینی (ئا٠ ئا٠ برتلس لـە گۆڤاری «واستوك» IV ، لاپەڕە ٩) کە زەردەشت لە دەست هـەژاریو بێ دارایی‌و خۆی سکالای کردوە ٠

٨٥ ـ نازناوی (کاوی) لە زۆر شوێنی ترا کەموزۆر بەو کەسانە دراوە کە لە ئاویستادا باس کراوە ، وە نوسینەکانی دواتر زنجیرەیەکی تازەیان بە ناوی کاویانیەکان یان کە یانیەکانەوە دروست کردوە ٠ ئەمە سەرنج رائەکێشی کەجێ نشینەکانی ویشتاسپا نازناوی (کاوی) یان نەبوە ٠

٨٦ـ

H. Guntet, uber die ahurischen und daevischen Ausdrucke im Awesta, sit zu ngsb. der Heide lberger Akademie der wiss., ph. - hist. klasse, 1914, No. 13.

٨٧ ـ یسنای XXXI ، ١٨ کە ئامۆژگاری تیا کراوە کافرەکان بـە چەك لەناو بەن ، یان یسنای XXXIII ٢ کەسێك بە زمان‌و بیرو دەست خراپە لەگەل کافرەکان دا بکات ٠٠ ئـەوە بـە ئارەزوی ئاهورا مزدا کـاری کردوە ٠ یسنای XXX ٦ (زاراوەی dvar ) و ٠٠٠٠٠ تاد ٠

٨٨ ـ ویدودات V ٣٥ بـە دواوە ، تەرمی لـە بیرو باوەڕ دەرچو پیس نیە ٠٠ ئەو لە سەردەمی ژیانیا پیس بووە ٠٠ یشت XVIII

٨٩ ـ ئاکادمیسین و٠و٠ ئاستروەوە ، زادەگای زەردەشتیەکان V ، SV ١٩٤٨ لاپەڕە ١٦ بە دواوە ٠

٩٠ ـ هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٧ بە دواوە W. B. Henning

٩١ ـ هەمان سەرچاوەو هەمان شوێن لاپەڕە ٤١

٩٢ ـ ئەگەر باوەڕ بـەوە بکـەین کـە موغەکان ئـەم ئامۆژگاریانەیان

هێناوه ئەبێ لەسەدەی شەشەمدا چاو لەوە بپوشین کە گاتاکان بـە شێوەی مێژویی نوسراونەتەوە ٠

٩٣ ـ بەڵام ئەگەر لە نوسینەکانی هرودوت دا ( 1 ، ١٠٧ بە دواوە) مێژوەکە هەڵە نەبێ هەرچۆن بێ گومان لەوە ئەکرێ کـە داستانەکەی ئـەو هەندێك لایەنگیری کردوە ، لەم روەوە پشتی پێ ئەبەسترێ ٠ ئەگەر ناوی فرائورت کە رەنگێ بێ لەگەل ئامۆژگاریە کانی زەردەشت دا پەیوەندی هەبێ، ئەتوانین بە وتەی هرودوت بـە هینی سـەدەی حـەوتەمی دابنێین ، مێژوی دەرکەوتنی ئامۆژگاریەکانی ئـەو ئەبێ لـە خاکی مادا بـە هینی سەردەمی کۆتایی سەدەی هەشتەمی دابنێین ٠ بەڵام لە سەدەی هەشتەمدا ، هەروەکو لەمەوبەر باس کراوە ، هەندێك یاسای (کوفرئامیز) هەیە ، کـە لـە مادی رۆژئاواو مەرکەزدا بەم جۆرە بوە ، وە ئـەم ناوە خۆی لـە واقیع دا هینی سەدەی شەشەمی پێش زایینیە ، لـە لایەکی ترەوە سـەرنجی ئـەو گۆرە هەلکەندراوانەی پادشایانی ماد بدەین (کیاکسارو ئاستیاك کە نەخشیان لێ هەلکەندراوە ،هەروەکو لە گۆرەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمدا ئەبینرێ (مزدیسنا) نیشان ئەدا کە ئەمە پەیوەندی بـە یاساو ئامۆژگاریەکانی ئاینی زەردەشتەوەیە ٠

٩٤ ـ نیاکان ـ پیشونان ـ پەرستی لـەگاتاکان کۆنترە ، بـەڵام بـە داخەوە ، ئەگەرچی ئەم باسە بۆ مێژوی ماد گەلێك بایەخی هەیە ، لـەگەل گرتنە بەرچاوی بەهای ناوی Fravartis ـ بەشێوەی ناوی تایبەتی ـ لە مێژوی باسکراوا ، ناتوانین بلێین کە ئایا مەفهومی گیانی نیاکان بە شێوەی Fravarti ( ئامۆژگاری کـار ) بۆ یـەکـەمین جـار کـەوتۆتـە نـاو ئامۆژگاریەکانەوە یان لەوە بەریش هەر بوە ٠٠ شێوەی یـەکەمیان زۆر تر رێی تێ ئەچێ ٠

٩٥ ـ ئەم زاراوەیە لـە سەردەمی هـەخامەنشیەکانا ( لە پا پیروسی

الفانتین )ەوە بۆمان دەرکەوتوە ، واتا ـ یاسای پەرستنی مزدا ـ وە رەنگ بێ نەك تەنیا ئەوانەی کە پەیرەوی گاتاکانیان ئەکردو زەردەشتیەکان خۆیان بە مزدا پەرست بزانن ٠٠ بەلام لێرەدا مەفهومی یاسا مەبەست لـە پەیرەو کردنی یاسـا ئاینیەکەیـە ، وە ئـەم مـەفهومە لـە ناو ئاینـە کۆنـەکانی پێشوودا نەبوە ٠

٩٦ ـ تەنانەت هردوت باسی ئەو یاسا ئاینیانە ئەکات کە لە دواییدا پارسەکان لـە خـەڵکی ترەوە وەریان گـرتوەو ئێمـە لێرەدا کـارمـان بـە سەریەوە نیە ٠

٩٧ ـ تاکو خاکەکە بە هۆی دانانی دارەمەیتەکەوە پیس نەبێ ٠

٩٨ ـ هرودوت لە بارەی پارسەکانەوە ئەلێ : ئەوانە میزو تف ناکەنە روبارەکانەوە دەستی تیا ناشۆرن ، ٠٠٠ تاد ( I ١٣٨) وە لـە بـارەی پیس کردنی ئاگرەوە ( III ١٦) ٠

٩٩ـ ویدودات، VI ، ٤٤ بە دواوە ، تەماشای I ١٣ـ «گوناهیك کە کفارەتی نەبێ بریتیيە لە ناشتنی مردوەکان» ٠٠

١٠٠ ـ 11 Mem., Del. en perse ‘ VIII, paris, 1905 لاپەرە ٢٩ بە دواوە ٠٠ PL-II (ژ٠ د٠ مورگان) ٠

١٠١ ـ بە پێی بیرورای هـەندێك لـە لێکۆلـەرەوەکانی ئـەوروپای رۆژئاوا میرولە بە بەشێك لە گیان لەبـەرە زیان بەخشەکان دائـەنێن ، وە هەرکەس دانیشتوی ناوچەی خواروو بێ ئەمە ئەزانێ ٠ زۆر سەیرە کە هرتل (ئەمە بە سودی موغەکان) ـ لەناو بردنی گیان لـەبـەری زیانۆمەند ـ بە بەلگەی خراپی رەووشتی ئەوانەدا ئەنێ کە ئاریایی نین ٠

١٠٢ ـ ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە هەندێك لـە لێکۆلەرەوەکان لـەو باوەرەدان کە ئەمە پەیوەندی بە گاتاکانەوە نیە ، لەبەر ئەوە کە لە گاتاکانا باسی پەیدا بونی جیهان نەکراوە ، رەنگ بێ لە یسنای XXX بێت ٠

١٠٣ ـ IV ‘ SPA پلاك ٩٧ ، تەماشای پلاك ٩٨ بكـە ، موغـەكە دەفرێكی سەر داپۆشراوی بۆ هئوما پێ یە ٠

١٠٤ ـ هەمان سەرچاوە لاپەڕەكانی ٧ و ٤٢ و ٦٩ G. G. Cameron
R. T. Hallock, New Light from persepolis, JNES, 1X, 4, 1950.
لاپەڕە ٢٣٩ ٠

١٠٥ ـ هەندێك لە لێكۆڵەرەوەكاین لەو باوەڕەدان كە گاتاكان لە بەكار هێنانی ناوی هئومادا هەڵەی كردوە (یسنای XLVIII ‘ ١٠) ٠

١٠٦ ـ وەكو نەرێتە لە دژی ئـەم بەڵگانە ئـەڵێن كـە هرودوت ناوی زەردەشتی نەبردوە ، بەڵام ئەو ئـەبوا تەنیـا لـە كاتێكدا ناوی زەردەشت ببات ـ هەروەكو هرتلو هرتسفلدو و٠و٠ ئاسترووە لەو باوەڕەدان ـ كە لە سەردەمی پادشایانی هەخامـەنشیدا ژیاوە ( لـەم روەوە تـەماشـای پیش لاپەڕەكانی ٦٦ و ٦٧ بكە ) وە جگە لەمە هیچ هۆیەك نـەبوە كـە هرودوت باسی زەردەشت بكات ٠٠ لەبەر ئەوە كە ئەو چەند لاپەڕەیەكی كـەمی بۆ بیرو باوەڕو ئامۆژگاری موغەكان تەرخان كردوە ٠٠ وە بە تایبەتی بە كورتیو پوختی باسیان لێوە ئەكات ٠

١٠٧ ـ تەماشای لاپەرە ٧٣ بە دواوەی ئەم سەرچاوەیە بكە :
M. Lidzbarski, Ephemeris fur Semstische Epigrapik, I-Gissen, 1909.
بە تایبەتی ئـەم یاسا ئاینیە لـە نوسراوەی ئانطیوكرس كوما لێكدانـەوەی پەرستنی موغەكان لە نوسینەكانی ئاسترابون دا هەیە

١٠٨ ـ ئیستا كە باسی ملیت بە شێوەی زانستیانە شی كراوەتەوە ، ئەمانەوێ زاراوەی (ئاینی هۆزەكان) بەكار بێنین ٠

١٠٩ ـ ف٠ ئا٠ « لیودویك فیرباخ »

١١٠ ـ ف٠ ئا٠ « لە سەرچاوەی مەسیحیەكان » (لە شیوەنگای برونو مائوئر) دا ٠

١١١ ـ پولین ( V11 ‘ ۱، به پێی نوسینی دینون ؟) ئەڵێ کە مادەکان ویستیان کە دیوك لە قەڵای ئەکباتانا بژیو یاساولی نێزە بە دەستی هەبێ وە ئەوان خۆراك (khoregia) هەمو جۆرە زەخیرەیەكو هۆی شوێنی پیرۆزی بۆ دابین بکەن ·

١١٢ ـ سەرچاوەی زەوی پەرستگای موغەکان ـ بە تایبەتی لەم سەرزەمینەدا کە لە بنەچەوە ئێرانی نەبوە وە دانیشتوانی بە تەواوی ماوەیەکی زۆر بە نارەحەت لە زمانی ئیرانی تێ ئەگەیشتن ـ بە زەحمەت ئەتوانرێ بە جۆرێکی تر دابنرێ · لە ئەمپەراتورێتی مادا ـ ئەگەر ناوچەی سنوری بین النهرینی ژورو کە لەبەر مەترسی پەلاماردانداً بوە نەهێنینە کایەوە ـ ناوچەیەکی سود مەندو بە بەرەکەتو بەرهەمدار تری نەبوە · بەڵام ئایا بۆچی ئەم زەویو زارە ـ بە تایبەتی لە سەردەمی هەخامەنشیەکانا ـ بە تایبەتی هینی پەرستگاکان بوە ـ زانینی ستەمە ، ئاتروپات لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا رەنگە بێ ئەویش بەم جۆرە بوبێ ·

١١٣ ـ لە ئەمپەراتوریتی پارسدا ئامۆژگاریەکانی مزد یسنا ـ لە پێشا لە سەردەمی خشایارشا دا ـ لە دوای هەولو تەقەللادانەکەی گئوماتا ـ بە شێوەی رەسمی پارێزگاری ئەکرا ·

١١٤ ـ بەرە بەرە زنجیرەیەك ئامۆژگاری ئاینی تازەی سەربەخۆ کە راستەو خۆ وە یان بە هۆی ئاینی مزد یسناوە پێکەوە پەیوەند بون پەیدا بوو ، بۆ نمونە میترا پەرستی لە روم زۆر لەناو خەڵکیدا باوی بووە ·

١١٥ ـ تەنانەت لە گاتاکانا بە دوقلو ناو براوە (یسنای XXX ‘ ٣ ) ·

١١٦ ـ ئەمە هەمان «٦٠٠٠» ساڵی ناو بەینەکەیە کە بە وتەی نوسەرە یۆنانیەکان کەوتبوە نێوان پەیدا بونی زەردەشتو ئەوانەوە ·

١١٧ ـ تەماشای Her., V11-114. بکە ··

١١٨ E. Benveniste, The persian Religion According to the chief Greek Texts Paris, 1929.

لاپەڕە ٦٩ بە دواوە ·· هەروەها ك· و· ترور ، دەرکەوتنی زەردەشتی لە هونەردا : I.IOVe لاپەڕە ٢٤٠ بە دواوە ·

R. C. Zaechner, Postscript to Zurvan, Bsoas, XVLI, 2, 1955. لاپەڕە ٢٣٣

١١٩ – plut. De. Iside 46-47.

١٢٠ – کۆ کردنەوەی دەسەڵاتو یاساکانی ئاویستا لە سەردەمی پارتەکانا دەستی پێ کرد – کتێبی زەردەشتی (دینکرت) باسی یەکێك لە ولخشی – ولگز ـەکان ئەکات – ئەم یاسایانە لە سەردەمی ئاردەشیری یەکەم دامەزرێنەری زنجیرەی ساسانیەکانا بە هۆی موغێکی ئازربایجانیەوە کە ناوی ئادرباد (ئاتروپات) کوری مهر سپند بوە تەتەڵە کراو لە سەردەمی شاپوری دووەمدا نوسرایەوە (٣٧٩ـ٣٠٩ ی زاینی) ·

١٢١ – باسی ئەوە کراوە کە هەخامەنشیەکانو بەر لەوان گۆڕی بەردینیان دروست ئەکرد ، وە ئەمە بە بەڵگەی ئەوە دائەنێن گوایە زەردەشتی نەبون ، ئێمە بێ ئەوەی لە بارەی یاسای پادشایانی هەخامەنشیەوە بیروڕای خۆمان دەربڕین – بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە ناتوانین ئەمە پەسەند بکەین · یەکەم لە گاتاکانا هیچ جۆرە شتێك لە بارەی مردو ناشتنەوەی تیا نیە ، دووەم نەیان ئەویست ئەو خاکە پاکە بە لاشەی مردو پیس بکەن ، وە بەڕای ئەوان بەرد پیس نابێ ،بۆ نمونە تەماشای (ویدودات) VI ٤٦ـ٤٥: لاشەی مردو بە هۆی بەردەکانەوە بکە ··

١٢٢ – بەم جۆرە هەندێك شتومەکی کۆن بە ناوی ئەنتیکەوە ئەفرۆشرێو بە دەسکردی لوڕستان دائەنرێ ، هەروەکو پشتێنی لە مفرغ دروست کراو ، کە بە ڕای ئێمە ئەمە هینی مادەکانە .(pl ‘ 56 A ‘ IV ‘ SPA )

١٢٣ ـ pl. 69 - 72 ‘ IV ‘ SPA «گومانی بۆ ناچێ ئەگـەر ئـەمانە به هینی لورستان دابنرێن شتێکی راست بێ ٠٠

١٢٤ ـ R. Ghirshman, Fouillesde sialk.

بۆ ئەوەی نمونـەی باشتر بدۆزرێتـەوە تـەماشای I , SPA لاپـەرە ١٣٩ بکە ٠

١٢٥ ـ A. Codard, Le Tresor de Ziwiye, Haarlem, 1950.

١٢٦ ـ E. HerZleld, Iran in the Ancient East

لاپەرە ٢٠١ بە دواوە ٠

١٢٧ ـ هرتسفلد ئەمە بە گئوماتای موغ دائەنێ (کە لە ٥٢٢ ی پێش زاینی لە دنیا دەرچووە) ، وە بەلگەی ئەو تەنیا ئەوەیە کە بە بیروڕای ئـەو رەنگ بێ ناوی سکوند) بە ناوی قـەلایـەك کـە گئوماتای تیـا کوژراوە و هرتسفلد بە sikayah vant ئەی خوێنێتەوە ، هەروەها لەگەل (سانگی بوتی) ئاشوری ! بە یـەك ئەزانێ ، وە بـە بیروڕای ئێمە ئـەم لێکچواندنە ناسەلمێ ٠٠ بەلام ئاشکرایە کە گئوماتا بە دەستی داریوشی یەکەم کوژراوە لەبەر ئەوە گۆرێکی تایبەتی بەو جۆرەی نەبوە ٠

١٢٨ ـ هەروەها لە بارەی گۆری دانیشتوانی مادی رۆژهەلاتـەوە لـە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینی دا ٠٠ تەماشای گۆرە هەلگەندراوەکانی تەپۆلکەی سیلك بکە ٠٠

١٢٩ ـ ئەوانەی کە دیوارەکانی (didam) یان ئەرازاندەوە ـ مادیو میسری بون ـ تەماشای نوسراوەکەی داریوشی یەکەم لە شوش بکە کە لـە سەر دیوارەکانی هەلکەندراوە ٠ هەروەها هـەمان سـەرچاوە لاپـەرە ١٤٣ ـ دێرەکانی ٥٤ـ٥٥ R. Kent

١٣٠ ـ لە نەخشە هەلکەندراوەکانی ئـەستێلك دا هونـەری عیـلامی دیارە ٠٠بێ گومـان هونـەری عیلامەکان لـە سـەر زەمینی مـاددا گـەلێك

باوی هەبوە ٠

١٣١ ـ هرتسفلد ئەم باسەی بە درێژی نوسیوەتەوە :

(Iran in the Ancient East لاپەڕە ٢٠٩ بە دواوە ٠

١٣٢ ـ لاپەڕە ٢٠٠ E. HerZfeld, Iran in the Ancient East

١٣٣ ـ Polyb., X, 27.

١٣٤ ـ لە نوسراوەکانی پولیبیدا ، بە Aines هاتوە ٠

١٣٥ ـ درەختی سەدر لەو سەردەمەدا تەنیا لە کێوەکانی عمانو لوبنان لە (سوریەو ـ فنیقیە) ئەڕوان ، وە بەڵگەی ئەمە کەمتر بەدەستەوەیە کە دیوکیەکان ئەم دارەیان هێنا بێت بۆ ئەکباتان ٠٠

# پەراوێزی بەشی حەوتەم

١ ـ G. Muller, Gtesiae ٥ ـ ١ وە لاپـــەڕە ١٠٦
Photlus, God. LXXII ( لـە چـاپی دیندورف نوسینی هرودوت )
Cuidii, .. Fragmenta, Paris, 1844 FGH, A.Barlin, 1826
لاپەڕە ٣٦١ بە دواوە .. Diod,IX لاپەڕە ٢١ بە دواوە .

٢ ـ لە بارەی کورشەوە گەلێک نوسراوە هەیە ، بە تایبەتی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا .. تـەماشای نوسینەکانی ئورس ، بیودینگر ، ئا. بانوئر ، ك. شوبارت ، بوسانکە ، پراشك ، لـە روسیە کلینگر و چـەندانی تر بکە ..

٣ ـ ئاکاد میشین و.و. ئاستترووە (هرودوت و جموجوڵی سیاسی لـە ئێران لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا VDI ژمـارە ٣ سـاڵی ١٩٢٨) چەندان بەڵگەی هێناوەتەوە کە لە سەردەمی حکومەتی داریوش دا لە ئێران ـ هەروەکو هرودوت نوسیویەتی ـ ( III ٨٢ـ٨٠) ـ بە باشترین شێوەی دەوڵەت باس کراوە ، ئەوەی کـە یۆنانیەکان لـە کورش گەیشتوون و لـە داستانەکانی هردوت و کتسیاس و کزنفون دا ـ داستانەکانی سەدەی پێنجەم و

سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زاینی – نوسراون ٠٠ بێ گومـان رواڵـەتی کرداری ئەو پیاوەو پـەیوەندی گشتی بوە لەگـەڵ هـەموانا ٠٠ هـەروەکو داریوشی دوەم یەکێك لە کورەکانی خۆی (کە لـە کۆتایی دەیـەی سێیەمی سەدەی پێنجەمی پێش زاینی دا لە دایك بوە) ناوی ناوە کورش ئەمە شتێکی ریکەوت نیەو ٠ بێ گومان لە سەرانسەری سەدەی پێنجەمی پێش زاینی دا گەلێك داستان لە بارەی کورشەوە نوسراوە ،وە کتسیاس گەلێك هـەواڵی جۆر بە جۆری لە بارەیەوە بیستووە ، بەو جۆرە ناچـار نـەبوە خۆی بـەو جۆرە دوچار بکات ٠٠ هەروەکو هرودوت ( III ، ٢ I ١٢٢) ٠

٤ – ئەو هەوڵـەی کـە س٠ ئـاسمیت لـە بـارەی راسـتی میژویی (کورشنامە)وە داوێتی لەم سەرچاوەیەدا :

(S. Smith, Babylonian Historical Taxts, London, 1924

لە لاپەرە ٣٤ و ١٠١ بە دواوە ، بە بیروڕای ئێمە بەڵگەیەکی سەلمێنراو نیە٠

٥ – ئەستو نەکەی نابونید NBKI لاپـەرە ٢٢٠–٢١٨ ، لـە سەرەتای پادشایی هـەمیشەیی من دا ٠٠٠٠ (خوا) ی مردوك پـێی وتم : «نابونید ، پادشـای بابل ، خشـت بنێ لـە ئـەسپەکان ، وە پـەرستگای (ئاخوتحول) لـە (حران) دروست کـە وە لـە ناویا خانوی (خوای) سینی سولتانی گەورە بکەرەوە ، من بە رێزەوە بە سولتانی خواکان (مردوك)م وت: ئەم پەرستگایە کە فـەرموت دروسـت بکرێ ، – (sahir-summa) لە ناوا گرتی ،٠٠٠٠٠ مردوك پێی وتم : لەشکری ماندا نیەو ئەو پادشایانەش کە یارمەتی ئەدەن نین ٠٠ لە سەردەمی پەلاماری سالی سێیەمی کورش دا ، پادشای ئانزان ، خزمەتکاری بچوکی ئەو ، لە دژی ئەو راپەڕیو بەو لەشکرە کەمەی خۆیەوە لەشکرە زۆرەکەی ماندای لەناو برد Istumegu پـادشـای لەشکری ماندای گرتو بـە دیلی بردی بۆ وڵاتی خۆی» ٠ ئـەوەی کـە پێی ئەوترێ میژوی روداوەکانی نابونید (s.smith) هەمان سەرچاوە لاپەرە

۹۸ به دواوه ، ئەمە رەنگ بێ پاشكۆی (میژوی روداوی گد بێ) I ،
۱۱ـ۲۲ .........

٦ ـ هەرچۆن بێ به پێی وتەی هرودوت موغـەكان لای ئـەو رێزیان گیراوه وه ئاستیاگ زۆر جار پرسو ڕای پێ كردوون ٠

٧ ـ تەماشای پالیمی لاپەڕه ٤٨٠ی نوسراوەكەو لەوه بەدواوەش بكه ٠

٨ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو لاپـەڕه ٤٥ بـه دواوه C.muller Photius, Cod. LXXII ـ۲ ، لاپەڕه ١٠٦ ٠

٩ ـ ئەم رێكەوته تا رادەیەك ماوەی ئەوەمان ئەدات كه له بارەی راستی ناوی (ئاسپیتام)ەوه كه كتسیاس هێناویەتـەوه باوەڕ بكـەین ٠٠ ئەگەرچی ناوەكانی (ئاسپیتام) و (ئاسپیتامن) له سەردەمی كتسیاس دا زۆر باو بووه ، رەنگ بێ كتسیاس ئـەم ناوەی لـه ناوەڕۆكی نـاوی زنجیرەی سـەردەمی هەخامەنشیەكان وەر گرتبێو بۆ كەسێكی دانابێ كه ناوی نەزانیوه ٠

١٠ ـ له واقیع دا هەروەكو داریوش لـه نوسراوەكەی بێستون دا بـه ئاشكرا ئەڵێ ئەو برای هاوخوێنو هاو گیانی كەمبوجیه بوه ، وه لەبەر ئەمه به پێچەوانەی وتەكەی كتسیاسەوه كوڕی ئامی تیدا نەبوه ٠

١١ ـ له بارەی ئامۆژگاریەكانی «سائوشیانت» تەماشای یشت XIII ، ١٢٩ ، ١٤٥ ، XIX ، ٨٩ـ٩٢ ، وه یسنای XXVI ٣٣ بكه ٠

١٢ ـ له گاتاكانا هەیه كه هاوكارانی زەردەشتو ویشتاسـپ لـەناو كۆمەڵه ئایندارەكانا زۆر رێزیان لێ گیراوه ٠

١٣ ـ واتا هارپاگ كورش ـ منالەكەی بـه زیندویی داناوەو گۆشتی كوڕەكەی پێ داوه ٠

١٤ ـ Her., I, 109.

١٥ـكتسیاس سوره لەسەر ئەوه كه كورش كوڕی ژنێكی شوانو ئاترادات له هۆزی مردان و له دواییدا خزمەتچی دەرباری ئاستیاگ بوەو له ئەنجامدا

بووه بە یەکیك لە لەشکریەکانی دەورو بەری خۆی (ئەمـە لـەگـەل میژوی ژیانی ئەفسانەیی کۆنی سارگون دا لـە یـەك ئەچن) ٠٠ تەماشای نیکولای دیمشقی FGH ، IIA ، لاپەڕە ٣٦١ بە دواوە ، وە fragm لاپەڕە ٦٦ بکە ٠٠ مردان هۆزێکی کوێستانی نیمچە بیابان نشین بون کـە بـە ڕێگرو دەس وەشاندن بەناوبانگ بون ، هەروەکو گیگر ئـەڵێ ناوی ئەمانـە لـە سەرەتادا وشەیەکی سادەو خۆش بوە ٠٠٠ تەماشای وشەی mareta ی ئیرانی بکە کە بە مانا (پیاو کوژ) ئەگرێتەوە ٠

( W. Geiger, Ostiranische kultur im Allertum, Erlangen 1882 لاپەڕە ٢٠٣) ٠ مردان لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی بیابانەکانی ئیرانو ئاسیای ناوەڕاستو مرغیاناو بەشـەکانی خـواروی قزل ئوزون – گیزیل بوندای کون – (کـە بـە دانیشتوانی ئەو ناوچـەیە شیان وتوە مردان ، وە ئاسترابون چـەندان جار ئـەو ناوەی دوبارە کردۆتەوە) لـە بـەشی ژوروی پرسیدا (Her, I, 125) ژیاون ٠٠کتسیاس تەنیا مردانی دوایی باسکردوە٠

١٦ – IIA, FGH لاپەڕە ٣٦١ بە دواوە Fragm ٦٦ ، دیسان تەماشای a Just.. I, بکە ٠

١٧ – کادوسیەکان کە بە پێی وتەی س٠ ت٠ یرمیان ـلە سەرچاوەکانی سەدەکانی ناوە ڕاست دا پێیان وتون کاتی شیان – ئەمانە هۆزێکی گرنگی سەر بە خۆ بون کە لە چیاکانی خواروتری روباری ئاراس دا – لە ناوچەی ژمارە ٢ ی ئێمە دا – ژیاوون ٠ ئەوەی کتسیاس لە بارەی ناکۆکی نێـوان ئەم هۆزەو مادەکانەوە باسی کردوە هەموی ئەفسانەیە ٠

١٨ – بە وتەی هرودوت ( 111 ، ٨٥ بە دواوە) ئەو – مەیتەرەکـەی داریوشی یەکەم وبە هۆی فرو فێڵەکانی یەوە یارمەتی چونە سەرتەختی داوە٠

١٩ – نابـێ ئـەو بـە سـاتراپی بابـل Gaubruva - Gubaru - ی نوسراوەکەی بێستونو Gobrues ی هرودوت بە یەك بزانین ٠

٢٠ ـ کتسیاس ئەڵێ کە کادوسیەکان لە کۆندا دوژمنایەتی مادەکانیان ئەکرد ، وە بۆ یەکەمین جار سەریان بۆ کورش دانەواند ٠

٢١ ـ بە وتەی ئەو ئاستیاگ بـە تەگبیرو ڕای موغەکان کورشی نارد بۆ پارس وە دوای ئەوە هەر بە هەمان هۆ ئـەوانی توشی چـەرمـە سـەرە کـرد ( 1 ، ١٢١ـ١٢٠ ، ١٢٨) ٠

٢٢ ـ تەماشای دینون FHG ، 11 ، لاپەرە ٩٠ V. frgam. ٧ بکە ٠

٢٣ ـ بە وتـەی هـرودوت ( 1 ، ١٢٣) نامـەکـە لـە ناو سـکی کەرویشکێکدا شاردرابۆوە ، وە نامە بەرەکە ئـەیویست وای نیشـان بدات کە ڕاوچی یە ٠

٢٤ ـ ئەستونەکەی نابونید سـەرەتای شەڕەکـە بـە سێیەمین سالی حکومەتی نابونید (سالی ٥٥٣ی پێش زاینی)و «مێژوی روداوەکانی نابونید» لە کۆتایی سالی شەشەمی دەسەلاتی نابونید (٥٥٠ی پێش زاینی) دائەنێت٠ س٠ ئاسمیت لە چاپی «مێژوی روداوەکانا» بەروارەکان سالێك دواتر دائەنێ بەلام ماوەی نێوانیان هیچ دەسکاری ناکات ٠

٢٥ ـ Her., I, 214, photius Cod, LXXII

لاپەرە ١٠٦ ، ٨ ، دینون I GIG. Dedi V لاپەرە ١٢٣ ، ٤٦ تـەماشای Just, I,8,74 بکە ٠٠ لە شوێنێکدا تەمەنی ئەویان بە ٣١ سال داناوە ( sulpic, severus, II,9 )

٢٦ ـ لە بارەی دوا قۆناغی ئـەوە زانیاریـەکانی کتسیاس لـەگـەل هینەکانی هرودوت دا بەرامبەرن ، وە رەنگە بێ ئەو بـەو هۆیەوە لـە بارەی لێدوانی ئەوەوە لە نوسینەکانی خۆیا چاوپۆشی کردوە ٠ کتسیاس هەولی داوە هەر نوسینێکی لەگەل هینەکانی هرودوت دا بەرامبەر بێ بی کوژێنێتەوە ، بۆ ئەوەی سەخت تر دژایەتی بیروڕای خۆی بەرامبەر بە هردوت نیشان بدات٠٠٠

٢٧ ـ کتسیاس شوێنی بگرەو بەردەو لێدانەکە بە پێی وتەی نیکولای

دیمشقی ( IIA, FGH : لاپەڕە ٣٦١ بە دواوە fragm ٦٦ ، ٢٨ ) بە هیربا (Hirba) دائەنێ ، لە سەرچاوەکانی ترا ناوی ئەم شوێنە نیە ·· کەوابو ئەبێ ئەم شوێنە بە جێگایەك دابنێین لە « پارەتاکن » لە نزیك ئەسفەهانی ئیستاوە ·

٢٨ ـ Jusa, I, 6-Polyaen, VII, 45, 2 پوستین ئەڵێ «کە لەو رۆژگارەدا کە مردان لە رێگا رویشتن دا دودڵ بون ، ئافرەتەکان لەویا بە روتی ڕوبەڕویان بونەوە و پرسی‌یان ئایا ئەتانەوێ رابکەنەوە ناو سکی دایکتانو ژنەکانتان بێننەوە » لەوە بە دواوە هەواڵێك لە هرودوتەوە ئەگێڕنەوە ، گوایە ئاستیاگ لە شەڕێکدا دەستگیر کراوە کە لە دواییدا رویداوە · ئەم روداوە پولین بە شێوەیەکی تر باسی ئەکات ( VII ٦ ، ١) چونکە بەر لە شەڕەکەی پاسارگاد باسی سێ شەڕی تر ئەکات پارسەکان تیایا سەر نەکەوتون تەماشای Polyaen (VII,6,9) بکە ·

٢٩ ـ نیکولای دیمشقی ( Fragm 66 45) کە زۆر تر سودی لە نوسینی کتسیاس وەرگرتوە ، سکایی‌و باکتریاییەکانیشی باس ئەکات · بەڵام ئەمە هۆی ئاڵۆزی سەرچاوەکانە ·· چونکە بە پێی وتەی کتسیاس سکایی‌و باکتریاییەکان لە دوای دیل بونی ئاستیاگ لەگەل کورش‌دا پەیوەندی‌یان بەستت ، ئەمە خۆی لەگەل راستی میژوییدا ئەگونجێ ·

٣٠ ـ NBkI لاپەڕە ٢٢٠ بە دواوە لەگەل 1 ‘ 11 ٣٧ ، ٢٥، لاپەڕە ٢٨٤ بە دواوە X ‘ ١٢ ، «حران» و پەرستگای ئاخولخول کە ٥٤ ساڵ وێران بوبو چونکە ئومان ـ ماندا ـییەکان پەرستگاکەی ئەوانیان تاڵانو وێران کردبو ـ وە خواکان لەو بارەیەوە ماوەی سوڵح کردنی ٥٤ ساڵەیی یان بریار دابو ـ کە دوای ئەوە (خوای) سین توانی بگەڕێتەوە جێگای خۆی » ····· ئەگەر باوەڕ بە « میژوی روداوەکانی گد » بکەین حران لە ساڵی ٦٠٩ دا وێران کراوە » ·····

٣١ ـ گوفتوگوی هارپاگ لەگەل ئاستیاگ ، لە دوای گرتنی ناوبراوی دوایی Her ' 1 ' 128 هرودوت ئـەم باسەی لـەسەرچاوەی هارپاگیەکانەوە وەر نەگرتوە بەلکو خۆی لە بارەی رەوشتو کرداری ئاستیاگەوە نوسیویتی ··هرودوت لـە بەر سـەرنجی ریزگرتنانەدا هارپاگ لـە باسو بەسەرهاتە هارپاگیەکان جیا ئەکاتەوە ·· هرودوت هارپاك بە بێ ئەقل ترینو بێ ویژدان ترین کەس دائەنێ ··

٣٢ ـ میژوی روداوەکانی نابونید ' 11 ' ٤ـ٣ :

S. Smith, Babylonian Historical Texts, London, 1924,

لە لاپەرە ١١٠ بە دواوە ·

٣٣ ـ کرداری salalu بە مانا ( بەدیل گرتن ) کـە لێرەدا بەکار هێنراوە ، ئەمەش بەشێکە لە تالانی زیندەوەری وەکو کۆیلەکان ·

٣٤ ـ photius, God; LXXII ' 106 ' 2.

٣٥ ـ میژوی (روداوی نابونید) ' 11 ' ٤ـ٣ باج سەندن لە مادەکان لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا ئاشکرایە ، بەلام ئـەگـەر باوەر بـە وتەی گزنفون بکەین (Xen,Cyrop,VIII,7,II) ماد لە سەردەمی کورش دا لەگەل ئەرمەنستانو سەرزەمینی کادوسیەکانا یـەك حاکـم نشین بووە ، وە هەمو وەکو یەك باجو خەراجیان خرابوە پێ ، لە وتەیەکی ئاستیاگ دا لەگەل هارپاك کە هرودوت باسی لێوە کردوە ، ئاستیاگ ئەلێ کە هارپاك مادەکانی بە دیلی گـەیاندووە katedoulose دیسانـەوە ئـەم باسـە جێگـای سەرنجە · وە لەبارەی زاراوەی doulos تەماشای یا· ئا· لنتسمان ، بکە، لە بارەی زاراوە کۆنە یۆنانیەکانەوە کـە بـە مانا (کۆیلە)یان ئەگەیاند ·· VDI ١٩٥١ ، ژمارە ٢ لاپـەرە ٦٢ـ٥٧ ·· (کۆیلە)ی مادەکان بـە پێی زاراوەی سـوید doulein ئـەگرێتـەوە ، بـەنیسـبەت قـەوارەی دەولەتیەوە ······

٣٥ ـ (دوباره)ـ بۆ نمونه Her., VII, 136 كه ئه‌لێت نوماینده‌كانی ئاسپارت خشایارشایان به پادشای ماده‌كان ناو ئه‌برد ، وه چه‌ندان نمونه‌ی تر له‌م روه‌وه هه‌یه ٠ ئه‌وه ئه‌زانین كـه یۆنانیه‌كان شه‌ڕه‌كانی نێوان یۆنان‌و پارس یان به شه‌ڕی یۆنان‌و ماده‌كان ناو ئه‌برد ٠٠

٣٦ ـ زاراوه‌ی mug-ba-ruamelehatmat Gat Gu-ti-um له (مێژوی روداوه‌كانی نابونید) دا ( 111 ، ١٥) ئه‌بێ وه‌ها لێك بدرێته‌وه، ئه‌و له كاتی داگیر كردنی بابل‌دا فه‌رمانده‌ی له‌شكره‌كه‌ی كورش بووه ، س٠ ئاسمیت ئه‌و به گوبری كورشنامه ئه‌زانێ ٠٠ ئه‌گه‌ر ئه‌مه وابێ ، هه‌رچۆن بێ ئه‌بێ ئه‌و له‌Gaubruva=Gubaruواتا گوبری ناوبراو كه له نوسینه‌كانی هرودوت دا ساتراپی بابل بووه ، جیایان بكه‌ینه‌وه ٠ ئه‌و نوسینه‌ی له باره‌ی له‌ناوچونی بابله‌وه له (كتێبه‌كه‌ی دانیال پێغه‌مبه‌ر) دا هه‌یه به هیچ شێوه‌یه‌ك راستی مێژویی تیا نـه‌پارێزراوه ، وه چـه‌ندان سـاڵ دوای روداوه‌كـه نوسراوه‌ته‌وه «داریوشی ماده‌كان» له‌گه‌ل ئه‌ودا له‌یه‌ك ئه‌چن ، پولین به پێی نوسینه‌كانی كتسیاس ( VII ٤٥ ،٢) ئوبیبار به ساتراپی كورش ناو ئه‌بات٠

٣٧ ـ په‌ڕه‌ی ٢،١٠٦ و لاپه‌ره ٤٦ـ٤٥ phitius, God., LXXII, ئه‌م هه‌واڵه له گومان به‌دور نیه ٠٠ له واقیع دا ناوی ئامی تیدا بـه پێی وته‌ی بروس له ناو بنه‌ماڵه‌ی ماده‌كانا به‌كار هێنراوه له دواییدا بۆ ناوی ژنه هه‌خامه‌نشیه‌كان به‌كار هاتوه ٠٠٠٠

٣٨ ـ م٠ ئا٠ ماتیو ١/ پاشماوه‌ی سـه‌رده‌می مێ وه‌جاخی لـه میسری كۆنا ٠ لـه كۆمه‌ڵی « په‌نجا هـه‌مین ساڵه‌ی كتێبی سه‌رچاوه‌ی بنـه‌ماڵـه‌و فه‌رمانڕه‌وایی تاكه كه‌سی‌و ده‌وڵه‌ت » ف٠ ئینگلز٠ چاپی مۆسكو ـلینینگراد٠ سـاڵی ١٩٣٦ لاپـه‌ره ٣٦٣ بـه دواوه ٢/ ئـه‌و زاراوانـه‌ی پـه‌یوه‌ندیان به‌خوێشایه‌تیه‌وه هه‌بوه له میسری كۆنا UZLGU زنجیره‌ی زانستی مێژویی ، ژماره ٩ ، ١٩٤١ ، لاپه‌ره ٢٢ بـه دواوه ٠ ٣/ مێژوی بنـه‌ماڵه‌و

عەشیرەتی لە میسری کۆنا VDI ١٩٥٤ ، ژمارە ١ـ ئەم نەریتە پاشماوەی جوتە گرتنی کۆمەڵی سەردەمی مێ وەجاخی نیە ، وە بە پێچەوانەوە ئەنجامی رێرەوی کامڵ بونی نێروەجاخی یەو کۆششێك بووە بۆ قایمەکاری لەبارەی پێدانی میراتو مافی تری ئافرەتەوە بە خێڵێکی تر ٠٠

٣٩ ـ بۆ نمونـە کورشی دوەم کوڕو مێردی دو کچی ئـاستیاگ بوە ؟ کەمبوجیەی دوەم خوشکی خۆی واتا ئاتوسای کچی کورشی خواستوە ، لـە دوای ئەو یەکەم جار بردیای درۆیینەو لە دوای لـەناو چونی ئـەو داریوشی یەکەم (کە لە هەمان کاتا پارمیدای کچی بردیا خێزانی بو) هەمان ئاتوسایان خواستوە ٠٠ خشایار شا کوڕی داریوش بەو هۆیەوە بو بە پادشا کە کوڕی ئاتوسابوە وە لەگەل ئـەوەدا داریوش کوڕی لـەو گـەورە تریشی بووە ٠ داریوشی دووەم خوشکی خۆی کەناوی پاریساتیدا بو خوازتوێتی ٠٠ کوڕی ئەوان کە ناوی ئاردەشێری دووەم بو لە دوای مردنی ژنی یەکەمی کچی خۆی کە ناوی ئاتوساو ئامستریدا بوە خوازتویەتی ٠٠ ئەسکەندەر بارسینای کچی داریوشی سێیەمو کودومانو پاریساتیدا کچی ئاردەشێری سێیەمی هێناوە ، وە سلوکوسی یەکەم ئاپامای کچی ئەسپتیامنی پاڵەوانی سگدیەکان کە لـە دایکەوە لە بنەماڵەی هەخامەنشیەکان بوە خوازتوێتی ٠

٤٠ ـ کرزوس (Her., 11, 86) بە دواوەو چەندان سەرچاوەی تر)،و ئابونید :

Flav. Josehus, Gontra Apionem, I, 20 - 21; Eusebius. praep, Evang, LX. 41.

(هەردو هەواڵەکە بە هۆی ئەلکساندر پولی هیستورەوە لە بروس وەرگیراون) وە رەنگە بێ ئارسام باپیری داریوشی یەکەم وای کردبێ ، وە دیسان رەنگە بێ خشاترنیاو کیاکسار لەگەل پادشایانی ماددا وایان کردبێ ٠

٤١ ـ هردوتو کتسیاس هەردوکیان باسی ئەمەیان کردوە ، لە مێژوی

روداوەکانی بابل دا شتێك پێچەوانەی ئەم باسە نیە ٠

٤٢ ـ لە نوسینەکـانی کتسیاس دا ( برکانیەکان ) نوسراوە ، بـەڵام رەنگ بێ hurkanion , barkanion بێت ٠ کـە تەنیا لە شێوەی جیاوازی بەکارهێنانی نـاوی دانیشتوانی ناوچـەی Varkana ـ واتـا هیرکانیەکان بێت ٠٠ لە نوسینەکانی یوستین (هیرکانیەکان) ە ، هـەروەهـا کنت کورس روف لـە میژوی ئـەسـکەندەری مـەکدونـیدا برکـانیـەکانو هیرکانیەکان بە یەك نازانێ ٠

٤٣ ـ کتسیاس ئەڵێ کە دوای ئـەوە ئامی تیدا چەرمەسەرەیەکی زۆری بۆ پتساك نایەوە ، وە ئوبیار خۆی کوشت ، لەگـەل ئـەوەدا کورش نـەی ئەویست سزای بدات ، ئوگبار لە ساڵی ٥٣٨ی پێش زاینی دا لە بابل لە دنیا دەرچوە ٠ (میژوی روداوەکانی نابونید 111 ، ٢٢) ٠

٤٤ ـ Her; 1, 80.

٤٥ ـ
J. Friedrich kleinasiatische Sprachdenkmaler, Berlin, 1932

لە لاپەرە ٦٢ بە دواوە ٠(نوسراوەی میژویی ژمارە ٤٤) ناوی بنەماڵەی هارپاگیەکان (؟) ـ هارپاگ Arppaku و ئارتمپار Arttumpara ـ لە ناو بنەماڵە گەورەکانی لیدی دا ، لە سەدەکانی پێنجەمو چوارەمی پێش زاینیدا باو بووە ٠ تەماشای هەمان سەرچاوە ، ژمارەکانی a ٤٤ ،١، ٣٠، ١١، ٣، ٢٩، ٧، ٧٧، 2b ١٠٤ ، b وسکەی ژمارە ١٨٠ بکە ٠

٤٦ ـ ٨٠ ، پەرەی ١٠٦ photius, God., LXXII یـەکێکیـان ساتراپی هیرکانیەو ئەوی تریان (دربیکان) ـ (سکاییەکان) بووە ٠ هرتسفلد ئاسپیتاکاو زەردەشت بە یەك کەس ئەزانێ ٠

٤٧ ـ Her; VI 94 ، ٨٨ VII, بە دواوە ٠

٤٨ ـ لە بارەی میژوەکانەوە تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە :

A. poebel, 1) The Names and the Order of the Old persian and Elamite Months, AJSL, LV, 1953/ له لاپەڕە ١٣٠ بە دواوە
2) Chronology of Darius, Firs of Reign
هەمان جێگا لاپەڕە ١٤٢ بە دواوە
W. Hinz, Das erste Jahrdes Grosskonigs Dareios, ZDMG, XCII, 1938. لاپەڕە ١٣٦ بە دواوە ٠
ئا٠ ئا٠ فریمان کات نامەی کۆنی ئێران لــە ناو تەقەلادانی دۆزینەوەی تازەدا VDI ژمارە ٣ ، ١٩٤٦ ، لاپەڕە ١٥ بە دواوە ٠
R. G. kent, old Persian Grammar, text, Lexicon New Haven, 1950 لاپەڕە ١٤٠ بە دواوە ٠

٤٩ ـ پێنجەمین بەسەرهاتی (ئاشیل)

٥٠ ـ هردوت ئەم ناوەی بە شێوەی گۆڕدراو smerdis واشــیل mardis ی بـەکار هێناوە ٠ کتسـیاس بـە تـاینورکسارو کزنفون لــە کورشنامەدا بە تانائوکسار ناوی بردوە ،وەکو دەر ئەکەوێ tanuoksakes جۆرە نازناوێکـی بردیا واتا tanu Vazrka ـ بە مانا « لەش گەورە » یە ٠ هرودوت باسی بەهێزی و زەلامی بردیای کردوە ( III ٣٠) ٠

٥١ ـ بە پێی وتەی کتسیاس موغێك دژی بردیا ـ سفندادات پەنای برد بو بۆ کەمبوجیە ناوی سفندادات بوە ، وە بردیا بە پێی ئـەو تاوانەی کـە موغەکە کردبوی سزای دابو ، کـەمبوجیە چەند جار بردیای بۆ لای خـۆی بانگ کردوەو بردیا نەرۆیشتوە بۆلای ، بەلام لە دوای ئاگادار کردنی سێیەمین جار چو بۆ لای کەمبوجیە ٠ کەمبوجیە کە لە ئامی تیدا ئەترسا ( بە وتەی کتسیاس ئامی تیدا دایکی بردیا بوە ) سزادانی ئەسفنداداتی وا نیشــان دا گوایە چونکە دژی بردیا بوە کوشتوێتی ٠٠ (ئەم موغە لە شێوەو روخساردا

له بردیا ئەچو) بەڵام لە واقیع دا بردیا کوژرابو وە سفندداتی موغ جلەکانی لەبەر کردبو وەکو ئەو ئەجوڵایەوە ·· کەمبوجیە ئەم بەسەرهاتەی تـەنیا لای ساتراپی ئارتسیر (ئەم ناوە راستی میژویی تیا نیە وە کتسیاس ئـەم ناوەی لـە یەکێك لـە هـاو چـەرخەکانی خۆی وەرگرتوە) وخصیان ( خواجەگان ) ئیکسابات‌و باگاپات گێرا بۆوە ·· گوایە هەمو ئەم روداوانە پێنج ساڵ بەر لە مردنی کـەمبوجیـە بوون ·· لێرەدا لایـەنـە ئـەفسانەییەکانی نوسینەکانی کتسیاس بە ئاشکرا دەر ئەکەوێ ·

٥٢ ـ ئەم نوسینەی هرودوت کـەمتر رێی تێ ئـەچێ ، سەرچاوەکانی تریش ئەوە ناسەلمێنن ·· رەنگە بێ خۆی بە گئوماتا ناو برابێ وە لە باس‌و بەسەرهاتە کانی دواییدا ئەویان بە ئەسپنداداتی ئەفسانەیی زانیبێ ·

٥٣ ـ زوربەی سەرچاوەکان ئەڵێن ئەمە نازناوێکی پارسییەو ناو نیە ·

٥٤ ـ لە نوسینەکەی یوستین Cometes نوسـراوە بـەڵام " C " لاتینی کۆن رەنگە بێ «گاما»ی یۆنانی پێ بەکار هێنرا بێ ·

٥٥ ـ لە کورشنامەدا ( VIII ، V ، ١١) هەیە کە (تانائوکسار) کرابو حکومڕەوای مادو کادوسی‌و ئەرمەنیەکان ، بە پێی وتەی کتسیاس ساتراپی باکتریا بووە ·

٥٦ ـ بە پێی نوسینەکانی هرودوت و کتسیاس (پەڕەی ١٠٦ ، ١٢ ، (Phitius, Cod ‘ LXXII ئـەو لـە ناکاو خۆی بریندار کرد ، لـە نوسراوەکـەی بێستون دا زاراوەیەك کـە بۆ ئێمـە رون نـەبۆتەوە بـەکار هێنراوە ·· وەکو وتراوە گوایە ئەو «بە مەرگی خۆی مردوە» یان «خۆی خۆی کوشـتوە» huvamrsiyus amaryata وە لـە نوسـینە بابلیـەکانا نوسراوە mitut(u) rama(n) nisu mit(i) کـە وشـە بـە وشە ئەمە : « بە مردنی خۆی مرد » ئەگرێتەوە ·

٥٧ ـ Ben., I, § II.

٥٨ ـ هیچ سەرچاوەیەکی ئێمە لە بارەی شـەڕەکانی سەردەمی چونـە سەرتەختی گئوماتا وە یان لە ناوچونو کوشتنیەوە هیچ باس ناکەن ·· لـە واقیع دا لەشکر لە هەر کاتێکدا بێ ئەوەی هەڵوێستێکیان هەبوبێت سەر بـە ئەنجامی کودتای دەربار بون ·

٥٩ ـ یا : « ····و (با) خانوەکانی ـ شورا خێڵەکیەکان ···· » ·

ـ٦٠

yata paruvamciyavaga adam akunavamayadana. tya Gaumata kya magus viyaka. Adamniyacarayam karahya abicaris gaigamca maniyamca vigbisca, tyadis Gaumatah (ya) magusadina; adamkaramgag - avastayam parsamca Madam(c) aūta aniy a dahyava.

نوسراوەی عیلامی بە شێوەی (ترانس کریپسیونی ئاسایی) بەم جۆرەیە :

u siyan nap. pa. nna hutta, appa (kammatta) akka makus (sa)ri S. ta,aku (tas) su.p.an lutas ak as ak kurtas ak ulam (?) mannu. p. ma appiliya, appa kammatta akka makus e. ma aptu.

S. ta, ak u tassu. (Pkate.masik) ki. ta, kutta parsin, kutta mata. pe, kutta tayaus-

پەرستگای خواکانم دروست کرد ، کە گئوماتای موغ وێرانی کردبون وە خەڵك و Lutas (?) و as kurtas و لـەنـاو کـۆمـەڵـەکـانـا (ulam (?) manu لەگـەل vitII ’ ۱۱) یەکن ئاوەدانم کردنـەوە (؟) کـە گئوماتا لەویدا گرتبوی « خەلکم لـە جێیان دانا ، پارسو مادو کیشوەرەکانی تریش » ··· نوسراوە عیلامیەکان لە روی زمانەوانیەوە لە نوسراوە پارسیەکان ئەچن ·· نوسراوە بابلیەکان بە تەواوی نەماونەتەوە ·

٦١ ـ Beh., 1, §§ 11-14.

٦٢ ـ راستە گوایا داریوش ئەمەی باس کردوە کە بردیای درۆینەی دوەم

بە تەواوی عیلامی (ئانچانی) بوە ، هەرچۆن بێ لـە ولاّتی پارسدا شـوێنو مەڵبەندێکی تاڕادەیەك بەهێزی هەبوە ، وە لەناو ناوە تایبەتیەکانی سەردەمی هەخامەنشیەکانا کـە بۆ ئێمـە دەرکەوتوە ناوی عیلامی نیـە ، لـەبەر ئەوە کاریگەریتی عیلام لەو کاتەدا زۆر لاواز بوە ·

٦٣ ـ تەماشای Beh., IV ' § 51 بکە ، یەکێ لە یاخی بوەکان موغێك بو کە ناوی گئوماتا بوو ·· ئەو درۆی کرد ، بەم جۆرەی وت : « من بردیای کوڕی کورشم » ئەو پارسی تێ خرۆشان ··

٦٤ ـ لـە بواری زانسـتی ڕۆژ ئـاوادا وەکو پێویسـت ڕوخسـاری کۆمەڵایەتی گۆڕانکاریەکەی گئوماتا نیشان نەدراوە ، بـەم جۆرە هرتسفلدو کنیگ داریوش بە نوێنەری ڤیودالەکانی پارس ئەزانن · بە تایبەتی کنیگ F. W. Konig, Die altete Geschichte der meder nud perser, Der A. O. XXXIII 3/4.

(لاپەڕە ٢٨)

لەو باوەڕەدایە هـەمو ئەو لێکدانو بگرەو بەردانەی کـە لـە مێژوی کۆنی ئێراندایە ڕواڵەتێکی هۆزایەتیو خێڵەکیانەیان بووە ، وە ئەم بگرەو بەردانە لە نێوان ڤیودالەکانی بەر لـە هیندو ئەوروپیەکان روی داوە · بـەلاّم لـە سەردەمی کۆنا وە لەو سەردەمەدا نـەك تەنیا پەیوەندی میللی یانـە نەبوە بەڵکو یەکگرتنی هۆزایەتیش لە ئارادا نەبوە ، وە خەڵك تەنیا هەستیان بەوە ئەکرد کە لە کام تیرەو خێڵن ، لەبەر ئەوە بەربەرەکانێی رەگـەزی (نژادی) نەبوە ، ئەو نوسراوەی کەکنیگ لـە بەردەکـەی بێستون وەری گرتوە زۆر سەیرە :ـ « ئەو پەرستگایەی کە دەزگای دەرامەتی (!) گئوماتا لـە نـاوی بردبو کردمەوە ·· بە سەربازەکان جارێکی تر توانای ئەربابی (!) و زەویو زاری ئەربابی (!)و دەرامەتی ئەربابی (!) ····کە دەزگای دەرامەتی گئوماتا لێی وەرگرتبون پێم دانەوە » ·· تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

F.W. kong. 1) Derfalsche Bardiya, wien, 1939 2) Relie Fund Inschrift deskonigs Dareios I am Felsen Von Bagistan, Leiden, 1938 لاپەڕە ٣٨ ٠

٦٥ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاستروەوه ، شورشی مرغیانا له سەردەمی داریوشی یەکەم دا VDI ١٩٤٩ ژماره ٢ لاپەڕە ٢٠ ٠٠٠و٠ ئا٠ تیورین نیشانی ئـەدا ، باری کۆمەلایەتی kur-tas بـە پـێی سـەنەدەکانی گەنجینەی ئەستێلك VDI ١٩٥١ ، ژماره ٣ ، لاپەڕە ٣٨ـ٣٧ ٠

٦٦ ـ لەم بەشەدا لێدوانو لێکۆلینەوەی Beh, I, 14 سـودی لـە نوسینەکانی م٠ م٠ دیاکونوف دا بە ناو نیشانی «کورتەیەکی مێژوی ئیرانی کۆن» وەرگرتوە ٠

٦٧ ـ راستە کـە هرودوت ( I ١٣١) دەری خستوە پارسـەکان پەرستگایان نە ئەکردەوە بـەلام باسی دوای چارەسـەر کـاری خشایارشا ئەکات پەرستگای (دیوان) کە تازە وێران بوبو ٠

٦٨ ـ
J. Hertel, I ) Achaemeniden und kayaniden, Leipzig, 1924, 2 ) Die Zeit Zoroastero, Leipzig 1934. - E. Herzfeld, Zoroaster and his world, prince ton, 1947.

بە بیرورای هرتل موغو کاهنـەکانی یاسای « دیوان » واتا خوا کۆنـەکان ئامۆژگاریەکانی زەردەشتیان بە شێوەی خراپ نیشان ئەدا ، هەروەکو ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسـتروەوه باسـی ئـەکات (زادەگای زەردەشت V,BC لاپەڕە ١٩) ، بە هۆی دۆزینەوەی « نوسینەکانی خشایار شاوە لـە بارەی دیوانەوە » کە لە دواییدا پەیدا بووە ئەمانە هـەمو بـە درۆ ئەکەونەوە ٠٠ چونکە خشایارشا ، بە شێوەیەك کـە بۆمان دەرکەوتوە پشتیوانی موغەکانو دوژمنی دیوان بووە ٠

٦٩ ـ E. Herzfeld, Altpersischelnschrifen, Berlin 1938

لاپەڕە ٣٤ ٠ ئا٠ ئا٠ فریمان هەندێك نوسینی تازە لە بارەی نوسراوە پارسیە کۆنەکانەوە VDI ١٩٤٠ ، ژمارە ٢ ، لاپەڕە ١٢٧ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسترووە ، نوسینی خشایارشا لە بارەی « دیوان » و یاسای پارسەکانەوە IAN (هەواڵی کۆڕی زانیاری زنجیرە بلاو کراوەیەکی میژوییو فەلسەفی ، ١٩٤٤ ، ژمارە ٣ ، لاپەڕە ١٣٢ ٠ ـ و٠ ئی٠ ئابایف نوسراوەی دژی دیوەکان ، خشایار شا ٠ کۆمەڵەی «زمانە ئیرانیەکان» I مۆسکو ، لینینگراد ، ١٩٤٥ ، لاپەڕە ١٣٦ بە دواوە ٠ R.G.kent هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٥٠ بە دواوە ٠

٧٠ ـ لەم کاتەدا باسی ئەوە ناکەین کە ئایا خشایار شا مەبەستی یەك پەرستگایە وە یان چەند پەرستگایەك ، وە ئایا مەبەستی لەو پەرستگایانە بوە کە لە ئیراندا بون یان لە دەرەوەی ئیران ٠٠ گرنگ ئەوەیە کە نوسینی ئەو لە سەردەمی کۆن دا کەمتر بینراوە ٠٠٠

٧١ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسترووە ، زادەگای زەردەشت V, CB ١٩٤٨ لاپەڕە ١٤ ٠

٧٢ ـ Her., V11, 19, 37, 43, 113, 191 هەروەکو ئاکاد میسین و٠و٠ ئاسترووە لەو باوەڕەدایە ( زادەگای زەردەشت لاپەڕە ١٩ بە دواوە ) ئاموژگاریەکانی زەردەشت خشایار شایان بە کافر دائەنا ، نوسەری ناوبراو لەو باوەڕەدایە کە ئەمە لەبەر ئەوە بوە ئەو ویستویەتی خۆی کاردارو حاکمی یاساکە بێت ٠ بە شێوەی گشتی هۆی ئەوە کە بۆچی پادشایانی هەخامەنشی بەر لە ئاردەشێری یەکەم لەناو باسو بەسەرهاتە زەردەشتیەکانا لابراوون بە ئاسانی ئەتوانرێ بزانرێ ٠٠ لە واقیع دا کورش ئاسپیتامای جێ نشینی زەردەشتی کوشت ٠ کەمبوجیە ، هەروەکو هردوت ئەڵێ دەس بەرداری ئاینی هۆزەکەی خۆی بو ، داریوشی یەکەم گئوماتا (ئاسپندات) ی کوشت ٠ ئەگەرچی هەمو پادشاکان ڕێگای یاسای موغەکانیان دابوو ، وە

یارمەتیان ئەدانو پشتگیرییان لێ ئەکردن ، بەڵام جیاوازیەکی زۆر لە نێوان یاسای موغەکانی سەردەکانی شەشەم تا چوارەم - کە تەنانەت لەگەڵ کاهنە کافرەکانا رابەرایەتی هاوبەشیان ئەکرد جیاوازیەکی زۆر هەبو ...

٧٣ - Her., 111 ‘ 79 پەڕەی ١٠٦، ١٥ .photius, Cod. LXXII

٧٤ - لێرەدا ئەبێ جارێکی تر باسی ئەوە بکەین بە وتەی هرتل - کە هەندێک لە دانشمەندەکان لایەنگیری ئەکەن - گوایا زەردەشت هاو چەرخی داریوش بووە .. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە سێ کەس بە سێ کەسی تر زانراوە .. ١- بە یەك زانینی گاوی ویشتاسپا پشتیوانی زەردەشت بە ویشتاسپ باوکی داریوش . ٢- ناوی خانەدانی ویشتاسپا « نائوتارا » بە بنەماڵەی هەخامەنشیەکان . ٣- ناوی ژنەکەی (؟) ویشتاسپا واتا هوتائوسا - لەگەل ئاتوسای کچی کورش کە یەك لە دوای یەك بە ژنی کەمبوجیەی دوەم و بردیای درۆینەو داریوشی یەکەم ناو براوە . ئاکاد میسین و.و. ئاسترووە ئەم باسە بە هەندێک دەسکاریەوە ئەسەلمێنێ .. ( شورشی مرغیانا لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا لاپەڕە ٢١ بە دواوە . زادەگای زەردەشت لاپەڕە ١٩ ) . ئاکاد میسین و.و. ئاسترووە لەم بارەیەوە بە پێی نوسینەکانی نوسەرەکانی دوایی وەکو - ئامیان مارتسلین (سەدەی چوارەم)و ئاگانی (سەدەی شەشەم) و بیرونی (سەدەی دەیەم) کە ناوی هیستاسپو ویشتاسپا بە رێکەوت بەرچاو ئەکەوێ باسی یەکبونی هیستاسپای باوکی داریوشو ویشتاسپای پشتیوانی زەردەشت ئەکات . بەڵام لەمەوبەر باسمان کرد کە گاتاکان بە زمانی پارسی نەنوسراونەتەوە ، ئاویستا بە شێوەی گشتی لە بارەی پارسەوە ئاگادار نیە ، ناوی ئەوانەی پشتیوانی زەردەشتیان کردوە لەگەل ناوی ویشتاسپای باوکی داریوش لە یەك نزیکن . دیسانەوە تەماشای ئەم سەرچاوەیەش بکە :

W. B. Henning, Zoroaster, Politician or witch-doctor ? London, 1951

٧٥ - بە تایبەتی تەماشای نەقشە هەلکەندراوە پارسیەکانی

نوسراوەکانی داریوش لە ئەستێنك بکە :

Dar. pers. C, § 3, Dar. NRa, §§ 2, 4.

٧٦ ــ ئەم نوسینە ( لەگەل لەبەرچاو گرتنی باس‌و بەسەرهاتە عیلامیەکان کە لەوە بەدواوە لە وشەی بەرامبەر بە Vtbis ی پارسی کۆن ، پاشگری لە moc - دا هەبوە ) ....

٧٧ ــ تەماشای کۆتایی لاپەڕە ٤٧٢ تا کۆتایی لاپەڕە ٤٧٥ی نوسراوەکە بکە .

٧٨ ــ بۆ نمونە ئوتان‌و گوبری .. تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :

J. V. Pvasek, Geschte der Meder und perser, 1, Gotha 1906

لاپەڕە ٢٠٣ بە دواوە .. گوبری پێشەوای بنەماڵەی پاتی سخوریان ( هام ناوی پاتی شخوار )ی مادی بوە . ئەبێ لە نوسراوەی Dar. NRC دا بەم جۆرەی بناسین : (Gaubruva Patishu varis)

ئەو یەکێك بوە لە گەورە پیاوە دەرکەوتوەکان ، لە سەردەمی کورش‌و کەمبوجیە ساتراپی بابل‌و سوریە ــ ئاشور (= ئاکادو ئەوبەری ڕوبار) بوە. بیرورای شیل و. س. ئاسمیت لە بارەی یەکبوونی گوبری (Gubru=Gaubruva) ی میژویی ..

S. Smith, Babylonian Historical texts, London, 1924

لاپەڕە ١٦٥ بە دواوە .. V. Scheil, RAXI لاپەڕە ٣٥ـ٣٤ ، ١٠٥ـ١٠٤ و ١٢٢ـ١٢١ ... لە بارەی (ئاتان)ەوە هرودوت ئەڵێ دەوڵەمەند ترین کەس بوە لە ناو گەورە پیاوەکانا .

٧٩ ــ ئەوانە بنچینەی بنەماڵەی رابەری گەورەکانی ئەمپەراتوری هەخامەنشیەکان بون لە دوای سەردەمی داریوش .. ویندا فرنا (ئینتا فرن، کە لە دواییدا لە لایەن داریوشی یەکەمەوە چەرمەسەرێ درا) ئوتانا (ئاتان)، گئوبرودا (گوبری) ، ویدرنا (گیدرن) ، بگابوخشا (مگابیز ــ) و ئاردومانیش کە لە بارەی ئەوەوە کەس هیچ هەوالێکی نەگەیاندوە ،وە تەنانەت لە

نوسینەکانی هرودوتدا لە جیاتی ناوی ئەو ناوی یەکێك لە هاوکارەکانی داریوش هاتوە کە ئەسپاچنا (ئەسپاتینا) یان پێ وتوە ٠٠

٨٠ ـ ئاکاد میسین و٠و٠ ئاستروەوە لە وتارێکدا بە ناو نیشانی «هرودوت‌و گێرەوکێشەی سیاسی لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا»، ( VDI ١٩٤٨ ، ژمارە ٣) ئەوەی سەلماندوە کە ئەم باسە راستە ٠

٨١ ـ لەم کاتەدا ئەنجومەنێکمان لە جۆری ئاتنیەکان وەکو هێزێکی سیاسی کەبەشداری یان کردبێ ناکەوێتە بەرچاو ٠٠ وە لە پارس‌دا کۆمەلێکی کەم لە خەلکە ئازادەکان ـ کە زوربەیان چەکدارو یاساولـەکانی دەوروبەری پادشا بون ئەیان توانی لەو جۆرە ئەنجومەنانەدا بەشدار بن ٠

٨١ ـ **(دوبارە)** ئەو لە یائوتی ـ کە رەنگ بێ هەمان ناوچەی ئوتیەکان بێ کە لە نوسینەکانی هرودوت دا هەیە ـ ئالای یاخی گەری هەلکرد ٠ ئەگەر باوەر بەو زاراوانە بکەین کە کامرون لە نوسراوەکەی بێستون وەری گرتوە ( R.G.kent هەمان سەرچاوە لاپەرە ١٢٦ و٢٠٤) بەوتەی داریوش مەلبەندی وخیازداتا بوە

kara parsa hya vita patiyhacayadaya Frataram

«بەخەلکە لەشکریەکانی پارس کە لە خانوەکانا (کۆمەلەکانا) بون لەوەبەر ئازیادا» بون ، لە باس‌و بەسەرهاتە عیلامیەکانا لە جیاتی ( ئازیادا ) Ansanmar ئەکەوێتە بەرچاو ، واتا ناوچەی عیلامی رۆژ هەلات ٠

٨٢ ـ ٠٠٠٠داریوش ساتاگیدیەو ئاراخوسیای بە جیا ناوبردوە ، لەو ناوچانەی کە لێی جیا بونەتەوە تەنیا باسی ساتاگیدیە ئەکات ٠٠ بەلام لە سەرچاوەی ترا دەرئەکەوێ کە لە ئاراخوسیا شورشی بەرپا بووە ٠ هەروەکو نەخشەکەی هرودوت دا دیارە هەردو ناوچەکە یەك ساتراپ نشین بون ٠

٨٣ ـ باس‌و بەسەرهاتە بابلیەکان لە جیاتی « هاوکارەکان » بۆ هەریەك لە شورش کارەکان هەموجار وشەی «گەورەکان» mar-banuti یان بەکار هێناوە ، رەنگ بێ هەندێك لە گەورە کان‌و خزمانی بنەمالەی

سەڵتەنەتی پێشو بەشداری ئەو شورش‌و راپەڕینانەیان کردبێ ٠

٨٤ ــ رەنگە بێ ئەم راپەڕینە زوتر دەستی پێ کردبێ ٠٠ تەماشای ئاکاد میسبین و٠و٠ ئاستروو بکە (شورشی مرغیانا لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا VDI ژمارە ٢ ، ١٩٤٩) لەگەل زوربەی نوسینەکانی تری نوسەردا کە ئەم راپەڕینەی لە دژی موغەکان‌و زردەشتیەکان داناوە ٠

٨٥ ــ بە پێی نوسراوەکانی بێستون (باس‌و بەسەرهاتە بابلیەکان) زیاتر لە ٥٥ هەزار کەس کوژراوە ٠

٨٦ ــ بگرەو بەردەکە لە ناوچەی (vardana) ماروش بوە ، رەنگە بێ مارغوبیشتو بوبێ (؟؟) لە ئالی‌پی ٠

٨٧ ــ لە باس‌و بەسەرهاتە بابلیەکانا (دێڕی ٤٣) ــ Hamban

٨٨ ــ رەنگە بێ ئەو ساتراپی هەمو ناوچەی XVI بوبێت کە هرودوت باسی لێوە کردوە ، هەروەکو لەمەوبەر وترا فراوانی بێ ئەندازەی ئەم ناوچەیە کە لە چوار ساتراپ نشین پێك هاتبو ، رەنگە بێ لەبەر ئەوە بوبێت کە باوکی پادشا حوکمڕەوایی تیا ئەکرد ٠

٨٩ ــ لە باس‌و بەسەرهاتە بابلیەکانا لە نوسراوەکەی بیستوندا ژمارەی کوژراوەکان نوسراوە بەلام بە رونی ناوخوێنرێتەوە ٦٥٧٠ یان ١٥٥٧٠ ؟ ٤١٩٢ کەس بە دیل گیراون ٠

٩٠ ــ ئەو نەرێتە کە پادشا سەرکەوتوەکان پارچەیەك لە لەشی پیشەوا یاخی بوەکانیان ئەبڕی‌و نوقستانیان ئەکردن ئەمە کرداری ئاشوریەکان بوە، یان ئەیان کردن بە نیشانەی نێزەو چەرمەسەرێی دوژمنە دیلەکانیان ئەدا ٠

٩١ ــ نازانرێ ئەوانە ساگارتیەکان بون یان دانیشتوانی زیکرتوی ئازربایجان ٠٠٠

٩٢ ــ پارسەکان لە هەمو هوردو گاکاندا لە میسرەوە تا هیندستان خزمەتیان ئەکردو ئەرکی لێ پرسراوی‌و بەڕێوە بردنیان بە دەستەوە بوە ٠

جگە لەوە پارسەکان لە خەراجو باج عەفو بون ٠

٩٣ ـ ئەگەر باوەڕ بە بواری میژویی و نژاد شوناسی بکەینو سود لە کرداری دەستو پێوەندو بێگانەکانو پەناهێنەرەکان وەربگرین ٠٠ ئەمە بە ڕواڵەتی شێوەی نێروەجاخی ناو ئەبرێ ٠٠٠٠

٩٤ ـ xen, Hell, 1,2,19

٩٥ ـ بەلاَم لە سەردەمی خشایارشادا ، تیگران کە لە بنەماڵەی هەخامەنشیەکان بووە یەکێك بوە لە سەرکردە سوپاییەکانی ماد .(Her., XII, 62)

٩٦ ـ Xen, Anab, VII, 8,25 (1, 7,11). Plut, Artax, 14.

ئەمە هەمان (ئارپاك)ە کە کتسیاس سودی لە ناوەکەی وەر گرتوەو کردویتی بە فارەمانی لەناوبردنی ئاشور ٠ بەلاَم لەبارەی ئەوەوە کە ئەم ناوە مادی‌یە جگە لە هەمو بەلگەیەك ئاشکرایە کە تەنانەت لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینی دا ئەم ناوە لە سەرزەمینی مادا باو بووە ٠

(Arbaxu: ARAB, II No, 192) وە لە پارس دا لێی بێ ئاگا بون ٠

٩٧ ـ جێگای سەرنجە کە ناوی (ئاتروپات) یەکەم زەردەشتی‌یە ،دووەم لەناو بنەماڵەی ویشتاسپای پشتیوانی زەردەشت دا هەبوە ٠ (یشت XIII ، ١٠٢ ـ پرویشتاسپا : Atarepata. ) ٠

٩٨ ـ تەنانەت ئەگەر ئیرانیەکان بە تالاَنکەر دابنێین پێویستە سەرنجی ئەم سەرچاوەیەش بدەین : Her ‘ V11 ‘ 223

٩٩ ـ گ٠ خ٠ سرکیسیان ١ـ شاری خود موختاری بابل سەردەمی سلوکیە VDI ‘ ١٩٥٢ ژمارە ١ ، لاپەڕە ٦٨ بە دواوە ٠ ٢ـ لە بارەی زەوی‌و زاری بابلەوە سەردەمی سلوکیە VDI ١٩٥٣ ژمارە ١ ، لاپەڕە ٥٩ بە دواوە ، ئی٠ م٠ دیاکونوف ٠ ١ـ ڕێبازی تەواوی یادداشتەکانی زەوی لە ئاشور ٠ لینینگراد ، ١٩٤٩ ،لاپەڕە ١٣٦ بە دواوە ٠ ٢ـ نوسینی

سیاسی بابلی سەدەی شەشەمو حەوتـەمی پێشی زاینی VDI ١٩٤٦ ، ژمارە ٤ لاپەڕە ١٤ بە دواوە ٠

١٠٠ ـ تەماشای ئەو نیگارە رونە بکـە لـە کتێبی (عذرا)ی تـەورات دا هەیە ٠

١٠٠ ـ **(دوبارە)** ـ لەشکری پیادە لـە کار کەوتبون ، وە رەنگە بێ لەبەر ئەوە بوبێت کە خەڵکە ئازادەکان لات کـەوتبون ٠ وەکو بـە وتـەی کورتسیا ( III ، ٢ IV ١٢) داریوشی سێیەم لـە ئیسوس ٢٥٠ هەزار پیادەو زیاتر لە ٥٠ هـەزار سوار لـە گائو گامل ٢٠٠ هەزار پیادەو ٤٥ هەزار سواری لەگەل بوە ٠٠ کە نیسبەتی ئەو ٥:١ و٤:١ بوە ، لەگەل ئەوەدا ١٥٠ ساڵ بەر لەوە لەشکری خشایارشا بـە پێی یۆقلەمـە کردنی هرودوت نیسبەتی پیادەو سوار ١٠:١ بوە ٠

١٠١ ـ ئەمە زۆر باوە (بە تایبەتی لە ناو دانشمەندەکانی سوڤییەتدا، ز٠ ئی٠ یامپولسکی لایەنگری ئەوە ئەکات) کە «ئاتروپات» ناو نیەو نازناوی کاهنێکە کە لە مادا حوکمی کردوە ٠ ئەم وشـە وا ئەگەیەنێ کـە مـانای (ئاگرەوان ـ یان ـ خاوەن ئاگر) بێ ٠٠ بـەڵام ئەگەر ئـەم وشەیە نازناو بوبێ ئەبوا لەکاتی تریشا حاکمەکانی ماد ئەم نازناوەیان بوبێت ٠٠٠

١٠٢ ـ لە شەڕی ئیسوسدا لەشکرێکی گەورەی مادەکان بەشدار بوە، بەڵام ئەوە رون نیە کـە لـەو سەردەمەدا ئاتروپات فەرماندەو سـەرکردەی لەشکرەکە بووە یان نە؟ ٠

١٠٣ ـ Arr., Anab., 111, 8, 4. وا دەرئەکەوێ کادوسیو ئالبانیو ساکسیەکان لە هاوکارانی ماد بوون نـەك ئەمپەراتوری پارس ٠ ئـەگەرچی یۆنانیەکان لە زۆر کاتا لـە جیـاتی پارس وشەی مادیان بـەکار هێناوە ٠ ئەمەجێگای سەرنجە کـە گردیەکان (کردوخی ، دانیشتوانی ژوروی چیاکانی ئاشور)و کاسـیو کوێستانیەکانی کوردستان و لورستانی ئیسـتا لـە ناو

لەشکری مادی ئاتروپاتین دا نەبون (curt, IV, 12) لە شەڕەکەدا کادوسیەکان لای چەپو مادەکان لای ڕاستیان گرتبو ٠

١٠٤ ـ Gurt, 1V, 9 ئاتروپات لێرەدا بە satropates ناو براوە وە ئەمە لە نوسخە نوسینەوەدا وای لێ هاتوە ٠

١٠٥ ـ ئەو پارتاکنای لە ساتراپ نشینی ماد جیا کردۆتەوە (Arr., Anab., 111, 19, 2)

١٠٦ ـ لە نوسینەکانی پلین دا سەرزەمینی کادوسیەکانو کاسپیەکان یەکن

١٠٧ ـ ئاریان (Anab., 111, 20, 3,) « ئاکسودات »ی بە پارس دائەنا ٠٠ بەلام میژوو نووسەکانی ئەسکەندەر هەمو گەورە پیاوانی هەخامەنشی کە بە زمانی ئیرانی ئەدوان بە پارسیان دائەنان ٠ ئەو بەڕای زوربە خەلکی ئاسیای ناوەڕاست بووە ٠

Vaxsudata - ی ئیرانی Oh sodates, ok. sudates کە بە مانا « ئامودریا » ئەگرێتەوە ؟) ٠

١٠٨ ـ Arr., Anab, 1V, 18, 3 کورتسیا VIII, 3 ئەلێ کە یەکەمجار لە جیاتی ئاکسودات ئارساك دانرابوو ٠٠

١٠٩ ـ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠

١١٠. Arr., Anab, V1, 29, 3. ناتوانین بلێین کە بارياکس نوێنەری کام توێژو کۆمەل بوەو چ مەبەستێکی بووە ٠

١١١ ـ هەمان سەرچاوە .V11, 4, 1

١١٢ ـ .Arr, Anab., V11, 4, 5

١١٣ ـ Arr., Anab., V11, 13, 2 ئاريان لەوە بەدواوە بەم جۆرە باس ئەکات : « هەندێك ئەلێن کە مەمکی ڕاستیان کە لەکاتی شەڕدا بە دەرەوەیە ـ بچوکتر بووە ، ئەسکەندەر ئەوانەی لە ناو لەشکر دەر کرد،٠٠٠

بەڵام نە ئاریستوبول وە نە بطلیموس لەم بارەوە هیچیان باس نەکردوە ،وە من لەو باوەڕەدا نیم کە هۆزی ئامازونی ئافرەتان تا ئەو سەردەمە مابێتەوە ۰ ۰۰۰ ئەگەر ئاتروپات ژنە سوارەکانی نیشان ئەسکەندەر داوە ، ڕەنگە بۆ ئافرەتە بەربەرەکان بوبن‌و فێری سواری کرابن‌و بەرگی ئافرەتی ئامازونیان کرابێتە بەر » ۰۰۰۰۰۰

١١٤ ـ ب۰ گراکۆف Guyaikokratogmeyoi ( یۆنـانـی ) ، ( پاشماوەی ســەردەمی مێوەجـاخی لـە نێوان سارماتەکانا ) VDI ١٩٤٧ ، ژمارە ٣ ، لاپەڕە ١٠٠ بە دواوە ۰

١١٥ ـ هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٠٣

١١٦ ـ تەور sagaris ،بە وتەی هرودوت ، هۆزەکانی ماساگت کە دراوسێی ساوروماتەکان بون بەکاریان هێناوە (٢١٥ ' I ) ، ئەگەرچی لێرەدا لەڕوی کۆنە شوناسیەوە ئەم جۆرە تەورە نەبینراوە ۰

١١٧ ـ ئەگەر کادوسیەکان بەشێك لـە کاسپیەکان بوبن (وە ئـەمە ڕێی تێ ئەچێ) کەوابو وتەکەی والری فلاك ( VI ' ١٠٨) لە بارەی یاسای سەگ پـەرستی‌یەوە لـەناو کاسپیەکانـا کـە دراوسێی هیرکانیـەکان ـ (Aelian, De Aanim, VII, 38) وە ڕەنگە بۆ ئالبانیەکان لـەم کارەدا بەشداری یان کردبێ strabo, XI, 6,7 وە پەیوەندی‌یان پێیانەوە بوبێ ۰ ڕەنگە بۆ ئەم سەگ پەرستی‌یە تەنیـا لـە ناو ڕاوچی‌یەکان‌و ئاژەڵدارەکانا باوی بوبێت ۰۰

١١٨ ـ هەمان سەرچاوە XXIV

١١٩ ـ plut., Artax., XXIV.

١٢٠ ـ سەرزەمینی داریان herdareitiskhora) ۰ بـە پێی وتەی بطلمیوس( VI ' 2, 6 ) بەشێکی زۆرو فراوانی لە خاکی ماد داگرتبوو تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە : Nat. Hist پلیـن VI, 95

١٢١ ـ ئاستراﺑۆن ( X1, 8, 8 : plin. Nat. Hist., V1, 25) بـە وتـەی ئاراستوفن لە ڕۆژ هەڵات تا ڕۆژ ئاوای کـەناری دەریای کاسپی (خزر) بـە

هیرکانی ئامردان (لەئاوەڕێژگەی روباری سپی ـ قزل‌ئوزون) و ئانازیان (واتا ئەوانەی ئارمی نەبون) و کادوسی‌و ئالبانی‌و کاسپی‌و ئوتی ناو ئەبران ۰ بە وتەی پلین ( VI ، ١٨ بە دواوە) هەمو هۆزە کانی دەوروبەری دەریای کاسپی (خزر) بە کاسپی ناو ئەبران ۰۰۰۰۰

١٢٢ ـ لە سالی ٤٠٤ دا ۰ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە : xen., Hell,, II, 1, 13 پلوتارك بە هەلە بەروازی ئەم لەشکر کەشی‌یەی دواتر داناوە ۰ (لە دوای شەڕ لەگەل کورشی بچوك دا) ۰۰

١٢٣ ـ Just, X, 3.

١٢٤ ـ تەماشای لاپەڕە ٦ ی پەراویزی ٢ ی ئەم سەرچاوەیە بکە :
A. Gutschmid, Geschichte Irans; Tubingen, 1888

١٢٥ ـ هەروەکو کورشی بچوك ، ساتراپی ئاسیای بچوك ، کە ئامادە بو لەشکر بکاتە سەر ئاردشیری دووەم کە برای خۆی بو ، کاتێك تەدارەکی شەڕی رێک خست وای نیشان دا گوایە لەشکر بۆ سەر هۆزی پی‌سیدی وە یان ساتراپی تی سافرن ئەکات ۰ (Xen, Anab, 1,2,1,4) ۰۰ پادشا لەم راگوزەرەدا هیچ نارەحەت نەبوبو ۰ کورشی ناوبراو شارەکانی یونیە کە سەر بە ساتراپی تی‌سافرن بون خستنیە سەر ساتراپەکەی خۆی و دەستی بەسەرا گرتن ۰

١٢٦ ـ تەماشای بەر لە کۆتایی لاپەڕە ٤١٥ تا سەرەتای ٤١٦ ی نوسراوەکەو چەند شوێنێکی تر بکە ۰

١٢٧ ـ Arr., Anab., 111, 19, 5-7.

١٢٨ ـ Polyb., X, 27, 3.

١٢٩ ـ ئەمە کۆنترین شێوەی ناوی ناوبراوە ۰۰ تەماشای پەراوێزی ١٣٢ ی بەشی سێیەم‌و کۆتایی لاپەڕە ٥٤٣ تا ٥٤٤ ی نوسراوەکە بکە ۰ لە وێدا لە بارەی ئەوەوە کە ناوی ئاتروپاتنا (ئاندرپاتیانو)ی سەردەمی ئاشور وەرگیراوە قسە کراوە ، زوربەی سەرچاوەکانی دواتر دەولەت‌و کیشوەری ناوبراو بە « ماد » ناو ئەبەن ۰ وە ئەمە ناوی رەسمی ئەو ناوچەیە بووە ۰

# کورتەی ئەو سەرچاوانەی

## دانەر بەزۆری سودی لێ وەر گرتوون

- ئی٠م٠ دیاکونوف ـ(سەرچاوە ئاشوریو بابلیو ئورارتوییەکان Aviu
- گۆڤاری (پەیك میژوی کۆن) ١٩٥١
- ژمارە (٢) ، (ژمارەکانی ٥٠ـ١) ژمارە ٣ لە ژمارە ٥١ بە دواوە ، ژمارە ٤ (فهرست اعلام)
- گۆڤاری (پەیك میژوی کۆن) ، (وستنیك درونی ئیستوریی) VDI
- یادداشتەکانی کۆڕی زانیاری ئازربایجان Danazssr
- گۆڤاری وەزارەتی زانیاری میللی Jmnp
- یادداشتەکانی بەشی رۆژ هەلاتی ئەنجومەنی کۆنە شوناسی روس ٠
- هەوالەکانی کۆڕی زانیاری ئازربایجان IZV.ANAZ
- هەوالەکانی کۆڕی زانیاری سۆڤیەت ـبەشی مێژوو فەلسەفە IAN,OIF
- گ٠ ئا٠ ملیکیشویلی ٠٠ نوسراوە بزمارییە ئورارتوییەکان
- گۆڤاریVDI ١٩٥٣ ، ژمارە ١ی سالی ١٩٥٤ و ژمارە ٢

melikishviliukn

- گ٠ ئا٠ ملیکیشویلی uk.n. ukn
- ئی٠ م٠ دیاکونوف ، لینینگرد ١٩٤٩ RZOA
- رۆژهەلاتناسی سۆڤییەت SV
- کارەکانی بەشی میژویی فەرهەنگو هونەری رۆژهەلات لە مۆزەخانەی دەولەت لە ئەرمیتاج TOVE
- یادداشتی دانشمەندەکانی دەولەت لە لینینگراد UZLGU
- نوسراوە رۆژهەلاتیەکان EV
- کۆمەلە کۆنە شوناسییە تیکەلاوەکان بە تایبەتی لە بارەی خواروی تورکمانستانەوە NTAKE

# × کورتەی سەرچاوە ئینگلیزیو ئەڵەمانیو فەرەنسەییو زمانەکانی تر ..

ADD= C. H. W. Johns, Assyrian and Documents, Cabride, 1898-1922.

AfO= Archiv für Orientforschhung.

AIrWB= Chr. Bartholomae, Alt-Iranisches Wörtebuch, Strassburg, 1902.

AJSL= American Journal of Semitic Languages.

AKA= E. A. W. Budge and L. W. King, Annals of the Kings of Assyria, V. I., London, 1902.

AL= F. Delitzch, Assyrische Lesestücke, 5. Ausg.. Leipzig, 1913.

AMI= E. Herzfeld, Archeologische Mitteilungen aus Iran, Berlin, 1929.

Der A.O.= Der Alte Orient, Leipzig.

AOF= H. Winckler, Altorientasche Forshungen, I-III, Leipzig, 1893-1906.

ARAB= D. D. Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, Chicago, 1926-1927.

Ar. Or.= Archiv Orientàlni.

ARU= J. Kohler und A. Ungand, Assyrische Rechtsukunden, Leipzig, 1913.

Asurbanipal= M. Streck. Assurbanipal die letzten assyrischen Könige, I-III, Leipzig, 1916.

BASOR = Bulletin of the American Schools of Oriental Research.

BASPR = Bulletin of the American Schools of Prehistoric Research.

BE = Babylonian Expedition of the Museum of the Universiy of Pennsylvania.

Beh. = نوسینەکانی داریوشی یەکەم لە بێستون

BOTU = Boghazköi - Texte in Umschrift.

BSOAS = Bulletin of the Schools of Oriental and African Studies.

CAH = Cambridge Ancient History, Cambridge, 1924.

CRAI = Comptes-rendus de l'Acadëmie des Inscriptions et des Belles-Lettres.

8CS = F. Thureau-Dangin, La relation de l'huitiéme campagne de Sargon II, Paris, 1912.

CT = Cuneiform Texte from Babylonian Tablets in the British Museum.

Dar. NR a =
Dar. NR b = نوسینەکانی داریوشی یەکەم لە نەقشی رۆستەم
Dar. NR c =

Dar. Pers. c =
Dar. Pers. f = نوسینەکانی داریوشی یەکەم لە تەختی جەمشید
Dar. Pers. e =
Dar. Pers. g =

Dar. Sus. f = نوسینەکانی داریوش لە شوش

FGH = F. Jacoby, Fragmente Criechischer Historiker.

FHG = Fragmenta historicorum graecarum 1848-1884.

HABL = R. E. Harper, Assyrian and Babylonian Letters, London, 1892 = L. Waterman, Royal

Correspondence of the Assyrian Empire, Ann Arbor, 1930.

JAOS = Journal of the American Oriental Society.

JCS = Journal of Cuneifrom Seudies.

JNES = Journal of Near Eastern Studies.

KAH, I = L. Messerschmidt, Keilschrifttexte aus Assur historischen Inhalts, Bd. I, Leipzig, 1911.

KAH, II = O. Schroeder, Keilschrifttexte aus Assur historischen Inhalts, Bd. II, Leipzig, 1921.

KB = Keilinschriftliche Bibliothek, herausgegeben won E. Schraeder,

KL = E. Klauber, Politisch — religöse Texte aus der Sargonidenzeit, Leipzeit, 1913.

Kn. = J. A. Knudtzon, Die Gebete an den Sonnengott für Staat und königliches Haus aus der Zeit Asarhaddons und Assurbanipals, Leipzig. 1893.

KS = H. Winckler, Die Keilschrifttexte Sargons II, Leipzig, 1889.

KTP = P. Rost, Die Kelischrifttexte Tiglatpilesers III, Leipzig, 1893.

KUB = Keilschrifturkunden aus Boghazöi.

Kuhn's Z. f. vgl. = Zeitschrift rür vergleichende Sprachenkunde, gegründet von Kuhn.

LAAA = Annals of Archeology and Anthropology, Liverpool.

Mém. Dél. en Perse = Mèmoires, Delegation en Perse, Peris, 1900-1929.

MO = Le Monde Oriental.

MVAG = Mitteilungen der Vorder asiatischen ( und Agyptischen ) Gesellschaft.

NBKI = S. Langdon, Neubabylonische Konigsinschriften, Vorderasiatische Bibliothek, 4, Leipzig, 1912.

N.F. = Neue Folge.
N.S. = Nouvelle sèrie.

OBI = H. V. Hilpercht, Old Babylonian Inscriptions chiefly from Nippur, Philadelphia, 1893-1896.

OECT = Oxford Edition of Cuneiform Texts.

OLZ = Orientalisische Literaturzeitung.

Pauly - Wissowa = Reallexikon der klassischen Wissenschaft. herausg. von Pauly - Wissoma - Kroll.

PSBA = Proceedings of the Society of Biblical Archeology.

IR Cuneiform Inscriptions of Western Asia, ed. by H.
IIR Ramlinson, vv. II, V, London, 1866, 1884.
V R

RA = Revue d'assyriologie et d'archeoligie orintale.

RLA = Reallexikon der Assyrioligie, heraug. von E. Ebeling und B. Meissner, Berlin — Leipzig, 1932 - 1938.

Sammlung = H. Minckler, Sammlung von keilschrifttexten.

SBAW = Wissenschaftliche Veröffentlichungen der Deutchen Sitzungsberichte der Bayrischen Akademie der Wissenschaften, Philologisch-historische Klasse.

SPA = A Survey of Persian Art, London — New York, 1938-1939.

SAKI = F. Thurean - Dangin, Die summerischen und akkadischen Königsinschriften, Vorderasiatische Bibliothek, 1, Leipzig, 1907.

SKL = The. Jacobson, The Summerian King List, Chicago, 1939.

Streck, ZA, XV=M. Streck, Die heutigen Landschaften Armenian, Kurdistan, und Westpersien, Zeitschrift für
Assyriologie, XV.

VB = Vorderasiatische Bilbliothek.

WVDOG = Wissenschaftliche Veröffentlichungen der Deutchen Orient - Gesellschaft.

Xerx. Pers. c. = نوسراوەكانى خشايار شا لە تەختى جەمشيد

ZA=Zeitschrift für Assyriologie und verwandte Gabiete.

ZDMG = Zeitschrift der Deutschen Morgenländerischen Gesellschaft.

